بسم الله الرحمن الرحيم

**(وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)** **(الحشر : ٧)** واتە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون وەریبگرن (جێبەجێی بکەن) ئەوەش کە لێی قەدەغە کردوون مەیکەن و وازی لێبێنن، لەخوا بترسن چونکە خوا سزای زۆر سەختە.

**(مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ وَمَن تَوَلَّى فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظاً)** **(النساء : ٨٠)** واتە هەرکەس گوێرایەڵیی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بکات ئەوە گوێرایەڵی خوا بووە هەرکەسیش سەرپێچیی بکات (خۆی بەرپرسیارە) ئێمە تۆمان ناردووە بۆ پاراستنی ئەوان.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

### پێشەکیی

سوپاس و ستاییش تەنها بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، درودو سەلامیش لەسەر گیانی پێغەمبەری ئاخر زەمان هاورێ لەگەڵ هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی هەتا رۆژی زیندوبوونەوە کە کاتی لێپرسینەوەمانە.

سوپاسی خوای پەروەردگار دەکەم کە پاش ئەوەی یارمەتی داین و لەخزمەتی چەند هاوەڵێکمدا توانیمان پوختەی صەحیحی موسلیم بگۆڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی، کە تا ئێستا دووجار چاپکراوە، ئێستاش پەروەردگاری میهرەبان یارمەتیدام و هەستام بە ئامادەکردن و وەرگێرانی فەرمووده هاوبەشەکانی موسلیم و بوخاری، واتە ئەو فەرموودانەی ئەو دوو پێشەوا بەڕێزە هەردووکیان لە صەحیحەکانیاندا هێناویانە. شایانی باسە ئەو فەرموودانەی ئەو دوو پێشەوایە هێناویانە لە ریزی پێشەوەی کتێبەکانی سوننەدان، کەواتە ئەو فەرموودانە ساغکراوەترین فەرموودەن، هیچ گومانێك ناتوانێ روویان تێبکات، لەبەر ئەوە ئێمەش بە پێویستمان زانی بە کوردی بیخەینە بەر دیدی خوێنەرانی کوردمان.

لەم بەرهەمەدا سوودی زۆرمان لە کتێبی ناوبراو وەرگرتووە، هەر بۆیە زۆر سوپاسی مامۆستایانی بەڕێز (بورهان محەمەدئەمین، عومەر ئەحمەد نیزامی، محەمەد محەمەد حەمەمیرزا، بورهان شێخ محەمەد سەمیع) دەکەم کە یارمەتی زۆریان داوم بۆ ئەم کتێبە، خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە. هەروەها دەستەواژەی فەرموودەکان و ریزبەندیی بابەتەکانیشمان هەر لە صەحیحی موسلیم وەرگرتووە، لە کتێبی (مختصر صحیح مسلم) کە زانای گەورە (زکی الدین عبد العظیم عبد القوی المنذری) (خوا پاداشتی بداتەوە) کۆیکردوونەتەوەو مامۆستای بەڕێز (دکتور مصطفی دیب البغا) لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، چونکە دۆزینەوەی فەرموودە زۆر ئاسانە بۆ خوێنەر، بەڵام ریزبەندیی پێشەوا بوخاری زۆر گرانەو دۆزینەوەی فەرموودە تیایدا زۆر قورسە، بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبەش سوودمان لە کتێبی (پوختەی صەحیحی موسلیم) کە وەرگێرانی بەندەو چەند هاوەڵێکە، هەروەها کتێبی (اقتران النيرين فی مجمع البحرين) لە وەرگێرانی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا

رەشـید بـەگی بابانـەو، لـە ئامـادەکردن و بەچـاپگەیاندنی مامۆسـتا محەمـەد عـەلی قەرەداغیە. خوای گەورە پاداشتی هەموویان بداتـەوەو، بیکـات بـە توێشـووی ڕۆژی قیامەتیان. هەروەها سوودمان لە سیدی (المكتبة الاسـلامية) وەرگرتـووە هیـوادارین سوودبەخش بێـت بـۆ موسـڵمانان و، ببێتـە هـۆی زیـاتر پابەنـدبوونیان بـە گوفتـارو ڕەفتارو هەڵسـوکەوتەکانی پێغەمبـەری خـواوە درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت. داواکاریشم لە خوێنەری بەرێز هـەر کەموکورپیـەك، یـا هەڵەیـەکی لـەم کتێبـەدا بینـی ئاگادارم بکاتەوە، بۆ ئەوەی خۆی خێرێکی دەست بکەوێت و ئێمـەش لـە چـاپەکانی داهاتوویدا ڕاستی بکەینەوە.

**حەمە کەریم عەبدوڵا**
**سلێمانی**
**٢٠٠٨/٢/١**

# بەشی یەکەم: ئیمان و باوەڕ

## (١) سەرەتای ئیمان ـ باوەڕ ـ وتنی: (لا اله الا الله) یە.

١-عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمًا بَارِزًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ، يَا رَسُولَ اللَّه مَا الْإِيمَانُ؟ قَالَ: "أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، ومَلَائِكَتِهِ، وكِتَابِهِ، ولِقَائِهِ، ورُسُلِه، وتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ الْآخِرِ" قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه مَا الْإِسْلَامُ؟ قَالَ: "الْإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا، وتُقِيمَ الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ، وتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وتَصُومَ رَمَضَانَ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه مَا الْإِحْسَانُ؟ قَالَ: "أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنَّكَ إِنْ لَا تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: "مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ، ولَكِنْ سَأُحَدِّثُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا ولَدَتِ الْأَمَةُ رَبَّهَا فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وإِذَا كَانَتِ الْعُرَاةُ الْحُفَاةُ رُءوسَ النَّاسِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، وإِذَا تَطَاوَلَ رِعَا و الْبَهْمِ فِي الْبُنْيَانِ فَذَاكَ مِنْ أَشْرَاطِهَا، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ". ثُمَّ تَلَا (ﷺ): (إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ ويُنَزِّلُ الْغَيْثَ ويَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ومَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا ومَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ )لقمان: ٣٤(قَالَ ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "رُدُّوا عَلَيَّ الرَّجُلَ، فَأَخَذُوا لِيَرُدُّوهُ فَلَمْ يَرَوْا شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ لِيُعَلِّمَ النَّاسَ دِينَهُمْ" ([٢] بخاري/ الايمان (سؤال جبريل النبي عن الايمان والاسلام وعلم الساعة/٥٠/)

(ابوهريرة) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) لەناو خەڵكیدا دەركەوت، پیاوێك هاتە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوەڕ چیە؟ فەرمووی: "باوەڕت هەبێت بەخوا، بەفریشتەكانی، بەكتێبەكانی، بەدیدارو بەخزمەت گەیشتنی، بەپێغەمبەرانیی. هەروەها باوەڕت هەبێت بەزیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت". ئینجاوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئیسلام چیە؟ فەرمووی: "ئیسلام ئەوەیەكە: خواپەرستی و هیچ شتێك نەكەیت بەهاوبەشی، نوێژە فەرزەكانت بكەیت، زەكاتی دیاریكراو بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت". وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیحسان چیە؟ فەرمووی: "وا خوا بپەرستیت وەكو چاوت لێی بێت، چونكە ئەگەر تۆ چاوت لەو نەبێت ئەو چاوی لە تۆیە) ئینجاوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، كەی ڕۆژی قیامەتە؟ فەرمووی:"پرسیار لێكراو لەوبارەیەوە (كەهاتنی قیامەتە) زاناتر نییە لەپرسیاركار،

بەلاَم باسی نیشانەکانیت بۆ دەکەم: هەرکاتێ کەنیزەك گەورەکەی خۆی بوو[1] ئەوە لەنیشانەکانیەتی. هەروەها ئەگەر رووت و پێخاوسەکان ببنە کاربەدەستانی خەڵك، ئەوەش لەنیشانەکانیەتی. هەروەها هەرکاتێ شوانەکانی مەڕومالاَت شانازییان کرد بەبەرزیی کۆشکەکانیانەوە(دوای ئەوەی دەست دەگرن بەسەر کاروباریاندا) ئەوەش لەنیشانەکانیەتی.

پێنج شتیش هەن کەس نایانزانێت جگە لەخوا، ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) (لقمان : ٣٤). واتە: لەراستیدا هەر خوا کاتی هاتنی رۆژی قیامەت دەزانێت، هەرئەویش باران دەبارێنێت، هەرئەویش دەزانێت چی لەمنداڵداندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەینێ چی دەکات، هیچ کەسێك نازانێت لەچ خاکێکدا دەمرێت، لەراستیدا خوا زاناو شارەزایە. ئینجا پیاوەکە پشتی هەڵکردوو رۆیشت، پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی: "ئەو پیاوەم بۆ بگێڕنەوە، کاتێ ویستیان بیگێڕنەوە، کەسیان نەبینی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:"ئەوە جوبرەئیل بوو هات بۆ ئەوەی خەڵك فێری ئایینەکەیان بکات".

**( ٢ ) فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن: ( لا اله الا الله )**

٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) واسْتُخْلِفَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَهُ، وكَفَرَ مَنْ كَفَرَ مِنَ الْعَرَبِ، قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) لِأَبِي بَكْرٍ (ﷺ): كَيْفَ تُقَاتِلُ النَّاسَ وقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَقَدْ عَصَمَ مِنِّي مَالَهُ ونَفْسَهُ إِلَّا بِحَقِّهِ، وحِسَابُهُ عَلَى اللَّهِ". فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) واللَّه لَأُقَاتِلَنَّ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الصَّلَاةِ والزَّكَاةِ، فَإِنَّ الزَّكَاةَ حَقُّ الْمَالِ واللَّه لَوْ مَنَعُونِي عِقَالًا كَانُوا يُؤَدُّونَهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهِ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ): فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ رَأَيْتُ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ قَدْ شَرَحَ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ لِلْقِتَالِ فَعَرَفْتُ أَنَّهُ الْحَقُّ. (بخاري/ الزكاة/ وجوب الزكاة/١٢٢٥)

---

[1] مەبەست لەمەش ئەوەیە: رۆژێك دێت منداڵ رێز لەباوكو دایكی ناگرێت،وەكو كۆیلە سەیریان دەكات

(ابوهريرة)(ﷺ)دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کردو، ئەبوبەکر کرا بە خەلیفە، کۆمەڵێك لەعەرەبەکان پاشگەز بوونەوە، (عمری کوری خطاب)(ﷺ)بە (ابوبکر)ی (ﷺ) وت: چۆن دەجەنگیت لەگەڵ ئەو خەڵکەدا لەکاتێکا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:"فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا دەڵێن: (لا الە الا الله)هەرکەس وتی: (لا الە الا الله) خۆی و سامانیشی پارێزراوە**، تەنها بەهەقی خۆی نەبێت، لێپرسینەوەشی لەلای خوایە، ئەبوبەکر وتی: سوێند بەخوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوانەی جیاوازی دەکەن لەنێوان نوێژو زەکاتدا[1]، چونکە زەکات مافێکە لەسامانداا، سوێند بەخوا ئەگەر پەتەگوریسێکم نەدەنێ کەداویانە بەپێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ئەوە دەجەنگم لەگەڵیاندا. عومەر وتی: سوێند بەخوا هەر خێرا بۆم دەرکەوت کە خوا دڵی ئەبوبەکری کردۆتەوە بۆ جەنگ ئینجا بۆیشم دەرکەوت کە ئەو لەسەر هەقە.

٣ ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ويُقِيمُوا الصَّلَاةَ، ويُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءهُمْ وأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا، وحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ".(بخاري/ الايمان/ (فأن تابوا واقاموا الصلاة ...)٢٥)

(عبدالله ی کوری عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا هەتا شایەتی دەدەن کە هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله)، موحەمەدیش رەوانەکراوی خوایە، نوێژیش بکەن، زەکاتیش بدەن ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوا خوێن و سامانیان لەلای من پارێزراوە، مەگەر بەهەقی خۆی، لێپرسینەوەشیان لەلای خوایە".

** لەو سەردەمەدا خەڵکی بتیان پەرستووە ، بۆیە فشاریان خستۆتە سەریان کەواز لەو بتپەرستیە بهێنن و خوای تاك و تەنیا بپەرستن، ئەگینا فشار نەخراوەتە سەر مەسیحی و جولەکەکان کەئایینی ئاسمانیان هەبووە.

[1] واتە ئەو جەنگە بەرگری بووە لەمانی هەژاران کە زەکاتە.

## ( ٣ ) پیاوێك كەسێك لەكافرەكانی كوشت دوای ئەوەی وتبوی ( لااله الا الله )

٤ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زيد (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَرِيَّةٍ، فَصَبَّحْنَا الْحُرَقَاتِ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَأَدْرَكْتُ رَجُلًا، فَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَطَعَنْتُهُ، فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ، فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وقَتَلْتَهُ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا قَالَهَا خَوْفًا مِنَ السِّلَاحِ. قَالَ: "أَفَلَا شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ أَقَالَهَا أَمْ لَا". فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا عَلَيَّ حَتَّى تَمَنَّيْتُ أَنِّي أَسْلَمْتُ يَوْمَئِذٍ. قَالَ: فَقَالَ سَعْدٌ: واناءاللَّهِ لَا أَقْتُلُ مُسْلِمًا حَتَّى يَقْتُلَهُ ذُو الْبُطَيْنِ. يَعْنِي أُسَامَةَ. قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ تعالى: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ) )الانفال: ٣٩( فَقَالَ سَعْدٌ: قَدْ قَاتَلْنَا حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ، وَأَنْتَ وَأَصْحَابُكَ تُرِيدُونَ أَنْ تُقَاتِلُوا حَتَّى تَكُونَ فِتْنَةٌ. (بخاري / المغازي/ بعث النبي(ﷺ) اسامة بن زيد الى الحروقات .../ ٤٠٢١)

(اسامە) كوری (زید)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەمەفرەزەیەك ناردینی بۆ سەرتیرەی (حروقات) لەهۆزی (جوهەینە) دەمەوبەیان گەیشتینە ئەویَ(كەوتنە جەنگەوە) گەیشتم بەپیاوێك، وتی: (لا اله الا الله) منیش شمشێرێكم لێدا كوشتم، بەلاَم بوو بەگرێ لەدڵما، گێڕامەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: "ئایا وتی(لا اله الا الله)و كوشتیشت" دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەراستیدا ئەو لەترسی چەكەكە وای وت. فەرمووی: "ئایا دڵت لەت كرد تابزانیت لەبەرئەوە وتویەتی یان نا"، بەردەوام پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی دەوتەوە بەسەرما هەتا خۆزگەم خواست كە ئەو رۆژە موسڵمان ببومایە. دەڵێ: سەعدیش وتی: بەخوا من هیچ موسڵمانێك ناكوژم هەتا ورگ زل نەیكوژێت. واتە ــ ئوسامەــ دەڵێ: ئینجا پیاوێك وتی: ئایا خوای گەورە نەیفەرمووە:(بجەنگن لەگەڵیان بانەبنە مایەی فیتنەو ئاینیش هەمووی ببێ بەئایینی خوا). سەعدیش وتی: ئێمە جەنگاوین بۆ ئەوەی فیتنە روونەدات، بەلاَم تۆو هاوەڵەكانت دەتانەوێت: بجەنگن بۆ ئەوەی فیتنە بەرپابكەن.

## (٤) هەركەس بەئیمانەوە گەڕایەوە بۆ لای خواو هیچ گومانی نەبوو دەچێتە بەهەشتەوە

٥ـ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) لَيْسَ بَيْنِي وبَيْنَهُ إِلَّا مُؤْخِرَةُ الرَّحْلِ، فَقَالَ: "يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ". قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللّه وسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: "يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ". قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللّه وسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: "يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ". قُلْتُ لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللّه وسَعْدَيْكَ، قَالَ: "هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللّه عَلَى الْعِبَادِ". قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: "فَإِنَّ حَقَّ اللّه عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ ولَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا". ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثم قَالَ: "يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ". قُلْتُ: لَبَّيْكَ يا رَسُولَ اللَّه وسَعْدَيْكَ، قَالَ: "هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللّه إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ". قُلْتُ: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: "أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ". (* بخاري / الجهاد/ اسم الفرس والحمار/٢٧٠١)

(معاذ)كوری(جبل)(ﷺ)دەڵێ: من لەپشت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) سوار بووبووم، لەنێوان من و ئەودا هیچ نەبوو جگە لەپاڵپشتێ زینەكە، فەرمووی: "ئەی (معاذ)كوڕی(جبل" وتم: ئەمر بكە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ماوەیەكیتر ڕۆیشت دووبارە فەرمووی: "ئەی(معاذ)كوری (جبل" وتم: ئەمركە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ماوەیەكی تریش ڕۆیشتوو فەرمووی: "ئەی(معاذ)كوڕی(جبل) وتم: ئەمركە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئایا دەزانی مافی خوا لەسەر بەندەكانی چییە؟"، دەڵێ: وتم : خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ) زاناترن، فەرمووی: "لەڕاستیدا مافی خوا لەسەر بەندەكانی ئەوەیە كە بیپەرستن و هیچ شتێك نەكەن بەشەریكی" ماوەیەكی تریش ڕۆیشت، دووبارە فەرمووی: "ئەی(معاذ)كوڕی ـ جبل" وتم: ئەمربكە لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). فەرمووی: "ئایا دەزانی مافی بەندەكان چییە لەسەر خوا ئەگەر وایان كرد" وتم: خواو پێغەمبەرەكەی زاناترن. فەرمووی: (ئەوەیە كە سزایان نەدات".

## ( ٥ ) ئيمان چيه؟ روونكردنەوەی نيشانەكانی

٦ـ عَنْ أَبِي ذَرّ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "الْإِيمَانُ بِاللَّهِ وَالْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ". قَالَ: قُلْتُ: أَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: "أَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا وَأَكْثَرُهَا ثَمَنًا". قَالَ: قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: "تُعِينُ صَانِعًا أَوْ تَصْنَعُ لِأَخْرَقَ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ ضَعُفْتُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ؟ قَالَ: "تَكُفُّ شَرَّكَ عَنِ النَّاسِ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ مِنْكَ عَلَى نَفْسِكَ". (بخاري/ العتق/ أي الرقاب افضل / ٢٣٨٢)

(ابي ذر)(ﷺ) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) : چاكترين كار كامەيە ؟ فەرمووی: "باوەڕ بەخواو جيهاد لەپێناويدا" دەڵێ: وتم: چاكترين ئازادكردن كامەيە (ئازادكردنی كۆيلە) فەرمووی: (گرانترينيان و بەبەهاترينيان لای خاوەنەكەيان) دەڵێ: وتم: ئەگەر نەمكرد؟ فەرمووی: "يارمەتی پيشەكارێك بدەيت يايارمەتی كەسێك بدەيت پيشە باش نازانێ يا هيچ پيشەيەكی نييە".

دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا پێت چۆنە ئەگەر بێتوانابووم لەهەندێ كار؟ فەرمووی: "شەڕو خراپەت لەخەڵكی لابدە، ئەوەش خێرێكە لەتۆوە بۆ خۆت"

## ( ٦ ) فەرمانكردن بەئيمان، پەناگرتن بەخوا لە وەسوەسەی شەيتان

٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَزَالُ النَّاسُ يَسْأَلُونَكُمْ عَنِ الْعِلْمِ حَتَّى يَقُولُوا: هَذَا اللَّهُ خَلَقَنَا، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ". قَالَ: وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِ رَجُلٍ، فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، قَدْ سَأَلَنِي اثْنَانِ وَهَذَا الثَّالِثُ. أَوْ قَالَ: سَأَلَنِي وَاحِدٌ، وَهَذَا الثَّانِي. (بخاري/ اقتران النيرين ج٥ ص٢٨٣)

(ابوهريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "بەردەوام خەڵك پرسيارتان لێدەكەن لەبارەی زانستەوە تەنانەت دەڵێن: ئەوە خوا ئێمەی دروست كردووە، ئەی كێ خوای دروست كردووە، (ابوهريرة) دەستی پياوێكی گرتبوو، ئينجا وتی: خواو پێغەمبەرەكەی راستيان فەرمووە، دووكەس ئەم پرسيارەيان لێكردووم ئەمەش سێيەمە ، يان وتی: يەكێك لێی پرسيم ئەمەش دووەمە..

## ( ٧ ) بەڵگەكانی پێغەمبەرو ( ﷺ ) باوەڕهێنان پێی

٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَا مِنَ الْأَنبياء مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الْآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَى اللَّهُ

إِلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري / فضائل القران/ كيف نزل الوحي /٤٦٩٦)

(ابوهريرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "لەپێغەمبەراندا هیچ پێغەمبەرێکیان نەبووە کە بەڵگەو سەراسیمەی وای پێنەبەخشرابێت کەوێنەی ئەوە خەڵك ئیمانی پێهێناوە ئەوەی منیش هێناومە (وحی)ە خوا ناردویەتە سەرم، خوازیارم لەهەموویان شوێن کەوتەم زیاتر بێت".

٩- عَنْ صَالِحِ بْنِ صَالِحٍ الْهَمْدَانِيِّ، عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ، سَأَلَ الشَّعْبِيَّ فَقَالَ: يَا أَبَا عَمْرٍو، إِنَّ مَنْ قِبَلَنَا مِنْ أَهْلِ خُرَاسَانَ يَقُولُونَ فِي الرَّجُلِ إِذَا أَعْتَقَ أَمَتَهُ ثُمَّ تَزَوَّجَهَا: فَهُوَ كَالرَّاكِبِ بَدَنَتَهُ. فَقَالَ الشَّعْبِيُّ: حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ بْنُ أَبِي مُوسَى عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "ثَلَاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وأَدْرَكَ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَآمَنَ بِهِ واتَّبَعَهُ وصَدَّقَهُ، فَلَهُ أَجْرَانِ. وعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ تَعَالَى، وحَقَّ سَيِّدِهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ. ورَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَّاهَا فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا، ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ". ثُمَّ قَالَ الشَّعْبِيُّ لِلْخُرَاسَانِيِّ: خُذْ هَذَا الْحَدِيثَ بِغَيْرِ شَيْءٍ، فَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يَرْحَلُ فِيمَا دُونَ هَذَا إِلَى الْمَدِينَةِ. (بخاري / تعليم الرجل امته وأهله/٩٧)

(صالح بن صالح الهمدانی) دەڵێ: (شعبی) دەڵێ: پیاوێکی خەڵکی خۆراسانم دی، پرسیاری لە(شعبی) کردوو وتی: ئەی(ابو عمرو) خەڵکی خۆراسانی لای ئێمە هەندێکیان دەڵێن: ئەو پیاوەی کەنیزەکەکەی خۆی ئازاد بکات و پاشان خۆی مارەی بکات، وەکو ئەوە وایە کەوشترێك بکات بەخێرو بەلاَم خۆی سواری ببێت ئینجا(شعبی) وتی: (ابوبردە) کوری (ابو موسی) لەزاری باوکیەوە بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "سێ کەس دووجار پاداشت دەدرێنەوە: پیاوێکی(ئەهلی کیتاب) باوەری بەپێغەمبەرەکەی هێنابێ و گەیشتبێت بەپێغەمبەری ئیسلامیش(ﷺ) باوەری بەویش هێنابێت و شوێنی کەوتبێ و بەراستی زانیبێت دوو پاداشتی هەیە. دووەمیش کۆیلەیەك مافی خوای گەورەی ئەنجام دابێت لەگەڵ مافی

خاوەنەکەی، ئەمیش دوو پاداشتی هەیە، سێیەمیش پیاوێك کەنیزەکێکی هـەبووبێت و بەباشی ژیاندبێتی ئینجا بەباشی پەروەردەی کردبێت، دوای ئەوە ئازادی کردبێت و مارەی کردبێت[1]، ئەمیش دووپاداشتی هەیە. ئینجا (شعبی) بـەکابرای خۆراسـانی وت: پیاوی وا هەبووە بۆ کەمتر لەم فەرموودەیەش لێرەوە چووە بۆ مەدینە.

## ( ٨ ) سێ شت هەن لە هەر کەسدا هەبن شیرینی ئیمان دەچێژێت

**١٠ أنْ يُقْذَفَ ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وجَدَ بِهِـنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: مَنْ كَانَ اللَّهُ ورَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّـهُ إِلَّا لِلَّهِ، وأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ –بَعْدَ أَنْ أَنْقَذَهُ اللَّهُ مِنْهُ– كَمَا يَكْرَهُ فِي النَّـارِ". (بخاري / الايمان / حلاوة الايمان/ ١٦، ٢١)**

(انس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "سێ شت هەن هەر کەس ئـەو سـیانەی تێیـدابێت شـیرینی ئیمـان بەدەسـت دەهێنـێ، هەرکـەس خـواو پێغەمبـەر(ﷺ)ی لەهەمووشـت خۆشـتر بووێـت، هـەروەها هەرکەسێکی خۆشویسـت تەنها لەبەرخوا خۆشی بووێت، ئینجا پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر ــ دوای ئەوەی خوا رزگاری کرد لێی وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە".

## ( ٩ )چوارشت هەن لەهەرکەسدا هەبن ئەوە مونافیقی تەواوە

**١١ــعَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، ومَنْ كَانَتْ فِيهِ خَلَّةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيـهِ خَلَّـةٌ مِـنْ نِفَـاقٍ حَتَّـى يَـدَعَهَا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وإِذَا وعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ". غَيْـرَ أَنَّ فِـي حَـدِيثِ سُفْيَانَ: "وَإِنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ". (بخاري/ الايمان/ علامة المنافق/٣٤)**

(عبدالله) کوری(عمرو)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "چوارشت هەرکەس تیایدابێت ئەوە مونافیقی تەواوە، هەرکەسیش یـەکێکیانی تێدابێت ئـەوە

---

[1] لەو سەردەمەدا کـەنیزەك بـاوبووە، بۆیـە ئیسـلام بەهـەموو شـێوەیەك هـەوڵی نەهێشـتنی داوەو ، بێگومان کەئازادکراو کەسی نەبوو بەخێوی بکـات ئەگـەر خـۆی مارەیبکـات ئـەوا کـارێکی زۆر باشـی کردووە لەبەرژەوەندی ئەو.

سیفەتێکی مونافیقی تێدایە، هەتا دەستی لێهەڵدەگرێت: هەرکات قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر پەیمانیدا بە کەسێك بیشکێنێت، ئەگەر بەڵێنیدا سەرپێچی لێبکات، ئەگەر دژایەتی کەسێکی کرد لەهەق لابدات و ستەمی لێبکات".

١٢ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وإِذَا وعَدَ أَخْلَفَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ". (بخاري/ الايمان/ علامة المنافق/٣٣)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "نیشانەی مونافیق سیانە: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا نایباتە سەر، ئەگەر سپاردەی لادانرا خیانەتی لێدەکات).

## (١٠) نموونەی ئیماندار وەکو کشتوکاڵ و نمونەی مونافیق و کافریش وەکو سنەوبەر وایە

١٣ـعن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْخَامَةِ منَ الزَّرْعِ تُفِيئُهَا الرِّيحُ، تَصْرَعُهَا مَرَّةً وتَعْدِلُهَا أُخْرَى حَتَّى تَهِيجَ. ومَثَلُ الْكَافِرِ كَمَثَلِ الْأَرْزَةِ الْمُجْذِيَةِ عَلَى أَصْلِهَا، لَا يُفِيئُهَا شيء حَتَّى يَكُونَ انْجِعَافُهَا مَرَّةً واحِدَةً". وفي الرواية: "وتعدلُها مرةً، حتى يأتيَهُ أجلهُ، و مَثَلُ المنافقِ الأرزَةِ المجذيةِ التي لا يصيبُها شيء". (بخاري/ المرضى/ ماجاء في كفارة المرض/٥٣١٩)

(كعب)كوری(مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "نموونەی ئیماندار وەکو رووەکێکی تەڕی تازە رواو وایە، بادەیلەرزێنێ، بەملاو بەولادا لاری دەکاتەوە، جارێك زۆر لاری دەکاتەوە، جارێکیش بەرزی دەکاتەوە، هەتا وشك دەبێت. نمونەی کافریش وەکو سنەوبەرێك وایە لەسەر قەدەکەی راوەستاوە، هیچ شتێك نایجولێنی هەتا هەڵکەندنی بەیەکجاری" لەریوایەتەتێکیشدا "جارێکیش راستی دەکاتەوە، هەتا کۆتایی ژیانی دێت، نمونەی مونافقیش وەکو سنەوبەرێکی پتەو وایە هیچ شتێکی تووش نابێت" (واتە: مونافیق تووشی دەردو بەلای دونیایی نابێت تابیبێتە کەفارەتی گوناهی).(١١) نموونەی موسڵمان نمونەی دارخورمایە

١٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ شِبْهِ -أَوْ: كَالرَّجُلِ- الْمُسْلِمِ، لَا يَتَحَاتُّ ورَقُهَا، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ". قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، ورَأَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وعُمَرَ لَا يَتَكَلَّمَانِ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ أَوْ

أَقُولَ شَيْئًا، فَقَالَ عُمَرُ: لَأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وكَذَا. (بخاري/ العلم / قول المحدث حدثنا /٦١)

(عبدالله) كوڕی(عمر)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین فەرمووی: "ئاگادارم بکەن لەدرەختێك وێنەی موسڵمان بێت یا : وەکوپیاوێکی موسڵمان، کە گەڵاکانی ناوەڕێت و هەموو کاتێك بەری خۆی دەدات".

(ابن عمر) وتی: هات بەدڵما ئەوە دارخورمایە، (عمر)و (ابوبکر)م بینی قسەیان نەدەکرد، منیش پێم ناخۆش بوو قسەبکەم یاشتێك بڵێم عومەر وتی: ئەگەر بتوتایە ئەوەندەو ئەوەندەم لەلاخۆشتربوو.

## (١١) شەرمکردن بەشێکە لە ئیمان

١٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "الْإِيمَانُ بِضْعٌ وسَبْعُونَ –أَوْ: بِضْعٌ وسِتُّونَ– شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، والْحَيَا و شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ". (بخاري/ الايمان/ امور الايمان/٩)

(ابوهریره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئیمان حەفتاو ئەوەندە ـ یا شەست و ئەوەندە ـ بەشە ، گەورەترینیان وتنی شایەتومانە، بچووکترینیان لابردنی کۆسپێکە لەسەر ڕێگایەك، شەرم و حەیاش بەشێکە لەئیمان".

١٦ـ عن أبي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ فِي رَهْطٍ، مِنَّا وفِينَا بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ، فَحَدَّثَنَا عِمْرَانُ يَوْمَئِذٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "الْحَيَا و خَيْرٌ كُلُّهُ. أَوْ قَالَ: الْحَيَا و كُلُّهُ خَيْرٌ". فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: إِنَّا لَنَجِدُ فِي بَعْضِ الْكُتُبِ –أَوِ الْحِكْمَةِ– أَنَّ مِنْهُ سَكِينَةً ووَقَارًا للَّه تعالى، ومِنْهُ ضَعْفٌ. قَالَ: فَغَضِبَ عِمْرَانُ حَتَّى احْمَرَّتَا عَيْنَاهُ، وقَالَ: أَلَا أَرَانِي أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وتُعَارِضُ فيه؟ قَالَ: فَأَعَادَ عِمْرَانُ الْحَدِيثَ، قَالَ: فَأَعَادَ بُشَيْرٌ، فَغَضِبَ عِمْرَانُ، فَمَا زِلْنَا نَقُولُ: إِنَّهُ مِنَّا يَا أَبَا نُجَيْدٍ، إِنَّهُ لَا بَأْسَ بِهِ. (بخاري/ الادب/ المياه/٥٧٦٦)

(ابو قتادة)(ﷺ) دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێك لای(عمران) کوڕی (حُصین) بووین، (بشیر) کوڕی (کعب)یشمان لەناودابوو،(عمران) قسەی بۆکردین و وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "شەرم و حەیا خێرە هەمووی" یان فەرمووی: (شەرم و حەیا هەمووی

خێره) ئینجا (بشیر) کوڕی (کەعب) وتی: ئێمە لەهەندێ کتێبدا یاحیکمەتدا - دەبینین، شەرم بەشێکی ئارامی و لەسەرخۆییەو ڕێزگرتنە لەخوای گەورە، هەندێکیشی لاوازییە، دەڵێ: عمران تووڕەبوو هەتا چاوەکانی سوور هەڵگەران، وتی: ئایا نابینی من لە پێغەمبەری خواوە بۆت دەگێڕمەوە کەچی تۆ نارەزایی تیادەردەبڕیت؟ دەڵێ: (عمران) فەرموودەکەی دووبارەکردەوە، وتی: (بشیر)یش قسەکەی خۆی دووبارەکردەوە، ئینجا (عمران) تووڕە بوو، ئێمەش بەبەردەوامی دەمانوت: ئەی (ابو نجید) ئەویش لەئێمەیەو پیاوێکی خراپ نییە.

## (١٢) دراوسێتی چاك و ڕێزی میوان بەشێکە لەباوەڕە

١٧ـ عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَسْكُتْ". (بخاري/ الادب/ من كان يؤمن بالله واليوم الاخر / ٥٦٧٣)

(ابو شريح الخزاعی) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، با چاك بێت لەگەڵ دراوسێکەی، هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە بارێز لە میوانەکەی بگرێت، هەرکەس باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە با چاك بڵێت یان بێدەنگ بێت".

## (١٣) هەرکەس دراوسێکەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت ناچێتە بەهەشت

١٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ". (بخاري/ الادب/ اثم من لامن جاره /٥٦٧٠)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ناچێتە بەهەشت ئەوەی دراوسێکەی لەشەڕو خراپەی ئەمین نەبێت". (١٤) گەورەترین گوناه هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە.

١٩ـ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ -ثَلَاثًا-: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَشَهَادَةُ الزُّورِ. أَوْ: قَوْلُ الزُّورِ". وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُتَّكِئًا فَجَلَسَ، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ. (بخاري/ الشهادات/ ماقيل في شهادة الزور/ ٢٥١١)

(عبدالرحمن) کوڕی (ابی بکره) دەڵێ: باوکم وتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین، فەرمووی: ئایا ئاگادارتان نەکەم لەگەورەترین گوناهی گەورە؟، سێ جار ئەمەی فەرموو ئینجا فەرمووی: "هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، ئازاردانی دڵی دایك و باوك، شایەتیدانی درۆو ناهەق یان وتەی درۆو ناهەق". لەوکاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) پاڵی دابووەوە ئینجا دانیشت بەردەوام ئەمەی دوایی دووپات دەکردەوە، هەتا وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو.

## ( ١٤ ) گەورەترین گوناه

**٢٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ". قيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه ومَا هُنَّ؟ قَالَ: "الشِّرْكُ بِاللَّه، والسِّحْرُ، وقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وأَكْلُ الرِّبَا، وأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، والتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وقَذْفُ الْمُحْصنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ". (بخاري / الوصايا / ان الذين ياكلون اموال اليتامى /٢٦١٥)**

(ابوهريره)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "دووربکەونەوە لەوحەوت گوناهەی کەئادەمیزاد تیادەبەن" وتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: "هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، جادوو، کوشتنی ئادەمیزاد کەخوا حەرامی کردووە، مەگەر بەهەقی خۆی، سوو خواردن، خواردنیماڵی هەتیوو، پشت هەڵکردن لەڕۆژی جەنگی کافراندا، بوختان کردن بۆ ئافرەتانی باوەڕداری بێئاگای پاکداوێن".

## ( ١٥ ) لادان لەرشتەی باوك كوفره

**٢١ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: لَمَّا ادُّعِيَ زِيَادٌ لَقِيتُ أَبَا بَكْرَةَ (رضي الله عنه)، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذَا الَّذِي صَنَعْتُمْ؟ إِنِّي سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وقَّاصٍ يَقُولُا: سَمِعَ أُذُنَايَ مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وهُوَ يَقُولُ: "مَنِ ادَّعَى أَبًا فِي الْإِسْلَامِ غَيْرَ أَبِيهِ، يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ، فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ". فَقَالَ أَبُو بَكْرَةَ: وأَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).(بخاري/ الفرائق /من ادعى الى غير أبيه/٦٣٨٥)**

(ابو عثمان) دەڵێ: کاتێ (زیاد)یان کرد بەکوڕی پیاوێك کەباوکی خۆی نەبوو، بە(ابوبکره) گەیشتم(رضي الله عنه) پێموت: ئەو کارە چییە کردووتانە؟ من لە(سعد)کوڕی(ابی وقاص)م بیستووە دەیوت: بەم دوو گوێیەم لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەرکەس لەئیسلامدا جگە لەباوکی خۆی باوکێکیتر بۆ خۆی دابنێ،

بیشزانیٚ کەباوکی نییە، ئەوە بەهەشت حەرامە لێی).ابوبکرە وتی: منیش (ئەوەم) لەپێغەمبەر(ﷺ) بیستووە.

## ( ١٦ ) ئەوەی بەبراکەی بڵێ کافر

٢٢ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "لَيْسَ مِنْ رَجُلٍ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وهُوَ يَعْلَمُهُ إِلَّا كَفَرَ، ومَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، ولْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. ومَنْ دَعَا رَجُلًا بِالْكُفْرِ أَوْ قَالَ: عَدُوَّ اللَّهِ، ولَيْسَ كَذَلِكَ، إِلَّا حَارَ عَلَيْهِ". (بخاري/ المناقب/ نسبة اليمين الى اسماعيل/٣٣١٧)

(ابوذر)(رضي الله عنه)دەڵێ: لەپێغەمبەری خوای(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەرکەسێك بەناوی جگە لەباوکیەوە ناوی خۆی بنێت بیشزانێت، ئەوە کافر دەبێت، هەرکەسیش خۆی بەخاوەنی شتێك بزانێت کەهی خۆی نەبێت، ئەوە لەئێمە نییە، باجێی خۆی لەناو ئاگردا خۆش بکات، هەرکەسیش پیاوێك بەکافر بانگ بکات، پێی بڵێ : دوژمنی خوا، وایش نەبێت، ئەوە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە".

٢٣ـ عن عَبْدُ اللَّه بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ: رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَيُّ الذَّنْبِ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّه؟ قَالَ: "أَنْ تَدْعُوَ للَّه نِدًّا و هُوَ خَلَقَكَ". قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "أَنْ تَقْتُلَ ولَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ". قَالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ". فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّوجَلَّ تَصْدِيقَهَا: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ولَا يَزْنُونَ ومَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا). (الفرقان:) (اقتران/ النيرين/ بخاري/ ١٤٨/٢٨٠ ب ١ ل٤٠٤)

(عبدالله)کوڕی (مسعود)(رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کام گوناهە لای خوا گەورەترین گوناهە؟ فەرمووی: "ئەوەیە هاوەڵ بۆ خوا دابنێی کە ئەو دروستی کردوی" وتی: ئینجا چیتر؟ فەرمووی: "ئەوەیەکە منداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی لەگەڵتا دەخوات (واتە لەترسی بەخێوکردنی)، وتی: ئینجا چیتر؟ فەرمووی: "ئەوەیە دەست درێژی لاقەکردن بکەیتە سەر خێزانی دراوسێت" خوای گەورەش بۆ بەڕاستگێڕانی قسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً) (الفرقان : ٦٨) واتە: ئەوانەی جۆرە

خوایەکیتر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کەخوا کوشتنی حەرام کردووە مەگەر بەهەق و ڕەوا، زیناش ناکەن، ئەوەی ئەو جۆرەکارە خراپانە ئەنجام بدات ئەواتووشی سزادەبێت.

## ( ١٧ ) کەسێك بمرێو شەریکی بۆ خوا دانەنابێ دەچێتە بەهەشت

٢٤ـ عن أَبِي الْأَسْوَدِ الدِّيلِيَّ: أَنَّ أَبَا ذَرّ (رضي الله عنه) حدَّثه أنه قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)وهُوَ نَائِمٌ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَضُ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَإِذَا هُوَ نَائِمٌ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ وقَد اسْتَيْقَظَ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: "مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ". قُلْتُ:وإِنْ زَنَى وإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: "وَإِنْ زَنَى وإِنْ سَرَقَ" قُلْتُ: وإِنْ زَنَى وإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: "وَإِنْ زَنَى وإِنْ سَرَقَ". ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: "عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرّ". قَالَ: فَخَرَجَ أَبُو ذَر وهُوَ يَقُولُ: وِنْ رَغِمَ أَنْفُ أَبِي ذَرّ. (بخاري/ الجنائز/ في الجنائز/١١٨٠)

(ابو اسود الديلى)دەڵێ: (ابو ذر)بۆی گێڕاوەتەوە وتویەتی: چوومە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوستبوو، سەرچەفێکی سپی بەسەرەوە بوو، جارێکیتر هاتمەوە هەرنوستبوو، پاشان جارێکیتر هاتمەوە خزمەتی هەستابوو، لەخزمەتیا دانیشتم، فەرمووی: "هەر بەندەیەك (لا اله الا الله)ی وتبێ و لەسەر ئەوە مردبێت، دەچێتە بەهەشتەوە". وتم: ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت؟) فەرمووی: "ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت". وتم: ئەگەر داوێن پیسی و دزیشی کردبێت؟ سێ جار فەرمووی: "با داوێن پیسی و دزیشی کردبێت) ئینجا لەچوارەم جاردا فەرمووی: (با لوتی ئەبوذریش بدات لەخۆل)، دەڵێ (ابو ذر)هاتە دەرەوەو لەبەرخۆیەوە هەر دەیوت: با لوتی ئەبوذریش بدات لەخۆڵ.

## ( ١٨ ) ئەوەی دەڵێ بەهۆی کەشوهەواوە بارا نمان بۆ باری کافرە

٢٥ـ عَنْ زَيْدِ ابْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ فِي إِثْرِ السماء كَانَتْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: "هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ". قَالُوا: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: "قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ ورَحْمَتِهِ: فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ،وأَمَّا مَنْ قَالَ مُطِرْنَا بِنَوْ و كَذَا وكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ". (بخاري/ صفة الصلاة/ يستقبل الامام الناس/٨١٠)

(زید) کوڕی(خالد الجهنی)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) نوێـژی بـەیانیی بـۆ کردین لەحودەیبیە لەدوای باران بارین، کاتێ سەلامی دایـەوە روویکـردە خەڵکەکـەو فـــەرمووی: "ئایـــا دەزانـــن پـــەروەردگارتان چـــی فـــەرمووە" وتیـــان: خـــواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) زاناترن، فەرمووی: "فەرمویەتی: بەندەکانم هەیانە بڕوای پێمە، هەشیانە کـافرە، ئەوانـەی کـە دەڵـێن: خـوای گـەورەو بەبـەزەیی خـۆی بـارانی بـۆ بارانین، ئـەوە بـاوەڕی بـەمن هەیـەو کـافرە بەئەسـتێرە، بـەڵام ئەوانـەی کـەدەڵێن: بەهۆی جووڵەی ئەستێرەکانەوە بارانمان بۆ باری ئەوە باوەڕی بەخوا نییەو بـاوەڕی بەئەستێرە هەیە".

## ( ١٩ ) ئیسلام چییە؟ ڕوونکردنەوەی نیشانەکانی

**٢٦ـ عن طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ (ﷺ) قال: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّـهِ (ﷺ) مِـنْ أَهْـلِ نَجْدٍ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، نَسْمَعُ دَوِيَّ صَوْتِهِ وَلَا نَفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ". فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ، وَصِيَامُ شَهْرِ رَمَضَانَ". قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ فَقَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ". وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الزَّكَـاةَ، فَقَـالَ: هَـلْ عَلَـيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: "لَا، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ". قَالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ مِنْهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ : "أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ". وفي روايةٍ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ : "أَفْلَحَ -وَأَبِيهِ- إِنْ صَدَقَ. أَوْ: دَخَلَ الْجَنَّـةَ -وَأَبِيـهِ- إِنْ صَـدَقَ". (بخـاري/ الايمـان/ الزكاة في الاسلام/٤٦)**

(طلحـــة)کـــوڕی(عبـــدالله)(ﷺ)دەڵـــێ: پیـــاوێکی خـــەڵکی نەجـــد هاتـــە خزمـــەت پێغەمبـەر(ﷺ) قـژی ئاڵۆزکـابوو، گوێمـان لەبۆڵـەبۆڵی بـوو بـەڵام نەمانـدەزانی چـی دەڵێت، هـەتا نزیـك بوویـەوە لەپێغەمبـەر(ﷺ) تومـەس دەیـەوێ پرسـیاری لێبکـات لەبارەی ئیسلامەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "پێنج نوێژ لەشـەوو ڕۆژێکـدا" وتـی: ئـەی بێجگـە لەوپێنجـە هیچـی تـرم لەسـەرە؟ فـەرمووی: "نـەخێر، مەگـەر خـۆت خۆبەخشـانە بیکـەیت، هـەروەها ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان" وتـی: ئایـا جگـە لـەو

(مانگـەم) لەسـەرە؟ فـەرمووی: "نـەخێر، مەگـەر خۆبەخشـانە بیکـەیت" ئینجـا پێغەمبـەر(ﷺ) نـاوی زەکاتیشـی هێنـا، پیاوەکـە وتـی: ئایا لـەوەزیاترم لەسـەرە؟ فـەرمووی: "نـەخێر، مەگـەر خۆبەخشـانە بیـدەیت" ئینجـا پیاوەکـە گەڕایـەوەو لەبەرخۆیـەوە دەیـووت: سـوێند بـەخوا نەلـەوە زیـــــاد دەکـــــەم و نەلێشـی کەمدەکەمەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر راست بکات رزگاری ئەبێت".

## ( ٢٠ ) ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە

٢٧ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ، وإِقَامِ الصَّلَاةِ، وإِيتَا و الزَّكَاةِ، وصِيَامِ رَمَضَانَ، والْحَجِّ". فَقَالَ رَجُلٌ: الْحَجُّ وصِيَامُ رَمَضَانَ؟ فقَالَ: لَا، صِيَامُ رَمَضَانَ والْحَجُّ، هَكَذَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ").(بخاري/ الايمان/ وقول النبي (ﷺ) بني/ ٨/٠٠٠)

(ابن عمر)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئیسلام لەسـەر پێـنج شت بنیات نراوە: خوا بەیەك بناسیت، نوێژ بکەیت، زەکات بدەیت، ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت، حەج بکەیت" پیاوێك وتی: حەج و ڕۆژووی ڕەمەزان؟ لەوەلاَمدا وتی: نەخێر، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج، بەم شێوەیە لەپێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە.

## ( ٢١ ) لە ئیسلامدا چی خێرە؟

٢٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: "تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ ومَنْ لَمْ تَعْرِفْ". (بخاري/ الايمان/ اطعام الطعام/١٢)

(عبدالله) کوڕی(عمرو)(رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لەپێغەمبەر(ﷺ) کرد، وتـی: لەئیسـلامدا چـی خێـرە؟ فـەرمووی: "خـۆراك ببەخشـیت و سـەلام بکـەیت لـەوەی دەیناسیت و لەوەش کەنایناسیت".

## ( ٢٢ ) جنێودان بەموسڵمان دەرچوونە لەهەق. جەنگان دژی کوفرە

٢٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وقِتَالُهُ كُفْرٌ". (بخاري/ الايمان/ خوف المؤمن من ان يحبط عمله/٤٨)

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: "جنێـودان بەمسوڵمان لادانە، جەنگیش لەگەڵیدا کوفرو".

## (٢٣) هەر كەس لە ئیسلامدا چاكە بكات، خراپەكانی سەردەمی نەفامی لێناگیرێت

٣٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بن مسعود (ﷺ): قَالَ: قَالَ أُنَاسٌ لِرَسُولِ اللَّه (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّه، أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّة؟ قَالَ: "أَمَّا مَنْ أَحْسَنَ مِنْكُمْ فِي الْإِسْلَامِ فَلَا يُؤَاخَذُ بِهَا، ومَنْ أَسَا و أُخِذَ بِعَمَلِهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ والْإِسْلَامِ". (بخاري/ استتابة المرتدين/٦٥٢٦)

(عبدالله) كوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ: خەڵكانێك وتیان بەپێغەمبەر(ﷺ) ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا لێپرسینەوەمان هەیە لەسەر ئەوكارانەی لەنەفامیدا ئەنجاممان داون؟ فەرمووی: "ئەوكەسەتان كەلەئیسلامدا چاكەكار دەبێت، لێی ناپرسرێتەوە، بەلاّم ئەوەی كەخراپەكاربوو (لەئیسلام هەڵگەڕایەوە) لەكارەكانی سەردەمی نەفامیی و ئیسلامیشی دەپرسرێتەوە".

## (٢٤) ئەگەر كەسێكتان موسڵمانێكی باش بێ هەرچاكەیەك كەدەیكات بە دەقات بۆی تۆمار دەكرێت

٣١ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: إِذَا تَحَدَّثَ عَبْدِي بِأَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ حَسَنَةً مَا لَمْ يَعْمَلْ، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا. وإِذَا تَحَدَّثَ بِأَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَأَنَا أَغْفِرُهَا لَهُ مَا لَمْ يَعْمَلْهَا، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَهُ بِمِثْلِهَا". وقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ: رَبِّ ذَاكَ عَبْدُكَ يُرِيدُ أَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً –وَهُوَ أَبْصَرُ بِهِ– فَقَالَ: ارْقُبُوهُ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ بِمِثْلِهَا، وإِنْ تَرَكَهَا فَاكْتُبُوهَا لَهُ حَسَنَةً، إِنَّمَا تَرَكَهَا مِنْ جَرَّائِيَ". وقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلَامَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ بِمِثْلِهَا حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ (ﷻ)". (بخاري/ حسن اسلام المرء/٤٢)

(ابوهريره)(دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "خوای گەورە فەرموویەتی: ئەگەر بەندەكەم نیازی وابوو چاكەیەك بكات، چاكەكەی بۆ دەنووسم كەهێشتا نەیكردووە، ئەگەر كردی ئەوا بەدەقات بۆی دەنووسم، بەلاّم ئەگەر نیازی وابوو كەخراپەیەك بكات ئەگەر نەیكرد من لێی خۆشدەبم، ئەگەر كردیشی یەك خراپەی بۆ دەنووسم".

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "فریشتەکان وتیان: پەروەردگار ئەوە بەندەکەتە نیازی وایە خراپەیەك بکات ـــ هەرچەندە خواباشتر چاوی لێیەتی ـــ فەرمووی: "چاودێری بکەن، ئەگەر کردی وەکو خۆی بۆی بنووسن، ئەگەر وازیشی لێهێنا چاکەیەکی بۆ بنووسن ـ چونکە لەبەر من وازی لێهێناوە".

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر یەکێکتان ئیسلامەتیەکەی بەباش ئەنجامدا، هەرچاکەیەك کەدەیکات دەقات بۆی دەنووسرێت هەتا، حەوسەد قات. هەر خراپەیەکیش کەدەیکات بەقەد خراپەکە بۆی دەنووسرێت هەتا دەگەرێتەوە بۆ لای خوای گەورە".

**٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ تبارك و تعالى تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ". (بخاري/ العتق/ الخطأ والنسيان/٢٣٩١)**

(ابوهريرە)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورەو بالآدەست لەوشتانەی ئوممەتم دەبورێت کەبەخەیاڵیاندا دێت، مادام نەیلێن یان نەیکەن).

**٣٣ـ عن عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ أَوْ صِلَةِ رَحِمٍ، أَفِيهَا أَجْرٌ؟ فَقَالَ (لَهُ) رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَسْلَمْتَ عَلَى مَا أَسْلَفْتَ مِنْ خَيْرٍ". (بخاري/ الزكاة/ من تصدق في الشرك ثم اسلم/ ١٣٦٩)**

(عروە) کوڕی (زبیر) دەڵێ: (حکیم) کوڕی (حزام) بۆی گێراوەتەوە کە بەپێغەمبەری خوای(ﷺ) وتووە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا ئەو کاروبارانەی کەلە نەفامیدا پەرستشمان پێدەکردن لەخێرو ئازادکردنی بەندەو سەردان لە کەسوکار، ئایا پاداشتیان هەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی: "تۆ لەسەر ئەوچاکانە موسڵمان بوویت کەپێشتر ئەنجامت داون".

## (٢٥) وریاکردنەوە لەتاقیکردنەوە

**٣٤ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَحْصُوا لِي كَمْ يَلْفِظُ الْإِسْلَامَ". قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَخَافُ عَلَيْنَا ونَحْنُ مَا بَيْنَ السِّتِّ مِائَةٍ إِلَى السَّبْعِ**

مائَةٍ؟ قَالَ: "إِنَّكُمْ لَا تَدْرُونَ لَعَلَّكُمْ أَنْ تُبْتَلَوْا". قَالَ: فَابْتُلِينَا، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ مِنَّا لَا يُصَلِّي إِلَّا سِرًّا". **(بخاري/ الجهاد/ كتابة الامام الناس/٢٨٩٥)**

(حذيفة)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خـوادا(ﷺ) بـووین، فـەرمووی: "بـۆم بژمێرن چەند کەس دانی بەئیسلامدا ناوە" دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) ئایا غەمی ئێمەتە لەکاتێکا ئێمە لەنێوان شەشسەد تا حەوسەد کەسـین؟ فـەرمووی: "ئێوە نازانن لەوانەیە تووشی تاقیکردنەوە ببن" دەڵێ: تووشـی هـاتین هـەتا وامـان لێهات پیاوێك لەئێمە مەگەر بەدزی نوێژی بکردایا.

## (٢٦) وەحی بۆ پێغەمبەری خوا چۆن دەستی پێکرد

٣٥ـ عن يَحْيَى قال: سَأَلْتُ أَبَا سَلَمَةَ: أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ قَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ). فَقُلْتُ: أَوِ: (اقْرَأْ). فَقَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (ﷺ): أَيُّ الْقُرْآنِ أُنْزِلَ قَبْلُ؟ فقَالَ: (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ). فَقُلْتُ: أَوِ (اقْرَأْ). قَالَ جَابِرٌ: أُحَدِّثُكُمْ مَا حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، قَالَ: "جَاوَرْتُ بِحِرَا و شَهْرًا، فَلَمَّا قَضَيْتُ جِوَارِي نَزَلْتُ، فَاسْتَبْطَنْتُ بَطْنَ الْوَادِي، فَنُودِيتُ، فَنَظَرْتُ أَمَامِي وخَلْفِي وعَنْ يَمِينِي وعَنْ شِمَالِي فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَنَظَرْتُ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، ثُمَّ نُودِيتُ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا هُوَ، عَلَى الْعَرْشِ فِي الْهَوَا و يَعْنِي جِبْرِيلَ (عليه السلام)، فَأَخَذَتْنِي رَجْفَةٌ شَدِيدَةٌ، فَأَتَيْتُ خَدِيجَةَ فَقُلْتُ: دَثِّرُونِي، فَدَثَّرُونِي، فَصَبُّوا عَلَيَّ ماء، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (عز وجل): (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ. قُمْ فَأَنْذِرْ. ورَبَّكَ فَكَبِّرْ. وثِيَابَكَ فَطَهِّرْ...)". (بخاري/ التفسير/ المدثر/٤٦٤)

(يحيى) دەڵێ: پرسیارم لە(ابو سلمه)کرد کامەی قورئان لەپێشدا دابەزی؟ وتـی: (یا ایها المدثر) وتم: یان (اقرا) ،ئەویش وتی: پرسیارم کرد لە(جـابر) کـوری(عبـدالله) (ﷺ): کامەی قورئان لەپێشدا دابەزیووە؟ ئەویش وتی: (یا ایها المـدثر) منـیش وتم: یا (اقرا) جابر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) چی بە ئێمە وت: بۆتـان دەگێڕمـەوە، فـەرمووی: "مانگێك لەئەشکەوتی حیرا لەخەڵوەتدا بووم، مانگەکەم تەواو کرد، دابـەزیم چـوومە ناو دۆڵەکەوە، بـانگم لێکـرا، سـەیری پێشـەوەو دواوەو راسـت و چـەپی خـۆمم کـرد کەسـم نـەبینی جـارێکیتر بـانگ کـرام، سـەیرم کـرد کەسـم نـەدی، ئینجـا سـەرم بەرزکردەوە کـەدەبینم لەسـەر عەرشـە لەئاسمانـدا، واتـە جوبرائیـل (علیـە السـلام) کوتوپڕ لەرزێکی توند دایگرتم ،هاتمەوە بۆ لای خەدیجە، وتم: دامپۆشـن، دامپۆشـن،

ئەوانیش ئاویان لێپرژاندم، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە (يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ* قُمْ فَأَنذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ * وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ) (المدّثر :١- ٤)

٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "حِينَ أُسْرِيَ بِي لَقِيتُ مُوسَى (عليه السلام) -فَنَعَتَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)- فَإِذَا هو رَجُلٌ -حَسِبْتُهُ قَالَ- مُضْطَرِبٌ، رَجِلُ الرَّأْسِ، كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُو وةَ. قَالَ: ولَقِيتُ عِيسَى -فَنَعَتَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)- فَإِذَا رَبْعَةٌ أَحْمَرُ، كَأَنَّمَا خَرَجَ مِنْ دِيمَاسٍ. يَعْنِي حمَّامًا. قَالَ: ورَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ (عليه السلام)، وأَنَا أَشْبَهُ ولَده به، قَالَ: فَأُتِيتُ بإناءيْنِ فِي أَحَدِهمَا لَبَنٌ وفِي الْآخَرِ خَمْرٌ، فَقِيلَ لِي: خُذْ أَيَّهُمَا شِئْتَ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ فَشَرِبْتُهُ، فَقَالَ: هُدِيتَ الْفِطْرَةَ -أَوْ: أَصَبْتَ الْفِطْرَةَ- أَمَّا إِنَّكَ لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ". (بخاري / الانبياء/ واذكر في كتاب مريم /٣٢٥٦)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "کاتێ شەورەویم پێکرا گەیشتم بەموسا(عليه السلام) پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کرد هەر دەڵێی پیاوێکی — وابزانم فەرمووی: لاوازه قژی کەمێك لوله دەڵێی لەپیاوانی (خێڵی) شەنوئەیە. فەرمووی: گەیشتم بەعیسا(عليه السلام) پێغەمبەر(ﷺ) وەسفی کرد - ئەویش بالا مامناوەندی، هەر دەڵێی لە(حەمام) هاتۆتە دەرەوە. فەرمووی: چاویشم کەوت بە ابراهیم(عليه السلام) من نزیکترین نەوەیەکم کەلەو دەچێ، فەرمووی: دوو دەفریان بۆ هێنام یەکێکیان شیری تێدابوو ئەویتریان مەی، پێموترا: کامیانت دەوێ هەڵیگرە، منیش شیرەکەم هەڵگرت و خواردمەوە، وتی: فیترەو سروشتی پاکت هەڵبژارد یان پێکات بەلام ئەگەر مەیەکەت هەڵبژاردایا ئوممەتەکەت سەرلێشێواو دەبوو".

## ( ٢٧ ) دەرچوونی یەکتاپەرستان لە ئاگر

٣٧- عن أَبِي الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) يُسْأَلُ عَنِ الْوُرُودِ؟ فَقَالَ: نَجِي و نَحْنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَنْ كَذَا وكَذَا -انْظُرْ- أَيْ ذَلِكَ فَوْقَ النَّاسِ. قَالَ: فَتُدْعَى الْأُمَمُ بِأَوْثَانِهَا ومَا كَانَتْ تَعْبُدُ، الْأَوَّلُ فَالْأَوَّلُ، ثُمَّ يَأْتِينَا رَبُّنَا بَعْدَ ذَلِكَ فَيَقُولُ: مَنْ تَنْظُرُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نَنْظُرُ رَبَّنَا، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: حَتَّى نَنْظُرَ إِلَيْكَ، فَيَتَجَلَّى لَهُمْ يَضْحَكُ، قَالَ: فَيَنْطَلِقُ بِهِمْ ويَتَّبِعُونَهُ، ويُعْطَى كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ -مُنَافِقٍ أَوْ مُؤْمِنٍ- نُورًا،

ثُمَّ يَتَّبِعُونَهُ. وعَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ كَلَالِيبُ وحَسَكٌ تَأْخُذُ مَنْ شَا و اللَّهُ (ﷻ)، ثُمَّ يُطْفَأُ نُورُ الْمُنَافِقِينَ، ثُمَّ يَنْجُو الْمُؤْمِنُونَ، فَتَنْجُو أَوَّلُ زُمْرَةٍ وجُوهُهُمْ كَالْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، سَبْعُونَ أَلْفًا لَا يُحَاسَبُونَ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ كَأَضْوَإِ نَجْمٍ فِي السماء، ثُمَّ كَذَلِكَ، ثُمَّ تَحِلُّ الشَّفَاعَةُ، ويَشْفَعُونَ حَتَّى يَخْرُجَ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ شَعِيرَةً، فَيُجْعَلُونَ بِفِنَا و الْجَنَّةِ، ويَجْعَلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ يَرُشُّونَ عَلَيْهِمُ الماء حَتَّى يَنْبُتُوا نَبَاتَ الشيء فِي السَّيْلِ ويَذْهَبُ حُرَاقُهُ، ثُمَّ يَسْأَلُ حَتَّى تُجْعَلَ لَهُ الدُّنْيَا وعَشَرَةُ أَمْثَالِهَا مَعَهَا. **(بخاري / الرقائق/ صفة الجنة والنار/ ٦١٩٠)**

(ابو زبیر) دەڵێ: گوێم لێبووە(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) پرسیاری تێپەڕبوونی سەر پردی دۆزەخی لێکرا؟ وتی: ئێمە ڕۆژی قیامەت بەم شێوەو بەوشێوە دێین(سەیرکە) واتە: ئەوەش بەسەر خەڵکیدا، وتی: میللەتان بەناوی بتەکانیانەوەو ئەوشتانەی دەیانپەرستن بانگ دەکرێن. یەك لەدوای یەك ئینجا پەروەردگارمان دێت بۆلامان و دەفەرموێت: چاوەڕێی کێن؟ دەڵێن: چاوەڕێی پەروەردگارمانین، دەفەرموێت: من پەروەردگارتانم، دەڵێن: باسەیرت بکەین، ئینجا بەدەم پێکەنینەوە خۆی دەردەخات بۆیان، دەڵێ: ئینجا دەڕواو ئەمانیش شوێنی دەکەون بەهەر ئادەمیزادێك لەوان ـ مونافیق یا باوەڕدار ـ نورێکی دەداتێ ئینجا شوێنی دەکەون لەسەر پردی دۆزەخ قولاپ و دڕك هەیە هەرچی خوای گەورە بیەوێ دەیگرێت، ئینجا ڕووناکی مونافیقەکان دەکوژێتەوە، پاشان ئیمانداران ڕزگاریان دەبێت.

یەکەم کۆمەڵ کەڕزگاریان دەبێ دەموچاویان وەکو مانگی چواردە وایە حەفتا هەزاریان لێپرسینەوەیان نییە. ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان دێن، وەکو ڕوناکترین ئەستێرەی ئاسمانن هەروەها بەهەمان شێوە ئینجا شەفاعەت دەست پێدەکات، شەفاعەتیان بۆ دەکرێت، هەتا هەرچی وتبێتی (لا الـه الا اللـه)و بەئەندازەی دەنکە جۆیەکی بچووك خێر لەدڵیدا بووبێت لەئاگر دێتە دەرەوەو دەخرێتە گۆڕەپانی بەهەشت و، خەڵکی بەهەشت ئاویان لێدەپرژێنن هەتا دەڕوێن وەکو ڕوانی ڕووەکی ناولیتاوی لافاو، ئاسەواری سوتاویەکەیان لەسەر نامێنێ پاشان (هەریەکەیان) دەپاڕێتەوە هەتا بەقەد دنیاو دە ئەوەندەی تریشیان دەدرێتێ.

## ( ٢٨ ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ( وانذر عشيرتك الاقربين )

٣٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ) (الشعراء:٢١٤) دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قُرَيْشًا فَاجْتَمَعُوا، فَعَمَّ وخَصَّ، فَقَالَ: "يَا بَنِي كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي مُرَّةَ بنِ كَعْبٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، يَا بَنِي هَاشِمٍ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ، (يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ)، يَا فَاطِمَةُ أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِمًا سَأَبُلُّهَا بِبَلَالِهَا". (بخاري / الوصايا/ هل يدخل النساء يولد في الاقارب /٢٦٠٢)

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی (وانذر عشيرتك الاقربين) (الشعراء:٢١٤) پێغەمبەر(ﷺ) قورەیشی بانگ كردو كۆبوونەوە بانگی قورەیشی بەگشتیو چەند كەسێك بەتایبەتی كرد ، فەرمووی: "ئەی نەوەی كەعبی كوڕی لوئەی خۆتان رزگاركەن لەئاگر ئەی نەوەی موڕەی كوری كەعب، خۆتان رزگار كەن لەئاگر، ئەی نەوەی عەبدشەمس خۆتان رزگار كەن لەئاگر، ئەی نەوەی(عەبدول مەناف) خۆتان رزگاركەن لەئاگر ئەی نەوەی هاشم خۆتان رزگاركەن لەئاگر (ئەی نەوەی عەبدول موتەڵیب خۆتان رزگار كەن لەئاگر)ئەی فاتمە خۆت رزگاركە لەئاگر، من لەلای خوا هیچ دەسەلاتێكم نییە، جگە لەوەی رەحم و خزمایەتی هەیە لەنێوانماندا و دەیگەیەنم".

## ( ٢٩ ) پێغەمبەر( ﷺ ) فریای ( ابوطالب ) ناكەوێت

٣٩ـ عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَفَعْتَ أَبَا طَالِبٍ بِشيء، فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ ويَغْضَبُ لَكَ؟ قَالَ (ﷺ): "نَعَمْ هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، ولَوْلَا أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ قصة ابي طالب / ٣٦٧ ، ٣٦٧٢)

(عباس) كوری(عبدالمطلب)(ﷺ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): ئایا كەڵكێكت گەیاند بە(ابوطالب) ئەو جاران تۆی دەپاراست لەسەر تۆ تووڕە دەبوو؟ فەرمووی: "بەڵێ ئەو لەناو ئاگرێكی تەنكدایە، ئەگەر من نەبوومایە دەبوو لەقوڵایی خوارەوەی ئاگردا بوایە".

٤٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا أَبُو طَالِبٍ، وهُوَ مُنْتَعِلٌ بِنَعْلَيْنِ (من نارٍ) يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ". **(بخاري/ الطب/ ٥٣٧٨)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "سوكترین سزای ئاگری دۆزەخ سزای (ابوطالب)ە، ئەویش جوتێ نەعلی لەئاگر دروستكراوی لەپێدایە، بەهۆی ئەو نەعلانەوە مێشكی دەكوڵێت.

## (٣٠) حەفتا هەزار لە ئومەتم بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت

٤١ـ عن حُصَيْنُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ فَقَالَ: أَيُّكُمْ رَأَى الْكَوْكَبَ الَّذِي انْقَضَّ الْبَارِحَةَ؟ قُلْتُ: أَنَا. ثُمَّ قُلْتُ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَكُنْ فِي صَلَاةٍ، ولَكِنِّي لُدِغْتُ. قَالَ: فَمَاذَا صَنَعْتَ؟ قُلْتُ: اسْتَرْقَيْتُ. قَالَ: فَمَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قُلْتُ: حَدِيثٌ حَدَّثَنَاهُ الشَّعْبِيُّ، فَقَالَ: ومَا حَدَّثَكُمُ الشَّعْبِيُّ؟ قُلْتُ: حَدَّثَنَا عَنْ بُرَيْدَةَ بْنِ حُصَيْبٍ الْأَسْلَمِيِّ أَنَّهُ قَالَ: لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ أَوْ حُمَةٍ، فَقَالَ: قَدْ أَحْسَنَ مَنِ انْتَهَى إِلَى مَا سَمِعَ، ولَكِنْ حَدَّثَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ومَعَهُ الرُّهَيْطُ، والنَّبِيَّ ومَعَهُ الرَّجُلُ والرَّجُلَانِ، والنَّبِيَّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ، إِذْ رُفِعَ لِي سَوَادٌ عَظِيمٌ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ أُمَّتِي، فَقِيلَ لِي: هَذَا مُوسَى وقَوْمُهُ، ولَكِنِ انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: انْظُرْ إِلَى الْأُفُقِ الْآخَرِ، (فنظرتُ) فَإِذَا سَوَادٌ عَظِيمٌ، فَقِيلَ لِي: هَذِهِ أُمَّتُكَ، ومَعَهُمْ سَبْعُونَ أَلْفًا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ ولَا عَذَابٍ". ثُمَّ نَهَضَ، فَدَخَلَ مَنْزِلَهُ، فَخَاضَ النَّاسُ فِي أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ ولَا عَذَابٍ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ صَحِبُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وقَالَ بَعْضُهُمْ: فَلَعَلَّهُمُ الَّذِينَ وُلِدُوا فِي الْإِسْلَامِ ولَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ (شيئاً) وذَكَرُوا اشياء، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "مَا الَّذِي تَخُوضُونَ فِيهِ". فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: "هُمُ الَّذِينَ لَا يَرْقُونَ ولَا يَسْتَرْقُونَ، ولَا يَتَطَيَّرُونَ، وعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ". فَقَامَ عُكَّاشَةُ بْنُ مِحْصَنٍ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: "أَنْتَ مِنْهُمْ". ثُمَّ قَامَ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَقَالَ: "سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ". **(بخاري/ الضب / ٥٣٧٨)**

(حصين) كوری(عبدالرحمن) (ﷺ) دەڵێ: من لەلای (سعیدی) كوری(جبیر) بووم وتی: كێتان ئەو ئەستێرەیەی دی كە دوێنێ كەوتە خوارەوە؟ دەڵێ: وتم: من ئینجاوتم: بەلاّم من لەنوێژدا نەبووم بەڵكو دوپشك پێوەی دابووم، وتی: ئەی چیت

کرد؟ وتم: نوشتەم کرد وتی: چی وای لێکردی؟ وتم: فەرمودەیەك کە(شعبی) بۆی گێراینەوە، وتی: چییە ئەوەی شەعبی بۆی گێراونەتەوە؟ وتم: لەبورەیدەی کوری(حصین الاسلمی)ەوە وتوویەتی: نوشتە نییە (بۆ هیچ شتیٚ) مەگەر بۆچاوپیسیو گەزین نەبیٚ، وتی: بەراستی چاکی کرد ئەوەی چی بیستووە پەیڕەوی دەکات بەلاٌم(ابن عباس) بۆی گێراینەوە لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: ئوممەتەکان خرانە بەرچاوم، دەبینم پێغەمبەر هەیە کەسی لەگەڵدا نیە، ئینجا خەڵکێکی زۆرم پیشاندرا، گومانم کرد کە ئوممەتەکەی من بن، پێم وترا: بروانە بۆ ئاسۆیەکیتر (سەیرم کرد) دەبینم خەڵکێکی زۆر، پێم وترا: ئەوە ئوممەتەکەی تۆیە، حەفتا هەزاریان لەگەڵتا بەبیٚ لێپرینەوە دەچنە بەهەشتەوە، سزایان نییە". ئینجا هەستا، چووە ماڵەوە، ئینجا خەڵکەکە کەوتنە باسکردنی ئەوانەی کەبەبیٚ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت و سزایان نییە، هەندێکیان وتی: لەوانەیە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بن، هەندێکیتریان وتیان: لەوانەیە ئەوانەبن لەسەردەمی ئیسلامدا لەدایك بوون و شەریکیان بۆ خوا دانەناوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە دەرەوە بۆناویان و فەرمووی: "ئەوە باسی چی دەکەن؟". ئاگاداریان کرد، فەرمووی: "ئەوانەن کەنوشتە ناکەن، داوای نوشتەکردن ناکەن، رەشبینی ناکەن، پشت بە پەروەدگاریان دەبەستن" (عەکاشە) کوڕی (محصل) هەستاو وتی: لەخوا داوا بکە بمخاتە ناو ئەوانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "تۆ لەوانی" ئینجا پیاوێکیتر هەستاو وتی: داوا بکە خوا بمخاتە ناو ئەوانەوە، فەرمووی: (عەکاشە) پێشت کەوت".

## ( ٣١ ) من خوازیارم کە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن

٤٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي قُبَّةٍ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ رَجُلًا، فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ): "أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ". قَالَ: قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: "أَتَرْضَوْنَ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ". فَقُلْنَا: نَعَمْ، فَقَالَ: "وَالَّذِي نَفْسُ محمدٍ بِيَدِهِ إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وذَاكَ أَنَّ الْجَنَّةَ لَا يَدْخُلُهَا إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، ومَا أَنْتُمْ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ إِلَّا كَالشَّعْرَةِ الْبَيْضَا و فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ: كَالشَّعْرَةِ السَّوْدَا و فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَحْمَرِ". (بخاري/ الرقاق/ كيف الحشر / ٦١٦٣)

(عبدالله) كوری(مسعود) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە نزیكەی چل كەس لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووین لەچادرێكدا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "ئایا رازین چواریەكی خەڵكی بەهەشت بن" دەڵێ: وتمان: بەڵێ، فەرمووی: "ئایا رازین سێیەكی خەڵكی بەهەشت بن، وتمان: بەڵێ: فەرمووی: "سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە من خوازیارم ئێوە نیوەی خەڵكی بەهەشت بن ، ئەوەشی موسڵمان نەبێ ناچێتە بەهەشت، ئێوەش لەناو خەڵكی موشریكدا وەكو موویەكی سپی وان لەپێستی گایەكی رەشدا، یاوەكو موویەكی رەش لەپێستی گایەكی سووردا".

## ( ٣٢ ) فەرمانی خوا بۆ ئادەم لە هەزار كەس نۆسەدو نەوەدو نۆیان بنێرە بۆ ئاگر

٤٣ــ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَقُولُ اللَّهُ (ﷻ): يَا آدَمُ، فَيَقُولُ: لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ، والْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. قَالَ: يَقُولُ: أَخْرِجْ بَعْثَ النَّارِ، قَالَ: ومَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وتِسْعَةً وتِسْعِينَ، قَالَ: فَذَاكَ حِينَ يَشِيبُ الصَّغِيرُ (وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وتَرَى النَّاسَ سُكَارَى ومَا هُمْ بِسُكَارَى ولَكِنَّ عَذَابَ اللَّه شَدِيدٌ) (الحج: ٢)". قَالَ فَاشْتَدَّ ذلك عَلَيْهِمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه أَيُّنَا ذَلكَ الرَّجُلُ؟ فَقَالَ رسولُ الله (ﷺ): "أَبْشِرُوا، فَإِنَّ مِنْ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ أَلْفًا ومِنْكُمْ رَجُلًا. ثُمَّ قَالَ: "وَالَّذِي نَفْس محمدٍ بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّة". فَحَمِدْنَا اللَّهَ وكَبَّرْنَا، ثُمَّ قَالَ: "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَطْمَعُ أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْلِ الْجَنَّة إِنَّ مَثَلَكُمْ فِي الْأُمَمِ كَمَثَلِ الشَّعْرَةِ الْبَيْضَا و فِي جِلْدِ الثَّوْرِ الْأَسْوَدِ، أَوْ: كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الْحِمَارِ". **(بخاري / الرقاق / قوله عزوجل (ان زلزلة الساعة شيء عظيم) ٦١٦٥)**

(ابو سعید) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "خوای عزوجل دەفەرموێت: ئەی ئادەم، دەڵێ: گوێڕایەڵم و لەخزمەتتام چاكەیش لەدەستی تۆدایە، دەفەرموێت: وەفدی ئاگر بنێرە، وتی: وەفدی ئاگر چەندە؟ فەرمووی: لەهەموو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ، دەڵێ: ئەوەش لەكاتێكا منداڵ سەری سپی دەبێت:(ئافرەتی سك پڕ سكەكەی فڕێ دەدا، خەڵك دەڵێی سەرخۆشن و سەرخۆشیش نین، بەڵكو سزای خوا سەختە) دەڵێ: ئەوە زۆر نارەحەتی كردن، ئینجاوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوە كاممانە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ)

فەرمووی: "مژدەتان لێبێت، لەیاجوج و ماجوج هەزارو لەئێوە یەك پیاو، ئینجا فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە من بەتەمام کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشتبن". ئێمەش سوپاسی خوامان کردو تەکبیرمان کرد، پاشان فەرمووی: "سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە بەتەمام سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن".

ئێمەش سوپاسی خوامان کردو تەکبیرمان کرد، ئینجا فەرمووی: "سوێند بەوەی گیانی موحەمەدی بەدەستە، من بەتەمام ئێوە نیوەی خەڵکی بەهەشت بن، نمونەی ئێوە لەناو ئوممەتەکاندا ، وەکو موویەکی سپی وان لەپێستی گایەکی رەشدا یاوەکو: هێڵێکی سپی لەدەستی گوێدرێژێکدا".

# بەشی دووەم: دەستنوێژ

## (١) کەچویتە سەرئاو چی دەڵێیت؟

٤٤ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ الْخَلَا و قال: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ". (بخاري/ الوضوء / مايقول عند الخلا و/١٤٢)

(انس)(ﷺ) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچوایەتە سەر ئاو دەیفەرموو: "اللهم إنِّي اعوذ بك من الخبث والخبائث).واتە: خوایە پەنا دەگرم بەتۆ لەهەموو جۆرە پیسیو هەموو زیانبەخشێك لەشەیتان و جانەوەرو هەرشتێکیتر کەپیس و زیانبەخش بێت".

## (٢) لەکاتی سەرئاودا رووەکەرە قیبلە

٤٥ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا أَتَيْتُمُ الْغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلَا تَسْتَدْبِرُوهَا، بِبَوْلٍ وَلَا غَائِطٍ، وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا". قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمْنَا الشَّامَ فَوَجَدْنَا مَرَاحِيضَ قَدْ بُنِيَتْ قِبَلَ الْقِبْلَةِ، فَنَنْحَرِفُ عَنْهَا، وَنَسْتَغْفِرُ اللَّهَ. (بخاري/ الوضوء/ الا تستقبل القبلة بغائط /١٤٤)

(ابو ایوب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر چوونە سەر ئاو بۆ میزوو پیسی روو نەکەنە قیبلەو پشتیشی تێمەکەن، بەڵکو رووبکەنە خۆرهەڵات یان خۆرئاوا".

(ابو ایوب) دەڵێ: چووین بۆ شام دەبینین ئاودەستەکان رووەو قیبلە دروستکراون ئێمە روومان وەردەگێراو داوای لێخۆشبوونمان لەخوادەکرد.

## (٣) لەناو خانوودا مۆڵەت دراوە

٤٦ـ عَنْ واسِعِ بْنِ حَبَّانَ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فِي الْمَسْجِدِ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ مُسْنِدٌ ظَهْرَهُ إِلَى الْقِبْلَةِ، فَلَمَّا قَضَيْتُ صَلَاتِي انْصَرَفْتُ إِلَيْهِ مِنْ شِقِّي، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: يَقُولُ أُناسٌ: إِذَا قَعَدْتَ لِلْحَاجَةِ فَلَا تَقْعُدْ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَلَا بَيْتَ الْمَقْدِسِ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَلَقَدْ رَقِيتُ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ، مُسْتَقْبِلًا بَيْتَ الْمَقْدِسِ، لِحَاجَتِهِ. (بخاري/ الوضوء/ من تبرز على لبنتين/١٤٥)

(واسع) کوڕی (حبان) دەڵێ: لەمزگەوت نوێژم کرد ، (عبدالله) کوڕی (عمر) پشتی کردبووە قیبلە، کاتێ لەنوێژەکە بوومەوە چوومە ئەوبەر بۆلای (عبدالله) وتی: خەڵکی دەڵێن: ئەگەر چوویتە سەرئاو روونەکەیتە نەقیبلەو نەقودس. (عبدالله)

وتی:جارێكیان چوومه سەربانی ماڵێك پێغەمبەری خوام(ﷺ) دی لەسەر دووخشت دانیشتبوو رووی لەقودس بوو،(واته پشتی لەقیبله بوو) دەستی بەئاو دەگەیاند.

### ( ٤ ) رێگریی لەمیزكردنه ئاوێك كه پاشان خۆتی پێ بشۆریت

٤٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الماء الدَّائِمِ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ". **(بخاري/ الوضوء/ البول في الماء الدائم / ٢٣٦)**

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (باكەستان میز نەكاته ئاوی وەستاوو دوایی خۆیشی تێدا بشوات). لەریوایەتێكیتردا: "میز مەكەره ئاوی ڕاوەستاوەوە كەلەبەری ناڕوات، دوایی خۆیشی تێدا بشۆرێت".

### ( ٥ ) خۆپاراستن لەمیز

٤٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: "أَمَا إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، ومَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، وأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ". قَالَ: فَدَعَا بِعَسِيبٍ رَطْبٍ، فَشَقَّهُ بِاثْنَيْنِ، ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هَذَا واحِدًا وعَلَى هَذَا واحِدًا، ثُمَّ قَالَ: "لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا". (بخاري/ الوضوء / من الكبائر ان يستتر من بوله/ ٢١٣)

(ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی فەرمووی: "ئەم دووانه سزادەدرێن ، بەلاّم لەسەرشتی گەورە سزانادرێن (چونكه دەیانتوانی خۆیانی لێ بپارێزن)، یەكێكیان قسەی دەهێناو دەبرد، ئەوی تریان خۆی نەدەپاراست لەمیزەكەی".

دەڵێ: داوای لقێك دارخورمای تەڕی كرد ، كردی بەدووكەرتەوە، لەسەر هەر گۆڕێكیان كەرتێكی چەقاند، ئینجا فەرمووی: "بەڵكو(سزا) لەسەریان سووك بكرێت هەتا وشك دەبن".

### ( ٦ ) رێگریی لەخۆپاككردنەوە بەدەستی ڕاست

٤٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا يُمْسِكَنَّ أَحَدُكُمْ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ وهُوَ يَبُولُ، ولَا يَتَمَسَّحْ مِنَ الْخَلَا و بِيَمِينِهِ، ولَا يَتَنَفَّسْ فِي الْانَاء". (بخاري الوضوء/ النهي عن الاستنجاء باليمين/١٠٢)

(عبدالله) کوڕی (ابو قتادە) لەباوکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "باکەستان زەکەری بەدەستی راستی نەگرێت لەکاتی میزکردنیدا، لەسەر ئاویش بەدەستی راست خۆی پاك نەکاتەوە، هەروەها فوو نەکات لەدەفری (خواردن و خواردنەوە)".

## ( ٧ ) خۆپاککردنەوە بەئاو

٥٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) دَخَلَ حَائِطًا وتَبِعَهُ غُلَامٌ مَعَهُ مِيضَأَةٌ، هُوَ أَصْغَرُنَا، فَوَضَعَهَا عِنْدَ سِدْرَةٍ، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَاجَتَهُ فَخَرَجَ عَلَيْنَا وقَدِ اسْتَنْجَى بِالماء. **(بخاري / الوضوء/ الاستنجاء بالماء/ ١٤٩)**

(انس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە پەنا دیوارێکەوە مێرد منداڵێك کە بچووکترینمان بوو شوێنی کەوت مەسینەیەکی بەدەستەوە بوو، لەتەنیشت درەختێکی سدرا داینا، پێغەمبەر(ﷺ) لێبوویەوەو هاتە دەرەوە هات بۆ ناومان بە ئاوەکە خۆی پاك کردبووەوە.

## ( ٨ ) خۆپاککردنەوە بە بەرد بەتاك دەبێ

٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)- قَالَ: "إِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَجْمِرْ وِتْرًا، وإِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ ماء ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ". **(بخاري/ الوضوء/ الاستنجاء في الوضوء/ ١٥٩)**

(ابوهریر)(ﷺ) دەیگەیەنێ بەپێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: "ئەگەر کەسێکتان بەبەرد خۆی پاك کردەوە، با تاك بێت، ئەگەر کەسێکیشتان دەستنوێژی گرت با ئاو بکاتە لوتیەوە ئینجا فنی بکاتە دەرە".

## ( ٩ ) دەست پێکردن و دەستنوێژو شتیتر بەلای راست

٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ، وفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ. **(بخاري/ الوضوء/ ١٦٦)**

(عائشة)(ﷺ)دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی بەوەدەکرد بەلای راست دەست پێبکات لەدەستنوێژ گرتنا کاتێ دەستنوێژی دەگرت، لەسەر داهێنان کاتێ سەری دادەهێنا، لەنەعل لەپێکردنا، کاتێ نەعلی لەپێدەکرد.

## ( ١٠ ) شێوەی دەستنوێژی پێغەمبەر( ﷺ )

٥٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ ابْنِ عَاصِمٍ الْأَنْصَارِيِّ (رضي الله عنه) -وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ- قَالَ: قِيلَ لَهُ: تَوَضَّأْ لَنَا وضُو و رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).فَدَعَا بِانَاء فَأَكْفَأَ مِنْهَا عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَضْمَضَ واسْتَنْشَقَ مِنْ كَفٍّ واحدَةٍ، فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ وجْهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاسْتَخْرَجَهَا، فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وأَدْبَرَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ وضُو و رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).**(بخاري/ الوضوء/ ١٨٣)**

(عبدالله) کوڕی (زید) کوری (عاصم الانصاری) (رضي الله عنه) کەیەکێك بووە لەهاوەڵان دەڵێ: پێی وترا: دەستنوێژێکمان بۆ بگرە وەکو دەستنوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەویش داوای کاسەیەکی (پڕ لەئاوی) کرد، لاریکردەوە بەسەردەستیداو سێ جار دەستەکانی شۆرد، ئینجا دەستێکی کرد بەئاوەکەداو دەری هێناو سێ جار ئاوی لەدەمولوتی وەردا پاشان دەستی کرد بە ئاوەکەداو دەری هێناو سێ جار دەموچاوی شۆرد، ئینجا دەستی کرد بەئاوەکەداو دەری هێناو دووجار دەستەکانی تا ئەنیشکی شۆرد پاشان دەستی کرد بەئاوەکەداو دەستی تەڕی هێنا بەسەریا، هەردوو دەستی لەپێشەوە داناو دەیبرد بۆدواوەو دەیهێنایەوە بۆ پێشەوە، ئینجا هەردوو قاچی شۆرد هەتا قولەپێی، پاشان وتی: ئابەم شێوەیە بوو دەستنوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ( ١١ ) لووت پاککردنەوە

٥٤ـ عن أَبُو هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَنْشِقْ بِمَنْخِرَيْهِ مِنَ الماء، ثُمَّ لِيَنْتَثِرْ". **(بخاري/ الوضوء/ الاستنثار/١٥٩)**

(ابوهريرە)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر یەکێکتان دەستنوێژی گرت با ئاو لەکونەلوتەکانی وەردات ،ئینجا فن بکات".

٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنَامِهِ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَبِيتُ عَلَى خَيَاشِيمِهِ". **(اقتران/ بخاري ١٦٨٨/٣٠)**

(ابـوهريره)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: "ئەگـەر یـەكێكتان لەخەوهەسـتا باسـێ جـار فـن بكـات، چـونكە شـەیتان بەشـەودا لەكونـە لوتیـدا دەخەوێت".

## (١٢) ناوچاو جوان و دەست و پێ سپی بەهۆی دەستنوێژەوە

**٥٦ـ عَنْ نُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُجْمِرِ قَالَ: رَأَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ، فَغَسَلَ وجْهَهُ، فَأَسْبَغَ الوضوء، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ، ثُمَّ يَدَهُ الْيُسْرَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي الْعَضُدِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي السَّاقِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى حَتَّى أَشْرَعَ فِي السَّاقِ، ثُمَّ قَالَ (لي): هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَتَوَضَّأُ. وقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَنْتُمُ الْغُرُّ الْمُحَجَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مِنْ إِسْبَاغِ الوضوء، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ فَلْيُطِلْ غُرَّتَهُ وتَحْجِيلَهُ". (بخاري/ الوضوء/ ١٣٦).**

(نعـيم) كـوڕی(عبـدالله الجمـر) دەڵـێ: (ابـوهريره)م دی دەسـتنوێژی دەگـرت دەموچاوی شۆرد بەباشی شۆردی، ئینجا دەستی راستی شۆرد هەتا گەیشتە قـۆڵی، ئینجا دەستی چەپی شۆرد هەتا گەیشتە قۆڵی، ئینجا دەستی تەڕی هێنا بەسەریدا، ئینجا قاچی راستی شۆرد، هەتا لولاقیشی گرتەوە، پاشان قاچی چەپی شۆرد هـەتا لولاقیشـی گرتـەوە وتـی (بـەمن) ئابـەم شـێوەیە پێغەمبـەری خـوام(ﷺ) دیـووە دەستنوێژی گرتووە، ئینجاوتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئێـوە لـەڕۆژی قیامەتدا ناوچاو جوان و دەست و پێ سپین بەهۆی دەستنوێژ گرتنەوە، هەركەسێك لەئێوە دەتوانێ بازیاتر ناوچاوی جوان بكات و دەستوپێی سپی بكات".

## (١٣) ئەوەی بەباشی دەستنوێژ دەگرێت

**٥٧ـ عن حُمْرَانَ، مَوْلَى عُثْمَانَ (ﷺ): أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (ﷺ) دَعَا بِوَضُوٍ و فَتَوَضَّأَ: فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ مَضْمَضَ واسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) تَوَضَّأَ نَحْوَ وضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وضُوئِي هَذَا، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، لَا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ". (بخاري/ الوضوء/ ١٥٨)**

قالَ ابْنُ شِهَابٍ: وكَانَ عُلَمَاؤُنَا يَقُولُونَ: هَذَا الوضوء أَسْبَغُ مَا يَتَوَضَّأُ بِهِ أَحَدٌ لِلصَّلَاةِ.

(حمـران) كـارگوزاری (عثمـان)کـوڕی (عفـان)(ﷺ) دەڵـێ: (عثمـان)کـوڕی (عفان)(ﷺ) داوای ئاوی دەستنوێژی کردو، دەستنوێژی گرت: دەستەکانی سێ جار شۆرد ئاوی لەدەمو لوتی وەرداو، سێ جار دەموچاوی شۆرد، ئینجا دەستی ڕاستی هەتا ئەنیشکی سێ جار شۆردو، دەستی چەپیشی بەوشێوەیە، پاشان مەسحی سەری کرد، پاشان قاچی راستی تاقولە پێی سێ جار شۆردو، قاچی چەپیشی بەهەمان شێوە، ئینجاوتی: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیووە وەکو ئەم دەستنوێژەی من دەستنوێژی گرتووەو، پاشان فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنوێژ وەکو ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، ئینجا هەستێ‌و دووڕکات نوێژ بکات، دالْغەلێنەدا لەنوێژەکەدا(خوا)، لەهەموو گوناهە رابوردووەکانی دەبوردرێت".(ابن شهاب) دەڵێ: زانایانمان دەڵێن: ئەم دەستنوێژە تەواوترین دەستنوێژە کەسێك بیگرێت بۆ نوێژکردن.

## (١٤) ئەوەی لەدەستنوێژدا شوێنێکی شۆردن تەرك دەكات با بگەڕێتەوە سەری‌و نوێژەکەی بکاتەوە

٥٨ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قال: أَخْبَرَنِي عُمَرُ ابْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ، فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَقَالَ: "ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وضُو وكَ". فَرَجَعَ، ثُمَّ صَلَّى. (بخاري/ الصلاة في ثياب، الصلاة في الخفان/ ٣٨٠)

(جابر) دەڵێ: (عمر) کوری(خطاب)(ﷺ) ئاگاداری کردم: پیاوێك دەستنوێژی دەگرت، بەئەندازەی نینۆکێکی لەسەر قاچی نەشۆرد بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چاوی پێی کەوت فەرمووی: "بگەڕێرەوە دەستنوێژەکەت بەباشی بگرە" گەڕایەوەو دوایی نوێژی کرد).

## (١٥) بڕی ئاو بۆ خۆشۆردن و دەستنوێژ

٥٩ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ، ويَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ. (بخاري / الوضوء بالمد/ ١٩٨)

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بە مشتێك (مد) ئاو دەستنوێژی دەگرت بەمەنێك (صاع)ێك، هەتا پێنج مشت خۆی دەشۆرد.*

---

* مشت ﴿مد﴾ بریتییە لەشەش پاڵویەك درێژی لایەکی ٩,٢ سم بێت.

## ( ١٦ ) مەسحی کاڵەو پێتاو ( خف )

٦٠ـ عَنْ هَمَّامٍ قَالَ: بَالَ جَرِيرٌ (ﷺ) ثُمَّ تَوَضَّأَ ومَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقِيلَ: تَفْعَلُ هَذَا؟ فَقَالَ: نَعَمْ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، ومَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ. (قَالَ الْأَعْمَشُ): قَالَ إِبْرَاهِيمُ: كَانَ يُعْجِبُهُمْ هَذَا الْحَدِيثُ، لِأَنَّ إِسْلَامَ جَرِيرٍ كَانَ بَعْدَ نُزُولِ الْمَائِدَةِ. **(بخاري/ الصلاة/٣٨٠)**

(همام) دەڵێ: (جرير) (ﷺ) دەستی بەئاو گەیاند، ئینجا دەستنوێژی گرت مەسحی کاڵەو پێتاوەکانی کرد، پێیان وت: ئاوا دەکەیت؟ وتی: بەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیووە چۆتە سەرئاو، دوایی دەستنوێژی گرتووەو دەستی هێناوە بەسەر کاڵەو پێتاوەکانیدا (اعمش)دەڵێ: ئیبراهیم وتی: ئەو فەرموودەیان پێ خۆشبوو ، چونکە موسڵمانبوونی(جرير) دوای دابەزینی سوورەتی(المائدة)بوو.

٦١ـ(عَنْ أَبِي وائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى يُشَدِّدُ فِي الْبَوْلِ، وَيَبُولُ فِي قَارُورَةٍ، ويَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ جِلْدَ أَحَدِهِمْ بَوْلٌ قَرَضَهُ بِالْمَقَارِيضِ. فَقَالَ حُذَيْفَةُ: لَوَدِدْتُ أَنَّ صَاحِبَكُمْ لَا يُشَدِّدُ هَذَا التَّشْدِيدَ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي اناءرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَتَمَاشَى، فَأَتَى سُبَاطَةً خَلْفَ حَائِطٍ فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ، فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَجِئْتُ فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ. زاد في رواية: فتوضَّأَ فسمح على خُفَّيه). **(بخاري/ الوضوء/ ٢٢٤)**

((ابو وائل) دەڵێ: (ابو موسى) زۆر خۆپارێز بوو لە میزکردندا، میزی دەکردە شووشەوەو دەیووت: ئەوەی ئیسرائیلیەکان ئەگەر یەکێکیان پرژی میز بەرجێگایەکی بکەوتایا بەمقەست دەیبڕی. حوزەیفە وتی: حەزم دەکرد هاوەڵەکەتان ئەوەندە توند وتیژ نەبوایا من خۆم لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دەرۆیشتین، گەیشتینە سەرە لوێنکی قەومێك لەدوای دیوارێکەوە، وەکو یەکێك لەئێوە هەستا چوو میزی کرد، لێی دوورکەوتمەوە ، ئاماژەی بۆ من کرد، چووم بۆ لای لەنزیکەوە راوەستام هەتا لێ بووەوە.(لەریوایەتێکدا ئەمەی زیادکردووە: دەستنوێژی گرت و دەستی هێنا بەسەر (کاڵەو پێتاوەکانیدا).

---

مەن ﴿صاع ﴾: بريتييە لەچوار ﴿ مد﴾.

٦٢ـ عَنْ الْمُغيرَةِ بن شعبة (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي مَسِيرٍ، فَقَالَ لِي: "أَمَعَكَ ماء". قُلْتُ: نَعَمْ، فَنَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِه، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى فِي سَوَادِ اللَّيْلِ، ثُمَّ جاء، فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ مِنَ الْإِدَاوَةِ، فَغَسَلَ وجْهَهُ، وعلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْهَا حَتَّى أَخْرَجَهُمَا مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ، ومَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: "دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ". ومَسَحَ عَلَيْهِمَا. (بخاري / اللباس / ٥٤٦٣)

(مغـيره)ى كـوڕى(شـعبه)(ﷺ) دەڵـێ: شـەوێكيان لەڕێگايەكـدا لەخزمـەت پێغەمبەردا(ﷺ) بووم فـەرمووى پـێم: "ئايا ئـاوت پێيـە" وتم: بـەڵێ. لەولاغەكەى دابەزى ڕۆيشت تا لە تاريكى شەودا لەچاو ونبوو، ئينجا هاتەوە لەدۆڵچەكە ئاوم كـرد بە دەستيا، دەموچـاوى شـۆرد، جبەيـەكى خـورى لەبـەردابوو نەيـدەتوانى دەسـتى دەربێنێ هەتا لەژێر جبەكەوە دەريهێناو هەردوو قـۆڵى شـۆرد، دەسـتى تـەڕى هێنـا بەسەريدا، ئينجاويستم كاڵەو پێتاوەكانى داكەنم، بـەلام فـەرمووى: "وازيـان لێ بێنـە من بەپاكى لەپێم كردوون" ئينجا دەستى تەڕى هێنا بەسەر هەردووكياندا.

## ( ١٧ ) خەوى دانيشتوو دەستنوێژ ناشكێنێ

٦٣ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ): أُقِيمَت الصَّلَاةُ، و رسولُ الله (ﷺ) نَجِيٌّ لرجلٍ –وفي حديثِ عبدِ الوارثِ: ونبيُّ الله (ﷺ) يُنَاجِي رَجُلًا– فما قامَ إلى الصَّلاة حتى نامَ القومُ. وفي حديثِ شُعبةَ: فَلَمْ يَزَلْ يُنَاجِيهِ حَتَّى نَامَ أَصْحَابُهُ، ثُمَّ جاء فَصَلَّى بِهِمْ. (بخاري/ الاذان/ ٦١٦)

(انس)(ﷺ) دەڵێ: قامـەت كـرا بـۆ نوێـژ كەچـى پێغەمبـەر(ﷺ) لەگـەڵ پياوێكـدا چپەى دەكرد هەڵنەستا بۆ نوێژ هەتا خەڵكەكە خەويان لێكەوت پاشان هات و نوێژى بۆ كردن..

## ( ١٨ ) دەستنوێژ لەدواى خواردنى گۆشتى وشتر

٦٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: "إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ، وإِنْ شِئْتَ فَلَا تَوَضَّأْ". قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: "نَعَمْ، فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الْإِبِلِ". قَالَ: أُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: "نَعَمْ". قَالَ: أُصَلِّي فِي مَبَارِكِ الْإِبِلِ؟ قَالَ: "لَا". (اقتران النيرين/ بخاري/ ١٧٢١/٦٣)

(جابر) كوڕی (سمره) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك پرسیاری كرد لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئایا دەستنوێژ بگرمەوە لەخواردنی گۆشتی مەڕ؟ فەرمووی: "ئەگەر ویستت دەستنوێژ بگرە، ئەگەر ویستیشت مەیگرە" وتی: ئەی دەستنوێژ بگرم لەگۆشتی وشتر؟ فەرمووی: "بەڵێ" وتی: نوێژبكەم لەمۆڵگای وشتردا؟ فەرمووی: "نەخێر".

## (١٩) هەڵوەشاندنەوەی دەستنوێژگرتن لەو شتەی ئاگری بەركەوتووە

٦٥ـ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَقَامَ وطَرَحَ السِّكِّينَ، وصَلَّى ولَمْ يَتَوَضَّأْ. **(بخاري / الوضوء/ من لم يتوضأ من كم الشاة/٢٠٥)**

(جعفر) كوڕی (عمرو) كوڕی(امية الضميري)(رضي الله عنه)دەڵێ: چاوم لێ بوو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەچەقۆ گۆشتی لەشانی مەڕێك دەكردەوە لێی دەخوارد، بانگدرا بۆ نوێژ چەقۆكەی داناو هەستا چوو نوێژی كرد دەستنوێژی نەگرت.

٦٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) شَرِبَ لَبَنًا، ثُمَّ دَعَا بِماء فَتَمَضْمَضَ وقَالَ: "إِنَّ لَهُ دَسَمًا". (بخاري/ الوضوء/ هل يمضمض من الييل/ ٢٠٨)

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) شیری خواردەوە، ئینجا داوای ئاوی كرد لە دەمی وەرداو فەرمووی "چەوریی پێوەیە".

# بەشی سێیەم: خۆشۆردن

## (١) ئاو لەئاوەوە پێویست دەبێت بۆ پیاوێك سەرجێیی (جماع) بكات و ئاوی نەیەتەوە

٦٧ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الاثْنَيْنِ إِلَى قباء، حَتَّى إِذَا كُنَّا فِي بَنِي سَالِمٍ وقَفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى بَابِ عِتْبَانَ فَصَرَخَ بِهِ، فَخَرَجَ يَجُرُّ إِزَارَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَعْجَلْنَا الرَّجُلَ". فَقَالَ عِتْبَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يُعْجَلُ عَنِ امْرَأَتِه ولَمْ يُمْنِ، مَاذَا عَلَيْهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّمَا الماء مِنَ الماء". (بخاري / الوضوء/ ١٧٨).

(عبدالرحمن) كوڕی(ابی سعید الخدری) لەباوكیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە(ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی دووشەممە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)ڕۆیشتین بۆ قوبا، ڕۆیشتین تاگەیشتینە (بنی سالم)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەردەرگای ماڵی (عتبان)دا ڕاوەستاو بانگی (عتبان)ی كرد، ئەویش هاتە دەرەوە داوێنی كراسەكەی ڕادەكێشا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "پەلەمان لەپیاوەكە كرد" عتبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) : ئەگەر پیاوێك بچێتە لای هاوسەرەكەی‌و پەلەی لێبكەن و ئاوی نەیەتەوە، چی لەسەرە؟ فەرمووی: "ئاو لەئاوەوە پێویست دەبێت" (لێرەدا واتە هەتا ئاو نەپەڕێت خۆ شۆردنی ناوێت).

## (٢) هەڵوەشاندنەوەی فەرموودەی پێشوو:

## واجب بوونی خۆشۆردن بە بەیەك گەیشتنی هەردو خەتەنەكراو

٦٨ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: اخْتَلَفَ فِي ذَلِكَ رَهْطٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ والْأَنْصَارِ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّونَ: لَا يَجِبُ الْغُسْلُ إِلَّا مِنَ الدَّفْقِ أَوْ مِنَ الماء. وقَالَ الْمُهَاجِرُونَ: بَلْ إِذَا خَالَطَ فَقَدْ وجَبَ الْغُسْلُ. قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى: فَأَنَا أَشْفِيكُمْ مِنْ ذَلكَ، فَقُمْتُ فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) فَأُذِنَ لِي، فَقُلْتُ (لَهَا): يَا أُمَّاهْ -أَوْ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ- إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شيء وإِنِّي أَسْتَحْيِيكِ. فَقَالَتْ: لَا تَسْتَحْيِي أَنْ تَسْأَلَنِي عَمَّا كُنْتَ سَائِلًا عَنْهُ أُمَّكَ الَّتِي ولَدَتْكَ، فَإِنَّمَا أَنَا أُمُّكَ. قُلْتُ: فَمَا يُوجِبُ الْغُسْلَ؟ قَالَتْ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الْأَرْبَعِ، ومَسَّ الْخِتَانُ الْخِتَانَ، فَقَدْ وجَبَ الْغُسْلُ". (اقتران النيرين / بخاري/ ١٧٦٥/٧)

(ابو موسى)(ﷺ) دەڵێ: كۆمەڵێك لە(مهاجر)و (انصار) جیاوازی كەوتە نێوانیان. (انصار)یەكان وتیان: خۆشۆردن پێویست نابێت هەتا ئاو نەیەتەوە (مهاجر)یەكانیش وتیان: بەڵێ ئەگەر تێكەڵبوون، خۆشۆردن پێویست دەبێت. دەڵێ(ابو موسى) وتی: من ئەوەتان بۆچارەدەكەم، هەستام چووم مۆڵەتم لەعائشە(ﷺ)وەرگرت و ئەویش مۆڵەتی دام و پێموت: دایە گیان ـــ یا ئەی دایكی ئیمانداران ـــ من دەمەوێ پرسیارێك لەبارەی شتێكەوە بكەم و بەلام شەرمت لێدەكەم ، ئەویش وتی: شەرم مەكە، ئەو پرسیارەی پرسیوتە لەو دایكەت كەتۆی لێ بوویت لەمنیشی بپرسە، منیش دایكتم، وتم: چی خۆشۆردن واجب دەكات؟ وتی: گەیشتی بەكەسی شارەزا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر لەنێوان هەردوو قاچیو هەردوو رانیا دانیشت، خەتەنەكراوی ئەم بەر خەتەنەكراوی ئەو كەوت، ئەوا خۆشۆردن واجب دەبێت"[1].

## (٣) چۆنێتی خۆشۆردن لە لەشگرانیی

**٦٩ـ عن مَيْمُونَةُ (ﷺ) زوج النبي (ﷺ) قَالَتْ: أَدْنَيْتُ لِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) غُسْلَهُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الْانَاء، ثُمَّ أَفْرَغَ بِهِ عَلَى فَرْجِهِ وغَسَلَهُ بِشِمَالِهِ، ثُمَّ ضَرَبَ بِشِمَالِهِ الْأَرْضَ فَدَلَكَهَا دَلْكًا شَدِيدًا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وضُو وهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ مِلْ و كَفِّهِ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى عَنْ مَقَامِهِ ذَلِكَ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أَتَيْتُهُ بِالْمِنْدِيلِ، فَرَدَّهُ". (بخاري/ الغسل/ ٢١٦)**

(مەیمونە)ی هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: ئاوم هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ خۆشتن لەلەشگرانیی، دووجار یا سێ جار دەستی شۆرد، ئینجا دەستی خستە ناو قاپەكەوە بەدەستی ئاوی كرد بە پێشی خۆیداو بەدەستی چەپی شۆردی، ئینجا بەتوندی دەستی چەپی هێنا بەزەویداو لەزەویەكەی دەخشاند، پاشان دەستنوێژی گرت وەكو بۆ نوێژ بیگرێت، ئینجا سێ مشتی پڕ ئاوی كرد بەسەریا، ئینجا هەموو لەشی شۆرد، پاشان جێگاكەی گۆڕیو هەردوو پێی شۆرد، ئینجا خاولیم بۆهێنا خۆی پێ وشك بكاتەوە نەیویست.

---

[1] ئەم فەرموودەیە پێشووەكەیان هەڵدەوەشێنێتەوە.

### ( ٤ ) بڕی ئەو ئاوەی لەشگران خۆی پێ دەشوات

٧٠ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) اناءأَخُوهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَسَأَلَهَا عَنْ غُسْلِ النَّبِيِّ (ﷺ) مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَدَعَتْ بِاناء قَدْرِ الصَّاعِ، فَاغْتَسَلَتْ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا سِتْرٌ، وأَفْرَغَتْ عَلَى رَأْسِهَا ثَلَاثًا، قَالَ: وكَانَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (ﷺ) يَأْخُذْنَ مِنْ رُ ووسِهِنَّ حَتَّى تَكُونَ كَالْوَفْرَةِ. **(بخاري/ الغسل/ ٢٤٨)**

(ابو سلمه) کوڕی (عبدالرحمن) دەڵێ: چوین بۆ لای عائشە(ﷺ) لەگەڵ برا شیرییەکەیدا، لەبارەی خۆشۆردنی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لە لەشگرانی لێی پرسی؟ داوای قاپێکی کرد بەئەندازەی (مەنێك) دەبوو، خۆی پێ شۆرد، لەنێوان ئێمەو عائشەدا پەردەیەك هەبوو، سێ جار ئاوی کرد بەسەریا وتی: هاوسەرەکانی پێغەمبەر(ﷺ) قژیان دەبڕی تادەگاتە ئاستی گوێچکەیان".

### ( ٥ ) پەردە گێڕان بۆ خۆشۆردن

٧١ـ عن أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ): أَنَّهُا لَمَّا كَانَ عَامُ الْفَتْحِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) وهُوَ بِأَعْلَى مَكَّةَ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى غُسْلِه، فَسَتَرَتْ عَلَيْهِ فَاطِمَةُ، ثُمَّ أَخَذَ ثَوْبَهُ فَالْتَحَفَ بِهِ، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ سُبْحَةَ الضُّحَى. **(بخاري / الصلاة في ثياب/٢٥٠)**

(ام هانی) کچی (ابوطالب) دەڵێ: لەساڵی فەتحی مەککەدا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرووی مەککەوەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چوو بۆ شوێنی خۆشۆردن فاتمە پەردەیەکی بۆ گێڕا تا خۆی شۆرد، ئینجا جلەکانی خۆی هەڵگرت و پێچای لەخۆیەوەو، دوای ئەوە هەشت ڕکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد.

### ( ٦ ) بەتەنها خۆشۆردنی پیاوو خۆ پەنادانی

٧٢ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَذَكَرَ أَحَادِيثَ، مِنْهَا: وقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى سَوْأَةِ بَعْضٍ، وكَانَ مُوسَى (عليه السلام) يَغْتَسِلُ وحْدَهُ، فَقَالُوا: واللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلَّا أَنَّهُ آدَرُ، قَالَ: فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِه، قَالَ: فَجَمَحَ مُوسَى (عليه السلام) بِإِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي حَجَرُ ثَوْبِي حَجَرُ، حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى سَوْأَةِ مُوسَى، قَالُوا: واللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ، فَقَامَ الْحَجَرُ حَتَّى نُظِرَ إِلَيْهِ، (قَالَ: فَأَخَذَ

ثَوْبَهُ) فَطَفِقَ بِالْحَجِرِ ضَرْبًا". قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: واللَّهِ إِنَّهُ بِالْحَجِرِ نَدَبٌ، سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ، ضَرْبُ مُوسَى بِالْحَجَرِ. (بخاري/ الغسل/ من اغتسل عرياناً../٢٧٤)

(ابوهريره)(ﷺ) لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) چەند فەرموودەیەکی بۆ گێڕاینەوە لەوانەش وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "نەوەی ئیسرائیل بەڕوتی خۆیان دەشۆردو سەیری عەیبی یەکتریان دەکرد، موسا(عليه السلام) بەتەنیا خۆی دەشۆرد، وتیان: بەخوا موسا قۆڕە بۆیە بەتەنیا خۆی دەشۆرێت دەڵێ: جارێکیان موسا چوو خۆی بشوات، جلەکانی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکە جلەکانی رفاند، دەڵێ: موسا (عليه السلام) ناچار بەپەلە کەوتەدوایو دەیفەرموو: بەردەکە جلەکانم، بەردەکە جلەکانم ، هەتا خەڵکەکە سەیری موسایان کردو وتیان: بەخوا موسا هیچ عەیبێکی نییە. دەڵێ: ئینجا جلەکانی هەڵگرت و دەستی کرد بەلێدانی بەردەکە" (ابوهريره) دەڵێ: بەخوا لەبەردەکەدا شوێنی لێدانەکە دیاربوو، شەش یا حەوت شوێنی لێدان بەبەردەکەوەبوو.

## (٧) خۆپەنادان و نابێ مرۆڤ بە رووتی ببینرێت

٧٣ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَنْقُلُ مَعَهُمُ الْحِجَارَةَ لِلْكَعْبَةِ وعَلَيْهِ إِزَارُهُ، فَقَالَ لَهُ الْعَبَّاسُ عَمُّهُ: يَا ابْنَ أَخِي، لَوْ حَلَلْتَ إِزَارَكَ فَجَعَلْتَهُ عَلَى مَنْكِبِكَ دُونَ الْحِجَارَةِ. قَالَ: فَحَلَّهُ فَجَعَلَهُ عَلَى مَنْكِبِهِ، فَسَقَطَ مَغْشِيًّا عَلَيْهِ، قَالَ: فَمَا رُئِيَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ عُرْيَانًا. (بخاري / الصلاة في ثياب/ ٣٥٧)

(جابر) کوڕی(عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەردی دەگواستەوە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بۆ کەعبە کراسێکی لەبەردابوو، (عباس)ی مامی پێی وت: ئەی برازا با کراسەکەت بکردایەتەوە بتخستایەتە سەرشتانت لەژێر بەردەکاندا، وتی: کردیەوە خستیە سەرشانی ، بەڵام بووراپەوەو کەوت، دەڵێ: لەو رۆژە بەدواوە بەڕوتی نەبینراوە.

## (٨) خۆشۆردنی ژن و پیاو لەیەك دەفردا

٧٤ـ عَنْ مُعَاذَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ اناءرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ اناء واحد بَيْنِي وبَيْنَهُ، فَيُبَادِرُنِي، حَتَّى أَقُولَ: دَعْ لِي دَعْ لِي، قَالَتْ: وهُمَا جُنُبَانِ. (بخاري/ الغسل / هل يدخل الجنب يده في الاناء/ ٢٦٠)

(معان)له (عائشـه)ەوه (ﭬ) دەڵـیٚ: مـن و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەیـەك دەفـردا خۆمان دەشۆرد، ئەو دەستپێشخەری دەکرد، منیش دەموت: داینێ بـۆ مـن، داینـێ بۆ من دەڵێ: هەردووکمان لەشمان گرانبوو.

## (٩) دەستنوێژی لەشگران ئەگەر بیەوێ بخەوێ یان نان بخوات

٧٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﭭ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا كَانَ جُنُبًا، فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ، تَوَضَّأَ وضُو وهُو (للصَّلَاة). **(بخاري/ الغسل/ الجنب يتوضأ ثم ينام/ ٢٨٤)**

(عائشه) (ﭬ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەشگران بوایەو بیویستایە نان بخوات یان بخەوێت ، دەستنوێژی دەگرت وەکو (بۆ نوێژ) دەستنوێژ بگرێت.

## (١٠) تەیەموم

٧٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﭭ) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِه حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبيداء أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى الْتمَاسِه، وأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، ولَيْسُوا عَلَى ماء ولَيْسَ مَعَهُمْ ماء، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ (ﭬ) فَقَالُوا: أَلَا تَرَى إِلَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) وبِالنَّاسِ مَعَهُ، ولَيْسُوا عَلَى ماء ولَيْسَ مَعَهُمْ ماء؟ فَجاء أَبُو بَكْرٍ (ﭬ) ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) واضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ، فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) والنَّاسَ. ولَيْسُوا عَلَى ماء ولَيْسَ مَعَهُمْ ماء؟ قَالَتْ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وقَالَ مَا شَاَ و اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وجَعَلَ يَطْعُنُ بِيَدِه فِي خَاصِرَتِي، فَلَا يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلَّا مَكَانُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) عَلَى فَخِذِي، فَنَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ ماء، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عز آيَةَ التَّيَمُّمِ، فَتَيَمَّمُوا، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ وهُوَ أَحَدُ النُّقباء: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ رض: فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ. **(بخاري / اول كتاب التيمم / ٣٢٧)**

(عائشه)(ﭬ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەسەفەرێکدا دەرچـووین ڕۆیشـتین هـەتا گەیشـتینە بەیـدا یـا (ذات الجـیش)لـەوێ گەردانەکـەم بچـڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) وەستا بۆئەوەی بیدۆزینەوە، خەڵکەکەش وەسـتان، لەوجێگەیەشـدا نە ئاو هەبوو نەخۆیشیان ئاویان پێبوو(هەر بۆیە) خەڵکەکە چـوون بـۆ لای (ابـوبکر) (ﭬ) وتیان: نابینی عائشەی کچت چیکرد؟ پێغەمبـەری خـواو(ﷺ) ئـەم خەڵکەشـی

لێرەدا وەستاندووە، نەلەسەر ئاوێکیشین و نە ئاویشمان پێیە؟ ئەبوبکر هات و لەوکاتەشدا پێغەمبەر(ﷺ) سەری خستبوویە سەر ڕانم و خەوی لێکەوتبوو، وتی: پێغەمبەرو(ﷺ) ئەم خەڵکەت بۆ ئالێرەدا گیرداوە، نەشوێنەکە ئاوی لێیە نەئاویان پێیە؟ (عائشه)(ﷺ) وتی: (ابوبکر) زۆر سەرزەنشتی کردم ــ چەندە خواحەزبکات ـ خێراخێرا سیخورمەی دەدا لەکەلەکەم منیش لەبەرئەوەی سەری پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ڕانم بوو نەدەجولام ، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوشەوە تابەیانی لەوێ خەوت کاتێ هەستا ئاو نەبوو بۆ دەستنوێژ، هەر بۆیە خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوەو، هەموو تەیەمومیان کرد (اسید) کوری (خضیر)کەیەکێك بوو لەنەقیبەکان وتی: ئەی بنەماڵەی ئەبوبکر: ئەمە یەکەم بەرەکەت نییە کەخوا بەهۆی ئێوەوە پێی داوین. (عائشە)(ﷺ) وتی: کاتێ وشترەکەمان هەستا گەردانەکەم لەژێریابوو دۆزیمانەوە.

## ( ١١ ) تەیەمومی لەشگران

**٧٧ـ عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ وأبِي مُوسَى (ﷺ)، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلًا أَجْنَبَ فَلَمْ يَجِدِ الماء شَهْرًا، كَيْفَ يَصْنَعُ بِالصَّلَاةِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا يَتَيَمَّمُ وإِنْ لَمْ يَجِدِ الماء شَهْرًا، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: فَكَيْفَ بِهَذِهِ الْآيَةِ فِي سُورَةِ الْمَائِدَةِ: (فَلَمْ تَجِدُوا ماء فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا). فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ رُخِّصَ لَهُمْ فِي هَذِهِ الْآيَةِ لَأَوْشَكَ إِذَا بَرَدَ عَلَيْهِمُ الماء أَنْ يَتَيَمَّمُوا بِالصَّعِيدِ فَقَالَ أَبُو مُوسَى لِعَبْدِ اللَّهِ: أَلَمْ تَسْمَعْ قَوْلَ عَمَّارٍ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي حَاجَةٍ، فَأَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الماء، فَتَمَرَّغْتُ فِي الصَّعِيدِ كَمَا تَمَرَّغُ الدَّابَّةُ، ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: "إِنَّمَا يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ بِيَدَيْكَ هَكَذَا". ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ الْأَرْضَ ضَرْبَةً وَاحِدَةً، ثُمَّ مَسَحَ الشِّمَالَ عَلَى الْيَمِينِ، وظَاهِرَ كَفَّيْهِ ووَجْهَهُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَوَلَمْ تَرَ عُمَرَ لَمْ يَقْنَعْ بِقَوْلِ عَمَّارٍ (ﷺ)؟ (بخاري/ التيمم ضربة /٣٤٠)**

(شقیق) دەڵێ: من لەگەڵ (عبداللـه) و (ابوموسی)(ﷺ) دانیشتبووین ، (ابوموسی) وتی: ئەی باوکی (عبدالرحمن): ئایا ئەگەر پیاوێك لەشی گرانبوو و تا مانگێ ئاوی دەست نەکەوت، چۆن نوێژ بکات؟ (عبداللـه) وتی: تەیەموم ناکات بامانگێ ئاوی دەست نەکەوێ، (ابوموسی) وتی: ئەی چی دەکەیت لەگەڵ ئەم

ئایەتـەی سـوورەتی(المائـدة) :(ئەگـەر ئاویـان دەسـت نەکـەوت بـا بـەخۆڵێکی پـاك تەیەموم بکەن) (عبدالله) وتی: ئەگەر ئەو مۆڵەتەیان بدرێتیَ کەلەم ئایەتەدا هاتووە، لەوانەیە کاتیَ ئاویش ساردبێت بەخۆڵ تەیـەموم بکـەن، (ابوموسـی) بـە(عبداللـە)ی وت: ئایا ئەم قسەی عەممارت نەبیستووە کەدەڵیَ: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) بـۆ کارێـك ناردمی، تووشی لەشگرانی بووم، ئاوم دەست نەکەوت، منیش خۆمم لەخۆڵدا گەوزان وەکو ولاَغ، ئینجا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) بۆم گێڕایـەوە، فـەرمووی: "بـەڵکو ئەوەندەت بەس بـوو کەبەدەسـتەکانت ئاوابکـەیت" دەسـتی دا بەزەویـدا یـەك جـار (هێنای بەدەموچاویدا)پاشان دەستی چەپی هێنا بەدەست و قۆڵی راستیا (عبـدالله) ئایا نەتدی عومەر متمانەی بەقسەکەی عەممار نەبوو؟.

## (١٢) تەیەموم بۆ وەلاَمی سەلام

**٧٨ـ عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: أَقْبَلْتُ اناءعَبْدُ اللهِ بْنُ يَسَارٍ، مَوْلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبِي الْجَهْمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِّمَّةِ الْأَنْصَارِيِّ، فَقَالَ أَبُو الْجَهْمِ: أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَيْهِ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ، فَمَسَحَ وجْهَهُ ويَدَيْهِ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ. (بخاري / التيمم/ التيمم في الحضر اذا لم يجد الماء/٣٣٠)**

(عمير) کارگوزاری (ابن عباس)(رضي الله عنه) دەڵیَ: گوێی لە(ابن عباس) بووە وتوویـەتی: من و (عبدالله) کوڕی (یسار) کارگوزاری مەیمونەی هاوسـەری پێغەمبـەر(ﷺ) هـاتین هەتا چووینە لای (ابولجهم) کوری (الحارث)کـوری (الصـمد الانصـاري)، (ابـو الجهـم) وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەشریفی لەلای بیری جەمەلەوە هات پیاوێکی پێگەیشـت سەلامی لێکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەلاَمی سـەلامەکەی نەدایـەوە، هـەتا گەیشـتە دیوارەکەو مەسحی دەموچاوی و دەستیکرد، ئینجاوەلاَمی سەلامەکەی دایەوە.

## (١٣) ئیماندار پیس نابێت

**٧٩ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّهُ لَقِيَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وهُوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ، فَتَفَقَّدَهُ النَّبِيُّ (ﷺ)، فَلَمَّا جاءَهُ قَالَ: "أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقِيتَنِي وأَنَا جُنُبٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَا يَنْجُسُ". (بخاري / الغسل / ٣٧٩)**

(ابـوهريره) (ﷺ) دەڵـێ: لەیـەکێ لـە ڕێگاکـانی مەدینـەدا گەیشـتم بەخزمـەت پێغەمبەر(ﷺ) لەشگران بووم، بەپەنهانی ڕۆیشتم خۆمم شۆرد، پێغەمبـەر(ﷺ) بـۆم دەگـەڕا، کـاتێ کەهاتمـەوە فـەرمووی: "لـەکوێ بوویـت ئـەی ابـوهريره" وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـاتێ گەیشـتی بـەمن لەشـم پیسـبوو، پـێم خـۆش نـەبوو لەخزمەتتا دانیشـم هـەتا خـۆم دەشـۆم ، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: "سـبحان الله ، ئیماندار پیس نابێت".

# بەشی چوارەم: حەیز

## (١) چۆنێتی خۆشۆردنی ئافرەت لەحەیزو لەشگرانیی

٨٠ـ عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ اسماء -(رضي الله عنها)- سَأَلَت النَّبيَّ (ﷺ) عَنْ غُسْلِ الْمَحيض؟ فَقَالَ: تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ ماءهَا وسِدْرَتَهَا فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الماء، ثُمَّ تَأْخُذُ فِرصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِهَا". فَقَالَتْ اسماء: وكَيْفَ أَتَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّه، تَطَهَّرِينَ بِهَا". فَقَالَتْ عَائِشَةُ -كَأَنَّهَا تُخْفِي ذَلكَ- تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ. وسَأَلَتْهُ عَنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ؟ فَقَالَ: "تَأْخُذُ ماء فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ -أَوْ: تُبْلِغُ الطُّهُورَ -ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ حَتَّى تَبْلُغَ شُؤُونَ رَأْسِهَا، ثُمَّ تُفِيضُ عَلَيْهَا الماء". فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النساء نساء الْأَنْصَارِ، لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَا و أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ. (بخاري/ الحيض/ ٣٠٨).

(عائشـه)(دەڵـێ: (اسمـاء)(رضي الله عنها) پرسـیاری کـرد لەپێغەمبـەر(ﷺ) لـەبارەی خۆشۆردنی حەیزەوە؟ فەرمووی: یەکێکتان ئاو هەڵدەگرێت لەگەڵ سیدرا (گەڵای دارێکە لەباتی صابون بـەکاریان هێنـاوە)بەباشـی خـۆی پـاك دەکاتـەوە، ئینجـا ئـاو دەکات بـە سـەریا بەتوندی دەسـتی لێدەخات هـەتا ئـاو دەگاتـە پێسـتی سـەری ، پاشان ئاوی تر دەکا بەسەریا، ئینجا پارچە لۆکەیـەك هەڵدەگرێت و خـۆی پـێ پـاك دەکاتەوە.

(اسماء) وتی: چـۆن خـۆمی پـێ پـاك بکەمـەوە؟ فـەرمووی (سـبحان الله) خـۆتی پێپاك بکەرەوە" عائشە وتی: وەکو بیەوێ بەنهێنی پێیی بڵێ ـ شوێن و شوێنەواری خوێنەکـەی پێپـاك بکـەرەوە، ئینجـا پرسـیاری لێکـرد لـەبارەی خۆشـۆردنی لەشگرانییەوە؟ فەرمووی: "ئـاو هەڵدەگریت بەباشـی خـۆت دەشـۆریت، ئینجـا ئـاو دەکەیت بەسەرتاو دەست دەخەیت لەسەرت تا پێسـتی سـەرت تـەڕ دەبێـت، ئینجـا ئاویتر دەکەیت بەسـەرتا" عائشـە وتـی: باشـترین ئـافرەت ئـافرەتی ئەنسـارەکانن ، شەرم رێگای لێنەگرتن کەشارەزابن لەئاییینەکەیان.

## (٢) ئافرەتی حەیزدارو شۆردنی سەری پیاو

٨١ـ عن عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لَأَدْخُلُ الْبَيْتَ لِلْحَاجَةِ، والْمَرِيضُ فِيه، فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلَّا وأَنَا مَارَّةٌ. وإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وهُوَ فِي الْمَسْجِدِ،

فَأُرَجِّلُهُ. وكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ، إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا. (بخاري/ الاعتكاف / الحائض ترجل المعتكف/ ١٩٢٤)

(عائشه)(ﷺ) دەڵێ: هەر كـاتێ بـۆ پێویستیەك دەچـومە ژوورەوە نەخۆشـێكی لێبوایە، (هەواڵم نەدەپرسی مەگەر بـەدەم رێگـەوە كەتێدەپـەڕیم، جـاری واهـەبووە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری دەهێنا ژوورەوە بۆم خـۆی لەمزگەوتەكـەدابوو، منـیش سەریم شانە دەكرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەكاتی (اعتكاف)دا مەگەر بۆ پێویستیەك ئەگینا نەدەهاتە ماڵەوە.

## ( ٣ ) پاڵدانەوە لەكۆشی حەیزدارو خوێندنەوە

٨٢ــ عَنْ عَائشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَتَّكِئُ فِي حِجْرِي وأَنَا حَائِضٌ، فَيَقْرَأُ الْقُرْآنَ. (بخاري/ قراءة الرجل في حجر امرأته وهي حائض /٢٩٣)

عائشە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری دەكـردە سـەر كۆشـم و منـیش لەحەیزدا بووم، قورئانی دەخوێند.

## ( ٤ ) خەوتن لەیەك لێفەدا لەگەڵ حەیزدار

٨٣ــ عن أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَتْ: بَيْنَمَا أَنَا مُضْطَجِعَةٌ مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فِي الْخَمِيلَةِ إِذْ حِضْتُ، فَانْسَلَلْتُ فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَنفسْتِ". قُلْتُ: نَعَمْ، فَدَعَانِي فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ. قَالَتْ: وكَانَتْ هِيَ ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَغْتَسِلَانِ فِي الْانَاء الْوَاحِدِ منَ الْجَنَابَةِ. (بخاري / من سمى النفاس حيضاً/ ٢٩٤)

(ام سلمه) (ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكا من لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) راكشـابووم سەرچەفێكم بەسەروەبوو كەوتمە حەیزەوە، بەدزی رۆیشتم جلـی حـەیزم لەبـەركرد، پێغەمبەر(ﷺ) فـەرمووی: "كـە وتیتـە حـەیزەوە؟" وتم: بـەڵێ: بـانگی كـردم لـەژێر سەرچەفەكەدا لەگەڵیا راكشـام، (ام سـەلەمە) دەڵـێ: خـۆیو پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەیەك دەفردا پێكەوە خۆیان دەشۆرد لەلەشگرانیی.

## ( ٥ ) گەمەكردن لەگەڵ ئافرەت لەحەیزا

٨٤ــ عَنْ عَائشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائضًا، أَمَرَهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَنْ تَأْتَزِرَ فِي فَوْرِ حَيْضَتِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا، قَالَتْ: وأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَمْلِكُ إِرْبَهُ. (بخاري/الحيض/ مباشرة الحائض/ ٢٩٦)

(عائشه)(ﷺ) دەڵێ: ئەگەر یەکێکمان (لەهاوسەرەکانی پێغەمبەر(ﷺ)) لەحەیزا بوایا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدەکرد کە نێوان ناوك و ئەژنۆی بەباش داپۆشێت ، ئینجا گەمەی لەگەڵ دەکرد، دەڵێ: ئایا کامتان دەتوانن خۆتان بگرن، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەیتوانی خۆی بگرێت.

### (٦) خۆشتن و نوێژی کاتی خوێنی نەخۆشی

٨٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَت: اسْتَفْتَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ (ﷺ) رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ؟ فَقَالَ: "إِنَّمَا ذَلِك عِرْقٌ، فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي". فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ قَالَ اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ: لَمْ يَذْكُرِ ابْنُ شِهَابٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، أَمَرَ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ (ﷺ) أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ، ولَكِنَّهُ شيء فَعَلَتْهُ هِيَ. **(بخاري/ الحيض/ عرق المستحاضة/ ٣٢١)**

(عائشه)(ﷺ) دەڵێ: (ام حبيبه) کچی (جحش) پرسی لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی: من خوێنی نەخۆشیم پیادێت؟ فەرمووی: "ئەوە دەمارێکە، خۆت بشۆرە ، ئینجا نوێژ بکە" ئەویش بۆ هەموو نوێژێك خۆی دەشۆرد.(ليث)کوری (سعد) وتی: (ابن شهاب) ئەوەی نەوت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی کرد بە(ام حبيبە) (ﷺ) کە بۆ هەموو نوێژێك خۆی بشوات، بەڵکو شتێك بووە خۆی کردوویەتی.

### (٧) پێنج شت لەسروشتی پاکن

٨٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "الْفِطْرَةُ خَمْسٌ، أَوْ خَمْسٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: الْخِتَانُ، والِاسْتِحْدَادُ، وتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، ونَتْفُ الْإِبِطِ، وقَصُّ الشَّارِبِ". **(بخاري / اللباس/ قص الشارب/ ٥٥٥٠)**

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "سروشتی پاك پێنج شتە، یا پێنج شت لەسروشتی پاکە: خەتەنەکردن، بەرتاشین، نینۆك کردن، توکی بن باڵ هەڵکەندن، سمێڵ کورت کردنەوە".

### (٨) سیواکدان بەکەسی گەورە

٨٧ـ عن (عَبْدَ اللَّه) بْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَذَبَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الْآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الْأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الْأَكْبَرِ". **(بخاري/ الوضوء/ دفع السواك الى الاكبر/ ٢٤٣)**

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: "خەوم بینی لەخەودا بەسیواكێك سیواكم دەكرد، دووپیاو كێشیان كردم، یەكێكیان لەوی تریان گەورەتربوو، من سیواكەكەم دا بەبچووكەكەیان ، پێیان وتم: گەورەی كە، منیش دام بەگەورەكەیان"

## ( ٩ ) سمێڵ كورت بكەنەوەو ریش بهێڵنەوە

٨٨ـ عَن ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: أَحْفُوا الشَّوَارِبَ، وأَوْفُوا اللِّحَى". **(بخاري/ اللباس/ تقليم الاظافر / ٥٥٥٣)**

(عبدالله) كوڕی (عمر) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "پێچەوانەی موشریكەكان بكەن، سمێڵ كورت بكەنەوە ، ریش بهێڵنەوە".

## ( ١٠ ) شۆردنی میزی ناو مزگەوت

٨٩ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذْ جاء أَعْرَابِيٌّ فَقَامَ يَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَهْ مَهْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا تُزْرِمُوهُ، دَعُوهُ". فَتَرَكُوهُ حَتَّى بَالَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ: "إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لَا تَصْلُحُ لِشيء مِنْ هَذَا الْبَوْلِ ولَا الْقَذَرِ، إِنَّمَا هِيَ لِذِكْرِ اللَّهِ (ﷻ) والصَّلَاةِ وقراءة الْقُرْآنِ". أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: فَأَمَرَ رَجُلًا مِنَ الْقَوْمِ فَجاء بِدَلْوٍ مِنْ ماء فَشَنَّهُ عَلَيْهِ. **(بخاري/ الادب/ ٥٦٧٨)**

(انس) كوری (مالك) (ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكا ئێمە لەمزگەوت لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووین، عەرەبێكی دەشتەكی هات و لەمزگەوتەكەدا دەستی كرد بەمیزكردن، هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: نەكەی ، نەكەی، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "پێی مەبڕن، وازی لێ بێنن" وازیان لێهێنا هەتا میزەكەی كرد، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی كردوو فەرمووی: "ئەم مزگەوتانە جێگای میزكردن و پیسی كردن نییە، بەڵكو جێگای یادكردنەوەی خوای گەورەو نوێژو خوێندنی قورئانە"، ئینجا فەرمانیكرد بە پیاوێك لەو خەڵكە، ئەویش دۆلكەیە ئاوی هێناو رشتی بەسەریا)

## ( ١١ ) ئاو پرژاندن لەمیزی كوڕی شیرەخۆرە

٩٠ـ عن أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ (ﷺ): أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ، قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: أَخْبَرَتْنِي أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)،

فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِماء فَنَضَحَهُ عَلَى ثَوْبِهِ، ولَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلًا. **(بخاري/ الوضوء/ بول الصبيان/ ٢٢١)**

(ام قيس) کچی (محصن) (رضي الله عنها) دەڵێ: منداڵێکم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێشتا خواردنی نەدەخوارد، عبيدالله وتی: ئەو ژنە ئاگاداری کردم کە کوڕەکەی میزی کرد بەکۆشی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوی کردو پرژاندی بەسەر پۆشاکەکەیداو نەیشۆرد.

# بەشی پێنجەم: نوێژ

## ( ١ ) دەستپێکردنی بانگدان

**٩١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﭬ) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَجْتَمِعُونَ فَيَتَحَيَّنُونَ الصَّلَوَاتِ، ولَيْسَ يُنَادِي بِهَا أَحَدٌ، فَتَكَلَّمُوا يَوْمًا فِي ذَلِكَ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اتَّخِذُوا نَاقُوسًا مِثْلَ نَاقُوسِ النَّصَارَى، وقَالَ بَعْضُهُمْ: قَرْنًا مِثْلَ قَرْنِ الْيَهُودِ، فَقَالَ عُمَرُ (ﭬ): أَوَلَا تَبْعَثُونَ رَجُلًا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَا بِلَالُ، قُمْ فَنَادِ بِالصَّلَاةِ". (بخاري/ الاذان/ ٥٧٩)**

(عبدالله) کوڕی (عمر) (ﭬ) دەڵێ: لەکاتێکا موسڵمانەکان هاتن بۆ مەدینە کۆدەبوونەوەو کاتی نوێژیان دەخەملاند، کەس بانگی نەدەدا، ڕۆژێکیان باسی ئەوەیان کرد، هەندێکیان وتیان: بازەنگێکی وەکو زەنگی گاورەکان دابنێین، هەندێکی تریان وتیان: کەڕەنایەك وەکو کەڕەنای جولەکە دابنێین، عمر(ﭬ) وتی: ئەی بۆ پیاوێك نانێرن بانگ بدات بۆ نوێژ. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "ئەی بلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ"

## ( ٢ ) بانگدان جوتەو قامەتیش تاك

**٩٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﭬ) قَالَ: أُمِرَ بِلَالٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، ويُوتِرَ الْإِقَامَةَ، زَادَ يَحْيَى (فِي حَدِيثِهِ عَنِ ابْنِ عُلَيَّةَ: فَحَدَّثْتُ بِهِ أَيُّوبَ، فَقَالَ): إِلَّا الْإِقَامَةَ. (بخاري/ الاذان / ٥٨٢)**

(انس) (ﭬ) دەڵێ: فەرمانکرا بە(بیلال) کەبانگدان بەجووت بڵێت قامەتیش بەتاك، یەحیا (لەریوایەتەکەیدا) لە(ابن علیه)وە ئەمەی بۆ زیادکرد: ئەمەم بۆ (ایوب) گێڕایەوە وتی: بێجگە لەقامەت (واتە رستەی قد قامت الصلاه ـ دووجار دەیووت).

**٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﭬ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ، حَتَّى لَا يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قُضِيَ التَّأْذِينُ أَقْبَلَ، حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلَاةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ أَقْبَلَ، حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ ونَفْسِهِ يَقُولُ لَهُ: اذْكُرْ كَذَا، واذْكُرْ كَذَا، لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ مِنْ قَبْلُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى". (بخاري/ الاذان / فضل التاذين/ ٥٨٣)**

(ابوهریره) (ﭬ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر بانگدرا بۆ نوێژ شەیتان هەڵدێت و تڕ لێدەدات بۆ ئەوەی بانگەکە نەبیستێ، کاتێ بانگەکە تەواو

دەبێت، دێتەوە هەتا قامەت دەكرێت ئینجا هەڵدێتەوە، كاتێ قامەت تەواو دەبێ دێتەوە بۆ ئەوەی دالغە بۆ نوێژخوێنەكە دروست بكات، پێی دەڵێت: یادی ئەمەو ئەوە (شتیوا كەپێشتر لەیادیانەبوو) تاوا لەكابرا دەكات نازانێ چەند ركاتی كردووە".

٩٤–عَنْ عَائِشَةَ (﵂): أَنَّ الصَّلَاةَ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ، وأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَقُلْتُ لِعُرْوَةَ: مَا بَالُ عَائِشَةَ تُتِمُّ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنَّهَا تَأَوَّلَتْ كَمَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ. (بخاري / تقصير الصلاة / يقصر اذا خرج من موضعه/١٠٤٠)

عائشە(خوا لێی رازی بێت) دەڵێ: یەكەمجار كەنوێژ فەرزكرا دووركات بوو ، پاشان نوێژی سەفەر مایەوە بەدووركات و، نوێژی نیشتەجێ بەتەواو دانرا (زهری) دەڵێ: بە(عروە)م وت: بۆچی عائشە لەسەفەردا نوێژی تەواو دەكات؟ وتی: ئەو وەكو عوسمان تەئویلی كردووە.(كە هەردووكیان دروستە)

٩٥–عن مُحَمَّد بْنِ عَمْرٍو قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْحَجَّاجُ الْمَدِينَةَ، فَسَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، والْعَصْرَ والشَّمْسُ نَقِيَّةٌ، والْمَغْرِبَ إِذَا وجَبَتْ، والْعِشَا و أَحْيَانًا يُؤَخِّرُهَا وأَحْيَانًا يُعَجِّلُ، كَانَ إِذَا رَآهُمْ قَدِ اجْتَمَعُوا عَجَّلَ، وإِذَا رَآهُمْ قَدْ أَبْطَئُوا أَخَّرَ، والصُّبْحَ –كَانُوا، أَوْ قَالَ– كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ. (بخاري/ حاشية مواقيت الصلاة/ ٥٣٥)

(محمد) كوڕی(عمرو) دەڵێ: كاتێ حاجیەكان گەیشتنە مەدینە، پرسیارمان كرد لە(جابر) كوری(عبدالله) ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی لەگەرمای نیوەڕۆدا دەكرد نوێژی عەسریشی دەكرد كەهێشتا خۆر روون بوو، شێوانیش هەركاتێ خۆرئاوابوو، خەوتنانیش جارجار دوای دەخست و جارجاریش زوو دەیكرد: هەركاتێ دەیبینی كۆبوونەتەوە پەلەی دەكرد، ئەگەر ئەوان دوابكەوتنایە ئەمیش دوای دەخست. بەیانیش (بەتاریكی دەیكرد) یا راوی دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) بەتاریكی دەیكرد.

٩٦ـ عَنْ أَبِي بَكْرِ بن أبي موسى الاشعريٍّ عَنْ أَبِيهِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ". (بخاري/ مواقيت الصلاة /٥٤٨)

(ابـوبكر) كـوری (ابـو موسـی الاشـعری) لەباوكیـەوە دەگێڕێتـەوە: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: "هەركـەس دوونوێـژی فێنكـی (واتـە بـەیانیو عەسـر بكـات) دەچێتە بەهەشتەوە".

## (٣) بەفێنكی نوێژكردن لەكاتی گەرمادا

**٩٧ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) قَالَ: أَذَّنَ مُؤَذِّنُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالظُّهْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) "أَبْرِدْ أَبْرِدْ. أَوْ قَالَ: انْتَظِرِ، انْتَظِرْ". وقَالَ: "إِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ، فَإِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا عَنِ الصَّلَاةِ". قَالَ أَبُو ذَرٍّ: حَتَّى رَأَيْنَا فَيْ و التُّلُولِ. (بخاري/ مواقيت الصلاة / الابراد بالظهر في شدة الحر/ ٥١١)**

(ابـوذر)(ﷺ) دەڵـێ: بانگبێـژی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـانگی نیوەڕۆیـدا ، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: "فێنكـی كـە فێنكـی كـە ، یـا فـەرمووی: چـاوەڕێ بكـە چاوەڕێ بكەو فەرمووی: بەهێزی تینی گەرما لـەهاڵاوی دۆزەخـە، جـا ئەگـەر گـەرما بـەتین بـوو نوێـژەكان بخەنـە كـاتی فێنكـی". (ابـوذر) دەڵـێ : هـەتا سـێبەری گردۆڵكەكانمان بینی.

## (٤) سەرەتـای كـاتی نوێژی عەسر

**٩٨ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ والشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي، فَيَأْتِي الْعَوَالِيَ والشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ. (بخاري/ مواقيت الصلاة / وقت العصر/٥٢٥)**

(انس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) نوێـژی عەسـری دەكـردو خۆر بەرزو بەتین بوو رێبوارێـك دەچـوو بـۆ گونـدەكانی دەوری مەدینـە، دەگەیشـتە ئەوێو هێشتا خۆر بەرزدەبوو.

## (٥) هەڕەشە لەوكەسەی نوێژی عەسری دەچێت

**٩٩ـ عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ كَأَنَّما ءترَ أَهْلَهُ ومالَهُ". (بخاري / مواقيت الصلاة /٥٢٧)**

(عبدالله) كـوڕی(عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فـەرمووی: "ئـەوەی نوێژی عەسری دەچێت هەروەكو ئەوەوایە ماڵ و خێزانی تاڵان كرابێت".

## ( ٦ ) لەبارەی نوێژی ناوەندەوە( الوسطى )

١٠٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن المسعود (رضي الله عنه) قَالَ: حَبَسَ الْمُشْرِكُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ، حَتَّى احْمَرَّتِ الشَّمْسُ أَوِ اصْفَرَّتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "شَغَلُونَا عَنِ الصَّلَاةِ الْوُسْطَى صَلَاةِ الْعَصْرِ، مَلَأَ اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا. أَوْ (قَالَ): حَشَا اللَّهُ أَجْوَافَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا". (اخرجه البخاري في الجهاد بان الدعاء على المشركين ٢٧٧٣)

(عبدالله) کوڕی (مسعود)(رضي الله عنه) دەڵێ: موشریکەکان ڕێگەیان نەدا کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نوێژی عەسر بکات، هەتا خۆر سوورهەڵگەڕا یازەردبوو، ئنجا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "خەریکیان کردین لەنوێژی ناوەڕاست ، نوێژی عەسر، خوای گەورە ناوسکیان و گۆڕەکانیان پڕبکات لەئاگر. یا(فەرمووی)خوای گەورە ناوسکیان و گۆڕەکانیان بەئاگر بئاخنێ".

١٠١–عن أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّيهِمَا بَعْدَ الْعَصْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّيهِمَا قَبْلَ الْعَصْرِ، ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُمَا، أَوْ نَسِيَهُمَا، فَصَلَّاهُمَا بَعْدَ الْعَصْرِ، ثُمَّ أَثْبَتَهُمَا، وكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَثْبَتَهَا. قَالَ إِسْمَعِيلُ بنُ جعفرٍ: تَعْنِي دَاوَمَ عَلَيْهَا. (بخاري، مواقيت الصلاة /٥٩٥ ـ ٥٦٨)

(ابو سلمه) پرسیاری کردووه لە(عائشە) (ر.ض)لەبارەی ئەو دوو رکاتەی کەپێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیکردن لەدوای عەسر؟ ئەویش وتوویەتی: لەپێش عەسرا دەیکردن، سەرقاڵیی نەیهێشتبوو بیانکات، یا لەبیری چووبوو ، لەبەر ئەوە دوای عەسر کردوویەتی ، ئینجا بەردەوام بووە لەسەری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر نوێژێکی بکردایە بەردەوام دەبوو لەسەری.

## ( ٧ ) گێرانەوەی نوێژی عەسر

١٠٢ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) يَوْمَ الْخَنْدَقِ جَعَلَ يَسُبُّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، واللَّه مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "فَوَاللَّهِ إِنْ صَلَّيْتُهَا". فَنَزَلْنَا إِلَى بُطْحَانَ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وتَوَضَّأْنَا، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْعَصْرَ بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ. ثُمَّ صَلَّى بَعْدَهَا المغربَ. (بخاري / مواقيت الصلاة/ ٥٧١)

(جابر) کوری (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەرۆژی خەندەقا (عمر) کوری (خطاب) جنێوی بەکافرەکانی قورەیش دەدا، ئینجاوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بەخوا نوێژی عەسرم نەکرد هەتا خەریکبوو خۆرئاوادەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:

"سوێند بەخوا منیش نوێژم نەکردووە" بۆیە دابەزین بۆ (بطحان) پێغەمبەر(ﷺ) دەستنوێژی گرت، ئێمەش دەستنوێژمان گرت، پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوەی خۆرئاوابوو نوێژی عەسری کرد، ئینجا دوای ئەوە نوێژی شێوانی کرد.

## (٨) کاتی شێو ئەو کاتەیە خۆرئاوا دەبێت

**١٠٣ـ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ إِذَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ وتَوَارَتْ بِالْحِجَابِ.** (بخاري/ مواقيت الصلاة / وقت المغرب /٥٣٦)

(سلمه) کوری (اکوع) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ خۆرئاوا دەبوو دیارنەدەما نوێژی شێوی دەکرد.

## (٩) کاتی نوێژی خەوتنان و دواخستنی

**١٠٤ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: أَعْتَمَ النَّبِيُّ (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ، وحَتَّى نَامَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى فَقَالَ: "إِنَّهُ لَوَقْتُهَا، لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي". (بخاري/ مواقيت الصلاة / فضل العشا و/٥٤١)**

عائشه(ر.ض) دەڵێ: شەوێکیان پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی خەوتنی دواخست هەتا زۆربەی شەو رۆیشت و خەڵکی ناو مزگەوت خەوتن، ئینجا هات و نوێژی کردو فەرمووی: "لەراستیدا ئەگەر گران نەبوایە لەسەر ئوممەتم، ئەمە کاتیەتی".

## (١٠) ئەوەی گەیشت بەرکاتێك گەیشتووە بەنوێژەکە

**١٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلَاةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ". (بخاري/ مواقيت الصلاة / ٥٥٥)**

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەوەی گەیشت بەرکاتێك لەنوێژەکە ئەوە گەیشتووە بەنوێژەکە".(لە نوێژی جەماعەتدا)

**١٠٦–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ سَائِلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ: "أَوَلِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ". (بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٥١)**

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پرسیارکەرێك پرسیاری لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد لەبارەی نوێژەوە لەیەك پۆشاکدا؟ ئەویش فەرمووی: "بۆ هەمووتان دوو پۆشاکتان هەیە".

عن عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ واحِدٍ مُشْتَمِلًا بِهِ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، واضِعًا طَرَفَيْهِ عَلَى عَاتِقَيْهِ. **(بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٤٩)**

(عمر) كوڕی (ابو سلمه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) دیووە نوێژی دەكرد لەیەك پۆشاكدا كە پێچابوی لەخۆی لەماڵی (ام سلمه) هەردوو چەمەكەی خستبووە سەر هەردووشانی.

## ( ١١ ) نوێژ لە پۆشاكی خەتخەتدا

١٠٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي خَمِيصَةٍ ذَاتِ أَعْلَامٍ، فَنَظَرَ إِلَى عَلَمِهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ: "اذْهَبُوا بِهَذِهِ الْخَمِيصَةِ إِلَى أَبِي جَهْمِ بْنِ حُذَيْفَةَ وأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيِّهِ، فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عن صَلَاتِي". **(بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٢٦٦)**

(عائشه) (ر.ض) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا دەستیكرد بەنوێژ لەبەرگێكی چوارگۆشەدا كە خەتخەت بوو، سەیری خەتەكانی دەكرد، كاتێ لەنوێژەكەی بوویەوە ، فەرمووی: "ئەم بەرگە ببەن بۆ (ابوجهم) كوری (حذیفة) بەرگێكی ئەستووری سادە بۆ من بهێنن ، چونكە خەیاڵی بردم لەنوێژەكەمدا".

## ( ١٢ ) نوێژ لەسەر حەسیر

١٠٨ـ عَنْ إِسْحَقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: "قُومُوا فَأُصَلِّيَ لَكُمْ". قَالَ أَنَسُ (بْنُ مَالِكٍ): فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِماءٍ، فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، وصَفَفْتُ اناءالْيَتِيمُ وراءهُ، والْعَجُوزُ مِنْ ورائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ. **(بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٦٦)**

(اسحاق) كوری(عبدالله) كوری(ابوطلحة) لە (انس) كوری (مالك)ەوە بۆمان دەگێڕێتەوە كە مولەیكەی نەنكی بانگێشتنی پێغەمبەری خوای (ﷺ) كرد بۆ خواردنێك كە سازی كردبوو، ئەویش لێی خوارد، پاشان فەرمووی: "هەستن با نوێژتان بۆ بكەم" (انس) دەڵێ: هەستاین لەسەر حەسیرێكی ئێمە كەلەبەر كۆنی

ڕەش دا گەڕابوو، ئاورشێنێکم کرد بەئاو پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەری من و مندالێکی بێباوك لەدوایەوە ریزبووین (پیرەژنەکەش لەدوامانەوە بوو) ،پێغەمبەر(ﷺ) دووركاتی بۆ کردین و پاشان ڕۆیشت.

## (١٣) نوێژ بەنەعلەوە

١٠٩ـ عن سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِي النَّعْلَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ. **(بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٧٣)**

(سعيد) کوری(یزید) دەڵێ: بە(انس) کوری(مالك)م (رضي الله عنه) وت: ئایا پێغەمبەری خوا بەنەعلەکانیەوە نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ.

## (١٤) یەکەم مزگەوت لەسەرزەویدا کرایەوە

١١٠ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ مَسْجِدٍ وضِعَ فِي الْأَرْضِ أَوَّلُ؟ قَالَ: "الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ". قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: "الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى". قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: "أَرْبَعُونَ سَنَةً، وأَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ فَصَلِّ، فَهُوَ مَسْجِدٌ". **(بخاري/ الانبياء/ ٣١٨٦).**

(ابوذر)(رضي الله عنه) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کام مزگەوت یەکەم مزگەوتە لەسەرزەویدا؟ فەرمووی: "مزگەوتی حەرام" وتم : پاشان کام؟ فەرمووی: "مزگەوتی ئەقسا" وتم: ماوەی نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: "چل ساڵ، لەهەر شوێنێکیش کاتی نوێژ هات نوێژ بکە، ئەوە مزگەوتە".

## (١٥) دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)

١١١ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَنَزَلَ فِي عُلْوِ الْمَدِينَةِ فِي حَيٍّ يُقَالُ لَهُمْ: بَنُو عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَأَقَامَ فِيهِمْ أَرْبَعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ إِنَّهُ أَرْسَلَ إِلَى مَلَإِ بَنِي النَّجَّارِ، فَجَاءوا مُتَقَلِّدِينَ بِسُيُوفِهِمْ، قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى رَاحِلَتِهِ وأَبُو بَكْرٍ رِدْفُهُ، ومَلَأُ بَنِي النَّجَّارِ حَوْلَهُ حَتَّى أَلْقَى بِفِنَا و أَبِي أَيُّوبَ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي حَيْثُ أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ، ويُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَمَرَ بِالْمَسْجِدِ، قَالَ فَأَرْسَلَ إِلَى مَلَإِ بَنِي النَّجَّارِ فَجَاءوا فَقَالَ: "يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا". قَالُوا: لَا واللَّهِ لَا نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلَّا إِلَى اللَّهِ (عز وجل). قَالَ أَنَسٌ: فَكَانَ فِيهِ مَا أَقُولُ: كَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وقُبُورُ الْمُشْرِكِينَ وخِرَبٌ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)

بِالنَّخْلِ فَقُطِعَ، وبِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، وبِالْخَرِبِ فَسُوِّيَتْ، قَالَ: فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةً، وجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ حِجَارَةً، قَالَ: فَكَانُوا يَرْتَجِزُونَ ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَعَهُمْ، وهُمْ يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَهْ فَانْصُرِ الْأَنْصَارَ والمهاجرة **(بخاري/ المساجد/ ٤١٨)**

(انس) كورى(مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا(ﷺ) هات بۆ مەدینە لەسەرووى مەدینە دابەزى لەناو تیرەیەكدا پێیان دەوتن: نەوەى(عمرو كورى عوف) چواردەشەو لەناویاندا مایەوە، پاشان ناردى بەدواى پیاوماقوڵانى (بنى النجار)دا، ئەوانیش هاتن شمشێرەكانیان لەملیاندا بوو، راوى دەڵێ: هەر دەڵێی ئێستا چاوم لەپێغەمبەرى خوایە (ﷺ) بەسەر وشترەكەیەوە (ابوبكر)وا لەپاشكۆیداو پیاوماقوڵانى (بنى النجار) دەورەیان داوە هەتا گەیشتە بەردەم ماڵى (ابو ایوب) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا(ﷺ) لەهەر شوێنێك كاتى نوێژ بهاتایە نوێژى دەكرد، لەمۆڵگاى عەریش نوێژى كرد، پاشان فەرمانى كرد بەدروستكردنى مزگەوت، دەڵێ: ناردى بەدواى پیاوماقوڵانى (بنى النجار) ئەوانیش هاتن و پێى فەرموون: ئەى (بنى النجار) مامەڵەى ئەم باخە خورمایەتانم لەگەڵ بكەن"، وتیان : نەبەخوا نرخمان ناوێ تەنها لەخواى (عزوجل) نەبێ، (انس) دەڵێ: باخەكە ئەمانەى تێدابوو دارخورماو گۆڕى موشریكەكان و چەند كەلاوەیەكیش ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیكرد بەبڕینى دارخورماكان و، هەڵتەكاندنى گۆڕى موشریكەكان و كەلاوەكانیش تەخت كران، دەڵێ: دارخورماكانیان لەلاى قیبلەوە ریزكرد، دوولاكەیشى بەبەرد دانرا، دەڵێ : ئەوان سروودیان دەخوێندەوە، پێغەمبەرى خواش (ﷺ) لەگەڵیانا هەموو دەیانوت : اللَّهُمَّ لَا خَيْرَ إِلَّا خَيْرُ الْآخِرَهْ فَانْصُرِ الْأَنْصَارَ والمهاجرة. واتە: خوایە گیان خێر هەر خێرى رۆژى دواییە، دە كۆچبەران و یاریدەدەران سەركەوتوو بكە.

## ( ١٦ ) هاتن بۆ مزگەوتى ( قباء )و نوێژكردن تیَیدا

١١٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْتِي مَسْجِدَ قباء رَاكِبًا ومَاشِيًا، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. **(بخاري/ التطوع/ اتيان مسجد قباء / ١١٣٦)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەرى خوا(ﷺ) بەسوارى و یان بەپێ دەهات بۆ مزگەوتى (قوبا) دووركات نوێژى تێدادەكرد.

## ( ١٧ ) خێری ئەوەی مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات

**١١٣ــ عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ (ﷺ): أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (ﷺ) أَرَادَ بِنَا وَ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّاسُ ذَلِكَ، فَأَحَبُّوا أَنْ يَدَعَهُ عَلَى هَيْئَتِه، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَنْ بَنَى مَسْجِدًا لِلَّهِ بَنَى اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ مِثْلَهُ". (بخاري/ / المساجد / من بنى مسجداً/ ٤٣٩)**

(محمود) كوری (لبيد) (ﷺ) دەڵێ: (عثمان)كوڕی(عفان) (ﷺ) ویستی مزگەوت دروست بكاتەوە، خەڵك ئەوەیان پێناخۆش بوو، حەزیان دەكرد، وەكو خۆی بمێنێتەوە بۆیە وتی: لەپێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەركەس مزگەوتێك بۆ خوا دروست بكات خوا لە بەهەشتا بەوێنەی ئەوەی بۆ دروست دەكات".

## ( ١٨ ) بەئارامی هاتن بۆ نوێژ و پەلەنەكردن

**١١٤ــ عن أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَسَمِعَ جَلَبَةً، فَقَالَ: "مَا شَأْنُكُمْ". قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلَاة، قَالَ: "فَلَا تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا سَبَقَكُمْ فَأَتِمُّوا". (بخاري/ الاذان / قول الرجل فااتتنا الصلاة / ٦٠٩)**

(ابو قتادە) (ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژمان دەكرد گوێی لە دەنگی پەلەپەلیەك بوو، فەرمووی: ئەوە چیتانە. وتیان: پەلەمان كرد بۆ نوێژ، فەرمووی: "وا مەكەن، ئەگەر هاتن بۆ نوێژ دەبێ ئارام و لەسەر خۆبن، بەچەندیا گەیشتن بیكەن، ئەوەش لەپێشتانەوە كراوە تەواوی بكەن".

**١١٥ــعَمْرَةَ (بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ): أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) تَقُولُ: لَوْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى مَا أَحْدَثَ النساء لَمَنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَمَا مُنِعَتْ نساء بَنِي إِسْرَائِيلَ. قَالَ: فَقُلْتُ لِعَمْرَةَ: أنساء بَنِي إِسْرَائِيلَ مُنِعْنَ الْمَسْجِدَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. (بخاري/ صفة الصلاة/ انتظار الناس قيام الامام العالم /٨٣١)**

(عمرة بنت عبدالرحمن) دەڵێ: لەعائشەی هاوسەری پێغەمبەری (ﷺ) بیستووە دەیوت: ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیدیایە ئافرەتان چییان داهێناوە* (كەدێن بۆ مزگەوت) ڕێگری دەكران هەروەكو ڕێگری لەئافرەتانی نەوەی ئیسرائیل كرا، راوی

* واتە: خۆڕازاندنەوەو دەرخستنی جوانیانو بۆن لەخۆدان.

دەڵێ:بەعەمرەم وت: ئایا ئافرەتانی نەوەی ئیسرائیل ڕێگری مزگەوتیان لێکرا؟ وتی: بەڵێ.

### ( ١٩ ) هەر کات چووە مزگەوت بادوو ركات نوێژ بكات

**١١٦ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) جَالِسٌ بَيْنَ ظَهْرَانَي النَّاسِ، قَالَ: فَجَلَسْتُ، فقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا مَنَعَكَ أَنْ تَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تَجْلِسَ". قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، رَأَيْتُكَ جَالِسًا والنَّاسُ جُلُوسٌ. قَالَ: "فَإِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلَا يَجْلِسْ حَتَّى يَرْكَعَ رَكْعَتَيْنِ". (بخاري/ المساجد / اذا اتصل المسجد فليركع ركعتين /٤٣٣)**

(ابـو قتـادە) (ﷺ) دەڵـێ: چـوومە مزگـەوت و پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەناو خەڵكەكەدا دانیشتبوو دەڵێ: منیش دانیشتم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "چـی ڕێـی لێگرتـی دوو ركـات نوێـژ بكـەیت پـێش ئـەوەی دابنیشـێت"، دەڵـێ: وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا دیـم بـەڕێزتان دانیشـتووەو، خەڵكەكـەش دانیشـتووە، فـەرمووی: ئەگەر یەكێكتان هاتە مزگەوتەوە، بادانەنیشێ هەتا دوو ركات نوێژ دەكات".

**١١٧–عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (ﷺ): "الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا". (بخاري/ المساجد/ كفارة البزاف/٤٠٥)**

(انس) كـوری (مالـك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "تـف ڕۆكردن لەمزگەوت تاوانە، كەفارەتیشی شاردنەوەیەتی"

### ( ٢٠ ) كەراهەتی خواردنی سیرو هاتن بۆ مزگەوت

**١١٨ ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ: "مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ –يَعْنِي الثُّومَ– فَلَا يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ". (بخاري/ صفة الصلاة/ ٨١٥)**

(ابـن عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەغـەزای خەیبـەردا فـەرمووی: "هەركەس لەم درەختەی خوارد ـ واتە سیر ـ بانەیەتە مزگەوتەكان".

**١١٩– عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِاللهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلًا فَلْيَعْتَزِلْنَا، أَوْ: لِيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، ولْيَقْعُدْ فِي بَيْتِه". وإِنَّهُ أُتِيَ بِقِدْرٍ فِيهِ خَضِرَاتٌ مِنْ بُقُولٍ، فَوَجَدَ لَهَا رِيحًا، فَسَأَلَ فَأُخْبِرَ بِمَا فِيهَا مِنَ الْبُقُولِ، فَقَالَ: "قَرِّبُوهَا". إِلَى بَعْضِ أَصْحَابِه، فَلَمَّا رَآهُ كَرِهَ أَكْلَهَا قَالَ: "كُلْ، فَإِنِّي أُنَاجِي مَنْ لَا تُنَاجِي". (بخاري/ صفة الصلاة/ ٨١٦)**

(جـابر) كـوری (عبـدالله) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "هەرکەس سیروپیازی خوارد با دوور بکەوێتەوە لێمان "لەمزگەوتەکانمان"و لـەماڵی خۆیدا دابنیشێت) هەروەها قابلەمەیەکیان هێنا کە پاقلەمەنی تێدابوو کە بینی بـۆنی لێدێت ، پرسـیاری لـەبارەوە کـرد، وەڵامیـان دایـەوە پاقلەمـەنی تێدایە فـەرمووی: "نزیکی بکەنـەوە" لەهەنـدێ لـەهاوەڵانیی، کـاتێ چـاوی پێـی کـەوت حـەزی نـەکرد بیخوات ، فەرمووی: "بخۆ، من موناجات دەکەم لەگەڵ ئەوەی موناجات ناکات".

## (٢١) ڕێگریکردن لەکردنی گۆڕ بە مزگەوت

**١٢٠ــ عن عَائِشَةَ وعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَا: لَمَّا نُزِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ كَشَفَهَا عَنْ وجْهِهِ، فَقَالَ وهُوَ كَذَلِكَ: "لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ والنَّصَارَى، اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ". يُحَذِّرُ مِثْلَ مَا صَنَعُوا. (بخاري/ المساجد/ الصلاة في البيعة /٤٢٥)**

(عائشـە) (ﷺ) و عەبـدوڵلای کـوری عبـاس(ر.ض)دەڵـێن کـاتێ پێغەمبـەر(ﷺ) لەسەرەمەرگدابوو، سەرچەفەکەی دەدا بەدەموچاویدا، کاتێ دڵتەنگ دەبوو لایدەبرد لەسەر دەموچاوی، لەوحاڵەدا فەرمووی: "نەفرینی خوا لەجولەکەو لەگاور کە گـۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت".

**١٢١–عَنْ عَائِشَةَ: أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ وأُمَّ سَلَمَةَ –(ﷺ)– ذَكَرَتَا كَنِيسَةً رَأَيْنَهَا بِالْحَبَشَةِ – فِيهَا تَصَاوِيرُ– لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ أُولَئِكَ إِذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وصَوَّرُوا، فِيهِ تِلْكِ الصُّوَرَ أُولَئِكِ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري/ المساجد/ هل تنبش قبور مشركي الجاهلية /٤١٧)**

(عائشە)( ﷺ)دەڵێ: (ام حبیبە)و (ام سلمە) (ر.ض)باسی کڵێسـایەکیان دەکـرد کە لەحەبەشە دیویانە ـ وێنەی ـ پێغەمبەرێکی خوای(ﷺ) تێـدابووە، پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: "ئەوانـە ئەگـەر پیاوچـاکێکیان تێـدا بوایـەو بمردایـە مزگـەوتیان لەسـەر گۆڕەکەی دروست دەکـرد، ئـەو وێنانەشـیان تێـدا دروسـت دەکـرد، ئەوانـە لـەڕۆژی قیامەتدا خراپترین کەسن لای خوا".

## ( ٢٢ ) هەموو زەویم بۆكراوە بەمزگەوت پاكۆكەریشە

١٢٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "فُضِّلْتُ عَلَى الْانبياء بِستٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ ونُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَهُوراءمَسْجِدًا، وأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ". (بخاري/ نصرت بالرعب مسيرة شهر/ ٢٨١٥)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "بەشەش شت رێزم دراوە بەسەر پێغەمبەراندا: وشەی پڕمانام پێدراوە، بەترس خستنە دڵی دوژمنانم پشتگیریم لێكراوە، دەستكەوتی جەنگم بۆ حەلاڵكراوە، كراوە، زەویم بۆ كراوە بە پاكۆكەر و كراوە بە سوجدەگاش بۆم، بۆ هەموو دروستكراوەكان رەوانەكراوم، كۆتایی پێغەمبەران بەمن هاتووە". (پاكۆكەر واتە: لەجێی ئاو تەیەممومی پێ دەكرێت)

## ( ٢٣ ) نزیكی لەبەربەستەوە

١٢٣ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ) قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ. (بخاري/ سترة المصلي/٤٧٤)

(سهلی) كوری(سعدی الساعدی) (ﷺ) دەڵێ: لەنێوان جێ نوێژەكەی پێغەمبەری خواو(ﷺ) دیوارەكەدا بزنە رێیەك هەبوو.

## ( ٢٤ ) فەرمان كردن بەرووكردنە قیبلە

١٢٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى، ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي نَاحِيَةٍ... وفِيهِ: "إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَسْبِغِ الوضوء، ثُمَّ اسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ فَكَبِّرْ".(أنظر الحديث: ٢٨٢). (بخاري/ الاستئذان / ٥٨٩٧)

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە مزگەوت و نوێژی كرد، پێغەمبەر(ﷺ) لەسوچێكدا بوو، لەم فەرموودەدا هاتووە "ئەگەر هەستای بۆ نوێژكردن، بەباشی دەستنوێژ بگرە، ئینجا رووبكەرە قیبلە ، ئینجا (الله اكبر)ی نوێژ دابەستن بكە".

## ( ٢٥ ) گۆڕینی قیبلە لەشامەوە بۆ مەككە

١٢٥ـ عَنِ الْبراء بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ (١٤٤)(وَحَيْثُمَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وجُوهَكُمْ

شَطْرَهُ) فَنَزَلَتْ بَعْدَمَا صَلَّى النَّبِيُّ (ﷺ)، فَانْطَلَقَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَمَرَّ بِنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ وهُمْ يُصَلُّونَ، فَحَدَّثَهُمْ بالحديث، فَوَلَّوْا وجُوهَهُمْ قِبَلَ الْبَيْتِ. **(بخاري/ التمني/ ٦٨٢٥)**

(براء)كوڕی (عازب) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) شانزە مانگ نوێژمان ڕووەو (بەیتول مەقدیس) دەكرد، هەتا ئەم ئایەتەی سورەتی(البقرة) دابەزی (وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ) كاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژ بوویەوە ئایەتەكەی بۆ دابەزی، پیاوێك لەوان ڕۆیشت تێپەڕی بەلای چەند كەسێكدا لەئەنصارەكان نوێژیان دەكرد، ئەوەی بۆ گێڕانەوە ، ئەوانیش ڕوویان وەرگێڕا بۆ لای كەعبەوە.

## ( ٢٦ ) ئەگەر قامەتكرا كەی خەڵكی هەڵدەستن بۆ نوێژ

١٢٦ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي". **(بخاري/ الاذان/ ٦١١)**

(ابوقتادە) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر قامەت كرا هەڵمەستن هەتا دەمبینن".

## ( ٢٧ ) ڕۆیشتنی ئیمام بۆ خۆشۆردن لەدوای قامەت

١٢٧ـ عن أَبي سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) يَقُولُ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَقُمْنَا، فَعَدَّلْنَا الصُّفُوفَ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى إِذَا قَامَ فِي مُصَلَّاهُ قَبْلَ أَنْ يُكَبِّرَ، ذَكَرَ، فَانْصَرَفَ، وقَالَ لَنَا: "مَكَانَكُمْ". فَلَمْ نَزَلْ قِيَامًا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى خَرَجَ إِلَيْنَا وقَدِ اغْتَسَلَ، يَنْطُفُ رَأْسُهُ ماء، فَكَبَّرَ فَصَلَّى بِنَا. **(بخاري/ الغسل/ ٢٥١)**

(ابو مسلم) كوری(عبدالرحمن) كوری(عوف) دەڵێ: لە (ابوهریرە)(رضي الله عنه)م بیست دەیووت: قامەتكرا، هەستاین بۆ نوێژ ، ڕیزەكانمان ڕێك كرد، پێش ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بێتە لامان، كاتێ تەشریفی هات چووە شوێنی نوێژكردن، بەڵام پێشئەوەی تەكبیر بكات بیری كەوتەوە گەڕایەوە ، فەرمووی: "لەجێگای خۆتان بن" ئێمە وەستاین لەجێگای خۆمان چاوەڕێمان كرد هەتا تەشریفی هاتەوە خۆی شۆردبوو، سەری ئاوی لێدەتكا، ئینجا تەكبیری كردو نوێژی بۆكردین".

## ( ٢٨ ) خێری ریزی پێشەوە

١٢٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَا و والصَّفِّ الْأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا، ولَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ، ولَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ والصُّبْحِ لَأَتَوْهُماءلَوْ حَبْوًا". (بخاري/ الاسهام في الاذان / ٥٩٠)

(ابـوهريره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: "ئەگـەر خـەڵك بیانزانیایە بانگ و ریزی یەكەم چیان تێدایە، ئەگەر دەست نەكەوتایە بـە تیروپشـك نەبێ، تیروپشكیان بۆدەكرد، خۆ ئەگەر بیانزانیایە لەزوو هـاتن بـۆ نوێـژ چ خێرێكـی هەیە پێش برکێیان بۆ دەكرد، ئەگەر بیانزانیایە نوێژی خەوتنان و نوێـژی بەیانیانـدا چ خێرێك هەیە، ئەگەر بەگاگۆڵكێش بوایە دەهاتن بۆی".

## ( ٢٩ ) سیواك كردن لەگەڵ هەموو نوێژێكدا

١٢٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ)، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ – وَفِي حَدِيثِ زُهَيْرٍ: عَلَى أُمَّتِي– لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ". (بخاري/ الجمعة/ ٨٤٧)

(ابـوهريره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "ئەگـەر لەسـەر ئیمانداران – لەریوایەتێكی تردا– لەسەر ئوممەتم قورس نەبوایە فەرمانم پێـدەكردن كەسیواك بكەن لەگەڵ هەموو نوێژێكدا".

١٣٠ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا قَامَ لِلصَّلَاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى تَكُونَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ ثُمَّ كَبَّرَ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، ولَا يَفْعَلُهُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ. (بخاري / صفة الصلاة/ ٧٠)

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) كـاتێ رادەوەسـتا بـۆ نوێـژ هـەردوو دەستی بەرزدەكردەوە هەتا دەگەیشتە ئاستی شانی ئینجا تـەكبیری دەكـرد، كـاتێ دەیویست ركوع بەرێت بەهەمان شێوە هەردوودەستی بەرزدەكردەوە كـاتێ لـەركوع بەرزدەبوویـەوە هـەمان شـتی دەكـرد، بـەڵام كـاتێ لەسـجود بەرزدەبوویـەوە وای نەدەكرد.

## ( ٣٠ ) تەكبیر لەنوێژدا

١٣١ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَال: كَانَ رَسُولُ اللّه (ﷺ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاة يُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: "سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ". حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، ثُمَّ يَقُولُ وهُوَ قَائِمٌ: "رَبَّنَا ولَكَ الْحَمْدُ". ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي سَاجِدًا، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الصَّلَاة كُلِّهَا حَتَّى يَقْضِيهَا، ويُكَبِّرُ حِينَ يَقُومُ مِنَ الْمَثْنَى بَعْدَ الْجُلُوسِ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: إِنِّي لَأَشْبَهُكُمْ صَلَاةً بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ).(بخاري/ صفة الصلاة/٧٥٦)

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: هەركاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵدەستا بۆ نوێژ ، كاتێ رادەوەستا تەكبیری دەكرد، كاتێ ركوعی دەبرد تەكبیری دەكردو دەیفەرمو "سمع الله لمن حمده" كاتێ راست دەبوویەوە پشتی بەرزدەكردەوە لەركوع دەیفەرموو: "ربنا ولك الحمد"، كاتێ دادەبەزی بۆ سوجدە تەكبیری دەكرد، كاتێ دادەبەزی بۆ سوجدەی (دووەم) تەكبیری دەكرد، كاتێ سەری بەرزدەكردەوە تەكبیری دەكرد ئابەو شێوەیە تا نوێژەكەی تەواو دەبوو، هەروەها كاتێ لەتەحیاتی دوای ركاتی دووەم هەڵدەستایەوە تەكبیری دەكرد. لەدواییدا(ابوهریره) وتی: نوێژی من لەهەمووتان زیاتر لەنوێژی پێغەمبەری خوا دەچێت.

## ( ٣١ ) دەبێ مەئموم شوێن ئیمام بكەوێت

١٣٢ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قال: سَقَطَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ فَرَسٍ فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ، فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ نَعُودُهُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِنَا قَاعِدًا فَصَلَّيْنَا وراءَهُ قُعُودًا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ: "إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا، وإِذَا رَفَعَ فَارْفَعُوا، وإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا: رَبَّنَا ولَكَ الْحَمْدُ، وإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ". (بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٧١)

(انس) كوری(مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەئەسپێك كەوتە خوارەوە لای راستی رووشابوو، ئێمە چووینە خزمەتی بۆ سەردانی كاتی نوێژ هاتە پێشەوە، بەدانیشتنەوە نوێژی بۆكردین، ئێمەش لەدوایەوە بەدانیشتنەوە نوێژمان كرد، كاتێ نوێژەكە تەواو بوو فەرمووی: "بۆیە ئیمام دانراوە تا شوێنی بكەون، ئەگەر تەكبیری كرد تەكبیر بكەن، ئەگەر سوجدەی برد سوجدە ببەن، ئەگەر

بەرزبوویەوەو بەرزببنەوە، ئەگەر وتی: (سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن: (ربنا ولك الحمد) ، هەروەها ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بەدانیشتنەوە نوێژ بکەن".

## ( ٣٢ ) ئاشکرا نەکردنی ( بسم الله الرحمن الرحيم ) لەنوێژدا

١٣٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وأَبِي بَكْرٍ وعُمَرَ وعُثْمَانَ (ﷺ)، فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْهُمْ يَقْرَأُ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). **(بخاري/ صفة الصلاة/ ٧١٠)**

(انس) دەڵێت: لەدوای پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانەوە نوێژم کردووە، نەمبیستووە کەسیان (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێندبێت.

## ( ٣٣ ) الحمد لله و ئامین کردن

١٣٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ". قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "آمِينَ". (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٤٧)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر ئیمام ئامینی کرد ئێوەش بیکەن، هەرکامتان ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا یەك بگرێت خوا لەگوناهە رابووردووەکانی خۆشدەبێت" (ابن شهاب) دەڵێ: پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئامینی دەکرد".

## ( ٣٤ ) خوێندنی قورئان لەنوێژی نیوەڕۆو عەسر

١٣٥ـ أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قالَ: كانَ النَّبِيُّ (ﷺ)يصَلِّي بنا، فيَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ والْعَصْرِ: الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وسُورَةٍ، ويُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، ويَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُخْرَيَيْنِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٤٥)

(ابوقتاده (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی بۆ دەکردین لەنیوەڕۆو عەسردا لەدوو ڕکاتی یەکەمدا فاتیحەو سوورەتێکی دەخوێند جارجار ئایەتەکەی دەدا بەگوێماندا، لەدوو رکاتی دوایشدا فاتیحەی دەخوێند.

## ( ٣٥ ) خوێندن لەنوێژی شێواندا

١٣٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: إِنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ سَمِعَتْهُ وهُوَ يَقْرَأُ (وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا) فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ، لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ، إِنَّهَا لَآخِرُ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ. **(بخاري / صفة الصلاة/ ٧٢٩)**.

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (ام الفضل)کچی (الحارث) گوێی لە (ابن عباس) بوو کەسوورەتی (والمرسلات عرفا) دەخوێند، ئەویش وتی: رۆڵە گیان ، بەخوێندنی ئەم سوورەتە ئەوەت بیرخستمەوە کە ئەوە دواین سورەت بوو کەلەپێغەمبەرم بیستووە لەنوێژی شێواندا خوێندویەتی.

## ( ٣٦ ) خوێندن لەنوێژی خەوتناندا

١٣٧ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ مُعَاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ)، ثُمَّ يَأْتِي فَيَؤُمُّ قَوْمَهُ، فَصَلَّى لَيْلَةً مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) الْعِشَا و، ثُمَّ أَتَى قَوْمَهُ فَأَمَّهُمْ، فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ، فَانْحَرَفَ رَجُلٌ فَسَلَّمَ، ثُمَّ صَلَّى وحْدَهُ وانْصَرَفَ. فَقَالُوا لَهُ: أَنَافَقْتَ يَا فُلَانُ. قَالَ: لَا واللَّه، ولَآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَلَأُخْبِرَنَّهُ. فَأَتَى رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّا أَصْحَابُ نَوَاضِحَ، نَعْمَلُ بِالنَّهَارِ، وإِنَّ مُعَاذًا صَلَّى مَعَكَ الْعِشَا و، ثُمَّ أَتَى فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ. فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى مُعَاذٍ، فَقَالَ: "يَا مُعَاذُ أَفَتَّانٌ أَنْتَ؟ اقْرَأْ بِكَذَا (وَ)اقْرَأْ بِكَذَا" قَالَ سُفْيَانُ: فَقُلْتُ لِعَمْرٍو: إِنَّ أَبَا الزُّبَيْرِ حَدَّثَنَا عَنْ جَابِرٍ أَنَّهُ قَالَ: "اقْرَأْ: (وَالشَّمْسِ وضُحَاهَا) (وَالضُّحَى) (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى) و(سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى). (فَقَالَ عَمْرٌو: نَحْوَ هَذَا). **(بخاري / الجماعة والامامة / ٦٦٨)**

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: (معاذ)نوێژی لەخزمەت پێغەمبەردا دەکردو ئینجا دەهات ئیمامەتی بۆ قەومەکەی دەکرد، شەوێکیان نوێژی خەوتنی لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)کرد ئینجا هات بۆ ناو قەومەکەی و ئیمامەتی بۆ کردن، بەسوورەتی (البقرة)دەستی پێکرد، پیاوێك (لەریزەکەیدا)سەلامی دایەوە ، ئینجا بەتەنها نوێژی کردوو چووە دەرەوە، پێیان وت: تۆ دوو روویت کرد ئەی فلان ، وتی: نەبەخوا، دەشچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ئاگاداری دەکەم، هات بۆ خزمەت پێغەمبەرو(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە خاوەنی وشتری ئاودێریین بەرۆژدا کاردەکەین، معاذ نوێژی خەوتنی لەخزمەت بەرێزتاندا کردوو، ئینجا هات بۆ لای ئێمەو بەسوورەتی(البقرة) دەستی پێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) روویکردە (معاذ) فەرمووی: "ئەی معاذ ئایا تۆ خەڵك تاقیدەکەیتەوە؟ ئەوە بخوێنە، ئەوە بخوێنە".

سفیان دەڵێ: بە(عمرو)م وت: (ابو زبیر) لە(جابر)ەوە بۆی گێراینەوە کەفەرموویەتی:(والشمس وضحاها) و (والضحى) (والليل اذا يغشى) و (سبح اسم ربك الاعلى) بخوێنە (عمرو) وتی: شتێك لەم جۆرەی فەرموو.

## (٣٧) رێگری لەسەربەرزکردنەوە لە پێش ئیمامەوە

١٣٨ ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا يَأْمَنُ الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ فِي صَلَاتِهِ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ صُورَتَهُ فِي صُورَةِ حِمَارٍ". **(بخاري/ الجماعة والامامة/ ٦٥٩)**

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەمین و دڵنیا نەبێ ئەو کەسەی لەپێش ئیمامەوە سەری بەرزدەکاتەوە لەنوێژەکەیدا کە خوا شێوەی نەگۆڕێتە سەر شێوەی گوێدرێژ".

## ( ٣٨ ) دەست خستنە سەر ئەژنۆو سڕینەوەی فەرموودەی پێشوو

١٣٩ـ عَنْ مُصْعَبِ ابْنِ سَعْدٍ قَالَ: صَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ أَبِي، قَالَ: وجَعَلْتُ يَدَيَّ بَيْنَ رُكْبَتَيَّ، فَقَالَ لِي أَبِي: اضْرِبْ بِكَفَّيْكَ عَلَى رُكْبَتَيْكَ، قَالَ: ثُمَّ فَعَلْتُ ذَلكَ مَرَّةً أُخْرَى فَضَرَبَ يَدَيَّ، وقَالَ: إِنَّا نُهِينَا عَنْ هَذَا، وأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بِالْأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ. **(بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٠٧)**

(مصعب) کوری (سعد (بن ابی وقاص)) دەڵێ: لەتەنیشت باوکمەوە نوێژم دەکرد، وتی: هەردوو دەستم خستە نێوان ئەژنۆکانم باوکم وتی: دەستت بخەرە سەر ئەژنۆکانت، وتی: جارێکی تریش هەروام کرد ، ئینجا کێشای بەدەستماو وتی: ئێمە رێگریمان لێکراوە کەئاوا بکەین فەرمانمان پێکراوە کەدەستمان بخەینە سەر ئەژنۆمان.

## ( ٣٩ ) ئەوەی لەرکوع و سجوددا دەوترێت

١٤٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ فِي رُكُوعِهِ وسُجُودِه: "سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وبِحَمْدِكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي". يَتَأَوَّلُ الْقُرْآنَ. **(بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٨٤)**

(عائشە) (ر.ض) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەرکوع و سجودەکانیا زۆرجار دەیفەرموو: "سبحانك اللهم ربنا وبحمدك، اللهم اغفر لی"*.واتە: "پاکیو بێگەردی و بێهاوەڵی بۆ تۆ ئەی خوایە، پەروەردگاری ئێمەی، شوکرو سوپاست ئەکەم، ئەی خوایە لێم خۆش ببە".

---

* بخاري/ صفة الصلاة / التسبيح, الدعاء في السجود / ٧٨٤.

## ( ٤٠ ) پارانەوە لەسوجدەدا

١٤١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وهُوَ سَاجِدٌ، فَأَكْثِرُوا الدعاء". (بخاري/ صفة الصلاة /٧٧٩)

(ابوهريره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموويـەتی: "نـزيكترين كـاتی بەندە لەپەروەرگاريەوە، كاتی سوجدە بردنيەتی، كەواتە زۆر بپارێنەوە تيايدا".

## ( ٤١ ) رێکی لەسجوداو بەرزکردنەوەی ئەنیشکەکان

١٤٢ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، ولَا يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ". (بخاري / بەرگی ٢ لا١١٨ اقتران النيرين لا ١٤)

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموويەتی: "لەسوجدەدا رێكو راست بن، باكەستان قۆڵەكانی رانەخات وەكو چۆن سەگ رايدەخات".

## ( ٤٢ ) دوورخستنەوەی قۆڵ لەلەش

١٤٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَالِكٍ ابْنِ بُحَيْنَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا سَجَدَ فَرَّجَ يَدَيْهِ عَنْ إِبْطَيْهِ حَتَّى إِنِّي لَأَرَى بَيَاضَ إِبْطَيْهِ. (بخاري/ الصلاة في ثياب/ ٣٨٣)

(عبدالله) كوری (مالك) كوری(بحينـه) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) كـاتێ سوجدەی دەبرد هەردوو قۆڵی لەبن باڵی دوور دەخستەوە هەتا من سپيايی بن باڵيم دەبينی.

## .( ٤٣ ) لەنوێژا پەنا لەچی دەگيرێت

١٤٤ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَدْعُو فِي الصَّلَاةِ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا والْمَمَاتِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْمَأْثَمِ والْمَغْرَمِ". قَالَتْ: فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: "إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، ووَعَدَ فَأَخْلَفَ". (بخاري/ صفة الصلاة / الدعاء قبل السلام/ ٧٩٨).

(عائشه) (ر.ض)هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لەنوێـژا دەپاڕايـەوە : خوايـە مـن پـەنادەگرم بـەتۆ لەسـزای گـۆڕو لەفيتنـەی دەجـالو، پەنادەگرم بەتۆ لە فيتنەی ژيان و مردن، خوايە پەنادەگرم بەتۆ لەهەرشتێ تووشـی گوناهم بكات، لەقەرزێك كەنادرێتەوە عائيشە دەڵێ: يـەكێ وتـی (ئـەی پێغەمبـەری

خـوا) بـۆ ئەوەنـدە پـەنا دەگـری لەقـەرزاری؟ فـەرمووی: "پیـاو ئەگـەر قـەرزاربوو قسەدەکات و درۆدەکات، بەڵێن دەدات و نایباتە سەر".

## ( ٤٤ ) نزا لەنوێژدا

**١٤٥ـ عَنْ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ): أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): عَلِّمْنِي دعاء أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي. فقَالَ: "قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَبِيرًا ــ وقَالَ قُتَيْبَةُ: كَثِيرًاــ ولَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ". (بخاري/ قوله تعالى: (وكان الله سميعاً بصيرا) ٦٩٥٣).**

(ابوبكر) (ﷺ) دەڵێ: وتم بەپێغەمبەری خوا(ﷺ) نزایەکم فێربکـە لەنوێـژەکانما بیڵێم، ئەویش فەرمووی: (اللهم اني ظلمت نفسي ظلماً كبيراً ـ قتيبه دەڵێ : ـ كـثيراً ولا يغفر الذنوب الا انت ، فـاغفر لـي مغفـرة مـن عنـدك ، وارحمـني ، انـك أنـت الغفـور الرحيم) واتـە: خوایـە گیـان مـن سـتەمێکی زۆرو گـەورەم لـەخۆم کـردووە کەسـیش لەگوناه خۆشنابێت جگە لەتۆ ، دە خۆت لێم خـۆش ببـەو بـەزەییت پێمـا بێتـەوە ، تەنها تۆ لێبوردەو میهرەبانی).

## ( ٤٥ ) دوای سەلام دانەوە لەنوێژ چی دەوترێت؟

**١٤٦ــ عَنْ ورَّادٍ مَوْلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ إِلَى مُعَاوِيَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ وسَلَّمَ قَالَ: "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ ولَهُ الْحَمْدُ وهُوَ عَلَى كُلِّ شيء قَدِيرٌ. اللَّهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، ولَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، ولَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ". (بخاري/ صفة الصلاة/ الذكر بعد الصلاة / ٨٠٦).**

(وراد) کارگوزاری (المغيره) کوری (شعبه) (ﷺ) دەڵـێ: (مغـیره) کـوری(شـعبه) نووسی بۆ (معاویه) (ﷺ) کاتێ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەنوێـژ دەبوویـەوەو سـەلامی دەدایەوە، دەیفەرموو: (لا اله الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمـد وهـو علـى كل شي قدير، اللهم لا مانع لما اعطيت ولا معطي لما منعت ولاينفع ذا الجد منك الجد) واتە: هیچ خوایەك نییە جگە لە(الله) تاك و تەنیایەو بێ شەریکە، موڵك هەمووی هـی ئەوە سوپاس تەنیا بۆئەوە ، ئەویش دەسەڵاتی بەسەر هـەموو شـتێکدا هەیـە، ئـەی خوایە، ئەوەی تۆ دەیبەخشـیت بـەری لێ ناگیرێـت. ئـەوەی تـۆ نەیبەخشـیت کـەس

ناتوانیٚ ببیەخشیٚت، خاوەن سامانەکان سوود لەسامان و دەسەلاٚتیان وەرناگرن لەلای تۆ".

## ( ٤٦ ) تەکبیر لەدوای نویٚژ

١٤٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نَعْرِفُ انْقِضَا و صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالتَّكْبِيرِ. (بخاري/ صفة الصلاة / الذكر بعد الصلاة /٨٠٦)

(ابن عباس) (ﷺ) دەلیٚ: ئیٚمە بە تەکبیر دەمانزانی پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) لەنویٚژ بۆتەوە (مەبەست لە زکری دوای نویٚژە).

## ( ٤٧ ) رۆیشتن دوای نویٚژ بەلای راست و چەپدا

١٤٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعودٍ (ﷺ) قَالَ: لَا يَجْعَلَنَّ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ مِنْ نَفْسِهِ جُزْءًا: لَا يَرَى إِلَّا أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لَا يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ، أَكْثَرُ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَنْصَرِفُ عَنْ شِمَالِهِ. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٨١٤)

(عبدالله) کوری (مسعود) (ﷺ) دەلیٚ: باکەستان شەیتان زالٚ نەکات لەدەروونی خۆیدا بەوەی: وابزانیٚت کە ئەرکی سەرشانیەتی کاتیٚ لەنویٚژ دەبیٚتەوە دەبیٚ هەر بەلای راستا هەستیٚو بروات، چونکە من زۆرترینی کات، دیومە پیٚغەمبەری خوا(ﷺ) کەلەدوای نویٚژ هەستاوەو بەلای چەپدا رۆیشتووە.

## ( ٤٨ ) شویٚنکەوتن و هەلسوکەوت لەدوای ئیمام

١٤٩ـ عن الْبراء (ﷺ): أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَإِذَا رَكَعَ رَكَعُوا، وإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ فَقَالَ: "سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ" لَمْ نَزَلْ قِيَامًا حَتَّى نَرَاهُ قَدْ وضَعَ وجْهَهُ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ نَتَّبِعُهُ. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٧٨)

(براء) (ﷺ) دەلیٚ: هاوەلاٚن لەخزمەت پیٚغەمبەری خوادا(ﷺ) نویٚژیان دەکرد،کاتیٚ رکوعی دەبرد ، ئەوانیش رکوعیان دەبرد، کاتیٚ سەری بەرز دەکردەوە لەرکوع دەیفەرموو (سمع الله لمن حمده) ئیٚمە هەر بەپیٚوە دەماینەوە هەتا دەمانبینی (پیٚغەمبەر(ﷺ)) ناوچاوی لەسەر زەویە ئینجا شویٚنی دەکە وتین.

## ( ٤٩ ) فەرمانی کرد بەئیمامەکان کە نویٚژەکانیان کورت و تەواوبیٚت

١٥٠ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا. فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ)

غَضبَ فِي مَوْعِظَةٍ قَطُّ أَشَدَّ مِمَّا غَضِبَ يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: "يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ أَمَّ النَّاسَ فَلْيُوجِزْ، فَإِنَّ مِنْ وَرَائِهِ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ". (بخاري/ الاحكام / ٦٧٤٠).

(ابو مسعود الانصارى) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: من لەنوێـژی بەیانیانـدا دوا دەكـەوم بـەهۆی فلاّنەكەسـەوە كەدرێـژی دەكاتـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) تووڕەبـوو تـووڕە بوونێـك كـە هـەرگیز نەمانـدیبوو لەئامۆژگاریـدا پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەنـدە تـووڕە بووبێـت وەكـو ئـەو رۆژە، ئینجـا فـەرمووی: "ئـەی خەڵكینە كەسانێكتان خەڵك راودەنێن ئەوەی ئیمامەت بۆ خەڵكی دەكـات، بـاكورتی بكاتەوە، چونكە پیرو لاوازو خاوەن كار لەپشتیەوەن".

١٥١ـ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) فَقُلْتُ لَهَا: أَلَا تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: "أَصَلَّى النَّاسُ". قُلْنَا: لَا، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "ضَعُوا لِي مَاء فِي الْمِخْضَبِ". فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُو و فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: "أَصَلَّى النَّاسُ". قُلْنَا: لَا، وهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: "ضَعُوا لِي مَاء فِي الْمِخْضَبِ". فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُو و، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: "أَصَلَّى النَّاسُ". قُلْنَا: لَا، وهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: "ضَعُوا لِي مَاء فِي الْمِخْضَبِ". فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُو و، فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: "أَصَلَّى النَّاسُ". فَقُلْنَا: لَا، وهُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَتْ: والنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ، يَنْتَظِرُونَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لِصَلَاةِ الْعِشَا و الْآخِرَةِ، قَالَتْ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَأَتَاهُ الرَّسُولُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَأْمُرُكَ أَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) وكَانَ رَجُلًا رَقِيقًا: يَا عُمَرُ صَلِّ بِالنَّاسِ، فَقَالَ عُمَرُ (ﷺ): أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ. قَالَتْ: فَصَلَّى بِهِمْ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) تِلْكَ الْأَيَّامَ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ -أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ (ﷺ)- لِصَلَاةِ الظُّهْرِ، وأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) أَنْ لَا يَتَأَخَّرَ، وقَالَ لَهُمَا: "أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ" فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ، وكَانَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) يُصَلِّي وهُوَ قَائِمٌ بِصَلَاةِ النَّبِيِّ (ﷺ) والنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ، والنَّبِيُّ (ﷺ) قَاعِدٌ. قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ لَهُ: أَلَا أَعْرِضُ عَلَيْكَ مَا حَدَّثَتْنِي

عَائِشَةُ عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ: هَاتِ. فَعَرَضْتُ حَدِيثَهَا عَلَيْهِ، فَمَا أَنْكَرَ مِنْهُ شَيْئًا، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: أَسَمَّتْ لَكَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ مَعَ الْعَبَّاسِ؟ قُلْتُ: لَا قَالَ هُوَ عَلِيٌّ، (ﷺ).**(بخاري/ الجماعة والامامة/٦٥٥)**.

(عبيدالله) كورى(عبدالله) دەڵێ: چوومەماڵى (عائشه) (ر.ض)پێموت: ئایا باسى نەخۆشیەکەی پێغەمبەرى خوام(ﷺ) بۆ ناکەیت؟ وتى: بەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) لەشى قورس بووبوو فەرمووى: (ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد) وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕێی بەڕێزتانن ئەی پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: ئاوم بۆ بکەنە کاسەکەوە" ئاومان تێکردوو دەستنوێژى گرت، ئینجاویستی هەستێ، بەڵام لەهۆش خۆی چوو، کاتێ کە هاتەوە هۆش خۆی فەرمووى: "ئایا نوێژیان کرد" وتمان: نەخێر، چاوەڕێی بەڕێزتانن ئەی پێغمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: "ئاوم بۆ بکەنە کاسەکەوە" ئاومان تێکردوو دەستنوێژى گرت و ویستی هەستێ، بەڵام لەهۆش خۆی چوو، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی فەرمووى: "ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد" وتمان: نەخێر چاوەڕێی بەڕێزتانن ئەی پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمووى: "ئاوم بۆ بکەنە کاسەکەوە". ئاومان تێکردو دەستنوێژى گرت و ویستی هەستێ بۆ نوێژ، بەڵام لەهۆش خۆی چوو، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووى: "ئایا خەڵکەکە نوێژیان کرد" وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕێی بەڕێزتانن ئەی پێغەمبەرى خوا(ﷺ) (عائشه) (ﷺ) وتى: خەڵکەکە لەمزگەوت مابوونەوە، چاوەڕێی پێغەمبەرى خوا(ﷺ) بوون بۆ نوێژى خەوتنان ئنجا پێغەمبەر (ﷺ) ناردى بەدواى ئەبوبکردا (ﷺ) کە نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، نێردراوەکە چوو بۆ لاى ئەبوبکرو وتى: پێغەمبەرى خوا(ﷺ) فەرمانت پێدەکات کەنوێژ بۆ خەڵکەکە بکەیت (ابوبکر)(ﷺ) کەپیاوێکی زۆر دڵ ناسك بوو وتى: ئەی (عمر) نوێژ بۆ ئەو خەڵکە بکە. (عمر) (ﷺ) وتى: تۆ شیاوترى بەوە، ئینجا (ابوبکر) ئەو چەند رۆژە نوێژى بۆ کردن پاشان پێغەمبەرى خوا(ﷺ) دەرچوو لەنێوان دوو پیاودا کەیەکێکیان عەباس بوو(هاتە دەرەوە بۆ نوێژى نیوەڕۆ لەوکاتەدا (ابوبکر) نوێژى بۆ خەڵکەکە دەکرد، کاتێ (ابوبکر) چاوى کەوت بە پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بێتە دواوە، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد کەنەچێتە دواوە، بەدوو کەسەکەی فەرموو: "لەتەنیشتیا دامنیشێنن لەتەنیشت (ابوبکر)ەوە دایاننا، (ابوبکر) بەپێوە بەنوێژەکەی پێغەمبەر(ﷺ) نوێژى دەکردوو، خەڵکەکەش بەنوێژەکەی (ابوبکر)

نوێژیان دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو (عبید الله) وتی: چوومە ژوورەوە بۆلای (عبدالله) کوری (عباس) پێموت: ئایا ئەوەی عائشە لەبارەی نەخۆشیەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێی وتم: بۆت نەگێرمەوە؟ وتی: بڵێ: منیش بۆم گێرایەوە، هیچی لێ رەت نەکردەوە بەلآم وتی: ناوی ئەو پیاوەی پێ وتی: کەلەگەڵ (عباس)دا بوو؟ وتی: نەخێر، وتی: ئەوە علی (رضي الله عنه) بوو.

## ( ٥٠ ) ئەگەر ئیمام دواکەوت کەسێکیتر دەخرێتە پێشەوە

**١٥٢ـعن الْمُغِيرَةَ ابْنَ شُعْبَةَ (رضي الله عنه): أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) تَبُوكَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَتَبَرَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قِبَلَ الْغَائِطِ، فَحَمَلْتُ مَعَهُ إِدَاوَةً، قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَيَّ أَخَذْتُ أُهَرِيقُ عَلَى يَدَيْهِ مِنَ الْإِدَاوَةِ، وغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ وجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يُخْرِجُ جُبَّتَهُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ، فَضَاقَ كُمَّا جُبَّتِهِ، فَأَدْخَلَ يَدَيْهِ فِي الْجُبَّةِ، حَتَّى أَخْرَجَ ذِرَاعَيْهِ مِنْ أَسْفَلِ الْجُبَّةِ، وغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ عَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ، قَالَ الْمُغِيرَةُ: فَأَقْبَلْتُ مَعَهُ حَتَّى نَجِدُ النَّاسَ قَدْ قَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ (رضي الله عنه) فَصَلَّى لَهُمْ، فَأَدْرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى مَعَ النَّاسِ الرَّكْعَةَ الْآخِرَةَ، فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (رضي الله عنه) قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُتِمُّ صَلَاتَهُ، فَأَفْزَعَ ذَلِكَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (ﷺ) صَلَاتَهُ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ قَالَ: "أَحْسَنْتُمْ" أَوْ قَالَ: "قَدْ أَصَبْتُمْ" يَغْبِطُهُمْ أَنْ صَلَّوُا الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا. (بخاري/ الضو و/١٨٠).**

(مغیرە) کوری(شعبە) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەغەزای تەبوکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بووم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە دەرەوە بۆ دەست بەئاو گەیاندن، منیش مەسینەیەك ئاوم بۆ هەڵگرت پێش نوێژی بەیانی بوو، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) گەرایەوە، بۆلام ئاوم کرد بەدەستیاو سێ جار دەستی شۆرد، ئینجا دەموچاوی شۆرد، ئینجاویستی قۆڵی لەجبەکەیەوە دەربهێنێ بەلآم تەسك بوو ناچار دەستی لەخوارەوە لەژێر جبەکەیەوە دەرهێناو هەردوو قۆڵی هەتا ئەنیشکی شۆرد، ئینجا مەسحی کاڵەو پێتاوەکان(خوفەکان)ی‌کرد، ئینجا هاتەوە، مغیرە دەڵێ: منیش لەخزمەتیا هاتمەوە هەتا دیمان خەڵکەکە (عبدالرحمن) کوری(عوف) یان (رضي الله عنه) خستۆتە پێشەوە نوێژیان بۆ دەکات، پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت بەرکاتێکا لەگەڵ خەڵکەکەدا دوا رکاتی کرد، کاتێ (عبدالرحمن) سەلامی دایەوە، پێغەمبەر (ﷺ)

هەڵسایەوە نوێژەکەی تەواو کرد، ئەو چاوەڕێ نەکردنەی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانەکانی ترساند، زۆر (سبحان اللە) یان دەکرد، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژەکەی بوویەوە، رووی تێکردن، فەرمووی: "چاکتان کرد" یا فەرمووی: "پێکاتان" دڵخۆشی دەربڕی بەوەی کەلەکاتی خۆیدا نوێژەکەیان کردووە.

## ( ٥١ ) خێری جەماعەت

١٥٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِنْ صَلَاةِ أَحَدِكُمْ وحْدَهُ بِخَمْسَةٍ وعِشْرِينَ جُزْ وا". **(بخاري/ الجماعة والامامة / ٦٢١)**.

(ابوهريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "نوێژی جەماعەت بیست و پێنج ئەوەندەی نوێژی یەکێکتان بەتاك خێری زیاترە".

## ( ٥٢ ) نوێژی جەماعەت رێگای هیدایەتە

١٥٤ـ عن عَبْدُ اللَّهِ بن مسعودٍ (ﷺ) قال: لَقَدْ رَأَيْتُنَا ومَا يَتَخَلَّفُ عَنِ الصَّلَاةِ إِلَّا مُنَافِقٌ قَدْ عُلِمَ نِفَاقُهُ أَوْ مَرِيضٌ، إِنْ كَانَ الْمَرِيضُ لَيَمْشِي بَيْنَ رَجُلَيْنِ حَتَّى يَأْتِيَ الصَّلَاةَ. وقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَلَّمَنَا سُنَنَ الْهُدَى، وإِنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى الصَّلَاةَ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي يُؤَذَّنُ فِيهِ. **(بخاري/ المساجد/ ٤٦٥)**

(عبداللە) کوری (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە خۆمانم وادیوە کەس لەنوێژ دوانەدەکەوت مەگەر مونافیقێ کە نیفاقەکەی زانرابێ، یان نەخۆش، ئەگەر نەخۆشیش بوایا دوو پیاو دەستیان دەگرت تابێت بۆ نوێژ ئنجاوتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) رێگای هیدایەتی فێرکردین، یەکێك لە رێگاکانی هیدایەت نوێژکردنە لەو مزگەوتەی بانگی تێدا دەدرێت.

## ( ٥٣ ) هەڕەشە کردن لەدواکەوتن لە نوێژی جەماعەتی خەوتنان و بەیانیان

١٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ أَثْقَلَ صَلَاةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلَاةُ الْعِشَا و وصَلَاةُ الْفَجْرِ، ولَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُماءلَوْ حَبْوًا، ولَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ – مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ– إِلَى قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ". (زاد في رواية: "ولو علِم أحدهم أنه يجدُ عظماً سميناً لشهدها"). **(بخاري / الجماعة والامامة / ٦٢٦)**.

(ابـوهريره) (دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: "قورسـترین نوێـژ لەسـەر مونافیق نوێژی خەوتنان و بەیانیە، ئەگەر بیانزانیایە چ پاداشـتێکیان تێدایە ئەگـەر بەگاگۆڵکێش بوایە دەهاتن، نیازم وابـوو فـەرمان بکـەم کـە قامـەت بکـەن بـۆ نوێـژو فەرمان بکەم بـەپیاوێك نوێژەکـەیان بـۆ بکـات، ئینجـا خـۆم لەگـەڵ چـەند پیاوێکـدا دەرچـم - چـەند باوەشـێ داریـان پـێ بێـت ــ بـۆ سـەرئەوانەی نایـەن بـۆ نوێـژ ، خانوەکانیـان بەسـەردا بسـوتێنم" (لەریوایەتێکـدا ئەمـەش زیـادکراوە) "ئەگـەر یەکێکیان بیزانیایە ئێسقانێکی گۆشتنی دەست دەکەوێت دەهات بۆ نوێژەکە").

**١٥٦ــ عَنِ الْبراء بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: رَمَقْتُ الصَّلَاةَ مَعَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ، فَرَكْعَتَهُ، فَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ رُكُوعِهِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالِانْصِرَافِ، قَرِيبًا مِنَ السواء. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٥٩)**

(بـراء) کـوری(عـازب) (ﷺ) دەڵـێ: سـەرنجی نوێـژی موحەممـەدم(ﷺ)دا وەستانەکەییم دی، رکوعەکەییم دی، هەڵسانەوەی دوای رکـوعم دی ، سـوجدەکەی، دانیشتنی نێوان سوجدەکان، سوجدەکەی تریش، دانیشـتنی نێـوان سـەلام دانـەوەو رۆیشتنی هەموویان نزیك بوون لەیەکەوە.

**١٥٧ــ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: إِنِّي لَا آلُو أَنْ أُصَلِّيَ بِكُمْ كَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي بِنَا. قَالَ: فَكَانَ أَنَسٌ يَصْنَعُ شَيْئًا لَا أَرَاكُمْ تَصْنَعُونَهُ، كَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ انْتَصَبَ قَائِمًا حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ مَكَثَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ قَدْ نَسِيَ. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٨٦)**

(انس) (ﷺ) دەڵێ: من کەمتەرخەمی ناکەم ئەگەر نوێژتان بۆ بکـەم وەکـو چـۆن دیومە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی بۆ دەکرین، دەڵێ: (انس) شـتێکی دەکـرد نـابینم ئێـوە بیکەن، هەرکاتێ سەری لەرکوع بەرزدەکردەوە بـەپێوە رادەوەسـتا هـەتا لەوانـەبوو کەسێك بیوتایە لـەبیری چـووە(کەسـوجدە ببـات) کـاتێ سەریشـی لەسـوجدە بـەرز دەکردەوە دەمایەوە (بەدانیشتنەوە)هەتا لەوانە بوو کەسێك بیوتایە لەبیری چووە.

## ( ٥٤ ) ئاماژە بە وەڵامی سەلام لەنوێژا

**١٥٨ــ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَنِي لِحَاجَةٍ، ثُمَّ أَدْرَكْتُهُ وَهُوَ يَسِيرُ –قَالَ قُتَيْبَةُ: يُصَلِّي– فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَأَشَارَ إِلَيَّ، فَلَمَّا فَرَغَ دَعَانِي، فَقَالَ: "إِنَّكَ**

سَلَّمْتَ آنِفًا وأَنَا أُصَلِّي". وهُوَ مُوَجِّهٌ حِينَئِذٍ قِبَلَ الْمَشْرِقِ. (بخارى / العمل اصالح/ ١١٥٩)

(جابر) (ﷺ) دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردمی بۆ ئیشێك، دوایی گەیشتمەوە پێی، رێیدەكرد قوتەیبە دەڵێ: نوێژی دەكرد، سەلامم لێكرد ئاماژەیەكی بۆ كردم، كاتێ لێبویەوە بانگی كردم فەرمووی: (پێشتر كەتۆ سەلامت كرد من نوێژم دەكرد)*.

١٥٩ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلَاةِ، يُكَلِّمُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ وهُوَ إِلَى جَنْبِهِ فِي الصَّلَاةِ، حَتَّى نَزَلَتْ: (وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ) فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، ونُهِينَا عَنِ الْكَلَامِ. (بخاري/ العمل في الصلاة /١١٤٢)

(زید) كوری (ارقم) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لەنوێژا قسەمان دەكرد، پیاوێك قسەی لەگەڵ هاورێكەی دەكرد كەلەتەنیشتیەوە نوێژی دەكرد، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:(وقوموا لله قانتين) ئینجا فەرمانمان پێكرا بەبێدەنگیو رێگای قسەكردنمان لێگیرا.

## ( ٥٥ ) ( سبحان الله ) كردن لەنوێژا بۆكاری پێویست

١٦٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، والتَّصْفِيقُ لِلنساء". وفي رواية: "فِي الصَّلَاةِ". (بخاري/ العمل في الصلاة/ ١١٤٥)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "بۆ پیاوان (سبحان الله) بۆ ئافرەتانیش چەپڵە لێدان، بەشێوەی بەری دەست لەپشتی دەست دان".

## ( ٥٦ ) رێگری لەچاو بەرزكردنەوە بۆ ئاسمان لەنوێژدا

١٦١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ رَفْعِهِمْ أَبْصَارَهُمْ عِنْدَ الدعاء فِي الصَّلَاةِ إِلَى السماء، أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ". (اقتران النيرين / بخاري/ ٢٢٣٣ ب٦ل ٢١١).

* لەسەر ولاغەكەی بووەو بەسەریەوە نوێژی سوننەتی كردووە لەوكاتەدا رووی لەقیبلە نەبووە ـ دروستە بەسەر پشتی ولاغەكەوە لەرۆشیتنا نوێژبكەیتو تەنها كاتی نوێژەكە دادەبەستێ رووی لەقیبلە بێت، دوای ئەوە قەیناكا.

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "ئەو خەڵکانە یان دەبێ وازبێنن لەچاو بەرزکردنەوەو بۆ ئاسمان لەکاتی دۆعاکردنی نوێژدا، یان چاویان دەفڕێنرێت" (واتە کوێردەبن).

## ( ٥٧ ) هاتووچۆ بەبەردەم نوێژگەردا

١٦٢ـ عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ: أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ (ﷺ) أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ يَسْأَلُهُ: مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي؟ قَالَ أَبُو جُهَيْمٍ (ﷺ) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ: أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ". قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لَا أَدْرِي قَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ شَهْرًا، أَوْ سَنَةً. **(بخاري/ سترة المصلي/ ٤٤٨)**

(بسر)کوری(سعید) دەڵێ: (زید) کوری (خالد الجهنی) (ﷺ) ناردی بۆ لای (ابو جهم) تاڵێی بپرسێ چی بیستووە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبارەی هاتووچۆ بەبەردەم نوێژگەردا؟ (ابوجهم) (ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر ئەوکەسەی بەبەردەم نوێژگەردا تێدەپەڕێت بیزانیایە چەند گوناهی تووش دەبێت گەر چل... بوەستایا باشترە بۆی لەوەی بەبەردەمیا تێبپەڕێت (ابو النضر) دەڵێ: نازانم فەرموویەتی چل رۆژ یا چل مانگ یا چل ساڵ.

## ( ٥٨ ) قەدەغەکردنی هاتووچۆ بەبەردەمی نوێژگەردا

١٦٣ـ عن أبي صَالِحٍ السَّمَّانُ قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا مَعَ أَبِي سَعِيدٍ (الخُدْرِيّ) (ﷺ) يُصَلِّي يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَى شيء يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، إِذْ جاء رَجُلٌ شَابٌّ مِنْ بَنِي أَبِي مُعَيْطٍ، أَرَادَ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَدَفَعَ فِي نَحْرِهِ، فَنَظَرَ فَلَمْ يَجِدْ مَسَاغًا إِلَّا بَيْنَ يَدَيْ أَبِي سَعِيدٍ، فَعَادَ، فَدَفَعَ فِي نَحْرِهِ أَشَدَّ مِنَ الدَّفْعَةِ الْأُولَى، فَمَثَلَ قَائِمًا، فَنَالَ مِنْ أَبِي سَعِيدٍ، ثُمَّ زَاحَمَ النَّاسَ فَخَرَجَ، فَدَخَلَ عَلَى مَرْوَانَ، فَشَكَا إِلَيْهِ مَا لَقِيَ، قَالَ: ودَخَلَ أَبُو سَعِيدٍ عَلَى مَرْوَانَ، فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: مَا لَكَ ولِابْنِ أَخِيكَ؟ جاء يَشْكُوكَ. فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شيء يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْ فِي نَحْرِهِ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ". **(بخاري/ سترة المصلي/ ٤٨٨)**

(ابوصالح السمان) دەڵێ: لەکاتێکا من لەگەڵ (ابو سعید الخدری)(ﷺ) بووم، (ابو سعید) لەرۆژی جومعەدا نوێژی دەکرد شتێك لەبەردەمیا هەبوو کەبەربەست دروست

بکات لەخەڵك، کوڕێکی گەنج لەنەوەی (ابی معیط) ویستی بەبەردەمیا تێپەڕێت، پاڵی نا بەملیەوە، ئەویش سەیری کرد هیچ ڕێگایەکیتری نییە جگە لەبەردەم (ابو سعید) دووبارە هاتەوە، ئەمیش پاڵێکی بەهێزتری نا بەملیەوە ئەویش راوەستاو دەستی کرد بەقسە پێوتنی ئینجا بەناو خەڵکەکەدا چووە دەرەوە، چوو بۆلای مەروان، سکاڵای بردە لای لەوەی کەتووشی هاتووە ئەڵێ: (ابو سعید چووە لای (مروان) (مروان) پێی وت: چیتانە تۆو برازاکەت هاتووە سکاڵا دەکات لەدەستت ؟ (ابو سعید) وتی: بیستوومە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان نوێژی دەرکرد بەرامبەر بەبەربەستێك لەنێوان خۆی و خەڵکیدا، ئەگەر کەسێك ویستی بەبەردەمیدا تێپەڕێت پاڵ بنێ بەگەردنیەوە، ئەگەر رازی نەبوو بابجەنگێ لەگەڵیا، چونکە ئەوە شەیتانە".

**١٦٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا وَالنَّاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الْأُمَرَا و. (بخاري/ سترة المصلي/ ٤٨٥)**

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لەرۆژی جەژنا بچوایەتە دەرەوە، بۆ نوێژ، فەرمانی دەکرد نێزەیەکیان لەبەردەمیا دادەنا، بەرامبەری نوێژی دەکردو خەڵکەکەش لەدوایەوە، ئەمکارەی لەسەفەریشدا ئەنجام دەدا، لەدوایشدا کاربەدەستان ئەمکارەیان کردبوو بەباو.

## ( ٥٩ ) نوێژ بەرامبەر بە وڵاخ

**١٦٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَعْرِضُ رَاحِلَتَهُ، وَهُوَ يُصَلِّي إِلَيْهَا. (بخاري/ سترة المصلي/ ٤٨٥).**

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) وڵاخەکەی رادەوەستان و، بەرامبەری نوێژی دەکرد (واتە وڵاخەکەی دەکرد بەبەربەست).

## ( ٦٠ ) ڕۆیشتن بەبەردەم نوێژگەردا لە پشت بەربەستەوە

**١٦٦ـ عن عَوْنُ بْنُ أَبِي جُحَيْفَةَ: أَنَّ أَبَاهُ (رضي الله عنه) رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي قُبَّةٍ حَمْرَا و مِنْ أَدَمٍ، وَرَأَيْتُ بِلَالًا أَخْرَجَ وَضُو وا، فَرَأَيْتُ النَّاسَ يَبْتَدِرُونَ ذَلِكَ الْوَضُوءَ، فَمَنْ أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا تَمَسَّحَ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يُصِبْ مِنْهُ أَخَذَ مِنْ بَلَلِ يَدِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ رَأَيْتُ بِلَالًا أَخْرَجَ عَنَزَةً فَرَكَزَهَا، وَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي حُلَّةٍ حَمْرَا و مُشَمِّرًا، فَصَلَّى إِلَى الْعَنَزَةِ**

بِالنَّاسِ رَكْعَتَيْنِ، ورَأَيْتُ النَّاسَ والدَّوَابَّ يَمُرُّونَ بَيْنَ يَدَيِ الْعَنَزَةِ. (بخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٦٩)

(عـون) كـوڕی(ابـو جحيفـه) دەڵـێ: بـاوكی(ﷺ) لەچـادرێكی سـووری لەچـەرم دروستكراودا پێغەمبەری خوای (ﷺ) دیووه، منیش بـيلالم بینـی ئـاوی دەسـتنوێژی هێنایـه دەرەوە، بینـیم خـەڵكی پێشـبڕكێیان بـوو بـۆ دەسـت تـەڕكردن بـەو ئـاوی دەستنوێژە و هێناویانه بەسەرو چاویاندا بۆ پیرۆزیی ، ئەو كەسەش كەئاوی دەست نەكـەوتبێ لەتـەڕیی دەسـتی هاوەڵەكـەی وەرگرتـووە، ئینجـا بـيلالم بینـی دارێكـی هێناوە و چـەقاندوويەتی، پاشـان پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هاتۆتـە دەرەوە لەدەسـتێ جلی سووردا خۆی هەڵكردبوو. دووڕكات نوێژی كرد بۆ خەڵكەكە بەرامبەر بەدارەكە، ئینجا خەڵك و ئاژەڵم دیووە لەپشتی دارەكەوە هاتوچۆیان دەكرد.

## ( ٦١ ) ڕێگریی لەدەست خستنە سەركەلەكە لەنوێژدا

١٦٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. (بخاري/ العمل في الصلاة/ ١١٦٢)

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگریی كردووە لەوەی كە نوێژگەر دەستی لەسەر كەلەكەی دابنێت.

## ( ٦٢ ) ڕێگری لەتف كردنە بەردەم لەنوێژدا

١٦٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ، فَأَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: "مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يَقُومُ مُسْتَقْبِلَ رَبِّهِ، فَيَتَنَخَّعُ أَمَامَهُ؟ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يُسْتَقْبَلَ فَيُتَنَخَّعَ فِي وجْهِهِ؟ فَإِذَا تَنَخَّعَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَنَخَّعْ عَنْ يَسَارِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَقُلْ هَكَذَا". ووَصَفَ الْقَاسِمُ: فَتَفَلَ فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ مَسَحَ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ. (بخاري/ المساجد/ ٤٠٠)

(ابوهريره)(دەڵێ: پێغەمبەری خـوا(ﷺ) چـاوی كـەوت بەبەڵغـەمێك لەپێشـەوەی مزگەوتدا، ڕووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: "چـیتانە وا یـەكێكتان وەسـتاوە ڕووەو پەروەرگاریی، كەچی بەڵغـەم فـڕێ دەداتـە بـەردەمی خـۆی؟ ئایـا كەسـێكتان پێـی خۆشە كاتێ پێشوازی لێدەكرێت لەوكاتـەدا بەڵغـەمێك فـڕێ بـدرێت بەسەروچـاویدا؟ ئەگەر یەكێكتان بەڵغەمی فرێدا بابـەلای چـەپیداو لـەژێر پێیـدا فرێـی بـدات. ئەگـەر ڕێگای نەبوو بەم شێوەیە تف بكاتەوە"، قاسم شێوەكەی پیشاندان تفی كردە سەر سوچێكی جلەكانی لاكەی تری دایەوەبەسەریدا".

## ( ٦٣ ) هەڵگرتنی منداڵ لەنوێژدا

١٦٩ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَؤُمُّ النَّاسَ وأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِي الْعَاصِ –وَهِيَ ابْنَةُ زَيْنَبَ بِنْتِ النَّبِيِّ (ﷺ)– عَلَى عَاتِقِهِ، فَإِذَا رَكَعَ وضَعَهَا، وإِذَا رَفَعَ مِنَ السُّجُودِ أَعَادَهَا. **(بخاري/ سترة المصلي/ ٤٩٤)**

(ابـو قتـاده الانصـاری)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوام(ﷺ) دیـووە ئیمامـەتی کردووە بۆ خەڵکیو (امامـە) کچـی (ابوالعـاص) کەکچـی زەینـەبی کچـی پێغەمبـەری خوا(ﷺ) بووە بەسەرملیەوە بـووە، کـاتێ رکـوعی دەبـرد، دایـدەنا، کـاتێ لەسـجود بەرزدەبوویەوە هەڵی دەگرتەوە.

## ( ٦٤ ) تەخت کردنی چەو لەنوێژدا

١٧٠ـ عَنْ مُعَيْقِيبٍ (ﷺ) قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَسْحَ فِي الْمَسْجِدِ، يَعْنِي الْحَصَى. قَالَ: "إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً". **(بخاري/ العمل في الصلاة/ ١١٤٩)**

(معیقیـب)(ﷺ) دەڵـێ: "باسـی تـەخت کردنـی چـەویان دەکـرد لەمزگـەوتا واتـە تەخت کردنی چەوەکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر چارت نـەبوو یـەکجار بیکە".

## ( ٦٥ ) نوێژ لەکاتێکا خواردن ئامادەبێت

١٧١ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا قُرِّبَ الْعَشَا و وحَضَرَتِ الصَّلَاةُ فَابدءوا بِهِ قَبْلَ أَنْ تُصَلُّوا صَلَاةَ الْمَغْرِبِ، ولَا تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ". **(بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٤١)**

(انس) کوڕی(مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر شێو ئامادەکرا کاتی نوێژ هات پـێش ئـەوەی نوێـژی شـێوان بکـەن، شـێوەکەتان بخـۆن، لەشێوەکەشدا پەلەمەکەن".

١٧٢ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِحْدَى صَلَاتَيِ الْعَشِيِّ: إِمَّا الظُّهْرَ وإِمَّا الْعَصْرَ، فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَتَى جِذْعًا فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَاسْتَنَدَ إِلَيْهَا مُغْضَبًا. وفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وعُمَرَ (ﷺ)، فَهَابَا أَنْ يَتَكَلَّمَا، وخَرَجَ سَرَعَانُ النَّاسِ: قُصِرَتِ الصَّلَاةُ، فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقُصِرَتِ الصَّلَاةُ أَمْ نَسِيتَ؟ فَنَظَرَ النَّبِيُّ (ﷺ) يَمِينًا وشِمَالًا فَقَالَ: "مَا يَقُولُ ذُو الْيَدَيْنِ". قَالُوا: صَدَقَ لَمْ تُصَلِّ إِلَّا رَكْعَتَيْنِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ وسَلَّمَ، ثُمَّ كَبَّرَ ثُمَّ سَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ فَرَفَعَ، ثُمَّ كَبَّرَ وسَجَدَ، ثُمَّ كَبَّرَ ورَفَعَ. قَالَ: وأُخْبِرْتُ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّهُ قَالَ: وسَلَّمَ. **(بخاري/ المساجد/ ٤٦٨)**

(ابـوهريره)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نوێـژێکی تـاقی دوانیـوەڕۆی بـۆ کردین، یـا نیوەڕۆبـوو یـا عەسـر، لـەدووەم رکاتـا سـەلامیدایەوە، ئینجـا چـووە لای بنەدارێکەوە کەلەرووگەی مزگەوتەکەدابوو، پاڵی پێوەدا تـووڕە دیـاربوو، لـەناو ئـەو خەڵکەشدا (ابوبکر)و(عمر)ی لێبوو نەیان وێرا هیچ بڵێن پەلەپەلەکەرەکان راپـەرین و وتیان: نوێژ کورت کراوەتەوە (ذو اليدين)هەسـتاو وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئایا نوێژ کورت بۆتەوە، یان لەبیرت چوو؟ پێغەمبەری(ﷺ) سەیرێکی ئەملاو ئـەولای خـۆی کـردو فـەرمووی: (ذو اليـدين چـی دەڵێـت؟) وتیـان: راسـت دەکـات، تـەنها دووڕکاتـت کـرد، ئینجـا دووڕکـاتیتری کـردو سـەلامیدایەوە، ئینجـا تـەکبیری کـردوو سـوجدەی بـردو تـەکبیری کـردوو سـەری بـەرزکردەوە، دووبـارە تـەکبیری کـردوو سوجدەی برد، پاشـان تـەکبیری کـردوو سـەری بـەرزکردەوە راوی دەڵـێ: (عمـران) کوڕی(حصين) هەواڵی دامێ کە سەلامیشی داوەتەوە.

## ( ٦٦ ) سوجدەی قورئان خوێندن

**١٧٣ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَيَقْرَأُ سُورَةً فِيهَا سَجْدَةٌ فَيَسْجُدُ ونَسْجُدُ مَعَهُ، حَتَّى مَا يَجِدُ بَعْضُنَا مَوْضِعًا لِمَكَانِ جَبْهَتِهِ. (بخاري/ سجود القرآن/ ١٠٢٥)**

(ابـن عمـر)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـەقورئانی دەخوێنـد کـاتێ سـوورەتێکی دەخوێنـد سـوجدەی تێـدا بوایـە سـوجدەی دەبـرد، ئێمـەش لەگـەڵیا سوجدەمان دەبرد، هەتا هەندێکمان شوێنی دەست نەدەکەوت بۆ سوجدەکەی.

**١٧٤ـ عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) صَلَاةَ الْعَتَمَةِ فَقَرَأَ: (إِذَا السماء انْشَقَّتْ) فَسَجَدَ فِيهَا، فَقُلْتُ لَهُ: مَا هَذِهِ السَّجْدَةُ؟ فَقَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ (ﷺ) فَلَا أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ. (بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٣٢)**

(ابو رافع) دەڵێ: لەگەڵ (ابوهريره) نوێـژی شـێوانم کـرد، (اذا السـماء انشـقت)ی خوێند سوجدەی تێدابرد، منیش پێم وت: ئەم سوجدەیە چییە؟ وتی: لەپشـت (ابـو القاسـم)ەوە ئـەم سـوجدەیەم بـردووە، بـەردەوام ئـەم سـوجدەیە دەبـەم تادەگـەم بەخزمەتی.

## ( ٦٧ ) قنوت لەنوێژی بەیانیدا

**١٧٥ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ صَلَاةِ الْفَجْرِ مِنَ الْقِراءة ويُكَبِّرُ، ويَرْفَعُ رَأْسَهُ: "سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا ولَكَ الْحَمْدُ". ثُمَّ**

يَقُولُ وهُوَ قَائِمٌ: "اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وسَلَمَةَ بْنَ هشَامٍ وعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، والْمُسْتَضْعَفِينَ منَ الْمُؤْمنِينَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، واجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ كَسني يُوسُفَ، اللَّهُمَّ الْعَنْ لحْيَانَ ورِعلاءذَكْوَانَ وعُصَيَّةَ، عَصَت اللَّهَ ورَسُولَهُ". ثُمَّ بَلَغَنَا أَنَّهُ تَرَكَ ذَلكَ لَمَّا أُنْزِلَ: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شيء أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ) (آلعمران). **(بخاري/ صفة الصلاة/ ٧٧٠)**

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ لەنوێژی بەیانیدا لەقورئان خوێندن دەبوویەوە تەکبیری دەکردو سەری بەرزدەکردەوە (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد)ی دەکرد ئینجا بەپێوە دەیفەرموو: "خوایە گیان وەلیدی کوری وەلیدو سەلمەی کوری هیشامو غەیاسی کوری ئەبو رەبیعەو باوەرداره چەوساوەکان رزگاربکە، ئەی خوایە تۆڵەت قورس بکە لەسەر هۆزی (مضر)و ساڵەکانیان بکە بەساڵە گرانیەکانی(یوسف) ئەی خوایە نەفرین بکە لەهۆزەکانی(لحیان)و (رعل)و (ذکوان)و (عصیه) کەلەخواو پێغەمبەر یاخی بوون" پاشان پێمان گەیشت کەوازی لەو دوعایە هێناوە کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی کەواتاکەی دەفەرموێت: "تۆ هیچت بەدەست نیە لەکاروباری بەندەکان ئەگەر تەویەیان لێ وەربگرێت یاسزاو ئازاریان بدات، لەبەر ئەوەی ئەوانە ستەمکارن".

## ( ٦٨ ) دوورکاتی بەیانی

**١٧٦ـ عَنْ حَفْصَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ لَا يُصَلِّي إِلَّا رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ. (بخاري/ الأذان/ ٥٩٣)**

(حفصه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ سپێدەی بەیان دەردەکەوت، نوێژی نەدەکرد جگە لەدوورکاتی سووك

## ( ٦٩ ) راکشان دوای سوننەتی بەیانی

**١٧٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا صَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ: فَإِنْ كُنْتُ مُسْتَيْقِظَةً حَدَّثَنِي، وإِلَّا اضْطَجَعَ. (بخاري/ التطوع/ ١١١٥)**

(عائشه)(رضی الله عنها) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوورکاتی سوننەتی بەیانی دەکرد ئەگەر من بەئاگابوومایە قسەی لەگەڵ دەکردم، ئەگەرنا رادەکشا.

**١٧٨–عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي سُبْحَةَ الضُّحَى قَطُّ وإِنِّي لَأُسَبِّحُهَا، وإِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)لَيَدَعُ الْعَمَلَ وهُوَ يُحِبُّ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ، خَشْيَةَ أَنْ يَعْمَلَ بِهِ النَّاسُ فَيُفْرَضَ عَلَيْهِمْ. (بخاري/ التهجد/ ١٠٧٦)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: هەرگیز نەم دیوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی چێشتەنگاو بکات، من زۆر حەزی لێدەکەم ، ئەگەرچی پێغەمبەری خوا هەندێ کاری نەدەکرد، حەزیشی کردووە بیکات، لەترسی ئەوەی نەك خەڵکەکە بیکەن و لەسەریان فەرز ببێت*.

## ( ٧٠ ) هەشت رکات نوێژی چێشتەنگاو

**١٧٩ـ عن عَبْدَ اللَّه بْنَ الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ قَالَ: سَأَلْتُ وحَرَصْتُ عَلَى أَنْ أَجِدَ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ يُخْبِرُنِي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) سَبَّحَ سُبْحَةَ الضُّحَى، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُحَدِّثُنِي ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَتْنِي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَتَى بَعْدَ مَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ يَوْمَ الْفَتْحِ، فَأُتِيَ بِثَوْبٍ فَسُتِرَ عَلَيْهِ، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ قَامَ، فَرَكَعَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ، لَا أَدْرِي: أَقِيَامُهُ فِيهَا أَطْوَلُ أَمْ رُكُوعُهُ أَمْ سُجُودُهُ، كُلُّ ذَلِكَ مِنْهُ مُتَقَارِبٌ، قَالَتْ: فَلَمْ أَرَهُ سَبَّحَهَا قَبْلُ ولَا بَعْدُ. (بخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٥٠)**

(عبدالله) کوری(حارث) کوری(نوفل) دەڵێ: پرسیارم کردوو بەپەرۆش بووم بۆئەوەی کەسێك بدۆزمەوە ئاگادارم بکات کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کردووە، بەلاَم کەسم نەدۆزیەوە باسی ئەوەم بۆ بکات، بەلاَم (ام هانی) کچی(ابو طالب) ئاگاداری کردم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەرۆژی فەتحدا دوای ئەوەی خۆر بەرزبۆتەوە هاتووە، جلێکیان هێناوەو کردوویانە بەپەردە بۆی خۆی شۆردووە، ئینجا هەستاوە هەشت رکات نوێژی کردووە، نازانم وەستانەکەی درێژتربووە یا رکوعەکەی یا سجودەکەی ئەمانە هەموویان نزیك بوون لەیەکەوە، وتی: ئیتر نەمدیووە نەلەپێش ئەوەو نەلەدوای ئەوەش ئەو نوێژەی کردبێت.

## ( ٧١ ) راسپاردن بۆ نوێژی چێشتەنگاو

**١٨٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي (ﷺ) بِثَلَاثٍ: بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، ورَكْعَتَيِ الضُّحَى، وأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَرْقُدَ. (بخاري/ التطوع/ ١١٢٤)**

---

* زانایان دەڵێن: ئەمە ئەوە رەت ناکاتەوە کەنوێژی چێشتەنگاوی کردبێ، چونکە هەموو رۆژێك لەماڵی عائیشە نەماوەتەوە.

(ابوهريره)(ﷺ) دەڵێ: خۆشەویستەکەم رایسپاردوم بۆسێ شت: بەگرتنی سێ رۆژ رۆژوو لەهەموو مانگێکدا ، دوورکاتی چێشتەنگاو هەروەها پێش ئەوەی بخەوم نوێژی وەتر بکەم.

### ( ٧٢ ) لەنێوان هەردوو بانگدا نوێژ هەیە

١٨١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ" قَالَهَا ثَلَاثًا، قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: "لِمَنْ شَا و". **(بخاري/ الأذان/ ٦٠١)**

(عبدالله) کوری (مغفل المزنی)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) سێ جار فەرموویەتی: "لەنێوان هەردوو بانگدا نوێژێك هەیە، لەسێیەم جاریشدا فەرموویەتی: بۆکەسێك بیەوێت (واتە لەنێوان بانگو قامەتدا).

### ( ٧٣ ) سوننەتی پێش نوێژو دوای نوێژ

١٨٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَبْلَ الظُّهْرِ سَجْدَتَيْنِ، وبَعْدَهَا سَجْدَتَيْنِ، وبَعْدَ الْمَغْرِبِ سَجْدَتَيْنِ، وبَعْدَ الْعِشَا و سَجْدَتَيْنِ، وبَعْدَ الْجُمُعَةِ سَجْدَتَيْنِ، فَأَمَّا الْمَغْرِبُ والْعِشَا و والْجُمُعَةُ، فَصَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي بَيْتِهِ. **(البخاري/ التطوع/ ١١١٩)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەپێش نیوەرۆدا دوو سوجدەمان بردووە، دوای نیوەرۆش دوو سوجدە، دوای شێوانیش دوو سوجدە، لەدوای خەوتنانیش دوو سوجدە، لەدوای جومعەیش دووسوجدە، بەڵام شێوان و خەوتنان و جومعە لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لەماڵەوە نوێژم کرد (دوو سوجدە واتە دوورکات)

### ( ٧٤ ) سوننەت بەشەوو رۆژ

١٨٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ تَطَوُّعِهِ، فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا ثُمَّ يَخْرُجُ، فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وكَانَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ الْمَغْرِبَ ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ويُصَلِّي بِالنَّاسِ الْعِشَا و ويَدْخُلُ بَيْتِي فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وكَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ فِيهِنَّ الْوِتْرُ، وكَانَ يُصَلِّي لَيْلًا طَوِيلًا قَائِماءلَيْلًا طَوِيلًا قَاعِدًا، وكَانَ إِذَا قَرَأَ

وهُوَ قَائِمٌ ركَعَ وسَجَدَ وهُوَ قَائِمٌ، وإِذَا قَرأَ قَاعِدًا رَكَعَ وسَجَدَ وهُوَ قَاعِدٌ، وكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. (بخاري/ التطوع/ ١١٢٧)

(عبدالله) كورى(شقيق) (ﷺ) دەڵێ: پرسیارم لە(عائشە)(رضی الله عنها)كرد لەبارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وتی: لەماڵەوە لەپێش نیوەڕۆدا چوار ركاتی دەكرد، ئینجا لەماڵی دەردەچوو نوێژی بۆ خەڵكەكەش دەكرد، ئینجا دەهاتەوە ماڵەوە دووركاتی دەكرد، نوێژی شێوانی بەخەڵكەكە دەكرد، ئینجا دەهاتە ماڵەوە دووركاتی دەكرد، نوێژی خەوتنانی بەخەڵكەكە دەكرد، دەهاتە ماڵەكەی من دووركاتی دەكرد، لەشەودا نۆ ركاتی دەكرد وەتریشی تێدابوو، هەروەها شەوێك بەپێوە نوێژی دەكرد، شەوێكی درێژیش بەدانیشتنەوە كاتێ بەپێوە نوێژی دەكرد لەحاڵەتی وەستانەوە دەچووە (ركوع)و (سجود) ، كاتێكیش بەدانیشتنەوە نوێژی دەكرد لەحاڵەتی دانیشتنەوە(ركوع)و (سجود)ی دەبرد. كاتێكیش سپێدە دەردەكەوت دووركاتی دەكرد.

### ( ٧٥ ) نوێژی سوننەت لەمزگەوتا

١٨٤ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (ﷺ) قَالَ: احْتَجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حُجَيْرَةً بِخَصَفَةٍ أَوْ حَصِيرٍ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُصَلِّي فِيهَا، قَالَ: فَتَتَبَّعَ إِلَيْهِ رِجَالٌ، وجاءوا يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، قَالَ: ثُمَّ جاءوا لَيْلَةً، فَحَضَرُوا وأَبْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْهُمْ، قَالَ: فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَرَفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ، وحَصَبُوا الْبَابَ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُغْضَبًا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا زَالَ بِكُمْ صَنِيعُكُمْ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُكْتَبُ عَلَيْكُمْ، فَعَلَيْكُمْ بِالصَّلَاةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلَاةِ الْمَرْ و فِي بَيْتِهِ إِلَّا الصَّلَاةَ الْمَكْتُوبَةَ". وفي رواية: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اتَّخَذَ حُجْرَةً فِي الْمَسْجِدِ مِنْ حَصِيرٍ. (بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٩٨)

(زيد) كورى(ثابت)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژوورێكی بچكۆلەی بەحەسیر دروست كرد جارێكیان پێغەمبەر(ﷺ) دەرچوو نوێژی تێدابكات، چەند پیاوێك بەشوێنیدا ڕۆیشتن، هاتن لەدوایەوە نوێژ بكەن، جارێكیتر شەوێكیان هاتن و ئامادەبوون، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دواكەوت، وتی: نەهات بۆ لایان، ئینجا دەنگیان بەرزكردەوەو زیخیان دەكێشا بەدەرگاكەدا، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە دەرەوەو توڕەیی پێوە دیاربوو، فەرموی: "هێشتا لەسەر كردارەكەتان (واتە: نوێژی

سـوننەت بەبـەردەوامی لەمزگەوتـدا) ئەوەنـدە بـەردەوام دەبـن، گومـان دەبـەم لەسەرتان فەرزبکرێت، کەواتە لەماڵی خۆتانـدا نوێـژەکانتان ((واتـە: سـوننەتەکان)) بکەن، خێرترین نوێژی مرۆڤ ئەوەیە کەلەماڵەوە بیکات، جگە لەنوێژی فەرز).

### ( ٧٦ ) هەریەك لەئێوە با بەچالاکی نوێژ بکات، ئەگەر ماندوو بوو با دابنیشێت

١٨٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمَسْجِدَ، وحَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ سَارِيَتَيْنِ، فَقَالَ: "مَا هَذَا". قَالُوا: لِزَيْنَبَ تُصَلِّي، فَإِذَا كَسِلَتْ أَوْ فَتَرَتْ أَمْسَكَتْ بِهِ. فَقَالَ: "حُلُّوهُ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا كَسِلَ أَوْ فَتَرَ قَعَدَ". (بخاري/ التهجد/ ١٠٩٩)

(انس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە مزگەوت، گوریسێك لـەنێوان دوو کۆڵەکەدا بەسترابوو، فەرمووی: "ئەمە چییە" وتیان: هی زەینەبە نوێژدەکات، کاتێ هیلاك دەبێـت یـان بێهێـز دەبێـت دەسـتی پێـوە دەگرێـت، ئـەویش(ﷺ) فـەرمووی: "بیکەنەوە، هەریەکێکتان چەند توانای بوو نوێژ بکات، ئەگـەر نـەیتوانی یـان هـیلاك بوو بادابنیشێت".

### ( ٧٧ ) خۆشەویستترین کار لای خوا بەردەوامترینیانە

١٨٦ـ عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ (ﷺ)، قَالَ: قُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، كَيْفَ كَانَ عَمَلُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، هَلْ كَانَ يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الْأَيَّامِ؟ قَالَتْ: لَا، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وأَيُّكُمْ يَسْتَطِيعُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَسْتَطِيعُ؟ (بخاري/ الرقاق/ ٦١٠١)

(علقمـە)(ﷺ) دەڵـێ: (لەعائشـە) (ﷺ) دایکـی ئیمانـدارانم پرسـی: ئـەی دایکـی ئیمانداران کاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن بـوو، ئایـا هەنـدێك لـەرۆژەکانی تایبـەت دەکرد؟ وتی: نەخێر کاری بەردەوام بووە ئایا کێتان دەتوانێ ئەوەی کەپێغەمبـەری خوا(ﷺ) توانیویەتی؟

### ( ٧٨ ) چەند دەتوانن ئەوەندە کاربکەن

١٨٧ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ الْحولاء بِنْتَ تُوَيْت بْنِ حَبِيبِ بْنِ أَسَدِ ابْنِ عَبْدِ الْعُزَّى مَرَّتْ بِهَا وعِنْدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ: هَذِهِ الْحولاء بِنْتُ تُوَيْتٍ،

وزَعَمُوا أَنَّهَا لَا تَنَامُ اللَّيْلَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تَنَامُ اللَّيْلَ؟ خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّه لَا يَسْأَمُ اللَّهُ حَتَّى تَسْأَمُوا". **(بخاري/ الإيمان/ ٤٣)**

(عائشه) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێ: (حولاء) کچی (تویت) بەلایدا تێپەڕی، پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەلا بوو ، وتم: ئەمە حولاء کچی(تویت)ە کەدەڵێن گوایە بەشەو ناخەوێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "شەو ناخەوێ؟ چەند دەتوانن ئەوەندە کاربکەن، سوێند بەخوا، خوا ماندوو نابێت (لەپاداشت بۆ نووسینتان) هەتا ئێوە (لەکارکردن)ماندوو دەبن".

## ( ٧٩ ) شەونوێژی پێغەمبەرو( ﷺ ) پارانەوەکانی

١٨٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: بِتُّ لَيْلَةً عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ فَأَتَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ غَسَلَ وجْهَهُ ويَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ، فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وضُوءًا بَيْنَ الوضوءَيْنِ ولَمْ يُكْثِرْ، وقَدْ أَبْلَغَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَنْتَبِهُ لَهُ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ فَصَلَّى، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَتَتَامَّتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ (ﷺ)، وكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ فَصَلَّى ولَمْ يَتَوَضَّأْ، وكَانَ فِي دُعَائِهِ: "اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وفِي بَصَرِي نُورًا، وفِي سَمْعِي نُورًا، وعَنْ يَمِينِي نُورًا، وعَنْ يَسَارِي نُورًا، وفَوْقِي نُورًا، وتَحْتِي نُورًا، وأَمَامِي نُورًا، وخَلْفِي نُورًا، وعَظِّمْ لِي نُورًا". قَالَ كُرَيْبٌ: وسَبْعًا فِي التَّابُوتِ. فَلَقِيتُ بَعْضَ وَلَدِ الْعَبَّاسِ، فَحَدَّثَنِي بِهِنَّ فَذَكَرَ: "عَصَبِي ولَحْمِي ودَمِي وشَعْرِي وبَشَرِي" وذَكَرَ خَصْلَتَيْنِ. **(بخاري/ الدعوات/ ٥٩٥٧)**

(ابن عباس)(ﷺ) دەڵێ: شەوێکیان لای پووره (میمونە)م مامەوە، شەو پێغەمبەر(ﷺ) هەستا چووە دەرەوە بۆ سەرئاو، ئینجا دەست و دەموچاوی شۆردو هاتەوە خەوتەوە، ئینجا هەستایەوە، هاتە لای کونەی ئاوەکەوە دەستنوێژێکی مام ناوەندی گرت کەزۆر پێیەوەی خەریك نەبوو، بەلاَم تەواویش بوو ، ئنجا هەستاو دەستیکرد بە نوێژکردن، منیش هەستام و خۆم کێشایەوە (وەکو ئێستا بەئاگاهاتبمەوە) بۆ ئەوەی ئەو وانەزانێ کەمن بەئاگابووم و ئاگام لێی بووە، دەستنوێژم گرت، ئەوهەستایەوە بۆ نوێژ ، منیش لەلای چەپییەوە راوەستام، بەلاَم دەستی گرتم و خستمیە لای راستییەوە نوێژی ئەو شەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بەسیانزە

ركات تەواو بوو، پاشان راكشاو نوست هەتا پرخەی لێوەهات پێغەمبەر كەدەخەوت پرخەی دەهات، ئینجا بلال هات ئاگاداری كرد كەكاتی نوێژە، هەستاودەستیكرد بەنوێژكردن و دەستنوێژی نەگرت.(پاشان لەخوا پاڕایەوەو) لەپاڕانەوەكەشیدا ئەمە هەبوو: "خوایە گیان (نور)و ڕووناكی بخەرە دڵمەوە، ڕووناكی بخەرەوە بینینمەوە، روناكی بخەرە بیستنمەوە، ڕووناكی بخەرە لای راستمەوە، ڕووناكی بخەرە لای چەپمەوە، ڕووناكی لەسەرمەوە ڕووناكی لەژێرمەوە ، ڕووناكی لەبەردەمما، ڕووناكی لەپشتمەوە، ڕووناكی گەورەو فراوان بكەی بۆم.

(كريب) دەڵێ: حەوت شوێنیتریشی وت لەلاشەی ئادەمیزاد (من لەبیرم چوون) بەڵام گەیشتم بە یەكێ لەنەوەی عباس باسی ئەو حەوتەی بۆكردم كەئەمانەن: دەمارەكانم، گۆشتم،خوێنم،مووەكانم، پێستم، دووشتی تریشی وت:(لەبیرم نەماون)

## ( ٨٠ ) پاڕانەوەی پێغەمبەر( ﷺ ) لەكاتی شەو نوێژدا

**١٨٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ يَقُولُ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ: "اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ. فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَأَخَّرْتُ، و (ما) أَسْرَرْتُ وَأَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ". (بخاري/ التوحيد/ ٧٠٦٠)**

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر لەقوڵایی شەودا هەستابایە بۆ نوێژكردن دەیفەرموو: "خوایە گیان، سوپاس بۆ تۆیە ، تۆ ڕووناكی ئاسمانەكان و زەویت، سوپاس بۆ تۆ ، تۆ راگری ئاسمانەكان و زەویت، سوپاس بۆ تۆ، پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی‌و ئەوەی لەناویاندایە، تۆ راستیت بەڵێنەكەت راستە، قسەكانت راستن، بەدیدار گەیشتنت راستە، بەهەشت راستە، ئاگر راستە، رۆژی قیامەت راستە، خوایە، تەنها خۆم بەتۆ سپاردووە، ئیمانم بەتۆ هێناوە، تەنها پشتم بەتۆ بەستووە، بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، لەپێناو تۆداو بەپشتیوانی تۆ دژایەتی (بێباوەران)م كردووە، تەنها بۆلای شەرعەكەی تۆ دەگەڕێمەوە، دە خۆش ببە لەگوناهە پێشوەكان و دواییەكانم، لەوانەش كەشاردومنەتەوەو لەوانەش كەئاشكرام

کردوون، تۆ فریادڕەس و فەرمانڕەوای منی هـیچ فریـادڕەس و فەرمانڕەوایـەك نییـە جگە لەتۆ".

**( ٨١ ) شەونوێژ دوو دووەو وەتریش یەك ركاتە لەكۆتـایی شەودا**

**١٩٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً واحِدَةً تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى". (بخاري/ الوتر/ ٩٤٦)**

(ابن عمر)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پیاوێـك پرسـیاری لەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) كـرد لـەبارەی شەونوێژەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ)فـەرمووی: "نوێـژی شـەو دوو دووە، ئەگـەر یـەكێكتان ترسا ڕۆژ ببێتەوە، بابەتاكە ڕكاتێك ئەو نوێژانەی كردوونی تاكیان بكاتەوە".

**( ٨٢ ) شەونوێژ بە پێوەو بەدانیشتنەوە**

**١٩١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقْرَأُ فِي شيء مِنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا كَبِرَ قَرَأَ جَالِسًا، حَتَّى إِذَا بَقِيَ عَلَيْهِ مِنَ السُّورَةِ ثَلَاثُونَ أَوْ أَرْبَعُونَ آيَةً قَامَ فَقَرَأَهُنَّ، ثُمَّ رَكَعَ. (بخاري/ التهجد/ ١٠٩٣)**

(عائشـە) (رضي الله عنها) دەڵـێ: نەمـدیوە پێغەمبـەر(ﷺ) بەدانیشـتنەوە قورئـان بخـوێنێ لەنوێـژدا، هـەتا بەساڵاچـوو، كەبەساڵاچـوو ئینجـا بەدانیشـتنەوە دەیخوێنـد، هـەتا لەسورەتێكا سی چل ئایەتی دەما ئینجا هەڵدەستایەوە بـەپێوە دەیخوێنـد ، ئینجـا ركوعی دەبرد).

**( ٨٣ ) كەراهەتـی هەیە هەموو شەوەكە بخەوێ و نوێژی تێدا نەكـات**

**١٩٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلٌ نَامَ لَيْلَةً حَتَّى أَصْبَحَ، قَالَ: "ذَاكَ رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ" أَوْ قَالَ: "فِي أُذُنِهِ". (بخاري/ التهجد/ ١٠٩٣)**

(عبدالله) كوری(مسـعود) (رضي الله عنه) دەڵـێ: لەخزمـەت پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) باسـی پیاوێكیان كرد كە شەوێكیان هەتا نوێژی بەیانی خەوتووە، فەرموی: "ئەوە پیاوێكە شەیتان میزی كردۆتە گوێكانیەوە" یافەرمووی "گوێیەوە".

### ( ٨٤ ) ئەگەر کەسێك لەنوێژدا وەنەوزیدا باڕاکشێت

١٩٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﵦ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاة فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وهُوَ نَاعِسٌ، لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ". (بخاري/ الوضوء/ ٢٠٩)

(عائشه) (ﵦ) دەڵـێ پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی: "ئەگـەر یـەکێکتان لەنوێـژا خەوەنوچکە بردیەوە، باڕاکشێت، تاخەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەگەر بەخـەواڵویی نوێژ بکات لەوانەیە لەباتی ئەوەی داوای لێخۆشبوون بکات قسە بەخۆی بڵێت".

### ( ٨٥ ) ئەوەی گرێکانی شەیتان دەکاتەوە

١٩٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)- قَالَ: "يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ ثَلَاثَ عُقَدٍ إِذَا نَامَ، بِكُلِّ عُقْدَةٍ يَضْرِبُ: عَلَيْكَ لَيْلًا طَوِيلًا، فَإِذَا اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ (ﷻ) انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، وإِذَا تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عَنْهُ عُقْدَتَانِ، فَإِذَا صَلَّى انْحَلَّتِ الْعُقَدُ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ". (بخاري/ التجهد/ ١٠٩١)

لـــە(ابـــوهریرە)ەوە (﵁) کەدەیگەیانـــدە پێغەمبـــەر(ﷺ) پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر یەکێکتان خەوت شـەیتان سـێ گـرێ دەدات لەپشـتی سـەری، لەهەر گرێیەکیدا دەڵێ: لەشەوێکی درێژدا بخەوە، بەڵام ئەگەر هەستاو نـاوی خـوای هێنـا (عزوجـل) گرێیـەکیان دەکرێتـەوە، ئەگـەر دەسـتنوێژی گـرت دووەمیشـیان دەکرێتەوە، ئینجا ئەگەر نوێژی کرد هەرسێکیان دەکرێنەوە، ئینجا چالاكو دەروون ئاسودە دەبێت، ئەگەر وانەکات دڵپیس و تەمەڵ دەبێت".

### ( ٨٦ ) لەوەترو دوورکاتی بەرەبەیاندا

١٩٥ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ (﵁) قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ، قُلْتُ: أَرَأَيْتَ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ أُوْطِيلُ فِيهِمَا الْقِراءة؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى ويُوتِرُ بِرَكْعَةٍ. قَالَ: قُلْتُ: إِنِّي لَسْتُ عَنْ هَذَا أَسْأَلُكَ. قَالَ: إِنَّكَ لَضَخْمٌ، أَلَا تَدَعُنِي أَسْتَقْرِئُ لَكَ الْحَدِيثَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، ويُوتِرُ بِرَكْعَةٍ، ويُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْغَدَاةِ كَأَنَّ الْأَذَانَ بِأُذُنَيْهِ. (بخاري/ الوتر/ ٩٤٦)

(انـس) کـوڕی(سـیرین) (﵁) دەڵـێ: لـە(ابـن عمـر) پرسـی وتم: ئایـا ئاگـاداری لـەدوورکاتی پـێش نوێـژی بـەیانی ئایـا خوێنـدنی بەدرێـژی تیـا دەخوێنـد؟ وتـی:

پێغەمبەر(ﷺ) لەشەودا دووركات نوێژی دەكردو وەتریشی بەیەك ركات، وتم من ئەوەت لێ ناپرسم، وتی: تۆ زلی (واتە گێلی) ئایا ناهێڵی هەموو فەرمودەكەت بۆ بخوێنمەوە : پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەشەودا جوت جوت نوێژی دەكرد، بەیەك ركاتیش دوایی دەهێنا، دووركاتیشی دەكرد پێش نوێژی بەیانی وەكو بانگەكە (مەبەستی قامەتە) لەگوێیدا بزرنگێتەوە (واتە: دووركاتی كورتی دەكرد).

## ( ٨٧ ) سوورەتەكانی ( المفصل )[1]

١٩٦ـ عَنْ أَبِي وائِلٍ (رضي الله عنه) قَالَ: غَدَوْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه) يَوْمًا بَعْدَ مَا صَلَّيْنَا الْغَدَاةَ، فَسَلَّمْنَا بِالْبَابِ فَأَذِنَ لَنَا، قَالَ: فَمَكَثْنَا بِالْبَابِ هُنَيَّةً. قَالَ: فَخَرَجَتِ الْجَارِيَةُ فَقَالَتْ: أَلَا تَدْخُلُونَ؟ فَدَخَلْنَا فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ يُسَبِّحُ، فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا وقَدْ أُذِنَ لَكُمْ؟ فَقُلْنَا: لَا، إِلَّا أَنَّا ظَنَنَّا أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ الْبَيْتِ نَائِمٌ. قَالَ: ظَنَنْتُمْ بِآلِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ غَفْلَةً؟ قَالَ: ثُمَّ أَقْبَلَ يُسَبِّحُ حَتَّى ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، فَقَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِي هَلْ طَلَعَتْ؟ قَالَ: فَنَظَرَتْ فَإِذَا هِيَ لَمْ تَطْلُعْ؟ فَأَقْبَلَ يُسَبِّحُ، حَتَّى (إِذَا) ظَنَّ أَنَّ الشَّمْسَ قَدْ طَلَعَتْ، قَالَ: يَا جَارِيَةُ انْظُرِي هَلْ طَلَعَتْ؟ فَنَظَرَتْ فَإِذَا هِيَ قَدْ طَلَعَتْ. فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَقَالَنَا يَوْمَنَا هَذَا. فَقَالَ مَهْدِيٌّ: وأَحْسِبُهُ قَالَ: وَلَمْ يُهْلِكْنَا بِذُنُوبِنَا. قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: قَرَأْتُ الْمُفَصَّلَ الْبَارِحَةَ كُلَّهُ. قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: هَذًّا كَهَذِّ الشِّعْرِ، إِنَّا لَقَدْ سَمِعْنَا الْقَرَائِنَ، وإِنِّي لَأَحْفَظُ الْقَرَائِنَ الَّتِي كَانَ يَقْرَؤُهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): ثَمَانِيَةَ عَشَرَ مِنَ الْمُفَصَّلِ، وسُورَتَيْنِ مِنْ آلِ (حم). (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٥٦)

(ابو وائل) (رضي الله عنه) دەڵێ: رۆژێكیان لەبەرەبەیاندا دوای نوێژی بەیانی چووین بۆ لای (عبداللـە) كوری(مسعود) (رضي الله عنه) لەدەرگادرا سەلاممان كرد، ئەویش فەرمووی لێكردین، دەڵێ: كەمێك لەدەرگاكەدا وەستاین كە هاتە دەرەوەو وتی: ئایا نایەنە ژوورەوە؟ چووینە ژوورەوە، دەبینین دانیشتووە تەزبیحات دەكات، وتی: چی رێی لێگرتن نەیەنە ژوورەوە خۆ فەرمووتان لێكرا؟ وتمان: ئێمە گومانمان وابوو كەخێزانی ماڵ نوستوون، وتی: ئایا گومان وادەبەن بەكەسوكاری (ابن ام عبدالله) كە بێئاگابن؟ ئینجا دەستی كردەوەو بەتەزبیحات هەتا وای گومان برد كەخۆر كەوتووە، وتی: ئەی كەنیزەك تەماشا بكە بزانە خۆر كەوتووە كەئەویش تەماشای

[1] المفصل: بەشی كۆتایی قورئانە كە سوورەتەكانی كورتنو ئایەتەكانیش كورتن لەسوورەتی الحجراتەوە دەست پێدەكەن هەندێك رای جیاوازیش هەیە.

کرد هێشتا خۆرنەکەوتبوو، وتی: ئەی کەنیزەك: تەماشا بکە بزانە خۆر کەوتووە؟ تەماشای کرد خۆرنەکەوتبوو ئەویش فەرمووی: سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان کە ئەمڕۆیش بەگوناهەکانمان نەیگرتین، پیاوێك لەخەڵکەکە وتی: ئەمشەوی رابوردوو هەمو سوورەتەکانی (المفصل)م گشت خوێندەوە، (عبدالله) وتی: دیارە بەپەلە وەك شیعر خوێندووتە، ئاگاداربە کەمن (قرئان)ەکانم بیستووە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)و لەبەریشمن ئەوانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیخوێندەوە کە هەژدە سوورتن لە(المفصل)و دوو سوورەتیش لەگروپی حامیمەکان.

## ( ٨٨ ) ئەوەی لەبارەی نوێژی رەمەزاندا هاتووە

**١٩٧ــ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) خَرَجَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى رِجَالٌ بِصَلَاته، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَتَحَدَّثُونَ بِذَلِكَ، فَاجْتَمَعَ أَكْثَرُ مِنْهُمْ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي اللَّيْلَةِ الثَّانِيَةِ فَصَلَّوْا بِصَلَاته، فَأَصْبَحَ النَّاسُ يَذْكُرُونَ ذَلِكَ، فَكَثُرَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَخَرَجَ فَصَلَّوْا بِصَلَاته، فَلَمَّا كَانَتِ اللَّيْلَةُ الرَّابِعَةُ عَجَزَ الْمَسْجِدُ عَنْ أَهْلِه، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَطَفِقَ رِجَالٌ مِنْهُمْ يَقُولُونَ: الصَّلَاةَ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حَتَّى خَرَجَ لِصَلَاةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا قَضَى الْفَجْرَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ تَشَهَّدَ، فَقَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ لَمْ يَخْفَ عَلَيَّ شَأْنُكُمُ اللَّيْلَةَ، وَلَكِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ فَتَعْجِزُوا عَنْهَا". وفي رواية: ذلك في رمضان. (بخاري/ الجمعة/ ٨٨٢)**

(عائشە) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەوێکیان چووە مزگەوت نوێژی کرد، چەند پیاوێك نوێژیان لەگەڵدا کرد ، خەڵکی بۆ سبەینێ باسی ئەو نوێژەیان کرد ، خەڵك زۆرتر کۆبوویەوەو لەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) نوێژیان کرد ، بۆ سبەینێ باس لەونوێژەکرا، لەشەوی سێیەمدا ئامادبووانی مزگەوت زۆرتربوون ، کاتێ هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت نوێژیان لەگەڵداکرد، کاتێ شەوی چوارەم هات مزگەوتەکە کەسی تری نەدەگرت، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو شەوە نەچوو بۆ مزگەوت کەنوێژیان بۆ بکات، بۆیە کەسانێك دەستیان کرد بەقسەکردن و دەیانوت: نوێژ، بەلآم پێغەمبەر ئەو شەوە نەچوو بۆ مزگەوت کەنوێژیان بۆ بکات، بۆیە کەسانێك دەستیان کرد بەقسەکردن و دەیانوت: نوێژ ، بەلآم پێغەمبەر(ﷺ) نەچوو بۆناویان، هەتا کاتی نوێژی بەیانی هات، کاتێ نوێژی بەیانی کۆتایی هات رووی کردە خەڵکەکە، ئینجا

شایەتومانێکی هێنـاو فـەرمووی: "کاروبـاری ئەمشـەوی ئێـوە بـەمن شـاراوە نـەبوو لەوەترسـام کەنوێـژی شـەو فـەرز بکرێـت لەسـەرتان ئێـوەش نـەتوانن بیکـەن" لەریوایەتێکیشا : ئەوە لەرەمەزاندابوو.

## ( ٨٩ ) هاندان بۆ شەونوێژی رەمەزان

١٩٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَهُمْ فيه بعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: "مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَاناءاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه". فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) والْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ كَانَ الْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ فِي خِلَافَة أَبِي بَكْرٍ، وصَدْرًا مِنْ خِلَافَة عُمَرَ (ﷺ) عَلَى ذَلِكَ. **(بخاري/ الإيمان/ ٣٧)**

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) هانی دەدا بۆ شـەونوێژی رەمـەزان بەبێ ئەوەی فەرمانیان پێبکات، دەیفەرموو: "هەرکەس لەڕەمەزاندا بەبڕوای تـەواو بەهیوای پاداشتەوە شەونوێژ بکات، خوا لەگوناهە پێشوەکانی خۆش دەبێت" هـەتا پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایـی کـردو کـار بـەم شـێوەیە بـوو ، لەسـەردەمی ئـەبوبکرو سەرەتای خەلافـەتی عومەریشـدا (ﷺ) هـەر بـەو شـێوەیە بـوو (مەبەسـت لەنوێـژی تەراویحە).

# بەشی شەشەم: ڕۆژی جومعە

## (١) ڕێنمایی ئەم ئوممەتە بۆ دۆزینەوەی ڕۆژی جومعە

١٩٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "نَحْنُ الْآخِرُونَ الْأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ونَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا، وأُ وتِىنَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ، فَاخْتَلَفُوا، فَهَدَانَا اللَّهُ لِمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ مِنَ الْحَقِّ، فَهَذَا يَوْمُهُمِ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ هَدَانَا اللَّهُ لَهُ -قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ- فَالْيَوْمَ لَنَا، وغَدًا لِلْيَهُودِ، وبَعْدَ غَدٍ لِلنَّصَارَى".

**(بخاري/ الجمعة/ ٨٣٦)**

(ابوهریرە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە دوایین ئوممەتین (لەدنیادا) لەقیامەتا یەکەمین، ئێمە یەکەمین لەچوونە بەهەشتا، ئەگەرچی ئەوان لەپێش ئێمەوە کتێبیان بۆ هاتووە، ئێمە لەدوای ئەوان بۆمان هاتووە، ئەوان جیاوازیان تێکەوت، خوا ڕێنمای ئێمەی کرد لەو جیاوازیەی ئەوانی تێکەوت، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ئەوان جیاوازیان هەبوو لەسەری خوارێنمایی ئێمەی کرد بۆی ئەمڕۆ بۆ ئێمەیە، سبەینێ بۆ جوولەکە، دووسبەی بۆ مەسیحی).

## (٢) ساتێك لەڕۆژی جومعەدایە

٢٠٠-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ) "إِنَّ فِي الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي، يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ". وقَالَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا: يُزَهِّدُهَا. **(بخاري/ الجمعة/ ٨٩٣)**

(ابوهریرە) (ﷺ) دەڵێ: (ابو اقاسم)(ﷺ) فەرموویەتی: "بەراستی لەڕۆژی جومعەدا کاتێك هەیە، ئەگەر موسڵمان ڕێکەوتی بکات لەنوێژابێت و، لەخواپاڕێتەوە بۆ شتی خێر، دەیداتێ" (ڕاوی دەڵێ: بەدەست ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کەکاتەکە کوورتە).

## (٣) خۆشۆردن لەجومعەدا

٢٠١ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) يَخْطُبُ النَّاسَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ دَخَلَ عُثْمَانُ ابْنُ عَفَّانَ فَعَرَّضَ بِهِ عُمَرُ (ﷺ) فَقَالَ: مَا بَالُ رِجَالٍ يَتَأَخَّرُونَ بَعْدَ النِّدَا و؟ فَقَالَ عُثْمَانُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَا زِدْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَا و أَنْ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ أَقْبَلْتُ. فَقَالَ عُمَرُ: والوضوء أَيْضًا؟ أَلَمْ تَسْمَعُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِذَا جاء أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ". **(بخاري/ الجمعة/ ٨٣٨)**

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: لەكاتێكا (عمر) كوڕی(خطاب) وتاری ڕۆژی جومعەی دەدا، (عثمان) كوری(عفان) هاتە ژورەوەو (عمر) ئاماژەیەكی بۆ كرد(ﷺ) وتی: هۆی چییە پیاوانێك دوادەكەون دوای بانگ؟ عثمان وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، هیچم نەكرد هەر كە گوێم لەبانگ بوو دەستنوێژم شت و هاتم، عومەر وتی: هەر دەستنوێژ؟ ئایا نەتانبیستووە كەپێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر كەسێكتان هات بۆ نوێژی جومعە باخۆی بشووات".

## ( ٤ ) بۆنی خۆش و سیواك لە جومعەدا

٢٠٢ـ عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ، وسِوَاكٌ، ويَمَسُّ مِنَ الطِّيبِ مَا قَدَرَ عَلَيْهِ". (بخاري/ الجمعة/ ٨٤٠)

(ابو سعيد الخدرى) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خۆشتنی ڕۆژی جومعە لەسەر هەركەسێكی باڵغە، لەگەڵ سیواككردن و چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات).

## ( ٥ ) خێری زووهاتن بۆ مزگەوت لەڕۆژی جومعەدا

**٢٠٣ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، فَإِذَا جَلَسَ الْإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ، وجاءوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ. ومَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي الْبَدَنَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْكَبْشَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الدَّجَاجَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْبَيْضَةَ". (بخاري/ الجمعة/ ٨٨٧)**

(ابوهریره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر ڕۆژی جومعە بوو، لەسەر هەردەرگایەك لەدەرگاكانی مزگەوت فریشتە رادەوەستن و ئەوكەسانە دەنووسن كەیەك لەدوای یەك لەپێش خەڵكیەوە دێن بۆ مزگەوت ، كاتێ ئیمام دێت و دادەنیشێت تۆمارەكانیان دەپێچنەوە، دێن گوێ لەزیكرەكان دەگرن، نموونەی ئەوكەسەی زوو دێن بۆ مزگەوت وەكو كەسێك وایە كە وشترێكی كردبێ بەخێر پاش ئەو وەكو كەسێك وایە مانگایەكی كردبێ بەخێر، پاش ئەویش وەكو كەسێك وایە مەرێكی كردبێ بەخێر، پاش ئەویش وەكو كەسێك كەمریشكێكی كردبێ بەخێر، پاش ئەویش وەكو كەسێك هێلكەیەكی كردبێ بەخێر".

## ( ٦ ) نوێژی جومعە لەکاتی نیوەڕۆدایە

٢٠٤ـ عن سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا نُجَمِّعُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ نَرْجِعُ نَتَتَبَّعُ الْفَيْءَ. **(المغازي/ ٣٩٣٥)**

کاتێ خۆر لایدەدا (لەناوەڕاستی ئاسمان)لەخزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژی هەینیمان دەکرد، پاشان بەبن سێبەرەکاندا دەگەڕاینەوە.

## ( ٧ ) دانانی دوانگە( مینبەر ) بۆ پێغەمبەری خوا ( ﷺ )و نوێژکردن لەسەری

٢٠٥ـ عن أَبِي حَازِمٍ: أَنَّ نَفَرًا جاءوا إِلَى سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَدْ تَمَارَوْا فِي الْمِنْبَرِ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ؟ فَقَالَ: أَماءاللَّه، إِنِّي لَأَعْرِفُ مِنْ أَيِّ عُودٍ هُوَ؟ وَمَنْ عَمِلَهُ؟ وَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَوَّلَ يَوْمٍ جَلَسَ عَلَيْهِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ، يَا أَبَا عَبَّاسٍ فَحَدِّثْنَا، قَالَ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى امْرَأَةٍ –قَالَ أَبُو حَازِمٍ: إِنَّهُ لَيُسَمِّهَا يَوْمَئِذٍ–: "انْظُرِي غُلَامَكِ النَّجَّارَ يَعْمَلْ لِي أَعْوَادًا أُكَلِّمُ النَّاسَ عَلَيْهَا". فَعَمِلَ هَذِهِ الثَّلَاثَ دَرَجَاتٍ، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَوُضِعَتْ هَذَا الْمَوْضِعَ، فَهِيَ مِنْ طَرْفَا و الْغَابَةِ، وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَامَ عَلَيْهِ فَكَبَّرَ وكَبَّرَ النَّاسُ وراءهُ، وهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ رَفَعَ فَنَزَلَ الْقَهْقَرَى حَتَّى سَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلَاتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: "يَا أَيُّهَا النَّاسُ، (إِنِّي) إنما صَنَعْتُ هَذَا لِتَأْتَمُّوا بِي، ولِتَعَلَّمُوا صَلَاتِي". **(بخاري/ الجمعة/ ٨٧٥)**

(ابو حازم) دەڵێ: چەند کەسێك هاتن بۆ لای (سهل) کوری(سعد) وتوێـژیان بـوو لەسەر دوانگە کەئاخۆ لە چ دارێکە ؟ وتی: بەخوا من دەزانم لەچ دارێك دروستکراوە، کێش دروستی کردووە ؟

یەکەم جاریش کەپێغەمبەر(ﷺ) لەسەری دانیشت چاوم لێی بووە دەڵێ پێم وت: ئـەی (ابـن عبـاس) قسـەمان بـۆ بکـە، ئـەویش وتـی: پێغەمبـەر(ﷺ) نـاردی بـۆلای ئافرەتێك (ابو حـازم) دەڵـێ: لـەورۆژەدا نـاوی بـردووە: پێـی فـەرمووە: "بەغولامـە دارتاشەکەت بڵێ چەند دارێکـم بـۆ بتـەنێ کەبچمەسـەری‌و قسـە بـۆ خـەڵکی بکـەم" ئەویش ئەم سێ پلەیەی بۆ دروست کردووە، ئینجا پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمانیکرد لـەم جێگایەدا دانرا، ئەودارەش دارگەزەکانی دارسـتانەکەی (نزیـك مەدینـە بـوو)چاویشـم لێبـوو کەپێغەمبـەر(ﷺ) لەسـەر مینبەرەکـە بەپشـتا دابـەزی‌و لـەبنی مینبەرەکـەدا

سوجدەی برد، ئینجا گەڕایەوە سەر مینبەرەکە هەتا لەهەموو نوێژەکەی بوویەوە ، ئینجا رووی‌کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە (من)بۆیە ئەمەم دروستکردووە کەلەنوێژەکاندا شوێنم بکەون و چاوتان لێم بێ لەنوێژەکەمدا چیدەکەم"[1].

## ( ٨ ) لەبارەی ئایەتی (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْواً انفَضُّوا إِلَيْهَا...)

٢٠٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَخْطُبُ قَائِمًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَجَاءَتْ عِيرٌ مِنَ الشَّامِ، فَانْفَتَلَ النَّاسُ إِلَيْهَا، حَتَّى لَمْ يَبْقَ إِلَّا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، فَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ الَّتِي فِي الْجُمُعَةِ: (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا) الآية. (بخاري/ الجمعة/ ٨٩٤)

(جابر) کوری(عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) رۆژی جومعە بەپێوە وتاری دەخوێندەوە، کاروانێك لەشامەوە هات، خەڵکی ناومزگەوتەکە چوون بەدەم کاروانەکەوەو تەنها دوانزە کەسیان مایەوە، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەجومعەدا (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْواً انفَضُّوا إِلَيْهَا...) واتە: هەرکاتێ بازرگانیەك یا یاریەکیان دی بەرەو رووی دەرۆن و بەپێوە تۆ بەجێ دەهێڵن).

## ( ٩ ) هەرکەس لەکاتی وتار خوێندنەوەدا هاتە ژوورەوە با دوو رکات نوێژ بکات

٢٠٧ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: جاء سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَاعِدٌ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَقَعَدَ سُلَيْكٌ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): "أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ". قَالَ: لَا، قَالَ: "قُمْ فَارْكَعْهُمَا". (بخاري/ الجمعة/ ٨٨٨)

(جابر) کوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: رۆژی جومعە (سليك الغطفاني) هات پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەمینبەردا دانیشتبوو، سليك پێش ئەوەی نوێژ بکات دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو "ئایا دوورکات نوێژت کرد" وتی: نەخێر ، فەرمووی: "دەهەستە بیانکە".

---

[1] (عەسقەلانی لەراڤەی بوخاریدا لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێ: بۆیە بەپشتا هاتۆتە خوارەوە تارووی لەقیبلە وەرنەچەرخێت، چونکە لەسەرەوە جێگای سوجدەی نەبووە، لەبەر ئەوەش لەسەر مینەبەرەکە نوێژی کردووە هەتا نوێژگەران چاویان لەهەڵسوکەوتی بێت فێربن.

## (١٠) گوێگرتن بۆ وتار

٢٠٨ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، والْإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَدْ لَغَوْتَ". **(بخاري/ الجمعة/ ٨٩٢)**

(ابوهريره) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "ئەگەر بەهاوەڵەکەتت وت گوێ بگرە لەرۆژی جومعەدا ، ئیمام وتاری دەخوێندەوە، ئەوە قڕەقڕت کردووە".

# بەشی حەوتەم: جەژنەکان

## (١) نوێژی جەژنەکان لە پێش وتاردا

٢٠٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: شَهِدْتُ صَلَاةَ الْفِطْرِ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) وأَبِي بَكْرٍ وعُمَرَ وعُثْمَانَ (ﷺ)، فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُ، قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِه، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جاء النساء ومَعَهُ بِلَالٌ، فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا) فَتَلَا هَذه الْآيَةَ حَتَّى فَرَغَ منْهَا، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ منْهَا: "أَنْتُنَّ عَلَى ذَلك". فَقَالَت امْرَأَةٌ واحدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا منْهُنَّ: نَعَمْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لَا يُدْرَى حِينَئِذٍ مَنْ هِيَ. قَالَ: "فَتَصَدَّقْنَ". فَبَسَطَ بِلَالٌ ثَوْبَهُ، ثُمَّ قَالَ: "هَلُمَّ فدًى لَكُنَّ أَبِي وأُمِّي". فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ والْخَوَاتِمَ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ. (بخاري/ العيدين/ ٩٣٦)

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی رەمەزان بووم، لەخزمەت پێغەمبەری خواو(ﷺ) هەروەها لەخزمەت (ابوبكر)و (عمر)و (عثمان) (رەزای خوایان لێبێت) هەموویان لەپێش وتاردا نوێژیان دەکرد ئینجاوتاریان دەدا، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دابەزی هەردەڵێی چاوم لێیەتی کاتێ بەدەستی پیاوەکانی دادەنیشانەوە، ئینجا ریزەکانی دەبڕی هەتا گەیشتە ناو ئافرەتەکانەوە بیلالی لەگەڵدابوو، فەرمووی: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً...) ئەم ئایەتەی خوێندەوە هەتا تەواوی کرد، ئینجا فەرمووی: "ئایا ئێوەلەسەر ئەم بەڵێنەن" کەس وەڵامی نەدایەوە جگە لەیەك ئافرەتیان وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کاتە نەزانرا کێ بوو، فەرمووی: "دەخێر بکەن" بیلالیش جلەکەی خۆی راسخت و، وتی: بهێنن باوك و دایکم بەقوربانتان بێت) ئینجا ئافرەتەکان ئەموستیلەی گەورە گەورەو ئەڵقەیان دەخستە ناو جلەکەی بیلالەوە.

## (٢) پێش نوێژی جەژن و دوای نوێژی جەژن سوننەت ناکرێت

٢١٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ يَوْمَ أَضْحَى أَوْ فِطْرٍ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا ولَا بَعْدَهَا. ثُمَّ أَتَى النساء ومَعَهُ بِلَالٌ، فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي خُرْصَهَا وتُلْقِي سِخَابَهَا. (بخاري/ العلم/ ٩٨)

(ابـن عبــاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـەڕۆژی جـەژنی قوربانـدا یـا ڕەمەزانـدا لـەماڵ چـووە دەرەوە دووركـات نوێـژی كـرد، نەلەپێشـیەوە نوێـژی كـرد نەلەدوایـەوە، ئینجـا هاتـە نـاو ئافرەتـەكان، بـیلالی لەگەڵـدابوو، فـەرمانی پێكـردن كەخێربكەن، ئینجا هەرژنە ملوانكەو ئەڵقەی ئاڵتونیان دەهاویشـتە سـەر ئـەو جلـەی بیلال رایخستبوو.

## ( ٣ ) چوونی ئافرەتـان بۆ نوێژی جەژن

٢١١ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (ﷺ) قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ نُخْرِجَهُنَّ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى: الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَأَمَّا الْحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ الصَّلَاةَ، وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ ودَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِحْدَانَا لَا يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ؟ قَالَ: لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا". (بخاري/ الحيض/ ٣١٨)

(ام عطيـة) (رضـى الله عنهـا) دەڵـێ : پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمانی پێكـردین كەئافرەتان بنێرین بۆ نوێژی جەژنی ڕەمـەزان و قوربـان (لەوانـەش) كچـە عـازەب ، ئەوانـــەی لەحـــەیزدان، ئەوانـــەش كـــەخۆیان دەرنەدەخســـت حـــەیزدارەكان كـەنارگیردەبوون بـەڵام ئامـادەی خێـرو دۆعـای موسـڵمانەكان دەبـوون، وتم: ئـەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یەكێكمان باڵا پۆشی نییە ؟ فەرمووی: "باخوشكەكەی بیخاتـە ژێر عەباكەی خۆیەوە".

## ( ٤ ) كەنیزەكەكان چی دەڵێن لەجەژندا

٢١٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ بِغِنَا و بُعَاثٍ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وحَوَّلَ وجْهَهُ، فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) فَانْتَهَرَنِي وقَالَ: مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فقَالَ: "دَعْهُمَا". فَلَمَّا غَفَلَ غَمَزْتُهُمَا فَخَرَجَتَا وكَانَ يَوْمَ عِيدٍ، يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ والْحِرَابِ، فَإِمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وإِمَّا قَالَ: "تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ"؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَأَقَامَنِي وراءَهُ، خَدِّي عَلَى خَدِّهِ، وهُوَ يَقُولُ: "دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ". حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: "حَسْبُكِ". قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: "فَاذْهَبِي". (بخاري/ العيدين/ ٩٠٧)

عائشـە (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) هاتـە ژوورەوەو دوو كـەنیزەك لـەلای مـن گۆرانی قەڵای (بعاث) یان دەوت، لەسەر جێگاكە راكشـاو رووی وەرگێـرا، لەوكاتـەدا

(ابوبکر) هاته ژوورەوه لێم تووڕەبوو وتی: جوزەلەی شەیتان لەلای پێغەمبەری خوادا(ﷺ)؟! پێغەمبەر(ﷺ) روویکردە ئەبوبەکرو فەرمووی: "وازیان لێ بێنە" کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چاوی لێی نەبوو بەچاو ئاماژەی بۆ کردن و چوونە دەرەوە، ئەو رۆژە رۆژی جەژن بوو، دوو ڕەشپێست بەسەرنێزە و قەڵغان یاریان دەکرد، منیش خۆم داوامکرد لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) یان ئەو فەرمووی حەزدەکەیت سەیر بکەیت وتم: بەڵێ: ئەویش خستمیە دوای خۆیەوە، رومەتم لەسەر روومەتی بوو سەری خستبووە سەرشانم دەیفەرموو: "بەردەوام بن ئەی نەوەی ئەرفیدە" هەتا بێ تاقەت بووم ئینجا فەرمووی: "بەستە" وتم : بەڵێ فەرمووی: "دەبڕۆ".

# بەشی هەشتەم: نوێژی ڕێبوار

## (١) نوێژی سوننەت بەسەر وڵاغەوە لە کارواندا

٢١٣-عن ابن عمر (ﷺ) قال:كان رسول الله (ﷺ) يسبح على الراحلة قبل اى وجهة توجه، ويوتر عليها، غير انه لايصلى عليها المكتوبة. (بخارى/الوتر فى السفر/٩٥٥).

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر وڵاخەوە ڕووی لە هەر لایەك بوایە نوێژی دەکرد، وەتریشی دەکرد، بەڵام نوێژی فەرزی لەسەر نەدەکرد.

## (٢) ئەگەر لەکاروان بهاتایەتەوە لەمزگەوت دوو رکاتی دەکرد

٢١٤ـ عَنْ جَابِرِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فَأَبْطَأَ بِي جَمَلِي وأَعْيَا، ثُمَّ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَبْلِي وقَدِمْتُ بِالْغَدَاةِ، فَجِئْتُ الْمَسْجِدَ، فَوَجَدْتُهُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، قَالَ: "الْآنَ حِينَ قَدِمْتَ". قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: "فَدَعْ جَمَلَكَ، وادْخُلْ فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ". قَالَ: فَدَخَلْتُ فَصَلَّيْتُ ثُمَّ رَجَعْتُ. (بخاري/ شرا والدواب والحمير/ ١٩٩١

(جابر) کوری(عبداللـه) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەغەزایەکدا دەرچووم وشترەکەم ماندو بوو، دوای خستم ، پێغەمبەر (ﷺ) لەپێش مندا گەیشتبوو، من لەپێش نیوەڕۆدا گەیشتم هاتم بۆ مزگەوت، پێغەمبەرم (ﷺ) لەدەرگای مزگەوتەکەدا تووش بوو فەرمووی: "ئائێستا دەگەیت؟" وتم: بەڵێ : فەرمووی: "واز لەوشترەکەت بێنە بچۆرە ژوورەوە دوورکات نوێژ بکە" وتی: چوومە ژوورەوە دوو رکاتم کردو گەرامەوە.

## (٣) لەبارەی نوێژی ترسەوە

٢١٥ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَوْمًا مِنْ جُهَيْنَةَ، فَقَاتَلُونَا قِتَالًا شَدِيدًا، فَلَمَّا صَلَّيْنَا الظُّهْرَ قَالَ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ مِلْنَا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً لَاقْتَطَعْنَاهُمْ. فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ (عليه السلام) رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) ذَلِكَ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: وقَالُوا إِنَّهُ سَتَأْتِيهِمْ صَلَاةٌ هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ الْأَوْلَادِ. فَلَمَّا حَضَرَتِ الْعَصْرُ، قَالَ صَفَّنَا صَفَّيْنِ، والْمُشْرِكُونَ بَيْنَنَا وبَيْنَ الْقِبْلَةِ. قَالَ: فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وكَبَّرْنَا، ورَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ وسَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الْأَوَّلُ، فَلَمَّا قَامُوا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي، ثُمَّ تَأَخَّرَ

الصَّفُّ الْأَوَّلُ وتَقَدَّمَ الصَّفُّ الثَّانِي فَقَامُوا مَقَامَ الْأَوَّلِ، فَكَبَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وكَبَّرْنَا، ورَكَعَ فَرَكَعْنَا، ثُمَّ سَجَدَ مَعَهُ الصَّفُّ الْأَوَّلُ وقَامَ الثَّانِي، فَلَمَّا سَجَدَ الصَّفُّ الثَّانِي ثُمَّ جَلَسُوا جَمِيعًا سَلَّمَ عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: ثُمَّ خَصَّ جَابِرٌ أَنْ قَالَ: كَمَا يُصَلِّي أُمَرَاؤُكُمْ هؤلاء. **(بخاري/ البيوع/ ١٩٩١)**

(جابر) كوری (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) غەزامان کرد لەگەڵ تیرەیەکدا لە(جوهەینە)، جەنگێکی سەختیان لەگەڵدا کردین، کاتێ نوێژی نیوەڕۆمان کرد، موشریکەکان وتیان: ئەگەر هێرشێکی بەهێز بکەینە سەریان لەرەگوریشە دەریان دەهێنین جوبرەئیل (علیه السلام) ئەو هەواڵەی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) ئاگاداری ئێمەی کرد، راوی دەڵێ: ئەوان کاتی نوێژ کردنیان دێت، کەلەمنداڵەکانیان خۆشتریان دەوێت، کاتێ کاتی عەسرهات کردینی بەدوو ریزەوە ، موشریکەکان لەنێوان ئێمەو قیبلەدابوون، وتی: پێغەمبەر(ﷺ) تەکبیری کردو ئێمەش تەکبیرمان کرد، رکوعی برد ئێمەش رکوعمان برد، ئینجا ریزی یەکەم دواکەوتن لە ئیمام ریزی دووەم پێشکەوتن وەك ریزی یەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) تەکبیری کرد ئێمە تەکبیرمان کرد، رکوعی برد ئێمەیش رکوعمان برد، ئینجا سوجدەی برد ریزی یەکەم لەگەڵیا سوجدەی برد، دووەم بەپێوەمانەوە کاتێ ریزی دووەم سوجدەی برد ئینجا هەمووپێکەوە دانیشتن پێغەمبەر(ﷺ) سەلامی دایەوە.

## (٤) پەناگرتن بەخوا لەکاتی باوبۆراندا

٢١٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وخَيْرَ مَا فِيهَا، وخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وشَرِّ مَا فِيهَا، وشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ". قَالَتْ: وإِذَا تَخَيَّلَتِ السماء تَغَيَّرَ لَوْنُهُ، وخَرَجَ ودَخَلَ، وأَقْبَلَ وأَدْبَرَ، فَإِذَا مَطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ فَعَرَفْتُ ذَلِكَ فِي وجْهِهِ، قَالَتْ عَائِشَةُ (ﷺ): فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: "لَعَلَّهُ يَا عَائِشَةُ كَمَا قَالَ قَوْمُ عَادٍ: (فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا) (الاحقاف: ٢٤)". **(بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٣٤)**

عائشه (ﷺ) دەڵێ: هەرکاتێ باهەڵی بکردایە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو "خوایە گیان خێری ئەم بایەو خێری ئەوەش کە تیایەتی خێری ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە

لەتۆ داواکارم، پەنادەگرم بەتۆ لە خراپەی ئەم بایەو خراپەی ئەوەی کە تیایەتی و خراپەی ئەوەش کە بۆی ڕەوانەکراوە". هەروەها وتویەتی: هەرکاتێ ئاسمان هەور بوایە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەنگی دەگۆڕا، دەهات و دەچوو، کە باران دەباری ئینجا ئاسایی دەبووەوە، من ئەوەم بەڕوخساریدا دەزانی، بۆیە لێم پرسی: ئەویش فەرموی: "ئەی عائشە لەوانەیە هەر وەکو حاڵەتەکەی قەومی عاد بێت (کە خوای گەورە لە ئایەتێکدا لەسەر زمانیان دەفەرموێت: (کاتێ هەورەکەیان دی ڕوو بە شیو ودۆڵەکانیان دێت، وتیان: ئەمە هەورێکە بارانمان بۆ دەبارێنێ) بەڵام ئەوە بوو هەور و سزای خوایی بوو).

## ( ٥ ) بای ڕۆژهەڵات و بای ڕۆئاوا

**٢١٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ". (بخاري/ الاستسقا و/ ٩٨٨٤)**

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "من بەهۆی بای ڕۆژهەڵاتەوە پشتیوانیم لێ کراوە، قەومی عاد بەبای خۆرئاوا تیاچوون".

# بەشی نۆیەم: مردن و جەنازە

## (١) هەرکەسێ حەز بەدیداری خوا بکات خواش حەزبە دیداری ئەو دەکات

٢١٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ أَحَبَّ لِقَا و اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَا وهُ، ومَنْ كَرِهَ لِقَا و اللَّه كَرِهَ اللَّهُ لِقَا وهُ". فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّه، أَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ؟ فَكُلُّنَا نَكْرَهُ الْمَوْتَ. فَقَالَ: "لَيْسَ كَذَلِك، ولَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ ورِضْوَانِه وجَنَّتِه أَحَبَّ لِقَا و اللَّه، فَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَا وهُ. وإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وسَخَطِه، كَرِهَ لِقَا و اللَّهِ وكَرِهَ اللَّهُ لِقا وه".

**(**وَفِي رواية عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ أَحَبَّ لِقَا و اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَا وهُ، ومَنْ كَرِهَ لِقَا و اللَّه، كَرِهَ اللَّهُ لِقَا وهُ". قَالَ: فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَذْكُرُ عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) حَدِيثًا، إِنْ كَانَ كَذَلِكَ فَقَدْ هَلَكْنَا. فَقَالَتْ: إِنَّ الْهَالِكَ مَنْ هَلَكَ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ومَا ذَاكَ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ أَحَبَّ لِقَا و اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقَا وهُ، ومَنْ كَرِهَ لِقَا و اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَا وهُ" ولَيْسَ مِنَّا أَحَدٌ إِلَّا وهُوَ يَكْرَهُ الْمَوْتَ؟ فَقَالَتْ: قَدْ قَالَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، ولَيْسَ بِالَّذِي تَذْهَبُ إِلَيْه، ولَكِنْ إِذَا شَخَصَ الْبَصَرُ، وحَشْرَجَ الصَّدْرُ، واقْشَعَرَّ الْجِلْدُ، وتَشَنَّجَتِ الْأَصَابِعُ، فَعِنْدَ ذَلِكَ مَنْ أَحَبَّ لِقَا و اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَا وهُ، ومَنْ كَرِهَ لِقَا و اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَا وهُ**)**. (بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٢)

(عائشه) (رضي الله عنها) دەڵێ: "پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەس حەزبە دیداری خوا بکات خوایش حەزبە دیداری ئەو دەکات، هەرکەسیش حەزبە دیداری خوا نەکات، خواش حەز بەدیداری ناکات". منیش وتم: باشە ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا حەزنەکردن لە مردن ئەوە دەگەیەنیت؟ کەسمان حەز لەمردن ناکەین؟ فەرموی: "ئەوە، وانیە، بەڵکو کاتێك ئیماندار مژدەی ڕەحمەت و ڕەزامەندی و بەهەشتی خوایی پێ دەدرێت، حەز بەدیداری خوا دەکات، خواش حەز بەدیداری ئەو دەکات، کافریش کاتێ مژدەی سزا و قینی خوای دەدرێتێ حەزبە دیداری خوا ناکات و خواش چارەی ئەوی ناوێت". لەڕیوایەتی (شریح ی کوڕی هانی)دا هاتووە کە (ابو هریره) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "ئەوەی حەز بەدیداری خوا بکات خواش حەزبەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری ناکات، خواش حەزبە دیداری

ئەو ناكات". (شريح) دەڵێت: (منیش چووم بۆلای عائشە و پێم وت: ئەی دایکی ئیمانداران گوێم لە (ابوهريرە) وە بوو فەرمودەیەکی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕایەوە، جا ئەگەر وابێت، ئەوە هەمومان تیاچووین، ئەویش و وتی: تیاچوو ئەو کەسەیە کەبە گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) تیابچێت.

–ئەو گوفتارە کامەیە؟ (شريح) دەڵێ: "ئەوەی حەز بەدیداری خوا بکات خواش حەز بەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری ناکات، خواش حەزبە دیداری ناکات" کەسیشمان نیە ڕقی لەمردن نەبێت. عائشە وتی: ڕاستە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی فەرمووە، بەڵام بەو شێوەیە نیە تۆ بۆی دەچێت، بەڵکو ئەمە ئەو کاتەیە کەچاو ئەبڵەق دەبێت، هەناسە سوار دەبێت، موچرکە بە پێستدا دێت، پەنجەکان گرژ دەبن، ئالەو کاتەدا، ئەوەی حەزبە دیداری خوا دەکات، خواش حەز بەدیداری دەکات، ئەوەش حەز بەدیداری نەکات خواش حەزبە دیداری ناکات.

## ( ٢ ) دا پۆشینی مردوو

٢١٩ـ عن عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سُجِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ. **(بخاري/ اللباس/ ٤٧٧)**

عائشە (رضي الله عنها) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد بە پارچە قوماشێکی سەوز داپۆشرا.

## ( ٣ ) دان بەخۆداگرتن لەسەرەتای بەڵاوە

٢٢٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَتَى عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: "اتَّقِي اللَّهَ واصْبِرِي". فَقَالَتْ: ومَا تُبَالِي بِمُصِيبَتِي. فَلَمَّا ذَهَبَ قِيلَ لَهَا: إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَخَذَهَا مِثْلُ الْمَوْتِ، فَأَتَتْ بَابَهُ فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: "إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ". أَوْ قَالَ: "عِنْدَ أَوَّلِ الصَّدْمَةِ". **(بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٣)**

(انس ی کوڕی مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی بینی بەسەر منداڵەکەیدا دەگریا، پێی فەرموو: "لەخوا بترسە و دان بەخۆتدا بگرە". ژنەکە وتی: دیارە تۆ لێقەومانەکەی منت لا گرنگ نییە!!، کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت پێیان وت: ئەوە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ). ئافرەتەکە لەهۆش خۆی چوو وەك مردووی

لێهات، پاشان خۆی گەیاندە دەرگاکەی، دەرگاوانی لەدەرگاکەیدا نەبینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نەمناسیت.. ئەویش فەرموی: "دان بەخۆدا گرتن دەبێ لەسەرەتای بەلاوە بێت".

### (٤) پاداشتی ئەو کەسەی کە منداڵی دەمرێت و بەتەمای پاداشتی

٢٢١ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لِنسْوَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: لَا يَمُوتُ لِإِحْدَاكُنَّ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَتَحْتَسِبَهُ، إِلَّا دَخَلَتِ الْجَنَّةَ". فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: أَوِ اثْنَيْنِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "أَوِ اثْنَيْنِ". (وبإسناد آخر عنه مرفوعاً: "لا يموت لأحد من المسلمين ثلاثة من الولد فتمسه النار، إلاَّ تَحِلَّة القسم"). (بخاري/ الجنائز/ ١١٩٢،١١٩٣)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەهەندێ لە ئافرەتانی (انصار)ی فەرموو "هەرکەسێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێت و ڕازی بێت بەفەرمانی خوا و بەئومێدی پاداشت بێت دەچێتە بەهەشتەوە". ئافرەتێکیان وتی: ئەی ئەگەر دوانیش بن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرموی: "بادوانیش بن". لەڕێگەیەکی ترەوە هەر (ابوهريره) دەیگەیەنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: "هیچ موسڵمانێك نییە سێ منداڵی بمرێت و ئاگری بەرکەوێت مەگەر بۆ ناوی سوێند" (کە مەبەست ئەم ئایەتەیە)... (وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَّقْضِيّاً) (مريم : ٧١) واتە: هیچ کەسێك لەئێوە نییە کە ئاگری دۆزەخ نەبینێت و بەسەریا تێنەپەڕێت.

### (٥) گریان لەسەر مردوو

٢٢٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ فَأَتَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وسَعْدِ بْنِ أَبِي وقَّاصٍ وعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ)، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ وجَدَهُ فِي غَشِيَّةٍ فَقَالَ: "أَقَدْ قَضَى". قَالُوا: لَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَا و رَسُول اللَّهِ (ﷺ) بَكَوْا، فَقَالَ: "أَلَا تَسْمَعُونَ؟ إِنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ، ولَا بِحُزْنِ الْقَلْبِ، ولَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا —وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ— أَوْ يَرْحَمُ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٤٢)

(عبدالله کوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: (سعدی کوڕی عبادە) ناساغیەکی هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (عبدالرحمن کوڕی عوف و سعدی کوڕی ابی وقاص و عبدالله

ی کوڕی مەسعود) (ﷺ)، چون بۆ سەردانی، کاتێ کە چونە ژورەوە بۆلای لەهۆش خۆی چووبوو، فەرمووی: "ئایا تەوابوو؟" وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ). پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بەگریان، کاتێ خەڵکەکە گریانی پێغەمبەری خوایان بینی، هەمو دەستیان کرد بە گریان پاشان فەرموی: "ئایا نەتان بیستووە کە خوا سزا نادات لەسەر فرمێسکی چاو، لەسەر غەمباری دڵ، بەڵکو بەهۆی ئەمەوە سزا دەدات —ئاماژەی بۆ زمانی کرد— یان ڕەحم دەکات".

**( ٦ ) لەئێمە نییە ئەوەی یەخەی خۆی دەدڕێ و لە ڕومەتی خۆی دەدا و..**

**٢٢٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بن مسعود (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ، أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ". وفي لفظ: "وَشَقَّ... ودَعَا" بِغَيْرِ أَلِفٍ. (بخاري/ الجنائز/ ١٢٣٥)**

(عبدالله ی کوڕی مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "لە ئێمە نییە ئەوەی لە ڕومەتی خۆی دەدا یان یەخەی خۆی دادەڕێت، یاخود دەنگ و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە وەك سەردەمی نەفامی".

**( ٧ ) مردوو ئازار دەدرێت بەهۆی گریانی زیندووانەوە**

**٢٢٤ـ عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (ﷺ): أَنَّهَا سَمِعَتْ عَائِشَةَ (ﷺ) —وَذُكِرَ لَهَا أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَا و الْحَيِّ— فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَمَا إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ، ولَكِنَّهُ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ، إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى يَهُودِيَّةٍ يُبْكَى عَلَيْهَا، فَقَالَ: "إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا، وإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٧)**

(عەمرەی کچی عبدالرحمن) بیستویەتی لە عائشە، کە بۆیان باس کردوە کە (عبدالله ی کوڕی عومەر) وتویەتی: مردوو سزادەدرێت بەگریانی زیندو عائشە وتی: خوا لە (ابو عبدالرحمن) خۆش بێت، خۆ درۆشی نەکردوە بەڵکو یان بیری چووە، یان هەڵەی کردووە، ئەگینا پێغەمبەر (ﷺ) بەلای (گۆڕی) ژنە جولەکەیەکدا تێپەڕیوە، بەسەریەوە دەگریان، بۆیە فەرمووی "ئەوانە دەگرین لەسەری، لە حاڵێکدا ئەو لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت".

٢٢٥ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيٍّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مُرَّ عَلَيْهِ بِجَنَازَةٍ، فَقَالَ: "مُسْتَرِيحٌ وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ فَقَالَ: "الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلَادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٧)**

(ابو قتادەی کوڕی ڕیبعی) (ﷺ) باسی ئەوەی کردووە کە: جارێکیان جەنازەیەك بەلای پێغەمبەردا (ﷺ) برا، فەرموی: "ئەوە ئاسودەیە و ئاسودەن لەدەستی".. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) : ئاسودەیە و ئاسودەن لەدەستی یانی چی؟!

فەرموی: "بەندەی ئیماندار لەدەست کێشەو ناخۆشیەکانی دنیا ڕزگاری دەبێت و ئاسودیە، بەندەی تاوانکاریش خەڵکی وڵات و دار و درەخت و ئاژەڵ لەدەستی ئاسودە دەبن".

## ( ٨ ) شۆردنی مردوو

٢٢٦ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (ﷺ) قَالَتْ: لَمَّا مَاتَتْ زَيْنَبُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اغْسِلْنَهَا وِتْرًا: ثَلَاثًا أَوْ خَمْسًا، وَاجْعَلْنَ فِي الْخَامِسَةِ كَافُورًا، أَوْ: شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا غَسَلْتُنَّهَا فَأَعْلِمْنَنِي". قَالَتْ: فَأَعْلَمْنَاهُ، فَأَعْطَانَا حَقْوَهُ وَقَالَ: "أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ". **(بخاري/ الجنائز/ ١١٩٥)**

"ام عطیە" (ﷺ) دەڵێ: کاتێ (زینب)ی کچی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتین: "باشتنەکەی تاك بێت سێ، یان پێنج جار، لە پێنجەمدا کافور لەسەر لاشەی دانێن، یان کەمێك کافور، جاکاتێ لەشتنی بونەوە ئاگادارم بکەن". (ام عطیە) دەڵێ: ئێمەش ئاگادارمان کرد، ئەویش پۆشتە ماڵێکی داینێ و فەرموی: (لەشی پێ داپۆشن).

## ( ٩ ) کفنی مردوو

٢٢٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ، سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ، أَمَّا الْحُلَّةُ فَإِنَّمَا شُبِّهَ عَلَى النَّاسِ فِيهَا أَنَّهَا اشْتُرِيَتْ لَهُ لِيُكَفَّنَ فِيهَا، فَتُرِكَتِ الْحُلَّةُ، وَكُفِّنَ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ، فَأَخَذَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: لَأَحْبِسَنَّهَا حَتَّى أُكَفِّنَ فِيهَا نَفْسِي، ثُمَّ قَالَ: لَوْ رَضِيَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ (ﷺ) لَكَفَّنَهُ فِيهَا، فَبَاعَهَا وَتَصَدَّقَ بِثَمَنِهَا. **(بخاري/ الجنائز/ ١٢٠٥)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسێ بەرگی سپی کفنی بەباڵابڕا کە لە لۆکە دروست کرابوون، نەکراس و نەمێزەری تیا نەبوو، ئەودوو پارچە قوماشەش کە لەیەك دەچن و خەڵکی مردووی خۆیانی پێ کفن دەکەن، ئەویشیان بۆ کڕی تا کفن بکرێت تێیدا، بەڵام لەوەدا کفن نەکرا، بەڵکو لەوسێ بەرگە سپیەدا کفن کرا کە لە لۆکە دوست کرابوو، ئیتر دوپارچە قوماشەکە (عەبدوڵڵای کوڕی ابوبکر) هەڵی گرت و وتی: ئەمە هەڵدەگرم بۆ خۆم تاتیایدا کفن بکرێم، پاشانیش وتی ئەگەر خوا ڕازی لەسەر بوایە کە بۆ پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە تیایدا کفن دەکرا، ئیتر فرۆشتی و پارەکەی کرد بەخێر.

### (١٠) پەلەکردن لە بەڕێ کردنی تەرمدا

٢٢٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ -(لَعَلَّهُ قَالَ) تُقَدِّمُونَهَا عَلَيْهِ، وإِنْ تَكُ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٥٢)

(ابو هريره) ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "پەلەبکەن لەبردنی جەنازەدا، ئەگەر چاك و خواناس بێت، ئەوە زوو بەخۆشی و شادی دەگەیەنن، بەڵام ئەگەر وانەبوو، ئەوە شەڕ و خراپەیەکە لە کۆڵی خۆتانی دەکەنەوە".

### (١١) قەدەغەکردنی ئافرەتان لە شوێنکەوتنی جەنازە

٢٢٩ـ عَنْ أُمُّ عَطِيَّةَ (ﷺ) قالتْ: كُنَّا نُنْهَى عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، ولَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا. (بخاري/ الجنائز/ ١٢١٩)

(ام عطيه) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە ڕێگریمان لێ دەکرا لە شوێنکەوتنی جەنازە بەڵام زۆر جەختیشی لەسەر نەدەکرا.

### (١٢) هەستان لەبەر جەنازە

٢٣٠ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: مَرَّتْ جَنَازَةٌ، فَقَامَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وقُمْنَا مَعَهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا يَهُودِيَّةٌ! فَقَالَ: "إِنَّ الْمَوْتَ فَزَعٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَها". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٤٩)

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: جەنازەیەك تێپەڕی، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا لەبەری و ئێمەش هەستاین و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە ئافرەتێکی

جولەکەیە، فەرمووی: "بەڕاستی مردن سامناکە، ئەگەر جەنازەتان بینی هەستن لەبەری".

## (١٣) جێگەی وەستانی (امام) لە نوێژی مردودا

**٢٣١ـ عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (ﷺ) قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ (ﷺ) وصَلَّى عَلَى أُمِّ كَعْبٍ، مَاتَتْ وهِيَ نُفَسَا و، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِلصَّلَاةِ عَلَيْهَا وسَطَهَا. (بخاري/ / الجنائز/ ١٢٦٧)**

(سمرەی کوڕی جندب) (ﷺ) دەڵێ: لەپشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) نوێژم کرد لەکاتێکدا کە نوێژی لەسەر (ام کعب) کرد کە بەسەر منداڵەوە وەفاتی کردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی نوێژەکەدا لەناوەڕاستی جەنازەکەدا وەستا.

## (١٤) (تكبير) لەسەر جەنازە

**٢٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، وكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ. (بخاري/ الجنائز/ ١٢٦٨)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی مەرگی نەجاشی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا کە تیایدا مردبوو، خەڵکەکەی برد بۆ جێ نوێژەکە و چوارجار (الله اكبر)ی فەرموو.

**٢٣٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَا و كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ -أَوْ شَابًّا- فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَسَأَلَ عَنْهَا -أَوْ عَنْهُ- فَقَالُوا: مَاتَ، (ماتت) قَالَ: "أَفَلَا كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي". قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا أَوْ أَمْرَهُ، فَقَالَ: "دُلُّونِي عَلَى (قبرها) قَبْرِه". فَدَلُّوهُ فَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُو وةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلَاتِي عَلَيْهِمْ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٢)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش پێست، یا لاوێك گسکی مزگەوتی دەدا، پێغەمبەر (ﷺ) چاوی بۆ گێڕا، دیار نەبو، هەواڵی پرسی، وتیان: مرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "نەدەبوو ئاگادارتان بکردمایە؟". پێدەچوو ئەوان بەکەمیان زانیبێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "گۆڕەکەیم نیشان بدەن" ئەوانیش نیشانیان دا، ئەویش نوێژی لەسەر کرد و فەرموی: "ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکی بۆ نیشتەجێکانی، بێگومان خوای گەورە بە نوێژکردنی من لەسەریان بۆیان ڕوناك دەکاتەوە".

## ( ١٥ ) خێری نوێژی جەنازە و شوێنکەوتنی

٢٣٤ـ عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، ومَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ". قِيلَ ومَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: "مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٦١)

(ابـو هريـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمويـەتی: "ئـەوەی بـەدیار جەنازەیەکەوە بێت هەتا نوێژی لەسەر دەکرێت قیراتێکی دەست دەکەوێت، ئەوەش شوێنی دەکەوێت هەتا دەینێژن ئەوە دوو قیراتی دەست دەکەوێت" پرسیاریان کرد: دووقیرات چین؟!. فەرموی: "وەك دووکەژی گەورە وایە" (لەسامان و پاداشت)

## ( ١٦ ) باسی چاکەو خراپەی مردوو.

٢٣٥ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ): "وَجَبَتْ وجَبَتْ وجَبَتْ". ومُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ نَبِيُّ اللَّه (ﷺ): "وَجَبَتْ وجَبَتْ وجَبَتْ". قَالَ عُمَرُ: فِدًى لَكَ أَبِي وأُمِّي، مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرٌ، فَقُلْتَ: وجَبَتْ وجَبَتْ وجَبَتْ. ومُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرٌّ، فَقُلْتَ: وجَبَتْ وجَبتْ وجَبَتْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْه خَيْرًا وجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، ومَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا وجَبَتْ لَهُ النَّارُ. أَنْتُمْ شُهَدَا و اللَّهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَا و اللَّهِ فِي الْأَرْضِ، أَنْتُمْ شُهَدَا و اللَّهِ فِي الْأَرْضِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٣٠١)

(انس ی کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: جەنازەیـەك بـرا (ئیمانـداران) بەباشـی ناویـان هێنـا، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرموی: "مسـۆگەر بـوو، مسـۆگەر بـوو، مسـۆگەر بـوو"، جەنازەیـەکی تریشـیان بـرد (ئیمانـداران) بەباشـی ناویـان نـەهێنا، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموی: "مسۆگەر بوو، مسۆگەر بـوو، مسـۆگەر بـوو" (عمـر) (ﷺ) وتـی: دایـك و باوکم بەقوربانت بێت: جەنازەیەك براو بەباشی نـاوی بـرا فـەرمووت: مسـۆگەر بـوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. جەنازەیەکی تـر هێنـرا بـە خراپـی نـاوی بـرا، فـەرموت: مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو، مسۆگەر بوو. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرموی: "ئـەوەی ئێـوە بەچاکی ناوی ببەن ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە، ئەوەش وەسفی بەخراپە دەکـەن، ئەوە دۆزەخی بۆ مسۆگەرە، ئێوە شایەتی خوای گەورەن لە زەویدا".

## ( ١٧ ) حاڵی مردوو له ئێواران و بەیانیاندا

٢٣٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ والْعَشِيِّ: إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّة فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّة، وإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٣١٣)

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەرکەس لە ئێوە کە دەمرێت شوێنەکەی لەبەیانیان و ئێواراندا نیشان دەدرێت، ئەگەر لەخەڵکی بەهەشت بێ، ئەوە خەڵکی بەهەشتە، خۆ ئەگەر خەڵکی دۆزەخ بێت، ئەوە خەڵکی دۆزەخە، ئینجا پێی دەوترێت: ئەمە جێگەی تۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت خوای گەورە زیندوت دەکاتەوە بۆلای خۆی".

## ( ١٨ ) پرسیاری دووفریشتەکە لەکاتی خستنە گۆڕدا.

٢٣٧ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللّهِ (ﷺ): "إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وضِعَ فِي قَبْرِهِ، وتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ. (زادَ في الرواية: إذا انصرفوا). قَالَ: يَأْتِيه مَلَكَانِ فَيُقْعِدَانه، فَيَقُولَانِ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ قَالَ: فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللّه ورَسُولُهُ. قَالَ: فَيُقَالُ لَهُ: "انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَدْ أَبْدَلَكَ اللّهُ بِه مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّة. قَالَ نَبِيُّ اللّه (ﷺ): "فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا". قَالَ قَتَادَةُ: وذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا، ويُمْلَأُ عَلَيْهِ خَضِرًا إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ. (بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٣)

(انس کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "کاتێ ئادەمیزاد دادەنرێت لە گۆڕەکەیدا و هاوەڵانی بەجێی دەهێڵن، ئەو دەنگی پێڵاوەکانیان دەبیسێت... دووفریشتە دێن و دایدەنیشێنن و دەڵێن: تۆ کاتی خۆی دەربارەی ئەم پیاوە چیت دەوت؟ ئیماندار دەڵێت: من شایەتی دەدەم کە ئەو بەندە و پێغەمبەری خودایە، ئەوسا پێی دەوترێت: تەماشای جێگەی خۆت بکە لەدۆزەخ دا، خوای گەورە بۆی گۆڕیویت بە جێگەیەکی تر لە بەهەشتدا". جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "هەردوکیان دەبینێت". (قتادە) دەڵێ: بۆمان باسکرا کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت بە ئەندازەی حەفتا باڵ و بۆی پڕدەکرێت لە سەوزایی تا ئەو ڕۆژەی زیندوو دەکرێتەوە.

## ( ١٩ ) دەربارەی ئایەتی ( يثبت الله الذين امنوا .. )

٢٣٨ـ عَنِ الْبراء بْنِ عَازِبٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ) **(فقال):** نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ، فَيُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ، وَنَبِيِّي مُحَمَّدٌ (ﷺ)، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وجَلَّ: (يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وفِي الْآخِرَةِ) (إبراهيم: ٢٧). **(بخاري/ الجنائز/ ١٣٠٣)**

(بەرائی کوڕی عازب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "(يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ) دەربارەی سزای ناوگۆڕ دابەزیوە...کاتێك پێی دەوترێت پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێت: پەروەردگارم (الله)یە و محمدیش (ﷺ) پێغەمبەرمە، جا ئائەوەیە کە خوای گەورە دەربارەی فەرمویەتی (يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ) (إبراهيم : ٢٧)". واتە: خوا ئیماندار پابەند و پایەدار دەکات لەسەر بەڵێن و گوفتاری دامەزراوو پایەدار لە ژیانی دونیاو لە قیامەتیشدا..

## ( ٢٠ ) سزادانی جوو لە گۆڕەکانیاندا

٢٣٩ـ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ مَا غَرَبَتِ الشَّمْسُ، فَسَمِعَ صَوْتًا، فَقَالَ: "يَهُودُ تُعَذَّبُ فِي قُبُورِهَا". **(بخاري/ الجنائز/ ١٣٠٩)**

(ابو ايوب) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆرئاوابوون چووە دەرەوە گوێی لەدەنگێك بوو، فەرموی: "ئەوە جولەکەکانن لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن".

# بەشی دەیەم: زەکات

## (١) باسی فەرزبوونی زکات

٢٤٠ ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ مُعَاذًا قَالَ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ: فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ: فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ: فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ". **(بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٥)**

(ابـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: (معـاذ) وتویـەتی: پێغەمبـەر (ﷺ) بـەڕێی کـردم و فەرمووی: "تۆ دەگەیت بەکەسانێك لەخاوەن کتێبـەکان بانگیـان بکـە بـۆ شـایەتمان (ان لا اله الا الله وأنی رسـول الله). جـا ئەگـەر ئـەوان ملکـەچ بـوون بـۆ ئـەوە، تێیـان بگەیەنە کە خوا لەشـەوو ڕۆژێکدا پێـنج جـار نوێـژی لەسـەر فـەرز کـردوون، ئەگـەر ملکەچ بوون بۆ ئەوەش، ئەوە تێیان بگەیەنە کە خوا زەکـاتێکی لەسـەر فـەرزکردون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێـت و دەدرێت بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر ملکەچ بوون بۆ ئەوەش، ئەوە نەکەیت ماڵە بەنرخ و گران بەهاکانیان لێوەربگریـت، خۆشـت لە نزای ستەم لێکرا و بپارێزە، چونکە بەڕاستی لەنێوان ئـەو و خـوای گـەورەدا هـیچ پەردەیەك نییە.

## (٢) زەکات لەچی دەردەکرێت؟

٢٤١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، صَدَقَةٌ وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ". **(بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٠)**

(ابو سعیدی خدری) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "لـە دانەوێڵـەو خورمادا زەکات نییە تا دەگاتە پێنج (اوسق) (کە بەرامبەرە بە ٦٥٣ کغم)، لە پێـنج سەر حوشتریش کەمتریش زەکـات نییـە، لـە پێـنج (ئوقیـە) زیـویش کـەمتر زەکـاتی ناکەوێت".

## (٣) پێشخستنی زەکات یان دەرنەکردنی زەکات

٢٤٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عُمَرَ عَلَى الصَّدَقَة، فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ وخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ والْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، وأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا، قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وأَعْتَادَهُ فِي سَبِيلِ اللَّه وأَمَّا الْعَبَّاسُ فَهِيَ عَلَيَّ ومِثْلُهَا مَعَهَا". ثُمَّ قَالَ: "يَا عُمَرُ، أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٩٩)

(ابـو هريـره) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) (عومـەری کـوڕی خطـاب)ی نـارد بـۆ کۆکردنەوەی زەکات.. وتیان: (ابـن جميـل) و (خالـدی کـوڕی وەليـد) و (عـەباس)ی مامی پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتیان نەداوە. پێغەمبەر (ﷺ) کە هـەواڵی پێـدرا فـەرموی: "ابن جميل لەوە ڕقی هەستاوە کە هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی کـرد!!، بـەڵام خالـد ئێوە ستەمی لـێ دەکـەن، چـونکە ئـەو زرێپـۆش و تفـاقی جـەنگی لەڕێگـەی خـوادا داناوە، (عەباس)یش هەرچی دەکەوێت لەسەر من بۆی دەدەم و ئەوەنـدەی تریشـی دەخەمـە سـەر، پاشـان فـەرموی ئـەی عومـەر نـازانی مـامی هەرکەسێك لـەجێی باوکیەتی".

## (٤) زەکات نەدەر

٢٤٣ـ عَنْ أَبِي ذَرٍّ (ﷺ) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَة، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: "الْأَخْسَرُونَ ورَبِّ الْكَعْبَة". قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى جَلَسْتُ، فَلَمْ أَتَقَارَّ أَنْ قُمْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، فِدَاكَ أَبِي وأُمِّي، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: "هُمُ الْأَكْثَرُونَ أَمْوَالًا، إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا -مِنْ بَيْنَ يَدَيْهِ ومِنْ خَلْفِهِ وعَنْ يَمِينِهِ وعَنْ شِمَالِهِ- وقَلِيلٌ مَا هُمْ. مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ ولَا بَقَرٍ ولَا غَنَمٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلَّا جاءتْ يَوْمَ الْقِيَامَة أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٩١)

(ابـو ذر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لـە سـێبەری کەعبـەدا دانيشـتبو، چـومە خزمەتی کاتێ منی بینی فەرموی: "بەخاوەنی کەعبـە ئەوانـە زۆر خەسـارۆمەندن". ئۆقرەم نەگرت هەستام و وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دایـك و بـاوکم بـەقوربانت بێ، کێن ئەوانە؟ فەرموی: "ئەوانەی کە مـاڵ و دارايیـان زۆرە، مەگـەر کەسـێ بڵـێ:

هاو هاو ها، لەبەردەم و لەپشتەوە و بەڕاست و بە چەپدا ببەخشێ، ئەوانەش کەمن، هیچ خاوەن وشترو گاگەل و مەڕو ماڵاتێك نیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەبۆیان دەهێنرێتە مەیدان، هەموو گەورەتر و قەڵەوتریشن بەشاخ دەدەن لەخاوەنەکەیان و دەیانخەنە ژێر سمیانەوە، کاتێ سەرەی هەموویان تەواو دەبێت سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە هەتا لێپرسینەوە لەناو خەڵکیدا تەواو دەبێت.

٢٤٤ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ ولَا فضَّةٍ، لَا يُؤَدِّي منْهَا حقَّهَا، إلَّا إذَا كَانَ يَوْمُ الْقيَامَة صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائحَ منْ نَارٍ، فَأُحْميَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جهَنَّمَ، فَيُكْوَى بهَا جَنْبُهُ وجَبِينُهُ وظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَردَتْ أُعيدَتْ لَهُ، في يَوْمٍ كَانَ مقْدَارُهُ خَمْسينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعبَاد، فَيَرَى سَبيلَهُ: إمَّا إلَى الْجَنَّة، وإمَّا إلَى النَّار". قيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه، فَالْإبلُ؟ قَالَ: "ولَا صَاحبُ إبلٍ لَا يُؤَدِّي منْهَا حَقَّهَا، ومنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ ورْدهَا، إلَّا إذَا كَانَ يَوْمُ الْقيَامَة بُطحَ لَهَا بقَاعٍ قَرْقَرٍ، أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، لَا يَفْقدُ منْهَا فَصيلًا واحدًا، تَطَؤُهُ بأَخْفَافهَا وتَعَضُّهُ بأَفْوَاههَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْه أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْه أُخْرَاهَا، في يَوْمٍ كَانَ مقْدَارُهُ خَمْسينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعبَاد، فَيَرَى سَبيلَهُ: إمَّا إلَى الْجَنَّة وإمَّا إلَى النَّار". قيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه، فَالْبَقَرُ والْغَنَمُ؟ قَالَ: "ولَا صَاحبُ بَقَرٍ ولَا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي منْهَا حَقَّهَا، إلَّا إذَا كَانَ يَوْمُ الْقيَامَة بُطحَ لَهَا بقَاعٍ قَرْقَرٍ، لَا يَفْقدُ منْهَا شَيْئًا، لَيْسَ فيهَا عَقْصَا و ولَا جَلْحَا و ولَا عَضْبَا و، تَنْطَحُهُ بقُرُونهَا وتَطَؤُهُ بأَظْلَافهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْه أُولَاهَا رُدَّ عَلَيْه أُخْرَاهَا، في يَوْمٍ كَانَ مقْدَارُهُ خَمْسينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعبَاد، فَيَرَى سَبيلَهُ: إمَّا إلَى الْجَنَّة وإمَّا إلَى النَّار". قيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه، فَالْخَيْلُ؟ قَالَ: "الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ: هيَ لرَجُلٍ وزْرٌ، وهيَ لرَجُلٍ ستْرٌ، وهيَ لرَجُلٍ أَجْرٌ، فَأَمَّا الَّتي هيَ لَهُ وزْرٌ: فَرَجُلٌ رَبَطَهَا ريَا و وفَخْرًا ونوَا و عَلَى أَهْلِ الْإسْلَامِ، فَهيَ لَهُ وزْرٌ. وأَمَّا الَّتي هيَ لَهُ ستْرٌ. فَرَجُلٌ رَبَطَهَا في سَبيلِ اللَّه ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّه في ظُهُورهَا ولَا رقَابهَا، فَهيَ لَهُ ستْرٌ. وأَمَّا الَّتي هيَ لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا في سَبيلِ اللَّه لأَهْلِ الْإسْلَامِ، في مَرْجٍ ورَوْضَةٍ، فَمَا أَكَلَتْ منْ ذَلكَ الْمَرْجِ أَو الرَّوْضَة منْ شيءٍ إلَّا كُتبَ (الله) لَهُ عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٌ، وكُتبَ لَهُ عَدَدَ أَرْوَاثهَا وأَبْوَالهَا حَسَنَاتٌ، ولَا تَقْطَعُ طوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، إلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارهَا وأَرْوَاثهَا حَسَنَاتٍ، ولَا مَرَّ بهَا صَاحبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَربَتْ منْهُ، ولَا يُريدُ أَنْ يَسْقيَهَا، إلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ مَا شَربَتْ حَسَنَاتٍ". قيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه، فَالْحُمُرُ؟ قَالَ:

"مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي الْحُمُرِ شيء إِلَّا هَذِه الْآيَةَ الْفَاذَّةُ الْجَامِعَةُ: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ) (الزلزلة: ٧-٨). (بخاري/ الزكاة/ ١٣٣٨،١٣٣٧)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هیچ خاوەن زێڕ و زیوێك نییە کە حەقەکەی (زەکاتەکەی) نەدات لە ڕۆژی قیامەتدا، پلێتی ئاگرینی بۆ ئامادە دەکرێت کە لە ئاگری دۆزەخدا سوور کراوەتەوە، لاتەنیشت و ناوچاوو پشتی پێ داخ دەکرێت، هەر کاتێك سارد بوویەوە بۆی تازە دەکرێتەوە، لە ڕۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزارساڵە، هەتا دادوەری لەنێوان هەموو بەندەکاندا تەواو دەکرێت، پاشان ڕێگەی نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ". وترا: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەی حوشتر؟ فەرمووی: "خاوەنی حوشتریش هەندێ لەمافەکەی ئەوەیە لەڕۆژی هێنانیدا بۆ سەرئاو بدۆشرێ و بەشی نەدارانی لێ بدرێت، ئەگەرنا لە ڕۆژی قیامەتدا لە دەشتێکی کاکی بەکاکی تەختدا دێت و قەڵەوترو گەورەترە تەنانەت بەچکەکەشیان لێ ون نییە، خاوەنەکانیان دەخەنە ژێر پێیانەوە و گازیان لێدەگرن، کاتێ سەرەتاکان تەواودەبن و دێنە کۆتایی سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە، لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا دادوەری لەنێوان هەموو بەندەکاندا تەواو دەکرێت، پاشان ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێت، یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ".وترا:ئەی پێغەمبەر (ﷺ)ئەی گاگەل و مالات؟ فەرمووی: "خاوەنی گاگەل ومالاتیش ئەوەی کە لەسەری پێویستە نەیبەخشێت،کەڕۆژی قیامەت هات دەشتێکی فراوانی سەختی بۆ ساز دەکرێت،هیچیان لێون نەبووە.هیچیان شاخ کەوانەیی،یان کۆل،یان شاخ شکاونین،بەشۆق لەخاوەنەکانیاندەدەن، سمیان پیادەنێن، کاتێ سەرەتاکانیان تەواودەبێ و دێنە کۆتایی سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە لە ڕۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە هەتا دادوەری لەنێوان هەموو بەندەکاندا تەواو دەکرێت، پاشان ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێت، یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ". وترا: ئەی پێغەمبەر ئەی ئەسپ؟ فەرمووی: "ئەسپ سێ جۆرە بۆ هەندێ کەس هۆی توشبونی تاوانە، بۆ هەندێکیش هۆی پاراستن و پۆشینە بۆ هەندێ کەسی تریش دەستکەوت و پاداشتە، جا ئەوەی کەتاوانە بۆی، پیاوێکە، بۆ خۆدەرخستن و شانازی و دژایەتی موسڵمانان ڕایگرتووە، ئەوە بۆ ئەو تاوانە،

ئەوەش بۆی دەبێـە قـەڵغان لـە ئـاگر، کەسێکە لەبـەرخوا ڕایگرتبێـت، حـەقی خـوا فەرامۆش نەکات لەبەکارهێنانیدا بۆ سواری و بەخشینی بۆ جیهاد، ئەوە بۆی دەبێـە قەڵغان، بەڵام ئەوەی کە بووە هۆی پاداشت، ئـەوە کەسێکە بۆخـوا ڕایگرتبێت بـۆ بەرژەوەندی موسڵمانان، لەدەشتێکی فراوانی سەوزەڵانیدا، هەموو ئەو گژوگیایانـەی کە لەو دەشتە فراوانە سـەوزەدا دەیخـوات بـۆی دەنووسـرێ بـە چـاکە بەئەنـدازەی ئـەوەی خواردوویـەتی، تەنانـەت هـەموو پاشـەڕۆ و میزەکەشـی بـە چـاکە بـۆی دەنووسـرێت، ئەگـەر پەتەکـەی بپچـڕێت تەپۆڵکەیـەك یـان دوو تەپۆڵکـە سـەرکەوت خوابەقەدەر جێ پێکانی و پاشەڕۆکانی چاکەی‌بۆ تۆماردەکـات، کـاتێ خاوەنەکـەی دەیباتە سەر هەر چەم و ڕووبارێك بۆ ئەوەی ئاوی بدات، خوا بەئەندازەی ئەو ئـاوەی دەیخواتــەوە چـاکەی بـۆ دەنوسـێت". ئینجـاوترا: ئـەی گـوێ درێـژ؟ فـەرمووی: "دەربارەی گوێ درێژ هیچم بۆ دانەبـەزیوە مەگـەر ئـەم ئایەتـە نـاوازە و گشـتگیرە: (فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ* وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ) (الزلزلة : ٨)

## ( ٥ ) نزا بۆ زەکاتهێنەر

**٢٤٥ـ عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ قَالَ: "اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ". فَأَتَاهُ أَبِي أَبُو أَوْفَى بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٦)**

(عبدالله کوڕی ابو اوفی) (ﷺ) دەگێڕێتەوە... پێغەمبـەر (ﷺ) هـەرکاتێ هۆزێـك زەکاتیان بۆ بهێنایە دەیفەرموو: "خوایە ڕەحمەت و میهرەبـانی خـۆت بـە سـەریاندا بڕێژە". ڕۆژێك باوکم (ابو اوفی) زەکاتەکەی بـۆ هێنـا... پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرموی: "خوایە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بڕێژە بەسەر ماڵی (ابو اوفی)دا".

## ( ٦ ) زەکاتدان بەباوەڕ دانەمەزراو

**٢٤٦ـ عن سَعْدِ بن ابي وقاص (ﷺ) قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَسْمًا. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِ فُلَانًا فَإِنَّهُ مُؤْمِنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "أَوْ مُسْلِمٌ". أَقُولُهَا ثَلَاثًا وَيُرَدِّدُهَا عَلَيَّ ثَلَاثًا: "أَوْ مُسْلِمٌ". ثُمَّ قَالَ: "إِنِّي لَأُعْطِي الرَّجُلَ، وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ، مَخَافَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِي النَّارِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٨)**

(سعدی کوڕی ابو وقاص) (ﷺ) دەگێڕێتـەوە– پێغەمبـەر (ﷺ) هەنـدێ زەکـاتی دابەش کـرد، وتم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەشـی فـلان بـدە، خـۆ بـڕوادارە...

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "یان موسڵمانە". من سێ جار ئەمەم وت، ئەویش سێ جار دوبارەی کردەوە، پاشان فەرموی: من جاری واهەیە بەشی کەسێك دەدەم، بەلأم کەسی تر هەیە لەو خۆشترم دەوێت کەچی بەشیشی نادەم، چونکە دەترسم خوای گەورە بەڕودا بیخاتە دۆزەخەوە.

## ( ٧ ) زەکاتدان بە نۆ موسڵمان

٢٤٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ أَقْبَلَتْ هَوَازِنُ وغَطَفَانُ وغَيْرُهُمْ بِذَرَارِيِّهِمْ ونَعَمِهِمْ، ومَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ عَشَرَةُ آلَافٍ ومَعَهُ الطُّلَقَا و، فَأَدْبَرُوا عَنْهُ حَتَّى بَقِيَ وحْدَهُ، قَالَ: فَنَادَى يَوْمَئِذٍ ندَا ويْن لَمْ يَخْلِطْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتَ عَنْ يَمِينِه فَقَالَ: "يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ". فَقَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّه أَبْشِرْ نَحْنُ مَعَكَ. قَالَ: ثُمَّ الْتَفَتَ عَنْ يَسَارِه فَقَالَ: "يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ". قَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّه أَبْشِرْ نَحْنُ مَعَكَ. قَالَ: وهُوَ عَلَى بَغْلَةٍ بَيْضَا و، فَنَزَلَ، فَقَالَ: "أَنَا عَبْدُ اللَّه ورَسُولُهُ". فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ، وأَصَابَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) غَنَائِمَ كَثِيرَةً، فَقَسَمَ فِي الْمُهَاجِرِينَ والطُّلَقَا و، ولَمْ يُعْطِ الْأَنْصَارَ شَيْئًا، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: إِذَا كَانَتِ الشِّدَّةُ فَنَحْنُ نُدْعَى، وتُعْطَى الْغَنَائِمُ غَيْرَنَا، فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ، فَقَالَ: "يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ، مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ". فَسَكَتُوا، فَقَالَ: "يَا مَعْشَرَ الْأَنْصَارِ أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالدُّنْيَا، وتَذْهَبُونَ بِمُحَمَّدٍ (ﷺ) تَحُوزُونَهُ إِلَى بُيُوتِكُمْ". قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّه رَضِينَا. قَالَ: فَقَالَ: "لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وادِيًا، وسَلَكَتِ الْأَنْصَارُ شِعْبًا، لَأَخَذْتُ شِعْبَ الْأَنْصَارِ". قَالَ هِشَامٌ –يعني ابن زيد بن أنس بن مالك– فَقُلْتُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ، أَنْتَ شَاهِدٌ ذَاكَ؟ قَالَ: وأَيْنَ أَغِيبُ عَنْهُ. **(بخاري/ الخمس/ ٢٩٧٨)**

(انس کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی غەزای (حنین) تیرەی (هوازن و غطفان) وئەوانی تر هاتن بە خۆیان و ماڵ و منداڵ و ماڵاتیانەوە، ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ) دەهەزار کەسی لە خزمەتدا بوو جگە لەوانەی کە لەڕزگارکردنی مەککەدا ئازادی کردن، کەچی هەموو پشتیان هەڵکردو هەلأتن تەنها خۆی مایەوە، بۆیە ئەو ڕۆژە دوو جار بانگی کرد نێوانیشیان ئەوەندە نەبوو... ڕوی کردە لای ڕاست و فەرمووی: "ئەی دەستەی پشتیوانان"... ئەوانیش خێرا وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) مژدەبێ ئێمە هەموو لە خزمەتداین، ئەوسا ڕوی کردە لای چەپ و هەر فەرمووی: "ئەی دەستەی پشتیوانان" ئەوانیش خێرا وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)

مژدەبێ ئێمە هەموو لە خزمەتدابن، جا پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر پشتی هێسترێکی سپییەوە بوو دابەزی و فەرمووی: "من بەندە و پێغەمبەری خوام". ئەوسا بێ باوەڕان تێك شکان، پێغەمبەر (ﷺ) دەستکەوتێکی زۆری بەدەست هێناو دابەشی کرد لەنێوان کۆچبەران و ئازادکراواندا، بەلاّم هیچی نەدا بە پشتیوانان، بۆیە پشتیوانان وتیان: لەکاتی تەنگانەدا ئێمە بانگ دەکرێین، کەچی دەستکە وتیش دەدرێ بەکەسانی تر، جا ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە هەموویانی لە ژێر دەوارێکی گومەزیدا کۆکردەوە، ئینجا فەرمووی: "ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئەو قسەو باسە چییە کەلای ئێوەوە پێم گەیشتووە؟". هەموو بێ دەنگ بوون، فەرمووی: "ئەی کۆڕی پشتیوانان، ئایا حەز دەکەن خەڵکی دنیا بەرێت، بەلاّم ئێوە موحەممەد (ﷺ) بەرنەوە بۆ ناو ماڵەکانتان؟". هەموو وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە بەوە ڕازین. ئینجا فەرمووی: "ئەگەر خەڵکی ڕێگەی دۆڵێك بگرنەبەر و پشتیوانان ڕێگەیەکی تر، من ڕێگەی پشتیوانان دەگرمە بەر". جا بە (هیشام ی کوڕی زەید)م وت: ئەی (ابو حمزە) تۆ شایەت و ئامادەی ئەو ڕوداوە بویت؟ لەوەلاّمدا وتی: بەڵێ، ئەی چۆن لەوێ نابم؟

٢٤٨ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قال: بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ الْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ، لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا، قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ: بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ وَالْأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ، وَالرَّابِعُ: إِمَّا عَلْقَمَةُ بْنُ عُلَاثَةَ، وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلَاءِ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَقَالَ: "أَلَا تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً". قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ، نَاشِزُ الْجَبْهَةِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، مُشَمَّرُ الْإِزَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ. فَقَالَ: "وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الْأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ". قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَا أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ: "لَا، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي". قَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ، وَلَا أَشُقَّ بُطُونَهُمْ". قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُقَفٍّ، فَقَالَ: "إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا، لَا يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ". قَالَ: أَظُنُّهُ قَالَ: "لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ". (بخاري/ المغازي/ ٤٠٩٤)

(ابـو سـعيد الخـدری) (ﷺ) دەڵـێ: (عـەلی کـوڕی ابـوطالـب) لەیەمەنـەوە پارچـە ئاڵتونێکی لە پارچە چەرمێکی خۆشـکراو بەجـەوت ڕەوانـە کـرد بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) کەهێشتا پاڵفتە نـەکرابوو لـە خۆڵەکـەی ئـەویش بەشـی کـرد لـەنێوان چـوار کەسـدا (عینـەی کـوڕی بـدر، اقـرع ی کـوڕی حـابس، زیـد الخیـل) چوارهەمەکەشـیان یـان (علقمەی کوڕی علانە، یان عامری کوڕی طفیل) بوو یەکێك لە هاوەڵان و وتـی: ئێمـە لە پێشتر بووین ئابەوە تا ئەوانە... ئەو قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبـەر (ﷺ) بۆیـە فەرمووی: "باشە، ئێوە متمانە بەمن ناکەن، لەکاتێکدا من متمانەپێکراوی ئەو زاتەم کە لەسەروو ئاسمانەکانەوەیە، بەیانیان و ئێواران هەواڵم لـە ئاسمانـەوە بـۆ دێـت". کەچـی پیـاوێکی چاوبەقولاَچـووی دەموچـاو قوپـاوی ناوچـاو قـۆقزی ڕیـش پـڕی سەرتاشـراوی چـاك هـەڵکراو وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە خـوا بترسـە ! ! فەرمووی: "واوەیلا بۆ تۆ، مەگەر من لە هەموو دانیشتوانی سەرزەوی لەپێشـتر نـیم بۆ ئەوەی لە خوابترسم؟". کابرا ڕوی وەرگێـڕاو ڕۆیشـت...(خالیـدی کـوڕی وەلیـد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ملی نەپەڕێنم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "نـەخێر، چونکە لەوانەیە نوێژ بکات". خالد وتی: چەندەها نوێژخوێن هەیـە کەبـەزمان شـتێك دەڵێن لە دڵیاندا نییە... پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "من فـەرمانم پـێ نـەدراوە دڵـی خەڵکی بکەمەوە و سکیان هەڵبدڕم"، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کابرای کـرد کـە ڕوی وەرچـەرخان و ڕۆی. فـەرموی: "لەنـەوەی ئەمـە کەسـانێك دەبـن کـە زمانیـان پاراوە بە دەورکردنەوەی قورئان، بەلاَم لە گەرویان ناترازێت، لەدین دەردەچـن وەك چۆن تیر لەلاشەی نێچیر دەردەچـێ". وابـزانم فەرمووشـی: "ئەگـەر پێیـان گەیشـتم وەکو قەومی (ثمود) هەمویان لەناو دەبەم".

## ( ٨ ) زەکات حەلاَڵ نییە بۆ پێغەمبەر و بنەماڵەکەی

**٢٤٩ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: أَخَذَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ (ﷺ) تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كِخْ كِخْ، ارْمِ بِهَا، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّا لَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٠)**

(ابـو هریـره) (ﷺ) دەڵـێ: (حسـن کـوڕی عـەلی) (ﷺ) دەنکـە خورمایـەکی لـە خورمای زەکات هەڵگرت و نایەدەمی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "کخە، کخە، فڕێـی بدە، ئەی نازانی زەکات بۆ ئێمە حەلاَڵ نییە؟".

### (٩) دیاریی بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) حەلاڵە

٢٥٠ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَهْدَتْ بَرِيرَةُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) لَحْمًا تُصُدِّقَ بِهِ عَلَيْهَا، فَقَال: "هُوَ لَهَا صَدَقَةٌ ولَنَا هَدِيَّةٌ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٤،١٤٢٣)

(أنس ی کوڕی مالك) دەڵێ: (بريره) ئەو گۆشتەی کەبەخێر بۆی هاتبوو بەدیاری بردی بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: "ئەو گۆشتە بۆ ئەو خێرە، بەڵام بۆ ئێمە دیارییە".

٢٥١ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: بَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِشَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَبَعَثْتُ إِلَى عَائِشَةَ (رضي الله عنها) مِنْهَا بِشيء، فَلَمَّا جاء رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى عَائِشَةَ قَالَ: "هَلْ عِنْدَكُمْ شَيء". قَالَتْ: لَا، إِلَّا أَنَّ نُسَيْبَةَ بَعَثَتْ إِلَيْنَا مِنَ الشَّاةِ الَّتِي بَعَثْتُمْ بِهَا إِلَيْهَا. قَالَ: "إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٤،١٤٢٣)

(أم عطية) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) مەڕێکی زەکاتی بۆ ناردم، منیش هەندێکیم لێنارد بۆ عائشە (رضي الله عنها). کە پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی عائشەی کرد فەرمووی: "ئەوە هیچتان لایە؟" وتی: نەخێر، ئەوە نەبێ کە (نسيبه) بۆی ناردووین لەو مەڕەی کەتۆ بۆت ناردبوو. فەرمووی: "ئەو مەڕە گەیشتۆتە شوێنی شیاوی خۆی". (واتە ئێمە وەکو دیاریەك وەرمان گرتووە)

### (١٠) پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی وەرنەگرتووە

٢٥٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ سَأَلَ عَنْهُ، فَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ، أَكَلَ مِنْهَا. وإِنْ قِيلَ: صَدَقَةٌ، لَمْ يَأْكُلْ مِنْهَا. (بخاري/ الهبة/ ٢٤٣٧)

(أبو هريره) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) خواردنێکی بۆ بهاتایە پرسیاری دەکرد، ئەگەر بوترایە دیارییە، ئەوە لێی دەخوارد، ئەگەر بوترایە: خێرو زەکاتە لێی نەدەخوارد.

### (١١) سەرفترە لەخورماو جۆ

٢٥٣ـ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ: صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ. (بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٧)

(عبدالله ی کوڕی عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) زەکاتی سەرفترەی فەرزکرد لەڕەمەزاندا لەسەر خەڵکی، مەنێك خورما، یان مەنێك جۆ، لەسەر هەموو کەسێکی ئازاد یان بەندە، نێر بێت یان مێ لەموسڵمانان.

## ( ١٢ ) سەرفترە لەخۆراك و كەشك و مێوژ

٢٥٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّي أَرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَا و الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ. فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ. **(بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٧)**

(أبو سعيد الخدرى) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەكاتێكدا پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەناوماندا بوو سەرفترەمان دەردەكرد بۆ هەموو كەسێكی بچوك و گەورە، ئازاد یان كۆیلە، مەنێك لەخۆراك، یان مەنێك لەكەشك، یان مەنێك لەجۆ، یان مەنێك لەخورما، یان مەنێك لەمێوژ. بەم شێوەیە دەرمان دەكرد هەتا (معاویەی كوڕی أبو سوفیان) هات بۆ ناومان بۆ حەج یان عەمرە، چووە سەر دوانگەو قسەی بۆ خەڵك كرد، یەكێك لەقسەكانی ئەوە بوو وتی: من پێم وایە دوو مشت گەنمی شام یەكسانە لەگەڵ مەنێك خورمادا، دوای ئەوە ئیتر خەڵك بەقسەی ئەویان كرد، (أبو سعید) دەڵێ: بەلام من هەمیشە سەرفترە دەردەكەم وەك ئەوسا هەتا لەژیاندام.

## ( ١٣ ) دەركردنی سەفیترە پێش نوێژی جەژن

٢٥٥ـ عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ. **(بخاري/ صدقة الفطر/ ١٤٣٨)**

(عبدالله كوڕی عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانیدا بەبەخشینی زەكاتی سەرفترە پێش ئەوەی خەڵك دەربچن بۆ نوێژی جەژن.

## ( ١٤ ) هاندان بۆ بەخشین

٢٥٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) –يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)– قَالَ: "قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وتَعَالَى: يَا ابْنَ آدَمَ أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ. وقَالَ: يَمِينُ اللَّهِ مَلْأَى –وَقَالَ ابْنُ نُمَيْرٍ: مَلْآنُ –سَحًّا و لَا يَغِيضُهَا شيء، اللَّيْلَ والنَّهَارَ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٤٠٧)**

(أبو هريرە) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم تۆ ببەخشە منیش پێت دەبەخشم" هەروەها فەرمویەتی: "دەستی ڕاستی (بەخشندەیی) خوای میهرەبان هەمیشە پڕە".

(إبن نمير) دەڵێ: پڕەو بەخوڕەمیش لەشەوو ڕۆژدا دەبارێت و هیچ شتێك كەمی ناكاتەوە.

**( ١٥ ) ڕۆژێك دێت كەس خێرو زەكات وەرناگرێت**

**٢٥٧ـ عن حَارِثَةَ بْنَ وهْبٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "تَصَدَّقُوا، فَيُوشِكُ الرَّجُلُ يَمْشِي بِصَدَقَتِه، فَيَقُولُ الَّذي أُعْطِيهَا: لَوْ جِئْتَنَا بِهَا بِالْأَمْسِ قَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الْآنَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا، فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٥)**

(حارثە ی كوڕی وهب) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: "خێر بكەن نزیكە كەسێك بگەڕێت تا خێرەكەی بدات بەكەسێك، كەچی ئەو كەسەی دەیەوێت پێی بدات دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بتهێنایە وەرم دەگرت، بەڵام ئێستا پێویستم پێی نییە. ئیتر كەسی دەست ناكەوێت لێی وەربگرێت"

**( ١٦ ) خێر بەخشین بەمێردو منداڵ**

**٢٥٨ـ عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَة عَبْد اللَّه (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "تَصَدَّقْنَ يَا مَعْشَرَ النساء ولَوْ منْ حُلِيِّكُنَّ". قَالَتْ: فَرَجَعْتُ إِلَى عَبْد اللَّه فَقُلْتُ: إِنَّكَ رَجُلٌ خَفيفُ ذَات الْيَد، وإِنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَدْ أَمَرَنَا بِالصَّدَقَة، فَأْته فَاسْأَلْهُ، فَإِنْ كَانَ ذَلكَ يَجْزِي عَنِّي، وإِلَّا صَرَفْتُهَا إِلَى غَيْرِكُمْ. قَالَتْ: فَقَالَ لِي عَبْدُ اللَّه: بَل ائْتيه أَنْت قَالَتْ: فَانْطَلَقْتُ فَإِذَا امْرَأَةٌ منَ الْأَنْصَار بِبَاب رَسُول اللَّه (؟)حَاجَتي حَاجَتُهَا، قَالَتْ: وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَدْ أُلْقيَتْ عَلَيْه الْمَهَابَةُ، قَالَتْ: فَخَرَجَ عَلَيْنَا بِلَالٌ، فَقُلْنَا لَهُ: ائْت رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَأَخْبِرْهُ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ بِالْبَاب تَسْأَلَانك: أَتُجْزِئُ الصَّدَقَةُ عَنْهُمَا عَلَى أَزْوَاجِهماءعَلَى أَيْتَامٍ في حُجُورِهمَا؟ ولَا تُخْبِرْهُ مَنْ نَحْنُ، قَالَتْ: فَدَخَلَ بِلَالٌ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَنْ هُمَا". فَقَالَ: امْرَأَةٌ منَ الْأَنْصَار وزَيْنَبُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَيُّ الزَّيَانب". قَالَ: امْرَأَةُ عَبْد اللَّه، فَقَالَ (لَهُ) رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَهُمَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الْقَرَابَة، وأَجْرُ الصَّدَقَة". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٩٧)**

(زینب) هاوسەری (عبدالله ی كوڕی مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئەی دەستەی ژنان خێر بكەن بالەخشڵی تایبەتی خۆشتان بێت". دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای (عبدالله) و پێم وت: تۆ پیاوێكی كەم دەستی پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی پێداوین كەخێر بكەین بچۆ لێی بپرسە: ئەگەر بەئێوەی بدەم دەبێت؟ ئەگەر نا بابیدەم بەكەسی تر، عبدالله پێی وتم خۆت بچۆ، منیش چووم، سەیرم كرد ئافرەتێكی (أنصاری) لەبەر قاپی ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ) وەستاوە بۆ

هەمان مەبەست، پێغەمبەریش (ﷺ) سام و هەیبەتێکی تایبەتی هەبوو، بیلال هاتە دەرەوە بۆلامان و پێمان وت: بچۆ بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ: دوو ئافرەت لەبەر دەرگان و هاتوون پرسیاریان هەیە: ئایا ئەو خێرەی دەیبەخشن بەمێردەکانیان و بەو هەتیوانەی کەلەژێر سایەی ئەواندان جێدەگرێت بۆیان؟ پێشی مەڵێ ئێمە کێین؟ بلال چوو بۆلای پێغەمبەر، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی کێن ئەو ئافرەتانە؟ بلال وتی: ئافرەتێکی (أنصاری) و زەینەبیشە، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی: "کام زەینەبە" بلال وتی: خێزانی (عبدالله ی کوڕی مسعود) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەو ئافرەتانە دوو جار پاداشتیان هەیە، پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی خێرەکەش".

## ( ١٧ ) خێر بۆ خوێش

٢٥٩ـ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قال: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالًا، وكَانَ أَحَبُّ أَمْوَالِه إِلَيْهِ بَيْرَحَى، وكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَدْخُلُهَا ويَشْرَبُ مِنْ ماء فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِه الْآيَةُ: (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) **(ال‌عمران: ٩٢)** قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ فِي كِتَابِه (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) وإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرَحَى ،وإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّه (ﷻ)، أَرْجُو بِرَّهَا وذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّه (ﷻ)، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّه حَيْثُ شِئْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "بَخْ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، قَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهَا، وإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الْأَقْرَبِينَ". فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِه وبَنِي عَمِّه. **(بخاري/ الزكاة/ ١٣٩٢)**

(أنس ی کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: (أبو طلحة) دەوڵەمەندترین (أنصاری) بوو لەمەدینەدا، خۆشەویستترین ماڵی بەلایەوە (بَیرحی) بوو (ناوی باخچەکەیەتی)، بەرامبەر مزگەوت، پێغەمبەر (ﷺ) دەچوو لەئاوە سازگارەکەی دەخواردەوە(أنس) دەڵێ: کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی (هەرگیز خێرو پاداشتان دەست ناکەوێت هەتا لەوە نەبەخشن کەخۆشتان دەوێت) آل عمران /٩٢.(أبو طلحة) چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی:خوای گەورە دەفەرمێت:(هەرگیز خێرو پاداشتان دەست ناکەوێت هەتا لەوە نەبەخشن کەخۆشتان دەوێت) منیش خۆشەویسترین سامانم (بَیرحی) یە، ئەوا ئەیبەخشم بەخوای گەورە بەئومێدی ئەوەی چاکەو پاداشتم لای خوای گەورە بۆ تۆمار بکرێت، جاتۆ ئەی پێغەمبەری خوا چی لێ دەکەیت سەربەستی. پێغەمبەر

(ﷺ) فەرمووی: "بەهـ، بەهـ، بەراستی سامانێکی بەقازانجـە، سـامانێکی بەسـوودە. گوێم لێ بوو دەربارەی باخەکە چیت وت: مـن پـێم باشـە، دابەشـی بکـەیت بەسـەر خزمەکانتا" ئەویش دابەشی کرد بەسەر خزم و ئامۆزاکانیدا.

## ( ١٨ ) خێر بۆ خاڵوان

**٢٦٠ـ عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ (رضي الله عنها): أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: "لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لِأَجْرِكِ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٥٢)**

(میمونـەی کچـی حـارث) (رضي الله عنها) دەڵـێ: کچـۆڵەیەکی ئـازاد کـردووە لەسـەردەمی پێغەمبــەر (ﷺ)، جائــەوەی بــۆ پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) باســکردووە، ئــەویش فەرموویەتی: "ئەگەر بتبەخشیایە بەخاڵوانت" ئەوە پاداشتەکەت زۆرتر دەبوو".

## ( ١٩ ) چاکە لەگەڵ دایکی موشریکدا

**٢٦١ـ عَنْ اسماء (رضي الله عنها) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ عَلَيَّ، وَهِيَ رَاغِبَةٌ -أَوْ: رَاهِبَةٌ- أَفَأَصِلُهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٧٧)**

(اسماء کچی أبوبکر) (رضي الله عنها) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دایکم هـاتووە بـۆ لام، حـەز لـە سـەردانم ئـەکات، یـان دەترسـێ پەیوەنـدی لەگـەڵ بپچـڕێنم، یـان پێشوازی نەکەم، ئایا سیلەی ڕەحمـی لەگـەڵ بکـەم و پێشـوازی بکـەم؟ فـەرموی: "بەڵێ".

## ( ٢٠ ) خێرکردن بۆ دایکی کۆچکردوو

**٢٦٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّيَ افْتُلِتَتْ نَفْسَهَا وَلَمْ تُوصِ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: "نَعَمْ". (بخاري/ الجنائز/ ١٣٢٢)**

(عائشـە) (رضي الله عنها) دەڵـێ: پیاوێـك هـات بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دایکم کتوپڕ مردوو وەسێتی نەکرد، وابزانم ئەگەر فریای قسە بکەوتایە وەسێتی بەخێر کردن دەکرد، ئایا ئەگـەر مـن خێـری بـۆ بکـەم پاداشـتی دەست ئەکەوێت؟ فەرموی: "بەڵێ".

## ( ٢١ ) خۆپاراستن لەئاگری دۆزەخ

**٢٦٣ـ عَنْ عَديٍّ بْنِ حَاتِمٍ (ﷺ) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللّٰه (ﷺ) النَّارَ، فَأَعْرَضَ وأَشَاحَ، ثُمَّ قَالَ: "اتَّقُوا النَّارَ". ثُمَّ أَعْرَضَ وأَشَاحَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا ثُمَّ قَالَ اتَّقُوا النَّارَ ولَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ. (بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٧)**

(عدی کوڕی حاتەم) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئاگری دۆزەخی دەکرد، لای دەکردەوەو ڕووی وەردەگێڕا، پاشان فەرمووی: خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن، دیسانەوە لای دەکردەوەو ڕووی وەردەگێڕا بەشێوەیەك وامان دەزانی کەلەبەرچاویەتی و تەماشای دەکات، پاشان فەرمووی: خۆتان لەئاگر بپارێزن ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بووە، ئەوەش کەنییەتی بەگوفتارێکی جوان.

## ( ٢٢ ) هاندان بۆ خێر لە شتی بەخشراودا

**٢٦٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) ـيَبْلُغُ بِهِ (إلى انبي (ﷺ)) ـ: "أَلَا رَجُلٌ يَمْنَحُ أَهْلَ بَيْتٍ نَاقَةً، تَغْدُو بِعُسٍّ وتَرُوحُ بِعُسٍّ، إِنَّ أَجْرَهَا لَعَظِيمٌ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٨٦)**

(أبو هريره) دەیگەیەنێتە پێغەمبەر (ﷺ) "ئای بۆ کەسێك وشترێك بەئەمانەت بدا بەماڵێك بەیانیان دۆلکەیەکی گەورە شیریان بداتێ و ئێوارانیش دۆلکەیەك بەڕاستی پاداشتی زۆر گەورەیە".

## ( ٢٣ ) شاردنەوەی خێر

**٢٦٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ: الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللَّهِ، ورَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، ورَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ، اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، ورَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، ورَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا، حَتَّى لَا تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، ورَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ". (بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٢٩٤)**

(أبوهريره) (ﷺ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "حەوت جۆر کەس هەن کەخوا دەیانخاتە ژێر سایەو سێبەری خۆیەوە لەو ڕۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێك نییە جگە لەسایەو سێبەری ئەو زاتە: پێشەوایەکی دادپەروەر، لاوێکە کەلەسەر خواپەرستی گەورە بوبێت، کەسێکە کەدڵی پەیوەستی مزگەوت بێت، دوو کەس

کەلەبەر خوا یەکتریان خۆش بوێت و لەسەر ئەو بنچینەیە بەیەك گەیشتبن، دوای دور کەوتنەوەو جیابونەوەشیان لەیەکتر خۆشەویستیان بەردەوام بێت، کەسێك کەئافرەتێکی جوان و ناودار بانگی بکات، ئەویش بڵێت : بەڕاستی من لەخوا دەترسم، کەسێکە کەخێر دەکات و دەیشارێتەوە، هەتا دەستی ڕاستی نازانێت دەستی چەپی چی بەخشیوە، کەسێکە بەتەنهایی یادی خوا بکات و چاوەکانی ئەسرینیان لێ ببارێت".

**( ٢٤ ) خێر لەماڵی حەلاڵ**

**٢٦٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَتَصَدَّقُ أَحَدٌ بِتَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ إِلَّا أَخَذَهَا اللَّهُ بِيَمِينِه، فَيُرَبِّيهَا كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ أَوْ قَلُوصَهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ أَوْ أَعْظَمَ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٤)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر کەسێك دەنکە خورمایەك کەبەحەلاڵی پەیدای کردووە بیکات بەخێر، خوا بەدەستی ڕاستی قودرەتی لێی وەردەگرێت و نەش و نمای پێدەکات، هەروەك چۆن کەسێك لەئێوە، جوانوەکەی یان بەچکە حوشترەکەی پەروەردە دەکات، هەتا وای لێ دێت وەکو کێوێکی لێ دەکات یان مەزنتریش".

**( ٢٥ ) بەکەم نەزانینی خێری کەم!**

**٢٦٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: "يَا نساء الْمُسْلِمَاتِ، لَا تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا، ولَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٢٧)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "ئەی ئافرەتە موسڵمانەکان، باهیچ دراوسێیەك خێری ئافرەتە دراوسێکەی بەکەم نەزانێت، با ئەو خێرە بە ئەندازەی ئێسقانی باڵە مەڕێکیش بێت".

**( ٢٦ ) ئەوانەی ڕەخنە لە بەخششی ئیمانداران دەگرن**

**٢٦٨ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: أُمِرْنَا بِالصَّدَقَة، قَالَ: كُنَّا نُحَامِلُ، قَالَ: فَتَصَدَّقَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ. قَالَ: وجاء إِنْسَانٌ بِشيء أَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، ومَا فَعَلَ هَذَا الْآخَرُ إِلَّا رِيَا و، فَنَزَلَتْ: (الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ والَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ) (التوبة: ٧٩). (بخاري/ الزكاة/ ١٣٤٩)**

(أبو مسعود) (ﷺ) دەڵێ: فەرمانمان پێدرا کەخێر بکەین، ئێمەش کۆڵبەریمان دەکرد (بۆ ئەوەی خێری لێ بکەین) (أبو عقيل) نیو مەن خۆراکی هێنا، کەسێکی تر نەختێك لەو زیاتری هێنا، دووڕووەکان وتیان: خوا پێویستی بەخێری ئەمە نەبوو، ئەوی تریش بۆ ڕیابازی هێنای!! ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: (ئەوانەی لۆمەی خێرخوازو خێر بەخشەکان دەکەن لەخێرو بەخشەکەیاندا، هەروەها لۆمەی ئەوانەش دەکەن کەتەنها دەتوانن بەخۆماندوکردن بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن، ئەوانە خوا سزایان دەدا...).

## ( ٢٧ ) خێرو کردەوەی چاك

٢٦٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ نُودِيَ فِي الْجَنَّةِ. يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ". قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ): مَا عَلَى أَحَدٍ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ، فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الْأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ". (بخاري/ الصوم/ ١٧٩٨)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "ئەوەی دوو جۆر چاکەی هەبێت لەپێناوی خوادا، لەبەهەشتەوە بانگی لێ دەکرێت: ئەی بەندەی خوا، وەرە لێرەوە بچۆ بەهەشتەوە چاکترە، جا ئەوەی نوێژ خوێنێکی چاك بوبێت لەدەروازەی نوێژەوە بانگی لێ دەکرێت، ئەوەی موجاهیدو تێکۆشەر بوبێت لەدەروازەی جیهادو تێکۆشانەوە بانگی لێ دەکرێت، ئەوەی خێرخوازو خێربەخش بوبێت، لەدەروازەی خێرو بەخشینەوە بانگی لێ دەکرێت، ئەوەی ڕۆژووی زۆر بوبێت لە دەروازەی (الريان)ەوە بانگی لێ دەکرێت". (أبوبكر الصديق) (ﷺ) وتی: بەڕاستی ئەوەی لەهەموو ئەو دەروازانەوە بانگی لێ بکرێت، ئەوە هیچ زیانێك رووی تێ ناکات و (بەختەوەرە)، ئاخۆ کەسێك هەبێت لەهەموو ئەو دەروازانەوە بانگی لێ بکرێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "بەڵێ، من ئومێدەوارم کەتۆ لەوانە بیت".

## ( ٢٨ ) خێرخوازو دەست نوقاو

٢٧٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَثَلُ الْبَخِيلِ والْمُتَصدِّقِ مَثَلُ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُنَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ: إِذَا هَمَّ الْمُتَصدِّقُ بِصَدَقَةٍ اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ حَتَّى تُعَفِّيَ أَثَرَهُ، وإِذَا هَمَّ الْبَخِيلُ بِصَدَقَةٍ تَقَلَّصَتْ عَلَيْهِ وانْضَمَّتْ يَدَاهُ إِلَى تَرَاقِيهِ، وانْقَبَضَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ إِلَى صَاحِبَتِهَا". قَالَ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "فَيَجْهَدُ أَنْ يُوَسِّعَهَا فَلَا يَسْتَطِيعُ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٧٥)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "نمونەی دەست نوقاوو خێرخواز وەك دووكەس وایە كەهەر یەكەیان ئەڵقەیەكی ئاسن دەورەی دابێت، كاتێ كەخێرخوازەكە دەیەوێت خێرێك بكات ئەڵقەكە بۆی فراوان دەبێت و شوێن پێكانی (گوناهەكانی) دەسڕێتەوە، كاتێكیش دەست نوقاوەكە دەیەوێت خێرێك بكات ئەڵقەكەی دێتەوەیەك و دەستەكانی بەرز دەكاتەوە تاگەردنی، ئەڵقەكانی هەموو دێنەوە یەك" جاگوێم لێ بوو پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "زۆر هەوڵ دەدات كەفراوانی بكات بەڵام ناتوانێت". مەبەست ئەوەیەكە ڕەزیل دەستی ناچێتە ماڵ و سامانی بۆ خێركردن.

## ( ٢٩ ) بەخشین و دەست گرتنەوە

٢٧١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلَّا مَلَكَانِ يَنْزِلَانِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا، ويَقُولُ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٧٤)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "هەر ڕۆژێك دادێت لەسەر بەندەكان دوو فریشتە دادەبەزن و یەكێكیان دەڵێت: خوایە ئەوەی خێر دەكات بۆی پڕبكەرەوە، ئەوی تریان دەڵێت: خوایە ئەوەی دەست دەگرێتەوە (سامانەكەی) لەناو ببە".

## ( ٣٠ ) خەزنەداری دەستپاك

٢٧٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (الأشعري (ﷺ)) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الْخَازِنَ الْمُسْلِمَ الْأَمِينَ، الَّذِي يُنْفِذُ –وَرُبَّمَا قَالَ: يُعْطِي– مَا أُمِرَ بِهِ، فَيُعْطِيهِ كَامِلًا مُوَفَّرًا طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ، فَيَدْفَعُهُ إِلَى الَّذِي أُمِرَ لَهُ بِهِ، أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٧١)

(أبو موسى الأشعري) (ﷺ) دەڵێ:پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "بەڕاستی خەزنەداری موسڵمانی دەستپاك كە (فەرمان) جێبەجێ دەكات و بەتەواوی پێی

خۆشنوودەو دەیدات بەو کەسەی کەفەرمانی پێدراوە، بەیەکێك لەخێرخوازان دەدرێتە قەڵەم".

### ( ٣١ ) ببەخشەو دەست مەگرەوە و کۆی مەکەرەوە

٢٧٣ـ عَنْ اسماء بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ الصديق (ﷺ) : أَنَّهَا جاءت النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، لَيْسَ (لِي) شيء إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَرْضَخَ مِمَّا يُدْخِلُ عَلَيَّ؟ فَقَالَ: "ارْضَخِي مَا اسْتَطَعْتِ، ولَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٥٠)

(اسماء کچی أبوبکر الصدیق) (ﷺ) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: من هیچم نییە جگە لەوەی کە (زبیر) پەیدای دەکات، ئایا گوناهم دەگات کەهەندێ لەوە ببەخشم کەدەهێنرێت بۆم؟ فەرمووی: چەندە دەتوانی ببەخشە، دەست مەگرەوە با خوا دەستت لێ نەگرێتەوە".

### ( ٣٢ ) ئەگەر ژن لەماڵی مێردی ببەخشێت

٢٧٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ، ولِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ، ولِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، لَا يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٥٩)

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر ژن لەخۆراکی ماڵەکەی ببەخشێت و زیادەڕەوی نەکات، ئەوە پاداشتی ئەو بەخشینەی دەست دەکەوێت، مێردەکەشی پاداشتی پەیداکردنەکەی، خەزنەداریش بەهەمان شێوە، کەسیان لەپاداشتی کەسیان کەم ناکەنەوە".

٢٧٥ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا تَصُمِ الْمَرْأَةُ وبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِه، ولَا تَأْذَنْ فِي بَيْتِهِ وهُوَ شَاهِدٌ إِلَّا بِإِذْنِه، ومَا أَنْفَقَتْ مِنْ كَسْبِهِ مِنْ غَيْرِ أَمْرِهِ فَإِنَّ نِصْفَ أَجْرِهِ لَهُ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٩٩)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ژن نابێت بەڕۆژوو بێت (مەبەست ڕۆژووی سوننەتە) لەکاتێکدا مێردەکەی لەماڵە مەگەر بەڕەزامەندی ئەو، مۆڵەتی کەسیش نابێ بدات (بێتەماڵەکەی) ئەگەر ڕەزامەندی ئەوی لەسەر نەبێت، هەرچییەکیش دەبەخشێت بەبێ فەرمان و ڕەزامەندی ئەو، ئەوە نیوەی پاداشتەکەی بۆ ئەوە" (واتە بۆ مێردەکەیەتی).

## ( ٣٣ ) پاكێتی و خۆگریی

٢٧٦ــ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ نَاسًا مِنَ الْأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا عِنْدَهُ قَالَ: "مَا يَكُنْ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَصْبِرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ مِنْ عطاء خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٠)

(أبـو سـعيد الخـدری) (ﷺ) دەگێڕێتـەوە: كەسـانێك لـە (أنصـار) داوای (پـارەو شتيان كرد) لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەويش (هەندێكی) دانـێ، پاشـان داوای تريـان كـرد، هەربەشيدان، هەتا هيچـی لا نـەما، ئەوسا فـەرمووی: "هەرچـی خێـرو بێـرێكم لابـێ لــەئێوەی ناگرمــەوە، هەركەســيش پــاك و (نــەفس بــەرز) بێــت، خــوای گــەورە دەوڵەمەندی دەكات، ئەوەی بێنيازی لە خەڵكی دەرخا، خوا دەوڵەمەنـدی دەكـات، ئەوەش خۆی بگرێت خوا ئـارامیی پـێ دەبەخشـێت، بـەهيچ كـەس هـيچ بەخششـێك نەدراوە كەلەخۆگری گەورەترو خێردارتر بێت".

## ( ٣٤ ) ناپەسەندی سواڵ

٢٧٧ــ عن عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "لَا تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ فِي وجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٥)

(عبداللەی كوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی: "كەسانی واتان هەيە ئەوەندە سواڵ دەكات و داوا دەكات، كاتێ بەخزمەت خوای گەورە دەگات دەم و چاوی تۆزقاڵێ گۆشتی پێوە نييە".

٢٧٨ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ:" "لَأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ فَيَحْطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ، فَيَتَصَدَّقَ بِهِ وَيَسْتَغْنِيَ بِهِ مِنَ النَّاسِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ رَجُلًا، أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْيَدَ الْعُلْيَا أَفْضَلُ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠١)

(أبـو هريـرە) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويـەتی: "ئەگـەر كەسـێكتان بەيانی زوو بچێت بـۆ دارهێنـان بـەكۆڵی خـۆی و بيكـات بـەخێر و خـۆی دور بگرێـت لەداواكردن لەخەڵكی چاكترە لەوەی داوا لەكەسێك بكات، يان دەيداتێ، يان نايداتێ، چونكە بەڕاستی دەستی سەرەوەی بەخشندە چاكترە لەدەستی خوارەوەی داواكار، بەوەش دەست پێبكە كەبەخێوكردنی لەسەرتە".

## ( ٣٥ ) دەستی سەرەوە چاکترە لەدەستی خوارەوە

٢٧٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، وهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ والتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: "الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، والْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ والسُّفْلَى السَّائِلَةُ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٦٢)

(عبداللەی کوڕی عمر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا لەسەر مینبەر بوو، باسی خێر و دووریگرتن لە سواڵکردنی دەکرد و هانی (خەڵکی) دەدابۆ دورە پەرێزی لەسواڵکردن دەیفەرموو: "دەستی سەرەوە چاکترە لەدەستی خوارەوە، دەستی سەرەوەی بەخشندە، دەستی خوارەوەی داواکار".

٢٨٠ـ عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِطِيبِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، ومَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ ولَا يَشْبَعُ، والْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٣)

(حكيم کوڕی حزام) (ﷺ) دەڵێ: داوای (هەندێ پارەو سامانم) لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، ئەویش بەشی دام، پاشان داوای هەندێکی ترم لێکرد، هەر بەشیدام، دواتر داوای هەندێکی ترم لێکرد هەر بەشی دام و فەرموی: "ئەم ماڵ و سامانە شیرین و ڕازاوەیە، ئەوەی بەڕەزامەندی و بێ داواکردن بیدرێتێ، بەرەکەتی بۆی تێدەکەوێت، ئەوەش هەر حەزی لێ بکات و چاوی تێر نەبێت، بەرەکەتی تێناکەوێت بۆی، وەکو ئەو کەسەی لێ دێت کەهەر دەخوات و تێریش نابێت.. دەستی سەرەوەش چاکترە لەدەستی خوارەوە".

## ( ٣٦ ) ئەو هەژارەی نیەتی و داواش ناکات

٢٨١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِي يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ واللُّقْمَتَانِ، والتَّمْرَةُ والتَّمْرَتَانِ". قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "الَّذِي لَا يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، ولَا يُفْطَنُ لَهُ فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ، ولَا يَسْأَلُ النَّاسَ شَيْئًا". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٠٩)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "هەژار ئەو کەسە نییە کەدەگەڕێت بەناو خەڵکداو بەپارویەك یان دوو پارو، یان خورمایەك و دوخورما ڕازییە" وتیان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەی هەژار کێیە؟ فەرموی: "ئەو کەسەیە

کەئەوەندەی دەست ناکەوێت بێنیاز بێت، خەڵکیش نایناسن تا خێری پێ بکەن، خۆیشی داوای هیچ لەخەڵکی ناکات".

## ( ٣٧ ) دەوڵەمەندیی بەشتی زۆر نییە

٢٨٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، ولَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦٠٨١)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "دەوڵەمەندی بە شتی زۆر نیە، بەڵکو دەوڵەمەندیی ئەوەیە کەدڵ و دەرون دەوڵەمەندبێت".

## ( ٣٨ ) ڕەوشی ئادەمیزاد

٢٨٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وتَشِبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ، الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ. والْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦٠٥٨)**

(أنس ی کوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "ئادەمیزاد پیر دەبێت، کەچی دوو شت تێیدا هەر گەنجە: پەرۆشی بۆ ماڵ و سامان، پەرۆشی تەمەن درێژی".

## ( ٣٩ ) گوڵزاری دنیا

٢٨٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (ﷺ) قالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: "لَا واللَّه مَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ إِلَّا مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا". فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَيَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: "كَيْفَ قُلْتَ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَيَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ الْخَيْرَ لَا يَأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ. **(ثم قال):** أَوَ خَيْرٌ هُوَ؟ إِنَّ كُلَّ مَا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ، إِلَّا آكِلَةَ الْخَضِرِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَلَأَتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ ثَلَطَتْ أَوْ بَالَتْ، ثُمَّ اجْتَرَّتْ فَعَادَتْ فَأَكَلَتْ، فَمَنْ يَأْخُذْ مَالًا بِحَقِّهِ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، ومَنْ يَأْخُذْ مَالًا بِغَيْرِ حَقِّهِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الَّذِي يَأْكُلُ ولَا يَشْبَعُ". **(بخاري/ الزكاة/ ١٣٩٦)**

(أبو سعید الخدری) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو وتاریداو فەرموی: "خەڵکینە من لەوە دەترسم (کەئالودەی هەر ئەوە ببن) کەخوا لەگوڵزارو ڕازاوەیی دنیا بۆتان فەراهەم دەهێنێ" پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا خێر شەڕ دەهێنێت؟! پێغەمبەر (ﷺ) تاوێك بێدەنگ بوو پاشان فەرموی: "ئەوە چیت وت؟" پیاوەکە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا خێر شەڕ دەهێنێت؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "لەڕاستیدا خێر هەر خێر دەهێنێت، پاشان فەرموی: بەڵام

ئایا ئەوە خێرە؟ (ئایا نابینن)، هەرچیش لەبەهاردا بەرهەم دێت یاخود چەم و چۆلّ دەیهێنێت یان سك دەئاوسێنێت یان خەریکە (بخۆرەکەی) تیا بەرێت، مەگەر گژوگیای هاوین، کەئاژەلّ دەیخوات سکی خۆی لێ پڕ دەکات، پاشان خۆی دەداتە بەرخۆرو سەنێر دەکات و میز دەکات، ئینجا کاوێژ دەکات و دەیخوات.. جا ئەوەی سامانی ڕەوای دەست بکەوێت بەرەکەتی بۆ تێدەکەوێت، ئەوەش بەناحەق و ناڕەوا سامان بەدەست بهێنێ، وەکو ئەو کەسە وایە کەهەر دەخوات و تێر نابێت".

## ( ٤٠ ) وەرگرتن دروستە بێ داوا

٢٨٥ـ عن ابن عمر (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ يُعْطِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّاب (رضي الله عنه) الْعطاء، فَيَقُولُ لَهُ عُمَرُ (رضي الله عنه): أَعْطه يَا رَسُولَ اللَّه أَفْقَرَ إِلَيْه منِّي، فَقَالَ (لَهُ) رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ أَوْ تَصَدَّقْ به، ومَا جاءكَ منْ هَذَا الْمَال وأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ ولَا سَائِلٍ فَخُذْهُ، ومَا لَا فَلَا تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ". قَالَ سَالمٌ: فَمنْ أَجْل ذَلكَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ لَا يَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا، ولَا يَرُدُّ شَيْئًا أُعْطيَهُ. (بخاري/ الأحكام/ ٦٧٤٤)

(إبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) شتی دەبەخشی بە (عمری کوڕی خطاب) عمریش دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیبەخشە بەوکەسەی لەمن هەژارترە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو: "وەری بگرە بۆ خۆت یان بیکە بەخێر، هەرچیت دەست دەکەوێت لەماڵ و سامان بەمەرجێ خۆت چاوت تێنەبڕیبێ و داوات نەکردبێ وەری بگرە، ئەگەر نا خۆتی بۆ ماندوو مەکە و بەدوایدا مەچۆ". (سالم)ی کوڕی دەڵێ: لەبەر ئەوە (عمر) داوای شتی لەکەس نەکردووەهەرچیشی پێبدرایە دەستی پێوە نەدەنا..

## ( ٤١ ) بەشی ئەوەش بدرێت کەبەرەقی داوا دەکات

٢٨٦ـ عَنْ أَنَس بْنِ مَالكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُول اللَّه (ﷺ) وعَلَيْه ردَا و نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَة، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَهُ بِردَائه جَبْذَةً شَديدَةً، نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَة عُنُق رَسُول اللَّه (ﷺ) وقَدْ أَثَّرَتْ بهَا حَاشِيَةُ الرِّدَا و منْ شدَّة جَبْذَته، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ، مُرْ لِي منْ مَالِ اللَّه الَّذي عنْدَكَ. فَالْتَفَتَ إِلَيْه رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَضَحكَ ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعطاء. (بخاري/ الخمس/ ٢٩٨٠)

(أنس ی کوڕی مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڕۆیشتم عەبایەکی نەجرانی بەسەر شانەوە بوو قەراغەکەی زۆر زبر بوو، عەرەبێکی

دەشتەکی خۆی گەیاندێ و عەباکەی بەتوندی ڕاکێشا، کەسەیرم کرد قەراغی عەباکە کاری کردبووە سەر لاملی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە بەتوندی ڕایکێشا بوو، ئینجاوتیشی: ئەی موحەممەد فەرمانبدە بالەو مالّی خوایەی کەلای تۆیە بەشم بدەن، پێغەمبەر (ﷺ) ئاوڕی لێ دایەوەو پێکەنی، پاشان فەرمانیدا کەبەشی بدەن.

**٢٨٧ـ عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَقْبِيَةً ولَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ، انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي، قَالَ: فَدَعَوْتُهُ لَهُ فَخَرَجَ إِلَيْهِ وعَلَيْهِ قباء مِنْهَا، فَقَالَ: "خَبَأْتُ هَذَا لَكَ". قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: "رَضِيَ مَخْرَمَةُ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٥٩)**

(میسوری کوڕی مخرمە) (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر (ﷺ) چەند پالّتۆیەکی بەش کردوو بەشی مخرمەی نەدا، ئینجا مخرمە بەکوڕەکەی وت: کوڕم بابچین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، میسور دەلّێ: منیش لەگەلّیدا چووم، پێی وتم: بچۆ ژوورەوە بۆ خزمەتی و بۆم بانگ بکە، منیش چووم و بۆم بانگ کرد، ئەویش تەشریفی هێنایە دەرەوەو یەکێك لەو پالّتۆیانەی لەبەردا بوو، فەرمووی: "ئەمەم شاردۆتەوە بۆ تۆ" ئینجا مخرمە سەیری کردوو وتی: ئیتر مخرمە ڕازییە..

# بەشی یانزەیەم: ڕۆژوو

## ( ١ ) گرنگیی ڕۆژوو

**٢٨٨ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ، إِلَّا الصِّيَامَ فَإِنَّهُ لِي وأَنَا أَجْزِي بِهِ، والصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلَا يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ ولَا يَسْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ، والَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، ولِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٠٥)**

(أبـو هريـره) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: "خـوای گـەورە دەفـەرموێت: هـەموو کردەوەکـانی ئـادەمیزاد بـۆ خۆیـەتی جگـە لـەڕۆژوو، ئـەوە بەڕاستی بۆ منەو هەر خۆشم پاداشـتی دەدەمـەوە، هـەروەها ڕۆژو قەڵغانـە، ئەگـەر ڕۆژێك کەسێکتان بەڕۆژو بوو با ئەو ڕۆژە قسەی ناشیرین و هات و هاوار نەکات، خـۆ ئەگەر کەسێك جنێـوی پێـداو شـەڕی پـێ فرۆشـت بابڵێـت: مـن کەسـێکی بـەڕۆژوم، سوێند بەوکەسەی گیانی محمدی بەدەستە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لەڕۆژی قیامەتـدا لای خوا لەبۆنی میسك خۆشترە، هەروەها دوو خۆشـی هەیـە بـۆ ڕۆژووەوان، کاتێـك بەربانگ دەکاتەوە دڵخۆشە بەڕۆژو شکاندنەکەی، کاتێکیش بەدیداری پـەروەردگاری شاد دەبێت دڵخۆشە بەڕۆژووەکەی".

## ( ٢ ) ڕێزی مانگی ڕەمەزان

**٢٨٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "إِذَا جاء رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٠٠)**

(أبو هريره) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "کـاتێ کەڕەمـەزان دێـت دەروازەکانی بەهەشت دەکرێنەوەو قاپیەکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت دەکرێن".

## ( ٣ ) یەك دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان ڕۆژوو دروست نییە

**٢٩٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "لَا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ ولَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا فَلْيَصُمْهُ". (بخاري/ الصوم/ ١٨١٥)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پێش ڕەمەزان بـەڕۆژێك یان دوو ڕۆژ بەڕۆژومەبن، مەگەر کەسێك وەکو عادەت ئەو ڕۆژەی گرتبێ با بـەڕۆژوو بێت".

## (٤) ڕۆژوگرتن بە بینینی مانگ

**٢٩١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الْهِلَالَ فَقَالَ: "إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ أُغْمِيَ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ". (بخاري/ الصوم/ ١٨١٠)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی مانگی یەك شەوەی کرد و فەرمووی:"ئەگەر بینیتان ئەوە بەڕۆژو بن، ئەگەر بینیشتانەوە بیشکێنن و (بیکەن بە جەژن) ئەگەر هەور بەرچاوی گرتن ئەوە سی ڕۆژی شەعبان تەواو بکەن".

## (٥) مانگ (جاری واهەیە) ٢٩ ڕۆژە

**٢٩٢ـ عن أُمَّ سَلَمَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) حَلَفَ أَنْ لَا يَدْخُلَ عَلَى بَعْضِ أَهْلِه شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا عَلَيْهِمْ أَوْ رَاحَ، فَقِيلَ لَهُ: حَلَفْتَ يَا نَبِيَّ اللَّه أَنْ لَا تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا؟ قَالَ: "إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وعِشْرِينَ (يَوْمًا)". (بخاري/ الصوم/ ١٨١١)**

(ام سلمه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سوێندی خوارد یەك مـانگ نەچـێتە مـاڵی هەندێ لە هاوسـەرانی کەچـی دوای ٢٩ ڕۆژ بەیانیـەك یـان ئێوارەیـەك چـووە ماڵیـان ...پێی وتـرا: ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) تـۆ سـوێندت خـوارد کـە تایـەك مـانگ نەیەیتـە ماڵمان. ئەویش فەرمووی: "مانگ جاری واهەیە ٢٩ ڕۆژە".

**٢٩٣ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لَا نَكْتُبُ ولَا نَحْسُبُ، الشَّهْرُ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا -وَعَقَدَ الْإِبْهَامَ فِي الثَّالِثَةِ- والشَّهْرُ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا" يَعْنِي تَمَامَ ثَلَاثِينَ. (بخاري/ الصوم/ ١٨١٤)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئێمە گەلێکی نەخوێندەوارین نانوسین، حساب ناکـەین، مـانگ ئەوەنـدە و ئەوەنـدە و ئەوەندەیـە لـە سـێهەمیاندا پەنجە گەورەی نوشـتانەوە... مـانگیش هەیـە ئەوەنـدە و ئەوەنـدە و ئەوەندەیـە ، واتە سی ڕۆژی تەواوە".

### ( ٦ ) دوو مانگەکەی جەژن

٢٩٤ـ عن أبِي بَكْرَةَ (ﷺ) عَنْ أبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ، رَمَضَانُ وذُو الْحِجَّةِ". (بخاري/ الصوم/ ١٨١٣)

(ابوبكرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ڕەمەزان و ذوالحجة دوو مانگن کەم ناکەن" (لەپاداشتدا ئەگەر ٢٩ڕۆژیش بن).

### ( ٧ ) پارشێوکردن

٢٩٥ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً". (بخاري/ الصوم/ ١٨٢٣)

(انس) (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پارشێو بکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە".

### ( ٨ ) دواختسنی پارشێو

٢٩٦ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (ﷺ) قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: خَمْسِينَ آيَةً. (بخاري/ الصوم/ ١٨٢١)

(زیدی کوڕی ثابت) (ﷺ) دەڵێ: پارشێومان کرد لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)، پاشان هەستاین بۆ نوێژ، منیش وتم: چەند نێوانیان بوو؟ وتی: پەنجا ئایەت. (واتە خوێندنەوەی ٥٠ ئایەتی مامناوەندی بەلەسەر خۆیی)

### ( ٩ ) فەرمایشتی پەروردگار ( حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ )

٢٩٧ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَالَ: (لَمَّا) نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَكُلُوا واشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ) (البقرة: ١٨٧) قَالَ: فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَرَادَ الصَّوْمَ رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِي رِجْلَيْهِ الْخَيْطَ الْأَسْوَدَ والْخَيْطَ الْأَبْيَضَ، فَلَا يَزَالُ يَأْكُلُ وِيَشْرَبُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رِئْيُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدَ ذَلِكَ: (مِنَ الْفَجْرِ) فَعَلِمُوا أَنَّمَا يَعْنِي بِذَلِكَ اللَّيْلَ والنَّهَارَ. (بخاري/ الصوم/ ١٨١٨)

(سهلی کوڕی سعد) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی کە ئەمە واتاکەیەتی: (بخۆن و بخۆنەوە هەتا تاڵی سپی لەتاڵی ڕەش جیادەکەنەوە) البقرە/١٨٧ پیاوی واهەبوو کە ئەیوسیت بەڕۆژو بێ پەتێکی ڕەش و پەتێکی سپی دەبەست بە قاچیەوە، خواردن و خواردنەوەی دەخوارد هەتا بۆی دەردەکەوت (کامیان ڕەشە و

کامیان سپییه)، پاشان خوای گەورە (لەبەرەبەیان)ی دابەزان، ئەو کاتە زانیان مەبەست شەو و ڕۆژە.

## ( ١٠ ) بانگی بیلال

٢٩٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مُؤَذِّنَانِ: بِلَالٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ". قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ هَذَا وَيَرْقَى هَذَا. **(بخاري/ الأذان/ ٥٩٢)**

(عبدالله ی کوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دوو بانگبێژی هەبوو...(بلال و ابن ام مکتوم)ی نابینا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بلال لەشەودا بانگ دەدا، بخۆن و بخۆنەوە هەتا ابن ام مکتوم بانگ دەدات". عبدالله دەڵێ: نێوانیان هەر ئەوەندە بوو کە ئەمیان دابەزێ و ئەویان سەرکەوێت.

## ( ١١ ) ڕۆژوی ئەو کەسەی لەشی گرانە

٢٩٩ـ عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) زَوْجَيِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُمَا قَالَتَا: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيُصْبِحُ جُنُبًا -مِنْ جِمَاعٍ غَيْرِ احْتِلَامٍ- فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ. **(بخاري/ الصوم/ ١٨٣٠)**

(عائشە و ام سلمە) (ﷺ) دوهاوسەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وتویانە: (جاری واهەبوو) پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی لێ دەبوەوە لەشی گران بوو-بەهۆی چونە لای هاوسەرەوە- لە ڕەمەزاندا، کەچی بەردەوامیش دەبوو لەسەر ڕۆژوەکەی.

## ( ١٢ ) ڕۆژوەوان و لە بیرچوون

٣٠٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ". **(بخاري/ الصوم/ ١٨٣١)**

(ابو هریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەوەی لەبیری نەبوو کە بەڕۆژوە و خواردن یان خواردنەوەی خوارد باڕۆژوەکەی تەواوبکات، چونکە ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی داوەتێ".

## ( ١٣ ) کەفارەتی سەرجێیی لەڕەمەزاندا

٣٠١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "وَمَا أَهْلَكَكَ". قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، قَالَ: "هَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً". قَالَ: لَا، قَالَ: "فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ". قَالَ: لَا،

قَالَ: "فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا". قَالَ: لَا، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: "تَصَدَّقْ بِهَذَا". قَالَ: أَفْقَرَ مِنَّا؟ فَمَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (ﷺ) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: "اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ". **(بخاري/ الصوم/ ١٨٣٤)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵـێ: پیاوێك هـات بۆلای پێغەمبـەر وتـی: تیاچـووم ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئـەویش فـەرمووی: "چـی تـۆی تیـا بـردووە؟!". کـابرا وتـی: لەڕەمەزانـدا سـەرجێیم لەگـەڵ هاوسـەرەکەمدا کـردوە... ئـەویش فـەرمووی: "ئایـا دەتوانیت بەندەیەك ئازاد بکەیت؟" کابرا وتی: نـەخێر، فـەرمووی: "ئایـا دەتوانیـت دومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوبیت؟" کابرا وتی: نەخێر، فەرموی: "ئەی دەتوانیت نانی شەست هەژار بدەیت؟". کابرا وتی: نەخێر، ئینجا کـابرا دانیشـت، پێغەمبـەر (ﷺ) زەمبیلەیەك خورمای بۆهات و فەرمووی: "ئائەمـە بکـە بـەخێر"، کـابراوتی: جـا بـۆ لەخۆمان هەژارتر هەیە؟ ئەم پەڕ و ئەوپەڕی شـار لـە ئێمـە هـەژارتری تیـا نییـە کـە پێویسـتی بـەوە بێـت!! ئەوسـا پێغەمبـەر (ﷺ) پێکـەنی تـا دانـە پیرۆزەکـانی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: "دەی بچۆ خێزانەکەتی پێ تێربکە".

**٣٠٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: احْتَرَقْتُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لِمَ". قَالَ: وطِئْتُ امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ نَهَارًا، قَالَ: "تَصَدَّقْ تَصَدَّقْ". قَالَ: مَا عِنْدِي شيء، فَأَمَرَهُ أَنْ يَجْلِسَ، فَجَاءَهُ عَرَقَانِ فِيهِمَا طَعَامٌ، فَأَمَرَهُ (رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)) أَنْ يَتَصَدَّقَ بِهِ. (بخاري/ المحاربين/ ٦٤٣٦)**

(دایکـە عائشـە) (ﷺ) دەڵـێ: پیاوێـك هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی: سـوتام!! پێغەمبـەری خـوایش (ﷺ) فـەرمووی: "بۆچـی؟!" کـابراوتی: لـە ڕۆژی ڕەمەزانـدا لەگـەڵ هاوسـەرەکەمدا تێکـەڵ بـووم.. ئـەویش فـەرمووی: "خێربکـە، خێربکـە".. کـابراوتی: جانیمـە.. ئینجـا فـەرمانی پێـدا کـە دابنیشـێت، دوزەمبیلـە خۆراکی بۆهات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەخشی و فەرمووی: "بڕۆ بیکە بەخێر".

## ( ١٤ ) ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان

**٣٠٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُقَبِّلُ وهُوَ صَائِمٌ، ويُبَاشِرُ وهُوَ صَائِمٌ، ولَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لِإِرْبِهِ. (بخاري/ الصوم/ ١٨٢٦)**

(دایکە عائشـە) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ماچـی دەکـرد، لەکاتێکدا بـەڕۆژو بوو... پێسـتی بـە پێسـتیان دەکـەوت وبـەڕۆژوو بـوو بـەڵام لەهـەمووتان ئـیرادەی بەهێزتر و خۆگرتر بوو.

## ( ١٥ ) كەخۆرئاوا بوو ڕۆژو دەشكێنرێت

٣٠٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، فَلَمَّا غَابَتِ الشَّمْسُ قَالَ: "يَا فُلَانُ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. قَالَ: "انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا". قَالَ: فَنَزَلَ فَجَدَحَ، فَأَتَاهُ بِهِ فَشَرِبَ النَّبِيُّ (ﷺ) ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ: "إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَا هُنَا، وجاء اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٣٩)

(عبدالله ی كوڕی ابو اوفی) دەڵێ: لەسەفەرێكدا لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوین لە مانگی ڕەمەزاندا كاتی خۆرئاوابوون فەرمووی: "فلاَن كەس دابەزە و خۆراكمان بۆ ئامادەبكە" كابراوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێشتا ڕۆژی ماوە، فەرمووی: "دابەزە و خۆراكمان بۆ دروست بكە" ئەویش هێنای و پێغەمبەر (ﷺ) لێی خواردەوە، پاشان بەدەست ئاماژەی كردو فەرمووی: "ئەگەر خۆر لەوێوە ئاوابوو، شەو ئالەوێوە داهات ئەوە ئیتر ڕۆژوەوان ڕۆژو دەشكێنێ".

## ( ١٦ ) ڕۆژو شكاندن

٣٠٥ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٥٦)

(سهل ی كوڕی سعد) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خەڵكی لە خێری بەردەوامدان هەتا پەلە بكەن لەڕۆژوو شكاندا" (واتە: دوای نەخەن لەكاتی خۆی).

## ( ١٧ ) قەدەغەی دانەدەمی شەو ڕۆژ بۆ ڕۆژوگرتن

٣٠٦ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوَاصِلُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "وَأَيُّكُمْ مِثْلِي؟ إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِي". فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلَالَ، فَقَالَ: "لَوْ تَأَخَّرَ الْهِلَالُ لَزِدْتُكُمْ" كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. (بخاري/ الصوم/ ١٨٦٤)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی كردووە لە ڕۆژوگرتندا شەوو ڕۆژ بدرێتە دەم یەك ، پیاوێك لە موسڵمانان وتی: خۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شەوو ڕۆژ دەدەیتە دەم یەك.. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "جاكێتان وەكو منە؟ من

شەوگار دەبەمە سەر و پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێ دەبەخشێ". بەلاَم کاتێ کە کۆڵیان نەدا مۆڵەتی دان کە ڕۆژ و شەوێك نەیشکێنن، ئینجا کە مانگی یەکشەوەیان بینی فەرمووی: "ئەگەر دوا بکەوتایە بۆ ئەو ئەندازەیەش بۆم زیاد دەکردن" وەکو سزایەك بۆیان کاتێ کە کۆڵیان نەدەدا لە ڕۆژو شکاندن.

## ( ١٨ ) ڕۆژوگرتن یان شکاندن لەسەفەردا

**٣٠٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإنَاء فِيهِ شَرَابٌ فَشَرِبَهُ نَهَارًا لِيَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ أفْطَرَ حَتَّى دَخَلَ مَكَّةَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): فَصَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وأفْطَرَ، فَمَنْ شَا و صَامَ، ومَنْ شَا و أفْطَرَ. (بخاري/ الصوم/ ١٨٤٦)**

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەڕەمەزاندا سەفەری کرد و بەڕۆژووش بوو هەتا گەیشتە (عەسفان) ئەوسا داوای جامۆڵەکەیەکی کرد کە خواردنەوەیەکی تێدا بوو، بە ئاشکرا و لە ڕۆژدا خواردیەوە تا خەڵکی بیبینێت، پاشان هەر ڕۆژوی نەگرت هەتا گەیشتە مەککە ئەوسا پێغەمبەر بەڕۆژو دەبوو (یان) دەیشکاند، (خەڵکیش) ئەوەی بیویستایە بەڕۆژو دەبوو، ئەوەی بیوسیتایە دەیشکاند...

## ( ١٩ ) ڕۆژوگرتن لە سەفەردا باش نییە

**٣٠٨ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَرَأى رَجُلًا قَد اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وقَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: "مَا لَهُ"؟ قَالُوا: رَجُلٌ صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَيْسَ الْبِرِّ أنْ تَصُومُوا فِي السَّفَرِ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٤٤)**

(جابری کوڕی عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێکدا بوو، پیاوێکی بینی خەڵك لێی کۆبونەتەوە و سێبەریان لەسەر کردوە، پێغەمبەر (ﷺ) پرسی: "ئەوە چیەتی؟" وتیان: پیاوێکە بەڕۆژوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ڕۆژو گرتن لە سەفەردا کارێکی چاك نییە".

## ( ٢٠ ) پاداشتی ڕۆژونەگر زیاترە لە سەفەردا ئەگەر بە ئەرکی سەرشانی هەستێ

**٣٠٩ـ عَنْ أنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي السَّفَرِ، فَمِنَّا الصَّائِمُ ومِنَّا الْمُفْطِرُ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا فِي يَوْمٍ حَارّ، أكْثَرُنَا ظِلًّا صَاحِبُ الْكِسَا و، ومِنَّا مَنْ يَتَّقِي**

الشَّمْسَ بِيَدِه، قَالَ: فَسَقَطَ الصُّوَّامُ وقَامَ الْمُفْطِرُونَ، فَضَرَبُوا الْأَبْنِيَةَ وسَقَوُا الرِّكَابَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ". (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٣٣)

(انس) (ﷺ) دەڵێت: له خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)دا بووین لەسەفەرێکدا، هەمان بوو، بەڕۆژوو بوو، هەشمان بوو شکاندبووی، لەڕۆژێکی گەرمادا بارمان خست ئەوەمان کە زۆر سێبەری هەبوو ئەوەمان بوو کە جلەکانی کردبوو بە سێبەر، هەمان بوو بەدەستی بەری خۆری دەگرت، ئیتر ئەوانەی بەڕۆژو بون بۆی دانیشتن، (هیچ کارێکیان پێ نەدەکرا) ئەوانەی بەڕۆژو نەبوون دەستیان کرد بە دەوار هەڵدان و ئاودانی وشترەکان، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئەمڕۆ ئەوانەی بەڕۆژو نەبوون پاداشتەکەیان بۆ خۆیان دەستەبەرکرد".

**٣١٠ـ عَنْ أَبِي الدرداء (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَحَدُنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، ومَا فِينَا صَائِمٌ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وعَبْدُ اللَّهِ ابْنُ رَوَاحَةَ. (بخاري/ الصوم/ ١٨٤٣)**

(ابو درداء) (ﷺ) دەڵێ: له خزمەت پێغەمبەری خوا لەمانگی ڕەمەزاندا کە زۆر گەرما بوو دەرچوین هەتا کەسانی وامان هەبوو کە دەستی دەنایە سەرسەری لەبەر تینی گەرما کەسمان بەڕۆژو نەبوین جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و (عبدالله ی کوڕی ڕەواحە).

## ( ٢١ ) گێڕانەوەی ڕەمەزان لە شەعباندا

**٣١١ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلَّا فِي شَعْبَانَ، الشُّغْلُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، أَوْ: بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). (بخاري/ الصوم/ ١٨٤٩)**

(ابو سلمه) بیستویەتی له عائشه (ﷺ) دەیوت: جاری واهەبوو کەمن قەرزاری ڕۆژوی ڕەمەزان دەبووم نەم دەتوانی بیگێڕمەوە لە مانگی شەعباندا نەبێت، چونکە سەرگەرم دەبوم بۆ ئەوەی (دڵی) پێغەمبەری خوا (ﷺ) (لەخۆم ڕازی بکەم).

## ( ٢٢ ) ڕۆژوگرتنەوە لەبری مردو

**٣١٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ مَاتَ وعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٥١)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: که پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "هەر کەس مردو قەرزاری ڕۆژو بوو با خزمە نزیکەکەی بۆی بگرێتەوە".

## ( ٢٣ ) ئەوانەی ڕۆژوناگرن دەبێ فیدیە بدەن

٣١٣ـ عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) **(البقرة: ١٨٤)** كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا. **(بخاري/ التفسير/ ٤٢٣٧٤)**

(سلمەی کوڕی الاکوع) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ کەئەم ئایەتە دابەزی (ئەوانەی کەناتوانن بەڕۆژو بن باخۆراکی هەژارێك بدەن) البقرة/١٨٤ ئەوسا هەرکەس بیویستایە دەیشکاندو فیدیەی دەدا، هەتا ئایەتی دواتر دابەزی کە حوکمی ئەوی سڕیەوە.

## ( ٢٤ ) ڕۆژوگرتن و نەگرتن لە مانگەکاندا

٣١٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (ﷺ) قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصُومُ شَهْرًا كُلَّهُ؟ قَالَتْ: مَا عَلِمْتُهُ صَامَ شَهْرًا كُلَّهُ إِلَّا رَمَضَانَ، وَلَا أَفْطَرَهُ كُلَّهُ حَتَّى يَصُومَ مِنْهُ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ (ﷺ). **(بخاري/ الصوم/ ١٨٦٨)**

(عبدالله ی کوڕی شقیق) لە (عائشە)ی (ﷺ) پرسیوە: ئایا پێغەمبەر لە هیچ مانگێکدا بەتەواوەتی بەڕۆژو بووە؟ وتی: ئاگادار نیم هیچ مانگێك بەتەواوی بەڕۆژو بوبێت جگە لە ڕەمەزان، هەروەها هیچ مانگێکیش نەبووەکە تیایدا بەڕۆژوو نەبووبێت، هەندێکی هەر لێ گرتووە، هەتا کۆچی دوایی کرد.

## ( ٢٥ ) ڕۆژو لەڕێی خوادا

٣١٥ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا". **(بخاري/ الجهاد/ ٢٦٨٥)**

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر بەندەیەك ڕۆژێك لەڕێی خوادا بەڕۆژو بێت خوای گەورە بەوهۆیە حەفتا پایز ڕوخساری لە ئاگری دۆزەخ بەدوور دەگرێت".

## ( ٢٦ ) ڕۆژوی عاشورا

٣١٦ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ قُرَيْشًا كَانَتْ تَصُومُ عَاشُوراء فِي الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِصِيَامِهِ حَتَّى فُرِضَ رَمَضَانُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيُفْطِرْهُ". **(بخاري/ الصوم/ ١٧٩٤)**

(دایکە عائیشە) (ﷺ) دەڵێ: قورەیش لەسەردەمی نەفامیدا لەعاشورا بەڕۆژوو دەبوون، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا (کەئیمانداران) تێیدا بەڕۆژوبن تارەمەزان تێیدا فەرز کرا، ئەوسا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەوەی دەیەوێت باعاشورا بگرێت ئەوەش دەیەوێت با نەیگرێت".

## ( ٢٧ ) گەورەیی ڕۆژوی عاشورا

**٣١٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهُودَ صِيَامًا يَوْمَ عَاشُوراء، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي تَصُومُونَهُ". فَقَالُوا: هَذَا يَوْمٌ عَظِيمٌ أَنْجَى اللَّهُ فِيهِ مُوسَى وقَوْمَهُ، وغَرَّقَ فِرْعَوْنَ وقَوْمَهُ، فَصَامَهُ مُوسَى شُكْرًا، فَنَحْنُ نَصُومُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَنَحْنُ أَحَقُّ وأَوْلَى بِمُوسَى". مِنْكُمْ فَصَامَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وأَمَرَ بِصِيَامِهِ. (بخاري/ الصوم/ ١٩٠٢،١٩٠٠)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە مەدینە بینی جولەکە بەڕۆژوون لەڕۆژی عاشورادا، پێی فەرموون : "ئەم ڕۆژەچییە واتێیدا بەڕۆژوو دەبن؟" وتیان: ئەمە ڕۆژێکی گەورەو گرنگە، خوای گەورە موساو گەلەکەی تێدا ڕزگارکردووە، فیرعەون و دارودەستەکەی تێدا غەرقکرد، ئیتر موسا بۆسوپاس گوزاری تێیدا بەڕۆژوبووە، ئێمەش بەڕۆژو دەبین. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئێمە لەپێش ترین بۆ موسا تا ئێوە". ئیتر ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا بەڕۆژو بوو وە فەرمانی دا کە(ئیماندارانیش) تێیدا بەڕۆژوبن.

**٣١٨ـ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي يَزِيدَ: سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) وسُئِلَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُوراء، فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) صَامَ يَوْمًا يَطْلُبُ فَضْلَهُ عَلَى الْأَيَّامِ إِلَّا هَذَا الْيَوْمَ، ولَا شَهْرًا إِلَّا هَذَا الشَّهْرَ. يَعْنِي رَمَضَانَ. (بخاري/ الصوم/ ١٩٠٢،١٩٠٠)**

(عبدالله ی کوڕی یزید) دەڵێ: گوێی لە(ابن عباس) (ﷺ) بووە کاتێ پرسیاری لێکراوە دەربارەی ڕۆژوگرتن لەعاشوردا، وتویەتی: نەم زانیوەو نەم بیستوە کەپێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك بەڕۆژو بوبێت و بەتەمای ئەوە بووبێت ئەو ڕۆژە لەڕۆژەکانی تر گەورەتربێ لەئەمڕۆ، یان مانگێگ جگە لەم مانگە (مەبەست ڕەمەزان بووە).

## ( ٢٨ ) ئەوەی لە عاشورادا شتی خوارد

٣١٩ـ عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عفراء (ﷺ) قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) غَدَاةَ عَاشُوراء إِلَى قُرَى الْأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: "مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِه". فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ مِنْهُمْ إِنْ شَا و اللَّهُ تعالى، وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ عِنْدَ الْإِفْطَارِ. (بخاري/ الصوم/ ١٨٥٩)

(ربيع ی کچی معوذی کوڕی عفراء) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەرەبەیانی ڕۆژی عاشورا خەڵکێکی نارد بۆ دێهاتەکانی دەوری مەدینە (فەرموبووی کەبڵێن) :"ئەوەی بەڕۆژووە باڕۆژووەکەی تەواوبکات، ئەوەی بەڕۆژوو نییە باهیچ نەخوات، تائێوارە، ئیتر ئێمە دوای ئەوە ئەو ڕۆژەمان دەگرت منالە وردەکانیشمان بەڕۆژو دەکرد ئەوەیان کەخوا بیویستایە. ئەوسا دەچوین بۆ مزگەوت و (تۆپ) و یاریمان لەخوری بۆ دروست دەکردن ئەگەر یەکێکیان بۆ خواردن بگریایە ئەوە تۆپەکەمان دەدایە تا کاتی بەربانگ.

## ( ٢٩ ) ڕۆژوو لەشەعباندا

٣٢٠ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ أَرَهُ صَائِمًا مِنْ شَهْرٍ قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلًا. (بخاري/ الصوم/ ١٨٦٨)

(ابی سلمه) دەڵێ: پرسیارم کردلە(عائیشە) (ﷺ) دەربارەی ڕۆژوی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش وتی: (ساڵی وا هەبوو) ئەوەندە بەڕۆژو دەبوو هەتا دەمانوت ئەم مانگە نایشکێنێ، (ساڵی واش هەبوو) بەڕۆژوو نەدەبوو، هەتا دەمانووت ئیتر ڕۆژو ناگرێت. نەشم بینیوە هیچ مانگێك زۆر بەڕۆژوو بوبێت، (ساڵی واش هەبوو) شەعبانی هەموو دەگرت مەگەر کەمێکی نەبێت.

## ( ٣٠ ) ڕۆژوی ناوەڕاستی شەعبان

٣٢١ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ لَهُ أَوْ لِآخَرَ: "أَصُمْتَ مِنْ سُرَرِ شَعْبَانَ". قَالَ: لَا. قَالَ: "فَإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ". (بخاري/ الصوم/ ١٨٨٢)

(عمرانی کوڕی حصین) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەوی فەرموو یان بەکەسێکی تر: ئایا ناوەڕاستی شەعبان هیچ بەڕۆژوو بویت؟ وتی: نەخێر فەرمووی: "هەرکات ڕۆژوی مانگی (ڕەمەزانت) تەواو کرد، دووڕۆژ بەڕۆژوبە لەبەر ئەوەی لە شەعبان نەتگرتووە."

## ( ٣١ ) نەگرتنی ڕۆژوی عارفە بۆ حاجیان

٣٢٢ـ عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ (ﷺ): أَنَّ نَاسًا تَمَارَوْا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ وهُوَ واقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ بِعَرَفَةَ، فَشَرِبَهُ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٧٨)**

(ام الفضل بنت الحارث) (ﷺ) دەڵێ: خەڵكێك لەلای ئەو گفتوگۆیان بوو دەربارەی بەڕۆژوبوونی پێغەمبەر (ﷺ): لەڕۆژی عارفەدا، هەندێكیان وتیان بەڕۆژووە، هەندێکی تریان وتیان نەخێر بەڕۆژو نییە، ئەوسا پەرداخێك شیری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نارد لەکاتێکدا بەسەر ووشترەکەیەوە بوو لەعارفەدا، ئەویش خواردیەوە.

## ( ٣٢ ) ڕۆژوو نەگرتن لە جەژنەکاندا

٣٢٣ـ عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ أَنَّهُ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) فَجاء فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، والْآخَرُ يَوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ. **(بخاري/ الصوم/ ١٨٨٩)**

(ابوعبید)کارگوزاری (ابن ازهار) دەڵێ: جەژنمان کرد لەگەڵ (عمری کوڕی خطاب) (ﷺ) هات، نوێژی کردوو ڕۆیشت، وتاری بۆ خەڵك داو وتی: ئەم دوو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ): ڕێگری کردووە ڕۆژوی تێدا بگیرێت، ئەو ڕۆژەی ڕۆژو دەشکێنن دوای مانگی ڕەمەزان (واتە جەژنی ڕەمەزان) هەروەها ئەوڕۆژەی کەقوربانی حەجی تێدا دەخۆن (ڕۆژەکانی جەژنی قوربان).

## ( ٣٣ ) بەڕۆژوبوونی ڕۆژانی هەینی بەتەنها پەسەندنییە

٣٢٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلَّا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ". **(بخاري/ الصوم/ ١٨٨٤)**

(ابوهریره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی: "باکەستان ڕۆژانی هەینی بەڕۆژو نەبێت مەگەر ڕۆژێك لەپێشەوە یان لەدواوە (لەگەڵیدا) بەڕۆژوبێت.

## ( ٣٤ ) ڕۆژوی بەردەوام پەسەند نییە

٣٢٥ـ عن عَبْدَ اللَّه بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ (ﷺ) أَنِّي أَصُومُ أَسْرُدُ، وأُصَلِّي اللَّيْلَ، فَإِمَّا أَرْسَلَ إِلَيَّ وإِمَّا لَقِيتُهُ، فَقَالَ: "أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ ولَا تُفْطِرُ وتُصَلِّي اللَّيْلَ؟ فَلَا تَفْعَلْ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ حَظًّا، ولِنَفْسِكَ حَظًّا، ولِأَهْلِكَ حَظًّا، فَصُمْ وأَفْطِرْ، وصَلِّ ونَمْ وصُمْ مِنْ كُلِّ عَشْرَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، ولَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ". قَالَ: إِنِّي أَجِدُنِي أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ، قَالَ: "فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام". قَالَ: وكَيْفَ كَانَ دَاوُدُ يَصُومُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: "كَانَ يَصُومُ يَوْماءيُفْطِرُ يَوْمًا، ولَا يَفِرُّ إِذَا لَاقَى". قَالَ: مَنْ لِي بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ عطاء: فَلَا أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الْأَبَدِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ، لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ". (بخاري/ الصوم ١٨٧٦)

(عبدالله ی کوڕی عمرو کوڕی عاص) (ﷺ) دەڵێ: هەواڵ گەیشتەوە پێغەمبەر (ﷺ): کەمن بەردەوام بەڕۆژوومو بەشەویش نوێژدەکەم، جا نازانم ناردی بەشوێنمدا یان خۆم بەخزمەتی گەیشتم. فەرمووی: "بیستومە کەتۆ بەردەوام بەڕۆژو دەبیت و ڕۆژو ناشکێنیت، بەردەوامیش شەونوێژ دەکەیت؟ وامەکە.. چونکە چاوت مافی هەیە خۆیشت مافت هەیە، خێزانت مافی هەیە، تۆ بەڕۆژوببەو مەشبە، شەونوێژ بکەو بشخەوە، لەدەڕۆژدا ڕۆژێك بەڕۆژو ببە. پاداشتی نۆ ڕۆژەکەی تری هەیە (عبدالله) وتی: من لەوە زیاتر دەتوانم ئەی پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی: "کەواتە ڕۆژو بگرە وەك بەڕۆژووبوونی (داود) سەلامی خوای لێبێت. وتم : (داود) چۆن بەڕۆژو دەبوو ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟: فەرمووی: "ڕۆژێك بەڕۆژو دەبو ڕۆژێك دەیشکاند. کاتێکیش بەرەنگاری دوژمنیش بووایەتەوە ڕای نەدەکرد" وتم جاکێ ئەوەی بۆ دەلوێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ عطاء دەڵێ: ئیتر نازانم چۆن باسی ڕۆژوی بەردەوام هاتە پێشەوە، پێغەمبەر (ﷺ): فەرمووی: "ئەوە ڕۆژوی نەگرتووە کەبەردەوام بەڕۆژو دەبێت، ئەوە ڕۆژوی نەگرتووە کە بەردەوام بەڕۆژو دەبێت (واتە: خێری ناگاتو نادروستە)

## ( ٣٥ ) چاکترین ڕۆژو ڕۆژوی ( داود )ە، ڕۆژ نا ڕۆژێك

٣٢٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وأَحَبَّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَام: كَانَ يَنَامُ نِصْفَ

اللَّيْلِ، ويَقُومُ ثُلُثَهُ، ويَنَامُ سُدُسَهُ. وكَانَ يَصُومُ يَوْماءيُفْطِرُ يَوْمًا". (بخاري/ التجهد/ ١٠٧٩)

(عبدالله ی کوڕی عمرو) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پەسەندترین ڕۆژو لای خوای گەورە ڕۆژوی (داود)ە، پەسەندترین شەونوێژیش لای خوای گەورە هەر شەونوێژی داودە. نیوەی کاتی شەو دەخەوت سێیەکەی تری شەونوێژی دەکرد، شەش یەکی دەخەوتەوە، هەروەها ڕۆژێك بەڕۆژودەبوو، ڕۆژێکیش بەڕۆژوو نەدەبوو".

# بەشی دوانزەیەم: حـــەج

## (١) حەج یەکجار فەرزە لەتەمەندا

٣٢٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَيُّهَا النَّاسُ، قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَحُجُّوا". فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلَاثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَوْ قُلْتُ نَعَمْ لَوَجَبَتْ، ولَمَا اسْتَطَعْتُمْ". ثُمَّ قَالَ: "ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، واخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشيءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شيءٍ فَدَعُوهُ". **(بخاري/ الاعتصام بالكتاب و السنة)**

(ابـو هريـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وتـاری بـۆ دایـن و فـەرمووی: "خەڵکینە، خوای گەورە حەجی لەسەر فەرزکردوون، حەج بکـەن"، کابرایـەك وتـی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو، هەتا کـابرا سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر بموتایە بـەڵێ، فـەرز دەبوو لەسـەرتان و، نەشـتان دەتـوانی ئـەنجامی بـدەن". پاشـان فـەرمووی: "وازم لێبێنێت ئەوەندە لەشت مەکۆڵنەوە، چونکە ئەوانـەی پـێش ئێـوە تیاچـوون بـەهۆی پرسیار زۆرکردن و لە فەرمان دەرچوونی پێغەمبەرانیانەوە، ئەگەر فـەرمانی شـتێکم پێکـردن چـەندەتان تـوانی ئـەنجامی بـدەن، ئەگـەر ڕێگـری شـتێکم لێکـردن دەستبەرداری ببن و وازی لێبهێنن".

## (٢) پاداشتی حەج و عەمرە

٣٢٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَكَ "الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، والْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَا و إِلَّا الْجَنَّةُ". **(بخاري/ العمرة/ ١٦٨٣)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "لە عەمرەیەکەوە بۆ عەمرەیەکی تر کەفارەتی گونـاهی نێوانیانـە، حـەجی وەرگیراویش پاداشـتی تـەنها بەهەشتە"

٣٢٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ ولَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَماءلَدَتْهُ أُمُّهُ". **(بخاري/ الإحصارو جزاء الصيد/ ١٧٢٣)**

(أبو هريره) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەوەی بێت بۆ ئەم ماڵە (واتە کەعبە) ڕەفتار و گوفتاری نابەجێ نەکات، گوناه و تاوان ئەنجام نەدات، دەگەڕێتەوە ئەو دۆخەی وەکو تازە لە دایك بووبێت..."

### ( ٣ ) گەورەترین حەج

٣٣٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنِي أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ) -فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ- فِي رَهْطٍ يُؤَذِّنُونَ فِي النَّاسِ يَوْمَ النَّحْرِ: لَا يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ، مِنْ أَجْلِ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ. (بخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٦٢)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: (ابو بكر الصديق) (ﷺ) ناردمی لەو حەجەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) کردبوی بە ئەمیری پێش حەجی ماڵئاوایی لەگەڵ دەستەیەکدا تا بانگەواز بکەین لەناو خەڵکیدا لەڕۆژی جەژنی قوربانندا، کە ئەمساڵ بەدواوە هیچ موشرکێك نابێ حەج بکات، هیچ کەس بەڕوتی نابێ تەوافی کەعبە بکات. (ابن شهاب) دەڵێ: (حمیدی کوڕی عبدالرحمن) دەیوت ڕۆژی جەژنی قوربان ڕۆژی حەجی گەورەیە. لەبەر ئەم ڕیوایەتەی (ابو هريره).

### ( ٤ ) سەفەری ئافرەت بۆ حەج دەبێ لەگەڵ مەحرەمدا بێت

٣٣١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا يَكُونُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا، إِلَّا وَمَعَهَا أَبُوهَا، أَوِ ابْنُهَا، أَوْ زَوْجُهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا". (بخاري/ الإحصار و جزا و الصيد/ ١٧٦٥)

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "بۆ هیچ ئافرەتێك دروست نییە کە باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت، سەفەربکات لە سێ ڕۆژ بەرەوژوور، باوکی یان کوڕی یان هاوسەری، یان برای لەگەڵدا نەبێت".

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُسَافِرُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ". (بخاري/ تقصير الصلاة/ ١٠٣٨)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "بۆ هیچ ئافرەتێك نییە باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، ڕۆژە ڕێیەك بەبێ مەحرەم بڕوات".

٣٣٢ـ عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَخْطُبُ يَقُولُ: "لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا ومَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ، ولَا تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ". فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ امْرَأَتِي خَرَجَتْ حَاجَّةً، وإِنِّي اكْتُتِبْتُ فِي غَزْوَةِ كَذَا وكَذَا. قَالَ: "انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ". (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٤)

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەدا و دەیفەرموو: "نابێت هیچ پیاوێك تەنیا بكەوێت لەگەڵ هیچ ئافرەتێكدا، مەگەر مەحرەمی لەگەڵدا بێت، هەروەها ئافرەت نابێت سەفەر بكات مەگەر لەگەڵ مەحرەمدا". پیاوێك هەستا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنەكەم چووە بۆ حەج و منیش ناونوس كراوم بۆ فلان غەزا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "برۆ لەگەڵ ژنەكەتدا حەج بكە".

## ( ٥ ) حەج بۆ ئەو كەسەی ناتوانێت بچێت

٣٣٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَجاءتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا وتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَصْرِفُ وجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الْآخَرِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّه عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخًا كَبِيرًا، لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: "نَعَمْ". وذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. (بخاري/ الحج/ ١٤٤٢)

(عبدالله ی كوڕی عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ "فضل ی كوڕی عباس" لە پاشكۆی پێغەمبەردا سواری وڵاخێك بوو، ئافرەتێك (خسعمي) هات و پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد، فضل تەماشای ئافرەتەكەی دەكرد و ئەویش تەماشای ئەوی دەكرد، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی فضل ی وەرچەرخان بۆلایەكی تر، ئینجا ئافرەتەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەج كەفەرزی خوایە لەسەر بەندەكانی كاتێ لەسەر باوكم فەرزبووە، كە پیرەو خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، ئایا من حەجی بۆ بكەم؟. فەرموی: "بەڵێ" ئەمەش لە حەجیماڵئاواییدا بوو.

## ( ٦ ) شوێنی ئیحرام بەستن

٣٣٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: وقَّتَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ، ولِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، ولِأَهْلِ نَجْدٍ: قَرْناً، ولِأَهْلِ الْيَمَنِ: يَلَمْلَمَ، قَالَ: "فَهُنَّ لَهُنَّ ولِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ والْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمِنْ أَهْلِهِ، وكَذَا فَكَذَلِكَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا". (بخاري/ الحج/ ١٤٥٢)

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەڵكی مەدینە بۆ ئیحرام بەستن (ذوالحلیفة)ی دیاری كرد، بۆ خەڵكی شام (الجحفە)، بۆ خەڵكی نجد (قرن)، بۆ خەڵكی یەمەن (یَلَمْلَم) و فەرموی: "ئەوە بۆ خەڵكی ئەو ولآتانەیە بۆ ئەو كەسانەش كەبەسەریاندا دێن، با خەڵكی ئەوێش نەبن، هەر كەس دەیەوێت حەج و عەمرە بكات ئەوانەی لەو شوێنانە نزیكترە ئەوە لە شوێنی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێ هەروا بەو شێوەیە دەبێت، هەتا خەڵكی مەككە خۆیان هەر لە مەككەوە ئیحرام دەبەستن".

## ( ٧ ) بۆنی خۆش بۆ ئیحرامپۆش

٣٣٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بيدي لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ، ولِحِلِّهِ حِينَ حلَّ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ. **(بخاري/ الحج/ ١٤٦٥)**

(عائشە) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ).دەڵێ: بەدەستی خۆم بۆنی خۆشم دا لە پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئیحرام بەستن، لەدوای ئەوەش كە ئیحرامی شكاند، پێش ئەوەی تەواف بكات بەدەوری بیتدا.

٣٣٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وبِيصِ الْمِسْكِ فِي مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ مُحْرِمٌ. **(بخاري/ الغسل/ ٢٦٨)**

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: هەر دەتوت چاوم لە بریقەی میسكە لە ناوچەوانی پێغەمبەر (ﷺ)، لەئیحرامیشدا بوو.

## ( ٨ ) ئیحرام لە مزگەوتی ( ذو الحلیفة )

٣٣٧ـ عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ (ﷺ) يَقُولُ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تَكْذِبُونَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِيهَا، مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَّا مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ. يَعْنِي ذَا الْحُلَيْفَةِ. **(بخاري/ الحج/ ١٤٦٧)**

(سالم ی كوڕی عبدالله) دەڵێ: گوێم لەباوكم بوو دەیوت: ئەو تەپۆلكەیە كە ئێوە وادەزانن پێغەمبەر (ﷺ) لێرەدا ئیحرامی بەستوە، نەخێر پێغەمبەر (ﷺ) ئیحرامی نەبەستوە لای مزگەوتەكەیدا نەبێ واتە (ذو الحلیفة).

## ( ٩ ) كاتی ئیحرام پۆشین

٣٣٨ـ عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: مَا هُنَّ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ:

رَأَيْتُكَ لَا تَمَسُّ مِنَ الْأَرْكَانِ إِلَّا الْيَمَانِيَيْنِ، ورَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، ورَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، ورَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلَالَ، ولَمْ تُهْلِلْ أَنْتَ حَتَّى يَكُونَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَمَّا الْأَرْكَانُ: فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَمَسُّ إِلَّا الْيَمَانِيَيْنِ. وأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ: فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ ويَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا. وأَمَّا الصُّفْرَةُ: فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا. وأَمَّا الْإِهْلَالُ: فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ. (بخاري/ الوضوء/ ١٦٤)

(عبيدى كوڕى جريج) دەڵێ: كە بە (عبدالله ى كوڕى عمر)ى وت: ئەى (أبو عبدالرحمن) چوار شتم لێ بينيت، نەم دى هيچكام لە هاوڕێيانت بيكەن، وتى: ئەوانە چين ئەى (ابن جريج) وتى: بينيم كە دەستت نادەيت لە سوچەكانى (كعبە) جگە لەدوو سوچە يەمەنيەكە. هەروەها بينيم نەعلى بێ موت لە پێ دەكرد، بينيم بۆيەى زەردت دەكرد، بينيم كاتێ كەلە مەككە بويت خەڵك ئيحرامى دەپۆشى كاتێ مانگى نوێيان دەبينى، بەلأم تۆ لەڕۆژى هەشتەمدا ئحرامت پۆشى... (عبدالله كوڕى عمر) وتى: دەربارەى سوچەكانى (كەعبە) من نەمبينى پێغەمبەر (ﷺ) دەست لە سوچەكانى بدات جگە لە دوسوچە يەمەنيەكە، دەربارەى نەعلە بێ موەكانيش، من بينيومە پێغەمبەر (ﷺ) نەعلێكى لە پێ دەكرد كە موى پێوە نەبوايە و دەست نوێژى بەوە دەگرت، بۆيە منيش حەزدەكەم لە پێى بكەم، بەنيسبەت بۆيەى زەرديشەوە من بينيومە پێغەمبەر (ﷺ) بۆيەى بەوە دەكرد، بۆيە پێم خۆشە بۆيە بەوە بكەم. دەربارەى ئيحرام پۆشينيش، من بينيم پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ ئيحرامى دەپۆشى كە وشترەكەى ئامادەى كەوتنە ڕێ دەبوو (واتە ڕۆژى هەشتەم).

### (١٠) ئيحرام پۆشين لە مەككەوە

٣٣٩ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ (ﷺ) بِعُمْرَةٍ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ عَرَكَتْ (عائشة) حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ والصَّفَا والْمَرْوَةِ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يَحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْيٌ، قَالَ: فَقُلْنَا: حِلُّ مَاذَا؟ قَالَ: "الْحِلُّ كُلُّهُ". فَوَاقَعْنَا النساء، وتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ، ولَبِسْنَا ثِيَابَنَا، ولَيْسَ بَيْنَنَا وبَيْنَ عَرَفَةَ إِلَّا أَرْبَعُ لَيَالٍ. ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ) فَوَجَدَهَا تَبْكِي، فَقَالَ: "مَا شَأْنُكِ". قَالَتْ: شَأْنِي أَنِّي قَدْ

حِضْتُ وقَدْ حَلَّ النَّاسُ ولَمْ أَحْلِلْ، ولَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، والنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الْآنَ. فَقَالَ: "إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاغْتَسِلِي ثُمَّ أَهِلِّي بِالْحَجِّ". فَفَعَلَتْ، ووَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ، حَتَّى إِذَا طَهَرَتْ طَافَتْ بِالْكَعْبَةِ والصَّفَا والْمَرْوَةِ، ثُمَّ قَالَ: "قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجِّكِ وعُمْرَتِكِ جَمِيعًا". فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَجِدُ فِي نَفْسِي أَنِّي لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حَتَّى حَجَجْتُ. قَالَ: "فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ". وذَلِكَ لَيْلَةَ الحَصْبَةِ. **(بخاري/ العمرة/ ١٦٩٣)**

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتین بە ئیحرامەوە بۆ حەجێکی تاك، عائشە بە نیەتی عەمرە هاتبوو هەتا گەیشتینە شوێنێك پێی دەوترا (سرف) عائشە کەوتە عادەوە، کاتێ گەیشتین تەوافی کەعبە و صەفاو مەروەمان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێداین، ئەو کەسەی قوربانی پێ نییە با ئیحرام بشکێنێ... وتمان: ئیحرام شکاندن لەچی؟. فەرمووی: "بۆ هەرشتێك" ئێمەش چوینە لای هاوسەرەکانمان، خۆمان بۆنخۆش کرد و پۆشاکمان پۆشی تەنها چوار شەویشی مابوو بۆ عەرەفە، لە ڕۆژی (ترویە)دا کە (٨ ذوالحجة)یە ئیحراممان بەستەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چو بۆلای عائشە بینی دەگری، فەرمووی: "ئەوە چیتە" وتی: کەوتمە حەیزەوە، خەڵك ئیحرامی شکاند من نەمشکاند، تەوافی بەیتیشم نەکردوە، وا ئێستا خەڵك بۆ حەج دەچن، فەرمووی: "ئەمە حاڵەتێکە خوا نوسیویەتی لەسەر کچەکانی ئادەم، خۆت بشۆ و نیەتی حەج بهێنە" عائشە بەقسەی کرد و ئەرکەکانی بەجێ هێنا، کاتێ پاك بۆوە تەوافی کەعبەو صەفاو مەرواشی کرد، ئینجا پێی فەرموو: "ئیتر تۆ لە حەج و عومرەش هەردوکیان بویتەوە". عائشە وتی: من ئەوە لەدڵمدا دروست بووە کە تەوافی کەعبەم نەکردوە بۆ حەج نەبێ، بۆیە فەرمووی: ئەی (عبدالرحمن)، عائشە ببە لە (تنعیم) عومرەی پێ بکە: ئەویش لەشەوی مانەوەی (حصبە)دا کە شوێنێکە لەدەرەوەی مەککە (لەگەڵمدا هات).

### (١١) لبيك اللهم لبيك

٣٤٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِي الْحُلَيْفَةِ أَهَلَّ، فَقَالَ: "لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ والنِّعْمَةَ لَكَ والْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ". قَالُوا: وكَانَ عَبْدُ اللَّهِ **(بْنُ عُمَرَ)** (ﷺ)

يَقُولُ: (هَذِه) تَلْبِيَةُ رَسُول اللَّه (ﷺ). قَالَ نَافِعٌ: كَانَ عَبْدُ اللَّه (رضي الله عنه) يَزِيدُ مَعَ هَذَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ، والْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ والرغباء إِلَيْكَ والْعَمَلُ. (بخاري/ الحج/ ١٤٧٤)

(عبدالله ى كوڕى عومەر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ بەسوارىيى كەوتەڕێ لەلاى مزگەوتى (ذو الحليفة) بەئيحرامەوە نيەتى هێناو فەرمووى: (لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك ان الحمد والنعمة لك والملك لا شريك لك) جا وتيان ئەمە شێوەى (لبيك)كردنى پێغەمبەر بووە (ﷺ). (نافع) دەڵێ: عبدالله لەگەڵ ئەوەدا ئەمەشى دەوت: لبيك لبيك، لبيك وسعديك، والخير بيديك، لبيك والرغباء اليك والعمل.

## ( ١٢ ) گرێدانى حەج و عەمرە پێكەوە

٣٤١–عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) أهلَّ بهما جميعاً: "لَبَّيْكَ عُمْرَةً وحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وحَجًّا". (بخاري/ المغازي/ ٤٠٩٦)

(انس) (رضي الله عنه) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو نيەتى هێنا بۆ عومرە و حەج پێكەوە و فەرموى: "لبيك عُمْرَة وحجا، لبيك عمرة وحجا".

## (١٣)حەج بە تەنيا

٣٤٢–عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالْحَجِّ مُفْرَدًا. وفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَدًا. (بخاري/ المغازي/ ٤٠٩٦)

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەرى خوادا (ﷺ) ئيحراممان بەستوە بەحەج ى تەنها، لە ڕيوايەتێكى تردا هاتوە كە پێغەمبەر (ﷺ) ئيحرامى تەنها بۆ حەج بەستوە.

## ( ١٤ ) گۆڕينى حەج بۆ عمرە

٣٤٣ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضي الله عنه) قَالَ: تَمَتَّعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ولَمْ يَنْزِلْ فِيهِ الْقُرْآنُ، قَالَ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ مَا شَا و. (بخاري/ التفسير/ ٤٢٤٦)

(عمران كوڕى حصين) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوين نيەتى حەجمان گۆڕى بە عەمرەو (ئيحرامان شكاند) لەو بارەوە قورئان نازڵ نەبوو، ئيتر هەركەس بەڕاى خۆى چى دەڵێ با بڵێ.

٣٤٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْد اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ونَحْنُ نَقول: لَبَّيْكَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ نَجْعَلَهَا عُمْرَةً. (بخاري/ الحج/ ١٤٩٣)

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) هاتین و دەمانوت: (لبيك بالحج) کەچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێداین کە بیکەن بە عەمرە.

### ( ١٥ ) ئەوەی ئیحرام بەحەج ببەستێ و قوربانی پێ بێت

**٣٤٥ـ عن مُوسَى بْنُ نَافِعٍ قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ مُتَمَتِّعًا بِعُمْرَةٍ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِأَرْبَعَةِ أَيَّامٍ، فَقَالَ النَّاسُ: تَصِيرُ حَجَّتُكَ الْآنَ مَكِّيَّةً، فَدَخَلْتُ عَلَى عطاء بْنِ أَبِي رَبَاحٍ فَاسْتَفْتَيْتُهُ، فَقَالَ عطاء: حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيُّ (ﷺ): أَنَّهُ حَجَّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَامَ سَاقَ الْهَدْيَ مَعَهُ، وقَدْ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ مُفْرَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ، فَطُوفُوا بِالْبَيْتِ وبَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ وقَصِّرُوا، وأَقِيمُوا حَلَالًا، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ، واجْعَلُوا الَّتِي قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً". قَالُوا: كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وقَدْ سَمَّيْنَا الْحَجَّ؟ قَالَ: "افْعَلُوا مَا آمُرُكُمْ بِهِ، فَإِنِّي لَوْلَا أَنِّي سُقْتُ الْهَدْيَ لَفَعَلْتُ مِثْلَ الَّذِي أَمَرْتُكُمْ بِهِ، ولَكِنْ لَا يَحِلُّ مِنِّي حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ". فَفَعَلُوا. (بخاري/ الحج/ ١٤٩٣)**

(موسى کوڕی نافع) دەڵێ چوم بۆ مەککە نیەتی عەمرەم هێنابوو چوار ڕۆژ پێش (ترويه) خەڵکی وتیان حەجەکەت حەجێکی مەکیت کردووە، چوم بۆلای (عطاء ی کوڕی رباح). پرسیارم لێکرد، عطاء وتی: (جابری کوڕی عبداللەی انصاری) بۆی گێڕامەوە، کە لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) حەجی کردووە، ئەو ساڵەی کە قوربانییەکەی بە دیاری هێناوە ئیحرامیشیان تەنها بۆ حەج بەستبو.. پێغەمبەری خوا) ﷺ) پێی فەرموو: "ئیحرامەکانتان بشکێنن دوای ئەوەی تەوافی کەعبەو صەفا و مەروە دەکەن و موی سەرتان کورت بکەنەوە ئیحرام داکەنن تارۆژی (ترويه) ئەو کاتە ئیحرام ببەستنەوە بۆ حەج، ئەوەی بۆی هاتبوون (کەحەجە) بیگۆڕن (بەعەمرە)" وتیان: چۆن ئیحرام بشکێنین، خۆ ئێمە ناوی حەجمان بردووە؟ فەرمووی: "ئەوەی من فەرمانتان پێدەکەم، بیکەن منیش ئەگەر قوربانیم نەهێنایە ئەوەم دەکرد کە فەرمانم پێداون، بەڵام حەرام بۆ من حەلاڵ نابێ تا ئەم قوربانیە نەگاتە کات و شوێنی خۆی" ئەوانیش بە قسەیان کرد.

### ( ١٦ ) سڕینەوەی ئیحرام شکاندنی حەج

**٣٤٦ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ (مُنِيخٌ) بِالْبطحاء فَقَالَ: "بِمَ أَهْلَلْتَ". قَالَ: قُلْتُ: أَهْلَلْتُ بِإِهْلَالِ النَّبِيِّ (ﷺ). قَالَ: "هَلْ سُقْتَ**

مِنْ هَدْيٍ". قُلْتُ: لَا. قَالَ: "فَطُفْ بِالْبَيْتِ وبِالصَّفَا والْمَرْوَةِ، ثُمَّ حِلَّ". فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وبِالصَّفَا والْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ قَوْمِي فَمَشَطَتْنِي وغَسَلَتْ رَأْسِي، فَكُنْتُ أُفْتِي النَّاسَ بِذَلِكَ فِي إِمَارَةِ أَبِي بَكْرٍ وإِمَارَةِ عُمَرَ (ﷺ)، فَإِنِّي لَقَائِمٌ بِالْمَوْسِمِ إِذْ جَاءَنِي رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ، فَقُلْتُ: أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ بِشيءٍ فَلْيَتَّئِدْ، فَهَذَا أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ، فَبِهِ فَأْتَمُّوا. فَلَمَّا قَدِمَ قُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا هَذَا الَّذِي أَحْدَثْتَ فِي شَأْنِ النُّسُكِ؟ قَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ قَالَ: (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ والْعُمْرَةَ لِلَّهِ) **(البقرة: ١٩٦)**. وإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ نَبِيِّنَا عَلَيْهِ الصَّلَاةُ والسَّلَام فَإِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الْهَدْيَ. **(بخاري/ الحج/ ١٦٣٧)**

(ابو موسى) (ﷺ) دەڵێ: چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتێکدا کە لە (بطحاء) باری خستبوو فەرمووی: "بەچی ئیحرامت بەستووە" منیش وتم: پێغەمبەر (ﷺ) بەچی ئیحرامی بەستووە منیش بەوە، فەرمووی: "ئایا قوربانیت هێناوە" وتم: نەخێر.. فەرمووی: "دەبچۆ تەوافی بەیت و صەفاو مەروە بکە پاشان ئیحرام بشکێنە" منیش چووم و تەوافی صەفاو مەروەم کرد، پاشان چوومە لای ئافرەتێکی (مەحرەم)ی خزمم سەری بۆ شۆردم و بۆشی داهێنام ... بۆیە من فەتوام دەدا بۆ خەڵکی لەسەردەمی فەرمانڕەوایی (ابوبکر و عمر) دا (ﷺ).. جارێکیان لەحەج بووم پیاوێك هات بۆ لام و وتی: تۆ نازانی کە ئەمیری ئیمانداران (عمر (ﷺ)) لە بارەی ئەرکەکانی حەجەوە چی داهێناوە، منیش وتم: خەڵکینە، ئەوەی پێشتر فەتوامان بۆ دابوو، با ڕایبگرێ، ئەوەتە ئەمیری ئیمانداران دێت بۆ لاتان و بیکەنە پێشەواتان و (فەتوای ئەو وەرگرن). کاتێ کەهات پێموت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئەو شتانە چییە کە لەبارەی ئەرکەکانی حەجەوە بڕیارت لەسەرداوە؟ ئەویش وتی ئەگەر بەقسەی قورئان بکەن ئەوەتە دەفەرموێت: (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ والْعُمْرَةَ لِلَّهِ)البقرة/١٩٦، ئەگەر لەسەر سونەتی پێغەمبەریشمان محمد (ﷺ) بڕۆین، پێغەمبەر (ﷺ) ئیحرامی نەشکان هەتا قوربانیەکەی سەربڕی.

## ( ١٧ ) گرێدانی حەج و عەمرە پێکەوە و سەربڕینی دیاری لەنێوانیاندا

٣٤٧ـ عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) خَرَجَ فِي الْفِتْنَةِ مُعْتَمِرًا، وقَالَ: إِنْ صُدِدْتُ عَنِ الْبَيْتِ صَنَعْنَا كَمَا صَنَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَخَرَجَ فَأَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وسَارَ حَتَّى إِذَا ظَهَرَ عَلَى الْبَيْدَاءِ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: مَا أَمْرُهُمَا إِلَّا وَاحِدٌ، أُشْهِدُكُمْ أَنِّي

قَدْ أَوْجَبْتُ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ. فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا جاء الْبَيْتَ طَافَ بِهِ سَبْعًا وبَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ سَبْعًا، لَمْ يَزِدْ عَلَيْهِ، ورَأَى أَنَّهُ مُجْزِئٌ عَنْهُ، وأَهْدَى. (بخاري/ الحج/ ١٥٥٨)

نافع دەڵێ: (عبدالله ی کوڕی عمر) ﷺ لەسەردەمی ئاشوبەکەدا (ئەو ساڵەی حەجاج هات بۆ شەڕ کردن دژی عبدالله ی کوڕی زبیر) چوو بۆ عەمرە و وتی: ئەگەر ڕێگەم لەچوون بۆ ماڵی خوا لێگیرا. ئەوە دەکەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردی، ئەوە بوو کە دەرچوو ئیحرامی بە عەمرە بەست و ڕۆیشت هەتا سەرکەوتنە سەر (بیداء)، ئەوسا ئاوڕی دایەوە لە هاوەڵانی و فەرمووی: "هەردوو ئەرکەکە یەکێکە، بەشایەت بن کە من بڕیارم داوە حەج و عەمرە پێکەوە بکەم". ئینجا (عبدالله) ڕۆیشت هەتا گەیشتە (بیت) حەوت جار تەوافی بەدەوردا کرد هەروەها حەوت جاریش لە نێوان صەفاو مەروادا، لەوە زیاتری نەکرد. بڕواشی وابوو کە بۆی دروستە و قوربانیەکەشی کرد (مەبەست ئەوەیە کەیەك جار طەوافی (بیت) و صەفا و مەروەی کردووە بۆ حەج و عەمرە).

### (١٨) قوربانی

٣٤٨ـ عَنْ سَالِمِ ابْنِ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ وأَهْدَى، فَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْيَ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وبَدَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْيَ، ومِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: "مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى فَإِنَّهُ لَا يَحِلُّ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَجَّهُ، ومَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ وبِالصَّفَا والْمَرْوَةِ، ولْيُقَصِّرْ ولْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالْحَجِّ، ولْيُهْدِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا فَلْيَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ، وسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ". وطَافَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أَوَّلَ شَيْءٍ، ثُمَّ خَبَّ ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ، ومَشَى أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ فَانْصَرَفَ فَأَتَى الصَّفَا فَطَافَ بِالصَّفَا والْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى قَضَى حَجَّهُ، ونَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ، وأَفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وفَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَنْ أَهْدَى وسَاقَ الْهَدْيَ مِنَ النَّاسِ. (بخاري/ الحج/ ١٦٠٦)

(سالم کوڕی عبدالله) دەڵێ: (عبدالله ی کوڕی عمر) وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لە حەجیماڵئاواییدا لە پێشدا بۆ عەمرە ئیحرامی بەست و دوایی ئیحرامی بەست بۆ حەج ، مەڕێکی کردە فیدیە لە (ذوالحليفة)ەوە ئەو حەیوانەی لەگەڵ خۆی هێنابوو سەرەتا پێغەمبەر (ﷺ) بەعەمرە دەستی پێ کرد پاشان خەڵکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئیحرامیان شکاند لە نێوان عەمرە بۆ حەج، جا هەبوو لەو خەڵکە فیدیەی هێنابوو، هەیش بوو نەیهێنابوو کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە مەککە بە خەڵکەکەی فەرموو: "ئەوەتان کە فیدیەی هێناوە ئەوە هیچ شتێك لەو شتانەی کە لێی حەرام کراوە بۆی حەڵاڵ نابێت هەتا حەجەکەی دەکات.. ئەوەش کە فیدیەی پێ نییە بابچێ تەوافی (بيت) و صەفا و مەروە بکات و موی سەری کورت بکاتەوە و ئیحرام بشکێنێ، پاشان ئیحرام ببەستێتەوە بۆحەج و لەوەو دوا فیدیەی بدات، ئەوەش توانای فیدیەی نییە با سێ ڕۆژ لەحەجدا بەڕۆژوبێت حەوتیش کە گەڕایەوە ناو کەس و کاری". جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ گەیشتە مەککە یەکجار دەستیدا لە سوچەکە (واتە حجر الاسود) پاشان سێ سووڕ لە حەوتەکەی بەهەروەلە کرد چواریشیان بەڕۆیشتن بوو، دوای تەوافیش لای مەقامدا دوورکات نوێژی کرد و سەلامی دایەوە و ڕۆیشت بۆ صەفاو حەوت جار لە نێوان صەفاو مەڕوەدا گەڕا..دوای ئەوە ئیحرامی نەشکان لەو شتانەی لێی حەرام کرابوو هەتا حەجەکەی تەواوکرد و قوربانیەکەی لە ڕۆژی جەژندا سەربڕی، ئینجا لە مینا هاتە خوارەوە و تەوافی (بيت)ی کرد و ئەوسا ئیحرامی شکاند لەهەموو ئەو شتانەی لێی حەرام بوو، هەرکەسیش قوربانی هێنابوو هەرەکو پێغەمبەری خوای کرد (ﷺ).

## ( ١٩ ) تێهەڵکێش کردنی حەج بەدوای عەمرەدا

٣٤٩ـ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ ومِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ ولَمْ يُهْدِ فَلْيَحْلِلْ، ومَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وأَهْدَى فَلَا يَحِلُّ حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيَهُ، ومَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ فَلْيُتِمَّ حَجَّهُ". قَالَتْ عَائِشَةُ (رضي الله عنها): فَحِضْتُ، فَلَمْ أَزَلْ حَائِضًا حَتَّى كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ، ولَمْ أُهْلِلْ إِلَّا بِعُمْرَةٍ، فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ أَنْقُضَ رَأْسِي، وأَمْتَشِطَ، وأُهِلَّ بِحَجٍّ، وأَتْرُكَ الْعُمْرَةَ. قَالَتْ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَضَيْتُ حَجَّتِي بَعَثَ مَعِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ، وأَمَرَنِي أَنْ أَعْتَمِرَ مِنَ التَّنْعِيمِ مَكَانَ عُمْرَتِي الَّتِي أَدْرَكَنِي الْحَجُّ ولَمْ أَحْلِلْ مِنْهَا. (بخاري/ الحيض/ ٣١٣)

عائشه دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا دەرچووین، هەمان بوو ئیحرامی بە عەمرە بەستبوو، هەمان بوو بەحەج هەتا گەیشتینە مەککە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەوەی ئیحرامی بۆ عەمرە بەستوە و قوربانی نەهێناوە با ئیحرامەکەی بشکێنێ، ئەوەش ئیحرامی بۆ حەج بەستوە باحەجەکەی تەواو بکات" عائشە دەڵێ من کەوتمە بێ نوێژیەوە و بەو حاڵەوە مامەوە هەتا ڕۆژی عەرەفە نیەتی تەنها عەمرەشم هێنابوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدام کە پەلکەکانم بکەمەوە و قژم دابهێنم، پاشان نیەتی حەج بێنم و واز لە عەمرە بێنم.. منیش ئەوەم کرد، کاتێ کە حەجەکەم تەواوکرد پێغەمبەر (ﷺ) عبدالرحمن ی کوڕی ابوبکری (برامی) لەگەڵ ناردم و فەرمانی پێدام کە عەمرە بکەم لە (تنعیم)ەوە (ئێستا پێی دەوترێت مزگەوتی عائشە) لەو شوێنەوە کە نیەتی حەجم هێنا و عەمرەکەشم تەواو نەکردبوو.

## ( ٢٠ ) بۆنی خۆش بە پۆشاكی ئیحرامەوە

**٣٥٠ـ عن يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ (ﷺ) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ عَلَيْهِ جُبَّةٌ وعَلَيْهَا خَلُوقٌ، أَوْ قَالَ: أَثَرُ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: كَيْفَ تَأْمُرُنِي أَنْ أَصْنَعَ فِي عُمْرَتِي؟ قَالَ: وأُنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) الْوَحْيُ، فَسُتِرَ بِثَوْبٍ، وكَانَ يَعْلَى يَقُولُ: وددْتُ أَنِّي أَرَى النَّبِيَّ (ﷺ) وقَدْ نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ، قَالَ: فَقَالَ: أَيَسُرُّكَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) وقَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ؟ قَالَ: فَرَفَعَ عُمَرُ طَرَفَ الثَّوْبِ فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ لَهُ غَطِيطٌ، قَالَ: وأَحْسَبُهُ قَالَ: كَغَطِيطِ الْبَكْرِ. قَالَ: فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْهُ قَالَ: "أَيْنَ السَّائِلُ عَنِ الْعُمْرَةِ؟ اغْسِلْ عَنْكَ أَثَرَ الصُّفْرَةِ -أَوْ قَالَ: أَثَرَ الْخَلُوقِ- واخْلَعْ عَنْكَ جُبَّتَكَ، واصْنَعْ فِي عُمْرَتِكَ مَا أَنْتَ صَانِعٌ فِي حَجِّكَ". (بخاري/ الحج/ ١٤٦٣)**

(يعلی کوڕی أمیه) (ﷺ) دەڵێت پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (جعرانه)و جبەیەکی بۆنخۆشی لەبەردا بوو یاخود زەردی زەعفەرانی پێوە بوو، وتی: چ فەرمانێکم پێ دەکەی لەعەمرەکەمدا بیکەم؟ جا لەوکاتەدا وەحی دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) بەپۆشاکێك داپۆشرا (يعلی) دەڵێ: پێم خۆش بوو پێغەمبەر (ﷺ) ببینم کاتێ وەحی بۆ دادەبەزێ.. کابرا وتی: حەزدەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ببینی کاتێ وەحی بۆ دادەبەزێ؟ لەو کاتەدا عمر لایەکی ئەو پۆشاکەی بەرزکردەوە، سەیرم کرد پێغەمبەر (ﷺ) پرخەی دێت... کاتێ هاتەوە سەرخۆی

فەرموی: "کوا ئەو کەسەی دەربارى عەمرە پرسیاری هەبوو؟ شوێنەواری ئەو زەردیە یان ئەو بۆنە بشۆ جبەکەشت دابکەنە، چیت کردووە لە حەجەکەتدا لە عەمرەکەشتدا بیکە".

## ( ٢١ ) ئیحرامپۆش چی لەبەردەکات؟

**٣٥١ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ): مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، ولَا الْعَمَائِمَ، ولَا السَّرَاوِيلَات، ولَا الْبَرَانِسَ ولَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَحَدٌ لَا يَجِدُ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، ولْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، ولَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ ولَا الْوَرْسُ". (بخاري/ الحج/ ١٤٦٨)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ پیاوێك پرسیاری كرد لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی پۆشاكی ئیحرام، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "كراس لەبەرمەكەن، مێزەر لەسەر مەكەن، شەرواڵ لەپێ مەكەن، كڵاو لەسەر مەكەن، مەگەر كەسێك نەعلی دەست نەكەوێت باكاڵە و پێتاوەكانی لە پێبكات، بەڵام پاژنەكانی خوار قولە پێكانی ببڕێت، جلێك لەبەر مەكەن كە زەعفەران و وەرس (دوو گیای بۆنخۆشن)ی بەركەوتبێ.

**٣٥٢ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ يَخْطُبُ يَقُولُ: "السَّرَاوِيلُ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الْإِزَارَ، والْخُفَّانِ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ". يَعْنِي الْمُحْرِمَ. (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/ ١٧٤٤)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) وتاری دەدا و دەیفەرموو "شەرواڵ بۆ كەسێكە پەشتەماڵی دەست نەكەوێت، كاڵەو پیتاویش بۆ كەسێكە نەعلی دەست نەكەوێت".

## (٢٢) نێچیر بۆ ئیحرامپۆش

**٣٥٣ـعَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حِمَارًا وحْشِيًّا، وهُوَ بِالْأبواء أَوْ بِوَدَّانَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّه (ﷺ). قَالَ: فَلَمَّا أَنْ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَا فِي وجْهِي قَالَ: "إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلَّا أَنَّا حُرُمٌ". (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/ ١٧٢٩)**

(صعب كوڕی جثامة) (ﷺ) دەڵێ: گوێدرێژێكی كێوی بەدیاری پێشكەش كرا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە كاتێكدا لە (ابواء، یان لە بودان) بوو كەچی وەرینەگرت، بەلاَم كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕوخسارمدا هەستی كرد پێم ناخۆشە فەرموی: "ئێمە بۆیە وەری ناگرین، چونكە لە ئیحرامداین".

## ( ٢٣ ) گۆشتی نێچیر بۆ ئیحرامپۆش

٣٥٤ـ عن أَبِي قَتَادَةَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَاجاءخَرَجْنَا مَعَهُ، قَالَ: فَصَرَفَ مِنْ أَصْحَابِهِ فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ، فَقَالَ: "خُذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ حَتَّى تَلْقَوْنِي". قَالَ فَأَخَذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا قِبَلَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَحْرَمُوا كُلُّهُمْ إِلَّا أَبَا قَتَادَةَ فَإِنَّهُ لَمْ يُحْرِمْ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَسِيرُونَ إِذْ رَأَوْا حُمُرَ وحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلُوا فَأَكَلُوا مِنْ لَحْمِهَا، قَالَ: فَقَالُوا: أَكَلْنَا لَحْماءنَحْنُ مُحْرِمُونَ؟ قَالَ: فَحَمَلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِ الْأَتَانِ، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا أَحْرَمْنَا، وكَانَ أَبُو قَتَادَةَ لَمْ يُحْرِمْ، فَرَأَيْنَا حُمُرَ وحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلْنَا فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهَا، فَقُلْنَا: نَأْكُلُ لَحْمَ صَيْدٍ ونَحْنُ مُحْرِمُونَ؟ فَحَمَلْنَا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا، فَقَالَ: "هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَوْ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشيء". **(قَالَ):** قَالُوا: لَا. قَالَ: "فَكُلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا". **(بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/١٧٢٨)**

(ابو قتادە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كەوتەڕێ بۆ حەج و ئێمەش لە خزمەتیا بووین، هەندێ لە هاوەڵانی جیاكردەوە كە (ابو قتادە)یان تێدابوو پێی فەرمون: "بەكەناری دەریادا بڕۆن هەتا پێم دەگەنەوە" ئەوانیش كەناری دەریایان گرتەبەرو ڕۆیشتن، هەموو ئیحرامیان بەست جگەلە (ابو قتادە) كە ئیحرامی نەبەست، كاتێ بە ڕێگەدا دەڕۆیشتن چاویان كەوت بە ژمارەیەك گوێ درێژی كێوی، (ابو قتادة) هێرشی بۆ بردن، مێنگەیەكی ڕاوكرد، ئەوانیش لایانداو لە گۆشتەكەیان خوارد، دوایی وتیان ئێمە گۆشتمان خوارد و لە ئیحرامیشداین؟ ئەوسا چی مابوو لەگۆشتەكە هەڵیان گرت و كاتێ گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە ئیحراممان بەستبوو، (ابو قتادە) ئیحرامی نەبەستبوو، چاومان كەوت بەگوێدرێژی كێوی، (ابو قتادە) هێرشی كردە سەریان و مێنگەیەكی لێ سەربڕین، ئێمەش لامانداو لە گۆشتەكەیمان خوارد، پاشان وتمان: ئێمە لە گۆشتی ڕاومان خوارد لەكاتێكدا كە لەئیحرامدا بووین، ئەوەتا ئەوەشی ماوە لە گۆشتەكە

هێناومانە، فەرموی: "ئایا کەسێك لە ئێوە فـەرمانی پێدا یـان ئامـاژەی بـۆ کـرد؟" وتیان: نەخێر. فەرمووی: "ئەوەشی ماوە لە گۆشتەکە بیخۆن".

**( ٢٤ ) ئیحرامپۆش پێویستە چی بکوژێت؟**

**٣٥٥ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِي الْحِلِّ والْحَرَمِ الْحَيَّةُ، والْغُرَابُ الْأَبْقَعُ، والْفَأْرَةُ، والْكَلْبُ الْعَقُورُ، والْحُدَيَّا". (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/١٧٣٢،١٧٣١)**

(عائشـە) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ): فەرمویـەتی: "پێـنج جانـەوەری زیـان بەخش هەیە لەمەککەو سنووری دەورو بەری مەککـە دەکـوژرێن. "مـار، قەلەڕەشـی بازو، مشك، سەگی هار، کۆلارە"

**٣٥٦ـ عَنْ ابن عمر (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "خَمْسٌ لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ فِي الْحَرَمِ والْإِحْرَامِ: الْفَأْرَةُ، والْعَقْرَبُ، والْغُرَابُ، والْحِدَأَةُ، والْكَلْبُ الْعَقُورُ". (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/١٧٣٢،١٧٣١)**

(ابـن عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "پێـنج گیانـەوەر هەیـە هەرکەس بیانکوژێت گوناهی ناگات، لەسنووری مەککەو لەکاتی ئیحرامیشـدا (مشـك، دووپشك، قەلەڕەش، کۆلارە، سەگی هار".

**( ٢٥ ) کەڵە شاخ بۆ ئیحرامپۆش**

٣٥٧ـ عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) احْتَجَمَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ وهُوَ مُحْرِمٌ، وسَطَ رَأْسِهِ. (بخاري/ الطب/ ٥٣٧٣)

(ابن بحینە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەڵە شاخی لەناوەڕاستی سـەری گـرت لەڕێگەی مەککەداو لەکاتی ئیحرامدا.

**( ٢٦ ) سەر شۆردنی ئیحرامپۆش**

**٣٥٨ـ عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ والْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (ﷺ): أَنَّهُمَا اخْتَلَفَا بِالْأَبواءِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وقَالَ الْمِسْوَرُ: لَا يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ وهُوَ يَسْتَتِرُ بِثَوْبٍ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِي إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ أَسْأَلُكَ: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَغْسِلُ رَأْسَهُ وهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ (ﷺ)يَدَهُ عَلَى**

الثَّوْبِ فطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِي رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لِإِنْسَانٍ يَصُبُّ: **(اصْبُبْ)** فَصَبَّ عَلَى رَأْسِه، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِماءأَدْبَرَ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ (ﷺ) يَفْعَلُ. **(بخاري/ (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/ ١٧٤٣)**

(عبدالله ی كوڕی حنين) دەڵێ: كە (عبدالله ی كوڕی عباس وميسوری كوڕی مەخرەمە) (رضي الله عنهم) لە(ابواء) ڕایان جیاواز بوو، (عبدالله ی كوڕی عباس) دەیوت: ئیحرامپۆش دروستە سەری بشوات،(میسور) دەیوت: نابێت ئیحرامپۆش سەری بشوات. عبد الله ی كوڕی حنين دەڵێ: (ابن عباس) ناردمی بۆ لای (ابو ايوب ی انصاری) (رضي الله عنه) تا لەو بارەیەوە پرسیاری لێبكەن بینیم لەنیوان دوودیواردا خۆی دەشوات و پەردەی گێڕاوە منیش سەلامم لێكرد، وتی ئەوە كێیە وتم (عبدالله ی كوڕی حنين)ە، (عبدالله ی كوڕی عباس) ناردوومی بۆ لات تا پرسیارت لێبكەم كە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن سەری دەشۆرد لەكاتی ئیحرامدا،(ابو ايوب) دەستی خستە سەر پەردەكەودای نەواند، سەری لێم دەركەوت بەكەسێكی وت ئاوبكە بەسەرمدا ئەویش كردی بەسەریدا، ئینجا هەڵیگلۆفت بەهەردوو دەستی پێشو دوای سەری شۆرد ئینجاوتی: من پێغەمبەر (ﷺ)م دیوە ئاوا سەری دەشۆرد.

## ( ٢٧ ) فيديەی ئیحرامپۆش

**٣٥٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبٍ (ﷺ)وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ) (البقرة: ١٩٦). فَقَالَ كَعْبٌ: نَزَلَتْ فِيَّ، كَانَ بِي أَذًى مِنْ رَأْسِي، فَحُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: "مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ الْجَهْدَ بَلَغَ مِنْكَ مَا أَرَى، أَتَجِدُ شَاةً". فَقُلْتُ: لَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ). قَالَ: "صَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، أَوْ إِطْعَامُ سِتَّةِ مَسَاكِينَ، نِصْفَ صَاعٍ طَعَامًا لِكُلِّ مِسْكِينٍ". قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيَّ خَاصَّةً، وَهِيَ لَكُمْ عَامَّةً. (بخاري/ التفسير/ ٤٢٤٥)**

(عبدالله ی كوڕی معقل) دەڵێ: چوم لای(كعب) دانیشتم لەمزگەوتدا پرسیارم دەربارەی ئەم ئایەتە لێكرد (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ) البقرة/١٩٦ (كعب) وتی: ئەوە لەسەر من دابەزی سەرم برینی پێوە بوو. بردیانم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپێ دەهاتە سەر دەم و چاوم، فەرمووی: "نەمزانیوە ئاوا ماندویت باشە مەڕێكت پێ هەڵ ناسوڕێ" وتم: نەخێر: ئیتر ئەو ئایەتە دابەزی (ففدية من صيام او

صدقة او نسك) فەرمووی: "سێ ڕۆژ بەڕۆژو، یان نانی شەش هەژار بدە بۆ هەر هەژارێك نیو مەن خواردن" جا ئەو ئایەتە بەتایبەت بۆ من دابەزی بۆ ئێوەشە بەگشتی.

### ( ٢٨ ) مردنی ئیحرامپۆش

٣٦٠ـ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) –عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)– قَالَ: خَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَعِيرِهِ فَوُقِصَ، فَمَاتَ. فَقَالَ: "اغْسِلُوهُ بِماءٍ وسِدْرٍ، وكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، ولَا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا". **(بخاري/ الجنائز/ ١٢٠٦)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لەوشترەكەی بەربۆەوەو ملی شكاو مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەئاوو سیدر بیشۆن و لەهەردوو پۆشاكەكەی خۆیدا كفنی بكەن، سەری دامەپۆشن، چونكە لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەدەم (لبیك) وتنەوەوە زیندووی دەكاتەوە".

### ( ٢٩ ) مانەوە لە( ذي طوى )

٣٦١ـ عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) كَانَ لَا يَقْدَمُ مَكَّةَ إِلَّا بَاتَ بِذِي طَوًى حَتَّى يُصْبِحَ ويَغْتَسِلَ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ نَهَارًا، ويَذْكُرُ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ فَعَلَهُ. **(بخاري/ الحج/ ١٤٩٩)**

نافع دەڵێ: –(ابن عمر) نەدەهاتە مەكە هەتا لە (ذی طوی) شەوی نەبردایەتە سەر، كە ڕۆژبۆوە خۆی دەشتو دەچووە مەككەو دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) وای دەكرد.

### ( ٣٠ ) چوونە ناو مەككەو مەدینە

٣٦٢ـ عَن ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ ويَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ الْمُعَرَّسِ، وإِذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا، ويَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى. **(بخاري/ الحج/ ١٥٠٠)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەڕێگەی (الشجرە)وە دەردەچوو لەمەدینەولەڕیگەی (معرس)وە دەگەڕایەوە بۆی، كە دەچوو بۆ مەككەش لە(ثنیة العلیا)وە دەچوو لە(ثنیة السفلی)وە لێی دەردەچوو.

### ( ٣١ ) دابەزین لەمەككە

٣٦٣ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ **(بْنِ حَارِثَةَ)** (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنْزِلُ فِي دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ فَقَالَ: "وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ". وكَانَ عَقِيلٌ ورِثَ أَبَا طَالِبٍ هُوَ

وطَالِبٌ، ولَمْ يَرِثْهُ جَعْفَرٌ ولَا عَلِيٌّ شَيْئًا لِأَنَّهُمَا كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وكَانَ عَقِيلٌ وطَالِبٌ كَافِرَيْنِ. **(بخاري/ الحج/ ١٥١١)**

(اسامەی کوڕی زید) (ﷺ) وتویەتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا دەچیتە ماڵی خۆتان لەمەککە؟ فەرموی: "بۆ (عقیل) شوێن و ماڵی بۆ هێشتوین؟" (عقیل)بەمیراتی بە(ابو طالب)ەوە لەگەڵ (طالب)ی برایدا بۆیان مابۆوە. نە(جعفر)و نە(علی) کەموسوڵمان بوون هیچ میراتیەکیان لەباوکیان وەرنەگرت، (عقیل و طالب)کە کافر بوون هەموو میراتیەکە بۆ ئەوان بووە.

## ( ٣٢ ) ڕاکردن لە تەواف و هاتووچۆی صەفاو مەروەدا

٣٦٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا طَافَ فِي الْحَجِّ والْعُمْرَةِ أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ: فَإِنَّهُ يَسْعَى ثَلَاثَةَ أَطْوَافٍ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ يَمْشِي أَرْبَعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٣٧)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) کەتەوافی دەکرد لەحەج و عەمرەدا لەسەرەتای هاتندا، سێ تەوافی بەڕاکردن بەدەوری (بيت)دا دەکرد،چوار تەوافیشی بەڕۆیشتن بەدەوریدا دەکرد، ئینجا دوو رکات نوێژی دەکرد. پاشان هاتوچۆی صەفاو مەروای دەکرد.

## ( ٣٣ ) ماچکردنی بەردە ڕەشەکە

٣٦٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ قَالَ: رَأَيْتُ الْأَصْلَعَ –يَعْنِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ)– يُقَبِّلُ الْحَجَرَ ويَقُولُ: واللَّهِ إِنِّي لَأُقَبِّلُكَ، وإِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وأَنَّكَ لَا تَضُرُّ ولَا تَنْفَعُ، ولَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَبَّلَكَ مَا قَبَّلْتُكَ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٢٠)**

(عبدالله ی کوڕی سرجس) دەڵێ: (عمر) (ﷺ)م بینی ماچی بەردە ڕەشەکە دەکات و دەڵێت: بەخوا خۆ من ماچت دەکەم و دەشزانم کەتۆ بەردێکیت و زیان و قازانجت نییە، ئەگەر پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینیایە ماچی دەکردی، منیش ماچم نەدەکردی.

## ( ٣٤ ) دەستدان لەسوچەکانی کەعبە

٣٦٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلَامَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ –الْيَمَانِيَ والْحَجَرَ– مُذْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَسْتَلِمُهُمَا، فِي شِدَّةٍ ولَا رَخَاءٍ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٢٩)**

(عبدالله ی کوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: من وازم لەدەست دان لەم دوو گۆشەیە نەهێناوە -یەمانی و بەردەکە- لەوکاتەوە کە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینیوە دەستیان لێ دەدا لەکاتی قەڵەباڵغی یان لەکاتی ئاساییدا.

٣٦٧ـ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَسْتَلِمُ غَيْرَ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٣١)**

(إبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست بدات لەهیچ شوێنێك جگە لە دوو گۆشە یەمانیەکە.

## ( ٣٥ ) تەواف بەسواری بۆ خەڵکی تر

٣٦٨ـ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنِّي أَشْتَكِي، فَقَالَ: "طُوفِي مِنْ وراء النَّاسِ وأَنْت رَاكِبَةٌ". قَالَتْ: فَطُفْتُ ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَئِذٍ يُصَلِّي إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، وهُوَ يَقْرَأُ بِـ(والطُّورِ وكِتَابٍ مَسْطُورٍ). **(بخاري/ المساجد/ ٤٥٢)**

(أم سلمه) (ﷺ) بەپێغەمبەری (ﷺ) ڕایگەیاند کەماندووم و ناساغم، فەرمووی: "لەدوای خەڵکەکەوە بەسواری تەوافی خۆت بکە" منیش تەوافم کرد، ئەوکاتە پێغەمبەر (ﷺ) لەپاڵ کەعبەدا نوێژی دەکردو (والطُّورِ وكِتَابٍ مَسْطُورٍ)ی دەخوێند.

## ( ٣٦ ) تەوافی سەفاو مەروە

٣٦٩ـ عن عُرْوَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (ﷺ): مَا أَرَى عَلَيَّ جُنَاحًا أَنْ لَا أَتَطَوَّفَ بَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ. قَالَتْ: لِمَ؟ قُلْتُ: لِأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ يَقُولُ: (إِنَّ الصَّفَا والْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) الْآيَةَ. فَقَالَتْ: لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ لَكَانَ: فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لَا يَطَّوَّفَ بِهِمَا. إِنَّمَا أُنْزِلَ هَذَا فِي أُنَاسٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، كَانُوا إِذَا أَهَلُّوا أَهَلُّوا لِمَنَاةَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَا يَحِلُّ لَهُمْ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ، فَلَمَّا قَدِمُوا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) لِلْحَجِّ ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الْآيَةَ، فَلَعَمْرِي مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا والْمَرْوَةِ. وفي رواية: ما أتم الله حج امرئ ولا عمرته لم يطف بين الصفا والمروة. **(بخاري/ العمرة/ ١٦٩٨)**

(عروه) دەڵێ: بە(عائشە)م (ﷺ) وت: من وانازانم گوناهم بگات ئەگەر تەواف لەنێوان سەفاو مەروەدا بکەم.. وتی: بۆچی؟ وتم: چونکە خوای گەورە دەفەرموێت

(بێگومان سەفاو مەروە لەدروشمەکانی خوای گەورەن). عائشە (ﷺ) وتی: ئەگەر وابوایە کەتۆ دەڵێی ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبوو: (ئەوە گوناهی ناگات ئەگەر تەوافیان نەکات). لەڕاستیدا ئەوە دەربارەی کەسانێك لە(أنصار) دابەزیوە کە ئیحرامیان لەسەردەمی نەفامیدا بۆ (مناة) دەبەست، بۆیان دروست نەبوو تەواف لەنێوان سەفاو مەروەدا بکەن. جاکاتێ لەخزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتن بۆ حەج و باسی ئەوەیان بۆ کرد، خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند، بەگیانی خۆم خوای گەورە ئەو حەجە بەتەواو دانانێت کەتەوافی نێوان سەفاو مەروەی تێدا نەبێت، لەڕیوایەتێکی تردا: خوای گەورە حەجی کەسێك یان عەمرەکەی بەتەواو دانانێت ئەگەر تەوافی سەفاو مەروەی نەکردبێت.

## (٣٧) چونە ناو کەعبە

**٣٧٠ـ** عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمَ الْفَتْحِ فَنَزَلَ بِفِنَا و الْكَعْبَةِ، وأَرْسَلَ إِلَى عُثْمَانَ بْنِ طَلْحَةَ فَجاء بِالْمِفْتَحِ فَفَتَحَ الْبَابَ، قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) وبِلَالٌ وأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ (ﷺ) وأَمَرَ بِالْبَابِ فَأُغْلِقَ، فَلَبِثُوا فِيهِ مَلِيًّا، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّه: فَبَادَرْتُ النَّاسَ فَتَلَقَّيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) خَارِجًا، وبِلَالٌ عَلَى إِثْرِه، فَقُلْتُ لِبِلَالٍ: هَلْ صَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ تِلْقَا و وجْهِهِ، قَالَ: ونَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى. **(بخاري/ الصلاة/ ٤٨٣)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی ئازادکردنی مەککە هات و چووە حەوشەی کەعبەوە، ناردی بەشوێن (عثمان ی کوڕی طلحة)داو کلیلی بۆ هێناو دەرگاکەی کردەوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (بلال و أسامەی کوڕی زید و عثمان ی کوڕی طلحة) (ر.ض) چوونە ژورەوە، فەرمانیدا کەدەرگاکە دابخرێت، ماوەیەك تیایمانەوە، پاشان دەرگاکەی کردەوە، (عبدالله) دەڵێ: من پێش خەڵکەکە گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا دەهاتە دەرەوە، (بلال)ی بەشوێنەوە بوو، وتم بە(بلال) ئایا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی تێدا کرد، وتی: بەڵێ.. وتم: لەکوێدا؟ وتی: لەنێوان هەردوو کۆڵەکەکەدا کەڕووبەڕوی بوون.ئیتر بیرم چوو لێی بپرسم: چەند نوێژی کرد؟

٣٧١ـ عن ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: قُلْتُ لعطاء: أَسَمِعْتَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّمَا أُمِرْتُمْ بِالطَّوَافِ، ولَمْ تُؤْمَرُوا بِدُخُولِهِ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنْ يَنْهَى عَنْ دُخُولِهِ، ولَكِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ:

أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمَّا دَخَلَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ حَتَّى خَرَجَ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ فِي قُبُلِ الْبَيْتِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: (هَذِهِ الْقِبْلَةُ". قُلْتُ لَهُ: مَا نَوَاحِيهَا أَفِي زَوَايَاهَا؟ قَالَ: بَلْ فِي كُلِّ قِبْلَةٍ مِنَ الْبَيْتِ. **(بخاري/ الصلاة/ ٣٨٩)**

(إبن جريج) دەڵێ: بە(عطاء)م وت: بیستوتە (إبن عباس) دەڵێ: فەرمانتان پێدراوە کەتەواف بکەن، نەك بچنە ناو کەعبەوە، پاشان ڕێگری لەچونەژورەوەی نەکرا، بەلاّم گوێم لێبوو دەیوت: (أسامەی کوڕی زید) هەواڵی داومەتێ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) چۆتە ناو کەعبەوە لەهەموو گۆشەیەکیدا نزای کردوە، نوێژی تێدا نەکردووە هەتا هاتۆتە دەرەوە، کاتێ کەدەرچوو لەپێشی کەعبەوە دووڕکات نوێژی کردوەو فەرمویەتی: "ئەمە قیبلەیە" منیش پێم وت: لاکانی کەعبە کامەیە، ئایا مەبەست گۆشەکانیەتی؟ وتی: بەڵکو هەموو بەشەکانی کەعبە (دەگرێتەوە).

## (٣٨) لبيك و الله اكبر

٣٧٢ـ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الثَّقَفِيِّ (رضي الله عنه): أَنَّهُ سَأَلَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) –وَهُمَا غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ– كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِي هَذَا الْيَوْمِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ فَقَالَ: كَانَ يُهِلُّ الْمُهِلُّ مِنَّا فَلَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ، وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ مِنَّا فَلَا يُنْكَرُ عَلَيْهِ. **(بخاري/ العيدين/ ٩٢٧)**

(محمد کوڕی أبوبکر ثقفي) (رضي الله عنه) دەڵێ: پرسیارم لە (أنس کوڕی مالك) (رضي الله عنه) کردوە لەکاتێکدا هەردووکیان لەبەیانیدا لەميناوە دەچوون بۆ عەرەفە: چیتان دەکرد کاتێك لەوڕۆژەدا لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوون؟ ئەویش وتی: هەبوو (لا إله إلا الله)ی دەووت کەس ڕەخنەی لێ نەدەگرت، هەبوو (الله أكبر) ی دەکرد، ئەویش کەس ڕەخنەی لێ نەدەگرت.

## (٣٩) (ثم أفيضوا من حيث أفاض الناس)

٣٧٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ، وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَلَمَّا جَاءَ الْإِسْلَامُ أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ (ﷺ) أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ فَيَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) (البقرة: ١٩٩). **(بخاري/ التفسير/ ٤٢٤٨)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: قورەیش و ئەوانەی لەسەر دینی ئەوان بوون لە (مزدلفە) دەوەستان، پێیان دەوتن (حمس) واتە: (شوێنی سەرسەختەکان) بەلام عەرەبەکانی تر لە (عرفە) دەوەستان، کاتێ ئیسلام هات خوای گەورە فەرمانیدا بەپێغەمبەرەکەی کەبچێت لە (عەرەفە) بوەستێت و پاشان لەوێوە دابەزێت، ئەمەیان مانای فەرمودەی خوایە (خەڵکی لەکوێوە دابەزین ئێوەش لەوێوە دابەزن).

**٣٧٤ـ عن جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (ﷺ) قَالَ: أَضْلَلْتُ بَعِيرًا لِي، فَذَهَبْتُ أَطْلُبُهُ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) واقفاً مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ، فَقُلْتُ: واللَّهِ إِنَّ هَذَا لَمِنَ الْحُمْسِ فَمَا شَأْنُهُ هَاهُنَا؟ وكَانَتْ قُرَيْشٌ تُعَدُّ مِنَ الْحُمْسِ. (بخاري/ الحج/ ١٥٨١)**

(جبیری کوڕی مطعم) (ﷺ) دەڵێ: وشترێکم ون کردبوو، ڕۆژی عەرەفە بەدوایدا دەگەڕام، پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینی لەعەرەفەدا لەگەڵ خەڵکیدا وەستا بوو، وتم بەخوا ئەمە لە (حمس)ە چی دەکات لێرە، چونکە قورەیش کۆمەڵی (حمس) بوون.

## (٤٠) بەجێهێشتنی (عەرەفە)و نوێژکردن لە (مزدلفە)

**٣٧٥ـ عن كُرَيْبٌ: أَنَّهُ سَأَلَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (ﷺ): كَيْفَ صَنَعْتُمْ حِينَ رَدِفْتَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) عَشِيَّةَ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ: جِئْنَا الشِّعْبَ الَّذِي يُنِيخُ النَّاسُ فِيهِ لِلْمَغْرِبِ، فَأَنَاخَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) نَاقَتَهُ وبَالَ –وَمَا قَالَ أَهرَاقَ الماء– ثُمَّ دَعَا بِالوضوء فَتَوَضَّأَ وضُو وا لَيسَ بِالْبَالِغِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه الصَّلَاةَ؟ فَقَالَ: "الصَّلَاةُ أَمَامَكَ". فَرَكِبَ حَتَّى جِئْنَا الْمُزْدَلِفَةَ فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ النَّاسُ فِي مَنَازِلِهِمْ ولَمْ يَحُلُّوا حَتَّى أَقَامَ الْعِشَا و الْآخِرَةَ فَصَلَّى، ثُمَّ حَلُّوا، قُلْتُ: فَكَيْفَ فَعَلْتُمْ حِينَ أَصْبَحْتُمْ؟ قَالَ: رَدِفَهُ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ، وانْطَلَقْتُ أَنَا فِي سُبَّاقِ قُرَيْشٍ عَلَى رِجْلَيَّ. (بخاري/ الوضوء/ ١٣٩)**

(کُریب) پرسیاری لە (أسامەی کوڕی زەید) (ﷺ) کرد: ئێوارەی عەرەفە کەلەپاشکۆی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بویت چیتان کرد؟ ئەویش وتی: چوین بۆ ئەو دەربەندەی کەخەڵکی لێ دادەبەزێت بۆ نوێژی شێوان، پێغەمبەر (ﷺ) وشترەکەی یخ داو دەستی بەئاو گەیاند، ئینجا داوای ئاوی کردو دەستنوێژێکی گرت و ئاوی کەم بەکارهێنا، منیش وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژ بکەین، ئەویش فەرمووی نوێژ لەبەردەمتایە، ئینجا سوار بوو هەتا گەیشتینە (مزدلفە) قامەت کرا بۆ نوێژی شێوان لەوەودوا خەڵکی لەشوێنەکانی خۆیاندا وشترەکانیان یخ دا بەلام بارەکانیان لێ نەکردنەوە هەتا قامەت بۆ نوێژی خەوتنان کراو نوێژی کرد، ئینجا بارەکانیان

داگرت، پرسیم: ئەی کاتێ کەبەیانیتان لێهات چیتان کرد؟ وتی: (فضل ی کوڕی عباس) چووە پاشکۆی و منیش لەپێشەنگی قورەیشدا بەپێ ڕۆیشتم.

### ( ٤١ ) گەڕانەوە لە( عەرەفە )

**٣٧٦ـ عَنْ عروة قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ وأَنَا شَاهِدٌ –أَوْ قَالَ: سَأَلْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (ﷺ)– وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَرْدَفَهُ مِنْ عَرَفَاتٍ: قُلْتُ كَيْفَ كَانَ يَسِيرُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حِينَ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وجَدَ فَجْوَةً نَصَّ. (بخاري/ الحج/ ١٥٨٣)**

(عروه) دەڵێ: پرسیار کراوە لە (أسامە) کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی خستبووە پاشکۆی خۆی –من خۆم شایەت بووم– پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعەرەفاتدا چۆن دەڕۆی کاتێ عەرەفەی بەجێهێشت ؟ وتی: مام ناوەندی دەڕۆیشت ئەگەر بوارێکی بەدی بکردایە خێراتر دەبوو.

### ( ٤٢ ) نوێژی مەغریب و عیشا لە ( مزدلفە )

**٣٧٧ـ عن ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بَيْنَ الْمَغْرِبِ والْعِشَا و، بِجَمْعٍ، لَيْسَ بَيْنَهُمَا سَجْدَةٌ. وصَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلَاثَ رَكَعَاتٍ، وصَلَّى الْعِشَا و رَكْعَتَيْنِ. فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّي بِجَمْعٍ كَذَلِكَ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ تَعَالَى. (بخاري/ الحج/ ١٥٨٩)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی مەغریب و عیشای کۆکردەوە بەکۆکردنەوەیەك لەنێوانیاندا نوێژی تری نەکرد، سێ ڕکات نوێژی شێوان و دوو ڕکات نوێژی خەوتنانیشی کرد، جا (عبدالله) لە (مزدلفە)دا هەر ئاوای دەکرد تاگەیشتەوە لای خوا.

### ( ٤٣ ) نوێژی بەیانی لە( مزدلفە )

**٣٧٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) صَلَّى صَلَاةً إِلَّا لِمِيقَاتِهَا إِلَّا صَلَاتَيْنِ: صَلَاةَ الْمَغْرِبِ والْعِشَا و بِجَمْعٍ، وصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا. (بخاري/ الحج/ ١٥٩٨)**

(عبدالله کوڕی مسعود) دەڵێ: پێغەمبەرم (ﷺ) نەدیوە نوێژێك بکات لەکاتی خۆیدا نەبێ جگە لەنوێژی شێوانو خەوتنان لە (مزدلفە)، نوێژی بەیانیشی پێش ئەو کاتەی جارانی کرد.

## ( ٤٤ ) دابەزین لە( مزدلفە )وە بۆ ئافرەتی کەمرەو

٣٧٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (﵂) أَنَّهَا قَالَت: اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَة تَدْفَعُ قَبْلَهُ، وقَبْلَ حَطْمَة النَّاسِ، وكَانَت (امْرَأَةً) ثَبِطَةً -يَقُولُ الْقَاسِمُ: والثَّبِطَةُ الثَّقِيلَةُ- قَالَ: فَأَذِنَ لَهَا، فَخَرَجَتْ قَبْلَ دَفْعه، وحَبَسَنَا حَتَّى أَصْبَحْنَا فَدَفَعْنَا بِدَفْعه، ولَأَنْ أَكُونَ اسْتَأْذَنْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَمَا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ، فَأَكُونَ أَدْفَعُ بِإِذْنِه، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَفْرُوحٍ بِهِ. (بخاري/ الحج/ ١٥٩٦)

(عائشه) (﵂) دەڵێ: (سوده) (﵂) مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر (ﷺ) لەشەوی (مزدلفە)دا تا پێش ئەو بڕوات، پێش ئەوەی خەڵکی قەڵەباڵغی بکەن چونکە ئافرەتێکی کەمرەو بوو، ئەویش مۆڵەتیدا، ئیتر هەتا بەیانی ئەو کەوتەڕێ خۆ ئەگەر منیش مۆڵەتم بخواستایە لە پێغەمبەر (ﷺ) وەك (سوده) بڕۆشتایەم لەهەموو شت لام خۆشتر بوو.

## ( ٤٥ ) پێشخستنی ئافرەت لە مزدلفە

٣٨٠ـ عن عَبْدُ اللَّهِ مَوْلَى اسماء قَالَ: قَالَتْ لِي اسماء (﵂) وهِيَ عِنْدَ دَارِ الْمُزْدَلِفَة: هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: لَا، فَصَلَّتْ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَتْ: يَا بُنَيَّ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَت: ارْحَلْ بِي، فَارْتَحَلْنَا حَتَّى رَمَت الْجَمْرَةَ، ثُمَّ صَلَّتْ فِي مَنْزِلِهَا، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ هَنْتَاهْ لَقَدْ غَلَّسْنَا، قَالَتْ: كَلَّا أَيْ بُنَيَّ، إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَذِنَ لِلظُّعُنِ. (بخاري/ الحج/ ١٥٩٥)

(عبدالله) کارگوزاری (اسماء) دەڵێ: (اسماء) (﵂) لەمزدلفە وە پێی وتم: ئایا مانگ ئاوا بووە؟ وتم: نەخێر، ساتێك نوێژی کرد، ئینجا وتی: ئەی کوڕی شیرینم مانگ ئاوا بووە؟ وتم: بەڵێ: وتی: کۆچم پێ بکە، کۆچمان کرد تاگەیشتینە مینا، ئەوسا بەرد بارانی (جمرە)ی کرد، پاشان نوێژی کرد لەشوێنەکەی خۆیدا.. پێم وت: پورێ بەتاریکی هاتین... فەرموی: نەخێر، ئەی کوڕم، پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتیداوە بەئافرەتان.

## ( ٤٦ ) پێشخستنی پیرو پەککەوتە

٣٨١ـ عن ابْنَ عَبَّاسٍ (﵄) قال: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي الثَّقَلِ -أَوْ قَالَ: فِي الضَّعَفَةِ- مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ. (بخاري/ الإحصار و جزا و الصيد/ ١٧٥٧)

(إبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) منى نارد لە (مزدلفە) وە لەشەودا لەناو کەم ڕەوو پەککەوتەکاندا.

٣٨٢ـ عن سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ) كَانَ يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِه، فَيَقِفُونَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِاللَّيْلِ، فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَدْفَعُونَ قَبْلَ أَنْ يَقِفَ الْإِمَامُ وَقَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ مِنًى لِصَلَاةِ الْفَجْرِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوُا الْجَمْرَةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: أَرْخَصَ فِي أُولَئِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). **(بخاري/ الحج/ ١٥٩٢)**

(سالم ی کوڕی عبدالله) دەڵێ: (عبدالله ی کوڕی عمر) (ﷺ) هەمیشە خزم وکەسی لاوازو پەککەوتەی پێش خۆی دەخست، بەشێك لەشەو لە(مشعر الحرام، مزدلفە) دەمانەوەو یادی خوایان دەکرد ئەوەندەی بۆیان بگونجایە، پێش ئەوەی ئیمام هەستێو بکەوێتەڕێ ئەوان دەڕۆیشتن هەیان بوو پێش نوێژی بەیانی دەگەیشتە مینا هەیان بوو دواتر، هەرکات گەیشتبن (جمرە)یان بەرد باران دەکرد، جا (إبن عمر) دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی ئەمانەی داوە.

## ٤٧ ) ( لبيك ) وتنى حاجى تاكاتى بەردبارانى ( جمره العقبه ) يه

٣٨٣ـ عن ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَرْدَفَ الْفَضْلَ (ﷺ) مِنْ جَمْعٍ، قَالَ: فَأَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنَّ الْفَضْلَ أَخْبَرَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٨٦)**

(إبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) (فضل)ی خستە پاشکۆی خۆی لە مزدلفە، پاشان (فضل) هەواڵی دایە کە: پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام (لبيك)ی دەووت هەتا (جمرة العقبة)ی بەرد باران کرد.

## ( ٤٨ ) بەرد بارانى ( جمره )

٣٨٤ـ عَنِ الْأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ يُوسُفَ يَقُولُ وَهُوَ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ: أَلِّفُوا الْقُرْآنَ كَمَا أَلَّفَهُ جِبْرِيلُ: السُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا النساء، وَالسُّورَةُ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا آلُ عِمْرَانَ، قَالَ: فَلَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِه، فَسَبَّهُ وَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ: أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) فَأَتَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِي، فَاسْتَعْرَضَهَا فَرَمَاهَا مِنْ بَطْنِ الْوَادِي بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ النَّاسَ يَرْمُونَهَا مِنْ فَوْقِهَا؟ فَقَالَ: هَذَا –وَالَّذِي لَا إِلَهَ غَيْرُهُ– مَقَامُ الَّذِي أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. **(بخاري/ الحج/ ١٦٦٣)**

ئەعمەش دەڵێ:گوێبیستی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بووم لە کاتێکا لەسەر مینبەر وتاری دەخوێندەوە دەیوت : قورئان رێکبخەن هەروەکو جوبرەئیل رێکی خستووە ئەو سورەتەی ناوی (البقرە)ی تیا هاتووە، ئەو سورەتەی ناوی (**النساء**) ی تیا هاتووە، ئەو سورەتەی ناوی(العمران)ی تیا هاتووە. دەڵێ:گەیشتم بە ئیبراهیمی نەخەعی ئەو قسانەی حەجاجم بۆ گێڕایەوە، ئەویش قسەی بە حەجاج وت و وتی : (عبدالرحمن کوڕی یزید) بۆی گێڕامەوە کەلەگەڵ (عبدالله ی کوڕی مسعود) (ﷺ) دا بوو بەرەو (جمرە العقبە) شۆڕ بۆوە بۆ ناوەڕاستی دۆڵەکە، لەوێوە حەوت بەردی گرتە (جمرە)و لەگەڵ هەر بەردێکدا (ألله أکبر)ی دەکرد، وتم: ئەی (أبو عبدالرحمن) خەڵکی لەسەرەوە بەردی تێدەگرن؟ وتی: سوێند بەو زاتەی جگە لەو خوایەکی تر نییە، ئەم شوێنە شوێنی ئەو کەسەیە کە سورەتی (البقرة)ی نازڵ بۆتە سەر.

## ( ٤٩ ) سەرتاشینی پێغەمبەر (ﷺ)

**٣٨٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. (بخاري/ الحج/ ١٦٤١،١٦٣٩)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەحەجیماڵئاواییدا سەری خۆی تاشی.

## ( ٥٠ ) تاشین و کورتکردنەوە

**٣٨٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ". قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّه ولِلْمُقَصِّرِينَ. قَالَ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه وَلِلْمُقَصِّرِينَ. قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ. قَالَ: "وَلِلْمُقَصِّرِينَ". (بخاري/ الحج/ ١٦٤١،١٦٣٩)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خوایە لەوانە خۆش ببە کەسەریان تاشیوە" وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە.. فەرمووی: "خوایە لەوانە خۆش ببە کەسەریان تاشیوە" وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە.. فەرمووی: "خوایە لەوانە خۆش ببە کەسەریان تاشیوە" وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە.. ئینجا فەرمووی: "لەوانەش کەکورتیان کردۆتەوە".

## ( ٥١ ) ڕەجم و قوربانیی و سەرتاشین

٣٨٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْبُدْنِ فَنَحَرَهَا، والْحَجَّامُ جَالِسٌ، وقَالَ بِيَدِهِ عَنْ رَأْسِهِ فَحَلَقَ شِقَّهُ الْأَيْمَنَ فَقَسَمَهُ فِيمَنْ يَلِيهِ، ثُمَّ قَالَ: "احْلِقِ الشِّقَّ الْآخَرَ". فَقَالَ: "أَيْنَ أَبُو طَلْحَةَ". فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ. (بخاري/ الوضوء/ ١٦٩)

(أنس ی کوڕی مالك) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرد بارانی (جمره العقبه)ی کردو ئینجا تەشریفی برد بۆ لای قوربانیەکەی و سەری بڕی، خوێنگرەکە دانیشتبوو (کەسەرتاشینیشی دەکرد) بەدەست ئاماژەی فەرموو کەلای ڕاستی سەری بتاشێ و کردی بەدوو بەشەوە (کەلای ڕاستی تەواو کرد) فەرمووی: "ئەو لاشی بتاشە".

## ( ٥٢ ) ئەوەی پێش قوربانیی سەری بتاشێ

٣٨٨ـ عن عَبْدَ اللَّه بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قالَ: وقَفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى رَاحِلَتِه، فَطَفِقَ نَاسٌ يَسْأَلُونَهُ، فَيَقُولُ الْقَائِلُ مِنْهُمْ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي لَمْ أَكُنْ أَشْعُرُ أَنَّ الرَّمْيَ قَبْلَ النَّحْرِ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ الرَّمْيِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَارْمِ ولَا حَرَجَ". قَالَ: وطَفِقَ آخَرُ يَقُولُ: إِنِّي لَمْ أَشْعُرْ أَنَّ النَّحْرَ قَبْلَ الْحَلْقِ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أن أنحر؟ فَيَقول: "انحر ولا حرج". قَالَ: فما سمعته يُسْأَلُ يَوْمَئِذٍ عَنْ أَمْرٍ مِمَّا يَنْسَى الْمَرْ و ويَجْهَلُ –مِنْ تَقْدِيمِ بَعْضِ الْأُمُورِ قَبْلَ بَعْضٍ وأَشْبَاهِهَا– إِلَّا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "افْعَلُوا ذَلِكَ ولَا حَرَجَ". (بخاري/ العلم/ ٨٣)

(عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی عاص) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر وڵاغەکەی وەستا بوو خەڵکی دەچوون پرسیاریان لێ دەکرد، یەکێکیان دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من نەمزانی کەبەردباران کردن پێش قوربانی کردنە، قوربانیم کرد پێش بەرد باران کردن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئێستا بەرد بارانەکەت بکەو قەیناکا" یەکێکی تر وتی: من نەمزانی کە قوربانی پێش سەرتاشینە، سەرم تاشی پێش قوربانی کردن، فەرموی: "قوربانییەکەت بکەو قەیناکات".. ئەوڕۆژە نەمبیست کەسێك پرسیار بکات لەوانەی کە نەیاندەزانی یان بیریان چووبوو، هەندێ شتیان پێش هەندێکی تر کردبو، پێغەمبەر (ﷺ) هەر دەیفەرموو: "ئەوە بکەو قەیناکات".

٣٨٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وأَتَاهُ رَجُلٌ يَوْمَ النَّحْرِ وهُوَ واقِفٌ عِنْدَ الْجَمْرَةِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ فَقَالَ: "ارْمِ ولَا حَرَجَ". وأَتَاهُ آخَرُ فَقَالَ: إِنِّي ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: "ارْمِ ولَا حَرَجَ". وأَتَاهُ آخَرُ فَقَالَ: إِنِّي أَفَضْتُ إِلَى الْبَيْتِ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ: "ارْمِ ولَا حَرَجَ". **(قَالَ):** فَمَا رَأَيْتُهُ سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شيءٍ إِلَّا قَالَ: "افْعَلُوا ولَا حَرَجَ". **(بخاري/ العلم/ ٨٣)**

(عبدالله ی کوڕی عمرو ی کوڕی عاص) (ﷺ) دەڵێ:گوێم له پێغەمبەر (ﷺ) بوو پیاوێك هات بۆ خزمەتی لەڕۆژی قوربانیدا، ئەو لەنزیکی (جمره العقبه)دا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من سەرم تاشی پێش ئەوەی بەرد باران بکەم؟ فەرموی: "بەرد باران بکەو قەیناکات" یەکێکی تر هات و وتی: من قوربانیەکەمم سەربڕیوە پێش ئەوەی بەرد باران بکەم؟ فەرموی: "ئێستە بەرد باران بکەو قەیناکات" یەکێکی تر هات و وتی: من چوم بۆ تەوافی (إفاضة) پێش ئەوەی بەرد باران بکەم؟ فەرموی: "ئێستە بەرد باران بکەو قەیناکات".. ئەو ڕۆژە نەمدی هیچ پرسیارێکی لێ بکرێت و نەفەرموێت: "ئەوە بکەو قەیناکات".

## ( ٥٣ ) قوربانیی دیاریکردن

٣٩٠ـ عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ زِيَاداً كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: مَنْ أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عَلَيْهِ مَا يَحْرُمُ عَلَى الْحَاجِّ حَتَّى يُنْحَرَ الْهَدْيُ، وقَدْ بَعَثْتُ بِهَدْيِي، فَاكْتُبِي إِلَيَّ بِأَمْرِكِ. قَالَتْ عَمْرَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: لَيْسَ كَمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، أَنَا فَتَلْتُ قَلَائِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدَيَّ، ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِيَدِهِ، ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِي، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) شيءٌ أَحَلَّهُ اللَّهُ لَهُ حَتَّى نُحِرَ الْهَدْيُ. **(بخاري/ الحج/ ١٦١٣)**

(عمره كچی عبدالرحمن) (ﷺ) دەڵێ: زیاد نامەی نووسی بۆ عائشه كه(عبدالله ی کوڕی عباس) (ﷺ) وتویەتی: ئەوەی قوربانییەك بڕیار بدات، چی بۆ حاجی حەرامە بۆ ئەویش حەرامە هەتا قوربانییەکە سەردەبڕێ، جا منیش قوربانیم ناردووە، وەڵامم بدەرەوە.. (عمره) دەڵێ: (عائشه) وتی: بەو شێوەیە نییە كە (إبن عباس) دەڵێ، من خۆم ملوانکەی قوربانییەکانی پێغەمبەری خوام (ﷺ) هۆنیوەتەوە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی خۆی کردوویەتیە ملیان و لەگەڵ باوکمدا هەموویانی نارد،

کەچـی هـیچ شـتێك لەوانـەی بـۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) حـەلاڵ بـوو، خـوای گـەورە لەسەری حەرام نەکرد.

### ( ٥٤ ) سواربوونی وشتری قوربـانیی

**٣٩١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَرَّةً إِلَى الْبَيْتِ غَنَمًا فَقَلَّدَهَا. (بخاري/ الحج/ ١٦١٧،١٦١٤)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان قوربانیی نارد بۆ (بیت) و ملوانکەشی کردە ملی.

**٣٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَأَى رَجُلًا يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: "ارْكَبْهَا". قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ؟ فَقَالَ: "ارْكَبْهَا وَيْلَكَ" فِي الثَّانِيَةِ أَوْ فِي الثَّالِثَةِ. (بخاري/ الحج/ ١٦٠٤)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی بینی وشترێکی قوربانی دابووە پێش خۆی، فەرمووی: "سواری ببە" کابراوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بۆ قوربانییە، فەرمووی: "سوار ببە داماو".

### ( ٥٥ ) قوربـانیی ڕەشەوڵاخ

**٣٩٣ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ عَائِشَةَ بَقَرَةً يَوْمَ النَّحْرِ. (بخاري/ الحج/ ١٦٢٣)**

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەجیاتی عائشە مانگایەکی لەجەژنی قورباندا سەربڕی.

### ( ٥٦ ) چۆنیەتی سەربڕینی وشتر

**٣٩٤ـ عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) أَتَى عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يَنْحَرُ بَدَنَتَهُ بَارِكَةً، فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً، سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ (ﷺ). (بخاري/ الحج/ ١٦٢٧)**

(زیادی کوڕی جبر) (ﷺ) دەڵێ: کە (ابن عمر) (ﷺ) پیـاوێکی بینـی وشـترەکەی بەچۆکا خستووەو خەریکە سـەری دەبـڕێ، پێـی وت: هەڵیسـێنە سـەرپێ‌و دەسـتی ببەستەو ئینجا سەری ببڕە، سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە (ﷺ).

### ( ٥٧ ) بەخشینی گۆشتی قوربـانی...

**٣٩٥ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا، وَأَنْ لَا أُعْطِيَ الْجَزَّارَ مِنْهَا، قَالَ: "نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا". (بخاري/ الحج/ ١٦٣٠)**

(علـي) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمانی پێـدام کەسەرپەرشـتی قوربانییەك بکـەم و گۆشـتەکەی و پێسـتەکەی و سـەرجلەکەی ببەخشـمەوە، هیچـی نەدەم بەقەسابەکەو فەرمووی: "ئێمە خۆمان حەقەکەی دەدەین".

## ( ٥٨ ) تەوافی ( إفاضة ) لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانداية

٣٩٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى. قَالَ نَافِعٌ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفِيضُ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيُصَلِّي الظُّهْرَ بِمِنًى، وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) فَعَلَهُ. **(بخاري/ الحج/ ١٦٤٥)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەوافی (إفاضة)ی کردووە لەیەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانـدا، پاشـان گەڕاوەتـەوەو نوێـژی نیـوەڕۆی کـردووە لـە (مینـا)، (نافع) دەڵێ: إبن عمر (هەموو جار) یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربـان تـەوافی (إفاضـة)ی دەکردو پاشان دەگەڕایەوە نوێـژی نیـوەڕۆی لـە(مینـا) دەکـردو دەیـوت: پێغەمبـەر (ﷺ) ئاوای کردووە.

## ( ٥٩ ) ئەوەی تەواف بکات ئیحرامی شکاندووە

٣٩٧ـ عن **(ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِي)** عطاء قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ) يَقُولُ: لَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ حَاجٌّ وَلَا غَيْرُ حَاجٍّ إِلَّا حَلَّ. قُلْتُ لعطاء: مِنْ أَيْنَ يَقُولُ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ) **(الحج: ٣٣)**. قَالَ: قُلْتُ: فَإِنَّ ذَلِكَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ. فَقَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ **((ﷺ))** يَقُولُ: هُوَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ وَقَبْلَهُ، وَكَانَ يَأْخُذُ ذَلِكَ مِنْ أَمْرِ النَّبِيِّ (ﷺ) حِينَ أَمَرَهُمْ أَنْ يَحِلُّوا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ. **(بخاري/ المغازي/ ٤١٣٥)**

(إبن جريج) دەڵـێ: (عطـاء) هـەواڵی پێـدام و وتـی: (إبـن عبـاس) (ﷺ) دەیـوت: هەرکەس تەواف بکات حاجی بێت یان نا ئەوە لە ئیحرام بۆتـەوە، بـە (عطـاء)م وت: بەڵگەی چییە بۆ ئەو کارە؟ ئەویش وتی: بەڵگەی ئەم ئایەتەیە (پاشـان شـوێنەکەی بۆ ماڵە دێرینەکەیە) (مەبەست کەعبەیە) وتم: جائەوە دوای عەرەفەیە؟ وتـی: (إبـن عبـاس) دەیـوت عەرەفـەو پـێش عەرەفەشـە، ئـەوەش لەفـەرمانی پێغەمبـەر (ﷺ) وەرگرتووە، کاتێ لەحەجی ماڵئاواییدا فەرمانی پێدان بەئیحرام شکاندن.

## ( ٦٠ ) ئەوەی ( نیەت )ی حەج و عەمرەی پێکەوە هێنابێت یەك تەوافی بەسە

٣٩٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّهَا حَاضَتْ بِسَرِفَ وَتَطَهَّرَتْ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يُجْزِئُ عَنْكِ طَوَافُكِ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ عَنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ". **(بخاري/ العمرة/ ١٦٩٦)**

(عائشه) (ﷺ) دەڵێ: (لەکاتی حەجەکەیدا) لەسەرف (شوێنێکە نزیك مەککە) عادەی مانگانەی بەسەردا هاتووەو لەعەرەفات پاك بۆتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووە: تەوافەکەی (صفاو مروة)ت بەسە بۆ حەج و عەمرەکەت.

## ( ٦١ ) ئەوەی ئیحرام بە حەج و عەمرە ببەستێ کەی دەیشکێنێ؟

**٣٩٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، ومِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وعُمْرَةٍ، ومِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَحَلَّ، وأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ والْعُمْرَةَ فَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ. (بخاري/ الحج/ ١٤٨٧)**

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووم لەساڵی حەجی ماڵئاواییدا چووین بۆ حەج، هەمانبوو نیەتی عەمرەی هێنا بوو، هەمانبوو نیەتی حەج و عەمرەی هێنا بوو، هەمانبوو تەنها نیەتی حەجی هێنا بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نیەتی حەجی هێنا بوو، جائەوەی نیەتی بەعەمرە هێنا بوو (پاش بەجێهێنانی عەمرەکە) ئیحرامی شکاند، بەڵام ئەوەی نیەتی بەحەج یان نیەتی حەج و عەمرەی هێنا بوو ئیحرامیان نەشکاند، هەتا ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان.

**٤٠٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: نُزُولُ الْأَبْطَحِ لَيْسَ بِسُنَّةٍ، إِنَّمَا نَزَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَنَّهُ كَانَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ إِذَا خَرَجَ. (بخاري/ الحج/ ١٦٧٦)**

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: دابەزین لە (أبطح) سوننەت نییە، پێغەمبەر (ﷺ) دابەزیی و لایدا چونکە لەوێوە دەرچوونی ئاسانتر بوو.

**٤٠١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ونَحْنُ بِمِنًى: "نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ" وذَلِكَ إِنَّ قُرَيْشًا وبَنِي كِنَانَةَ تَحَالَفَتْ عَلَى بَنِي هَاشِمٍ وبَنِي الْمُطَّلِبِ: أَنْ لَا يُنَاكِحُوهُمْ ولَا يُبَايِعُوهُمْ حَتَّى يُسْلِمُوا إِلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، يَعْنِي بِذَلِكَ الْمُحَصَّبَ. (بخاري/ الحج/ ١٥١٣)**

(أبو هريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (مینا) پێی وتین ئێمە سبەینێ لە(طيف)ی (بنو كنانة) لادەدەین، لەو شوێنەدا کەلەسەر کوفرو دژایەتی پەیمانیان بەست، ئەویش بەوەی کە قورەیش و (بنو كنانە) پەیمانیان بەست دژی (بنو هاشم) و (بنو عبدالمطلب) کەژن و ژنخوازی و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەسلیم نەکەن.

## ( ٦٢ ) مانەوە بۆ ئاوگێڕان لە مەککەدا

٤٠٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (ﷺ) اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِي مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٥٣)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: (عباس ی کوڕی عبدالمطلب) مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرت کەئەو شەوانەی حاجی لە(مینا)یە ئەو لە مەککە بێت لەبەر ئاوگێڕانەکەی، ئەویش مۆڵەتیدا.

## ( ٦٣ ) مانەوەی حاجی لەمەککە دوای حەج و عەمرە

٤٠٣ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَقُولُ لِجُلَسَائِهِ: مَا سَمِعْتُمْ فِي سُكْنَى مَكَّةَ؟ فَقَالَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ: سَمِعْتُ الْعَلاءَ -أَوْ قَالَ: الْعَلاءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ- قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يُقِيمُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ قَضَا وِ نُسُكِهِ ثَلَاثًا". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٧١٨)**

(عبدالرحمن کوڕی حُمید) دەڵێ: گوێم لە (عمری کوڕی عبدالعزیز) بوو بەهاونشینانی خۆی دەوت: چیتان بیستووە دەربارەی مانەوە لەمەککەدا؟ (سائبی کوڕی یزید) لەوەڵامدا وتی: بیستومە لە (علاء ی کوڕی حضرمي) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: حاجی دوای بەجێهێنانی سروتەکانی (مناسك) حەج سێ ڕۆژ دەمێنێتەوە.

## ( ٦٤ ) ئەو ئافرەتەی دەکەوێتە بێنوێژی پێش تەوافی خواحافیزی

٤٠٤ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ (ﷺ) بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَذَكَرْتُ حِيضَتَهَا لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَحَابِسَتُنَا هِيَ". قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَفَاضَتْ وَطَافَتْ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَاضَتْ بَعْدَ الْإِفَاضَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَلْتَنْفِرْ". **(بخاري/ الحج/ ١٦٤٦)**

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: (صفیە کچی حیی) دوای تەوافی (إفاضة) کەوتە بێنوێژیەوە، عائشە دەڵێ: منیش باسی بێ نوێژیەکەیم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: تۆ بڵێی گیرمان نەدا منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەوافی (إفاضة)ی کردووە، تەوافی (بیت)ی کردووە دوای ئەوە کەوتۆتە بێنوێژیەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "کەواتە بابڕوات".

٤٠٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ. (بخاري/ الحج/ ١٦٦٨)

(إبن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: فەرماندرا بەخەڵكی كە كۆتا سروتیان تەوافی (كەعبە) بێت، بەڵام مۆڵەت دراوە بەئافرەتی بێ نوێژ.

## ( ٦٥ ) عەمرە دروستە لە مانگەكانی حەجدا

٤٠٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الْعُمْرَةَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِي الْأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَرًا، وَيَقُولُونَ: إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَا الْأَثَرْ. وَانْسَلَخَ صَفَرْ، حَلَّتِ الْعُمْرَةُ لِمَنِ اعْتَمَرْ. فَقَدِمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذَلِكَ عِنْدَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَيُّ الْحِلِّ؟ قَالَ: "الْحِلُّ كُلُّهُ". (بخاري/ الحج/ ١٤٨٩)

(إبن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: (قورەیش) عەمرەیان لەمانگەكانی حەج دا بەگوناهێكی گەورە لەسەر زەویدا دەدایە قەڵەم، مانگی (محرم)یان دەكرد بە (صفر)و دەیانووت: ئەگەر زامی پشتی وشترەكان چاك بۆوەو ئاسەواری نەماو (صفر) تێپەڕی، عەمرە دروستە بۆ ئەو كەسەی دەیەوێت عەمرە بكات، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی هاتن و سەرلەبەیانی چوارەمی (ذی الحجة) ئیحرامیان بۆ حەج بەست، كەچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێدان كەبیكەن بەعەمرە (قورەیش) ئەمەیان زۆر بە (داهێنراوێكی) گەورە زانی، بۆیە وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چیمان بۆ حەڵاڵ دەبێت بەم ئیحرام شكاندنە؟ فەرمووی: "هەموو شتێكتان بۆ حەڵاڵە".

## ( ٦٦ ) خێری عەمرە لە رەمەزاندا

٤٠٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهَا أُمُّ سِنَانٍ: "مَا مَنَعَكِ أَنْ تَكُونِي حَجَجْتِ مَعَنَا". قَالَتْ: نَاضِحَانِ كَانَا لِأَبِي فُلَانٍ -زَوْجِهَا- حَجَّ هُوَ وَابْنُهُ عَلَى أَحَدِهِمَا، وَكَانَ الْآخَرُ يَسْقِي عَلَيْهِ غُلَامُنَا نَخلاً لَنا. قَالَ: "فَعُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً أَوْ حَجَّةً مَعِي". (بخاري/ العمرة/ ١٦٩٠)

(إبن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەئافرەتێكی (أنصار)ی كەپێی دەوترا (أم سنان) فەرمووی: "چی رێی لێ گرتی كەحەجت نەكرد لەگەڵماندا؟" ئەویش وتی: دوو وشترە ئاوكێشەكەی باوكی فلانەكەس -مەبەستی مێردەكەی بوو- چونكە ئەو خۆی و كوڕەكەی بەسواری یەكێكیان حەجیان كرد، ئەوی تریش كارگوزارەكەمان ئاوی دارخورماكانی پێدەدا، فەرمووی: "عەمرەیەك لەڕەمەزاندا جێی حەجێك یاخود حەجێك لەگەڵ مندا دەگرێتەوە".

## ( ٦٧ ) پێغەمبەر (ﷺ) چەند حەجی کردووە؟

٤٠٨ـ عَنْ أَبِي إِسْحَقَ قَالَ: سَأَلْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ: كَمْ غَزَوْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ. قَالَ: وحَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) غَزَا تِسْعَ عَشْرَةَ، وأَنَّهُ حَجَّ بَعْدَ مَا هَاجَرَ حَجَّةً واحِدَةً حَجَّةَ الْوَدَاعِ. قَالَ أَبُو إِسْحَقَ: وبِمَكَّةَ أُخْرَى. **(بخاري/ المغازي/ ٤١٤٢)**

(أبو إسحاق) دەڵێ: پرسیارم لەزەیدی کوڕی أرقم کرد: چەند غـەزات لەخزمـەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردووە؟ ئەویش وتی: حەڤدە، ئینجا زەید وتـی: پێغەمبـەری خوا (ﷺ) نۆزدە غەزای کردووەو دوای هیجرەتیش تەنها حـەجێکی کـردووە ئـەویش حەجی ماڵئاواییە.

## ٦٨ ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند عەمرەی کردووە؟

٤٠٩ـ عن أَنَس (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ كُلُّهُنَّ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، إِلَّا الَّتِي مَعَ حَجَّتِهِ: عُمْرَةً مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ –أَوْ: زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ– فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وعُمْرَةً مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وعُمْرَةً مِنْ جِعْرَانَةَ حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ فِي ذِي الْقَعْدَةِ، وعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِهِ. **(بخاري/ العمرة/ ١٦٨٨)**

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوار عەمرەی کردووەو هـەموویان لـە (ذو العقـدة)دا بـووە، جگـە لـەوەی کەلەگـەڵ حەجەکەیـدا بـوو، عەمرەیـەك لەحودەیبیـەوە، عەمرەیـەك لەسـاڵی دواتـر، عـەمرەی (جعرانـە)ش کـاتێ کـە دەستکەوتەکانی دابەش کرد، عەمرەیەکیش لەگەڵ حەجەکەیدا.

## ( ٦٩ ) سەر کورتکردنەوە لە عەمرەدا

٤١٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (رضي الله عنه) أَخْبَرَهُ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِمِشْقَصٍ وهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. أَوْ: رَأَيْتُهُ يُقَصَّرُ عَنْهُ بِمِشْقَصٍ وهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. **(بخاري/ الحج/ ١٦٤٣)**

(إبن عبـاس) (رضي الله عنه) دەڵـێ: معاویـەی کـوڕی أبـو سـفیان (رضي الله عنه) هـەواڵی داوە کـە: بەمقەست هەندێ مووم بڕی لەسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (مروە)دا.

**٤١١ـ** عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَصْدُرُ النَّاسُ بِنُسُكَيْنِ، وأَصْدُرُ بِنُسُكٍ واحِدٍ؟ قَالَ: "انْتَظِرِي، فَإِذَا طَهَرْتِ فَاخْرُجِي إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهِلِّي مِنْهُ، ثُمَّ

الْقَيْنَا عِنْدَ كَذَا وكَذَا –قَالَ: أَظُنُّهُ قَالَ: غَدًا– ولَكِنَّهَا عَلَى قَدْرِ نَصَبِكِ، أَوْ قَالَ: نَفَقَتِكِ". **(بخاري/ العمرة/ ١٦٩٥)**

دایکی ئیمانداران (ﷺ) دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەڵك گەڕانەوەو دوو فەرزیان بەجێ هێنا، بەڵام من دەگەڕێمەوەو تەنها یەك فەرزم بەجێهێنا؟ فەرمووی: "چاوەڕێ بکە، هەرکات پاك بویتەوە، بچۆ بۆ (تنعیم)و لەوێوە ئیحرام ببەستە پاشان پێمان بگە لە فلان شوێن، بەڵام پاداشت بەگوێرەی ماندوو بوون یان فەرمووی: بەگوێرەی پارە خەرج کردنەکەتە".

## (٧٠) نزای گەڕانەوە لە سەفەر

**٤١٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا قَفَلَ مِنَ الْجُيُوشِ، أَوِ السَّرَايَا أَوِ الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ، إِذَا أَوْفَى عَلَى ثَنِيَّةٍ أَوْ فَدْفَدٍ كَبَّرَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ ولَهُ الْحَمْدُ، وهُوَ عَلَى كُلِّ شيءٍ قَدِيرٌ. آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وعْدَهُ، ونَصَرَ عَبْدَهُ، وهَزَمَ الْأَحْزَابَ وحْدَهُ". (بخاري/ العمرة/ ١٧٠٣)**

(عبدالله کوڕی عومەر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ لەگەڵ لەشکر، یان پۆلێك جەنگاوەر، یان لەحەج، یان عەمرە دەگەڕایەوە دەگەیشتە سەربەرزیەك یان تەپۆڵکەیەك سێ جار الله اکبری دەکرد و دەیفەرموو: "لا الـه إلا الله وحده لا شريك له، له الملك ولَه الحمد وهو على كل شيء قدير، آيبون، تائبون، عابدون، ساجدون، لربنا حامدون، صدق الله وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده" واتا: هیچ خوایەك نییە جگە لە الله، تاك و تەنهایە، خاوەنداریەتی هەر بۆ ئەوە، سوپاس و ستایش هەر شایستەی ئەوە، هەر ئەو زاتە دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، گەڕاینەوە بەتەوبەکاری و بەندایەتی و سوژدەوە، لەبۆ پەروەردگاریشمان سوپاس گوزارین، خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەڕاست و دروست بردەسەر، بەندەی خۆی سەرخست، هەرخۆیشی هەموو دەستە و گروپ و تاقمەکانی لەناوبرد.

**٤١٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِي بِذِي الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا. وكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ. (بخاري/ الحج/ ١٤٥٩)**

(عبدالله ی کوڕی عومەر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (بطحاء) ی (ذو الحليفة) لایداو نوێژی لێ کرد، ڕاوی دەڵێ: (ابن عمر)یش ئەمەی کرد.

٤١٤ـ عن ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ وهُوَ فِي مُعَرَّسِهِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ فِي بَطْنِ الْوَادِي، فَقِيلَ: إِنَّكَ بِبطحاء مُبَارَكَةٍ. قَالَ مُوسَى: وقَدْ أَنَاخَ بِنَا سَالِمٌ بِالْمُنَاخِ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُنِيخُ بِهِ، يَتَحَرَّى مُعَرَّسَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وهُوَ أَسْفَلُ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِي بِبَطْنِ الْوَادِي، بَيْنَهُ وبَيْنَ الْقِبْلَةِ وسَطًا مِنْ ذَلِكَ. **(بخاري/ الحج/ ١٤٦٢)**

(ابن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: هەندێك هاتن بۆ خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) لەکاتێکـدا ئـەو لەهەوارگەکەیدا بوو لەشیوی (ذوالحلیفة) پێی وترا: تۆ لە –بطحاء–ێکـی پیرۆزدایـت (موسی ی ڕاوی) دەڵێ: سالم دایبەزانین لەو شوێنەدا کە (عبدالله) تیایدا دادەبـەزی، دەگەڕا بەشوێن هەوارگەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) کەلەخوار مزگەوتەکەوە بـوو لـەنێوان مزگەوت و قیبلەی شیوەکەدا.

## ( ٧١ ) ڕاو و داربڕین حەرامە لە مەککەدا

٤١٥ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَكَّةَ، قَامَ فِي النَّاسِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ، وسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ (ﷺ) والْمُؤْمِنِينَ، وإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ كَانَ قَبْلِي، وإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ بَعْدِي، فَلَا يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، ولَا يُخْتَلَى شَوْكُهَا، ولَا تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلَّا لِمُنْشِدٍ، ومَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُفْدَى وإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ". فَقَالَ الْعَبَّاسُ: إِلَّا الْإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي قُبُورِنَا وبُيُوتِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) "إِلَّا الْإِذْخِرَ". فَقَامَ أَبُو شَاهٍ –رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ– فَقَالَ: اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اكْتُبُوا لِأَبِي شَاهٍ". قَالَ الْوَلِيدُ: فَقُلْتُ لِلْأَوْزَاعِيِّ: مَا قَوْلُهُ: اكْتُبُوا لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: هَذِهِ الْخُطْبَةَ الَّتِي سَمِعَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). **(بخاري/ اللقطة/ ٢٣٠٢)**

(ابو هریرە) (رضي الله عنه) دەڵێ: کاتێك خوای گەورە ڕزگارکردنی مەککەی بەخشی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەستایە سەرپێ لەناو خەڵکیدا و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و پاشان فەرمووی: "خوای گەورە فیلەکانی گرتەوە لەمەککە پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانی دەستەلاتدار کرد بەسەریدا بێ گومان بۆ هیچ کەس پێش من حەلاڵ نەبووە بجەنگێ تیایدا بەلاَم لەساتێکی ڕۆژدا جەنگاندن بۆ من حەلاڵە".

## ( ٧٢ ) (حجری ئیسماعی )و دەرگای کەعبە

٤١٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْجَدْرِ، أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: "نَعَمْ". قُلْتُ: فَلِمَ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِي الْبَيْتِ؟ قَالَ: "إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ". قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: "فَعَلَ ذَلِكِ قَوْمُكِ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَا ووا ويَمْنَعُوا مَنْ شَا ووا، ولَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَخَافُ أَنْ تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ، لَنَظَرْتُ أَنْ أُدْخِلَ الْجَدْرَ فِي الْبَيْتِ، وأَنْ أُلْزِقَ بَابَهُ بِالْأَرْضِ". (بخاري/ الحج/ ١٥٠٧)

(عائشه) (رضي الله عنها) دەڵێ: پرسیارمکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا (حجری ئیسماعیل) بەشێکە لە (بیت)؟ فەرمووی: "بەڵێ" وتم: ئەی بۆ نەیانخستۆتە سەر (بیت)؟ فەرمووی: "ئەوە خزمەکانت وایان کردووە تا کێیان بوێ بیکەنە ژورەوە، کێیان بوێ نەیەڵن، جا ئەگەر خزمەکانت لەسەردەمی نەفامیەوە نزیک نەبونایە کە دەترسم پێیان ناخۆش بێت لەوانە بوو دیوارەکە بخەمە سەر (بیت) دەرگاکەشی ڕێکی زەوی بکەم".

## ( ٧٣ ) دەربارەی دروستکردنەوەی کەعبە

٤١٧ـ عَنْ عطاء قَالَ: لَمَّا احْتَرَقَ الْبَيْتُ زَمَنَ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ حِينَ غَزَاهَا أَهْلُ الشَّامِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ، تَرَكَهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ حَتَّى قَدِمَ النَّاسُ الْمَوْسِمَ يُرِيدُ أَنْ يُجَرِّئَهُمْ —أَوْ يُحَرِّبَهُمْ— عَلَى أَهْلِ الشَّامِ، فَلَمَّا صَدَرَ النَّاسُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي الْكَعْبَةِ، أَنْقُضُهَا ثُمَّ أَبْنِي بِنَا وهَا، أَوْ أُصْلِحُ ماءهَى مِنْهَا؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإِنِّي قَدْ فُرِقَ لِي رَأْيٌ فِيهَا، أَرَى أَنْ تُصْلِحَ ماءهَى مِنْهَا، وتَدَعَ بَيْتًا أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وأَحْجَارًا أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهَا، وبُعِثَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (ﷺ). فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: لَوْ كَانَ أَحَدُكُمُ احْتَرَقَ بَيْتُهُ مَا رَضِيَ حَتَّى يُجِدَّهُ، فَكَيْفَ بَيْتُ رَبِّكُمْ؟ إِنِّي مُسْتَخِيرٌ رَبِّي ثَلَاثًا، ثُمَّ عَازِمٌ عَلَى أَمْرِي. فَلَمَّا مَضَى الثَّلَاثُ أَجْمَعَ رَأْيَهُ عَلَى أَنْ يَنْقُضَهَا، فَتَحَامَاهُ النَّاسُ أَنْ يَنْزِلَ بِأَوَّلِ النَّاسِ يَصْعَدُ فِيهِ أَمْرٌ مِنَ السماء، حَتَّى صَعِدَهُ رَجُلٌ، فَأَلْقَى مِنْهُ حِجَارَةً، فَلَمَّا لَمْ يَرَهُ النَّاسُ أَصَابَهُ شَيْء تَتَابَعُوا فَنَقَضُوهُ حَتَّى بَلَغُوا بِهِ الْأَرْضَ، فَجَعَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ أَعْمِدَةً فَسَتَّرَ عَلَيْهَا السُّتُورَ حَتَّى ارْتَفَعَ بِنَاؤُهُ. وقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: إِنِّي سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) تَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "لَوْلَا أَنَّ النَّاسَ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، ولَيْسَ عِنْدِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يُقَوِّي عَلَى بِنَائِهِ، لَكُنْتُ أَدْخَلْتُ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ خَمْسَ أَذْرُعٍ، ولَجَعَلْتُ لَهَا بَابًا يَدْخُلُ النَّاسُ مِنْهُ، وبَابًا يَخْرُجُونَ مِنْهُ". قَالَ: فَأَنَا الْيَوْمَ أَجِدُ مَا أُنْفِقُ، ولَسْتُ أَخَافُ النَّاسَ. قَالَ:

فَزَادَ فِيهِ خَمْسَ أَذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ حَتَّى أَبْدَى أُسًّا نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، فَبَنَى عَلَيْهِ الْبِنَا و، وكَانَ طُولُ الْكَعْبَةِ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا زَادَ فِيهِ اسْتَقْصَرَهُ، فَزَادَ فِي طُولِهِ عَشْرَ أَذْرُعٍ، وجَعَلَ لَهُ بَابَيْنِ، أَحَدُهُمَا يُدْخَلُ مِنْهُ والْآخَرُ يُخْرَجُ مِنْهُ، فَلَمَّا قُتِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ كَتَبَ الْحَجَّاجُ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُخْبِرُهُ بِذَلِكَ، ويُخْبِرُهُ أَنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ قَدْ وضَعَ الْبِنَا و عَلَى أُسٍّ نَظَرَ إِلَيْهِ الْعُدُولُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ الْمَلِكِ: إِنَّا لَسْنَا مِنْ تَلْطِيخِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي شَيْءٍ، أَمَّا مَا زَادَ فِي طُولِهِ فَأَقِرَّهُ، وأَمَّا مَا زَادَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ فَرُدَّهُ إِلَى بِنَائِهِ، وسُدَّ الْبَابَ الَّذِي فَتَحَهُ. فَنَقَضَهُ وأَعَادَهُ إِلَى بِنَائِهِ. **(بخاري/ الحج/ ١٥٠٩)**

(عطاء) دەڵێ: کاتێ خەڵکی شام هێرشیان کردەسەر (بیت) لەسەردەمی یەزیدی کوڕی معاویەدا سوتا و ئەوەی بەسەر هات، کەبەسەری هات، (ابن الزبیر) وازی هێنا هەتا خەڵکی هاتن بۆ حەج دەیویست هانیان بدات بۆ ئەوەی بجەنگن دژی خەڵکی شام، کاتێ خەڵکی ویستیان بگەڕێنەوە وتی: خەڵکینە چی بکەین بۆ کەعبە ئایا تێکی بدەم و پاشان دروستی بکەمەوە، یان ئەوەی ڕوخاوە چاکی بکەمەوە؟ (ابن عباس) وتی: من ڕایەکم هەیە لەو کارەدا، من وای بەباش دەزانم کەئەوەی ڕوخاوە چاکی بکەیتەوە واز لە (بیت) و ئەو بەردانە بێنی کە لەسەرەتای موسڵمان بوونی خەڵکەوە بوون، لەسەرەتای هاتنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بوون، (ابن الزبیر) وتی: ئەگەر کەسێکتان ماڵی بسوتێ بە تازە کردنەوەی نەبێت ڕازی نابێت، خۆئەمە ماڵی پەروەردگاریشتانە من سێ ڕۆژ لەسەر یەك (استخارە) دەکەم ئەوسا بڕیاری خۆم دەدەم. کاتێ سێ ڕۆژ تێپەڕی بڕیاریدا کە تێکی بدات، خەڵکی خۆیان پاراست و ترسان لەوەی یەکەم کەس دەچێتە سەر کەعبە، بەلایەکی لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێت، هەتا پیاوێك سەرکەوتە سەری و بەردێکی لێ فڕێدا، کاتێ خەڵکی بینیان هیچی لێ نەهات بەشوێن یەکدا دەست بەکاربون هەتا تەختیان کرد لەگەڵ زەویدا، (ابن الزبیر) کۆڵەکەی هێنا و پەردەی پیادان هەتا دیوارەکانی بەرزبۆوە، (ابن الزبیر) دەڵێ: من بیستومە لە عائشە (ﷺ) دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "ئەگەر خەڵکی لە کوفرەوە نزیك نەبونایە، ئەوەندەش پارەم نییە بۆ ئەم ڕۆژەم کە پێی دروست بکەمەوە، ئەگینا پێنج باڵم لەلای (حجر)ەوە دەخستە سەری، دەرگایەکم بۆ دروست دەکرد کە خەڵکی لێوەی بچنە ژورەوە و دەرگایەکیش کە لێی بچنەدەرەوە" ئینجاوتی: من ئەمڕۆ ئەوەندەم هەیە خەرجی بکەم، لە خەڵکیش

ناترسم ئیتر پێنج باڵی لە (حجر)ی ئیسماعیل خستە سەری وهەڵی کەند هەتا بناغەی دەرکەوت، خەڵك بینیان و لەسەر ئەوە دیواری درست کرد،درێژی کەعبە ١٨ گەزبوو، کاتێ پانتاییەکەی زیاد کرد بەرزیەکەی بەکەم دەهاتە پێش چاو بۆیە ١٠ گەزی خستەسەر بەرزیەکەی. دودەرگاشی بۆ کرد یەکێکیان بۆ چونە ژورەوە و ئەوی تریان بۆ چونە دەرەوە، کاتێ کە (ابن الزبیر) شەهید کرا (حجاج) نوسی بۆ (عبدالملك ی کوڕی مروان) و هەواڵی دایەو پێی وت کە (ابن الزبیر) بناغەی (بیت) ی داناوە و پرس و ڕای کردوە بە پیاوماقولآنی مەککە.. (عبدالملك) وتی: ئێمە لەگەڵ کاری نادروستی (ابن الزبیر)دا نین ئەوەی لە بەرزیەکەی خستویەتە سەری ئەوە بڕیاری لەسەر بدە ئەوەش کەلە (حجر) خستویەتە سەری وەکو خۆی لێ بکەرەوە، ئەو دەرگایەش داخە کە کردویەتییەوە، ئیتر (حجاج) هەڵی وەشاندەوە و وەکو خۆی لێ کردەوە.

## ( ٧٤ ) ڕێزداریی مەدینە

**٤١٨ـ عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ ودَعَا لِأَهْلِهَا، وإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَمَا حَرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وإِنِّي دَعَوْتُ فِي صَاعِهَا ومُدِّهَا بِمِثْلَيْ مَا دَعَا بِهِ إِبْرَاهِيمُ لِأَهْلِ مَكَّةَ". (بخاري/ البيوع/ ٢٠٢٢)**

(عبدالله ی کوڕی زید) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بێ گومان ابراهیم شەڕ و ئاشوبی لە مەککەدا حەرام کرد و نزای خێری بۆ خەڵکەکەی کرد منیش جەنگ و ئاشوب لە مەدینەدا حەرام دەکەم وەك چۆن ابراهیم لە مەککەدا حەرامی کرد، دەپاڕێمەوە بۆ مەن و شتی (کێشان و پێوانی) دوئەوەندەی ابراهیم کەدەپاڕایەوە بۆ خەڵکی مەککە".

**٤١٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَيْ مَا بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨٦)**

(انس ی کوڕی مالیك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "...ئەی خوایە دووئەوەندەی مەککە بەرەکەت بڕژێنە بەسەر مەدینەدا".

**٤٢٠ـ عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَطَبَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) فَقَالَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَؤُهُ إِلَّا كِتَابَ اللَّهِ وهَذِهِ الصَّحِيفَةَ –قَالَ: وصَحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فِي**

قراب سَيْفه- فَقَدْ كَذَبَ، فيهَا أَسْنَانُ الْإِبلِ واشياء منَ الْجرَاحَات، وفيهَا: قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "الْمَدينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ، فَمَنْ أَحْدَثَ فيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا، فَعَلَيْه لَعْنَةُ اللَّه والْمَلَائِكَة والنَّاسِ أَجْمَعينَ، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ منْهُ يَوْمَ الْقيَامَة صَرْفًا ولَا عَدْلًا. وذمَّةُ الْمُسْلمينَ واحدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ. ومَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيه، أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَاليه، فَعَلَيْه لَعْنَةُ اللَّه والْمَلَائِكَة والنَّاسِ أَجْمَعينَ، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ منْهُ يَوْمَ الْقيَامَة صَرْفًا ولَا عَدْلًا". (بخاري/ الاعتصام ابالكتاب و السنة/ ٦٨٧٠)

(ابراهيم التيمى) لەباوكيەوە دەگێڕێتەوە: (عەلى كوڕى ابو طالب) (ﷺ) وتارى بۆ داين و وتى: هەركەس وا گومان بەرێت كە ئێمە شتێكمان لايە دەيخوێنينەوە جگەلە قورئانەكەى خوا و ئەم پەڕەيەش -كەپەڕيەك بوو پێچرا بوو بە كێلانى شمشێرەكەيەوە-ئەوە درۆ دەكات، ئەو پەڕەيەش باسى تەمەنى وشترى لە خوێندا دراوو خوێنى هەندێ برين دەكات، تيايشا هاتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: "مەدينە حەرامە (جەنگ و ئاژاوە تيايدا) لە (عير)ەوە بۆ (ثور) (دوو چيان لەملاو ئەولاى مەدينەدا) ئەوەى كارێكى نادروستى تێدا بكات، يان جێگەى كەسێكى خراپى تيا بكاتەوە ئەوە نەفرينى خوا و فريشتەكان و هەموو خەڵكى لەسەر بێت، خواى گەورە تەوبەو فيديەى لێ وەرناگرێت، موسڵمانان هەموو يەك پارچەن، كەمترينيان ڕێزدارە لاى هەمويان و خاوەنى بڕيارە، هەركەس خۆى بكات بەكوڕى كەسێكى تر جگە لە باوكى يان پاڵ بدات بە هۆزێكى ترەوە جگە لە هۆزەكەى خۆى. ئەويش نەفرينى خوا و فريشتەكان و هەموو خەڵكى لەسەرە، لەڕۆژى قيامەتدا پەشيمانى و فيديەى لێ وەرناگيرێت".

٤٢١ـ عَنْ عَائشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَدمْنَا الْمَدينَةَ وهيَ وبِيئَةٌ، فَاشْتَكَى أَبُو بَكْرٍ واشْتَكَى بلَالٌ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) شَكْوَى أَصْحَابِه قَالَ: "اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، وصَحِّحْهَا، وبَارِكْ لَنَا فِي صَاعهَا ومُدِّهَا، وحَوِّلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَة". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٩٠)

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: هاتينە مەدينە نەخۆشى تيا بلاَوبوو، ابوبكرو بلال سكالاَيان كرد، كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) سكالاَى هاوەڵەكانى بينى فەرمووى: "خوايە گيان مەدينەمان لا شيرين بكە وەك چۆن مەككەت لا شيرين كردوين، يان زياتريش،

هەروەها بۆمان پاك بكەرەوە لە نەخۆشیو بەرەكەت بخەرە ناو مەن و مشتییەوە بۆمان، بەلاكەشی بگوێزەرەوە بۆ "جحفە".

### ( ٧٥ ) تاعون و دەجال ناچنە مەدینە

٤٢٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلَائِكَةٌ، لَا يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ ولَا الدَّجَّالُ". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨١)

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لەسەر ڕێگاكانی مەدینە چەندەها فریشتە هەن، بۆیە تاعون و دەجال ڕووی تێ ناكەن".

### ( ٧٦ ) هاندان بۆ مانەوە لەمەدینەدا

٤٢٣ـ عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِي زُهَيْرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "يُفْتَحُ الْيَمَنُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ ومَنْ أَطَاعَهُمْ، والْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ. ثُمَّ يُفْتَحُ الشَّامُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ ومَنْ أَطَاعَهُمْ، والْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ. ثُمَّ يُفْتَحُ الْعِرَاقُ، فَيَأْتِي قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ ومَنْ أَطَاعَهُمْ، والْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٧٦)

(سفیانی كوڕی زهیر) (ﷺ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو: "یەمەن ئازاد دەكرێت، خەڵكێك لەمەدینە كۆچ دەكەن بەوشترو ئاژەڵەكانیان و كەس و كاریان، هەركەس بەقسەیان بكات دەیبەن لەگەڵ خۆیان، مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بزانن ، پاشان شام ئازاد دەكرێت، خەڵكێكی تر وشترو ئاژەڵەكانیان دەدەنە بەرو كەس و كارو هەركەس بەگوێیان بكات دەیبەن لەگەڵ خۆیان، مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بیانزانیایە، دوای ئەوە عێراق ئازاد دەكرێت، خەڵكێكی تر وشترو ئاژەڵەكانیان دەدەنە بەرو كەس و كارو هەركەس بەقسەیان بكات ئەیبەن لەگەڵ خۆیان، مەدینە چاكترە بۆیان ئەگەر بیانزانیایە"

### ٧٧ ) كاتێ مەدینە چۆڵ دەبێت

٤٢٤ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ، لَا يَغْشَاهَا إِلَّا الْعَوَافِي -يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ والطَّيْرِ- ثُمَّ يَخْرُجُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ، يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا فَيَجِدَانِهَا وحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وجُوهِهِمَا". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٧٥)

(أبـو هريـره) (ﷺ) دەڵـێ: بیسـتومە لـە پێغەمبـەری خـواوە (ﷺ) دەیفـەرموو: خەڵكی مەدینـە جێدەهێڵن لەچاكترین بارودۆخیدا، كـەس ڕووی تێناكـات –مەگـەر درندەو باڵندە نەبێت– پاشان دوو شوانی هۆزی مزینـە بـەهات و هـاوار مـەڕەكانیان دەدەنە بـەرو بـەرەو مەدینـە دەڕۆن، دەبینـن چـۆڵ و هۆڵـە، كـاتێ دەگەنـە (ثنیـة الوداع) دەكەون بەڕوداو دەمرن".

## ( ٧٨ ) نێوان ئارامگاو مینبەر باخچەیەكە لەباخچەكانی بەهەشت

**٤٢٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَا بَيْنَ بَيْتِي ومِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، ومِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي". (بخاري/ التوع/ ١١٣٨)**

(أبـو هريـره) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: "نێـوان ماڵەكـەم و مینبەرەكـەم باخچـەیەكە لەباخچـەكانی بەهەشـت، مینبەرەكەشـم لەسـەر حەوزەكەمە".

## ( ٧٩ ) بنەو بارگە مە پێچنەوە بۆ سێ مزگەوت نەبێت

**٤٢٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) –يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)– قَالَ: "لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِي هَذَا، ومَسْجِدِ الْحَرَامِ، ومَسْجِدِ الْأَقْصَى". (بخاري/ التطوع/ ١١٣٢)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەیگەیەنێ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) كـە فەرمویـەتی: "بـۆ سـێ مزگـەوت نـەبێت بنەوبارگـە ناپێچـرێتەوە، ئـەم مزگەوتـەی مـن، مزگـەوتی حـەرام، مزگەوتی ئەقصا".

## ( ٨٠ ) ڕێزی مزگەوتی ( قباء )

**٤٢٧ـ عَن ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْتِي مَسْجِدَ قباء، رَاكِبًا ومَاشِيًا، فَيُصَلِّي فِيهِ رَكْعَتَيْنِ. (بخاري/ التطوع/ ١١٣٦،١١٣٥)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەچوو بـۆ مزگـەوتی (قبـاء)، بەسواری یان بەپێ و دوو ڕكات نوێژی تێدا كرد.

**٤٢٨ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ): كَانَ يَأْتِي قباء كُلَّ سَبْتٍ، وكَانَ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَأْتِيهِ كُلَّ سَبْتٍ. (بخاري/ التطوع/ ١١٣٦،١١٣٥)**

(إبن عمر) (ﷺ) هەموو شـەممەیەك دەردەچـوو بـۆ مزگـەوتی (قبـاء)و دەیـوت: پێغەمبەری خوام (ﷺ) بینیوە هەموو شەممەیەك دەهات بۆ ئێرە.

# بەشی چواردەیەم : هاوسەرگیریی

## (١) هاندان بۆ هاوسەرگیریی

٤٢٩ـ عَنْ عَلْقَمَةَ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بِمِنًى فَلَقِيَهُ عُثْمَانُ (ﷺ)، فَقَامَ مَعَهُ يُحَدِّثُهُ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَلَا نُزَوِّجُكَ جَارِيَةً شَابَّةً؟ لَعَلَّهَا تُذَكِّرُكَ بَعْضَ مَا مَضَى مِنْ زَمَانِكَ. قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ لَقَدْ قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ".(بخاری/ النكاح / ٤٧٧٨)

علقمە (ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ عبداللە دا لە (مینا) دەگەڕاین، (لقمان)ی (ﷺ) پێگەیشت، دەستیان کرد بە گفتوگۆ، عثمان پێیوت: ئەرێ عبدالرحمن بۆچی کچێکی گەنجت بۆ نەهێنین، سا بەڵکو ئەو ڕۆژگارانەت بهێنێتەوە یاد کە لە دەستت چوون؟ عبداللە وتی: ئەگەر تۆ ئەوە بڵێیت، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموویـن: "هەر کەس لە ئێوە توانای هەیە، با ژن بهێنێت، چونکە ژن هێنان باشترین هۆکارە بۆ چاوپارێزی و داوێن پارێزی، هەر کەسێکیش ناتوانێ با ڕۆژوو بگرێت، چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان".

٤٣٠ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) سَأَلُوا أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) عَنْ عَمَلِهِ فِي السِّرِّ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا آكُلُ اللَّحْمَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا أَنَامُ عَلَى فِرَاشٍ. فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، فَقَالَ: "مَا بَالُ أَقْوَامٍ قَالُوا كَذَا وَكَذَا؟ لَكِنِّي أُصَلِّي وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي".(بخاری/ النكاح / ٤٧٨٦)

(أنس)(ﷺ) دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی کاری پەنامەکی پێغەمبەرەوە (ﷺ) پرسیاریان لە هاوسەرەکانی کرد: یەکێکیان وتی: ئیدی من ژن ناهێنم، یەکێکی تریان وتی: منیش گۆشت ناخۆم، یەکێکی تریشیان وتی: منیش لە مەودوا لەسەرجێگە ناخەوم، (پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بیستەوە) لە وەڵامیاندا سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: "ئەوە چیە هەندێ کەس وا دەڵێن و وادەڵێن؟ بەڵام من نوێژ دەکەم و دەشخەوم و ڕۆژو دەگرم و (هەندێ ڕۆژیش) دەیشکێنم، ژنیش دەهێنم، هەر کەسێکیش پشت لە سوونەتی من بکات لە من نیە، (واتە ڕێگەی منی بەتەواوی نەگرتووە).

٤٣١ـ عن سَعْدَ بْنَ أَبِي وقَّاصٍ (ﷺ) قالَ: أَرَادَ عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ -(ﷺ)- أَنْ يَتَبَتَّلَ، فَنَهَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، ولَوْ أَجَازَ لَهُ ذَلِكَ لَاخْتَصَيْنَا.(بخاری / النكاح/ ٤٧٨٦)

(سعدی کوڕی أبی وقاص) (ﷺ) دەڵێ: (عثمانی کوڕی مظعون)(ﷺ) ویستی واز لە ژن هێنان بهێنێ، پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی پێنەدا، خۆ ئەگەر ڕێگەی بەو بدایە، ئێمەش خۆمان دەخەساند.

## ( ٢ ) خواستنی ئافرەتی دیندار

٤٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا ولِحَسَبِهَا ولِجَمَالِهَا ولِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٠٢)

(أبو هريرە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێت: بۆ ماڵ و سامانەکەی، لەبەر بنەماڵەکەی، لەبەر جوانیەکەی، لەبەر دیندارییەکەی، جا تۆ ئافرەتی دیندار بهێنە، تا دەست پڕ بەرەکەت بیت".

٤٣٣ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ -أَوْ قَالَ: سَبْعَ (بَنات)- فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّبًا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ". قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: "فَبِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ". قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "فَهَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وتُلَاعِبُكَ، أَوْ قَالَ: تُضَاحِكُهَا وتُضَاحِكُكَ". قَالَ: قُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ -أَوْ: سَبْعَ (بنات)- وإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ آتِيَهُنَّ -أَوْ: أَجِيئَهُنَّ- بِمِثْلِهِنَّ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَجِي و بِامْرَأَةٍ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وتُصْلِحُهُنَّ. قَالَ: "فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ". أَوْ: قَالَ لِي خَيْرًا. (بخاري/ النفقات/ ٥٠٥٢)

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: (عبدالله)ی باوکم مرد و نۆ کچی لەدوا بەجێما، یان حەوت کچ، منیش بێوەژنێکم مارە کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێم: "ئەرێ جابر ژنت هێنا؟" وتم: بەڵێ، فەرمووی: "کچە یان بێوەژن؟" وتم: بێوە ژنە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەی نەدەکرا کچێك بێت گەمەی لەگەڵدا بکەیت و گەمەت لەگەڵ بکات؟" یان فەرمووی: "لەگەڵت پێکەنێ و لەگەڵی پیکەنیت؟" عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عبدالله)ی باوکم مردوو نۆ کچی لەدوا بەجێماوە -یان حەوت کچ-، منیش پێم ناخۆشبوو کچێکی وەك خۆیان بهێنمە لایان، حەزم کرد ژنێك بهێنم سەروکاری و پەروەردەیان بکات. فەرمووی: "خوا بەرەکەت برژێنێ بەسەرتا". یان دوعایەکی خێری بۆ کردم.

### ( ٣ ) مۆڵەت خواستن لە بێوەژن و کچ

٤٣٤ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، ولَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: "أَنْ تَسْكُتَ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٤٣)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "بێوەژن مارە ناکرێت هەتا قسەی لەدەم وەرنەگیرێت، کچیش مارەناکرێت هەتا مۆڵەتی لێوەرنەگیرێت" وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەت وەرگرتن لە کچ چۆنە؟ فەرموی: "ئەوەیە کە بێدەنگ بێت".

### ( ٤ ) ئەو مەرجانەی سەرجێیی پێ حەڵاڵ دەکرێت

٤٣٥ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ أَحَقَّ الشَّرْطِ أَنْ يُوفَى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ". (بخاري/ الشروط/ ٢٥٢٧)

(عقبەی کوڕی عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لە پێشترین مەرجێك کە پێویست بێت وەفای پێبکرێت ئەو مەرجانەیە کە سەرجێی پێ حەڵاڵ دەکرێ". (وەك: مارەیی و نەفەقە و ڕەوشت چاکی لەگەڵ هاوسەر و... هتد).

### ( ٥ ) سڕینەوەی کاتیی و حەرامکردنی ژنهێنانی کاتی

٤٣٦ـ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النساء يَوْمَ خَيْبَرَ، وعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ. (بخاري/ المغازي/ ٣٩٧٩)

(علی کوڕی أبو طالب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژی غەزای (خەیبەر) ژنهێنانی کاتی و خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەرام کرد.

٤٣٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ((ﷺ)) أَنَّهُ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَيْمُونَةَ وهُوَ مُحْرِمٌ. (بخاري/ الإحصار و جزا و الصيد/ ١٧٤٠)

(أبن عباس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) (میمونە)ی مارە کرد لەکاتێکدا ئیحرامی لەبەردا بوو.

### ( ٦ ) کۆکردنەوەی هاوسەر لەگەڵ پورەکەیدا حەرامە

٤٣٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ أَرْبَعِ نِسْوَةٍ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُنَّ: الْمَرْأَةِ وعَمَّتِهَا، والْمَرْأَةِ وخَالَتِهَا. (بخاري/ النكاح/ ٤٨٢٠)

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە لە کۆکردنەوەی ژن و پورەکەی ئیتر خوشکی دایکی بێت یان باوکی.

## ( ٧ ) مارەبڕین لەسەر گۆیەکی ئاڵتون

٤٣٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (ﷺ) أَثَرَ صُفْرَةٍ. فَقَالَ: "مَا هَذَا). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: "فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٦٠)

(أنس ی كوڕی مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕەنگی زەردی (زەعفەران) و بۆنی خۆشی بە (عبدالرحمن ی كوڕی عوف)ەوە بینی، فەرموی: "ئەمە چییە؟" وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ژنێكم لەسەر گۆیەكی ئاڵتون مارە كردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "خوالێت پیرۆز بكات، كەواتە خواردن بكە با بەتاكە مەڕێكیش بێت".

## ( ٨ ) مارە بڕین لەسەر فێركردنی قورئان

٤٤٠ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ) قَالَ: جاءت امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَصَعَّدَ النَّظَرَ فِيهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَأْسَهُ. فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا. فَقَالَ: "فَهَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيءٍ". فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: "اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا". فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ ماعجَدْتُ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "انْظُرْ وَلَوْ خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ". فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ (يَا رَسُولَ اللَّهَ) وَلَا خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي –قَالَ سَهْلٌ: مَا لَهُ رِدَا وَ– فَلَهَا نِصْفُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيءٌ". فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: "مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ". قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، عَدَّدَهَا فَقَالَ: "تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "اذْهَبْ فَقَدْ مُلِّكْتَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ". (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٤٢)

(سهل ی كوڕی سعدی ساعدی)(ﷺ) دەڵێ: ژنێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووم خۆمت پێشكەش بكەم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیری كرد و باش ورد بووەوە، پاشان سەری داخست، كە ژنەكە بینی پێغەمبەر (ﷺ) شتێكی لەبارەیەوە نەفەرموو، دانیشت، یەكێك لە هاوەڵەكانی هەستاو، وتی:

ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر تۆ داخوازی نیت بۆ منی مارە بکە فەرمووی: "ئایا هیچت هەیە بیکەیت بە مارەیی؟" وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەر، فەرمووی: "بڕۆ ماڵەوە بزانە هیچت دەست دەکەوێت؟". ڕۆیشت و هاتەوە، وتی: نەبەخوا هیچم دەست نەکەوت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەوڵ بدە با ئەڵقەیەکی ئاسنیش بێت"، کابرا چوو هاتەوە. وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەر، ئەڵقەیەکی ئاسنیشم دەست نەکەوت. بەڵام ئەوە پۆشاکەکەمە هەر باشە (نیوەی بۆ ئەو) سهیل وتی: ئەو پیاوە پۆشاکی تری نییە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "چی دەکەی لەو تەنها پۆشاکەت؟ تۆ لەبەری بکەیت هیچ بۆ ئەو نابێت، ئەویش لەبەری بکات هیچی بۆ تۆ نابێت" کابرا دانیشت، دانیشتنەکەی درێژەی کێشا، ئینجا هەستا، پێغەمبەری خوا بینی کابرا ڕۆیشت، فەرمانیدا بانگکرایەوە، کە هاتەوە، پێی فەرموو: "چەندە قورئانت لەبەرە" وتی": فلانە سورەت و فلانە سورەت. ژمارەی کردن. فەرمووی: "لەبەر دەیانخوێنیت؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی: "بڕۆ ئەوە لێم مارەکردیت بەو ئەندازە قورئانەی لەبەرتە"

**( ٩ ) سەبارەت بە ئایەتی (ترجی من تشاء منهن)**

**٤٤١ ــعَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللَّاتِي وهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّه (ﷺ)، وأَقُولُ: (وَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا؟ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (تُرْجِي مَنْ تَشاء مِنْهُنَّ وتُؤْوِي إِلَيْكَ مَنْ تشاء ومَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ) (الأحزاب: ٥١). قَالَتْ: قُلْتُ: واللَّهِ مَا أَرَى رَبَّكَ إِلَّا يُسَارِعُ لَكَ فِي هَوَاكَ. (بخاري/ التفسير/ ٤٥١٠)**

(عائشه)(ﷺ) دەڵێ: من ئیرەیم دەبرد کە هەندێ ئافرەت خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ)، دەموت: ئایا دەشێ ئافرەت خۆی ببەخشێ؟ کە خوای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە دەڵێ: بە پێغەمبەرم وت: سوێند بەخوا وادێتە بەرچاوم کە پەروەردگارت بە دڵی تۆ دەکات.

**( ١٠ ) نانی شایی**

**٤٤٢ــ عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مَا أَوْلَمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِه أَكْثَرَ أَوْ أَفْضَلَ مِمَّا أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ. فَقَالَ ثَابِتٌ الْبُنَانِيُّ: بِمَا أَوْلَمَ؟ قَالَ: أَطْعَمَهُمْ خُبْزًا ولَحْمًا حَتَّى تَرَكُوهُ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٦٨، ٤٨٧٣)**

(أنس ی کوڕی مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هیچ ژنێکی بە ئەندازەی (زەینەب)نانی شایی ئامادەنەکردبوو، (ثابت البناني) بە (أنس)ی وت: نانە

شاییەکەی (زینب)چی بوو؟ (أنس) وتی: نانی شاییەکە نـان و گۆشـت بـوو، خـەڵکی ئەوەندەیان خوارد تا لێیان مایەوە.

٤٤٣ـ عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَدَخَلَ بِأَهْلِه، قَالَ: فَصَنَعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ حَيْسًا، فَجَعَلَتْهُ فِي تَوْرٍ، فَقَالَتْ: يَا أَنَسُ اذْهَبْ بِهَذَا إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقُلْ: بَعَثَتْ بِهَذَا إِلَيْكَ أُمِّي وهِيَ تُقْرِئُكَ السَّلَامَ، وتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ يَا رَسُولَ اللَّه، قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي تُقْرِئُكَ السَّلَامَ، وتَقُولُ إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ (يَا رَسُولَ اللَّه). فَقَالَ: "ضَعْهُ". ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَادْعُ لِي فُلَانًا وفُلَانًا وفُلَانًا ومَنْ لَقِيتَ". وسَمَّى رِجَالًا، قَالَ: فَدَعَوْتُ مَنْ سَمَّى ومَنْ لَقِيتُ. قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ: عَدَدَ كَمْ كَانُوا؟ قَالَ: زُهَا و ثَلَاث مِائَةٍ، وقَالَ لِي رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَا أَنَسُ هَاتِ التَّوْرَ". قَالَ: فَدَخَلُوا حَتَّى امْتَلَأَتِ الصُّفَّةُ والْحُجْرَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لِيَتَحَلَّقْ عَشَرَةٌ عَشَرَةٌ، ولْيَأْكُلْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِمَّا يَلِيه". قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، قَالَ: فَخَرَجَتْ طَائِفَةٌ ودَخَلَتْ طَائِفَةٌ حَتَّى أَكَلُوا كُلُّهُمْ، فَقَالَ لِي: "يَا أَنَسُ ارْفَعْ". قَالَ: فَرَفَعْتُ، فَمَا أَدْرِي حِينَ وضَعْتُ كَانَ أَكْثَرَ أَمْ حِينَ رَفَعْتُ؟ قَالَ: وجَلَسَ طَوَائِفُ مِنْهُمْ يَتَحَدَّثُونَ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) جَالِسٌ، وزَوْجَتُهُ مُوَلِّيَةٌ وجْهَهَا إِلَى الْحَائِطِ. فَثَقُلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَسَلَّمَ عَلَى نِسَائِه ثُمَّ رَجَعَ، فَلَمَّا رَأَوْا رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَدْ رَجَعَ ظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ ثَقُلُوا عَلَيْه، قَالَ: فَابْتَدَرُوا الْبَابَ فَخَرَجُوا كُلُّهُمْ، وجَاءَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حَتَّى أَرْخَى السِّتْرَ، ودَخَلَ وأَنَا جَالِسٌ فِي الْحُجْرَةِ، فَلَمْ يَلْبَثْ إِلَّا يَسِيرًا حَتَّى خَرَجَ عَلَيَّ وأُنْزِلَتْ هَذِه الْآيَةُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ ولَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا ولَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ (الأحزاب: ٥٣). قَالَ الْجَعْدُ: قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَا أَحْدَثُ النَّاسِ عَهْدًا بِهَذِهِ الْآيَاتِ، وحُجِبْنَ نِسَاءُ النَّبِيِّ (ﷺ).(بخاري/ النكاح/ ٤٨٦٨، ٤٨٧٣)

(أنس ی کوڕی مالك) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ژنـی گواسـتەوە، دەڵـێ: (أم سليم)ی دایکم حەڵوای دروست کرد و کردیە قازانێکی گـەورەی مسـەوە و پێـی وتم: (أنس) ئـەم حەڵوایە ببـە بـۆ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و پێـی بڵـێ دایکـم ئەمـەی بـۆ ناردویت و سڵاویشی لێدەکردی، دەیوت: ئەمە بۆ بەڕێزتان لەلایەن ئێمەوە، شـتێکی

کەمیشە، منیش بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێم وت: دایکم سڵاوت لێدەکات و دەڵێ: ئەمە بۆ بەڕێزتان لە ئێمەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەمیشە، فەرموی: "داینێ" پاشان فەرموی: "بڕۆ، فلانە کەس و فلان و فلان و هەرکەسێکی تـرت پێگەیشت بانگیان بکە" ناوی چەند پیاوێکی تریشی برد، دەڵێ: ئەوانەی ناوی بردن و هەرکەسێکی تریش پێم گەیشت بانگم کرد، (ڕاوی) دەڵێ: پرسیم لە (أنس): ژمارەیان چەند کەس بوو؟ وتی: نزیکەی سێسەد کەس، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئەی (أنس) قازانە گەورەکە بێنە". خەڵکە چوونە ژوورەوە تا هەیوانی مزگەوت و ژوورەوەش پڕبوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئادەی دە کەس دە کەس ئەڵقە ببەستن با هەرکەسی لە لای خۆیەوە بخوات". ئیتر هەموویان نانیان خوارد هەتا تێر بوون، کۆمەڵێ دەچوونە ژوورەوە و کۆمەڵێ دەهاتنە دەرەوە، هەتا هەموویان تێربوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئادەی (أنس) قازانەکە لا ببە". (أنس) دەڵێ: قازانەکەم لابرد نەمدەزانی ئەو کاتەی دامنا زۆرتری تێدابوو یان ئەو کاتەی هەڵمگرت؟ دەڵێ: چەند کەسێکیان لەماڵی پێغەمبەردا مانەوە و، دەستیان کرد بە قسەکردن.. پێغەمبەریش دانیشتبوو، هاوسەرەکەشی ڕووی کردبووە دیوارەکە، ئەو حاڵەیان گران بوو لەسەر دڵی پێغەمبەر (ﷺ). پێغەمبەری خوا (ﷺ) سڵاوی لەخێزانەکانی کردو گەڕایەوە هەستیان کرد لەسەردڵی قورس بوو، (أنس) دەڵێ: بەخێرایی ڕوویان کردە دەرگاکە و هەموویان چوونە دەرەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) هات و پەردەکەی دادایەوە، هاتە ژوورەوە. من لە ژوورێکدا دانیشتبووم، زۆری پێنەچوو تەشریفی هاتە دەرەوە. لای من بوو ئەم ئایەتە نازڵ بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە دەرەوە و ئایەتەکەی خوێندەوە بۆ خەڵکەکە کە ئەمە ماناکەیەتی: (ئەی گرۆی ئیمانداران، مەڕۆنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) مەگەر مۆڵەتتان پێ بدرێ بۆ نان خواردنێك، بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بن، بەڵام ئەگەر بانگهێشت کران بڕۆنە ژوورەوە ئەگەر نانتان خوارد بڵاوەی لێبکەن و بەدیار قسەو باسەوە دامەنیشن، چونکە ئەو کارەتان ئازاری دڵی پێغەمبەر (ﷺ) دەدات جا شەرمیشتان لێدەکات، بەڵام خوا شەرم لە حەق و ڕەوا ناکات، ئەگەر داوای کەل و پەلیشتان لە هاوسەرانی پێغەمبەر کرد ئەوە لە پشتی پەردەوە داوای بکەن...).

## ( ١١ ) بەدەمەوە چوونی دەعوەتی زەماوەند

٤٤٤ـ عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) كَانَ يَقُولُ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): "إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُجِبْ، عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ". (البخاري/ النكاح/ ٤٨٨٤)

(نافع) دەڵێ: (أبن عمر) (رضي الله عنه) لەپێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە دەیفەرموو: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە بانگهێشتی براکەی کرد بۆ شایی یان بۆ هەر بۆنەیەکی لەوبابەتە دەبێت بچێت بەدەمیەوە".

٤٤٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا، وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٨٢)

(أبو هريره)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خراپترین خۆراك خۆراکی شاییيە ئەوەی کە دێت بانگ ناکرێت و ئەوەی کە نایەت بانگ دەکرێت ، هەرکەس وەڵامی ئەو دەعوەتانە نەداتەوە ، ئەوە لە خوا و پێغەمبەر یاخی بووە"[1].

## ( ١٢ ) ئەوەی لەکاتی تێکەڵی ژن و مێردا دەوترێ

٤٤٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُماءلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٧٠)

(ابن عباس)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: "ئەگەر یەکێ لەکاتی دروست بوون لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڵێ: بسم الله، خوایە شەیتانمان لێ دووربخەرەوە و، لەنەوەکانیشمان بەدوری بگرە، ئەگەر لەو شەوەدا خودا هەر منداڵێکیان پێ ببخشێ هەرگیز شەیتان زیانی پێناگەیەنێت.

## ( ١٣ )سەبارەت بە ئایەتی ( نساؤكم حرث لكم )

٤٤٧ـ عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ: سَمِعَ جَابِرًا (رضي الله عنه) يَقُولُ: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ: إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ، فَنَزَلَتْ: (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) (البقرة: ٢٢٣). (بخاري/ التفسير/ ٤٢٥٤)

---

[1] مەبەست ئەوەیە زۆربەی کات لەو دەعوەتانەدا دەوڵەمەندان دەعوەت دەکرێنو هەژاران فەرامۆش دەکرێن.

(أبن المنكدر) له جابری بیستووه كه دەیوت: جولەكەكان دەیانوت: ئەگەر پیاو له ڕووی دواوه له شوێنی منالّەوە لەگەڵ هاوسەرەكەیدا دروست بوو منالّەكەیان خێل دەردەچێت، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە ئەمە ماناكەیەتی: (ژنەكانتان كێڵگەی تۆوەكانی ئێوەن، بەهەر چۆنێك دەتانەوێ بڕۆنە لایان) (چۆنیەتیەكە گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە لە شوێنی منالّەوە بێت).

## (١٤) ئەو ژنەی لە جێگادا خۆی نادا بەدەستەوە

٤٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٦٥)

(أبو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر مێرد داوای سەرجێگەیی لە ژنەكەی كرد و ئەویش ملینەدا، مێرد بە توڕەییەوە سەری نایەوە، فریشتەكان تا بەرەبەیان نەفرین لەو ئافرەتە دەكەن".

## (١٥) كاری (عزل) لەسەر جێیدا

**عـزل:** مانای گرتنەوەی مەنییە لەكاتی جوتبووندا بۆ ئەوەی نەڕژێتە منداڵدانیەوە.

٤٤٩ـ عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: ذُكِرَ الْعَزْلُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: "وَمَا ذَاكُمْ". قَالُوا: الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ تُرْضِعُ، فَيُصِيبُ مِنْهَا وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ مِنْهُ. وَالرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْأَمَةُ، فَيُصِيبُ مِنْهَا وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ مِنْهُ. قَالَ: "فَلَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا ذَاكُمْ، فَإِنَّمَا هُوَ الْقَدَرُ". قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ الْحَسَنَ فَقَالَ: وَاللَّهِ لَكَأَنَّ هَذَا زَجْرٌ. (بخاري/ المغازي/ ٣٩٠٧)

(أبو سعيد الخدری)(ﷺ) دەڵێ: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) باسی (عزل)كرا، فەرموی: "مەبەستتان لەو (عزل)ە چییە؟ وتیان: جاری وا هەیە پیاو ژنی شیردەری هەیە كە دەچێتە لای نایەوێ سكی تر بكات، یان پیاوێك كەنیزەكێكی هەیە و دەچێتەلای حەزناكات سكی لێی پڕبێت. فەرمووی: "هیچتان بۆنابێ گەر وانەكەن چونكە ئەوە قەزاو قەدەرە" (أبن عون)دەڵێ: ئەمەم بۆ حەسەن باسكرد. وتی: بەخوا پێدەچێ بۆ سەرزەنشت بێت.

## ( ١٦ ) شەو مانەوە لای ( کچ )و بێوەژن

٤٥٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا. قَالَ خَالِدٌ: ولَوْ قُلْتُ إِنَّهُ رَفَعَهُ لَصَدَقْتُ، ولَكِنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ كَذَلِكَ. **(بخاري/ النكاح/ ٤٩٦١)**

(أنس)(ﷺ) دەڵێ: ئەگەر کچی مارە بکردایە بەسەر بێوەژندا حەوت شەو لای دەمایەوە (خالد کە یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: گەر بڵێم ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەرەوە ڕوایەت کردووە، ڕاست دەکەم، بەڵام ئەو وتی: سوننەت وایە.

## ( ١٧ ) وازهێنان لەسەرەی هەندێ هاوسەر

٤٥١ـ عن عطاء قَالَ: حَضَرْنَا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) جَنَازَةَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) بِسَرِفَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذِهِ زَوْجُ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَإِذَا رَفَعْتُمْ نَعْشَهَا فَلَا تُزَعْزِعُوا ولَا تُزَلْزِلُوا وارْفُقُوا، فَإِنَّهُ كَانَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) تِسْعٌ، فَكَانَ يَقْسِمُ لِثَمَانٍ ولَا يَقْسِمُ لِوَاحِدَةٍ. قَالَ عطاء: الَّتِي لَا يَقْسِمُ لَهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ. **(بخاري/ النكاح/ ٤٧٨٠)**

(عطاء) دەڵێ: لەگەڵ (ابن عباس)دا (ﷺ) لەناوچەی (سَرِف) –کە شوێنێکە لە دەرەوەی (مەککە)– ئامادەی تەرمی (میمونە)ی هاوسەری پێغەمبەر بووین (ﷺ). (أبن عباس)(ﷺ) وتی: ئەمە هاوسەری پێغەمبەرە (ﷺ) کاتێ تەرمەکەیتان بەرزکردەوە بە هێمنی لەسەرخۆ بیبەن، پێغەمبەر (ﷺ) نۆ هاوسەری هەبوو، سەرەبەشی دەدا بە هەشتیان و نەیدەدا بە یەکێکیان. (عطاء) دەڵێ: ئەو یەکەیان کەسەرەی نەبوو، (صفیەی کچی حییی کوڕی أخطب)بوو. (بەڵام زانایان ئەڵێن: ئەمە گومانە و ڕاستییەکەی ئەوەیە هەر (سودە)بووە کە خۆی وازی لەسەرە بەشی خۆی هێناوە بۆ عائشە (ﷺ)).

## ( ١٨ ) لەگەڵ ژن دا هەڵکردن و ڕاسپاردە لەبارەیانەوە

٤٥٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ والْيَوْمِ الْآخِرِ فَإِذَا شَهِدَ أَمْرًا فَلْيَتَكَلَّمْ بِخَيْرٍ أَوْ لِيَسْكُتْ. واسْتَوْصُوا بِالنساء، فَإِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وإِنَّ أَعْوَجَ شيء فِي الضِّلَعِ أَعْلَاهُ، إِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، اسْتَوْصُوا بِالنساء خَيْرًا". **(بخاري/ النكاح/ ٣٨٩٠)**

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کەفەرموویـەتی: "هەرکەسـێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، هەرشتێکی بینی یان چاك بڵێت یان بێدەنگ بێت، ئامۆژگـاری وەرگـرن و چـاك بـن لەگـەڵ ژنـان، چـونکە لەپەراسـوو دروسـت کـراون، لارترین بەشی پەراسووش لای سەرەوەیەتی، ئەگەر هەوڵی ڕاست کردنەوەی بـدەیت دەیشـکێنیت، ئەگـەر وازیشـی لێبهێنیـت بـەلاری دەمێنێتـەوە، ئامۆژگـاری چـاکەم وەربگرن دەربارەی ژنان.

**(١٩) هـەرپیاوێك لەسـەفەر هاتـەوە بـا خێـرا خـۆی نەکاتـەوە بەماڵـدا تـا هاوسەرەکەی خۆی بۆ ڕێك دەخات**

٤٥٣ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فَلَمَّا أَقْبَلْنَا تَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ لِي قَطُوفٍ، فَلَحِقَنِي رَاكِبٌ خَلْفِي فَنَخَسَ بَعِيرِي بِعَنَزَةٍ كَانَتْ مَعَهُ، فَانْطَلَقَ بَعِيرِي كَأَجْوَدِ مَا أَنْتَ رَا و مِنَ الْإِبِلِ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَ: "مَا يُعْجِلُكَ يَا جَابِرُ". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، فَقَالَ: "أَبِكْرًا تَزَوَّجْتَهَا أَمْ ثَيِّبًا". قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبًا. قَالَ: "هَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ". قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ فَقَالَ: "أَمْهِلُوا حَتَّى نَدْخُلَ لَيْلًا –أَيْ عِشَا و– كَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ، وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ". قَالَ: وقَالَ: "إِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ". (بخاري/ النكاح/ ٤٩٤٧)

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لەغەزایەکدا لە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادا بووم (ﷺ)، بـە سـواری وشـترێکی خـاوەوە، کاتـێ نزیـك بووینـەوە پەلـەم دەکـرد، سـوارێك لـەدواوە پـێم گەیشـت و بـە نەقیزەیـەك ژەنـدی لـە وشـترەکەمەوە، ئـیتر وشترەکەم کەوتە غار، وەکو چاکترین وشترکە تۆ دیبێتت، کەلام کـردەوە پێغەمبـەر بوو (ﷺ)، فەرمووی: "پەلەت چییە ئـەی (جـابر)؟ وتم: ئـەی پێغەمبـەر! تـازە ژنم گواستۆتەوە، فەرمووی: "کچـە یـان بێـوەژن؟" وتم: بێـوە ژنـە. –پێغەمبـەری خـوا فەرموی: "نەدەکرا کچێك بێنیت پێکەوە گەمە و گاڵتە بکەن" کـە گەیشـتینەوە نـاو مەدینە، ویستمان بڕۆین بـەرەوماڵ، فـەرمووی: "بوەسـتن تاشـەو، ئەوسـا دەچـینە ماڵـەوە، هـەتا ژنـە قـژ گژوبژەکان پرچیان شـانەدەکەن و خۆیـان سـاز و ئامـادە دەکەن– ئینجا فەرمووی: "کاتێ گەیشتن ژیرانە و لەسەر خۆ بچنە ماڵەوە".

# بەشی پانزەیەم: تەڵاق

## (١) ئەو پیاوەی لەکاتی (بێ نوێژی)دا ژنەکەی تەڵاق دەدات

**٤٥٤ـ عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وهِيَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النساء. قَالَ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ وهِيَ حَائِضٌ يَقُولُ: أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا واحدَةً أَوِ اثْنَتَيْنِ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا. وأَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلَاثًا، فَقَدْ عَصَيْتَ رَبَّكَ فِيمَا أَمَرَكَ بِهِ مِنْ طَلَاقِ امْرَأَتِكَ، وبَانَتْ مِنْكَ. (بخاري/ التفسير/ ٤٦٢٥)**

(نافع) دەڵێ: (أبن عمر) (رضي الله عنه) لەکاتی بێنوێژیدا ژنەکەی تەڵاق دا. (عمر) پرسیاری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرد. ئەویش فەرمانی پێدا کە بیهێنێتەوە و مۆڵەتێکی تری بدا هەتا دەکەوێتە بێنوێژییەکی ترەوە، پاشان لەسەری بوەستێ تاپاک دەبێتەوە، ئینجا پێش چوونەلای، تەڵاقی بدات. ئەمە ئەو چەند ڕۆژە دیاریکراوەیە کە خوای مەزن فەرمانیداوە کە ژنی تێدا تەڵاق بدرێت.. بۆیە (أبن عمر) ئەگەر پرسیاری لێبکرایا دەربارەی ئەو پیاوەی کەژنەکەی لەکاتی بێنوێژیدا تەڵاق دەدات، دەیوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانیداوە بیهێنیتەوە و دەرفەتی بدات ئەگەر تۆ یەك تەڵاق یان دوو تەڵاقت داوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردووە کە بیگێڕێتەوە و مۆڵەتی بدات هەتا حەیزێکی تر دەبینێ و پاکدەبێتەوە و ئینجا تەڵاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەگەر تۆ سێ‌بەسێ تەڵاقتداوە ئەوە لێت جیابۆتەوە و فەرمانی پەروەردگاریشت شکاندووە لە تەڵاقدانی ژنەکەتدا.

**٤٥٥ـ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَكَثْتُ عِشْرِينَ سَنَةً يُحَدِّثُنِي مَنْ لَا أَتَّهِمُ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا وهِيَ حَائِضٌ، فَأُمِرَ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَجَعَلْتُ لَا أَتَّهِمُهُمْ ولَا أَعْرِفُ الْحَدِيثَ، حَتَّى لَقِيتُ أَبَا غَلَّابٍ يُونُسَ بْنَ جُبَيْرٍ الْبَاهِلِيَّ، وكَانَ ذَا ثَبَتٍ، فَحَدَّثَنِي أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَحَدَّثَهُ: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَةً وهِيَ حَائِضٌ فَأُمِرَ أَنْ يَرْجِعَهَا، قَالَ: قُلْتُ: أَفَحُسِبَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: فَمَهْ، أَوَ إِنْ عَجَزَ واسْتَحْمَقَ؟ (بخاري/ الطلاق/ ٤٩٥٨)**

(أبن سيرين) دەڵێ: بۆ ماوەی بیست ساڵ کەسێك کە جێی متمانەم بوو بۆی دەگێڕامەوە کە (أبن عمر)(ﷺ) لەکاتی بێنوێژیدا ژنەکەی سێبەسێ تەڵاقدا، فەرمانی پێدرا کە بیگێڕێتەوە، منیش هیچ دوودڵ نەبووم لەوتەکەیان و ئاگام لە فەرموودەکەش نەبوو، تا گەیشتمە (یونس ی کوڕی جبیری باهلی) (أبو غلاب) کە پیاوێکی دەمڕاست بوو، بۆی گێڕامەوە، کە ئەو پرسیاری لە (أبن عمر) کردووە و ئەویش فەرموودەکەی بۆ گێڕاوەتەوە کە ژنەکەی تەڵاقداوە بەیەك تەڵاق لەکاتی بێنوێژیدا، فەرمانی پێکراوە کە بیگێڕێتەوە وتم: ئایا ئەو تەڵاقەی لەسەر حساب کرا؟ وتی: بێدەنگ بە، ئەی بۆنا؟ مەگەر لەبەر ئەوەی کاری ناژیرانەی کرد و نەیتوانیوە چاوەڕێ بکات لەسەرەتای پاکیدا تەڵاقیبدات؟

## ( ٢ ) ژنی تەڵاق دراو، گەرشووی کردەوە

٤٥٦ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيَّ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَبَتَّ طَلَاقَهَا، فَتَزَوَّجَتْ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، فَجاءتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه إِنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ رِفَاعَةَ، فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلَاثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَتَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وإِنَّهُ واللَّه مَا مَعَهُ إِلَّا مِثْلُ الْهُدْبَةِ. وأَخَذَتْ بِهُدْبَةٍ مِنْ جِلْبَابِهَا، قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) ضَاحِكًا، فَقَالَ: "لَعَلَّك تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا، حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَك، وتَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ". وأَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ) جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، وخَالِدُ بْنُ سَعِيد بْنِ الْعَاصِ جَالِسٌ بِبَابِ الْحُجْرَةِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، قَالَ: فَطَفِقَ خَالِدٌ يُنَادِي: أَبَا بَكْرٍ، أَلَا تَزْجُرُ هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)؟ **(بخاري/ الشهادات/ ٢٤٩٦)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: (رفاعة القرظی) سێبەسێ ژنەکەی تەڵاقدا، دوای ئەوە، شووی کردەوە بە (عبدالرحمن ی کوڕی الزبیر)، ژنەکە هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ)، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من پێشتر خێزانی (رفاعة)بووم، ئاخرین سێ تەڵاقەی دام، پاشان شووم کرد بە (عبدالرحمن)ی کوڕی (الزبیر)، ئافرەتەکە چمکێکی کراسەکەی خۆی گرت و وتی: سوێند بەخوا کوڕی (الزبیر) لەپیاوەتی کەوتووە و، وەکو ئەم پەڕۆیەوایە، پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: "پێدەچێ حەز بکەیت بگەڕێیتەوە بۆلای (رفاعة)؟ نەخێر نابێ، نابێ هەتا ئەو چێژ لەتۆ وەردەگرێت و تۆش چێژ لەو وەردەگریت" لەو کاتەدا (أبوبکر الصدیق)یش (ﷺ) لە

خزمەتیدا دانیشتبوو، (خالدی کوڕی سعدی کوڕی عاص)یش (ﷺ) لەدەرکی ژورەکەدا بوو، مۆڵەتی نەدرا بێتە ژوورەوە، (ڕاوی)دەڵێ: (خالد) هاواری کرد: ئەرێ (أبو بكر) بۆ هەڵناشاخێیت بەو ژنەدا، کەبەو ڕوهەڵماڵراوییە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) قسە دەکات؟

**(٣) ئایەتی :( یا ایها النبی لم تحرم ما احل الله لك )**

٤٥٧ـ عن ابْنَ عَبَّاس (ﷺ) قَالَ: إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ فَهِيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا، لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ. **(بخاري/ التفسير/ ٤٦٢٧)**

(أبن عباس)(ﷺ) دەڵێ: هەرکەسێ ژنەکەی لەخۆی حەرام کرد، ئەوە سوێندەو کەفارەتی بدات، پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئێوە چاکترین پێشەنگە.

٤٥٨ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلًا، قَالَتْ: فَتَوَاطَيْتُ اناءحَفْصَةُ: أَنَّ أَيَّتَنَا مَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟ فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: "بَلْ شَرِبْتُ عَسَلًا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، ولَنْ أَعُودَ لَهُ". فَنَزَلَ: (لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ) إِلَى قَوْلِهِ: (إِنْ تَتُوبَا) لِعَائِشَةَ وحَفْصَةَ (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) **(التحريم: ١-٣)** لِقَوْلِهِ: "بَلْ شَرِبْتُ عَسَلًا". **(بخاري/ الطلاق/ ٤٩٦٦، ٤٩٦٧)**

لە(عائشە)وە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرجارێ لای (زینب)ی کچی (جحش) دەمایەوە هەنگوینی لەلا دەخوارد، عائشە (ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ (حفصە)دا ڕێککەوتم کە پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنا بۆلای هەرکاممان پێی بڵێین: بۆنی (مغافیر)ت لێدێت -(مغافیر) شیلەیەکی شیرینی بۆن ناخۆشە- ئەرێ (مغافیر)ت خواردووە؟ ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی برد بۆلای یەکێکیان و ئەوەی پێوت. ئەویش فەرمووی: "نەخێر بەڵکو لای (زینب)ی کچی (جحش) هەنگوینم خواردووە، ئیدی جارێکی تر نایخۆم" ئایەت هاتە خوارەوە (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ..) هەتا ئایەتی (إِنْ تَتُوبَا إِلَى اللَّه) کە ڕووبەڕوی (عائشە) و (حفصة)یە هەروەها ئایەتی: (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) (التحریم: ١-٣) سەبارەت بە خواردنی هەنگوینەکەیە کە ئەمە واتاکەیەتی: (ئەی پێغەمبەر بۆچی تۆ ئەو شتانە لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردویت، دەتەوێ ڕەزامەندی هاوسەرانت بەدەست بهێنیت؟ لەکاتێکدا خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

بێگومـان ئـەو خوایـە مۆڵـەتی داوە کـەفارەتی سـوێندەکانتان بـدەن، هـەرخوایش پشتیوانتانە و هەر ئەویش زاناو دانایە، کاتێك پێغەمبەر باسێکی گێڕایەوە بۆ یـەکێ لە هاوسەرانی و هەواڵەکەی پێداو خواش هەموو شتێکی بـۆ ڕوونکـردەوە، هەنـدێکی باس کرد و لەهەندێکی خۆی بوارد، جا کاتێك بۆ ئەو هاوسەرەی باس کـرد، ئـەویش پرسی: ئەی پێغەمبەر: کێ ئەم هەواڵەی پێدای، ئەویش وتـی: ئەوزاتەی کە هەمیشـە زاناو ئاگادارە هەواڵی پێدام).

## ( ٤ ) سەرپشك کردنی پیاو بۆ ژنەکەی

**٤٥٩ـ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: مَا أُبَالِي خَيَّرْتُ امْرَأَتِي واحِدَةً أَوْ مِائَةً أَوْ أَلْفًا، بَعْدَ أَنْ تَخْتَارَنِي، ولَقَدْ سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رضي الله عنها)، فَقَالَتْ: قَدْ خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، أَفَكَانَ طَلَاقًا؟ (بخاري/ الطلاق/ ٤٩٦٢- ٤٩٦٣)**

(مسروق)(رضي الله عنه) دەڵێ: من باکم نییە جارێك یان سەدجار یان هـەزار جـار ژنەکـەم سەرپشك بکەم، پـاش ئـەوەی کـە مـن هەڵبـژێرێ، چـونکە مـن پرسـیارم کـردوە لـە (عائشە) (رضي الله عنها) وتوویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) ئێمـەی سەرپشـك کـرد، ئایا ئـەوە تەڵاق بوو؟ (مەبەستی ئەوەیە ئەم سەرپشك کردنە بە تەڵاق حیساب ناکرێ).

## ( ٥ ) ئـایەتی ( وان تظاهرا عليه )

**٤٦٠ـ عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً وأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ فَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الْأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ، فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وعَائِشَةُ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: واللَّهِ إِنْ كُنْتُ لَأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ. قَالَ: فَلَا تَفْعَلْ، مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَسَلْنِي عَنْهُ، فَإِنْ كُنْتُ أَعْلَمُهُ أَخْبَرْتُكَ، قَالَ: وقَالَ عُمَرُ: واللَّهِ إِنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنساء أَمْرًا، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ، وقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا فِي أَمْرٍ أَأْتَمِرُهُ إِذْ قَالَتْ لِي امْرَأَتِي: لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وكَذَا، فَقُلْتُ لَهَا: ومَا لَك أَنْت ولِمَا هَاهُنَا، ومَا تَكَلُّفُكِ فِي أَمْرٍ أُرِيدُهُ؟ فَقَالَتْ لِي: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، مَا تُرِيدُ أَنْ تُرَاجَعَ أَنْتَ، وإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ. قَالَ عُمَرُ: فَآخُذُ رِدَائِي، ثُمَّ أَخْرُجُ مَكَانِي حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى حَفْصَةَ، فَقُلْتُ لَهَا يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ**

رَسُولَ اللَّه (ﷺ) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ؟ فَقَالَتْ حَفْصَةُ: واللَّه إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ، فَقُلْتُ: تَعْلَمِينَ أَنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّه وغَضَبَ رَسُوله (ﷺ)، يَا بُنَيَّةُ، لَا يَغُرَّنَّكِ هَذه الَّتي قَدْ أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا، وحُبُّ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) إِيَّاهَا. ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي منْهَا، فَكَلَّمْتُهَا، فَقَالَتْ لي أُمُّ سَلَمَةَ: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّاب، قَدْ دَخَلْتَ في كُلِّ شيء حَتَّى تَبْتَغِيَ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وأَزْوَاجِه؟ قَالَ: فَأَخَذَتْنِي أَخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ منْ عنْدهَا، وكَانَ لي صَاحِبٌ منَ الْأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِي بِالْخَبَرِ، وإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتيه بِالْخَبَرِ، ونَحْنُ حينَئِذٍ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا منْ مُلُوك غَسَّانَ، ذُكرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا، فَقَد امْتَلَأَتْ صُدُورُنَا منْهُ. فَأَتَى صَاحِبِي الْأَنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ وقَالَ: افْتَحِ افْتَحْ، فَقُلْتُ: جاء الْغَسَّانِيُّ؟ فَقَالَ: أَشَدُّ منْ ذَلكَ، اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ: رَغمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وعَائشَةَ، ثُمَّ آخُذُ ثَوْبِي فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) في مَشْرُبَةٍ لَهُ يُرْتَقَى إِلَيْهَا بِعَجَلَةٍ، وغُلَامٌ لرَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَة، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ، فَأُذنَ لي. قَالَ عُمَرُ: فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) هَذَا الْحَديثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَديثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، وإِنَّهُ لَعَلَى حَصيرٍ مَا بَيْنَهُ وبَيْنَهُ شيء، وتَحْتَ رَأْسه وسَادَةٌ منْ أَدَمٍ حَشْوُهَا ليفٌ، وإِنَّ عنْدَ رِجْلَيْه قَرَظًا مَصْبُورًا، وعنْدَ رَأْسه أُهُبًا مُعَلَّقَةً، فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصيرِ في جَنْبِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: "مَا يُبْكِيكَ يا عمر". فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ كسْرَى وقَيْصَرَ فيمَا هُمَا فيه، وأَنْتَ رَسُولُ اللَّه. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمَا الدُّنْيَا ولَكَ الْآخرَةُ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٦٢٩)**

(عبدالله)ی كوڕی (عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: ماوەی یەك ساڵ دەمویست پرسیار لە (عمر)ی كوڕی (خطاب)(رضي الله عنه) بكەم لەبارەی ئایەتێكەوە كەچی نەمدەوێرا لەبەر ئەوەی سامم دەكرد، هەتا ڕۆژێك چوو بۆ حەج، لەگەڵیدا ڕۆیشتم، كە گەڕایەوە لەڕێگەدا بووین، (عمر)(رضي الله عنه) لایدا بۆ ژێر سێبەری درەختێكی (أراك) بۆ پێویستی خۆی، بەدیاریەوە وەستام هەتا لێبویەوە، پاشان لەگەڵیدا كەوتمە ڕێ، وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران! ئەو دوو هاوسەرەی پێغەمبەر (ﷺ) كێ بوون كە پشتی یەكتریان گرت بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ)؟ وتی: (حفصە) و (عائشە)بوون، پێم وت: بەخوا یەك ساڵە دەمەوێ ئەو پرسیارەت لێبكەم بەڵام نەمدەوێرا، عمر وتی: جارێكی تر وامەكە، هەرچی زانیت من دەیزانم پرسیارم لێبكە، ئەگەر زانیم وەڵامت

دەدەمەوە. بەڵێ: (عمر)(ﷺ) وتی: بەخوا ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا پلەوپایەمان بۆ ژن دانەدەنا. هەتا ئەوە بوو خودا ئایەتی لەبارەیانەوە نارده خوارەوە، مافی خۆیانی پێدان، (عمر) (ﷺ) دەڵێ: جارێکیان سەبارەت بە مەسەلەیەك پرس و ڕای خۆمم دەکرد، ژنەکەم پێی ووتم: ئەگەر ئاواو ئاوا بکەیت چۆنە؟ منیش پێم وت: تۆ چیت داوە لەوەی لە دڵی مندایە؟ هەر چیم لە دڵدا بێت تۆ چیت لە دەست دێت؟ ژنەکەم وتی: ئەرێ من سەیرم لە تۆ دێ (أبن خطاب)، تۆ ناتەوێت کەس قسەوباست لەگەڵدا بکات؟ لەکاتێکدا کە کچەکەت (واتە حفصە) ئەوەندە سەر دەخاتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕۆژە تا ئێوارە تورەی دەکات، (عمر) دەڵێ: منیش عەباکەم دابەشانمدا و، پاشان ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە لای (حفصە) و چوومە ژوورەوە بۆلای، پێم وت: کچێ! ئەرێ ڕاستە تۆ ئەوەندە قسە لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەیت (ﷺ) ئەو ڕۆژە تا ئێوارە تورەی دەکەیت؟ (حفصە) وتی: بەخوا ئێمە قسەی زۆری لەڕوودا دەکەین. منیش وتم: وریابە! بەر سزای خوای گەورە و تورەیی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نەکەویت. کچێ، نەکەی بخەڵەتێی بەو ژنەی کەبە جوانی خۆی و خۆشەویستی پێغەمبەردا (ﷺ) دەنازێ. پاشان چوومە دەرەوە تا چووم بۆلای (أم سلمة)چونکە خزمی نزیکم بوو، قسەم لەگەڵیدا کرد، (أم سلمة) وتی: (أبن الخطاب)! سەیرم لە تۆدێ: خۆت لە هەموو شتێکدا هەڵدەقورتێنی، هەتا گەیشتە ئەوەی بکەویتە نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و هاوسەرەکانیشی؟ عمر دەڵێ: ئەوەندە وەڵامەکەی سەخت بوو، وازم لەهەندێ شتی تریش هێنا کە بۆی هاتبووم، لای ئەو هاتمە دەرەوە، برادەرێکی ئەنصاریم هەبوو ئەگەر دیار نەبومایە هەواڵی بۆ دەهێنام، ئەگەر ئەویش دیار نەبوایە من هەواڵم بۆ دەبرد، لەو کاتەشدا مەترسی هێرشی پادشای غەسانیمان لەسەر بوو، هەواڵمان بۆ هاتبوو کە پێدەچێ هێرشی بکاتە سەرمان، لێی پڕبوبوین.

جارێکیان ئەو برادەرە ئەنصاریەم تەقەی لەدەرگای ماڵەکەمداو وتی: بیکەرەوە.. بیکەرەوە. وتم: ئایا (غەسسانی)ی هات، وتی: نەخێر، لەوەش خراپتر ڕووی داوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هاوسەرەکانی دوورکەوتۆتەوە. وتم: (حفصە)و (عائشە) بە قوڕاچن.. پاشان عەباکەمدا بەسەرشانمدا و گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووم.. بینیم پێغەمبەر (ﷺ) لەژوورێکی بچووکدا دانیشتووە کە

بەپلیکانەیەکی دارخورما بۆی سەردەکەوتن، خزمەتنکارەکەشی لەسەر پلیکانەکە بوو، وتم: من (عمر)م ڕێگەی دام چوومە ژوورەوە. (عمر) دەڵێ: ئەو بەسەرهاتەم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، کە گەیشتمە قسەکەی (أم سلمة) پێغەمبەر (ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد، لەسەر پارچە حەسیرێك دانیشتبوو هیچی تری لەسەر نەبوو، سەرینێکی چەرمی لەژێر سەردا بوو، ناوەکەی بە ڕیشوی دارخورما ئاخنرابوو، لای قاچی پیرۆزیەوە هەندێ گەڵای پێستە خۆشکردن دانرابوو، لای ژوور سەریشیەوە چەند پارچە پێستەیەکی خۆشەنەکراو هەڵواسرابوو، لا تەنیشتی پێغەمبەر (ﷺ) شوێنەواری حەسیرەکەی پێوە دیاربوو، منیش (کە ئەوەم دی) گریام، فەرمووی: "عمر، بۆچی دەگریت؟" وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە حاڵی کیسراو قەیسەرە ئەوان لە چ حاڵێکدان و، تۆیش پێغەمبەری خوایت، ئەوە حاڵتە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: "ئایا ڕازی نابی کە دنیا بۆ ئەوان بێت و قیامەت بۆ تۆ بێت؟".

# بەشی شانزەیەم: ( عیددە )

## ( ١ ) ئەو ژنەی دوای مردنی مێردەکەی منداڵی دەبێت

**٤٦١-عن عُبَيْدُ اللَّه بْنُ عَبْد اللَّه بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ أَبَاهُ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْد اللَّه بْنِ الْأَرْقَمِ الزُّهْرِيِّ، يَأْمُرُهُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ الْأَسْلَمِيَّةِ، فَيَسْأَلَهَا عَنْ حَدِيثِهَا وعَمَّا قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حِينَ اسْتَفْتَتْهُ. فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْد اللَّه إِلَى عَبْد اللَّه بْنِ عُتْبَةَ يُخْبِرُهُ: أَنَّ سُبَيْعَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْد بْنِ خَوْلَةَ، وهُوَ فِي بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، وكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا، فَتُوُفِّيَ عَنْهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وهِيَ حَامِلٌ، فَلَمْ تَنْشَبْ أَنْ وضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وفَاتِه، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ -رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْد الدَّارِ- فَقَالَ لَهَا: مَا لِي أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً، لَعَلَّكِ تَرْجِينَ النِّكَاحَ؟ إِنَّكِ واللَّه مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وعَشْرٌ. قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِي ذَلِكَ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَفْتَانِي بِأَنِّي قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وضَعْتُ حَمْلِي، وأَمَرَنِي بِالتَّزَوُّجِ إِنْ بَدَا لِي. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَلَا أَرَى بَأْسًا أَنْ تَتَزَوَّجَ حِينَ وضَعَتْ وإِنْ كَانَتْ فِي دَمِهَا، غَيْرَ أَنْ لَا يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَطْهُرَ. (بخاري/ المغازي/ ٣٧٧٠)**

(عبیدالله)ی کە (عبدالله)ی کوڕی (عتبة): کەباوکی نامەیەك دەنوسێت بۆ (عمر)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (أرقم الزهري) تیایدا داوای لێدەکات بڕوات بۆلای (سبیعة)ی کچی (الحارث الاسلمیة) پرسیاری لێبکات دەربارەی بەسەرهاتێکی کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش وەڵامنامەکەی (عبدالله ی کوڕی عتبە) دەنووسێ و دەڵێ: "سبیعة وەڵامی پێدام کاتێ هاوسەری (سعد ی کوڕی خولة)بووە و لەناو خێڵی (بنی عامر بن لؤي)کە یەکێك بووە لەوانەی ئامادەی (بەدر)بووە، لە حەجی ماڵ ئاواییدا وەفات دەکات، لەکاتێکدا کە ئەو دووگیان بووە، دوای وەفاتی مێردەکەی، منداڵەکەی دەبێت. کاتێك لە زەیسانی پاك دەبێتەوە خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ خوازبێنی کاران، (أبو سنابل)کوڕی (بعکك) -کەپیاوێکی خێڵی (بنی عبدالدار) بوو- چوو بۆلای، پێی ووت: چیە دەتبینم خۆتت ڕازاندۆتەوە؟ دەڵێی بەتەمای شوویت؟ سوێند بەخوا ناتوانی شوو بکەیت، هەتا چوار مانگ و دەڕۆژ بەسەرتا نەگوزەرێ. (سبیعە)ش و وتی: کە ئەمەی پێ وتم، لەئێوارەدا خۆم

کۆکردەوە چوومە خزمەت پێغەمبەر لەوبارەیەوە پرسیارم لێکرد. ئەویش فەتوای بۆدام کەلەگەڵ لەدایك بوونی منداڵەکەمدا (عیددە)م تەواو بووە. فەرمانی پێدام کەشوو بکەم، ئەگەر بەلامەوە چاك بێت –أبی شهاب دەڵێ: بەگوناهی نازانم ئافرەت شو بکات دوای دانانی منداڵەکەی، با خوێنیشی مابێت بەڵام مێردە تازەکەی نابێت نزیکی بکەوێت تا پاك دەبێتەوە.

## ( ٢ ) تەعزیەباری و چاونەڕشتن لە ( پرسە )دا

٤٦٢ـ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ: أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ هَذِهِ الْأَحَادِيثَ الثَّلَاثَةَ، قَالَ: قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ، خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ، فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ (عَلَى الْمِنْبَرِ): "لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا". قَالَتْ زَيْنَبُ: ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ، غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: "لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا". قَالَتْ زَيْنَبُ: سَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا، أَفَنَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا". مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، كُلَّ ذَلِكَ يَقُولُ: "لَا". ثُمَّ قَالَ: "إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ". قَالَ حُمَيْدٌ: قُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلَا شَيْئًا حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ –حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَيْرٍ– فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلَّا مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ، فَتُعْطَى بَعْرَةً فَتَرْمِي بِهَا، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ". **(بخاري/ الطلاق/ ٥٠٢٤)**

(حمید کوڕی نافع) ئەویش لە (زینب کچی أبی سلمة)وە کە ئەم سێ فەرموودەیەی دواوەی پێگەیاندوە: (زینب) وتی: کاتێ کە (أبو سفیان)ی باوکی (أم حبیبە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد چووم بۆلای (أم حبیبە) ئەویش

داوای ڕەنگ و بۆیە و بۆنی خۆشی کرد لە جۆری (خلوق)یا جۆرێکی دیکە بوو بۆیان هێناو کیژۆڵەیەکی پێ بۆنخۆش کرد و دەستیشی هێنابە دەم و چاوو ڕومەتیدا، پاشان (أم حبيبه) وتی: من پێویستم بە بۆن نییە، بەڵام لە پێغەمبەرم بیستووە کە لەسەر مینبەر فەرموویەتی: "حەڵاڵ نییە هیچ ژنێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، زیاتر لەسێ ڕۆژ ماتەمینی بگرێت بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێردی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە. (زينب کچی أبو سلمة) دەڵێ: دیسانەوە چووم بۆلای (زينب کچی جحش)، کاتێ براکەی وەفاتی کرد، داوای کرد بۆنی خۆشیان بۆ هێنا و لەخۆیدا، پاشان وتی: بەخوا من هیچ پێویستم بەبۆنی خۆش نییە، بەڵام ئەوەندە هەیە گوێم لێبووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر فەرمووی: "حەڵاڵ نییە بۆ هیچ ئافرەتێك کە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێ، زیاتر لە سێ ڕۆژ ماتەمینی بگرێ بۆ مردووەکەی، مەگەر بۆ مێرد کە چوار مانگ و دە ڕۆژە. (زينب) دەڵێ: لە (أم سلمة)ی دایکم بیستوە، دەیوت: ژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، مێردی کچەکەم وەفاتی کردووە، کچەکەم تووشی چاو ئێشە بووە، ئایا دروستە چاوی بە کل بۆ بڕێژین؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "نەخێر". ئەمەی دووجار یان سێجار دووبارە کردەوە. لەهەموو جارێکیشدا دەیفەرموو: "نەخێر"، ماوەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە. خۆ جاران یەکێ لەئێوە لەسەردەمی نەفامیدا دوای تەواو بونی ساڵێك پشقلەکەی فڕێ دەدا". (حميد) دەڵێ: بە (زينب)م وت: مەبەستی چی بوو دوای تەواو بونی ساڵێك پشقلەکەی فڕێ دەدا؟ (زينب) وتی: لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر ژن مێردەکەی بمردایە دەچووە زنجێکی پیس و پۆخڵی بچووکەوە، خراپترین جلی لەبەردەکرد. نەبۆنی خۆش و نەهیچی تری بەجێ نەئەهێنا تا ساڵێك. ئینجا گیاندارێکیان دەهێنا گوێدرێژ یان مەڕ یان باڵندەیەك. داوێن و گیانی خۆی پێدا هەڵدەسوو، کەمجار ئەو شتەی ئەو خۆی پێدەسڕی نەدەمرد[1]، ئینجا لە زنجەکەی دەهاتە دەرەوە، پشقلێکی دەدرایە دەست و ئەویش فڕێی دەدا، ئیتر ئەوکاتە ئاوی بە خۆیدا دەکرد و بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا.

---

[1] [مەبەست ئەوەیە کە لاشەی ئەو ئافرەتە ئەوەندە پیس ئەبوو، کە زۆر جار ئەو گیاندارەی دەکوشت کە لێی نزیك دەکرایەوە].

## ( ٣ ) وازهێنان لەبۆنی خۆش و جلی ڕەنگاوڕەنگ

٤٦٣ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضي الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا تُحِدُّ امْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وعَشْرًا، ولَا تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، ولَا تَكْتَحِلُ ولَا تَمَسُّ طِيبًا، إِلَّا إِذَا طَهُرَتْ نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ أَوْ أَظْفَارٍ". (بخاري/ الحيض/ ٣٠٧)

(أم عطية)(رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هیچ ژنێك بۆ مردوو زیاتر لەسێ ڕۆژ ماتەمینی نابێ بكات، مەگەر بۆ مێردی كە بۆ ماوەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، لەوكاتانەدا جگە لەپەڕۆی خۆ بەستنەكەی نابێ جلی ڕەنگاوڕەنگی لەبەردابێت، چاوناڕێژێت و بۆن لەخۆی نادات، مەگەر پاش پاكبوونەوە، كە ئەتوانێت كەمێك بۆنی (قسط) و (أضفار) (كە دوو جۆر بۆنی ئەو سەردەمە بوون) لەخۆی بدات.

# بەشی حەڤدەیەم: نەفرینکردن ( اللّعان )

## ( ١ ) ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەیدا پیاوێکی دی دەبینێت

٤٦٤ـ عن سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ: أَنَّ عُوَيْمِرًا الْعَجْلَانِيَّ جاء إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) فَقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ يَا عَاصِمُ لَوْ أَنَّ رَجُلًا وجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَسَلْ لِي عَنْ ذَلِكَ يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمَسَائِلَ وعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ عَاصِمٌ لِعُوَيْمِرٍ: لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا. قَالَ عُوَيْمِرٌ: واللَّهِ لَا أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا. فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وسَطَ النَّاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلًا وجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "قَدْ نَزَلَ فِيكَ وفِي صَاحِبَتِكَ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا". قَالَ سَهْلٌ: فَتَلَاعَنَا وأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا فَرَغَا قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا. فَطَلَّقَهَا ثَلَاثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ سُنَّةَ الْمُتَلَاعِنَيْنِ. **(بخاري/ الطلاق/ ٤٩٥٩)**

لە(سهل ی کوڕی سعدی ساعدییەوە) دەڵێ: جاریکیان (عـویمری عجلانـی) هـات بۆلای (عاصم ی کوڕی عدی أنصاری)(ﷺ) پێی وت: ئـەرێ (عاصـم) ئەگـەر پیاوێـك لەگـەڵ ژنەکەیـدا پیـاوێکی بینـی، بیکوژێـت و ئێـوەش بیکوژنـەوە؟! یـان چـیبکات باشە؟ (عویمر) وتی بە (عاصم): تکات لێدەکەم لەم بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکە.. (عاصم)یش پرسیاری کرد.. پێغەمبەر (ﷺ) بـەم جـۆرە پرسـیارانە ناڕەحەت دەبـوو، تـاوای لێهـات (عاصـم) ئـەو حاڵەتـەی لەسـەر دڵ گـران بـوو، کـە (عاصم) گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، جارێکی دی (عویمر) هاتەوە بۆلای وتـی: پێغەمبەر (ﷺ) چی پێ وتی؟ عاصم وتی: خێرت بەناوچەوانەوە نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) باسـی ئەو مەسەلەیەی بەلاوە گران بوو، (عویمر) وتـی: بەخوا وازناهێنم تـا خـۆم پرسـیاری لێنەکەم، ئیتر چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لەناو کۆمەڵێ خەڵکدا دانیشتبوو وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ): چـی دەفـەرموویت لـەبارەی پیاوێکـەوە لـەناو جێگـەدا

پیاوێکی تر لەگەڵ ژنەکەیدا ببینێ؟ ئایا بیکوژێ و ئێوەش بیکوژنەوە، یان چی بکات باشە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لەبارەی تۆو هاوسەرەکەتەوە ئایەت هاتۆتە خوارەوە، برۆ بیهێنە" (سهل) دەڵێ: (عویمر) و هاوسەرەکەی لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بەرنامەی (لعان)یان ئەنجامدا، منیش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دانیشتبوم، کاتێ لێبونەوە (عویمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر بیهێنمەوە مانای وایە بۆختانم بۆ کردووە، بۆیە پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان بدات، (عویمر) سێبەسێ تەڵاقیدا. (أبن شهاب) دەڵێ: ئیتر ئەوە بووە بەرنامەی (لعان) لەبەینی ژن و مێردا.

٤٦٥ـ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلَاعِنَيْنِ فِي إِمْرَةِ مُصْعَبٍ: أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا. **(قَالَ):** فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ، فَمَضَيْتُ إِلَى مَنْزِلِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ لِلْغُلَامِ: اسْتَأْذِنْ لِي، قَالَ: إِنَّهُ قَائِلٌ، فَسَمِعَ صَوْتِي، قَالَ: ابْنُ جُبَيْرٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: ادْخُلْ، فَوَاللَّهِ مَا جَاءَ بِكَ هَذِهِ السَّاعَةَ إِلَّا حَاجَةٌ، فَدَخَلْتُ، فَإِذَا هُوَ مُفْتَرِشٌ بَرْذَعَةً، مُتَوَسِّدٌ وِسَادَةً حَشْوُهَا لِيفٌ، قُلْتُ: أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْمُتَلَاعِنَانِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! نَعَمْ، إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ أَنْ لَوْ وَجَدَ أَحَدُنَا امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ، كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ تَكَلَّمَ تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ. قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَلَمْ يُجِبْهُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ الَّذِي سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدِ ابْتُلِيتُ بِهِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ فِي سُورَةِ النُّورِ: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ) فَتَلَاهُنَّ عَلَيْهِ، وَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ، وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، قَالَ: لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا. ثُمَّ دَعَاهَا فَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا. وَأَخْبَرَهَا أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الْآخِرَةِ، قَالَتْ: لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ. فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ. ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. **(بخاري/ الطلاق/ ٥٠٠٥– ٥٠٠٩)**

(سعيد كوڕی جبير) دەڵێ: لەکاتێکدا کە (مصعب) میر بوو پرسیارم لێکرا دەربارەی ئەو پیاوو ژنەی کە (لعّان) دەکەن، ئایا جیا دەکرێنەوە لەیەك؟ نەم دەزانی چ وەڵامێك بدەمەوە. چووم بۆ ماڵی (أبن عمر) (رضي الله عنه) لە مەککە و

بەخزمەتکارەکەیم وت: مۆڵەتم بۆ وەربگرە، وتی: خەوتووەوە، (أبن عمر) لە ژوورەوە گوێی لەدەنگم بوو، وتی: ئەوە (ابن جبیر)ە؟ وتم: بەڵێ، وتی: وەرە ژوورەوە، سوێندبێ لەم کاتەدا پێویستیەك تۆی هێناوە.. (سعید) دەڵێ: چوومە ژوورەوە، لەسەر سەرجلی ولاغێك دانیشتبوو، پشتیەکی پڕ لە ریشووی دارخورمای لەژێر شاندابوو.. وتم: (أبو عبدالرحمن) ئایا ژن و پیاوێك (لعان) چوو بە بەینیاندا جیا دەکرێنەوە؟ وتی: (سبحان الله) بەڵێ، لەڕاستیشدا یەکەم کەسیش ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) فلانی کوڕی فلان بوو پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): تۆچی دەفەرموویت ئەگەر یەکێکمان ژنەکەی خۆی لەحاڵەتی فاحیشەدا بینی چی بکات؟ ئەگەر قسە دەکات باس لە شتێکی زۆر گەورە دەکات، ئەگەر بێدەنگیش بێت لە شتێکی گەورە بێدەنگ بووە. پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو، وەلامی نەدایەوە.

دوای ئەوەی بابای (پرسیارکەر) هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و عەرزی کرد: قوربان ئەو پرسیارەی کە پێشتر عەرزم کردی تووشی خۆم بووە، ئیتر خوای گەورە ئەم چەند ئایەتەی لەسورەتی (النور) ناردەخوارەوە (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ..) پێغەمبەر (ﷺ) ئایەتەکانی بەسەردا خوێندەوە، ترسی خودا و باسی قیامەتی بیر خستەوە، پێشی فەرموو: "کەسزای دنیا گەلێك سوکترە لە سزای قیامەت" کابرا وتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردووە، بوختانم بۆ نەکردووە. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەرەکەشی بانگکرد، بەهەمان شێوە ترسی خودا و باسی قیامەتی بیر خستەوە، بەویشی فەرموو: "سزای دنیا گەلێ سوکترە لە سزای قیامەت". ژنەکە وتی: نەخێر، سوێندم بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە، ئەو پیاوەم درۆ دەکات. ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەکابراوە دەستی پێکرد، ئەویش چوار جار سوێندی خواردکە خۆی لەڕاستگۆیانە، لەسوێندی پێنجەمیشدا وتی: نەفرەتی خوام لێبێ ئەگەر درۆزن بم. پاشان ژنەکە چوار جار سوێندی خوارد. کە پیاوەکەی لە درۆزنانە، لەسوێندی پێنجەمیشدا وتی: خەشم و قینی خوام لەسەربێت ئەگەر ئەو مێردەم لەڕاستگۆیان بێت. ئیتر پاش ئەم سوێند و نەفرەتە جیایکردنەوە لەیەك.

**٤٦٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا لَاعَنَ امْرَأَتَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَهُماءأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِأُمِّهِ. (بخاري/ الطلاق/ ٥٠٠٥– ٥٠٠٩)**

(أبـن عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: لەسـەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) پیاوێـك (لعـان)ی كـرد لەگـەڵ ژنەكـەی، پێغەمبـەریش (ﷺ) لەیـەكتر جیـای كردنـەوە و منداڵەكەشـی دابـە دایكی.

## ( ٢ ) منداڵ و ڕەچەڵەك

٤٦٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): "هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "مَا أَلْوَانُهَا". قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: "فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَأَنَّى هُوَ". قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): "وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ". **(بخاري/ الطلاق/ ٤٩٩٩)**

(أبو هريـرە)(ﷺ) دەڵـێ: كابرایـەكی دەشـتەكی هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنەكەم منداڵێكی ڕەش پێستی بووە، منیش حاشام لێكردووە كە منداڵی من بێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئایا تۆ گەلە وشـترت هەیە؟" وتی: بەڵێ. فەرمووی: "ڕەنگەكانیان چییەو چۆنە؟" كـابرا وتـی: سـورن، فەرمووی: "ئایا ڕەنـگ خۆڵەمێشـیان تیایە؟" كـابرا وتـی: بـەڵێ، پێغەمبـەری خـوا فەرمووی: "بۆچی وایە؟" كابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لەوانەیـە لـە ڕەچـەڵەكی (باوانێكـەوە) هاتبـێ. پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "لەوانەیـە ئەمـەش لەڕەچـەڵەكی باوانێكیەوە هاتبێ".

## ( ٣ ) منداڵ هی ناوجێیە

٤٦٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلَامٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هَذَا -يَا رَسُولَ اللَّهِ- ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ. فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى شَبَهِهِ فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ. فَقَالَ: "هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ". قَالَتْ: فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ. **(بخاري/ البيوع/ ٢١٠٥)**

(عائشـة)(ﷺ) دەڵـێ: جارێكیـان (سـعد ی كـوڕی أبـی وقـاص و عەبـدی كـوڕی زەمعە) لەبارەی منداڵێكەوە بوو بە مشت ومڕیان، (سعد) وتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەم منداڵە برازامە، منداڵی (عتبە)ی كوڕی (ابی وقاص)ە، وەسیەتی بۆ كردووم،

کەلای من دایناوە، وتویەتی: ئەمە کوڕمە. سەیری شێوەی بفەرموو. (عبد)ی کوڕی (زمعە)ش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕە برای منە، لەباوکی خۆمە، (بەلاَم دایکمان جیایە) ئەو لە کەنیزەکەکەیەتی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەیرێکی منالەکەی کرد، بینی بەئاشکرا لە (عتبە) دەچێ، فەرمووی: "عبد ئەم منالە هی تۆیە، چونکە منالَ ڕۆڵەی تێکەڵی باوك و دایکە. مرۆڤی داوێن پیسیش جگە لە پەشیمانی و ڕەنج خەساری هیچی تری دیکەی دەست ناکەوێ" ئینجا بە (سودە)ی کچی (زمعە)ی فەرموو: "سودە! ئیتر تۆ نامەحرەمی بەو کوڕە"، ئیتر ئەو کوڕە (سودە)ی نەدەبینی.

## (٤) وەرگرتنی قسەی ڕەچەڵەك ناس بۆ ناسینی منالّ

٤٦٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا، فَقَالَ: "يَا عَائِشَةُ، أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ، فَرَأَى أُسَامَةَ وزَيْدًا وعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ، قَدْ غَطَّيَا رُ ووسَهُماءبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: "إِنَّ هَذِهِ الْأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ". **(بخاري/ الفرائض/ ٦٣٨٩)**

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دڵخۆشییەوە تەشریفی هاتە ژوورەوە بۆلام، فەرمووی: "ئەی (عائشە)، ئەرێ نەتبینی (مجزِّز)ی (مدلجی) هاتەلام. کە هاتە ژوورەوە (أسامە) و (زید)ی لەژێریەك بەتانی قەیفەدا بینی، سەریان داپۆشیبوو تەنها قاچیان دیار بوو، وتی: ئەم قاچانە لەیەك ئەچن.

# بەشی هەژدەیەم: شیردان

## (١) ئەوەی لە ڕێی لەدایکبوونەوە حەرامە

**٤٧٠–عن عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ عِنْدَهَا، وإِنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِ حَفْصَةَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِي بَيْتِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أُرَاهُ فُلَانًا" لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: (قلت): يَا رَسُولَ اللَّه لَوْ كَانَ فُلَانٌ حَيًّا –لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ– دَخَلَ عَلَيَّ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) "نَعَمْ، إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلَادَةُ". (بخاري/ الشهادات/ ٢٥٠٣)**

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلای بووە، عائشە گوێی لە دەنگی پیاوێک بوو، مۆڵەتی دەخواست بۆ ماڵەکەی (حفصە). (عائشە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوە پیاوێکە مۆڵەت دەخوازێ بۆ هاتنە ژوورەوەی ماڵەکەت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "وابزانم فلان کەسە" مەبەستی مامی شیری حفصە بوو. (عائشە)(رضي الله عنها) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر فلان کەس زیندوو بوایە، –کەمامی شیری بووە– مەحرەم بوو بەمن؟ ئەیتوانی بێتە ماڵم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڵێ هەرچی لەڕێگەی لەدایك بوونەوە ببێتە مەحرەم، بەشیرخواردنیش دەبێتە مەحرەم".

## (٢) کاریگەریی شیردان

**٤٧١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: جاء عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْمِرَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، فَلَمَّا جاء رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قُلْتُ: إِنَّ عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) "فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ عَمُّكِ". قُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ؟ قَالَ: "إِنَّهُ عَمُّكِ، فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ". (بخاري/ النكاح/ ٤٩٤١)**

(عائشە)(رضي الله عنها) دەڵێ: مامە شیریەکەم هات و مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست. منیش ڕێگەم نەدا تا پرسیار بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەم، کە پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنا، وتم: مامی شیریم مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی خواست، منیش ڕێگەم نەدا، پێغەمبەر فەرمووی: ڕێگەی بدە، با مامت بێتە ژورەوە بۆلات". وتم: خۆمن ژنەکەی شیری پێداوم، نەك پیاوەکە، فەرمووی: "ئەوە مامی تۆیە بابێتە ژوورەوە".

### (٣) حەرامبونی زڕکچ و ژن خوشك

٤٧٢ـ عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ (ﷺ) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ لَكَ فِي أُخْتِي بِنْتِ أَبِي سُفْيَانَ؟ فَقَالَ: "أَفْعَلُ مَاذَا". قُلْتُ: تَنْكِحُهَا، قَالَ: "أَوَ تُحِبِّينَ ذَلِكِ". قُلْتُ: لَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وأَحَبُّ مَنْ شَرِكَنِي فِي الْخَيْرِ أُخْتِي، قَالَ: "فَإِنَّهَا لَا تَحِلُّ لِي". قُلْتُ: فَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّكَ تَخْطُبُ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. قَالَ: "بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ". قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: "لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حِجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وأَبَاهَا ثُوَيْبَةُ، فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ ولَا أَخَوَاتِكُنَّ".
**(بخاري/ النكاح/ ٤٨١٧)**

(أم حبيبه)ی کچی (أبو سفيان) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلام، پێم وت: ڕات چۆنە بەرامبەر بە خوشکەکەم، کچی (أبو سفيان)؟ فەرمووی: "چی بکەم؟" وتم: بیخوازیت. فەرمووی: "تۆ پێت خۆشە؟" وتم: خۆ بەتەنها من هاوسەرت نیم، خۆشەویسترین کەس کە حەز بکەم لەم خێرەدا بەشداربێت، خوشکەکەمە، فەرمووی: "ئەو بۆمن حەڵاڵ نییە". وتم: من هەواڵم پێگەیشتووە کە تۆ دەتەوێ (درة)ی کچی (أبو سلمه) بخوازیت. فەرمووی: "کچی (أم سلمه)؟" وتم: بەڵێ، فەرمووی: "جا ئەو زڕ کچیشم نەبوایە کە دایکی حەڵاڵی خۆمە هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو، چونکە ئەو برازای شیریمە. (ثويبة)شیری داوە بەمن و باوکی، هیچ کامێکتان باسی کچ و خوشکی خۆتانم لەوبارەیەوە بۆ مەکەن".

# بەشی نۆزدەیەم: خەرجییەکان (النفقات)

## (١) لەخۆوە دەسپێکردن و پاشان خێزان و خزمان

٤٧٣ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي عُذْرَةَ عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ". فَقَالَ: لَا، فَقَالَ: "مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّي". فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْعَدَوِيُّ بِثَمَانِ مِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا، فَإِنْ فَضَلَ شيء فَلِأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شيء فَلِذِي قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِي قَرَابَتِكَ شيء فَهَكَذَا وهَكَذَا". يَقُولُ: فَبَيْنَ يَدَيْكَ، وعَنْ يَمِينِكَ، وعَنْ شِمالك. **(بخاري/ البيوع/ ٢٠٣٤)**

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: کابرایەکی خێڵی (بني عذرة) بەمەرجی دوای مردنی خۆی، کۆیلەیەکی ئازاد کرد، هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەکابرا: "تۆ ماڵی ترت هەیە؟" کابرا وتی: نەخێر، هەر ئەو کۆیلەیەم هەیە، جا فەرمووی: "کێ لێم دەکڕێتەوە؟" (نُعیم ی کوڕی عبدالله ی عدوی) بە هەشت سەد درهەم کڕییەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پارەکەی دایە دەست پیاوەکە و فەرمووی: "لەخۆتەوە دەست پێبکە و چاکە لەگەڵ خۆتدا بکەو، ئەگەر شتێك زیاد بوو بیدە بە ژن و منداڵەکەت، چی لەوانیش زیادبوو بیدە بە خزمانت، چی لەوانیش زیاد بوو ئاوا و ئاوا بیبەخشە".

ڕاوی دەڵێ: مەبەستی لای ڕاست و و چەپی بوو.

## (٢) چاکەی خەرجیکێشانی ژن و منداڵ

٤٧٤ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا أَنْفَقَ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةً –وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا– كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً". **(بخاري/ النفقات/ ٥٠٣٦)**

(أبـو مسعودی بـدری)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "ئەگـەر موسڵمان خەرجیەك بۆ خێزانەکەی بکێشێ (هەرچەند واجبە لەسەری) بەڵام ئەگەر –مەبەستی ڕەزامەندی خوابێ– بەخێر بۆی دەنوسرێ".

## (٣) ژن بۆی هەیە لە سامانی مێردەکەی بۆ منداڵەکانی خەرج بکات

٤٧٥ ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: جاءتْ هِنْدٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، واللَّهِ مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَهْلُ خِبَا و أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يُذِلَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ،

ومَا عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ أَهْلُ خِبَا و أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يُعِزَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "وَأَيْضًا، والَّذِي نَفْسِي بِيَدِه". ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مُمْسِكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى عِيَالِه مِنْ مَالِه بِغَيْرِ إِذْنِه؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "لَا حَرَجَ عَلَيْكِ أَنْ تُنْفِقِي عَلَيْهِمْ بِالْمَعْرُوفِ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٣١)

(عائشه) (رضي الله عنها) دەڵێ: (هند) هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا لەسەر زەوی خوادا بنەماڵەیەك نەبوە پێمان خۆشبێ خوا توشی نەهامەتی بكات زیاتر لە بنەماڵەكەی تۆ. ئێستاش هیچ بنەماڵەیەك نییە لەسەر زەوی زیاتر لە بنەماڵەكەی تۆ حەز بەسەربەرزی بكەین بۆی. پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی: "سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، منیش هەروەها". پاشان (هند) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (أبو سفيان) پیاوێكی چروكە، ئایا گوناهم دەگات ئەگەر بەبێ ئیزنی ئەو لەماڵەكەی خەرجی منداڵەكان بكێشم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "گوناهبار نابیت ئەگەر بەخێویان بكەیت بەپێی پێویست و بەچاكی (واتە بێ لە سنور دەرچوون).

## (٤) ژنی سێبەسێ تەڵاق دراو، خەرجی لەسەر ناكرێ

٤٧٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّهَا قَالَتْ: مَا لِفَاطِمَةَ خَيْرٌ أَنْ تَذْكُرَ هَذَا. تَعْنِي قَوْلَهَا: لَا سُكْنَى ولَا نَفَقَةَ. (بخاري/ الطلاق/ ٥٠١٥ـ ٥٠١٧)

(عائشه)(رضي الله عنها) دەڵێ: (فاطمة) هیچ بەرژەوەندیەكی نەبوو لە باسكردنی ئەو فەرموودەیەدا كە نەجێگای پێدەدرێ و نە خەرجی.

# بەشی بیستەم: کڕین و فرۆشتن

## (١) ڕێگریی لە فرۆشتنی خۆراك پێش وەرگرتنی

٤٧٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ". قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وأَحْسِبُ كُلَّ شيءٍ مِثْلَهُ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٢٩)

(ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "هەرکەسێك خۆراکێکی کڕی تا وەرینەگرێت نەیفرۆشێتەوە" (ابن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێم وایە هەموو مامەڵەیەك دەبێ بەمشێوەیە بێت.

## (٢) گواستنەوەی خۆراك ئەگەر بە گۆترە فرۆشرا

٤٧٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "مَنِ اشْتَرَى طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ". قَالَ: وكُنَّا نَشْتَرِي الطَّعَامَ مِنَ الرُّكْبَانِ جِزَافًا، فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نَبِيعَهُ حَتَّى نَنْقُلَهُ مِنْ مَكَانِهِ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠١٧)

(أبن عمر)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "هەرکەسێ خۆراکێ بکڕێت با نەیفرۆشێتەوە هەتاکو وەری دەگرێت" (راوی) دەڵێ: ئێمە خۆراکمان دەکڕی لەکاروانچیەکان بەگۆترە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردین کە بیفرۆشینەوە تا نەیگوێزینەوە لە شوێنەکەی خۆی.

## (٣) فرۆشتنی خۆراکی پێوانەکراو بە گۆترە

**٤٧٩**–عَن ابن عُمَر (رضي الله عنه) قَالَ: نَهَى نَهَى رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم) عَنِ المُزابَنَة : أن يَبِيعَ ثَمَرُ حَائطه اِنْ كَانَتْ نَخَلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وانْ كَانَ كَرماً أَنْ يُبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيلاً ، وانْ كَانَ زَرْعَاً أَنْ يُبِعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ ، نَهى عَنْ ذَلكَ كُلَّهُ.(بخاري/ البيوع/ ٢٠٦٣)

(ابن عمر)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرین و فرۆشتنی (مزابنە)ی قەدەغە کردوە (بۆ نمونە) ئەگەر بەروبومی باخەکەی خورما بوو، بیفرۆشێت بە خورمای وشکی پێوراو، ئەگەر باخەکە ترێ بوو بیفرۆشێ بە مێوژ بە پێوراوی یان کشتوکاڵ بوو بیفرۆشێ بە خۆراك بە پێوانە. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری لە هەموو ئەمانە کردووە مزابنە: کرینی بەروبووم پێش ئەوەی پێ بگات بە دارەکەوە).

## ( ٣ ) فرۆشتنی خورما بە خورما وەکو یەك

٤٨٠ـ عن أبي هُرَيْرَةَ وأبي سَعيدٍ (رضي الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) بَعَثَ أَخَا بَنِي عَدِيٍّ الْأَنْصَارِيَّ فَاسْتَعْمَلَهُ عَلَى خَيْبَرَ، فَقَدِمَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا". قَالَ: لَا واللَّه يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّا لَنَشْتَرِي الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ مِنَ الْجَمْعِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تَفْعَلُوا، ولَكِنْ مِثْلًا بِمِثْلٍ، أَوْ بِيعُوا هَذَا واشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هَذَا، وكَذَلِكَ الْمِيزَانُ". (بخاري/ البيوع/ ٢٠٨٩)

(أبـو هريـره) و (أبـو سـعيد) (رضي الله عنهما) دەڵـێن: پێغەمبـەر (ﷺ) براکـەی (بـنی عـدی الانصاری) ناردو کردیە میری خەیبەر، بەخورمایـەکی باشـەوە هاتـەوە، پێغەمبـەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: "ئەرێ هەموو خورمای خەیبەر بەم شـێوەیە جوانـە؟ وتـی: نەخێر، ئەی پێغەمبـەری خـوا، ئێمـە یـەك مـەن لـەم خورمایـە بـە دوو مـەنی خـراپ دەکڕین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "شتی وەها مەکەن، خورما بە خورما لە جـۆری خۆی بگۆڕنەوە یان ئەمەیان بفرۆشن و بـە نرخەکـەی لـەو جـۆرەی تریـان بکڕنـەوە، کێشانەش هەر بەو شێوەیە دەبێت".

## ( ٤ ) بەروبوم نافرۆشرێت هەتـا پێدەگات

٤٨١ـ عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: نَهَى –أَوْ نَهَانَا– رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَطِيبَ. (بخاري/ الزكاة/ ١٤١٦)

(جـابر)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێگـری کـردووە –یـان ڕێگـری لێکردوین– لە فرۆشتنی بەروبووم تا تەواو پێنەگات.

٤٨٢ـ عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ؟ فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَأْكُلَ مِنْهُ، أَوْ يُؤْكَلَ، وحَتَّى يُوزَنَ. قَالَ: فَقُلْتُ: مَا يُوزَنُ؟ فَقَالَ رَجُلٌ عِنْدَهُ: حَتَّى يُحْزَرَ. (بخاري/ السلم/ ٢١٣٠)

(أبو البحتری) دەڵێ: لەبارەی فرۆشتنی خورماوە پرسیارم لە (ابن عبـاس) کـرد وتـی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فرۆشـتنی خورمـای قەدەغـەکرد هـەتا ئەوکاتـەی پێدەگات، لێی دەخوات، یان لێی دەخورێت و کێشـانە دەکرێت، وتم: چـی کێشـانە بکرێت؟! پیاوێك کەلەلای بوو وتی: واتە هەتا نەخەملێنرێت.

## ( ٥ ) ڕێگریی لە فرۆشتنی بەروبووم هەتـا پێدەگات

٤٨٣ –عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ، وعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ ويَأْمَنَ الْعَاهَةَ، نَهَى الْبَائِعَ والْمُشْتَرِيَ. (بخاري/ السلم/ ٢١٣١)

(أبـن عبـاس)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ڕێگـەی نـەداوە خورمـا بفرۆشـرێت هەتاکو سووورباو یان زەردباو نەبێت، هەروەها فرۆشتنی گوڵەگەنم تا سپی دەبێتەوە و لەدەرد ڕزگاری دەبێ، ڕێگری کردووە لە فرۆشیار و کڕیار.

## ( ٦ ) سەوداگەریی –المزابنة-

**٤٨٤–عن بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ: أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ وسَهْلَ بْنَ أَبِي حَثْمَةَ حَدَّثَاهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ: الثَّمَرِ بِالتَّمْرِ، إِلَّا أَصْحَابَ الْعَرَايَا فَإِنَّهُ قَدْ أَذِنَ لَهُم. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٧٩)**

(بشـیر کـوڕی یسـار) کـە خزمـەتگوزاری (بـني حارثـة)یـە دەڵـێ: (ڕافـع) کـوڕی (خدیج) و(سهل)ی کوڕی (أبو حثمـة) پێیـان وتـووە: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ڕێگـری کردووە لە کڕین و فرۆشتنی جۆری (مزابنة) واتە بەروبوم بە خورمای وشك، مەگەر ئەوانەی مامەڵەی (عرایا) دەکەن، بۆ ئەوانە مۆڵەتی داوە.

(عرایـا: ئـەو مامەڵەیەیـە کـە لەسـنووری (٥) (وسـق)دا دەکرێـت واتـە (٧٠٠کغـم) ئەمەیش لەبەر دابینکردنی پێویستی خواردنی ماڵ و منداڵ بۆ ماوەی ساڵێك).

## ( ٧ ) فرۆشتنی بەروبووم بە خورما بە پێی کێشانەی خۆی

**٤٨٥–عن زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَخَّصَ فِي الْعَرِيَّةِ، يَأْخُذُهَا أَهْلُ الْبَيْتِ بِخَرْصِهَا تَمْرًا، يَأْكُلُونَهَا رُطَبًا. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٧٢)**

(زیدی کوڕی ثابت)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی داوە مامەڵەی (العریـة)، ئەویش ئەوەیە خێزانێك خورمای تەڕ وەردەگرن و دەیخەملێنن بە خورمای وشك، بۆ ئەوەی بە تەڕی بیخۆن.

## ( ٨ ) دەربارەی ئەندازەی دروستیی مامەڵە لە جۆری ( العرایا )

**٤٨٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا، بِخَرْصِهَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ، أَوْ: فِي خَمْسَةِ. يَشُكُّ دَاوُدُ: قَالَ خَمْسَةٌ أَوْ دُونَ خَمْسَةٍ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٧٨)**

(أبو هریره) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتیدا لە مامەڵەی (عرایا)، لەوەی کەوا لە پێنج وسق (واتە ٧٠٠ کغم) زیاتر نەبێت.

## ( ٩ ) ئەو كەسەی باخە خورمای بەردار بفرۆشێت

٤٨٧–عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَنِ ابْتَاعَ نَخْلًا بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا لِلَّذِي بَاعَهَا، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ. وَمَنِ ابْتَاعَ عَبْدًا فَمَالُهُ لِلَّذِي بَاعَهُ، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ". **(بخاري/ البيوع/ ٢٠٩٠)**

(عبدالله ی كوڕی عمر) (ﷺ) دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: "ئەو كەسەی باخە خورمایەك بكڕێت دوای پێوانەكردنی، ئەوە بەروبوومەكەی بۆ ئەو كەسەیە كە فرۆشتویەتی، مەگەر كڕیار بەمەرجی گرتبێت.. هەركەسێكیش بەندەیەك بكڕێ ماڵەكەی بۆ ئەو كەسەیە كە فرۆشتویەتی، مەگەر كڕیار بەمەرجی گرتبێت".

## ( ١٠ ) مامەڵەی ( مخابرة ) و ( محاقلة )

٤٨٨ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ الْمَكِّيُّ، وهُوَ جَالِسٌ عِنْدَ عطاء بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُخَابَرَةِ، وَأَنْ تُشْتَرَى النَّخْلُ حَتَّى تُشْقِهَ، وَالْإِشْقَاهُ: أَنْ يَحْمَرَّ أَوْ يَصْفَرَّ أَوْ يُؤْكَلَ مِنْهُ شَيءٌ، وَالْمُحَاقَلَةُ: أَنْ يُبَاعَ الْحَقْلُ بِكَيْلٍ مِنَ الطَّعَامِ مَعْلُومٍ، وَالْمُزَابَنَةُ: أَنْ يُبَاعَ النَّخْلُ بِأَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَالْمُخَابَرَةُ: الثُّلُثُ وَالرُّبُعُ وَأَشْبَاهُ ذَلِكَ. قَالَ زَيْدٌ: قُلْتُ لعطاء بْنِ أَبِي رَبَاحٍ: أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَذْكُرُ هَذَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: نَعَمْ. **(بخاري/ المساقاة (الشرب)/ ٢٢٥٢)**

(زیدی كوڕی أبی أنیسه) دەڵێ: (أبو ولید المكی) لەكاتێكدا كە لەلای (عطاء)ی كوڕی (أبو رباح) دانیشتبوو لە (جابری كوڕی عبدالله)وە (ﷺ) بۆی گێڕاینەوە: پێغەمبەر (ﷺ) كڕین و فرۆشتنی (محاقلة) و(مزابنة) و (مخابرة)ی قەدەغەكرد. هەروەها ڕێگەی نەداوە خورما بكڕێت هەتا سووربا‌و یان زەردباو دەبێت، یان لێی دەخورێت.

(محاقلة): كێڵگە فرۆشتنە بە خۆراكێكی دیاری كراو (مزابنة) فرۆشتنی دارخورمایە بە چەند ویسقێك لە خورمای وشك. (مخابرة) بریتییە لەڕێژەی سێیەك و چواریەك و شتی لەو جۆرە، (زید) دەڵێ: بە (عطاء) ی كوڕی (رباح)م وت: گوێت لێبوو كە (جابر) بڵێت: ئەم فەرموودەیەم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەرگرتووە؟! وتی: بەڵێ.

## ( ١١ ) شتێك گۆشتی حەرام فرۆشتنی حەرامە

**٤٨٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: بَلَغَ عُمَرَ أَنَّ سَمُرَةَ (ﷺ) بَاعَ خَمْرًا، فَقَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ سَمُرَةَ، أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ، حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ، فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا". (بخاري/ البيوع/ ٢١١٠)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: هەواڵ گەیشت بە (عمر) (ﷺ) کە (سمرة)(ﷺ) عەرەقی فرۆشتووە، (عمر)(ﷺ) وتی: خوا(سمرە) بکوژێت، ئەی نازانێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خوا نەفرەتی کردووە لە جولەکە، کاتێ کە پیویان لەسەر حەرام کرابوو، دەچوون دەیانتوانەوە و دەیانفرۆشت".

## ( ١٢ ) حەرامکردنی مردارەوە بوو و بت و بەراز

**٤٩٠–مَكَّةَ: "إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالْأَصْنَامِ". فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: "لَا، هُوَ حَرَامٌ". ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عِنْدَ ذَلِكَ: "قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا أَجْمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ". (بخاري/ البيوع/ ٢١٢١)**

(جابری کوڕی عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ساڵی ڕزگارکردنی مەککە، لەناو مەککەدا فەرمووی: "خوداو پێغەمبەرەکەی مەی و مردارەوەبوو بەراز و بتیان حەرامکردوە" وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕات چییە لەبارەی پیوی مردارەوە بوو، دیواری کەشتی پێ سواغ دەدرێت و، پێستەی پێ چەور دەکرێت و،خەڵکی بەکاری دێنن بۆ چرا؟ فەرمووی: "نەخێر ئەوە حەرامە". پاشان لەوێدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خوا جولەکەکان بکوژێت، لەکاتێکدا خوای گەورە پیوی مردارەوەبووی لێ حەرام کردبوون، ئەوان دەیانتوانەوە و دەیانفرۆشت وپارەکەیان دەخوارد".

## ( ٩ ) قەدەغەکردنی نرخی سەگ و کرێی ئافرەتی داوێن پیس و فاڵچی

**٤٩١ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ. (بخاري/ البيوع/ ٢١٢٢)**

(أبو مسعود الانصاری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) نرخی سەگ و کرێی ئافرەتی داوێن پیس و کرێی فاڵچی و کتێب گرەوەی قەدەغە کردوە.

## (١٠) حەڵاڵكردنی كرێی كەڵەشاخگر

**٤٩٢- ابن عباس (رضي الله عنه) قال "حجم النبى (ﷺ)عبد لبنى بياضة، فأعطاه النبى (ﷺ) أَجْرَهُ، وكَلَّمَ سَيِّدَهُ فَخَفَّفَ عَنْهُ مِنْ ضَرِيبَتِهِ، ولَوْ كَانَ سُحْتًا لَمْ يُعْطِهِ النَّبِيُّ (ﷺ). (بخاري/ البيوع/ ١٩٩٧)**

(أبن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: كۆیلەیەك لە (هۆزی بني بياضة) كەڵەشاخێكی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) گرت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرێی داپێی، قسەی لەگەڵ گەورەكەشی داكرد و باجەكەی لەسەر كەم كردەوە، خۆ ئەگەر ئەوە حەرامبووایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیدەدا پێی.

**٤٩٣ـ عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه) عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ، فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وكَلَّمَ أَهْلَهُ فَوَضَعُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ، وقَالَ: "إِنَّ أَفْضَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ. أَوْ: هُوَ مِنْ أَمْثَلِ دَوَائِكُمْ". (بخاري/ البيوع/ ١٩٩٦)**

(حميد) دەڵێ: (أنس كوڕی مالك) (رضي الله عنه) پرسیاری لێكرا لەبارەی دەستكەوتی كەڵەشاخگرەوە، وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەڵەشاخی گرتووە (أبو طيبة) كەڵەشاخی بۆ گرت، فەرمانیدا دوومەن خۆراكیان پێدا، قسەی لەگەڵ خاوەنەكەشی كرد باجەكەیان لەسەر سوك كرد، پاشان فەرمووی: "كەڵەشاخگرتن باشترین دەرمانە خۆتانی پێ چارەسەر بكەن، یان فەرمووی: باشترین داوو دەرمانی ئێوەیە".

## (١٠) قەدەغەكردنی فرۆشتنی سكی سك

**٤٩٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ (أَهْلُ) الْجَاهِلِيَّةِ يَتَبَايَعُونَ لَحْمَ الْجَزُورِ إِلَى حَبَلِ الْحَبَلَةِ: وحَبَلُ الْحَبَلَةِ أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ، ثُمَّ تَحْمِلَ الَّتِي نُتِجَتْ، فَنَهَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ ذَلِكَ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٣٦)**

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: خەڵكی لەسەردەمی نەفامیدا گۆشتی وشتری سەربڕاویان دەفرۆشت، بۆ ئەوكاتەی ئەو سكە سكی دەبێ (واتە بۆ ئەو كاتەی وشترەكە سكەكەی دادەنێ و سكەكەشی گەورە دەبێ و سكی دەبێ). پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی ئەوەی لێكردن.

## ( ١١ ) قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنی ( ملامسه ) و ( منابذة )

**٤٩٥ـ عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (ﷺ) قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ بَيْعَتَيْنِ ولِبْسَتَيْنِ، نَهَى عَنِ الْمُلَامَسَةِ والْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ، والْمُلَامَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الْآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، ولَا يَقْلِبُهُ إِلَّا بِذَلِكَ. والْمُنَابَذَةُ: أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، ويَنْبِذَ الْآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، ويَكُونُ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا، مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ ولَا تَرَاضٍ. (بخاري/ اللباس/ ٥٤٨٢)**

(أبو سعيدی خدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێکردین لەدوو جۆر مامەڵە و دوو جۆر پۆشین. کە بریتی بوون لە (ملامسة) و (منابذة).

(ملامسة: ئەوەیە کە کەسێك بەڕۆژ یان بەشەو دەست بدا لە پۆشاکی کەسێکی ترو دەست لێدانەکەی لەجێی کڕین بێت و بۆی نەبێت تەماشای بکات).

(منابذة: ئەوەیە کە دوو کەس هەریەك جلی خۆی فڕی بدا بۆ ئەوی تر، ئەو فڕێدانە لەجێی فرۆشتن بێت وبواری تەماشاکردن و ڕەزامەندی تیا نەبێت).

## ( ١١ ) قەدەغەکردنی زەمکاریی بە نیازی فێڵ

**٤٩٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنِ النَّجْشِ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٣٥)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردوە لە زەمکاری بە نیازی فێڵ (ئەویش ئەوەیە کەسێکی تر بێ ئەوەی نیازی کڕینی شمەکێکی هەبێ زەم بکات و نرخی شمەکەکە بەرز بکاتەوە بۆ چەواشەکردنی کڕیار).

## ( ١٢ ) پێویستە شارنشین شت بە لادێ نشین نەفرۆشێت

**٤٩٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ تُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ، وأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ. قَالَ (طاوس): فَقُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لَا يَكُنْ لَهُ سِمْسَارًا. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٥٠)**

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە لە بەدەمەوە چوونی کاروان، هەروەها ڕێگری کردوە لەوەی کە شارنشینێك شت ومەك بفرۆشێت بە گوند نشینێك. (طاوس) دەڵێ: بە (ابن عباس)م وت مەبەست چییە لەمە؟ وتی: مەبەست ئەوەیە کە خۆی نەکا بە دەلاڵ و چاوساغی.

## ( ١٣ ) فرۆشتن بەخواستە

٤٩٨ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ فَكُلُّ واحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا وكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلك فَقَدْ وجَبَ الْبَيْعُ، وإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، ولَمْ يَتْرُكْ واحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ فَقَدْ وجَبَ الْبَيْعُ". (بخاري/ البيوع/ ٢٠٠٦)

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر دوو کەس کڕین و فرۆشتنیان کرد، هەردووکیان بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە هەتا جیا دەبنەوە، یان یەکێکیان بەوی تریان بڵێ من ڕازیم و تۆیش کەیفی خۆتە، ئەگەر بەرامبەرەکەشی وتی: منیش ڕازیم ئیتر ئەو مامەڵەیە گرێبەند بووە، ئەگەر دوای ئەو مامەڵە هیچ لایەکیان پەشیمان نەبونەوە، جیا بونەوە ئەوە مامەڵەکە دامەزراوە".

## ( ١٤ ) ڕاستگۆیی لە کڕین و فرۆشتن دا

٤٩٩ـ عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وإِنْ كَذَبَا وكَتَمَا مُحِقَ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا". (بخاري/ البيوع/ ١٩٧٣)

(حکیم) کوڕی (حزام) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "کڕیارو فرۆشیار خواستیان ئازادە، پێش ئەوەی لەیەك جیا ببنەوە، جا ئەگەر لەگەڵ یەکتریدا ڕاستگۆبن و لەکەو عەیبەکان بۆ یەکتری ڕون بکەنەوە، بەرەکەت دەکەوێتە کڕین و فرۆشتنەکەیان، خۆ ئەگەر درۆیان لەگەڵ یەکتریدا کردو لەکەو عەیبەکانیان شاردەوە، ئەوا بەرەکەت لەسەر کڕین و فرۆشتنەکەیان نامێنێت.

## ( ١٥ ) کەسێك لەمامەڵەدا فێڵی لێبکرێت

٥٠٠ـ عن ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) قال: ذَكَرَ رَجُلٌ لِرَسُولِ (ﷺ) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): "مَنْ بَايَعْتَ فَقُلْ: لَا خِلَابَةَ". فَكَانَ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لَا خِيَابَةَ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠١١)

(ابن عمر)دەڵێ: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەدا (ﷺ) باسی ئەوەی کرد کە لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتندا دەیخەڵەتێنن، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "لەگەڵ هەر کەس مامەڵەت کرد بڵێ: "لاخلابة" واتا بۆت ڕەوانیە بمخەڵەتێنی ئیتر ئەو پیاوە

لەوەولا هەرکات مامەڵەی بکردایە لەبری ئەوەی بڵێ (لاخلابة) ئەیووت (لاخیابە) (چونکە زمانی تەواو نەبوو).

## ( ١٦ ) پارە گۆڕینەوە و فرۆشتنی پارەی زێڕ بە زیو

**٥٠١ـ عَنْ مَالك بْن أَوْسِ ابْنِ الْحَدَثَانِ أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَقُولُ: مَنْ يَصْطَرِفُ الدَّرَاهِمَ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّه، وهُوَ عنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، (ﷺ): أَرِنَا ذَهَبَكَ ثُمَّ ائْتِنَا، إِذَا جاء خَادِمُنَا نُعْطِكَ ورقَكَ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: كَلَّا واللَّه لَتُعْطِيَنَّهُ ورقَهُ أَوْ لَتَرُدَّنَّ إِلَيْهِ ذَهَبَهُ. فَإِنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "الْوَرِقُ بِالذَّهَبِ رِبًا إِلَّا هَا و وهَا و، والْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلَّا هَا و وهَا و، والشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلَّا هَا و وهَا و، والتمر بالتمر رِبًا إِلَّا هَا و وهَا و". (بخاري/ البيوع/ ٢٠٦٥)**

(مالك)ی کوڕی (أوس)ی کوڕی (الحدثان) دەڵێ: ڕۆژێ رووم کردە (بازاڕ) و ئەموت: کێ پارە دەگۆڕێتەوە؟ (طلحة)ی کوڕی (عبیدالله) کە لای (عمر)ی کوڕی (الخطاب)بوو (ﷺ) وتی: پارە زێڕەکەتمان پێنیشان بدە و پاشان وەرە بۆلامان هەرکات خزمەت کارەکەمان هاتەوە ئینجا زیوەکەت دەدەینێ. (عمر)ی کوڕی (الخطاب) وتی: ناسوێند بە خوا دەبێ یائێستا زیوەکەی بدەیتێ یا دەبێ زێڕەکەی بۆ بگێریتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "گۆڕینەوەی زیو بەزێڕ سووە مەگەر دەست بەدەست (لەیەك كات وشوێندا) و گۆڕینەوەی گەنم بە گەنم سووە مەگەر دەست بە دەست، گۆڕینەوەی جۆ بەجۆ سووە مەگەر دەست بە دەست، گۆڕینەوەی خورما بە خورما سووە مەگەر دەست بە دەست".

## ( ١٧ ) ڕێگریی لە فرۆشتنی زێڕ و زیو، بە قەرز

**٥٠٢ـ عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ قَالَ: بَاعَ شَرِيكٌ لي ورقًا بِنَسِيئَةٍ إِلَى الْمَوْسِمِ –أَوْ إِلَى الْحَجِّ– فَجاء إِلَيَّ فَأَخْبَرَنِي، فَقُلْتُ: هَذَا أَمْرٌ لَا يَصْلُحُ، قَالَ: قَدْ بِعْتُهُ فِي السُّوقِ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ، فَأَتَيْتُ الْبراء بْنَ عَازِبٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: قَدمَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ ونَحْنُ نَبِيعُ هَذَا الْبَيْعَ، فَقَالَ: "مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلَا بَأْسَ به، ومَا كَانَ نَسِيئَةً فَهُوَ رِبًا" وائْتِ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ تِجَارَةً مِنِّي. فَأَتَيْتُهُ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٧٢٤)**

(ابو منهال) دەڵێ: شەریکێکم هەبوو زیوێکی فرۆشت بە قەرز تا وەرزی حەج لە دوایدا هات بۆلام و ئەمەی بۆ گێڕامەوە منیش وتم: ئەمە کارێکی نەشیاوە، وتی:

لەبازاڕ فرۆشتوومە و کەسیش نکۆڵی لێنەکردووە منیش هاتم بۆلای (البراء)ی کوڕی (عازب) پرسیارم لێکرد ئەویش وتی: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەدینە ئێمە ئەم جۆرە سەودایەمان دەکرد فەرمووی: "ئەوەی دەست بە دەست بێت، قەیناکات بەڵام هەرچی بە دواخستن (قەرز) بێت ئەوە سووە"، بیشچۆ بۆلای زەیدی کوڕی (أرقم) چونکە ئەو بازرگانێکی گەورەترە لە من، منیش چووم بۆلای پرسیارم لێکردو ئەویش هەمان شێوەی پێ وتم.

## ( ۱۷ ) سوو لەدواخستندایە

**٥٠٣ـ عن عطاء بْنُ أَبِي رَبَاحٍ: أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ لَقِيَ ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) فَقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ قَوْلَكَ فِي الصَّرْفِ، أَشَيْئًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ (ﷺ) أَمْ شَيْئًا وجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَلَّا لَا أَقُولُ، أَمَّا رَسُولُ الله (ﷺ) فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِهِ، وأَمَّا كِتَابُ اللَّهِ فَلَا أَعْلَمُهُ، ولَكِنْ حَدَّثَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) قَالَ: "أَلَا إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ". (بخاري/ البيوع/ ٢٠٦٩)**

(عطاء)ی کوڕی (أبو رباح) دەڵێ: (أبو سعيد الخدري)(ﷺ) دەگات بە (أبن عباس)(ﷺ) پێی دەڵێ: ئایا خۆت دەزانی چی دەڵێی لە بارەی پارە گۆڕینەوە؟ (ئایا ئەم فتوایە کە دەیدەیت) شتێکە لە پێغەمبەری خوات بیستووە یا لەقورئاندا بینیوتە؟ (أبن عباس)یش دەڵێ: ناهەرگیز واناڵێم ئەوەی تایبەتە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوە ئێوە زاناترن پێی، ئەوەیش تایبەتە بە قورئان ئەوە من نایزانم بەڵام من (أسامە)ی کوڕی (زيد) قسەی بۆ کردووم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئاگاداربن سوو لە دواخستندایە" (واتا دواخستنی پارەکە یان شتەکە).

## وەرگرتنی حەڵاڵی روون و دوورکەوتنەوە لە شتی گوماناوی

**٥٠٤ـعَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) يَقُولُ –وأَهْوَى النُّعْمَانُ بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ–: "إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ وإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ، لَا يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وعِرْضِهِ، ومَنْ وقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلَا وإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلَا وإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وهِيَ الْقَلْبُ". (بخاري/ الإيمان/ ٥٢)**

(نعمان)ی کوڕی (بشیر)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو-لەم کاتەدا (نعمان) دەستی برد بۆ هەردوو گوێی- "بێگومان حەڵاڵ ئاشکرایەو حەرامیش ئاشکرایە و لە نێوانیاندا چەند شتێکی گوماناوی هەن، زۆر لە خەڵکی نایان زانن، هەرکەس خۆی لە گومان بپارێزێ ئەوە خۆی و ئاینەکەی پاراستووە لە تانە و تاوان، هەرکەسیش بکەوێتە ناو شتی گوماناوییەوە ئەوە کەوتۆتە ناو شتی حەرامەوە، وەك چۆن شوانێك (ئاژەڵەکانی) لە دەوروبەری قەدەغەکراوێ دەلەوەڕێنێ دوور نیە تێی بکەوێت، چاك بزانن هەموو پادشایەك قەدەغە کراوێکی (تایبەت بە خۆی) هەیە، چاك بزانن قەدەغەکراوی خوا هەر ئەو شتانەیە کە حەرامی کردووە، بزانن کەلە لەشدا پارچە گۆشتێك هەیە ئەگەر چاك بێت هەموو لەش چاك دەبێت ئەگەر خراپیش بوو هەموو لەش خراپ دەبێت چاك بزانن ئەو پارچەیەش دڵە"

## ( ١٨ ) قەرزدانەوە بە چاکتر لەخۆی

٥٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَسُولِ (ﷺ) حَقٌّ، فَأَغْلَظَ لَهُ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "إِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالًا". فَقَالَ لَهُمْ: "اشْتَرُوا لَهُ سِنًّا فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ". فَقَالُوا: إِنَّا لَا نَجِدُ إِلَّا سِنًّا هُوَ خَيْرٌ مِنْ سِنِّهِ، قَالَ: "فَاشْتَرُوهُ فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ -أَوْ: خَيْرَكُمْ- أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً". (بخاري/ الوكالة/ ٢١٨٣)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك حەقێکی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) هەبوو زبربێژی لە خزمەتدا نواند، هاوەڵەکانی ویستیان تەمێی بکەن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خاوەن حەق بەڵگەی بەدەستە". ئینجا فەرمووی: "بڕۆن وشترێکی هاوتەمەنی وشترەکەی خۆی بۆ بکڕن و پێی بدەنەوە" وتیان: ئێمە هەر وشترێکمان لادەست دەکەوێت کەلە وشترەکەی ئەو باشترە فەرمووی: "بۆی بکڕن و پێی بدەنەوە چاکترین کەستان ئەوەتانە چاکتر قەرز ببژێرێت".

## ڕێگریی لە سوێند خواردن لە مامەڵەدا

٥٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "ثَلَاثٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ يَمْنَعُهُ

مِن ابْنِ السَّبِيلِ. ورَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَحَلَفَ لَهُ بِاللَّهِ لَأَخَذَهَا بِكَذَا وكَذَا، فَصَدَّقَهُ وهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ. ورَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وفَى، وإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ يَفِ". (بخاري/ المساقاة/ ٢٢٣)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "سێ کەس هەن خوا گفتوگۆیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و خاوێنیان ناکاتەوە لەگوناهو تاوان و سزایەکی بەسوێیان بۆ هەیە: پیاوێك لەسەر ئاوێك بێت لە دەشتێکدا زیاد بێت لە خۆی کە چی لە رێبوارانی قەدەغە بکات، پیاوێکیش شتێك بفرۆشێت بە پیاوێکی تر پاش عەسر سوێندی بۆ بخوات بەخوا کە ئەمەندە و ئەمەندەی پێدراوە ئەویش باوەڕی پێ بکات کەچی ئەمەندەشی پێنەدابێت، پیاوێکیش پەیمان بدات بە پێشەوایەك بەلام پەیمانەکەی هەر لەبەر بەرژەوەندی دونیایی بێت، ئەگەر بەشی لێبدات پەیمانەکەی بەرێتە سەر، ئەگەر نا نەیباتە سەر".

## فرۆشتنی حوشتر

**٥٠٧ـ** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ (ﷺ) فَتَلَاحَقَ بِي وتَحْتِي نَاضِحٌ لِي قَدْ أَعْيَا ولَا يَكَادُ يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: "مَا لِبَعِيرِكَ". قَالَ: قُلْتُ: عَلِيلٌ. قَالَ: فَتَخَلَّفَ رَسُولُ (ﷺ) فَزَجَرَهُ ودَعَا لَهُ، فَمَا زَالَ بَيْنَ يَدَيِ الْإِبِلِ قُدَّامَهَا يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: "كَيْفَ تَرَى بَعِيرَكَ". قَالَ: قُلْتُ: بِخَيْرٍ، قَدْ أَصَابَتْهُ بَرَكَتُكَ. قَالَ: "أَفَتَبِيعُنِيهِ". فَاسْتَحْيَيْتُ، ولَمْ يَكُنْ لَنَا نَاضِحٌ غَيْرُهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَبِعْتُهُ إِيَّاهُ عَلَى أَنَّ لِي فَقَارَ ظَهْرِهِ حَتَّى أَبْلُغَ الْمَدِينَةَ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي عَرُوسٌ، فَاسْتَأْذَنْتُهُ فَأَذِنَ لِي، فَتَقَدَّمْتُ النَّاسَ إِلَى الْمَدِينَةِ، حَتَّى انْتَهَيْتُ فَلَقِيَنِي خَالِي، فَسَأَلَنِي عَنِ الْبَعِيرِ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا صَنَعْتُ فِيهِ، فَلَامَنِي فِيهِ، قَالَ: وقَدْ كَانَ رَسُولُ (ﷺ) قَالَ لِي حِينَ اسْتَأْذَنْتُهُ: "مَا تَزَوَّجْتَ، أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا". فَقُلْتُ لَهُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، قَالَ: "أَفَلَا تَزَوَّجْتَ بِكْرًا تُلَاعِبُكَ وتُلَاعِبُهَا". فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُوُفِّيَ والِدِي –أَوِ اسْتُشْهِدَ– ولِي أَخَوَاتٌ صِغَارٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ إِلَيْهِنَّ مِثْلَهُنَّ فَلَا تُؤَدِّبُهُنَّ، ولَا تَقُومُ عَلَيْهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا لِتَقُومَ عَلَيْهِنَّ وتُؤَدِّبَهُنَّ. قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ غَدَوْتُ إِلَيْهِ بِالْبَعِيرِ، فَأَعْطَانِي ثَمَنَهُ ورَدَّهُ عَلَيَّ. (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٠٥)

(جابر)کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) غەزام دەکرد لە رێگە پێم گەیشتەوە کە من حوشترێکی ئاوکێشی خۆمم لە ژێر دابوو کە پەکی

کەوتبوو بەتەواوەتی نەیدەتوانی بڕوات، دەڵێ: پێی فەرمووم: "حوشترەکەت چییەتی؟" وتم: نەخۆشە، پێغەمبەر (ﷺ) لێی دواکەوت و تێی خوڕیو دۆعای بۆکرد. تاوای لێهات بەردەوام لە پێش حوشترەکانی ترەوە دەڕۆیشت. پاشان پێی فەرمووم: "ئێستا حوشترەکەت چۆن دەبینی" وتم: باشە، فەڕو بەرەکەتی جەنابتی بەرکەوت. فەرمووی: "پێمی دەفرۆشی" منیش شەرمم کرد جگە لەوە حوشتری لەو جۆرەمان نەبوو، وتم: بەڵێو پێم فرۆشت بەمەرجێك خۆم سواری بم تا دەگەڕێمەوە مەدینە، دەڵێ: پێم وت ئەی پێغەمبەری خوا من تازە زاواشم. هەربۆیە داوای مۆڵەتم لێکرد ئەویش مۆڵەتیدام، منیش لەپێش خەڵکییەوە گەڕامەوە بۆ مەدینە، کاتێ هاتمەوە خاڵم پێگەیشت پرسیاری حوشترەکەی لێکردم، منیش بۆم باس کرد کە چیم لێکردووە، ئەویش حەزی نەکرد سەرزەنشتی کردم لەو بارەوە، دەڵێ: لەو کاتەدا کە مۆڵەتم لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرگرت پێی فەرمووم: "چیت هێناوە کچ یا بێوەژن" منیش وتم: بێوەژن، فەرمووی: "ئەی بۆ کچێکت نەهێنا گەمەو سوعبەتی لەگەڵ بکەیت و گەمەو سوعبەتت لەگەڵ بکا". منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم وەفاتی کرد–یاشەهید بوو– منیش چەند خوشکێکی بچووکم هەیە حەزم نەکرد کەسێکی وەك خۆیانیان بۆ بێنم کە نەتوانێت پەرەردەیان بکات و خزمەتیان بکات، بۆیە بێوەژنم هێناوە تا بتوانێت پەرەوردەیان بکات و خزمەتیان بکات. دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە سەر لەبەیانی بە حوشترەکەوە چوومە خزمەتی ئەویش نرخی حوشترەکەی پێدام و حوشترەکەیشی بۆ گەڕانمەوە.

## ( ١٩ ) دەربارەی قەرز داشکاندن

**٥٠٨ـ عن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ (ﷺ) فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ (ﷺ) وهُوَ فِي بَيْتِه، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ الله (ﷺ) حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِه، ونَادَى كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فَقَالَ: "يَا كَعْبُ". فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّه، فَأَشَارَ إِلَيْه بِيَدِه: أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ مِنْ دَيْنِكَ، قَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّه، قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "قُمْ فَاقْضِه". (بخاري/ المساجد/ ٤٤٥)**

(كعب)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: داوای قەرزێکی خۆم لە (أبن أبى حَدْرَد) کرد لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لە مزگەوتا تا دەنگمان بەرزبوویەوە پێغەمبەر (ﷺ)

لەماڵەوە گوێی لێبوو، پێغەمبەریش (ﷺ) دەرچوو بەرەولایان پەردەی ژورەکەی لاداو بانگی (كعب)ی کوڕی (مالك)ی کرد و فەرمووی: "ئەی كعب" ئەویش وتی: لە خزمەتت دام ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش بەدەستی ئاماژەی کرد کە نیوەی قەرزەکەت داشکێنە. کعبیش وتی: ئەوا دامشکاند ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش (ﷺ) بە قەرزدارەکەی فەرموو: "دە هەستە بیدەرەوە".

**( ٢٠ ) قەرز کوێریی دەوڵەمەند ستەمە**

**٥٠٩ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِي و فَلْيَتْبَعْ". (بخاري/ الحوالات/ ٢١٦٦)**

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "سستیکردنی دەوڵەمەند لە دانەوەی قەرزێك کەلە سەری بێت ستەمە، جا گەر یەکێك لە ئێوە حەواڵەکرا بۆلای دەوڵەمەندێك کە قەرزەکەی بداتەوە با بچێت[1]".

**( ٢١ ) پەلە نەکردن لە قەرزاری هەژار و لێبوردنی**

**٥١٠ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): "أَنَّ رَجُلًا مَاتَ فَدَخَلَ الْجَنَّةَ، فَقِيلَ لَهُ: مَا كُنْتَ تَعْمَلُ؟ -قَالَ: فَإِمَّا ذَكَرَ، وإِمَّا ذُكِّرَ- فَقَالَ: إِنِّي كُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ، فَكُنْتُ أُنْظِرُ الْمُعْسِرَ وأَتَجَوَّزُ فِي السِّكَّةِ -أَوْ فِي النَّقْدِ- فَغُفِرَ لَهُ". فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: وأَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ (ﷺ). (بخاري/ البيوع/ ١٩٧١)**

(حذيفة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "پیاوێك دەمرێت و دەچێتە بەهەشت پێی دەوترێت: تۆ کارت چیبوو لە دونیادا؟ دەڵێ: یابیری کەوتەوە- یا بیری خرایەوە- وتی: من شتومەکم بە خەڵکی دەفرۆشت و مۆڵەتی نەدارم دەداو چاوپۆشیم لەکەم وکوڕی نرخ و مافی خۆم دەکرد، بۆیە خوا لێی خۆش بوو" (أبو مسعود)یش دەڵێ: ئەمەم لە پێغەمبەر (ﷺ) بیستووە.

**( ٢٢ ) کەسێك ماڵێکی خۆی لای کەسێکی نەدار ببینێتەوە**

**٥١١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا أَفْلَسَ الرَّجُلُ، فَوَجَدَ الرَّجُلُ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ". (بخاري/ الاتقراض/ ٢٢٧٢)**

---

[1] حەواڵە ئەوەیە کە قەرزێك خاوەن قەرزەکەی خۆی بنێرێت بۆلای قەرزێکی ئەم تا قەرزەکەی لەو وەرگرێتەوە.

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "ئەگـەر پیـاوێکی نەدار قەرزارکەوت و هیچی نـەبوو خـاوەن قـەرزیشماڵەکـەی خـۆی لـەلای ئـەو وەك خۆی بینیەوە ئەوا ئەو شایستە ترە پێی".

## ( ٢٣ ) فرۆشتن و بارمتە

٥١٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ، ورَهَنَهُ دِرْعًا لَهُ مِنْ حَدِيدٍ. (بخاري/ البيوع/ ١٩٦٢)

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) خواردنێـك لـە جولەکەیـەك بـە قـەرز دەکرێت بۆ ماوەیەك، زرێکەشی کەلە ئاسن بوو ئەکات بە بارمتەی.

## ( ٢٤ ) سەلەم لە بەروبومدا

٥١٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ وهُمْ يُسْلِفُونَ فِي الثِّمَارِ السَّنَةَ والسَّنَتَيْنِ، فَقَالَ: "مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، ووَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ". (بخاري/ السلم/ ٢١٢٤)

(أبـن عبـاس)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) کەهاتـە مەدینـە خـەڵکی سـەلەمیان دەکرد لەبەروبومدا بۆ ساڵێك و بۆ دووساڵ ئەویش فەرمووی: "هەرکەس سەلەمی لە خورمادا کرد باسەلەم بکات لە پێوانەیەکی دیاری و کێشێکی دیاریداو بـۆ ماوەیـەکی دیاری".

٥١٤ـعَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَضَى رَسُولُ (ﷺ) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ، رَبْعَةٍ أَوْ حَائِطٍ، لَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شَا و أَخَذَ وإِنْ شَا و تَرَكَ، فَإِذَا بَاعَ ولَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٩٩)

(جابر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی بەهەڵگرتنەوە کردووە لە هەر ماڵێکدا کە چەند کەسێك بەشداربن تیایدا و بەشیش نەکرێت، ئیتر ئەو ماڵـە خـانوو و زەوی بێت یاباخ و باخات ڕەوا نیە بۆی کە بیفرۆشێت هـەتا شـەریکەکەی مۆڵـەتی نـەدات، جا ئەگەر ویستی بـا هەڵیگرێتـەوە ئەگـەر نەیشـی ویسـت بـا وازی لێبێنێـت، ئەگـەر فرۆشتیشی و پرسی پێنەکرد ئەوا ئەو شایستەترە پێی.(واتە شەریکەکەی)

## ( ٢٥ ) دارخستنە سەر دیواری دراوسێ

٥١٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَمْنَعْ أَحَدُكُمْ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ". قَالَ: ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟ واللَّهِ لَأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ. (بخاري/ المظالم/ ٢٣٣١)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "با هیچ کەس لە ئێوە بەرهەڵستی دراوسێکەی نەکات لەوەی کە نێرگەیەك بخاتە سەر دیوارەکەی" پاشان (أبو هريرة) وتی: چییە ئەبینم پێتان ناخۆشە؟ بەخوا ئەگەر حەزی پێنەکەن لە سەرشانیشتان بێت هەردایدەنێم.

## ( ٢٦ ) هەرکەس بستێك زەوی داگیر بکات

٥١٦ـعن عُرْوَةَ بن الزبير (ﷺ): أَنَّ أَرْوَى بِنْتَ أُوَيْسٍ ادَّعَتْ عَلَى سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ): أَنَّهُ أَخَذَ شَيْئًا مِنْ أَرْضِهَا، فَخَاصَمَتْهُ إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ، فَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا كُنْتُ آخُذُ مِنْ أَرْضِهَا شَيْئًا بَعْدَ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ (ﷺ)؟ قَالَ: وَمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ (ﷺ)؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) يَقُولُ: "مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنَ الْأَرْضِ ظُلْمًا طُوِّقَهُ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ". فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: لَا أَسْأَلُكَ بَيِّنَةً بَعْدَ هَذَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَتْ كَاذِبَةً فَعَمِّ بَصَرَهَا، وَاقْتُلْهَا فِي أَرْضِهَا. قَالَ فَمَا مَاتَتْ حَتَّى ذَهَبَ بَصَرُهَا. ثُمَّ بَيْنَا هِيَ تَمْشِي فِي أَرْضِهَا إِذْ وَقَعَتْ فِي حُفْرَةٍ فَمَاتَتْ. (بخاري/ المظالم/ ٢٣٢٩)

لە (عروة)ی کوڕی (الزبير) دەگێڕنەوە کە (اروى)ی کچی (أويس)لافی ئەوە لێئەدات کە (سعيد)ی کوڕی (زيد) بەشێکی زەویەکەی داگیرکردووە. هەر بۆیە ڕاپێچی دەکات بۆلای (مروان)ی کوڕی (الحكم) (سعيد)یش دەڵێ: من چۆن زەوی ئەو داگیردەکەم پاش ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە؟ دەڵێ: چیت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیستووە؟ دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: "هەرکەس بستێك زەوی داگیربکات تا حەوت تەبەقەی زەوییەکە دەکرێتە گەردنی" (مروان) وتی: لە دوای ئەو فەرموودەیە داوای شایەتت لێناکەم، لە دواییدا (سعيد) وتی: خوایە ئەگەر درۆ دەکات چاوی کوێر کەو هەر لەزەویەکەی خۆیدا بیکوژە، ئیتر ئەو ئافرەتە نەمرد تا کوێر بوو، پاشان لە دوای ئەوە ڕۆژێ بە ناو زەویەکەیدا دەڕۆیشت کەوتە چاڵێکەوە و مرد.

## ( ٢٧ ) کێشەی ڕێگە و بان

٥١٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِي الطَّرِيقِ جُعِلَ عَرْضُهُ سَبْعَ أَذْرُعٍ". (بخاري/ المظالم/ ٢٣٤١)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر لەسەر ڕێگەی شەقام ناکۆکیتان تێکەوت ئەوا پانی ڕێگەکە بە حەوت باڵ مەزەندە دەکرێت".

# بەشی بیست و یەکەم: کشتوکاڵ

## (١) ڕێگریی لە بەکرێدانی زەوی

٥١٨ـ عن جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيُزْرِعْهَا أَخَاهُ، وَلَا يُكْرِهَا". (بخاري/ المزارعة/ ٢٢١٤، ٢٢١٥، ٢٢١٨)

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەرکەس لە ئێوە زەویەکی هەیە با یاخۆی دایچێنێت یا بیدات بە براکەی با ئەو بۆ خۆی دایچێنێت، نەیدات بە کرێ".

## (٢) بەکرێدانی زەوی بە زێڕو زیو

٥١٩ـ عن حَنْظَلَةُ بْنُ قَيْسٍ الْأَنْصَارِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (ﷺ) عَنْ كِرَا و الْأَرْضِ بِالذَّهَبِ والْوَرِقِ، فَقَالَ: لَا بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ وأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، واشياء مِنَ الزَّرْعِ، فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا، فَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَا و إِلَّا هَذَا، فَلِذَلِكَ زُجِرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شيء مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ فَلَا بَأْسَ بِهِ. (بخاري/ المزارعة/ ٢٢١٤، ٢٢١٥، ٢٢١٨)

(حنظلة)ی کوڕی (قیس)ی (الانصاري)دەڵێ: پرسیارم لە (رافع)ی کوڕی (خدیج)کرد سەبارەت بەبەکرێدانی زەوی بە زێڕ و زیو، ئەویش وتی: قەیناکات، خەڵکی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) زەویان بەکرێ ئەدا لەسەر هەندێ کشتوکاڵ، ئیتر جاری واهەبوو ئەمەیان دەفەوتاو ئەوەیان دەهاتەبەر یا ئەمیان دەهاتەبەر و ئەویان دەفەوتا خەڵکیش کرێکەیان تەنها ئەوەبوو، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لێکرد، بەڵام بەرامبەر بەکرێیەکی دیاری و دابینکراو قەیناکات،

## (٣) بەخشینی زەوی

٥٢٠-عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ كَانَ يُخَابِرُ، قَالَ عَمْرٌو فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَوْ تَرَكْتَ هَذِهِ الْمُخَابَرَةَ، فَإِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، فَقَالَ: أَيْ عَمْرُو، أَخْبَرَنِي أَعْلَمُهُمْ بِذَلِكَ -يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ)- أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) لَمْ يَنْهَ عَنْهَا، إِنَّمَا قَالَ: "يَمْنَحُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرْجًا مَعْلُومًا". (بخاري/ المزارعة/ ٢٢٠٤)

لە(طاوس)ەوە دەگێڕنەوە کە مامەڵەی بە (المخابرە)دەکرد (کە بریتیە لە بەکرێدانی زەوی لەسەر هەندێك لەبەروبومەکەی بەڵام تۆوەکە لە جوتیارەوە

دەبێت). (عمر)دەڵێ: منیش پێم وت: ئەی (أبو عبدالرحمن) ئەگەر وازت لەم جۆرە مامەڵەیە بهێنایە باشتر نەبوو چونکە خەڵکی وا دەزانن کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگریی لێکردووە. ئەویش وتی: ئەی (عمر) زاناتر لەوان خەبەری پێداوم مەبەستی (أبن عباس)ە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگریی لێنەکردووە بەڵکو فەرموویەتی: "ئەگەر یەکێ لە ئێوە ئەو پارچە زەوییەی کە هەیەتی بیبەخشێ بە برا موسڵمانەکەی باشترە لەوەی کە کرێیەکی دیاری لەسەر وەرگرێت".

### ( ٤ ) ئاودێریی بەرامبەر بە نیوەی بەرهەم

**٥٢١-عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ (ﷺ) خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ، فَكَانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ كُلَّ سَنَةٍ مِائَةَ وسْقٍ، ثَمَانِينَ وسْقًا مِنْ تَمْرٍ وعِشْرِينَ وسْقًا مِنْ شَعِيرٍ، قَالَ: فَلَماءلِيَ عُمَرُ (ﷺ) قَسَمَ خَيْبَرَ، خَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ الْأَرْضَ والماء، أَوْ يَضْمَنَ لَهُنَّ الْأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ، فَاخْتَلَفْنَ، فَمِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الْأَرْضَ والماء، ومِنْهُنَّ مَنِ اخْتَارَ الْأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ، فَكَانَتْ عَائِشَةُ وحَفْصَةُ (ﷺ) مِمَّنِ اخْتَارَتَا الْأَرْضَ والماء. (بخاري/ المزارعة/ ٢٢٠٣)**

(أبن عمر) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) زەوییەکانی خەیبەری دایەوە دەست دانیشتوانی بەرانبەر نیوەی بەرهەمەکەی، لەو بەرهەمەی هەموو ساڵێك سەد (وەسق)ی لێئەدابە خێزانەکانی، هەشتا (وەسق) لە خورماو بیستیش لە جۆ، دەڵێ: کاتێ (عمر) بووە خەلیفە، خاکی خەیبەری بەش کرد و خێزانەکانی پێغەمبەری (ﷺ) سەرپشك کرد لەوەی کە زەوی و ئاوەکەیان بۆ دابڕێت، یا وەك جاران ساڵانە وەسقەکانیان بۆ مسۆگەر بکات و بیداتەوە پێیان، ئەوانیش جیاواز بوون، هەیانبوو زەوی و ئاوەکەی هەڵگرتەوە، هەشیان بوو ساڵانە وەسقەکانیان هەڵگرتەوە، (حفصە) و (عائشە) لەوانە بوون کە زەوی‌و ئاوەکەیان هەڵبژارد.

### ( ٥ ) قەدەغە نەکردنی ئاوی زیادە

**٥٢٢-أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "لَا تَمْنَعُوا فَضْلَ الماء لِتَمْنَعُوا بِهِ الْكَلَأَ". ٤ببخ المساقاة/ ٢٢٢٦)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "زیادەی ئاو قەدەغە مەکەن تا نەبێتە هۆی قەدەغەکردنی لەوەڕیش".

# بەشی بیست و دووەم: وەسیێت و خێر و بەخشین

## (١) هاندان بۆ وەسیەت کردن سەبارەت بەوشتانەی پێویستن

٥٢٣ـ **(عَنْ سَالِمٍ)** عَنْ أابن عمر (رضي الله عنه): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَهُ شيء يُوصِي فيه، يَبِيتُ ثَلَاثَ لَيَالٍ إِلَّا ووَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ". قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: مَا مَرَّتْ عَلَيَّ لَيْلَةٌ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ ذَلِكَ إِلَّا وعِنْدِي وصِيَّتِي. **(بخاري/ الوصايا/ ٢٥٨٧)**

لە(سالم)ەوە ئەویش لە (ابن عمر)ەوە: کە لە پێغەمبەری (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: "هەق نییە بە هیچ موسوڵمانێك کە شتێکی هەبێت پێویستی بەوەسێت بێت سێ شەوی بەسەردا تێپەڕێت، مەگەر وەسێتی لای خۆی نووسیبێت" (أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەوکاتەوە ئەمەم بیستووە لە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ شەوێکم بەسەردا تێنەپەڕیوە مەگەر وەسێتەکەم لای خۆم دانابێت.

## (٢) وەسێت لەسێیەك تێناپەڕێت

٥٢٤ـ عن سَعْدِ أَبِي وقاص (رضي الله عنه) قَالَ: عَادَنِي رَسُولُ (ﷺ) فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وجَعٍ أَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى الْمَوْتِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَلَغَنِي مَا تَرَى مِنَ الْوَجَعِ، وأَنَا ذُو مَالٍ، ولَا يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ لِي واحدَةٌ، أَفَأَتَصدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: "لَا". قَالَ: قُلْتُ: أَفَأَتَصدَّقُ بِشَطْرِه؟ قَالَ: "لَا، الثُّلُثُ والثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ ورَثَتَكَ أَغْنِيَا و خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، ولَسْتَ تُنْفِقُ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وجْهَ اللَّهِ **(تعالى)** إِلَّا أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى اللُّقْمَةُ تَجْعَلُهَا فِي فِي امْرَأَتِكَ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: "إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ، فَتَعْمَلَ عَمَلًا تَبْتَغِي بِهِ وجْهَ اللَّهِ **(تعالى)** إِلَّا ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً ورِفْعَةً، ولَعَلَّكَ تُخَلَّفُ حَتَّى يُنْفَعَ بِكَ أَقْوَامٌ ويُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ. اللَّهُمَّ أَمْضِ لِأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، ولَا تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ بْنُ خَوْلَةَ". قَالَ: رَثَى لَهُ رَسُولُ (ﷺ) مِنْ أَنْ تُوُفِّيَ بِمَكَّةَ. **(بخاري/ الجنائز/ ١٢٣٣)**

(سعد)ی کوڕی (ابی وقاص) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەحەجیماڵئاوایدا نەخۆش کەوتم خەریك بوو بمرم. پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی کردم، پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا: خۆت ئەبینی چەندە نەخۆشم، منیش کەسێکی دەوڵەمەندم کەسیش نییە میراتم لێبگرێت جگەلە تاقە کچێك، ئایا دروستە دوو سێیەکی ماڵەکەم بکەم بەخێر،

فەرمووی: "نەخێر" وتم: ئەی نیوەی بکەم بەخێر؟ فەرمووی: "نەخێر" سێ یەکی بکە و سێیەکیشی زۆرە، تۆ ئەگەر پاش خۆت منداڵت بە دەوڵەمەندی بەجێبێڵی باشترە لەوەی بەهەژاری جێیان بێڵی و دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە تۆ هیچ خەرجیەك ناکێشیت کە مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێت مەگەر خوا پاداشتت ئەداتەوە لەسەری تەنانەت ئەو پاروەش کە ئەیکەیت بە دەمی خێزانەکەتەوە" دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هاوەڵانم من لە مەککە بەجێدێڵن؟ فەرمووی: "ئەگەر تۆ بەجێیش بمێنی و هەر کارێك ئەنجام بدەیت لە بەر ڕەزامەندی خوا ئەواپلەو پایەت بەرز دەبێتەوە، نزیکیشە بەجێبمێنی تاوەکو سودت هەبێت. بۆ خەڵکانێك زیانیشت هەبێ بۆ خەڵکانێکی تر. خوایە کۆچی هاوەڵانم بۆ بەپایان بگەیەنە و بەرەودوا مەیان گەڕێنەوە بەڵام داماو (سعد)ی کوڕی (خەولە)ەیە" دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) دڵی بۆی تەنگ بوو (لاواندیەوە) چونکە لەمەککە وەفاتی کرد.

٥٢٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: لَوْ أَنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنَ الثُّلُثِ إِلَى الرُّبُعِ، فَإِنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "الثُّلُثُ، والثُّلُثُ كَثِيرٌ". **(بخاري/ الوصايا/ ٢٥٩٢)**

"أبن عباس)(ﷺ) دەڵێ: خۆزگە خەڵکی لەسێیەکەوە دابەزینایە بۆ چواریەك، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "سێیەك و سێیەکیش زۆرە".

## ( ٣ ) وەسێتی پێغەمبەر ( ﷺ ) بە پابەندبوون بە قورئانەوە

٥٢٦ـ عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (ﷺ): هَلْ أَوْصَى رَسُولُ (ﷺ)؟ فَقَالَ: لَا، قُلْتُ: فَلِمَ كُتِبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْوَصِيَّةُ، أَوْ: فَلِمَ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ. **(بخاري/ الوصايا/ ٢٥٨٩)**

(طلحة)ی کوڕی (مصرف)دەڵێ: پرسیارم لە (عبدالله) ی کوڕی (أبی أوفى)کرد: ئایا پێغەمبەر (ﷺ) وەسێتی کردووە؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی بۆچ وەسێت لەسەر موسڵمانان دانراوە؟ وتی: وەسێتی کردووە بە پابەندبوون بە قورئانەوە.

٥٢٧ـعَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ عَلِيًّا (ﷺ) كَانَ وصِيًّا، فَقَالَتْ: مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟ فَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي -أَوْ قَالَتْ: حَجْرِي- فَدَعَا بِالطَّسْتِ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حَجْرِي، ومَا شَعَرْتُ أَنَّهُ مَاتَ، فَمَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟. **(بخري/ الوصايا/ ٢٥٩٠)**

(الاسـود)ی كـوڕی (یزیـد) دەڵـێ: لای (عائشـة) باسـی ئـەوەیان كـرد كـە (علـی) وەسێتی بۆ كراوە (كە پاش پێغەمبەر (ﷺ) ببێتە جێنشینی ئەو) ئەویش وتی: ئـەم وەسێتەی كەی بۆ كراوە؟ من خۆم پێغەمبەرم (ﷺ) نابوو بە سنگمەوە یاخود وتی: بەباوەشمەوە (لەكاتی وەفاتیا) كە داوای تەشتێ ئـاوی كـرد، لەباوەشـی منـداهات بەلاداو هەستم نەكرد كە مردوووە، ئیتر كەی ئەم وەسیەتەی بۆ كرد؟

## ( ٤ ) ئامۆژگاری پێغەمبەر ( ﷺ ) بەدەركردنی موشریكەكان

**٥٢٨ـ عَنْ سَعِيد بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ): يَوْمُ الْخَمِيسِ ومَا يَوْمُ الْخَمِيسِ، ثُمَّ بَكَى حَتَّى بَلَّ دَمْعُهُ الْحَصَى، فَقُلْتُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ ومَا يَوْمُ الْخَمِيسِ؟ قَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ (ﷺ) وجَعُهُ فَقَالَ: "ائْتُونِي أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَا تَضِلُّوا بَعْدِي". فَتَنَازَعُوا، ومَا يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ، وقَالُوا: مَا شَأْنُهُ أَهَجَرَ؟ اسْتَفْهِمُوهُ، قَالَ: "دَعُونِي، فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ، أُوصِيكُمْ بِثَلَاثٍ: أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ". قَالَ: وسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ، أَوْ قَالَهَا فَأُنْسِيتُهَا. (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٨٨)**

(سعید)ی كوڕی (جبیر) (ﷺ) دەڵێ: (أبن عباس) (ﷺ) وتی: ڕۆژی پێنجشـەممە ئای چ ڕۆژێك بـوو ئـەو ڕۆژە، پاشـان دای لـە پرمـەی گریـان تـاوەكو بـە فرمێسـكی چـەوەكەی تـەڕكرد، وتم: ئـەی (أبـن عبـاس) ڕۆژی پێنجشـەممە. وتـی: لـەو ڕۆژەدا پێغەمبـەر (ﷺ) نەخۆشیەكەی تـاوی سـەند، فـەرمووی: "بـێن بـا نوسراوێكتان بـۆ بنوسم كەپاش خۆم سەرتان لێنەشێوێت" بـەلام خـەڵكی نـاكۆكی وكێشمەكێشیان تێكەوت، ناشبێت لە خزمەت هـیچ پێغەمبەرێكدا دەمـەدەمێ بكرێـت. وتیـان: ئـەوە چییەتی؟ بلێـی بـەهۆی تاكەیـەوە قسـە ببڕزكێنـێ. داوای ڕوون كردنـەوەیان لێكـرد فەرمووی: "وازم لێبێنن ئەو وەزعەی منی تێدام باشە. وەسێتان بـۆ دەكـەم بەسـێ شت: بە دەركردنی (مشرك)ەكان لە دوورگەی عەرەبیو داواتان لێدەكەم كـە خـەڵات و بەراتی نوێنەری هۆزەكـان بكـەن و ڕێزیـان بگـرن هـەروەك مـن چـۆن وام دەكـرد. دەڵێ: لە سێهەم بێدەنگ بوو یا دەڵێت: لەبیرم چوویەوە.

## ( ٥ ) پەشیمان بوونەوە لە بەخشین

**٥٢٩ـ عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: حَمَلْتُ عَلَى فَرَسٍ عَتِيقٍ فِي سَبِيلِ اللَّه، فَأَضَاعَهُ صَاحِبُهُ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ (ﷺ) عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: "لَا**

**تَبْتَعْهُ، ولَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِي صَدَقَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤١٩)**

(عمر)ی کوڕی (الخطاب)(ﷺ) دەڵێ: ئەسپێكی ڕەسەنی چاكم بەخشیبە زەلامێك تالەڕێگەی خوادا بەكاری بهێنێ. كەچی خاوەنەكەی وەكو پێویست گوێی پێنەدا، منیش وامزانی كە تالانفرۆشی كردووە. هەر بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) كرد لەو بارەوە ئەویش فەرمووی: "مەیكڕەوە لە خێرەكەیشت پاشگەز مەبەرەوە چونكە ئەوەی لە خێرێك بگەڕێتەوە كە كردوویەتی وەك سەگ وایە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەكەی".

**( ٦ ) جیاوازیكردن لە خەلاتكردنی منداڵەكاندا**

**٥٣٠-عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ، فَقَالَتْ أُمِّي عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ، لَا أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ (ﷺ). فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) لِيُشْهِدَهُ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ (ﷺ): "أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ". قَالَ: لَا، قَالَ: "اتَّقُوا اللَّهَ واعْدِلُوا فِي أَوْلَادِكُمْ". فَرَجَعَ أَبِي فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ. (بخاري/ الهبة/ ٢٤٤٧)**

(النعمان)ی كوڕی (بشیر)(ﷺ) وتوویەتی: "باوكم هەندێ لە ماڵەكەیی پێ خەلات كردم، بەڵام دایكم (عمرة)ی كچی (رواحە) وتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەر (ﷺ) نەزانێ، باوكم لەگەڵ خۆی بردمی بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی بیكات بە شایەت لەسەر ئەو خەلاتەی پێشكەشی كردووم، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: "ئایا ئەمەت لەگەڵ هەموو منالەكانی ترت كردووە؟ ئەویش وتی: نەخێر، ئەویش فەرمووی: "لە خوا بترسن و دادگەربن لە نێو منداڵەكانتانا". ئیتر باوكم گەڕایەوە و لەو خەلاتە پاشگەز بوویەوە.

**٥٣١ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (ﷺ) قَالَ: انْطَلَقَ بِي أَبِي يَحْمِلُنِي إِلَى رَسُولِ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وكَذَا مِنْ مَالِي. فَقَالَ: "أَكُلَّ بَنِيكَ قَدْ نَحَلْتَ مِثْلَ مَا نَحَلْتَ النُّعْمَانَ". قَالَ: لَا، قَالَ: "فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي". ثُمَّ قَالَ: "أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سواء". قَالَ: بَلَى، قَالَ: "فَلَا إِذًا". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٤٧)**

(النعمان)ی كوڕی (بشیر)(ﷺ) دەڵێ: باوكم لەگەڵ خۆی هەڵی گرتم و بردمی بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەشایەت بە كەمن ئەوە و

ئەوەم لەماڵی خۆم خەڵات کردووە بە (النعمان) ئەویش فەرمووی: "ئایا ئەوەی خەڵاتت کردووە بە (النعمان) بە هەموو کوڕەکانی ترتداوە؟". وتی: نەخێر، فەرمووی: "دەبڕۆ کەسێکی دیکە جگە لە من بکە بەشایەت". پاشان فەرمووی: "ئەی تۆ پێت خۆش نییە لە چاکەکردن لەگەڵتا هەموو وەك یەك بن" وتی: بەڵێ فەرمووی: "کەوابوو نا".(واتە مەیدەرێ)

**( ٥ ) کەسێك ماڵێك بدات بە کەسێك تا لەژیاندا بێت**

**٥٣٢ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه الْأَنْصَارِيَّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْمَرَ رَجُلًا عُمْرَى لَهُ ولِعَقِبِهِ، فَقَالَ: قَدْ أَعْطَيْتُكَهَا وعَقِبَكَ مَا بَقِيَ مِنْكُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّهَا لِمَنْ أُعْطِيَهَا وعَقِبِهِ، وإِنَّهَا لَا تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا، مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ أَعْطَى عطاء وقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٨٢، ٢٤٨٣)**

له(جابر)ەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر پیاوێك ماڵێك بدات بە پیاوێکی دیکە بۆخۆیو نەوەکانی بۆماوەی هەموو تەمەنی، پێی بڵێ: ئەوا ئەو ماڵەم بەخشی بەخۆت و نەوەکانت تا یەك کەستان لەژیاندا مابێت. ئەو ماڵە دەبێتە موڵکی ئەو کەسە و نەوەکانی و جارێکیتر ناگەڕێتەوە بۆ خاوەنی، چونکە خەڵاتێکی پێخەڵات کردوون کە تازە بەشی میرات گرانی تێکەوتووە".

**٥٣٣ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ ولَا تُفْسِدُوهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِي أُعْمِرَهَا حَيًّا ومَيِّتًا ولِعَقِبِهِ". (بخاري/ الهبة/ ٢٤٨٢، ٢٤٨٣)**

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "دەست بە سامانی خۆتانەوە بگرن و لەناوی مەدەن، چونکە هەرکەسێك ماڵێك ببەخشێت بە کەسێك بۆ ماوەی هەموو تەمەنی ئەوا ئەو ماڵە دەبێتە موڵکی ئەو کەسەی کە پێی داوە بە زیندوویی و بەمردوویی وە بۆ نەوەکانیشی

# بەشی بیست و سێیەم: میرات

## (١) موسڵمان میرات لە کافر نابات و کافریش لە موسڵمان

٥٣٤–عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلَا يَرِثُ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ". (بخاري/ الفرائض/ ٦٣٨٣)

لە (أسامة)ی کوڕی (زيد)(ﷺ) وە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "نە موسڵمان میرات لە کافر دەبات نەکافریش لە موسڵمان".

## (٢) میرات بدەن بە شایستەو خاوەنەکانی

٥٣٥ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "أَلْحِقُوا الْفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا، فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ فَلِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ". (بخاري/ الفرائض/ ٦٣٥١)

(ابن عباس) (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (میرات بدەن بە میراتبەرەکان، ئەوەی بەجێدەمێنێت بۆ یەکەم نێرینەیە".

## (٣) میراتی (کلالە)

٥٣٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَأَنَا مَرِيضٌ لَا أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ، فَصَبُّوا عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ فَعَقَلْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا يَرِثُنِي كَلَالَةٌ، فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَقُلْتُ لِمُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ) (النساء: ١٧٦)؟ قَالَ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ. (بخاري/ الوضوء/ ١٩١) واتە پرسیارت لێدەکەن لە بارەی (کلالە)وە بڵێ خوای گەورە خۆی فەتواتان بۆ دەدات.

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ سەردانم کە من نەخۆش بووم هۆشم نەبوو، دەست نوێژی گرت لە ئاوی دەست نوێژەکەیان پرژاند بەسەرما منیش هۆشم کردەوە. وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من میراتگرانم (کلالە)ەن (واتا:کور و باوك) ئیتر ئایەتی میرات هاتە خوارەوە، بە (محمد)ی کوڕی (المنکدر)م وت: (يستفتونك قل الله يفتيكم في الكلالة) النساء: ١٧٦. وتی: هەروا دابەزیوە.

## (٤) دواهەمین ئایەتێك دابەزیوە ئایەتی (الكلالە)ەیە

٥٣٧ـ عَنِ الْبَرَاءِ (ﷺ): أَنَّ آخِرَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ تَامَّةً سُورَةُ التَّوْبَةِ، وَأَنَّ آخِرَ آيَةٍ أُنْزِلَتْ آيَةُ الْكَلَالَةِ. (بخ المغازي/ ٤١٠٥)

لە (البراء)ی کوڕی (عازب)ەوە دەگێڕنەوە: کە دواهەمین سورەت کە بەتەواوەتی دابەزیووە سورەتی (التوبة)ەیە، دواهەمین ئایەتیش کە دابەزیووە ئایەتی (الكلالە)ەیە.

## ( ٥ ) هەر كەس ماڵ و دارایيەكی جێهێشت بۆ میرات گرەكانێتی

٥٣٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمَيِّتِ عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: "هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِه مِنْ قَضَا و". فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وفَا و صَلَّى عَلَيْه، وإِلَّا قَالَ: "صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ". فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْه الْفُتُوحَ قَالَ: "أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ وعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، ومَنْ تَرَكَ مَالًا فَهُوَ لِوَرَثَتِه". (بخاري/ الكفالة/ ٢١٧٦)

(أبـو هريـرة)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) كـاتێ پيـاوێكی مردوويـان بهێنايـاتـە خزمـەتی كـە قـەرزی لـە سـەربووايا پرسـياری دەكـرد "ئايـا بەشـی قەرزەكـەيی جێهێشتووە" ئەگەر پێيان بوتايـە بەشـی دانـەوەی قەرزەكـەی جێهێشـتووە نوێـژی لەسەر دەكرد، ئەگەر نا دەيفەرموو: "نوێژ لەسەر هاوەڵەكەتان بكـەن". هـەتا كاتـێ خوا دەرووی خێری لێكردەوە. فەرمووی: "من لە پێشترم بۆ موسـڵمانان لـە خۆيـان هەر كەسێك مردوو قەرزی لەسەربوو ئەوە دانەوەی لەسەر منە، هەركەسـيش مـاڵ و سامانێكی جێهێشت ئەوە بۆ میراتگرەكانی دەبێت".

# بەشی بیست و چوارەم: وەقف

## (١) وەقف بۆ بنەڕەتی شتەکەیە و بەروبوومەکەی خێرە

٥٣٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ (رضي الله عنه) أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: "إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا". **(قَالَ):** فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لَا يُبَاعُ أَصْلُهَا وَلَا يُبْتَاعُ، وَلَا يُورَثُ وَلَا يُوهَبُ. قَالَ: فَتَصَدَّقَ عُمَرُ فِي الْفُقَرَا و، وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا، غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. **(بخاري/ الشروط/ ٢٥٨٦)**

(ابن عمر) دەڵێ: (عمر) (رضي الله عنه) پارچە زەویەکی لە (خەیبەر) دەست کەوت و هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسی پێکرد دەربارەی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من پارچە زەویەکم لە (خەیبەر) دەست کەوتووە، هەرگیز ماڵی ئاوا بە نرخم دەست نەکەوتووە، فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: "ئەگەر ئەتەوێت ئەسڵەکەی گل دەرەوەو بیکە بەخێر(وقف) (عمر)یش کردی بەخێر بە مەرجێك خودی زەوییەکە نەفرۆشرێت و نەکڕێت و بە میرات نەبرێت و نەبەخشرێت دەڵێ: ئیتر عومەر کردی بەخێر بۆ هەژاران و خزمان و کۆیلەکان و لە ڕێگەی خوا و ڕێبواران و میواندا. بەو شێوەی کە گوناه و تاوان نەبێت لەسەر هەر کەسێك کە سەرپەرشتی بکات بە گوێرەی توانا لێی بخوات و بەشی دۆست و برادەریشی لێبدات بەمەرجێ لێی قایم نەکات.

# بەشی بیست و پێنجەم: نەزرکردن

## (١) باسی وەفاکردن بە نەزر

٥٤٠ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) سَأَلَ رَسُولَ (ﷺ) وهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ بَعْدَ أَنْ رَجِعَ مِنَ الطَّائِف، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ يَوْمًا فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَكَيْفَ تَرَى؟ قَالَ: "اذْهَبْ فَاعْتَكِفْ يَوْمًا". قَالَ: وكَانَ رَسُولُ (ﷺ) قَدْ أَعْطَاهُ جَارِيَةً مِنَ الْخُمْسِ، فَلَمَّا أَعْتَقَ رَسُولُ (ﷺ) سَبَايَا النَّاسِ سَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) أَصْوَاتَهُمْ يَقُولُونَ: أَعْتَقَنَا رَسُولُ (ﷺ) فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: أَعْتَقَ رَسُولُ (ﷺ) سَبَايَا النَّاسِ. فَقَالَ عُمَرُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْجَارِيَةِ فَخَلِّ سَبِيلَهَا. **(بخاري/ الخمس/ ٢٩٧٥)**

(أبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: (عمر)ی کوڕی (الخطاب) پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردووە لە کاتێکدا لە (طائف) گەڕایەوە و گەیشتبووە (الجعرانة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەسەردەمی نەفامیدا نەزرم کردووە کە ڕۆژێك خەڵوەت بکێشم لە کەعبەدا بەلاتەوە چۆنە؟ فەرمووی: "بڕۆ ڕۆژێك تیایدا بمێنەرەوە"، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) کەنیزەکێکی لە پێنج یەکی(دەستکە وتی جەنگ) پێدابوو، ئەوە بوو کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ژن و منداڵی بەدیل گیراوی خەڵکی ئازاد کرد (عمر)ی کوڕی (الخطاب) گوێی لە دەنگیان بوو کە ئەیان وت: پێغەمبەر (ﷺ) ئازادی کردین. ئەویش وتی: ئەمە چییە؟ ئەوانیش وتیان: پێغەمبەر (ﷺ) ژن و منداڵی دیل کراوی خەڵکی ئازاد کردو (عمر)یش وتی: ئەی (عبدالله) بڕۆ بۆ لای ئەو کەنیزەکە و ئازادی بکە.

## (٢) قەزاکردنەوەی نەزر

٥٤١ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ رَسُولَ (ﷺ) فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "فَاقْضِهِ عَنْهَا". **(بخاري/ الوصايا/ ٢٦١٠)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (سعد) ی کوڕی (عبادة)پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد سەبارەت بە نەزرێك کە لەسەر دایکی بووە و مردووە پێش ئەوەی بەجێی بێنێ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "دەتۆ بۆی بەجێبهێنە".

( ٣ ) کەسێك نەزر بکات کە بە پێ بچێت بۆ ( کعبە )

٥٤٢ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (﵁) قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ حَافِيَةً، فَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ (ﷺ)، فَاسْتَفْتَيْتُهُ فَقَالَ: "لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ". (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/ ١٧٦٦، ١٧٦٧)

(عقبة)ی کوڕی (عامر) (﵁) دەڵێ: خوشکەزاکەم نەزری کردبوو کە دەبێ بەپێخاوسی بچێت بۆ کەعبە، داوای لێکردم کە پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بکەم لەوبارەیەوە. منیش پرسیارم بۆ کرد ئەویش فەرمووی: "با بڕوات بەپێ و بەسواریش".

٥٤٣ـ عَنْ أَنَسٍ (﵁): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: "مَا بَالُ هَذَا". قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: "إِنَّ اللَّهَ (ﷻ) عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ". وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ. (بخاري/ الإحصار و جزاء الصيد/ ١٧٦٦، ١٧٦٧)

(أنس) (﵁) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پیرەمێردێکی بینی کە خۆی دابوو بەسەر شانی دوو کوڕیدا لە نێوانیاندا دەڕۆیی، فەرمووی: "ئەمە چییە؟" وتیان نەزری کردووە کە بەم شێوە بڕوات (بۆ کەعبە) ئەویش فەرمووی: "خوای باڵادەست پێویستی بەوەنیە ئەمە سزای خۆی بدات" ئینجا فەرمانی پێکرد سوار بێت.

( ٤ ) ڕێگری کردن لە نەزر

٥٤٤ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (﵄) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: "إِنَّهُ لَا يَأْتِي بِخَيْرٍ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ". (بخاري/ القدر/ ٦٢٣٤، ٦٢٣٥)

لە(أبن عمر)ەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە نەزر کردن کردووە و فەرموویەتی: "نەزر کردن هیچ خێرێك ناداتەوە، تەنها ئەوەندە هەیە بەهۆیەوە هەندێ شت لە دەستەنگ دەسێنرێت".

٥٤٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ النَّذْرَ لَا يُقَرِّبُ مِنِ ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ، وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ، فَيُخْرَجُ بِذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ مَا لَمْ يَكُنِ الْبَخِيلُ يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَ". (بخاري/ القدر/ ٦٢٣٤، ٦٢٣٥)

لە (أبو هريرە)ەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: "دڵنیابن کە نەزرکردن هیچ شتێك لەئادەمی نزیك ناخاتەوە کە خوا بۆی بڕیار نەدابێت، بەڵام (هەندێ جار) نەزر هاوکات دەبێت لەگەڵ قەدەر و بڕیاری خوادا، ئیتر بەوشێوەیە شتێك لە دەستی دەستەنگ و چروك دەبێتەوە کە پێشتر نەیدەویست بیدات".

# بەشی بیست و شەشەم: سوێندخواردن

## (١) ڕێگریی لە سوێند خواردن بە باوبا پیران

**٥٤٦ـ عن عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ". قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ (ﷺ) نَهَى عَنْهَا، ذَاكِرًا وَلَا آثِرًا. (بخاري/ الإيمان و النذور/ ٦٢٧٠، ٦٢٧٢)**

(عمر)ی كوڕی (الخطاب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خوای باڵادەست ڕێگریتان لێدەكات كە سوێن بە باوباپیران بخۆن". عومەر دەڵێ: سا بەخوا لەوكاتەوە بیستوومە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگریی لێكردووە سوێندم پێنەخواردووە نەبەزمانی خۆم و نە لەزمانی خەڵكیشەوە.

**٥٤٧ـ عن ابْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلَا يَحْلِفْ إِلَّا بِاللَّهِ". وكَانَتْ قُرَيْشٌ تَحْلِفُ بِآبَائِهَا، فَقَالَ: لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ". (بخاري/ الإيمان و النذور/ ٦٢٧٠، ٦٢٧٢)**

لە(أبن عمر)ەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەركەس سوێندی خوارد باسوێند نەخوات تەنها بەخوا نەبێت" هۆزی (قورەیش) سوێندیان بەباوباپیرانیان دەخوارد، ئەویش فەرمووی: "سوێند بەباوو باپیرانتان نەخۆن".

## (٢) كەسێ سوێندی بە (لات) و (عزی) خوارد بابڵێ (لااله الا الله)

**٥٤٨ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: بِاللَّاتِ، فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ومَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ". وفِي رِوَايَةٍ: "مَنْ حَلَفَ بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٧٩)**

(أبو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر كەسێ لە ئێوە سوێندی خوارد و لە سوێندەكەیا وتی: بە (لات)، ئەوا بابڵێ: لا الـه الا الله، هەر كەسیش بە برادەرەكەی وت: وەرە با قومارت لەگەڵ بكەم، ئەوا با خێرێك بكات" لە ڕیوایەتێكی تردا بەم شێوەیە هاتووە: "هەركەس سوێندی بە (لات)و (عزی) خوارد".

## (٣) كەسێ سوێندی لەسەر شتێ خوارد و باشتر لەوی بینی باسوێندەكەی بخات و كەفارەتەكەی بدات ئەوە باشترە

**٥٤٩ـ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ، فَقَالَ: "وَاللَّهِ لَا أَحْمِلُكُمْ، ومَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ". قَالَ:**

فَلَبِثْنَا مَا شَا و اللَّهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِإِبِلٍ فَأَمَرَ لَنَا بِثَلَاثِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا، قُلْنَا- أَوْ: قَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ- :لَا يُبَارِكُ اللَّهُ لَنَا، أَتَيْنَا رَسُولَ (ﷺ) نَسْتَحْمِلُهُ، فَحَلَفَ أَنْ لَا يَحْمِلَنَا، ثُمَّ حَمَلَنَا. فَأَتَوْهُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: "مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ، وَإِنِّي - وَاللَّهِ، إِنْ شَا و اللَّهُ- لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ، ثُمَّ أَرَى خَيْرًا مِنْهَا، إِلَّا كَفَّرْتُ (عَنْ) يَمِينِي وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ". (بخاري/ الخمس/ ٢٩٦٤)

(أبى موسى)ى (الاشعرى)(ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ كۆمەڵێك لە ئەشعەرییەكاندا هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) داوای وڵاغی سواریمان لێكرد، ئەویش فەرمووی: "بەخوا هەڵتان ناگرم، و هیچیشم لانییە هەڵتان گرم لەسەری". دەڵێ: ئێمەیش هەروا ماینەوە چەندێك خوا حەزكات، تاوەكو گەلە وشترێكی بۆهات، ئەوجا فەرمانی دەركرد بەسێ حوشتری كۆپارەسپی قەڵەو، كاتێ دەرچووین وتمان -یا هەندێكمان بە هەندێكمانی وت-: خوا بەرەكەتی تێناخات بۆمان، هاتین بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) داوامان لێكرد هەڵمان گرێت، ئەویش سوێندی خوارد هەڵمان نەگرێت لەدوایشدا هەڵی گرتین. ئینجا هاتنەوە بۆ خزمەتی ئەمەیان بۆ باس كرد، ئەویش فەرمووی: "من هەڵم نەگرتوون بەڵكو خوا هەڵیگرتوون بەخوا، ئەگەر خوا حەزكات من سوێند لەسەر شتێ ناخۆم پاشان باشتر لەو ببینم ئیللا كەفارەتی سوێندەكەم دەدەم و ئەوە دەكەم كە باشترە".

### ( ٤ ) كەفارەتی سوێند

**٥٥٠ـ** عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قال: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "وَاللَّهِ، لَأَنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي فَرَضَ اللَّهُ". (بخاري/ أوائل و الإيمان والنذور/ ٦٢٥٠)

لە(أبو هريرة)وە (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "سوێند بەخوا ئەگەر یەكێ لە ئێوە سوور بێت لەسەر ئەو سوێندەی كە دەیخوات لەناو خێزانیدا و سوێندەكەی نەخات، تاوانی زیاترە لای خوا لەوەی سوێندەكەی بخات و ئەو كەفارەتەی خوا فەرزی كردووە بیدات".

# بەشی بیست و حەوتەم: حەرامکردنی خوێنڕێژی

## (١) حەرامکردنی خوێن و ماڵ و نامووس

**٥٥١ـ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "إِنَّ الزَّمَانَ قَد اسْتَدَارَ كَهَيْئَته يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَات والْأَرضَ، السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا منْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلَاثَةٌ مُتَوَاليَاتٌ: ذُو الْقَعْدَة، وذُو الْحجَّة، والْمُحَرَّمُ، ورَجَبٌ، شَهْرُ مُضَرَ الَّذي بَيْنَ جُمَادَى وشَعْبَانَ". ثُمَّ قَالَ: "أَيُّ شَهْرٍ هَذَا". قُلْنَا: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيه بغَيْر اسْمه، قَالَ: "أَلَيْسَ ذَا الْحجَّة". قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: "فَأَيُّ بَلَدٍ هَذَا". قُلْنَا: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيه بغَيْر اسْمه، قَالَ: "أَلَيْس الْبَلْدَةَ". قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: "فَأَيُّ يَوْمٍ هَذَا". قُلْنَا: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيه بغَيْر اسْمه، قَالَ: "أَلَيْس يَوْمَ النَّحْر". قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّه، قَالَ: "فَإِنَّ دماءكُمْ وأَمْوَالَكُمْ –قَالَ مُحَمَّدٌ: وأَحْسبُهُ قَالَ –وأَعْرَاضَكُمْ، حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَة يَوْمكُمْ هَذَا، في بَلَدكُمْ هَذَا، في شَهْركُمْ هَذَا، وسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالكُمْ، فَلَا تَرْجعُنَّ بَعْدي كُفَّارًا –أَوْ: ضُلَّالًا– يَضْربُ بَعْضُكُمْ رقَابَ بَعْضٍ، أَلَا ليُبَلِّغ الشَّاهدُ الْغَائبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلِّغُهُ يَكُونُ أَوْعَى لَهُ منْ بَعْضِ مَنْ سَمعَهُ" ثُمَّ قَالَ: "أَلَا هَلْ بَلَّغْتُ". بخارى، المغازي/ ٤١٤٤)**

(أبو بكرة) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ڕۆژگار سوڕاوە و گەڕاوەتەوە دۆخی ئەو ڕۆژەی کە خوا ئاسمانەکان و زەوی تێدا دروست کردووە، ساڵ دوانزە مانگە، چواریان حەرام کراون (واتە: جەنگیان تێدا حەرامە) سیانیان بە شوێن یەکدا دێن: (ذو القعدة) و(ذو الحجة) و (محرم)و (رجب)یش مانگی (مضر)کە لە نێوان هەردوو جومادا و شەعبان دایە"، پاشان فەرمووی: "ئەم مانگە چ مانگێکە". وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، ئینجا بێدەنگ بوو تاوەکو وا گومانمان برد بەناوێکی تر ناوی دەنێت، فەرمووی: "ئایا (ذو الحجة) نییە؟" وتمان: بەڵێ، فەرمووی: "ئەی ئەمە چ وڵاتێکە؟" وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، دەڵێ: بێدەنگ بوو، تاوەکو وا گومانمان برد بەناوێکی تر ناوی دەنێ، فەرمووی: "ئەی ئەمە شاری مەککە نیە؟" وتمان: بەڵێ، فەرمووی: "ئەی ئەمە چ ڕۆژێکە؟" وتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن. لەمیش بێدەنگ بوو تاوەکو وا گومانمان برد بەناوێکی تر

ناوی دەنێ، فەرمووی: "ئایا ڕۆژی قوربانی نییە؟". وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: "دەچاك بزانن كە خوێنتان وماڵتان –ڕاوی دەڵێ: وا بزانم فەرموویشی– ناموسیشتان حەرامە لەسەرتان وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان، لەم شارەتاندا و لەم مانگەتاندا، لەمەودوا دەگەنەوە بەپەروەردگارتان پرسیاری كردەوەكانتان لێدەكات، دوای من كافر نەبنەوە –یان گومڕانەبنەوە– لەناو خۆتاندا هەندێكتان بدات لە گەردنی هەندێكتان، ئاگاداربن با ئەو كەسەی ئاگادارە و ئامادەیە بیگەیەنێت بەو كەسەی ئامادەنییە، كێ دەڵێ ڕەنگە هەندێك لەو كەسانەی ئەم ڕاسپاردانەیان پێدەگاتەوە باشتر لێی حاڵی ببن لە هەندێك لەو كەسانەی كە گوێیان لێیەتی" پاشان فەرمووی: "ئاگاداربن ئەوا پێم ڕاگەیاندن".

## (٢) یەكەم شت داوەریی لەسەر دەكرێت لە قیامەتدا خوێنە

**٥٥٢ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ): "أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٦٨)**

(عبدالله)ی كوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "یەكەم شت لە ڕۆژی قیامەتدا داوەری لەسەر دەكرێت لەنێوان خەڵكیدا خوێنە".

## (٣) ئەو هۆیەی خوێنی كەسێكی موسڵمان حەڵاڵ دەكات

**٥٥٣ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "لَا يَحِلُّ دَمُ (امْرِئٍ) مُسْلِمٍ –يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ– إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: الثَّيِّبُ الزَّانِي، والنَّفْسُ بِالنَّفْسِ والتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ". (بخاري/ الديات/ ٦٤٨٤)**

لە(عبدالله)ی كوڕی (مسعود)ەوە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "حەڵاڵ نییە خوێنی هیچ كەسێكی موسڵمان –كە شایەتی بدات بەوەی كە هیچ كەسێك شایانی پەرستن نییە جگە لە خواو، منیش پێغەمبەری خوام– مەگەر بەیەكێ لەم سیانە نەبێت: پیاوی ژن هاوردوو ژنی مێرد كردو كە زینابكەن، و گیان بە گیان (كەسێ كەسێ بە ناحەقی بكوژێ و لە تۆڵەیدا دەكوژرێتەوە) و كەسێ پاشگەز بێتەوە لە ئاینی خۆی و لە كۆمەڵی موسڵمانان جیابێتەوە".

## (٤) تاوانی كەسێك كوشتنی داهێنا

**٥٥٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لِأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ". (بخاري/ الانبياء/ ٣١٥٧)**

(عبـدالله) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووییـەتی: "هەرکەسـێك بەسـتەم بکوژرێت ، یەکەم کوڕی ئادەم پشـکی ئـەو تاوانـەی بەردەکـەوێت ، چـونکە یەکـەم کەس بووە کوشتنی داهێناوە".

## ( ٥ ) ئەوەی بەهەر شتێك خۆی بکوژێت ئەوا لە قیامەتدا پێی ئەشکەنجە دەدرێت

٥٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ، يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا. وَمَنْ شَرِبَ سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَرَدَّى فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا". **(بخاري/ الطب/ ٥٤٤٢)**

(أبـي هريـرة)دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووییـەتی: "هـەر کـەس خـۆی بەپارچـە ئاسنێك بکوژێت. ئەوا پارچە ئاسنەکە لەدەستیا دەبێت ورگـی خـۆیی پـێ ڕادەدات لەناو ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە بە هەتا هەتایی و، هەر کەس ژەهـراو بخواتـەوە و خۆی پێبکوژێت ئەوە لەناو ئاگری دۆزەخدا قوم لە دوای قوم دەیخواتەوە بـە هـەتا هـەتایی دەمێنێتـەوە لـەناو ئـاگری دۆزەخـدا، هـەر کـەس لەشـاخێك خـۆی بەرداتـە خوارەوە و خۆی بکوژێـت ئـەوا بـەردەوام لـەناو ئـاگر خـۆی بەردەداتـە خـوارەوە و بۆهەتا هەتایی تێیدا دەمێنێتەوە (واتە: ئەگەر خۆ کوشتن بەحەڵاڵ بزانێ ئەگەر نـا، مەبەست پێی زۆرمانەوەیە).

٥٥٦ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ (ﷺ) إِلَى عَسْكَرِهِ، وَمَالَ الْآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ (ﷺ) رَجُلٌ لَا يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً **(ولا فاذة)** إِلَّا اتَّبَعَهَا يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالُوا: مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلَانٌ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): "أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ". فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ **(أبدًا)**. قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ، كُلَّما ءقَفَ وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالْأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، قَالَ: فَخَرَجَ الرَّجُلُ إِلَى رَسُولِ (ﷺ) فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: "وَمَا ذَاكَ". قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفًا أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ. فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي

**طَلَبِه حَتَّى جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِه بِالْأَرْضِ وذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْه، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْه فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ) عِنْدَ ذَلِكَ: "إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّة، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّة". (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٢٤)**

له(سهل)ی كوڕی (سعد الساعد)ییەوە (ﷺ) دەگێڕنـەوە: كەلەشـكری پێغەمبـەر (ﷺ)و لەشـكری موشـریكەكان گەیشـتن بەیـەك و جـەنگان، كاتـێ پێغەمبـەر (ﷺ) گەڕایەوە سـەربازگەی خـۆی و ئـەوانی تـریش گەڕانـەوە سـەربازگەی خۆیـان، لـەناو هاوەڵانی پێغەمبـەردا (ﷺ) پیاوێك هـەبوو هـیچ كەسـێكی لـە دەسـت دەرنەئەچـوو ئەگەر ڕایشی بكردایـە شـوێنی دەكـەوت و بەشمشـێرەكەی دای ئەگرتـەوە، خـەڵكی وتیان بەڕاستی هیچ كەس ئەمڕۆ فریامان نەكەوت وەك فلان كـەس، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڵام بابزانن ئەو لـە ئاگردایـە" پیاوێك لـە خەڵكەكـە وتـی: دەبـێ لێـی جیانەبمـەوە (بـزانم چـی دەكـات) ئینجـا لەگـەڵی ڕۆیشـت، هـەركات لـە شـوێنێكا بوەستایە لەگەڵی ئەوەستا، كاتێ تەكانی بدایە و بڕۆشتایە لەگەڵی ئەڕۆیشـت، هـەتا پیاوەكـە بەسـەختی برینـدار كـرا، خـۆی نـەگرت و پەلـەی كـرد بـۆ مـردن مشـتووی شمشێرەكەی لەسەر زەوی داناو دەمەكەیشی خستە نێوان مەمكەكانیـەوە و خۆیـدا بەسەریدا و خۆی كوشت، ئینجا پیاوەكە ڕۆیشـتەوە بـۆلای پێغەمبـەری خـواو وتـی: شـایەتی دەدەم كـە تـۆ پێغەمبـەری خوایت. فـەرمووی: "ئـەوە بـۆچ؟" وتـی: ئـەو پیاوەی كەمێك لەمـەو پـێش باسـت كـرد فـەرمووت دۆزەخییـەو خـەڵكیش ئـەوەیان بەلاوە شتێكی گران بوو، منیش پێم وتن: من چارەی ئەوەتان بۆ دەكەم بە شـوێنی كەوتم تا كاتێ برینێكی خەستی لێكرا پەلەی لـە مردنـی خـۆی كـرد و خـۆی نـەگرت هات مشتووی شمشێرەكەی نایە سەر زەوی و دەمی شمشێرەكەیشی خسـتە نێـوان هەر دوو مەمكیەوە و پاشان خۆیـدا بەسـەریدا و خـۆی كوشـت. پێغەمبـەریش (ﷺ) لەوكاتەدا فەرمووی: "پیـاو جـاری وا هەیـە كـرداری ئـەهلی بەهەشـت دەكـات، وەك لەبەر چاوی خەڵكی وایە كەچـی لـە ئـەهلی ئاگریشـە، پیـاو جـاری وا هەیـە كـرداری ئەهلی ئاگر دەكات وەك لە پێش خەڵكی وایە كەچی بە هەشتیشە".

## ( ٦ ) كەسێك كەسێك بە بەردێك بكوژێت بە بەردێكی هەمان شێوە دەكوژرێتەوە

٥٥٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﭬ): أَنَّ جَارِيَةً وجِدَ رَأْسُهَا قَدْ رُضَّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَسَأَلُوهَا مَنْ صَنَعَ هَذَا بِكِ؟ فُلَانٌ، فُلَانٌ، حَتَّى ذَكَرُوا يَهُودِيًّا، فَأَوْمَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَأَقَرَّ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ (ﷺ) أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ. **(بخاري/ الخصومات/ ٢٢٨٣)**

له(أنس)ی كوڕی (مالك) ەوە دەگێڕنەوە كە كەنیزەكێك بینرا سەری لەنێوان دوو بەردا تێكشكێنرابوو، لێیان پرسی كێ وای پێكردووی؟ فلان كەس، فلان كەس، تاوەكو ناوی جوولەكەیەكیان برد ئەویش بەسەری ئاماژەی كرد، جوولەكەكە گیرا و دانی بە تاوانەكەی خۆیدا نا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی پێكرد كە سەری تێك بشكێ لە نێوان دووبەردا.

## ( ٧ ) تۆڵەسەندنەوەی برین

٥٥٨ـ عَنْ أَنَسٍ (ﭬ): أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَانًا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): "الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ". فَقَالَتْ أُمُّ الرَّبِيعِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُقْتَصُّ مِنْ فُلَانَةَ؟ واللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "سُبْحَانَ اللَّهِ! يَا أُمَّ الرَّبِيعِ، الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ". قَالَتْ: لَا واللَّهِ لَا يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَدًا. قَالَ: فَمَا زَالَتْ حَتَّى قَبِلُوا الدِّيَةَ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): "إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ". **(بخاري/ الصلح/ ٢٥٥٦)**

له(أنس)ەوە دەگێڕنەوە: كە خوشكی (الربیع) دایكی (حارثة)كەسێك بریندار دەكات، ئەوانیش دێن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) شكات دەكەن، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت: "تۆڵە سەندنەوە، تۆڵە سەندنەوە" دایكی (الربیع)یش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا تۆڵە لە فلانە ئافرەت دەكرێتەوە بە خوا نابێت تۆڵەی لێبكرێتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "سبحان الله! ئەی دایكی ڕەبیع تۆڵە سەندنەوە فەرمانی خوایە". ئەویش دەڵێت: نابەخوا نابێت هەرگیز تۆڵەی لێبكرێتەوە بەردەوام ئەو ژنە هەروای دەوت تاوەكو بە خوێن ڕازی بوون، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "لەناو بەندەكانی خوادا كەسی ئەوتۆ هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات داواكەی بۆ جێبەجێ دەكات".

## ( ٨ ) خوێنی ژنێکی دووگیان و کۆرپەکەی

٥٥٩-عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ، فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِحَجَرٍ، فَقَتَلَتْهَا ومَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ (ﷺ)، فَقَضَى رَسُولُ الله (ﷺ) أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ وليدَةٌ، وقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا ووَرَّثَهَا ولَدَهَا ومَنْ مَعَهُمْ، فَقَالَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لَا شَرِبَ ولَا أَكَلَ، ولَا نَطَقَ ولَا اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ. فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ" مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ. (بخاري/ الطب/ ٥٤٢٦)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵـێ: دووژن لـە هـۆزی (هـذيل) دەبـێ بەشـەڕيان، يـەکێکيان بەردێك دەگرێتە ئەوی تريـان دەيکوژێـت لەگـەڵ منداڵەکـەی سـکيدا، لای پێغەمبـەر (ﷺ) شکات دەکـەن، پێغەمبـەريش (ﷺ) کێشـەکە دەبڕێتـەوە بـەوەی کـە خـوێنی کۆرپەکـەی دائـەنێت بەبەندەيـەك يـا کـەنيزەکێك کـە نرخەکـەی نرخـی پێـنج حوشتربێت(واتا نيوەی دەيەکی خوێنێکی تەواو)، خوێنی ژنەکەيش دائەنێت لەسەر خزم و کەس و کاری ژنە بکوژەکە، کوڕی ژنەکوژراوەکە و ئەوانەی لەگەڵياندا کردنی بەميراتگری ژنەکە. (حمل)ی کوڕی (نابعـة)ی (هـذلی)دەڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، چۆن خوێنی کەسێك ببژێرم کەنـە ئـاوی خواردۆتـەوە و نـەنانی خـوارد وە نەقسـەی کـردووە و نـەهاواری کـردووە، نموونـەی کەسـێکی لـەو شـێوە خـوێنی بەتاڵـەو، بـە هـەدەردەڕوات، پێغەمبـەريش (ﷺ) فـەرمووی: "ئەمـە لـە برادەرانـی کوڵـەنانی و فاڵچيەکانە" لەبەر ئەو بەيت و باڵۆرەی کە وتی.

## ( ٩ ) ئەو شتانەی کە بە هەدەر دەڕۆن

٥٦٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "البئر جَرْحُهَا جُبَارٌ، والْبِئْرُ جُبَارٌ، والْمَعْدِنُ جُبَارٌ، والْعَجْماءجَرْحُهَا جُبَارٌ، وفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ". (بخاري/ الزكاة/ ١٤٢٨)

لە(أبـو هريـرة)(ﷺ) ئـەويش لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) کـە فەرموويـەتی: "بـير هەڵکەنـدن هـەر زيـانێکی لێبکەوێتـەوە بـە فـيڕۆ دەڕوات، کـانزا هەڵکەنـدنيش هـەر زيـانێکی لێبکەوێتـەوە بـە فـيڕۆ دەڕوات، گيـان لەبـەری بێزمـانيش هـەر زيـانێکی لێبکەوێتەوە بەهەدەر دەڕوات و گەنجينە شـاراوەکانی (پـێش ئيسـلام) پێـنج يـەکی زەکاتە.

# بەشی بیست و هەشتەم: سوێندخۆریی بە کۆمەڵ لەسەر کوشتن

### (١) کێ سوێندی تێدا دەخوات

٥٦١- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّهُ عَنْ رِجَالٍ مِنْ كُبراء قَوْمه: أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ سَهْلٍ ومُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ فَأَخْبَرَ أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتلَ وطُرِحَ فِي عَيْنٍ أَوْ فَقِيرٍ، فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ واللَّه قَتَلْتُمُوهُ، قَالُوا: واللَّه مَا قَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِه فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ – وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ– وعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ، وهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ) لِمُحَيِّصَةَ: "كَبِّرْ كَبِّرْ" يُرِيدُ السِّنَّ. فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ): "إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ". فَكَتَبَ رَسُولُ (ﷺ) إِلَيْهِمْ فِي ذَلكَ، فَكَتَبُوا: اناءاللَّه مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) لِحُوَيِّصَةَ ومُحَيِّصَةَ وعَبْدِ الرَّحْمَنِ: "أَتَحْلِفُونَ وتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ". قَالُوا: لَا، قَالَ: "فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ". قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ، فَوَادَاهُ رَسُولُ (ﷺ) مِنْ عِنْدِه، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ (ﷺ) مِائَةَ نَاقَةٍ حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، فَقَالَ سَهْلٌ: فَلَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَا و. (بخاري/ الأحكام/ ٦٧٦٩)

لە(سهل)ی کوڕی (أبي حثمة)وە ئەویش لە چەند گەورە پیاوانێکی هۆزەکەیەوە دەگێڕێتەوە کە (عبدالله)ی کوڕی (سهل) و (مُحَيصة) دەرئەچن بۆ خەیبەر لەبەر نەبوونیی و برسێتی کە تووشیان بوو بوو، لەوکاتەدا هەواڵ درا بە (محيّصة)کە (عبدالله)ی کوڕی (سهل) کوژراوە و فڕێ دراوەتە ناو کارێزێك یا بیرێکی دەم بلاوی نزیکە دەستەوە، هات بۆلای جوولەکەکان و پێی وتن: بەخوا ئێوە کوشتووتانە، ئەوانیش وتیان: بەخوا ئێمە نەمان کوشتووە، دوای ئەوە بەرێ دەکەوێت تادێتەوە بۆلای هۆزەکەی و ڕووداوەکەیان بۆ باس دەکات. پاشان ئەوو (حويصە)ی براگەورەی و (عبدالرحمن)ی کوڕی (سهل) دێن (بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ))سەرەتا (محيصە) –ئەوەی کەلە خەیبەر بوو– ویستی قسە بکات، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "گەورەتر، گەورەتر" مەبەستی تەمەن بوو(واتا با بەتەمەنتر لە تۆ قسە

بكات) ئینجا (حویصــة)دێتـه گۆو دوای ئـەو (محیصـه)یش، ئینجا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "یـا ئـەبێ جوولەکـە. خـوێنی هاوەڵەکـەتان بـدەن، یادەبێـت جـەنگ ڕاگەیەنن". پێغەمبەر (ﷺ) لەوبارەوە نامەی بۆ نووسین، ئەوانیش بۆیان نووسیەوە: کە بەخوا ئێمە نەمان کوشتووە پاشان پێغەمبـەر (ﷺ) بـە (حویصـە)و (محیصـە)و (عبـدالرحمن)ی فـەرموو: "ئایـا سـوێند دەخـۆن تـا خـوێنی هاوەڵەکـەتان مسـۆگەر بکەن؟" وتیان: نەخێر، فەرمووی: "ئەی جوولەکەکان سوێنتان بۆ بخۆن؟" وتیـان: ئەوان موسڵمان نـین، ئینجا پێغەمبـەر (ﷺ) لەلایـەن خۆیـەوە خوێنەکـەی بـۆدان و صەد حوشتری بۆ ناردن تا کرانە ژوورەوە بۆیان. (سهل) دەڵێ: وشترێکی سـووریان لەقەیەکی لێدام.

# بەشی بیست و نۆیەم: سنوورەکان ( سزا شەرعیەکان )

## سزای داوێن پیسی ( الزنا )

### ( ١ ) بەرد باران کردنی ژن و پیاوی داوێن پیس

**٥٦٢ـ عن عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ)، وهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ (ﷺ): إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا (ﷺ) بِالْحَقِّ، وأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا ووَعَيْنَاهَا وعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ (ﷺ) ورَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ تعالى،فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى –إِذَا أَحْصَنَ– مِنَ الرِّجَالِ والنساء، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوِ الاعْتِرَافُ. (بخاري/ المحاربين/ ٦٤٤٢)**

له(عبيدالله)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عتبه)وە دەگێڕنەوە: کە لە (عبدالله)ی کوڕی (عباس)ی بیستووە دەیووت: (عمر)ی کوڕی (خطاب) لە کاتێکدا کە لە سەر دوانگەی پێغەمبەری خوا دانیشتووە وتویەتی: بێگومان خوا –محمد–ی بە حەق ڕەوانە کردووە و قورئانی بۆ ناردووە، لەوەی کە خوا ناردبوویە سەری ئایەتی بەردە بارانکردنی (داوێن پیس) بوو خوێندبوومانەوەو لێیحاڵی بووبوین و تێی گەشتبووین، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی (پیاو و ژنی) داوێن پیسی بەردباران کردوە و ئێمەیش پاش ئەو کردومانە، ئەترسم لەوەی گەر ڕۆژگار بە خەڵکی تێپەڕ بکات و درێژ بکێشێت کەسی ئەو تۆیان لێڕاست بێتەوە و بڵێ: لەنامەی خوای باڵادەستا بەردە باران کردنی تیا نیە ئینجا سەریان لێبشێوێت و گومڕابن بەوازهێنان لە حوکمێك کە خوا دای بەزاندوە، بەڕاستی بەردەبارانکردن لە قورئاندا حەقێکی نەگۆڕە لەسەر کەسێك کە زینای کردبێت، ئەگەر ژنی شووکردو یان پیاوی ژن هاوردو بێت بەو مەرجەی (چوار) شایەت هەبێت، یان سك پڕبوون، یان دان پیانان.

### ( ٢ ) بەردباران کردنی جوولەکەی ژێر سایەی ئیسلام ( أهل الذمة )

**٥٦٣ـ عن عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) أُتِيَ بِيَهُودِيٍّ ويَهُودِيَّةٍ قَدْ زَنَيَا، فَانْطَلَقَ رَسُولُ (ﷺ) حَتَّى جاء يَهُودَ، فَقَالَ: "مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ عَلَى مَنْ زَنَى".**

قَالُوا: نُسَوِّدُ وجُوهَهُماءنُحَمِّلُهُمَا، ونُخَالِفُ بَيْنَ وجُوهِهِمَا، ويُطَافُ بِهِمَا. قَالَ: "فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ". فَجَاءوا بِهَا فَقَرَ ووهَا، حَتَّى إِذَا مَرُّوا بِآيَةِ الرَّجْمِ وضَعَ الْفَتَى الَّذِي يَقْرأُ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، وقَرأَ مَا بَيْنَ يَدَيْهَا ومَاءرَاءهَا، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ وهُوَ مَعَ رَسُولِ (ﷺ): مُرْهُ فَلْيَرْفَعْ يَدَهُ. فَرَفَعَهَا فَإِذَا تَحْتَهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ (ﷺ) فَرُجِمَا، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رضي الله عنه): كُنْتُ فِيمَنْ رَجَمَهُمَا، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَقِيهَا مِنَ الْحِجَارَةِ بِنَفْسِهِ. (بخاري/ المناقب/ ٣٤٣٦)

له(عبدالله)ی کوڕی (عمر)ەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاووژنێکی جولەکەیان هێنایە خزمەتی کە زینایان کردبوو، پێغەمبەریش (ﷺ) لێیدا ڕۆیشت تا هاتە لای جوولەکەکان فەرمووی: "چی لە تەوراتدا ئەبینن دەربارەی کەسێك زینا بکات". ئەوانیش وتیان: دەموچاوی هەردووکیان ڕەش دەکەین و هەردوکیان بەروپشت سواری حوشترێکیان دەکەین و ئەیان گەڕێنین. فەرمووی: "دە تەورات بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن". ئەوانیش هێنایان و خوێندیانەوە، تا کاتێ ڕابوردن بەسەر ئایەتی بەردباران کردندا، ئەم سەر و ئەوسەری ئایەتەکەی دەخوێندەوە لەو کاتەدا (عبدالله)ی کوڕی (سلام)کە لەگەڵ پێغەمبەرابوو (ﷺ) وتی:پێی بڵێ با دەستی بەرزبکاتەوە. ئەویش کاتێ دەستی بەرز کردەوە دەبینن ئایەتی بەرد باران کردن لەژێر دەستیدایە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە هەردووکیان کرد، هەردووکیان بەردباران کران، (عبدالله)ی کوڕی (عمر) دەڵێ: من خۆم یەکێك بووم لەوانەی بەرد بارانمان کردن، بینیم پیاوەکە خۆی ئەدایە بەر بەردەکان و ژنەکەی لێدەپاراست.

## ( ٣ ) ڕێگری لە تکاکردن لە سزا شەرعیەکاندا

٥٦٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها)، زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ (ﷺ)؟ فَقَالُوا: ومَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ (ﷺ). فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللهِ (ﷺ) فَكَلَّمَهُ فِيهَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَتَلَوَّنَ وجْهُ رَسُولِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَتَشْفَعُ فِي حَدّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ". فَقَالَ: (لَهُ) أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ قَامَ رَسُولُ (ﷺ) فَاخْتَطَبَ، فَأَثْنَى عَلَى اللهِ (تعالى) بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ: أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ

أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وإِنِّي والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا". ثُمَّ أَمَرَ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقُطِعَتْ يَدُهَا، قَالَتْ عَائِشَةُ (ﷺ): فَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا بَعْدُ، وتَزَوَّجَتْ، وكَانَتْ تَأْتِينِي بَعْدَ ذَلِكَ فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى رَسُولِ (ﷺ). **(بخاري/ المغازي/ ٤٠٥٣)**

لــــه(عائشـــــة)ەوە، خێزانــــی پێغەمبـــەر (ﷺ) دەگێڕنـــەوە: کــــە هـــۆزی (قورەیش)مەسەلەی ئەو ژنە (مخزومية)ی کە دزیکرد بوو لەسەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) زۆر نیگەران وبێتاقەتی کرد بوون، کە ئەمەیش لەکاتی گرتنـی شـاری مەکـەدا بوو لەناو خۆیاندا وتیان: کێ بێت بتوانێت قسەی تیابکـات لـە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ)؟ ئینجاوتیان: جا کێ بێ بتوانێت بوێرێ وا بکات لە خزمەتیدا مەگەر (أسامة)ی کوڕی (زید) نـەبێت، خۆشەویسـتی پێغەمبـەری خوایـە، ئینجـا ئـەو ژنـەیان هێنایـە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئوسامەش چووە خزمەتی و قسەی لەسـەر کـرد، پێغەمبـەر (ﷺ) ڕەنگ و ڕووی تێکچوو فەرمووی: "ئایا بۆ لابردنی سزایەك لە سزاکانی خوا تکا دەکەیت؟". (أسامە) وتـی: جـا کاتـێ شـەوداهات پێغەمبـەر (ﷺ) هەسـتا وتـارێکی فەرموو: "لەڕاستیدا میللەتانی پێش ئێوە تەنها بەوە تیاچوون: ئەگەر پیاو ماقوڵێـك لەناویاندا دزی بکردایە وازیان لێدەهێنا. بەڵام کـاتێ کەسـێکی گـەدا و بێکـەس دزی بکردایە سزایان بەسەردا جێبەجێ دەکـرد. بـەڵام سـوێند بـەو کەسـەی گیـانی منـی بەدەستە ئەگەر (فاطمة)ی کچی (محمد) دزی بکات دەستی دەبڕم". (عائشة) دەڵێ: ئەو ئافرەتە ئیتر لەوەولا تەوبەیەکی جوانی کـرد و شویشـی کـرد. لـە دوای ئـەوەوە ئـەهات بـۆ لام سـەردانی دەکـردم ئەگـەر پێویسـتیەکی بوایـە بـەرزم دەکـردەوە بـۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).

## ( ٤ ) سزای مەی خواردنەوە

**٥٦٥ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: مَا كُنْتُ أُقِيمُ عَلَى أَحَدٍ حَدًّا، فَيَمُوتَ فِيهِ، فَأَجِدَ مِنْهُ فِي نَفْسِي إِلَّا صَاحِبَ الْخَمْرِ، لِأَنَّهُ إِنْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، لِأَنَّ رَسُولَ (ﷺ) لَمْ يَسُنَّهُ. (بخاري/ الحدود/ ٦٣٩٦)**

لە(علي)یـەوە (ﷺ) وتوویـەتی مـن هـیچ کاتێـك نییـە سـزایەکی شـەرعی بەسـەر کەسێکدا جێبـەجێ بکـەم و لـەژێر دەسـتمدا بمرێـت و لەسـەر دڵمـا ببێـت بـەگرێ و تووشی دڵەڕاوکێم بکات جگە لە عەرەق خۆر نەبێت، ئەگـەر لـەژێر دەسـتمدا بمرێـت خوێنەکەی دەدەم چونکە پێغەمبەر (ﷺ) سزایەکی شەرعی دیاری بۆ دانەناوە.

## ( ٤ ) سزای شەرعی سڕینەوەی تاوانە

٥٦٦ـ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِت (رضي الله عنه) قَالَ: أَخَذَ عَلَيْنَا رَسُولُ (ﷺ) كَمَا أَخَذَ عَلَى النساء: أَنْ لَا نُشْرِكَ بِاللَّهِ شَيْئًا، ولَا نَسْرِقَ، ولَا نَزْنِيَ، ولَا نَقْتُلَ أَوْلَادَنَا، ولَا يَعْضَهَ بَعْضُنَا بَعْضًا. "فَمَنْ وفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّه، ومَنْ أَتَى مِنْكُمْ حَدًّا فَأُقِيمَ عَلَيْه فَهُوَ كَفَّارَتُهُ، ومَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ: إِنْ شَا و عَذَّبَهُ، وإِنْ شَا و غَفَرَ لَهُ".
**(بخاري/ الإيمان/ ١٨)**

(عبادة)ی كوڕی (صامت) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانی لە ئێمەیش وەرگرت هەر وەك چۆن پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت: كە هیچ شتێك نەكەین بە هاوەڵ بۆ خوا، دزی نەكەین، داوێن پیسی نەكەین، منداڵەكانمان نەكوژین، درۆ و بوختان بۆ یەكتری نەكەین، "جا هەر كەس لە ئێوە ئەم بەڵێنانەی بردە سەر ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، هەر كەسیش لە ئێوە تاوانێك ئەنجام بدات و سزا بدرێت ئەوە ئەبێتە مایەی سڕینەوەی تاوانەكەی‌و هەركەسیش خوا بۆی بپۆشێت و ئاشكرای نەكات ئەوە حەواڵەی خوا ئەكرێت ئەگەر ویستی سزای دەدات و ئەگەر ویستیشی لێی خۆش دەبێت".

# بەشی سێیەم: دادگایی و شایەتی

## (١) داوەریی بەڕواڵەت دەكرێت

٥٦٧–عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ)، زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) سَمِعَ جَلَبَةَ خَصْمٍ بِبَابِ حُجْرَتِه، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: "إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَهُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ فَأَقْضِي لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا". (بخاري/ المظالم/ ٢٣٢٦)

لە(أم سلمة)ەوە، خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) كە پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە قرەقرِی چەند كەسێكی ناكۆك بوو لە بەردەرگای ژوورەكەیدا، ئەویش هاتە دەرەوە بۆلایان و فەرمووی: "دڵنیابن منیش هەر مرۆڤم كەسانی ناكۆك و كێشەدار دێن بۆلام، ڕەنگە هەندێكیان زمان پاراوترین لە هەندێكیان، منیش بەڕاست گۆی بزانم و ماف بدەم بەو، جا هەركەس بڕیارم بۆ داو مافی موسڵمانێكم دایێ ئەوە بادڵنیابێت كە من پارچەیەك لە ئاگری بۆ بڕیار دەدەم، دەبا هەڵی بگرێت یا وازی لێبێنێت".

## (٢) لاساری سەرسەخت

٥٦٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الْأَلَدُّ الْخَصِمُ". (بخاري/ المظالم/ ٢٣٢٥)

(عائشة) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بێگومانم لەو پیاوانەی كە خوا لە هەموو پیاوێكی دیكە زیاتر ڕقی لێیانە، ئەو پیاوانەن كە لە هەمووان زیاتر لاسار و سەرسەختن".

## (٣) سوێندانی داوالەسەركراو-المدعى عليه-

عن ابن عباس (ر.ض) ان النبى (ﷺ)قال :"لو يعطى الناس بدعواهم لادعى ناس دماء رجال و اموالهم، ولكن اليمين على المدعى عليه" (بخارى/التفسير/٤٢٧٧)

واتە :پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی "ئەگەر خەڵكی بەپێی داوای خۆیان بیاندرێتێ ئەوە كەسانی ئەوتۆ هەن لافی سامان و خوێنی كەسانێكی تر (بە ناهەق) لێدەدەن، بەڵام سوێند لەسەر داوالەسەركراوە"

## (٤) دادوەر نابێت دادوەری بكات ئەگەر تووڕە بوو

٥٦٩ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبِي وكَتَبْتُ لَهُ إِلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، وهُوَ قَاضٍ بِسِجِسْتَانَ: أَنْ لَا تَحْكُمَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ

رَسُولَ (ﷺ) يَقُولُ: "لَا يَحْكُمْ أَحَدٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وهُوَ غَضْبَانُ". **(بخاري/ الأحكام/ ٦٧٣٩)**

(عبدالرحمن)ی كوڕی (ابو بكرة)دەڵێ: باوكم نامەی نووسی كەمن بۆم نووسی بۆ (عبیدالله ی كوڕی ابو بكره) قازی سجستان: لەكاتی توڕەییدا دادگایی دوو كەس مەكە چونكە من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: "با كەس دادگایی دوو كەس نەكات ئەگەر تووڕە بوو".

# بەشی سی و یەکەم : جیهاد

## ( ١ )خێری شەهیدبوون

٥٧٠-عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وأَنَّ لَهُ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شيء، غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ، لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ".(بخاری / الجهاد/ ٢٦٦٢)

(أنس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هیچ کەس نییە بچێتە بەهەشت و حەزبکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا با هەرچی لەسەر زەویشدا هەیە هی ئەوبێت، جگە لە شەهید، کە حەز دەکات بگەڕێتەوە و دەجار بمرێت، لەبەر ئەو ڕێز و شکۆیەی دەستی دەکەوێت و بەچاوی خۆی دەیبینێت".

## ( ٢ ) نیەت لە کردەوەکاندا

٥٧١ـ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ ورَسُولِه فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ ورَسُولِه، ومَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ"(بخاری / بدءالوحی/ ١).

(عمر)ی کوڕی (الخطاب)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "کاروکردەوەکان هەر بەپێی نیەتن و هەر کەس بەپێی نیەتی خۆی. هەر کەس کۆچەکەی بۆلای خوا و پێغەمبەری خوا بێت. ئەوە کۆچەکەی بۆلای خوا و پێغەمبەری خوایە، هەرکەسیش کۆچەکەی بۆ (ماڵێکی) دونیا بێت کە بەدەستی بهێنێت، یا ژنێك بێت کە مارەی بکات. ئەوا کۆچەکەی بۆلای ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردووە".

## ( ٣ ) ڕەزامەندی خوا لە شەهیدان

٥٧٢ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: جاء نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) **(فَقَالُوا):** أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالًا يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ والسُّنَّةَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقرَّا و، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَ ونَ الْقُرْآنَ ويَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ. وكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالماء فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، ويَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ ويَشْتَرُونَ بِه الطَّعَامَ لِأَهْلِ الصُّفَّةِ ولِلْفقرَا و، فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيهِمْ فَعَرَضُوا لَهُمْ. فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا

الْمَكَانَ، فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ ورَضِيتَ عَنَّا. **(قَالَ):** وأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خَالَ أَنَسٍ مِنْ خَلْفِه فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ، فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وربِّ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ (ﷺ) لأَصْحَابِه: "إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وإِنَّهُمْ قَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ ورَضِيتَ عَنَّا".(بخاری / الجهادم٢٦٤٧)

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: چەند کەسێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: چەند پیاوێکمان لەگەڵ بنێرە تا قورئان و سوننەتمان فێر بکەن. پێغەمبەریش (ﷺ) حەفتا کەس لە یاریدەدەران (الانصار)ی بۆ ناردن کەپێیان دەوترا (قورئان خوێنەکان) (حرام)ی خاڵمیانی تێدا بوو. قورئانیان دەخوێند و بەشەو دەوریان دەکردەوە و فێری دەبوون، بە ڕۆژیش ئاویان بۆ مزگەوت دەهێنا و دایان دەنا، داریان دەکرد و دەیان فرۆشت و خواردنیان پێ‌دەکڕی بۆ ئەهلی (صُفه) پێغەمبەریش (ﷺ) ناردنی و ئەوانیش ڕێگەیان پێگرتن و هەموویان کوشتن پێش ئەوەی بگەنە ئەو شوێنە، وتیان: خوایە بە پێغەمبەرەکەمان ڕاگەیەنە کە ئێمە بە خزمەت تۆ شاد بووین و لێمان ڕازی بوویت ئێمەیش لە تۆ ڕازی بووین. **(دەڵێت):** پیاوێك دێت بۆ (حرام) خاڵی (أنس) لە پشتەوە لێیدەدا تاوەکو دیوەدەری دەکات. ئینجا (حرام)دەڵێ: سوێند بە پەروەردگاری (کەعبە) بەختەوەر بووم. پێغەمبەریش (ﷺ) بە هاوەڵانی ڕادەگەێنێت و دەفەرمووێت "براکانتان کوژرانو وتیان: خوایە بە پێغەمبەرەکەمان ڕاگەیەنە کە ئێمە بە خزمەت تۆ شاد بووین و لێمان ڕازی بوویت و ئێمەیش لەتۆ ڕازی بووین".

### ( ٤ ) شەهیدان پێنجن

٥٧٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ (ﷺ) قَالَ: "بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ". وقَالَ: "الشُّهَدَا و خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، والْمَبْطُونُ، والْغَرِقُ، وصَاحِبُ الْهَدْمِ، والشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ **(عَزَّ وجَلَّ)**".(بخاری/الجماعة و الامامة/٦٢٤)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەکاتێکدا پیاوێك بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشت و چڵە دڕکێك دەبینێ و لای دەدات، ئینجا سوپاسی خوا دەکاتو ، خوایش لێی قوبوڵ دەکات و لێی خۆش دەبێت"و فەرمووی: "شەهیدەکان پێنجن، ئەوانەی بە دەردەکولێرە و نەخۆشینە درمەکان دەمرن،

ئەوانەی بە نەخۆشیی سکئێشە دەمرن، ئەوەی دەخنکێت، ئەوەی شتی بەسەردا دەڕوخێت و، ئەوەیش شەهید دەبێت لە ڕێگەی خوادا".

### (٥) تاعون شەهادەتە بۆ هەموو موسڵمانێك

٥٧٤ـ عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ قَالَتْ: قَالَ لِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: بِمَ مَاتَ يَحْيَى بْنُ أَبِي عَمْرَةَ (ﷺ)؟ قَالَتْ: قُلْتُ: بِالطَّاعُونِ، **(قَالَتْ):** فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ (ﷺ): "الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ".(بخاری/الجهاد/٢٦٧٥)

(حفصة)ی کچی (سیرین) دەڵێ: (أنس) ی کوڕی (مالك) پێی وتم: (یحیی)ی کوڕی (أبو عمره) بەچی مرد؟ دەڵێ: منیش وتم: بە (تاعون) مرد. ئەویش وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "تاعون شەهیدییە بۆ هەموو موسڵمانێك".

### (٦) لەبارەی فەرمووەی خوا (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ)

٥٧٥ـ عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ (ﷺ): عَمِّيَ الَّذِي سُمِّيتُ بِهِ، لَمْ يَشْهَدْ مَعَ رَسُولِ (ﷺ) بَدْرًا، قَالَ: فَشَقَّ عَلَيْهِ، قَالَ: أَوَّلُ مَشْهَدٍ شَهِدَهُ رَسُولُ الله (ﷺ) غُيِّبْتُ عَنْهُ، وَإِنْ أَرَانِيَ اللَّهُ مَشْهَدًا فِيمَا بَعْدُ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ)، لَيَرَانِي اللَّهُ **(تعالى)** مَا أَصْنَعُ. قَالَ: فَهَابَ أَنْ يَقُولَ غَيْرَهَا، قَالَ: فَشَهِدَ مَعَ رَسُولِ الله (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: فَاسْتَقْبَلَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ لَهُ أَنَسٌ: يَا أَبَا عَمْرٍو أَيْنَ؟ فَقَالَ: وَاهًا لِرِيحِ الْجَنَّةِ أَجِدُهُ دُونَ أُحُدٍ. قَالَ: فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى قُتِلَ، قَالَ: فَوُجِدَ فِي جَسَدِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ بَيْنِ ضَرْبَةٍ وَطَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ، قَالَ: فَقَالَتْ أُخْتُهُ عَمَّتِيَ الرُّبَيِّعُ بِنْتُ النَّضْرِ: فَمَا عَرَفْتُ أَخِي إِلَّا بِبَنَانِهِ. وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: (رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا) **(الاحزاب: ٢٣)** قَالَ: فَكَانُوا يُرَوْنَ أَنَّهَا نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ.(بخاری/الجهاد/٢٦٥١)

(ثابت)(ﷺ) دەڵێ: (أنس) وتی: ئەو مامەیەم کەمن بە ناویەوە ناونراوم ئامادەی جەنگی بەدر نەبوو لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەڵێ: ئەویش ئەمەی لا زۆر زەحمەت بوو. وتی: یەکەم جەنگێك پێغەمبەر (ﷺ) ئامادەی بوو منی لێبێبەش بووم و ئامادەی نەبووم ئەگەر لەمەولا خوای گەورە دیمەنی جەنگێکی دیکەی نیشان دام لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوە خوا دەزانێت چی دەکەم، دەڵێ: ترسا کە شتێکی تر بڵێ. لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) لە جەنگی (اُحد)دا ئامادەبوو. لەو ڕۆژەدا (سعد)ی کوڕی (معاذ) بەرەو ڕووی دێت و (أنس) پێی دەڵێت: ئەی (أبا عمر)

بەرەو كوێ؟ ئەویش دەڵێ: ئاه تامەزرۆی بۆنی بەهەشتم لە ڕووی كێوی (أُحد) دا هەستی پێدەكەم، ئیتر لەگەڵیان جەنگا تا كوژرا لە لەشیدا هەشتا و ئەمەندە برینی تێدابوو لە لێدانی ڕم و شیر و تیر. خوشكەكەی كە پوورمە (ربیع)ی كچی (النضر) دەڵێ: براكەمم نەناسیەوە بەسەر پەنجەكانیدا نەبێت. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە ئەمە ماناكەیەتی: (لە ناو بڕواداراندا پیاوانێك هەن ڕاستگۆن لەو بەڵێنەی داویانە بە خوا، هەیانە بە ئاكامی خۆی گەیشتنووە و هەشیانە چاوەڕوانە) دەڵێ: خەڵكی وای بۆ دەچوون كە ئەم ئایەتە لەشانی ئەوو هاوەڵەكانیاندا هاتبێتە خوارەوە.

## ( ٧ ) ئەوەی بجەنگێ بۆ بڵندكردنەوەی فەرموودەی خوا

**٥٧٦–عن أبي مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، والرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُذْكَرَ، والرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ أَعْلَى فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ".(بخاری/الجهاد/٢٦٥٥)**

(أبو موسی)ی (ألاشعري) دەڵێ: پیاوێكی دەشتەكی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاو هەیە دەجەنگێت بۆ دەستكەوت، پیاویش هەیە دەجەنگێت بۆ ناوو شۆرەت و پیاویش هەیە دەجەنگێت بۆ ئەوەی شوێن و پلەوپایەی لە نێو خەڵكیدا بناسراو ببینرێت، لەوانە كامیان لەڕێگەی خوادایە؟ ئەویش فەرمووی: "هەر كەس بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرز و بڵند بێت ئەوە لەڕێگەی خوادایە".

## ( ٨ ) پاداشتی كەسێك تفاق بۆ جەنگاوەرێك دابین بكات

**٥٧٧ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ الله (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، ومَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا". (بخاری/الجهاد/١٠٩٢)**

(زید)ی كوڕی (خالد الجهنی) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر كەس تفاقی جەنگاوەرێك ساز بكات و بیخاتە سەر ڕێ ئەویش هەر غەزای كردووە، هەر كەسیش بە جوانی خزمەتی ماڵ و منداڵی جەنگاوەرێك بكات ئەویش هەر غەزای كردووە".

## ( ٩ ) تاقمێك له ئوممه‌تم تا قیامه‌ت له‌سه‌ر هه‌ق ده‌بن

٥٧٨ – عَنْ ثَوْبَانَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ، حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ كَذَلِكَ". (بخاری/المناقب/٣٤٤١، ٣٤٤٢)

(ثوبان)(رضي الله عنه) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: "به‌رده‌وام تاقمێك له ئوممه‌ته‌كه‌م له‌سه‌ر حه‌ق ده‌مێنن و نابه‌زن و كه‌سێك بیه‌وێت سه‌رشۆڕیان بكات ناتوانێت زیانیان لێبدات تاوه‌كو فه‌رمانی خوا به مردنیان دێت و ئه‌وان هه‌روا ده‌بن".

## ( ١٠ ) دووكه‌س یه‌كێكیان ئه‌وی تریان ده‌كوژێت

٥٧٩ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قال: قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ): "يَضْحَكُ اللَّهُ لِرَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، كِلَاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ". قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "يُقْتَلُ هَذَا فَيَلِجُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْآخَرِ، فَيَهْدِيهِ إِلَى الْإِسْلَامِ، ثُمَّ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ"(بخاری/الجهاد/٢٦٧١).

(أبو هريره) (رضي الله عنه) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: "خوا پێكه‌نینی بۆ دوو پیاو دێت (مه‌به‌ست له پێكه‌نین نواندنی ڕه‌زامه‌ندیه) یه‌كێكیان ئه‌وی تریان ده‌كوژێت و كه‌چی هه‌ردووكیان ده‌چنه به‌هه‌شت" وتیان: چۆن ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا؟ فه‌رمووی: "ئه‌مه‌یان ده‌كوژرێت و ده‌چێته به‌هه‌شت، پاشان خوا تۆبه له‌وه‌ی تریشیان وه‌رده‌گرێت و ڕێنمایی ده‌كات به‌ره‌و ئیسلامه‌تی و پاشان جیهاد ده‌كات له ڕێگه‌ی خواداو شه‌هید ده‌بێت".

## ( ١١ ) خێر به ناوچاوی ئه‌سپه‌وه‌یه تا ڕۆژی قیامه‌ت

٥٨٠–عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ وَهُوَ يَقُولُ: "الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الْأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ".(بخاری/الجهاد/٢٦٩٧)

(جریر)ی كوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوام (ﷺ) بینی ده‌ستی به‌نێو چاوانی ئه‌سپێكدا ده‌هێنا و ده‌یفه‌رموو: "ئه‌سپ خێر و بێر به‌ناوچاوانیه‌وه‌یه هه‌تا ڕۆژی قیامه‌ت. هه‌م پاداشت و هه‌م ده‌ستكه‌وت".

٥٨١ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ".(بخاری/الجهاد/٢٦٩٧

(أنس)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "فەڕ و بەرەکەت لەناوچاوانی ئەسپ دایە".

## (١٢) پێشبڕکێ کردن لە نێوان ئەسپ دا

٥٨٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) سَابَقَ بِالْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحفياء، وكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وكَانَ ابْنُ عُمَرَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا(بخاری/المساجد/٤١٠).

(أبن عمر)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێشبڕکێی دەکرد بەو ئەسپانەی کە دابەستە کرابوون لە شوێنێك کە ناوی (حفياء) بوو، کۆتاییەکەی لە (ثنية الوداع) بوو، هەروەها پێشبڕکێی دەکرد لە نێوان ئەو ئەسپانەی کە دابەستە نەکرابوون لە (ثنية)وە بۆ مزگەوتی بەنی زورەیق، (ابن عمر)یش یەکێك بوو لەوانەی لە پێشبڕکێکەدا بوون.

## (١٣) کەسانێك بڕوبەهانە یان هەبێت و لەجەنگ دوابکەون

٥٨٣ـ عَنْ أَبِي إِسْحَقَ: أَنَّهُ سَمِعَ الْبراء (ﷺ) يَقُولُا فِي هَذِهِ الْآيَةِ (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ... والْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) زَيْدًا فَجاء بِكَتِفٍ يَكْتُبُهَا، فَشَكَا إِلَيْهِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ، فَنَزَلَتْ: (لَا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ) (النساء: ٩٥)(بخاری/الجهاد/٢٦٧٦)

لە (أبو اسحاق)وە کەدەڵێ: گوێی لە (البراء)بوو دەدوا دەربارەی ئەم ئایەتە کە ئەمە ماناکەیەتی: ( وەکو یەك نین ئەوانەی کە لەماڵەوە دانیشتوون لەگەڵ ئەوانەی کە لە جیهاددان (لە ڕێی خوادا..) ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی بە زەید کرد دەفە شانێکی هێنا تا بینووسێت. لەو کاتەدا کوڕی (أم مکتوم) سکاڵای نابینایی خۆی لاکرد ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی کە ئەمە ماناکەیەتی: "ئەو کەسانەی کە لێکەوتوون لە بڕواداران جگە لە زیان لێکەوتووان نەبێت وەك یەك نین لەگەڵ ئەو کەسانەی جیهاد دەکەن لە ڕێگەی خوادا".

# بەشی سی و دووەم: بەسەرهاتی جەنگەکان

## ( ١ ) فەرماندان بە نوێنەران بۆ ئاسانکاریی

٥٨٤ـ عن أبي موسى (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) بَعَثَهُ ومُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: "يَسِّرَا ولَا تُعَسِّرَا، وبَشِّرَا ولَا تُنَفِّرَا، وتَطَاوَعَا ولَا تَخْتَلِفَا". (البخاري/ الجهاد/ ٢٨٧٣)

لە (أبو موسى)وە (رضي الله عنه): پێغەمبەر (ﷺ) ئەوو (معاذ)ی نارد بۆ یەمەن و فەرمووی: "ئاسانکاریی بکەن و شت قورس مەکەن، موژدە دەربن و خەڵکی دوور مەخەنەوە، گوێڕایەڵی یەکتربن و لەنێوخۆتاندا ناکۆك مەبن".

## ( ٢ ) سنووری تەمەنی نێوان بچووك و گەورە لە چوون بۆ جەنگ

٥٨٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ، وأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي، وعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي. قَالَ نَافِعٌ: فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ (رحمه الله) وهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فَحَدَّثْتُهُ هَذَا الْحَدِيثَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَدٌّ بَيْنَ الصَّغِيرِ والْكَبِيرِ، فَكَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ كَانَ ابْنَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، ومَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجْعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ. (البخاري/ الشهادات/٢٥٢١)

(إبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: لە رۆژی جەنگی (أُحد)دا چواردە ساڵ بووم پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چاوی پێم کەوت مۆڵەتی نەدام، لە رۆژی (خندق) دا کە چاوی پێم کەوت تەمەنم پانزە ساڵ بوو، مۆڵەتیدام بجەنگم، (نافع) دەڵێ: هاتمە لای (عمر)ی کوڕی (عبدالعزیز) (رحمه الله) کە ئەو کاتە جێنشین بوو، ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەوە سنوری نێوان بچووك و گەورەیە، نووسراوی نارد بۆ کاربەدەستانی کە مووچە ببڕنەوە بۆ ئەو کەسەی تەمەنی پانزە ساڵە، هەرکەسیش لەوە خوارتربێت بیخەنە ڕیزی ئەو خێزانانەوە کە یارمەتی دەدرێن.

## ( ٣ ) ڕێگریی لە هەڵگرتنی قورئان بۆ خاکی دوژمن

٥٨٦ـ عن ابن عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يَنْهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ. (البخاري/ الجهاد/ ٢٨٢٨)

(إبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری دەکرد لە هەڵگرتنی قورئان لە کاتی سەفەرکردندا بۆ خاکی دوژمن، لەترسی ئەوەی نەبادا دوژمن دەست درێژی بکاتە سەر.

## ( ٤ ) سەفەرکردن بەشێکە لە سزا و ئازار

٥٨٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وطَعَامَهُ وشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وجْهِهِ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ". **(البخاري/ العمرة/ ١٧١٠)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "سەفەر بەشێکە لە سزا و ئازار، چونکە خەوو خواردن و خواردنەوە لەو کەسە قەدەغە دەکات، ئەگەر یەکێکتان لەسەفەرەکەیدا ئیشەکەی تەواو بوو، با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ ناوماڵ و خێزانی".

## ( ٥ ) بەشەو گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵ باش نییە

٥٨٨ـ عَنْ أَنَس ابْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ لَا يَطْرُقُ أَهْلَهُ لَيْلًا، وكَانَ يَأْتِيهِمْ غُدْوَةً أَوْ عَشِيَّةً. **(البخاري/ العمرة/ ١٧٠٦)**

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشەودا نەدەگەڕایەوە ناو ماڵ و خێزانی، بەڵکو لە کاتی بەیانیاندا یان دەمەو ئێوارە دەگەڕایەوە.

## ( ٦ ) نزا و پارانەوە لە پێش دەستپێکردنی جەنگ

٥٨٩ـ عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الدعاء قَبْلَ الْقِتَالِ؟ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي أَوَّلِ الْإِسْلَامِ، قَدْ أَغَارَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ وهُمْ غَارُّونَ، وأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الماء، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ وسَبَى سَبْيَهُمْ، وأَصَابَ يَوْمَئِذٍ –قَالَ يَحْيَى: أَحْسِبُهُ قَالَ –جُوَيْرِيَةَ– أَوْ قَالَ الْبَتَّةَ– ابْنَةَ الْحَارِثِ. وحَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (ﷺ)، وكَانَ فِي ذَلِكَ الْجَيْشِ. **(البخاري/ العتق/ ٢٤٠٣)**

(ابن عون) (ﷺ) دەڵێ: نامەم نارد بۆ (نافع) و پرسیاری پارانەوەی پێش جەنگم لێکرد؟ وتی: بۆی نووسیمەوە: ئەمە لەسەرەتای بڵاو بونەوەی ئیسلامەوە بوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو (بني المصطلق) ڕۆیشت، لەکاتێکا بێ ئاگا بوون، مەڕوماڵاتیان لە ئاو خواردنەوەدا بوون، جەنگا لەگەڵ جەنگاوەرانیاندا و ژن و منداڵی بەدیل گرتن، (یحیی) دەڵێ: (ابن عون) وتی: هەر لەو ڕۆژەدا وا گومان دەبەم کە (جویریة) یان بە دڵنیاییەوە کچەکەی (حارث)ی بە دیل گرت. ئەم فەرموودەیە (عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) بۆی گێڕامەوە کە لەناو سوپاکەدا بوو.

## ( ٧ ) نامەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ پادشاکان کە بانگهێشتی دەکردن بۆ خواپەرستی

٥٩٠ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ نَبِيَّ اللَّه (ﷺ) كَتَبَ إِلَى كِسْرَى وإِلَى قَيْصَرَ وإِلَى النَّجَاشِيِّ، وإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ، يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ، تَعَالَى ولَيْسَ بِالنَّجَاشِيِّ الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ).(البخاري/ الجنائز/ ١١٨٨)

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەی نووسی بۆ لای (کیسرا) و (قیصر) و (نجاشی) و بۆ هەموو خاوەن دەسەڵاتێکی نا موسڵمانی بە زەبر، بانگهێشتی دەکردن باوەڕ بهێنن بە خوای گەورە، ئەم (نجاشی)یە ئەو (نجاشی)یە نییە کە موسڵمان بوو، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی جەنازەی غائبی لەسەر کرد.

## ( ٨ ) پارانەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) و ئارامگرتنی لەسەر ئازاری دووڕووەکان

٥٩١ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَكِبَ حِمَارًا عَلَيْهِ إِكَافٌ، تَحْتَهُ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ، وأَرْدَفَ وراءَهُ أُسَامَةَ، وهُوَ يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، الْأَوْثَانِ والْيَهُود، فيهِمْ عَبْدُ اللَّه بْنُ أُبَيِّ وفِي الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللَّه بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ خَمَّرَ عَبْدُ اللَّه بْنُ أُبَيِّ أَنْفَهُ بِرِدَائِه، ثُمَّ قَالَ: لَا تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا. فَسَلَّمَ عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ (ﷺ)، ثُمَّ وقَفَ فَنَزَلَ، فَدَعَاهُمْ إِلَى اللَّه وقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّه بْنُ أُبَيّ: أَيُّهَا الْمَرْءُ، لَا أَحْسَنَ منْ هَذَا، إِنْ كَانَ مَا تَقُولُ حَقًّا فَلَا تُؤْذِنَا فِي مَجَالِسِنَا، وارْجِعْ إِلَى رَحْلِكَ، فَمَنْ جاءَكَ مِنَّا فَاقْصُصْ عَلَيْه. فَقَالَ عَبْدُ اللَّه بْنُ رَوَاحَةَ (رضي الله عنه): اغْشَنَا فِي مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ. قَالَ: فَاسْتَبَّ الْمُسْلِمُونَ والْمُشْرِكُونَ والْيَهُودُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَتَوَاثَبُوا، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ (ﷺ) يُخَفِّضُهُمْ، ثُمَّ رَكِبَ دَابَّتَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْد بْن عُبَادَةَ، فَقَالَ: "أَيْ سَعْدُ أَلَمْ تَسْمَعْ إِلَى مَا قَالَ أَبُو حُبَابٍ –يُرِيدُ عَبْدَ اللَّه بْنَ أُبَيّ– قَالَ: كَذَا وكَذَا". قَالَ: اعْفُ عَنْهُ يَا رَسُولَ اللَّه واصْفَحْ، فَوَاللَّه لَقَدْ أَعْطَاكَ اللَّهُ الَّذِي أَعْطَاكَ، ولَقَد اصْطَلَحَ أَهْلُ هَذه الْبُحَيْرَة أَنْ يُتَوِّجُوهُ فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا رَدَّ اللَّهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِي أَعْطَاكَهُ شَرِقَ بِذَلِكَ، فَذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَا رَأَيْتَ. فَعَفَا عَنْهُ النَّبِيُّ (ﷺ).(البخاري/ التفسير/ ٤٢٩٠)

(أسامة)ی کوڕی (زید) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سواری گوێدرێژێك بوو بوو، کۆپانێکی پێوەبوو. لە ژێر خۆیشیدا قەیفەیەکی (فَدَك)[٣]ی ڕاخستبوو، (أسامة)ی لە

[٣] فَدَك: شارۆچکەیەکە دوو قۆناغ لە مەدینەوە دوورە.

پشتیەوە سوار کردبوو سەردانی (سعد) کوڕی (عبادە)ی دەکرد کە نەخۆش بوو، لەناو (بنی الحارث)ی سەر بە (خزرج). ئەوەش لە پێش ڕووداوی بەدردا بوو، دای بەلای کۆڕێکدا کە هەمە جۆرە بوو لە موسڵمانان و بت پەرستان و جولەکە، (عبدالله) کوڕی (أُبي) لەناویاندا بوو، (عبدالله) کوڕی (ڕەواحە)ش لە کۆڕەکەدا بوو، هەر کە تەپ و تۆزی گوێدرێژەکە کەوتە سەر مەجلیسەکە، (عبدالله)ی کوڕی (أبي) بە پۆشاکەکەی لوتی خۆی داپۆشی، پاشان وتی: تۆز مەکە بەسەرماندا، پێغەمبەر (ﷺ) سڵاوی لێکردن. پاشان وەستاو دابەزی، بانگهێشتی کردن بۆ پەرستنی خوای گەورە و، قورئانی خوێند بەسەریاندا، ئینجا (عبدالله) کوڕی (اُبي) وتی: ئەی کابرا، قسەی لەمە باشترت نیە، ئەگەر ئەوەش ڕاستە کە دەیڵێیت، ئازاری مەجلیسەکەمان مەدە و بگەڕێرەوە بۆماڵی خۆت، هەر کەس لە ئێمە هاتەلات ئەوا لەوێ قسەی بۆ بکە، (عبدالله) کوڕی (رواحە) (ﷺ) وتی: بەڵکو سەرمان لێبدە لە کۆڕەکانماندا، ئێمە ئەوەمان پێخۆشە، پاشان موسڵمانەکان و بت پەرستەکان و جولەکە لەیەك تورە بوون و بە مەبەستی شەڕکردن هەستانە سەر پێ بۆیەکتر، پێغەمبەر (ﷺ)بەردەوام دایدەمرکاندنەوە، پاشان سواری ولاغەکەی بوویەوە تا چووە لای (سعد)کوڕی (عُبادة)، فەرمووی: "ئەی (سعد) ئایا نەتبیست کە (أبو حباب) - مەبەستی (عبدالله) کوڕی (اُبي)- ئاوا و ئاوای وت؟". (سعد) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی خۆش ببە و چاوپۆشی لێبکە، سوێند بە خوا ئەو پلەوپایەی خوا بە تۆی بەخشی لە کاتێکدا بوو کە خەڵکی ئەم شارە بڕیاریان دابوو کە تاجی لەسەرکەن و بیکەنە گەورەی خۆیان، کاتێ خوای گەورە ئەوەی لێسەندەوە بەو ڕاستیەی کە بە تۆی داوە زۆر نارەحەت و تەنگەتاو بوو، ئەوە بوو وای لێکرد کە ئەو هەڵوێستەی هەبێ کە بینیت، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) لێی خۆش بوو.

## ( ٩ ) خۆزگە نەخواستن بە ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن و، خۆڕاگری لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا

٥٩٢ـ عَنْ أَبِي النَّضْرِ، عَنْ كِتَابِ رَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) يُقَالُ لَهُ: عَبْدُ اللَّه بْنُ أَبِي أَوْفَى، فَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّه حِينَ سَارَ إِلَى الْحَرُورِيَّةِ يُخْبِرُهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ فِي بَعْضِ أَيَّامِه الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ يَنْتَظِرُ، حَتَّى إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ، قَامَ فِيهِمْ فَقَالَ: "يَا أَيُّهَا النَّاسُ لَا تَتَمَنَّوْا لِقَا و الْعَدُوِّ واسْأَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، واعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ". ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ (ﷺ)

وقَالَ: "اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، ومُجْرِيَ السَّحَابِ، وهَازِمَ الْأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ". **(البخاري/ الجهاد/ ٢٨٦١)**

(أبو النضر) دەڵێ: لەنامەی پیاوێکەوە لە تیرەی (أسلم) و لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کە پێی دەوترا: (عبدالله) کوڕی (أوفى) کە نووسیبوی بۆ (عمر) کوڕی (عبيدالله) کاتێ ڕۆشتبوو بەرەو (الحرورية)[1] ئاگاداری دەکات: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەیەکێ لە جەنگەکانیدا کە ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە، چاوەڕوانی کرد، هەتا خۆر بەرەو ئاوابوون چوو، ئینجا هەستاو فەرمووی: "ئەی خەڵکینە خۆزگە مەخوازن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، لەخوا بخوازن سەلامەت و پارێزراوبن، ئەگەر ڕووبەڕووشیان بوونەوە ئارامبگرن، ئەوەش بزانن کە بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە". دووبارە پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو فەرمووی: "ئەی خوایە، دابەزێنەری قورئان و هێنەری هەورەکان، ئەی ڕوخێنەری حیزب و تاقمە بێباوەڕەکان. تێکیان بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا".

## (١٠) دەرچوونی ئافرەتان لە ڕۆژی جەنگا

٥٩٣ ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وأَبُو طَلْحَةَ بَيْنَ يَدَيِ النَّبِيِّ (ﷺ) مُجَوِّبٌ عَلَيْهِ بِحَجَفَةٍ، قَالَ: وكَانَ أَبُو طَلْحَةَ رَجُلًا رَامِيًا شَدِيدَ النَّزْعِ، وكَسَرَ يَوْمَئِذٍ قَوْسَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، قَالَ: فَكَانَ الرَّجُلُ يَمُرُّ مَعَهُ الْجَعْبَةُ مِنَ النَّبْلِ، فَيَقُولُ: "انْثُرْهَا لِأَبِي طَلْحَةَ". قَالَ: ويُشْرِفُ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) يَنْظُرُ إِلَى الْقَوْمِ، فَيَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ بِأَبِي أَنْتَ وأُمِّي لَا تُشْرِفْ، لَا يُصِبْكَ سَهْمٌ مِنْ سِهَامِ الْقَوْمِ، نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ. قَالَ: ولَقَدْ رَأَيْتُ عَائِشَةَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ وأُمَّ سُلَيْمٍ – (رضي الله عنهما)– وإِنَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَانِ أَرَى خَدَمَ سُوقِهِمَا، تَنْقُلَانِ الْقِرَبَ عَلَى مُتُونِهِمَا، ثُمَّ تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِهِمْ، ثُمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلَآنِهَا، ثُمَّ تَجِيئَانِ تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، ولَقَدْ وقَعَ السَّيْفُ مِنْ يَدَيْ أَبِي طَلْحَةَ إِمَّا مَرَّتَيْنِ وإِمَّا ثَلَاثًا، مِنَ النُّعَاسِ. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٠٠)**

(أنس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: کاتێ کەلە ڕۆژی (اُحد)دا کەسانێ لە جەنگاوەران لە شەڕ هەڵهاتن و پێغەمبەریان بەجێهێشت، (أبو طلحة)یش لەبەردەمی

---

(٢) الحرورية: ناوچەیەکە (خەواریج)ی تێدابوو.

پێغەمبەردا بوو (ﷺ) بە پارچەیەك پێست بەری گرتبوو لە پێغەمبەر و شێوە قەڵغانێکی بۆ دروست کردبوو، (أنس) وتی: (أبو طلحة) پیاوێکی دەست ڕاست و تیر بەهێز بوو. لەو ڕۆژەدا دوو یاسێ کەوانی شکاند، هەر کە پیاوێ تێدەپەڕی بەلایدا و تیرخانی پێبووایە، پێغەمبەر دەیفەرموو: "تیرەکانت دانێ بۆ (أبو طلحة). پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە گۆشەیەکەوە دەیڕوانیە خەڵکەکە، (أبو طلحة) دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا، باوك و دایکم بە فیدات بن، دەرمەکەوە، نەبادا تیرێ لە تیرەکانی ئەو بێباوەڕانە بەرت بکەوێ، گیانم بە فیدای گیانت بێ. (أنس) وتی: بینیم بەچاوی خۆم وا عائیشەی کچی أبو بکر و (أم سليم) خۆیان هەڵکردووە بە جۆرێ کە خەڵخاڵی پێیانم دەبینی، کوندە ئاو لەسەر پشتیان بوو دەیانگواستەوە، پاشان کوندەکەیان خاڵی دەکردەوە لەدەمی جەنگاوەراندا، پاشان دەگەڕانەوە پڕیان دەکردەوە، دیسان دەهاتنەوە خاڵیان دەکردەوە لەدەمی جەنگاوەراندا، دوو جار سێ جار شمشێر لەدەستی (أبو طلحة) کەوتە خوارەوە لەتاو ئەوە کە خەو زۆری بۆ هێنابوو.

**٥٩٤ـ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ (ﷺ) قَالَتْ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ، فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ، وأُدَاوِي الْجَرْحَى، وأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى. (البخاري —٣٦٠٠—مناقب ابي طلحة (ﷺ))**

(أم عطية الأنصارية) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەوت جار چووم بۆ غەزا لە شوێنی چادر هەڵدانیان و سەربازگەی دواوە دەمامەوە خواردنم بۆ دروست دەکردن، زامدارەکانم تیمار دەکرد، چاودێری نەخۆشەکانم دەکرد.

## (١١) ڕێگریی کردن لە کوشتنی ژنان و منداڵان لە جەنگدا

**٥٩٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: وجِدَتِ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ تِلْكَ الْمَغَازِي، فَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ قَتْلِ النساء والصِّبْيَانِ. (البخاري/ الجهاد/ ٢٨٥٢)**

(عبدالله) کوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: لە غەزایەك لە غەزاکاندا ئافرەتێکی کوژراو بینرا، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگریی کرد لە کوشتنی ژنان و منداڵان.

## (١٢) بڕینی دارخورماکانی دوژمن و سوتاندنیان

**٥٩٦ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَطَعَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وحَرَّقَ. ولَهَا يَقُولُ حَسَّانُ (ﷺ):**

وهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيِّ    حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

وَفِي ذَلِكَ نَزَلَتْ: (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا) الْآيَةَ. **(البخاري/ المغازي/ ٢٩٨٤)**

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دارخورماكانی (بنو النضير) بڕی و سوتاندنیشی، لەم بارەیەوە حسان (شاعیری ئیسلام) (ﷺ) دەڵێ:

وهان على سراة بني لؤي   حريق بالبويرة[1] مستطيرُ

بەلای گەورەكانی (بني لؤی) وە ئاسان بوو ئاگرێ لە (بويرة) بكەوێتەوە تەشەنەبكات. هەر لەم بارەیەوە ئەم ئایەتەی سەرەوە هاتە خوارەوە كە ئەمە ماناكەیەتی: (هەر درەختێكی تەڕتان بڕیبێت یان وازتان لێهێنابێت و لەسەر بنجی خۆی مابێت (لەخەیبەردا) بە فەرمانی خوابووە و ویستی ئەوی لەسەرە، تا تاوانباران و لەسنوور دەرچووەكانی سەرشۆڕ و خەجاڵەت بكات).

**٥٩٧**-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (ﷺ) قَالَ: أَصَبْتُ جِرَابًا مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ، قَالَ: فَالْتَزَمْتُهُ، فَقُلْتُ: لَا أُعْطِي الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ هَذَا شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُتَبَسِّمًا. **(بخاري/ الخمس/ ٢٩٨٤)**

(عبدالله) كوڕی (مُغفل) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژی (خەیبەر) هیزەیەك(بەز)م دۆزیەوە" هەڵمگرت و وتم: ئەمڕۆ لەمە هیچ بەشی كەس نادەم. وتی: كە لامكردەوە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بەزەردەخەنەوە بینی.

## (١٣) حەلاڵكردنی دەستكەوتەكانی جەنگ تایبەتە بەم ئوممەتەوە

٥٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "غَزَا نَبِيٌّ مِنَ الْانبياء، فَقَالَ لِقَوْمِهِ: لَا يَتْبَعْنِي رَجُلٌ قَدْ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ، وهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا ولَمَّا يَبْنِ. ولَا آخَرُ قَدْ بَنَى بُنْيَاناءلَمَّا يَرْفَعْ سُقُفَهَا. ولَا آخَرُ قَد اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وهُوَ مُنْتَظِرٌ ولَادَهَا. قَالَ: فَغَزَا فَأَدْنَى لِلْقَرْيَةِ حِينَ صَلَاةَ الْعَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ لِلشَّمْسِ: أَنْتِ مَأْمُورَةٌ وأَنَا مَأْمُورٌ، اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيَّ شَيْئًا، فَحُبِسَتْ عَلَيْهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَجَمَعُوا مَا غَنِمُوا، فَأَقْبَلَت النَّارُ لِتَأْكُلَهُ فَأَبَتْ أَنْ تَطْعَمَهُ، فَقَالَ: فِيكُمْ غُلُولٌ، فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ، فَبَايَعُوهُ فَلَصِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ، فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ،

---

[1] البويرة: ناوی شوێنێكە لە گەڕەك و بانی بنو النضير.

فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ، فَبَايَعَتْهُ، قَالَ: فَلَصِقَتْ بِيَدِ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ، فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ، أَنْتُمْ غَلَلْتُمْ، قَالَ: فَأَخْرَجُوا لَهُ مِثْلَ رَأْسِ بَقَرَةٍ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: فَوَضَعُوهُ فِي الْمَالِ، وَهُوَ بِالصَّعِيدِ، فَأَقْبَلَتِ النَّارُ فَأَكَلَتْهُ، فَلَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لِأَحَدٍ مِنْ قَبْلِنَا، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا، فَطَيَّبَهَا لَنَا". **(البخاري/ الخمس/ ٢٩٥٦)**

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: "پێغەمبـەرێ لـە پێغەمبەران غەزایەكی كرد و، بە ئوممەتەكەیی وت: با پیاوێ شوێنم نەكەوێ كە ئـافرەتێكی مارەكردبـێ و، ویسـتبێتی بیگوێزێتـەوە و هێشـتا نەیگواسـتبێتەوە، هـەروەها كەسـێكی تـریش كـە خانوویـەكی كردبێتـەوە وهێشـتا سـەری نـەگرتبێ، یەكێكی تریش كە مەڕ یا حوشتری ئاوسی كڕی بێ و چاوەڕێی بێ بەچكەی ببێ، فەرمووی: غەزاكەی كرد و كات نوێژی عەسر یان دەوروبەری عەسر نزیكی گوندەكە بووبوویەوە، بە خۆری فەرموو: تـۆ فەرمانبـەرداری و منـیش فەرمانبـەردارم، خوایـە ماوەیەك ئەم خۆرە ڕاگرە بۆم. خۆرەكەی بۆ ڕاگیرا تاخوا سەری خست، فـەرمووی: دەستكەوتە جەنگیەكەیانیان كۆكردەوە، ئـاگر هـات بـۆ ئـەوەی بیسـوتێنێ كەچـی نەیسوتاند، پێغەمبەرەكە فەرمووی: گزیكارتان تێدایە، با لە هەر هۆزێـك كەسـێ بـێ پەیمانم بداتێ، پەیمانیان دایە، دەستی پیاوێك لكا بـە دەسـتیەوە، فـەرمووی: گـزی كارتان تێدایە، با هۆزەكەت هەمووی پەیمانم بـداتێ، ئینجـا هۆزەكـە پـەیمانی دایـە: دەستی لكابە دەستی دووسێ پیاوی هۆزەكەوە، فەرمووی: گزییەكـە لـە ئێوەدایـە، ئێوە گزیتان كردوە، فەرمووی: بەقەبارەی سەرە مانگایەك ئاڵتونیان بـۆ دەرهێنـا و خستیانە ناو ئەو دەستكەوتەوە كەلە دەشتەكە دانرابوو، ئاگرەكە هات و سـوتاندی، دەستكەوتەكانی شەڕ بۆ كەس حەڵاڵ نەكراوە لەپێش ئێمەوە، بـەڵام چـونكە خـوای گەورە لاوازی و بێدەستەڵاتی ئێمەی بینیوە، بۆیە حەڵاڵی كردووە بۆ ئێمە".

## ( ١٤ ) هێزەكان دەستكەوتی جەنگیان پێ دەدرێ

٥٩٩ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) سَرِيَّةً إِلَى نَجْدٍ، فَخَرَجْتُ فِيهَا، فَأَصَبْنَا إِبِلًا وَغَنَمًا، فَبَلَغَتْ سُهْمَانُنَا اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا، وَنُفِّلْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعِيرًا بَعِيرًا. **(البخاري/ الخمس/ ٢٩٦٥)**

(إبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێزێكی نارد بۆ (نەجد)، منیش لە گەڵیاندا ڕۆیشتم، حوشتر و مەڕێكی زۆر بووە دەستكەوتمان، بـە جـۆرێ كـە پشـكی

هەریەکەمان دوانزە حوشتر بوو، لەسەرووی ئەوەشەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکی حوشترێکی تری پێداین.

٦٠٠ـ عَنْ ابْنِ عُمَر (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَدْ كَانَ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لِأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً، سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ، والْخُمْسُ فِي ذَلِكَ واجِبٌ كُلِّه. **(البخاري/ الخمس/ ٢٩٦٦)**

(إبـن عمـر) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەسـتکەوتی جـەنگی دەدا بـە هەندێ لەو هێزانە کە دەیناردن بۆ جەنگ ئەمە تایبـەت بـەو هێزانـە بـوو، جگـە لـەو بەشەی کە لەکۆی گشتی دەستکەوتی جەنگی سوپاکە بەریان دەکەوت، واجبە پێنج یەك لە هەموو ئەو دەستکەوتە دەربکرێت لە پێش دابەشکردنی.

## ( ١٥ ) چەك وشمەکی کوژراو دەدرێ بە بکوژەکە

٦٠١ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) عَامَ حُنَيْنٍ، فَلَمَّا الْتَقَيْنَا كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ رَجُلًا مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ عَلَا رَجُلًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَاسْتَدَرْتُ إِلَيْه حَتَّى أَتَيْتُهُ مِنْ ورائه فَضَرَبْتُهُ عَلَى حَبْلِ عَاتِقه، وأَقْبَلَ عَلَيَّ، فَضَمَّنِي ضَمَّةً وجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ الْمَوْت، ثُمَّ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَأَرْسَلَنِي، فَلَحِقْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه)، فَقَالَ: مَا لِلنَّاس؟ فَقُلْتُ: أَمْرُ اللَّه (عز وجل)، ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ رَجَعُوا، وجَلَسَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: "مَنْ قَتَلَ قَتِيلًا لَهُ عَلَيْه بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ". قَالَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَقَالَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ الثَّالِثَةَ، فَقُمْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا لَكَ يَا أَبَا قَتَادَةَ". فَقَصَصْتُ عَلَيْه الْقِصَّةَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: صَدَقَ يَا رَسُولَ اللَّه، سَلَبُ ذَلِكَ الْقَتِيلِ عِنْدِي، فَأَرْضِه مِنْ حَقِّه، وقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رضي الله عنه): لَا هَا اللَّه إِذًا، لَا يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسُدِ اللَّه، يُقَاتِلُ عَنِ اللَّه وعَنْ رَسُولِه (ﷺ)، فَيُعْطِيكَ سَلَبَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "صَدَقَ، فَأَعْطِه إِيَّاهُ". فَأَعْطَانِي، قَالَ: فَبِعْتُ الدِّرْعَ فَابْتَعْتُ بِه مَخْرَفًا فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَإِنَّهُ لَأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الْإِسْلَامِ. **(بخاري/ الخمس/ ٢٩٧٣)**

(أبو قتـادة) (رضي الله عنه) دەڵـێ: سـاڵی (حـنين) لـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) چووین بۆ جەنگ، کاتێ ڕووبەرووی (دوژمنان) بووینەوە موسڵمانان توشی شـڵەژانێ بـوون، بینـیم، وا پیاوێـك لـە بێبـاوەڕان زاڵ بـووە بەسـەر موسـڵمانێکدا، منـیش سوڕامەوە بەلایدا تا چوومە پشتیەوە و شمشێرێکم دا لە ڕەگی لاملی، ڕووی تێکردم

و گوشیمی بە خۆیەوە، بۆنی مردنم لێ بەدی کرد، دوایی بەریدام و مرد، گەیشتمەوە بە (عمر)ی کوڕی (خطاب) و (ﷺ) وتی: ئەم خەڵکە بۆوای لێهات؟ وتم: فەرمانی خوای گەورەیە، پاشان خەڵکی گەڕانەوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دانیشت و فەرمووی: "هەرکەسێ کوژراوێکی کوشتبێ و بەڵگەیەکی هەبێ لەسەری ئەوا چەك و شمەکەکەی بۆ ئەو کەسەیە" (أبو قتادة) دەڵێ: هەستام وتم: کێ شایەتیم بۆ دەدا؟ پاشان دانیشتم، دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەکەی دووبارە کردەوە. منیش هەستام و وتم: کێ شایەتیم بۆدەدا؟ دیسان دانیشتمەوە، بۆ جاری سێیەم پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەکەی دووبارە کردەوە. هەستامەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەوە چیتە (أبو قتادة)؟ داستانەکەم بۆ گێڕایەوە، یەکێ لەناو خەڵکەکەدا وتی: ڕاست دەکات ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەك و شمەکی ئەو کوژراوە لای منە، ڕازی بکە با بۆ من بێت. (أبو بکر الصدیق) (ﷺ) وتی: هەرگیز نابێ ئەوە ببێ، پێغەمبەر ئەوە ناکات کە شێرێ لە شێرانی خوا بجەنگێ لە پێناو خواو پێغەمبەرەکەیدا و ئێستە چەك و شمەکەکەی بدات بە تۆ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ڕاست دەکات بیدەرەوە". ئەویش پێی دامەوە، (أبو قتادة) دەڵێ: زرێکەم فرۆشت و بە پارەکەی باغێکم لە (بنی سلمة) کڕی. ئەوەیش یەکەم سامانێ بوو کە لە ئیسلامدا دەستم بکەوێ و کردبێتم بە موڵکی خۆم.

## ( ١٦ ) چەك و شمەکی کوژراو بە ئیجتهاد دەدرێ بە یەکێ لە بکوژان

٦٠٢ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: بَيْنَا اناءاقفٌ فِي الصَّفِّ يَوْمَ بَدْرٍ، نَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي (وَشِمَالِي) فَإِذَا أَنَا بَيْنَ غُلَامَيْنِ مِنَ الْأَنْصَارِ حَدِيثَةٍ أَسْنَانُهُمَا، تَمَنَّيْتُ لَوْ كُنْتُ بَيْنَ أَضْلَعَ مِنْهُمَا، فَغَمَزَنِي أَحَدُهُمَا فَقَالَ: يَا عَمِّ، هَلْ تَعْرِفُ أَبَا جَهْلٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، ومَا حَاجَتُكَ إِلَيْهِ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ يَسُبُّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَئِنْ رَأَيْتُهُ لَا يُفَارِقُ سَوَادِي سَوَادَهُ حَتَّى يَمُوتَ الْأَعْجَلُ مِنَّا. قَالَ: فَتَعَجَّبْتُ لِذَلِكَ، فَغَمَزَنِي الْآخَرُ، فَقَالَ مِثْلَهَا، قَالَ: فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ نَظَرْتُ إِلَى أَبِي جَهْلٍ يَزُولُ فِي النَّاسِ، فَقُلْتُ: أَلَا تَرَيَانِ؟ هَذَا صَاحِبُكُمَا الَّذِي تَسْأَلَانِ عَنْهُ، قَالَ: فَابْتَدَرَاهُ فَضَرَبَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا حَتَّى قَتَلَاهُ، ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَاهُ، فَقَالَ: "أَيُّكُمَا قَتَلَهُ". فَقَالَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُمَا: أَنَا قَتَلْتُ، فَقَالَ: "هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا". قَالَا: لَا، فَنَظَرَ فِي السَّيْفَيْنِ، فَقَالَ: "كِلَاكُمَا قَتَلَهُ". وقَضَى بِسَلَبِهِ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ

الْجَمُوحِ، والرَّجُلَانِ: مُعَاذُ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ، ومُعَاذُ بْنُ عفراء. **(البخاري/الخمس/٢٩٧٢)**

(عبدالرحمن) كوڕى (عوف) (ﷺ) دەڵێ: لە كاتێكدا كە من لە ڕۆژى بەدردا لەناو ڕیزى (جەنگاوەران)دا وەستابووم، بەلاى ڕاست و چەپى خۆمدا سەیرم كرد خۆم بینیەوە لە نێوان دوو مێرد منداڵى ئەنصارى مەدینەیى تازە لاودا وەستاوم، ئاواتم خواست كە لە نێوان دووانى لەوانە بەهێزتردا بومایە، یەكێكیان چاوى لێداگرتم و وتى: مامە ئایا تۆ (أبو جهل) دەناسى؟ وتم: بەڵێ كوڕى برام كارت چییە پێی؟ وتى: هەواڵم پێگەیشتوە كە جنێو بە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) دەدات سوێند بەوكەسەى گیانى منى بەدەستە، ئەگەر بیبینم لاشەم لەلاشەى ناترازێ تا ئەو كەسەمان كە زووتر ئەجەلى هاتووە بمرێ. (عبد الرحمن) دەڵێ: لەو هەڵوێستە سەرم سوڕما. ئەوى تریشیان چاوى لێداگرتم و هەمان قسەى هاوەڵەكەى دووبارە كردەوە. زۆرى نەخایاند تا سەیرم كرد وا (أبوجهل) لە نێو خەڵكەكەدا دێت و دەچێ و وتم: ئایا نایبینن؟ ئەوە ئەو كەسەیە كە هەواڵتان پرسى، (عبدالرحمن) دەڵێ: هەڵیانكوتایە سەرى و (دەست پێشخەریان كرد) بە شمشێرەكانیان كەوتنە لێدانى تاكوشتیان، پاشان گەڕانەوە بۆ لاى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) و هەواڵەكەیان پێگەیاند، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: "كامتان كوشتى؟" هەریەكەیان وتى: من كوشتم، ئینجا فەرمووى: "ئایا شمشێرەكانتان سڕیوە؟" وتیان: نەخێر، سەیرى هەردوو شمشێرەكەى كرد، فەرمووى: "بەڵێ، هەردووكتان كوشتوتانە". فەرمانیدا چەك و شمەكەكەى أبو جهل بدرێ بە (معاذ) كوڕى (الجموح). دوو پیاوەكەش (معاذ) كوڕى (عمرو)ى كوڕى (الجموح) و (معاذ) كوڕى (عفراء) بوون.

## (١٧) چۆنێتی دابەشكردنی دەسكەوتی بێ جەنگ

**٦٠٣**-عَنْ مَالِكَ بْنَ أَوْسٍ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) فَجِئْتُهُ حِينَ تَعَالَى النَّهَارُ، قَالَ: فَوَجَدْتُهُ فِي بَيْتِهِ جَالِسًا عَلَى سَرِيرٍ مُفْضِيًا إِلَى رُمَالِهِ، مُتَّكِئًا عَلَى وسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ، فَقَالَ لِي: يَا مَالُ، إِنَّهُ قَدْ دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ قَوْمِكَ، وقَدْ أَمَرْتُ فِيهِمْ بِرَضْخٍ، فَخُذْهُ فَاقْسِمْهُ بَيْنَهُمْ. قَالَ: قُلْتُ: لَوْ أَمَرْتَ بِهَذَا غَيْرِي. قَالَ: خُذْهُ يَا مَالُ. قَالَ: فَجاء يَرْفَا فَقَالَ: هَلْ لَكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فِي عُثْمَانَ وعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ والزُّبَيْرِ وسَعْدٍ؟ فَقَالَ عُمَرُ: نَعَمْ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَدَخَلُوا، ثُمَّ جاء فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عَبَّاسٍ وعَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ:

نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمَا، فَقَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اقْضِ بَيْنِي وبَيْنَ هَذَا –وذكر كلاماً– (قالَ:) فَقَالَ الْقَوْمُ: أَجَلْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَاقْضِ بَيْنَهُمْ وأَرِحْهُمْ، فَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَوْسٍ: يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّهُمْ قَدْ كَانُوا قَدَّمُوهُمْ لِذَلِكَ. فَقَالَ عُمَرُ: اتَّئِدَا، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السماء والْأَرْضُ: أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ"؟ قَالُوا: نَعَمْ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى الْعَبَّاسِ وعَلِيٍّ (ﷺ) فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السماء والْأَرْضُ: أَتَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ"؟ قَالَا: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ اللَّهَ جَلَّ وعَزَّ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ (ﷺ) بِخَاصَّةٍ لَمْ يُخَصِّصْ بِهَا أَحَدًا غَيْرَهُ، قَالَ: (مَا أَفَا و اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ ولِلرَّسُولِ) –مَا أَدْرِي هَلْ قَرَأَ الْآيَةَ الَّتِي قَبْلَهَا أَمْ لَا– قَالَ: فَقَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَكُمْ أَمْوَالَ بَنِي النَّضِيرِ، فَوَاللَّهِ مَا اسْتَأْثَرَ عَلَيْكُمْ ولَا أَخَذَهَا دُونَكُمْ، حَتَّى بَقِيَ هَذَا الْمَالُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْخُذُ مِنْهُ نَفَقَةَ سَنَةٍ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ أُسْوَةَ الْمَالِ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السماء والْأَرْضُ: أَتَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، ثُمَّ نَشَدَ عَبَّاسًا وعَلِيًّا بِمِثْلِ مَا نَشَدَ بِهِ الْقَوْمَ: أَتَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالَا: نَعَمْ، قَالَ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ): اناءلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَجِئْتُمَا تَطْلُبُ مِيرَاثَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، ويَطْلُبُ هَذَا مِيرَاثَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ" فَرَأَيْتُمَاهُ كَاذِبًا آثِمًا غَادِرًا خَائِنًا، واللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ. ثُمَّ تُوُفِّيَ أَبُو بَكْرٍ واناءلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ووَلِيُّ أَبِي بَكْرٍ، فَرَأَيْتُمَانِي كَاذِبًا آثِمًا غَادِرًا خَائِنًا، واللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَصَادِقٌ بَارٌّ (رَاشِدٌ) تَابِعٌ لِلْحَقِّ، فَوَلِيتُهَا ثُمَّ جِئْتَنِي أَنْتَ وهَذَا، وأَنْتُمَا جَمِيعٌ وأَمْرُكُماءاحِدٌ فَقُلْتُمَا: ادْفَعْهَا إِلَيْنَا، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا، عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ أَنْ تَعْمَلَا فِيهَا بِالَّذِي كَانَ يَعْمَلُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَخَذْتُمَاهَا بِذَلِكَ، قَالَ: أَكَذَلِكَ؟ قَالَا: نَعَمْ، قَالَ: ثُمَّ جِئْتُمَانِي لِأَقْضِيَ بَيْنَكُمَا؟ ولَا واللَّهِ لَا أَقْضِي بَيْنَكُمَا بِغَيْرِ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَرُدَّاهَا إِلَيَّ. (البخاري/ الخمس/ ٢٩٢٧)

(مالك) كوڕی (أوس) دەڵێ: (عمر) كوڕی (الخطاب) ناردبووی بە دوامدا، خۆر بەرزبوبیەوە هاتم بۆلای: بینیم وا لە ماڵەكەیدا لەسەر حەسیرێكی دارخورما دانیشتوە و شانی داداوە لەسەر سەرینێكی پێست، پێی وتم: ئەی مالو (واتە ئەی مالك): چەند ماڵێ لە قەومەكەت هاتبوون بۆ لام، فەرمانمدا شتێكی كەمیان بدەنێ، بیبە بۆیان

بەشی بکە بەسەریاندا، (مالك) دەڵێ وتم: خۆزگە ئەو فەرمانەت بەسەر کەسێکی تردا بدایە، وتی: ئەی (مال) هەڵیگرە بیبە، (مالك) دەڵێ: لەوکاتەدا دەرگاوانەکەی هات و وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئایا کارێکت هەیە بە (عثمان) و (عبدالرحمن) کوڕی (عوف) و (زبیر) و (سعد)؟ (عمر) وتی: بەڵێ، مۆڵەتی دان و هاتنە ژوورەوە، پاشان هاتەوە و وتی: ئایا ئیشت هەیە بە (عباس) و (علي)؟ عمر: وتی بەڵێ، مۆڵەتیدان، (عباس) وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران دادوەری بکە لە نێوان من و ئەمەدا — قسەیەکی کرد– خەڵکەکە وتیان بەڵێ ئەی پێشەوای باوەڕداران، دادوەریان بکە و رزگاریان بکە. (مالك) کوڕی (أوس) وتی: هات بەخەیاڵمدا کە ئەوانە بۆ ئەو مەبەستە هێنابوونیان. (عمر) وتی: لەسەر خۆ بن، سوێندتان دەدەم، بەو خوایەی کە ئاسمان و زەوی بە خواستی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئێمە میراتیمان لێ نابرێ، ئەوەی لە پاش خۆمان بە جێی دێڵین دەکرێتە خێر"؟ هەموو وتیان: بەڵێ، پاشان ڕوویکردە (عباس) و (علي) و وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە ئاسمان و زەوی بە خواستی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن کە پێغەمبەریخوا(ﷺ) فەرموویەتی (ئێمە میراتیمان لێنابرێ، ئەوەی لە پاش خۆمان بەجێی دێڵین دەکرێتە خێر". وتیان: بەڵێ، (عمر) وتی: خوای گەورەو باڵادەست پێغەمبەری خوای (ﷺ) تایبەتمەند کردووە بە تایبەتمەندیەکەوە کە بەکەسی تری نەداوە، وتی: ئەم ئایەتانەی خوێندەوە کە ئەمە واتاکەیانە: (ئەو دەستکەوتانەی، خوا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی لە خەڵکی دێهات، ئەوە خوا بڕیاری لەسەرداوە کە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرە...".

نازانم ئایا ئایەتەکەی پێش ئەم ئایەتەی خوێندەوە یان نا– وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵو سامانی (بنو النضیر)ی دابەشکرد لە نێوانتاندا، بەخوا زوڵمی لێنەکردوون و فەزڵی کەسی نەداوە بەسەرتاندا و بێ ئێوەش وەری نەگرتوە بۆ خۆی، بە جۆرێ کە ئەو سامانە لێی مایەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بژێوی ساڵێکی لێهەڵدەگرت، پاشان ئەوەی کەمایەوە حیسابی هەموو سامان و ماڵەکەی تری بۆ کرد، پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بەو خوایە کە ئاسمان و زەوی بە خواستی ئەو وەستاون ئایا ئەمە دەزانن؟ هەموو وتیان: بەڵێ. پاشان هەمان سوێندی (عباس)و (علي)دا کە بە خەڵکەکەی وت: ئایا ئەمە دەزانن؟ هەردووکیان وتیان: بەڵێ. (عمر)

وتـی: كاتـێ كـه پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) وەفـاتی كـرد، (أبـو بكـر) (رضي الله عنه) وتـی: مـن جێگەداری پێغەمبەری خوام (ﷺ) ئێوه به جووته هاتن تۆ داوای میراتـی برازاكـەتت دەكـرد، ئـەویش هـات و داوای میراتـی ژنەكـەیی دەكـرد لـه بـاوكی، (أبـوبكر) وتـی: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "ئێمـه میراتیمـان لێنـابرێ، ئـەوەی لـه پـاش خۆمان بەجێی دێڵـین دەكرێتـه خێـر"، ئێـوەش واتـانزانی كـه (أبـو بكـر) درۆزنـه و تاوانباره و ستەمكارێكی گزیكاره، خوا دەزانێ كه ئەو (أبوبكر)، ڕاستگۆ و بەوەفا و ژیر و داناو شوێنكەوتەی ڕاستی بوو، پاشان (أبو بكر) كۆچـی دوایـی كـرد و منـیش جێگـری پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و أبـوبكر بـووم، منیشـتان بـه درۆزن و تاوانبـار و سـتەمكارێكی گـزی كـار هاتـه پـێش چـاو، خـوا دەزانـێ مـن ڕاسـتگۆ و بـەوەفام و شوێنكەوتەی حەقم، بوومه جێگەدار پاشان تۆ و ئەمه هاتنه لام ئێـوه یـەك بـوون و یەك ئیشتان هەبوو، وتتان: ئەو میراته بده به ئێمه، وتم: ئەگەر بتانەوێ دەیدەم بـه ئێوه، بەلام به مەرجێ پەیمانی خوا بەسەرتانەوەبێ كه پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـی لێكردووه، ئێوەش هەروای لێبكەن، لەسەر ئەو بەڵێنه وەرتـان گـرت، (عمـر) وتـی : ئایا وایه؟ به جووته وتیان: بـەڵێ. وتـی: ئێسـته هـاتوون بـۆ لام دادوەری بكـەم لـه نێوانتاندا، نەبه خوای گەوره هەرگیز بەبێ ئەو پەیمان و بڕیاره دادوەریتان ناكەم تا ڕۆژی قیامـەت دێ، ئەگـەر نـاتوانن ئـەو بـەڵێن و بڕیـاره ببەنەسـەر ئـەو سامانه بگێڕنەوه بۆم.

٦٠٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ فَاطِمَةَ (رضي الله عنها) بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَرْسَلَتْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رضي الله عنه) تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، مِمَّا أَفَا و اللَّهُ عَلَيْهِ بِالْمَدِينَةِ وفَدَكٍ ومَا بَقِيَ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه): إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) فِي هَذَا الْمَالِ". وإِنِّي واللَّهِ لَا أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْ صَدَقَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ حَالِهَا الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهَا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ولَأَعْمَلَنَّ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَدْفَعَ إِلَى فَاطِمَةَ (رضي الله عنها) شَيْئًا، فَوَجَدَتْ فَاطِمَةُ عَلَى أَبِي بَكْرٍ فِي ذَلِكَ، قَالَ: فَهَجَرَتْهُ فَلَمْ تُكَلِّمْهُ حَتَّى تُوُفِّيَتْ، وعَاشَتْ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سِتَّةَ أَشْهُرٍ، فَلَمَّا تُوُفِّيَتْ دَفَنَهَا زَوْجُهَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) لَيْلًا، ولَمْ يُؤْذِنْ بِهَا أَبَا بَكْرٍ، وصَلَّى عَلَيْهَا عَلِيٌّ، وكَانَ لِعَلِيٍّ مِنَ النَّاسِ وجْهَةٌ حَيَاةَ فَاطِمَةَ (رضي الله عنها)، فَلَمَّا تُوُفِّيَتِ اسْتَنْكَرَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه) وجُوهَ النَّاسِ، فَالْتَمَسَ مُصَالَحَةَ أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنه)

ومُبَايَعَتَهُ، ولَمْ يَكُنْ بَايَعَ تِلْكَ الْأَشْهُرَ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ: أَنِ ائْتِنَا، ولَا يَأْتِنَا مَعَكَ أَحَدٌ -كَرَاهِيَةَ مَحْضَرِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ)- فَقَالَ عُمَرُ لِأَبِي بَكْرٍ: واللَّه لَا تَدْخُلْ عَلَيْهِمْ وحْدَكَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: ومَا عَسَاهُمْ أَنْ يَفْعَلُوا بِي، **(إِنِّي)** واللَّه لَآتِيَنَّهُمْ. فَدَخَلَ عَلَيْهِمْ أَبُو بَكْرٍ فَتَشَهَّدَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّا قَدْ عَرَفْنَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَضِيلَتَكَ ومَا أَعْطَاكَ اللَّهُ، ولَمْ نَنْفَسْ عَلَيْكَ خَيْرًا سَاقَهُ اللَّهُ إِلَيْكَ، ولَكِنَّكَ اسْتَبْدَدْتَ عَلَيْنَا بِالْأَمْرِ، وكُنَّا نَحْنُ نَرَى لَنَا حَقًّا لِقَرَابَتِنَا مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَلَمْ يَزَلْ يُكَلِّمُ أَبَا بَكْرٍ حَتَّى فَاضَتْ عَيْنَا أَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ قَالَ: والَّذِي نَفْسِي بِيَدِه لَقَرَابَةُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ أَصِلَ مِنْ قَرَابَتِي، وأَمَّا الَّذِي شَجَرَ بَيْنِي وبَيْنَكُمْ مِنْ هَذِه الْأَمْوَالِ فَإِنِّي لَمْ آلُ فِيهَا عَنِ الْحَقِّ، ولَمْ أَتْرُكْ أَمْرًا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَصْنَعُهُ فِيهَا إِلَّا صَنَعْتُهُ. فَقَالَ عَلِيٌّ لِأَبِي بَكْرٍ: مَوْعِدُكَ الْعَشِيَّةُ لِلْبَيْعَة، فَلَمَّا صَلَّى أَبُو بَكْرٍ صَلَاةَ الظُّهْرِ رَقِيَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَشَهَّدَ، وذَكَرَ شَأْنَ عَلِيٍّ (ﷺ) وتَخَلُّفَهُ عَنِ الْبَيْعَة، وعُذْرَهُ بِالَّذِي اعْتَذَرَ إِلَيْهِ ثُمَّ اسْتَغْفَرَ. وتَشَهَّدَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) فَعَظَّمَ حَقَّ أَبِي بَكْرٍ، وأَنَّهُ لَمْ يَحْمِلْهُ عَلَى الَّذِي صَنَعَ نَفَاسَةً عَلَى أَبِي بَكْرٍ، ولَا إِنْكَارًا لِلَّذِي فَضَّلَهُ اللَّهُ (ﷻ) بِه، ولَكِنَّا كُنَّا نَرَى لَنَا فِي الْأَمْرِ نَصِيبًا فَاسْتُبِدَّ عَلَيْنَا بِه، فَوَجَدْنَا فِي أَنْفُسِنَا. فَسُرَّ بِذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ، وقَالُوا: أَصَبْتَ، فَكَانَ الْمُسْلِمُونَ إِلَى عَلِيٍّ (ﷺ) قَرِيبًا حِينَ رَاجَعَ الْأَمْرَ بِالْمَعْرُوفَ. **(البخاري/ المغازي/ ٣٩٩٨)**

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: (فاطمة)ی (ﷺ) کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردیە لای (أبو بكر الصديق) (ﷺ) داوای بەشە میراتی خۆی دەکرد لەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەجێیهێشتووە، لەوە کە خوا کردبوویە دەستکەوتی لە مەدینە و (فَدك) و ئەوەی لە پێنجیەکی (خیبر) مابوویەوە. (أبوبكر) (ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: "ئێمە میراتیمان لێناگیرێ، ئەوەی لە پاش خۆمان بەجێیدێڵین دەکرێت بەخێر"، بنەماڵەی محمد (ﷺ) لەو سامانە دەخۆن (واتە بيت المال) بەخوا منیش هیچ شتێ ناگۆڕم لە خێرو خێراتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرچۆن بووە دەبێ هەروا بمێنێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنی بەشکردوە منیش هەروا بەشی دەکەم بۆیە (أبو بكر) (ﷺ) هیچ شتێکی نەدا بە (فاطمة)، لەسەر ئەوە (فاطمة)لە (أبو بكر) زویر بوو، قسەی لێدابڕی و هاتوو چۆی نەکرد تا کۆچی دوایی کرد. دوای پێغەمبەری خوایش (ﷺ) شەش مانگ ژیا،

کاتێ کە کۆچی دوایی کرد (علي) کوڕی (أبو طالب)ی (ﷺ) مێردی بەشەو ئەسپەردەی کرد، (أبو بکر)یشی ئاگادار نەکرد، (علي) خۆی نوێژی لەسەر کرد، (علي) جیا لە خەڵکی تر هۆکار و بیانوی خۆی هەبوو لە بەیعەت نەدان بە (أبو بکر) (ﷺ) کە (فاطمة) بوو (ﷺ)، کاتێ کە (فاطمة) (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، (علي) (ﷺ) بینی کە ڕوخساری خەڵکی لە ئاستیدا گۆڕاوە، لە دوای ئەوەوە (علی) داوای ئاشتەوایی کرد لە (أبو بکر) (ﷺ) بە بەیعەتپێدانی کە ئەو چەند مانگەی ژیانی (فاطمة) (ﷺ) (علي) پەیمانی جێنشینی نەدابوو بە (أبو بکر) (ﷺ)، ناردی بۆ لای (أبو بکر) کە: بێ بۆ لامان بەڵام کەسی ترت لەگەڵ نەبێ، حەزی نەدەکرد (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) ئامادەبێ نەبادا دەرگای گلەیی بکرێتەوە، (عمر) بە (أبو بکر)ی وت: سوێند بە خوا بە تەنها ناچیت بۆ لایان، (أبو بکر) وتی: گوایا دەبێ چیم لەگەڵا بکەن بە خوا دەچم بۆ لایان، (أبو بکر) چوو بۆ لایان (علي) کوڕی (أبو طالب) بە دروشمی شایەتوومان دەستی کرد بە گفتوگۆ و ئینجاوتی: ئەی (أبو بکر) ئێمە نەجیبی و ڕێزی تۆمان زانیوە ئەو بەهرەیەش کە خوا پێی بەخشیویت هەرگیز حەسودیمان پێنەبردویت لەسەر ئەوە کە خوا پێی داویت، بەڵام تۆ بەسەربەخۆ ئەم کارەت کرد، ئێمە لەبەر نزیکیمان لە (محمد) پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وامان دەبینی کە مافێکمان هەیە، بەردەوام بوو لە قسەکردن لەگەڵ (أبو بکر) تاچاوانی (أبو بکر) پڕ بوو لە فرمێسك، کاتێ (أبوبکر) کەوتە قسە کردن ، وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، دڵنەواییکردنی خزمەکانی پێغەمبەری خوام (ﷺ) لامەبەست ترە تا خزمەکانی خۆم، بەڵام ئەو ناکۆکیەی کە لە نێوان منو ئێوەدا دروست بووە لەسەر ماڵ و سامانە لە ڕاستیدا من لەحەق لام نەداوە، هیچ فەرمانێکم پشتگوێ نەخستووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو سامانەدا کردبێتی، بەڵکو منیش هەر ئەوەم داوە، (علي) بە (أبو بکر)ی وت: کاتمان دوانیوەڕۆبێت بۆ پەیمان بەستن. کاتێ (أبو بکر) نوێژی نیوەڕۆی کرد چووە سەر دوانگە و شایەتوومانی هێناو وتی (لا الە الا اللە محمد رسول اللە). ئینجا باسی (علي) (ﷺ) کرد کە هۆی چی بوو، وا لە پەیماندان دواکەوتووە، ئەو عوزرەی قوبوڵکرد کە هێنایەوەو داوای لێخۆشبوونی گوناهی بۆ کرد. (علي) کوڕی (أبوطالب)یش (ﷺ) شایەتومانی هێنا و هاتە گۆ و ڕێزی تەواوی دانا بۆمافی (أبو بکر) (ﷺ)، وتی ئەوەی کەوای لێکردین ئەوە هەڵوێستمان بێ حەسودی بردن نەبوو بە (أبو بکر) وەیان نکوڵیکردن نەبوو بەرانبەر بەوپلە و پایەیە

که خوای گەورە بە (أبو بكر)ی (ﷺ) داوە، بەڵام ئێمە وامان دەبینی کە بەشێکمان هەیە و ئەو بەسەربەخۆیی و بێپرسینەوە ئەمکارەی کرد، شتێك لە دڵماندا دروست بوو، موسوڵمانەکانیش دڵخۆش بوون بە هەڵوێستەکەی و وتیان: پێکاوتە، هەر کە (علي) (ﷺ) بە خۆیدا چوویەوە موسڵمانانیش ڕوویان تێکردەوە.

٦٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَقْتَسِمُ ورَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي ومَؤُونَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ". (البخاري/ الوصايا/ ٢٦٢٤)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "میراتگرانم تاکە دیناریش بەش ناکەن لە نێوانیاندا، ئەوەی بەجێمهێشتووە لە پاش بژێوی خێزانەکانم و ئەو کەسەیش کە ئیشوکاری بۆ کردووم دەکرێتە خێر بۆ موسڵمانان.

## ( ١٨ ) ئازاد کردنی دیل

٦٠٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَيْلًا قِبَلَ نَجْدٍ، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ: ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ سَيِّدُ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ. فَخَرَجَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ لَهُ: "مَاذَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ". فَقَالَ: عِنْدِي يَا مُحَمَّدُ خَيْرٌ، إِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ، وإِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، وإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ. فَتَرَكَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْغَدِ، فَقَالَ: "مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ". قَالَ: مَا قُلْتُ لَكَ، إِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، وإِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ، (وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ). فَتَرَكَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى كَانَ مِنَ الْغَدِ، فَقَالَ: "مَاذَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ". فَقَالَ: عِنْدِي مَا قُلْتُ لَكَ: إِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، وإِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ، وإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَطْلِقُوا ثُمَامَةَ". فَانْطَلَقَ إِلَى نَخْلٍ قَرِيبٍ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسُولُهُ، يَا مُحَمَّدُ، واللَّهِ مَا كَانَ عَلَى الْأَرْضِ (وَجْهٌ) أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْ وجْهِكَ، فَقَدْ أَصْبَحَ وجْهُكَ أَحَبَّ الْوُجُوهِ كُلِّهَا إِلَيَّ، واللَّهِ مَا كَانَ مِنْ دِينٍ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْ دِينِكَ، فَأَصْبَحَ دِينُكَ أَحَبَّ الدِّينِ كُلِّهِ إِلَيَّ، واللَّهِ مَا كَانَ مِنْ بَلَدٍ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْ بَلَدِكَ، فَأَصْبَحَ بَلَدُكَ أَحَبَّ الْبِلَادِ كُلِّهَا إِلَيَّ، وإِنَّ خَيْلَكَ أَخَذَتْنِي وأَنَا أُرِيدُ الْعُمْرَةَ، فَمَاذَا تَرَى؟ فَبَشَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَمِرَ، فَلَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ، قَالَ لَهُ قَائِلٌ: أَصَبَوْتَ؟ فَقَالَ: لَا، ولَكِنِّي أَسْلَمْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ولَا واللَّهِ لَا يَأْتِيكُمْ مِنَ الْيَمَامَةِ حَبَّةُ حِنْطَةٍ حَتَّى يَأْذَنَ فِيهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ).(البخاري/ المغازي/ ٤١١٤)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ)، چـەند سـوارەیەکی نـارد ڕووبـە نەجد: پیاوێکیان لە تیرەی (بنی حنیفـة) بـەدیل هێنـا پێـی دەوتـرا: (ثمامـة) کـوڕی (أثال) گـەورەی خـەڵکی (یمامـە) بـوو بەسـتیانەوە بـە کۆڵەکەیـەك لـە کۆڵەکـەکانی مزگەوتەکەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوو بۆلای، پێـی فـەرموو: "ئـەی ثمامـة چـیت لاهەیە". وتی: ئەی موحەممەد (خێرم) لایـە، ئەگـەر بمکـوژی بـە حـەق دەمکـوژی، ئەگەر لێم خۆش ببـی ئـەوا لـە کەسـێکی سوپاسـگوزار خـۆش دەبـیٚ، ئەگـەر مـاڵ و سامانیشت دەویٚ ئەوا داوابکـە چـەندت دەویٚ پێـت دەدریٚ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بەجێی هێشت تا ڕۆژی دوایی دووبارە فەرمووی: "ئەی ثمامـة چـیت لا هەیـە" وتـی: هەر ئەوەیە کە عەرزم کردوویت، ئەگەر لێم خۆش ببی ئەوا لە کەسێکی سوپاسگوزار خۆش دەبی، ئەگەر بمکوژی بە حـەق دەمکـوژی. (ئەگـەر مـاڵ و سامانیشـت دەویٚ ئـەوا داوا بکـە چـەندت دەویٚ پێـت دەدریٚ)، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) (ئـەو ڕۆژیـش) بەجێی هێشت تا ڕۆژی سیٚیەم، (دووبارە) فـەرمووی: "ئـەی ثمامـة چـیت لا هەیـە" وتی: هـەر ئـەوەم هەیـە کـە عـەرزم کردویـت. ئەگـەر لـێم خـۆش ببـی لـە کەسـێکی سوپاسگوزار خۆش دەبی، ئەگـەر بمکـوژی بـە حـەق دەمکـوژی، وە ئەگـەر مـاڵ و سامانیشت دەویٚ ئەوا داوابکـە چـەندت دەویٚ پێـت دەدریٚ، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: "ثمامـة بـەردەن" بـە پرتـاو چـوو بـۆ نـاو باخـە خورمایـەکی نزیـك بـە مزگەوتەکەو خۆی شۆرد، پاشان هاتە ناو مزگەوتەکەوە، وتـی: (أشـهد أن لا الـه الاّ الله و أشهدُ أن محمداً عبده ورسوله)، ئەی (محمد) سوێند بە خوا لەم سـەر زەویـەدا ڕوخساریٚ نەبوو لەلام بە ڕادەی ڕوخساری تۆ ڕقم لێی بیٚ. وا ئێسـتە ڕوخسـاری تـۆ خۆشەویسترینی هەموو ڕوخسارەکانە لەلام، سوێند بە خوا هیچ ئاینێك نەبووە لەلام کە بەڕادەی ئایینەکەی تۆ ڕقم لێیبێت، وا ئێستا ئایینەکەی تۆ لـە هـەموو ئـایینێکی تـر خۆشەویسـترە لـەلام. سـوێند بـە خـوا هـیچ شـاریٚ نـەبوە لـەلام کـە بـە ڕادەی شارەکەی تۆ ڕقم لێیبێت، وا ئێستا شارەکەی تۆ بووەتە خۆشەویسترین شار لـەلام، سوارەکانی تۆ منیان گرت لە کاتێکدا کە مـن دەمویسـت بچـم بـۆ عـەمرە، فـەرمانت بەچییە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی پێدا و فەرمانیشی پێکرد کە عەمرە بکـات. کاتیٚ کە گەیشتەوە مەککە یـەکیٚ پێـی وت، ئایـا لەدینەکـەت هەڵگەڕایتـەوە؟ وتـی: نەخێر، بەڵام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) موسـڵمان بـووم ، سـوێند بـە خـوا جـارێکی تـر لـە یەمامـەوە دەنکـە گـەنمێکتان بـۆ نایـەت تـا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) مۆڵەتی پێنەدات.

## ( ١٩ ) دەرکردنی جولەکە لە مەدینە

٦٠٧ـ عن أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ". فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى جِئْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَنَادَاهُمْ، فَقَالَ: "يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا". فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ذَلِكَ أُرِيدُ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا". فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ذَلِكَ أُرِيدُ". فَقَالَ لَهُمُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: "اعْلَمُوا أَنَّمَا الْأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَأَنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الْأَرْضِ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلَّا فَاعْلَمُوا أَنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ". **(بخاري/ الإكراه: ٦٥٤٥)**

(ابو هريره) (ﷺ) دەڵێ : لەکاتێکا ئێمە لەمزگەوت دانیشتبووین پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناومان و فەرمووی: "دەرچن بۆ جولەکە" ئێمە لەخزمەتیا دەرچووین تاگەیشتینە لایان، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردن، فەرمووی: "ئەی جەماوەری جولەکە ! خۆتان بدەن بەدەستەوە سەلامەت دەبن" جولەکەکان وتیان: راتگەیاند ئەی باوکی قاسم ، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووی: "منیش ئەوەم دەوێت" بۆ سێیەم جار فەرمووی: "باش بزانن زەوی هی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) من دەمەوێت لەم زەویە دوورتان بخەمەوە، هەرکەس شتێکی هەیە با بیفرۆشێت، ئەگەر نا، باش بزانن زەوی هی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ).

## ( ٢٠ ) حوکمی کەسێ کە دەجەنگێ و پەیمان دەشکێنێ

٦٠٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: أُصِيبَ سَعْدٌ (ﷺ) يَوْمَ الْخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ **(يُقَالُ لَهُ)** ابْنُ الْعَرِقَةِ، رَمَاهُ فِي الْأَكْحَلِ، فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ يَعُودُهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ الْخَنْدَقِ وَضَعَ السِّلَاحَ فَاغْتَسَلَ، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ وَهُوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الْغُبَارِ، فَقَالَ: وَضَعْتَ السِّلَاحَ؟ وَاللَّهِ مَاوَضَعْنَاهُ، اخْرُجْ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَأَيْنَ". فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، فَقَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْحُكْمَ فِيهِمْ إِلَى سَعْدٍ، قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ الْمُقَاتِلَةُ، وَأَنْ تُسْبَى الذُّرِّيَّةُ وَالنِّسَاءُ، وَتُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ. قَالَ هِشَامٌ: قَالَ أَبِي: فَأُخْبِرْتُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَقَدْ حَكَمْتُ فِيهِمْ بِحُكْمِ اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ" وَفِي رِوَايَةٍ: "حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ". وَقَالَ مَرَّةً: "لَقَدْ حَكَمْتَ بِحُكْمِ الْمَلِكِ". **(البخاري/ المغازي/ ٣٨٩٦)**

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: (سعد) لە ڕۆژی خندقدا زامدار بوو، پیاوێکی قورەیشی تیری تێگرت کە پێیان دەوت (أبن العَرِقةَ) ، تیرەکە شاڕەگی باڵی گرت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) چادرێکی بۆ هەڵدا لەمزگەوت و زوو زوو سەردانی دەکرد، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) خۆی شۆرد جوبرەئیل هات سەری خۆی دەتەکان لەتۆز وتی: چەکت دانا؟ سوێند بەخوا ئێمە دامان نەنانەوە، دەرچۆ بۆیان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بۆ کوێ؟" جبریل ئاماژەی کرد بۆ (بنو قریظة)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵیاندا جەنگا، هاتنە سەر ئەوە کە ڕازی ببن بە حوکمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ)یش حوکمەکەی دایە دەستی (سعد)، (سعد) وتی: حوکمی من ئەوەیە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن، ژن و منداڵیان بە دیل ببرێ، وە ماڵ و سامانیان دابەش بکرێ، هشام دەڵێ: باوکم وتی: ئاگادارکرام، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بەڕاستی حوکمێکت لەسەریاندا کە حوکمی خوای گەورە و باڵادەستە". (لە راستیدا جولەکەکان بەردەوام لە دژایەتیکردنی ئیسلام و پیلانگێڕان بوون دژی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیە دەرکران).

# بەشی سی وسێیەم: کۆچکردن و جەنگەکان

## (١) کۆچی پێغەمبەر (ﷺ)

٦٠٩- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبراء بْنَ عَازِبٍ (رضي الله عنه) يَقُولُ: جاء أَبُو بَكْرٍ (الصِّدِّيق) (رضي الله عنه) إِلَى أَبِي فِي مَنْزِلِهِ، فَاشْتَرَى مِنْهُ رَحْلًا، فَقَالَ لِعَازِبٍ: ابْعَثْ مَعِيَ ابْنَكَ يَحْمِلْهُ مَعِي إِلَى مَنْزِلِي، فَقَالَ لِي أَبِي: احْمِلْهُ، فَحَمَلْتُهُ وخرَجَ أَبِي مَعَهُ يَنْتَقِدُ ثَمَنَهُ، فَقَالَ لَهُ أَبِي: يَا أَبَا بَكْرٍ حَدِّثْنِي كَيْفَ صَنَعْتُمَا لَيْلَةَ سَرَيْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ: نَعَمْ، أَسْرَيْنَا لَيْلَتَنَا كُلَّهَا حَتَّى قَامَ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ، وخَلَا الطَّرِيقُ فَلَا يَمُرُّ فِيهِ أَحَدٌ، حَتَّى رُفِعَتْ لَنَا صَخْرَةٌ طَوِيلَةٌ لَهَا ظِلٌّ لَمْ تَأْتِ عَلَيْهِ الشَّمْسُ بَعْدُ، فَنَزَلْنَا عِنْدَهَا، فَأَتَيْتُ الصَّخْرَةَ فَسَوَّيْتُ بِيَدِي مَكَانًا يَنَامُ فِيهِ النَّبِيُّ (ﷺ) فِي ظِلِّهَا، ثُمَّ بَسَطْتُ عَلَيْهِ فَرْوَةً، ثُمَّ قُلْتُ: نَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وأَنَا أَنْفُضُ لَكَ مَا حَوْلَكَ. فَنَامَ، وخَرَجْتُ أَنْفُضُ مَا حَوْلَهُ، فَإِذَا أَنَا بِرَاعِي غَنَمٍ مُقْبِلٍ بِغَنَمِهِ إِلَى الصَّخْرَةِ، يُرِيدُ مِنْهَا الَّذِي أَرَدْنَا، فَلَقِيتُهُ فَقُلْتُ: لِمَنْ أَنْتَ يَا غُلَامُ؟ فَقَالَ: لِرَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، قُلْتُ (له): أَفِي غَنَمِكَ لَبَنٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، (قَالَ) قُلْتُ: أَفَتَحْلُبُ لِي؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَخَذَ شَاةً، فَقُلْتُ لَهُ: انْفُضِ الضَّرْعَ مِنَ الشَّعَرِ والتُّرَابِ والْقَذَى –قَالَ: فَرَأَيْتُ الْبراء يَضْرِبُ بِيَدِهِ عَلَى الْأُخْرَى يَنْفُضُ– فَحَلَبَ لِي فِي قَعْبٍ مَعَهُ كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، قَالَ: ومَعِي إِدَاوَةٌ أَرْتَوِي فِيهَا لِلنَّبِيِّ (ﷺ) لِيَشْرَبَ مِنْهَا ويَتَوَضَّأَ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) وكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُ مِنْ نَوْمِهِ، فَوَافَقْتُهُ اسْتَيْقَظَ، فَصَبَبْتُ عَلَى اللَّبَنِ مِنَ الماء حَتَّى بَرَدَ أَسْفَلُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْرَبْ مِنْ هَذَا اللَّبَنِ، قَالَ: فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ، ثُمَّ قَالَ: "أَلَمْ يَأْنِ لِلرَّحِيلِ". قُلْتُ: بَلَى (يا رسول الله) قَالَ: فَارْتَحَلْنَا بَعْدَمَا زَالَتِ الشَّمْسُ، واتَّبَعَنَا سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكٍ، قَالَ: ونَحْنُ فِي جَلَدٍ مِنَ الْأَرْضِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُتِينَا، فَقَالَ: "لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا". فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ(ﷺ) فَارْتَطَمَتْ فَرَسُهُ إِلَى بَطْنِهَا (أُرَى) فَقَالَ: إِنِّي قَدْ عَلِمْتُ أَنَّكُمَا قَدْ دَعَوْتُمَا عَلَيَّ، فَادْعُوَا لِي، فَاللَّهُ لَكُمَا أَنْ أَرُدَّ عَنْكُمَا الطَّلَبَ، فَدَعَا اللَّهَ فَنَجَا، فَرَجَعَ لَا يَلْقَى أَحَدًا إِلَّا قَالَ: قَدْ كَفَيْتُكُمْ مَا هَاهُنَا، فَلَا يَلْقَى أَحَدًا إِلَّا رَدَّهُ، قَالَ: ووَفَى لَنَا. (البخاري/ المناقب/ ٣٤١٩)

(أبو أسحاق) دەڵێ: لە (البراء) کوڕی (عازب)م بیست (رضي الله عنه) دەیوت: (أبو بکر الصدیق) (رضي الله عنه) هات بۆلای باوکم لە ماڵەوە، زینێکی لە باوکم کڕی و پێی وت: کوڕەکەت بنێرە لەگەڵمدا بۆم هەڵبگرێ تا ماڵی خۆمان، باوکم پێی وتم: بۆی

هەڵبگرە، منیش هەڵم گرت و باوکیشم لەگەڵیدا هاتەدەرەوە نرخەکەیی لێوەربگرێ، باوکم پێی وت: ئەی (أبو بكر) پێم بڵێ، ئەو شەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کۆچتانکرد چیتانکرد؟ وتی: بەڵێ ئەو شەوەی کە کۆچمان کرد هەموو شەوەکەو تاسبەینێ نیوەڕۆش ئێمە هەر ڕێگەمان بڕی. ڕێگەکە چۆڵ بوو کەسی پێدا نەدەڕیشت تا تاشە بەردێکی درێژمان لێ دەرکەوت کە سێبەری هەبوو، هێشتا خۆری نەگەیشتبوویە، لاماندایە لای تاشەکە، هاتمە لای تاشەکەو بە دەستم شوێنێکم تەختکرد لە سێبەرەکەیدا تا پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا بخەوێ، پاشان فەروەیەکم لەسەری ڕاخست، دوایی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بخەوە، منیش پاسەوانیت دەکەم و چاودێری دەوروبەرت دەکەم، (پێغەمبەر) (ﷺ) خەوت منیش ڕۆیشتم چاودێری دەوروبەرەکەیم دەکرد لەناکاو بینیم وا شوانێکی مەڕ بە مەڕەکانیەوە ڕووە و بەردەکە دێ، ئەویش ئەوەی لێدەویست کە ئێمە ویستبومان، پێی گەیشتمو وتم: کوڕە تۆ شوانی کێیت؟ وتی: هی پیاوێکی خەڵکی مەدینەم، وتم پێی: ئایا مەڕەکانت شیریان تێدایە، وتی: بەڵێ، وتم: ئایا بڕێ شیرم بۆ دەدۆشیت؟ وتی: بەڵێ مەڕێکی گرت و، منیش پێم وت: گوانەکەی بتەکێنە لە موو خۆڵ و پیسی أبو اسحاق وتی: (البراء)م بینی ئەم دەستی دەدا بەو دەستەکەی تریداو دەیتەکاند– کەمێ شیری دۆشیە ناو قاپێکی دارین، منیش جەوەنەیەك ئاوم پێ بوو لێم دادەکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) تا لێی بخواتەوە و دەست نوێژی پێ بگرێ– هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و حەزم نەکرد لە خەوەکەی بە ئاگای بهێنمەوە، بەڵام لەو کاتەدا خۆی بە ئاگاهاتەوە، لە ئاوەکەم کرد بەسەر شیرەکەدا هەتا بەشی خوارەوەی ساردبوویەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەم شیرە بخۆرەوە، لێی خواردەوە، ئەوەندەی من پێم خۆش بوو پاشان فەرمووی: "ئایا کاتی ڕۆیشتن نەهاتووە" وتم: بەڵێ (ئەی پێغەمبەری خوا)، لە دوانیوەڕۆ کە وتینەڕێ، (سراقە)ی کوڕی (مالك) شوێنمان کەوتبوو، ئێمەش لە زەویەکی ڕەقەمەنیدا بووین، ئینجا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هاتن بۆمان، فەرمووی: "خەمت نەبێ خوامان لەگەڵە" پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای لێکرد و هەر چوار پەلی ئەسپەکەی هەتا ژێر سکی نوقمی زەویەکە بوون، (سراقة) وتی: من دەزانم کە ئێوە دوعاتان لێکردووم، ئێستە دوعام بۆ بکەن، پەیمانی خواتان دەدەمێ هەر کەس بەدواتاندا بێت بیگێڕمەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای بۆ

کرد و ڕزگاری بوو، گەڕایەوەو بگەیشتایە بە هەرکەسێ پێی دەوت: ئەم ڕێگەیەم بۆ تاقی کردوونەتەوە (خۆتان ماندوو مەکەن) بە هەرکەس بگەیشتایە دەیگێڕایەوە، (سراقە) بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر.

## (٢) جەنگی ئوحود

**٦١٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) أُفْرِدَ يَوْمَ أُحُدٍ فِي سَبْعَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ ورَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ، فَلَمَّا رَهِقُوهُ قَالَ: "مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا ولَهُ الْجَنَّةُ، أَوْ هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ". فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، ثُمَّ رَهِقُوهُ أَيْضًا فَقَالَ: "مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا ولَهُ الْجَنَّةُ. أَوْ: هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ". فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قُتِلَ السَّبْعَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِصَاحِبَيْهِ: "مَا أَنْصَفْنَا أَصْحَابَنَا". (البخاري ٢٧٥٤– الجهاد–لبس البيضة)**

(انس)ی کوڕی (مالك)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ حەوت کەس لەپشتیوانان و دووکەس لەقوڕەیشیەکان جیاکرانەوە لەرۆژی ئوحوددا، کاتێ ویستیان هێرش بکەنە سەریان، فەرمووی: "کێ ئەوانەمان لەکۆڵ دەکاتەوە دەچێتە بەهەشت (یا هاوڕێمە لەبەهەشتا)؟ یەکێك لەپشتیوانەکان چووە پێشەوە بۆیان و جەنگا هەتا کوژرا، دووبارە ویستیان هێرش بکەنەوە سەریان، فەرمووی: "هەرکەس ئەوانەمان لەکۆڵ دەکاتەوە دەچێتە بەهەشت (یا: هاوڕێمە لەبەهەشتا) پیاوێك لەپشتیوانەکان چووە پێشەوە بۆیان، جەنگا لەگەڵیانا هەتا کوژرا، بەوشێوەیە هەتا هەر حەوتەکەیان کوژران، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بەدوو هاوڕێکەی فەرموو: بەئینصاف نەبووین لەگەڵ هاوەڵەکانماندا".

## (٣) برینداربوونی پێغەمبەر (ﷺ)

**٦١١ـ عَنْ أَبِي حَازِمٍ: عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَاعدي يَسْأَلُ عَنْ جُرْحِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: جُرِحَ وجْهُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ وهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِه، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ (رضي الله عنها) –بِنْتُ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)– تَغْسِلُ الدَّمَ، وكَانَ عَلِيٌّ (بْنُ أَبِي طَالِبٍ)(رضي الله عنه) يَسْكُبُ عَلَيْهَا بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الماءَ لَا يَزِيدُ الدَّمَ إِلَّا كَثْرَةً، أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَادًا، ثُمَّ أَلْصَقَتْهُ بِالْجُرْحِ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ. (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٥٤)**

(أبو حزام) دەڵێ: گوێی لە (سهل) کوڕی (سعد الساعدي) بوە کە پرسیاری لێکرا لە بارەی برینداری پێغەمبەر خوا (ﷺ) لە رۆژی ئوحوددا، سەعد وتی: دەموچاوی

پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) برینـدار بـوو یـەکێ لـە چـواردانەکەی پێشـەوەی شـکێنرا، خودەکەی سەرسەری پارچە پارچە بوو، فاطمة (رضي الله عنها) –کچی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) –خوێنەکـەی دەشـۆری، وە (علـي) کـوڕی (أبـو طالـب)(رضي الله عنه) ئـاوی دەکـرد بەسـەر خوێنەکەدا بە (قـەڵغان)، هـەر کـە فاطمـة بینـی کـە ئاوەکـە تـا دێ خوێنەکـە زیـاتر دەکـات، پارچـە حەسـیرێکی سـوتاند هـەتا بویـە خۆڵـەمێش، پاشـان لکانـدی بـە زامەکەوەو، خوێنەکەی وەستایەوە.

## (٤) توڕەیی خوا سەختە لەسەر ئەو کەسەی

**٦١٢ـ عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّه عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا (هَذَا) بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ"). وهُوَ حِينَئِذٍ يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِه، وقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّه (عز وجل) عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ". (البخاري/ المغازي/ ٣٨٤٥)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "توڕەیی خوا سەختە لەسەر کەسانێ ئەوەیان کرد بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوکاتەدا ئاماژەی دەکرد بۆ دانـی پێشـەوەی خـۆی، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: "تـوڕەیی خـوا (عز وجل) سەختە لەسەر ئەو پیاوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیکوژێ لە پێناوی خوادا"

## (٥) ئەو دەردیسەریەی تووشی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو لەلایەن گەلەکەیەوە

**٦١٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّه (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّه، هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: "لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِك، وكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَة، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَال، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلَّا بِقَرْنِ الثَّعَالِب، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ (عَزَّ وجَلَّ) قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ ومَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ وسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ، وقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِك، فَمَا شِئْتَ؟ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الْأَخْشَبَيْنِ". فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلَابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وحْدَهُ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا". (البخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٩٥)**

(عائشة) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) وت: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ڕۆژی وات بەسەردا هاتووە کە سەختتربێت لە ڕۆژی ئوحود؟ فەرمووی: "دەردی سەری زۆرم بەسەرهاتووە لە قەومەکەتەوە، سەختترین شت کە بەسەرمهاتووە لێیان، ڕۆژی (العقبة) بوو، چوومە لای (إبن عبد یالیل) کوڕی (عبد کلال) داواکەی جێبەجێ نەکردم، ڕۆیشتم و خەفەت دایگرتم و ئاگام لە خۆم نەما، تا لە (قرن الثعالب)[1] بە ئاگا هاتمەوە، کە سەرم بەرزکردەوە، هەورێکم بینی سێبەری بۆ کردبووم، کە سەیرم کرد جوبرەئیلی لەناودابوو، بانگی لێکردم و وتی: خوا (ﷻ) قسەی قەومەکەتی بیست کە پێیان وتی: داواکەیان ڕەت کردیتەوە، ئەوا فریشتەی کێوەکانی بۆ ناردویت تا فەرمانی پێبکەیت چیت دەوێ پێیان بکات، فریشتەی کێوەکان بانگی کردم و سەلامی لێکردم، پاشان وتی: ئەی موحەممەد خوا قسەی قەومەکەتی بیست کە پێیان وتی، منیش فریشتەی کێوەکانم پەروەردگارەکەت ناردوومی بۆلای تۆ تا چیت دەوێ فەرمانم پێبکەیت؟ ئەگەر بتەوێ هەردوو کێوەکەی (مەککە) دەهێنمەوە یەك بەسەریاندا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بەڵکو ئەوەم دەوێ کە خوای گەورە هەر لە پشتی خۆیان کەسانێکیان لێدەربهێنێ خوای تاکو تەنها بپەرستن و هیچ شتێ نەکەنە هاوەڵی".

٦١٤ـ عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ (ﷺ) قَالَ: دَمِيَتْ إِصْبَعُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الْمَشَاهِد، فَقَالَ:

**هَلْ أَنْتِ إِلَّا إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ (بخاري/ الجهاد/ ٢٦٤٨)**

(جندب) کوڕی (سفیان) (ﷺ) دەڵێ:پەنجەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە یەکێ لە جەنگەکاندا خوێنی لێهات، فەرمووی: "تۆ تەنها پەنجەیەکیت کە لە ڕێگای خوادا تووش بوویت و خوێنت لێهاتووە"

تۆ تەنها پەنجەیەکی خوێنت لێهاتووە و لە پێناوی خوادا ئەوەت بەسەرهاتووە.

٦١٥ـ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وأَبُو جَهْلٍ وأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، وقَدْ نُحِرَتْ جَزُورٌ بِالْأَمْسِ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: أَيُّكُمْ يَقُومُ إِلَى سَلَا جَزُورِ بَنِي فُلَانٍ، فَيَأْخُذُهُ فَيَضَعُهُ فِي كَتِفَيْ مُحَمَّدٍ (ﷺ) إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى

---

[1] قرن الثعالب: شوێنێکە نزیکی مەککە.

الْقَوْمِ فَأَخَذَهُ، فَلَمَّا سَجَدَ النَّبِيُّ (ﷺ) وضَعَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، قَالَ: فَاسْتَضْحَكُوا، وجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ، وأَنَا قَائِمٌ أَنْظُرُ، لَوْ كَانَتْ لِي مَنَعَةٌ طَرَحْتُهُ عَنْ ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، والنَّبِيُّ (ﷺ) سَاجِدٌ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى انْطَلَقَ إِنْسَانٌ فَأَخْبَرَ فَاطِمَةَ (ﷺ) فَجَاءَتْ وهِيَ جُوَيْرِيَةٌ فَطَرَحَتْهُ عَنْهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيْهِمْ تَشْتِمُهُمْ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (ﷺ) صَلَاتَهُ رَفَعَ صَوْتَهُ ثُمَّ دَعَا عَلَيْهِمْ، وكَانَ إِذَا دَعَا دَعَا ثَلَاثًا، وإِذَا سَأَلَ سَأَلَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ" ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا سَمِعُوا صَوْتَهُ ذَهَبَ عَنْهُمُ الضِّحْكُ، وخَافُوا دَعْوَتَهُ، ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، وعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وشَيْبَةَ ابْنِ رَبِيعَةَ، والْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ، وأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ.." . وذَكَرَ السَّابِعَ ولَمْ أَحْفَظْهُ، فَوَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا (ﷺ) بِالْحَقِّ، لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ سَمَّى صَرْعَى يَوْمَ بَدْرٍ، ثُمَّ سُحِبُوا إِلَى الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ، قَالَ أَبُو إِسْحَقَ: الْوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ غَلَطٌ فِي هَذَا الْحَدِيثِ. **(البخاري/ الوضوء/ ٢٣٧)**

(أبن مسعود) (ﷺ) دەڵێ: له كاتێكدا كه پێغەمبەری خوا له پەنای كەعبەدا نوێژی دەكرد، أبوجهل و چەند هاوەڵێكی دانیشتبوون، ڕۆژی پێشووتر حوشترێك سەربڕابوو، أبو جهل وتی: كامتان هەڵدەستێ و ورگ و ڕیخۆڵەی ئەو حوشترەی فلان تیره هەڵدەگرێ و دەیخاته سەر هەردوو شانی موحەممەد (ﷺ) هەر كه سوجدەی برد؟ نەگبەتترین كەسی قەومەكە پەلاماری دایه و هەڵیگرت، كاتێ كه پێغەمبەر (ﷺ) سوجدەی برد خستیه نێوان هەردوو شانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا هەموو دایانه قاقای پێكەنین، به جۆرێ كه لاردەبوونەوەو دەكەوتن بەسەریەكتریدا، منیش وەستا بووم سەیرم دەكرد، ئەگەر هێزو پشتێكم ببوایه فڕێم دەدا لەسەرپشتی پێغەمبەر (ﷺ) ، پێغەمبەریش (ﷺ) سوجدەی بردبوو سەری بەرز نەكردەوە، هەتا كەسێ چوو هەواڵی دابه (فاطمة) (ﷺ) ، (فاطمة) بەپەله هات كه ئەو كاته كچۆڵەیەك بوو، ڕیخۆڵەكانی لابردن، پاشان ڕوویكردە كۆمەڵەكە و كەوتە قسەی ناشرین پێوتنیان، كاتێ كه پێغەمبەر (ﷺ) نوێژەكەی تەواو كرد بە دەنگی بەرز دۆعای لێكردن، هەر كاتێ داخوازی ببوایه سێ جار داخوازی دەكرد ئینجا فەرمووی: "خوایه تۆ بچۆ به گژ قورەیشدا" سێ جار لەسەر یەك، هەر كه دەنگی پێغەمبەریان (ﷺ) بیست پێكەنینەكەیان نەما، وەترسان له دۆعاكەی، پاشان فەرمووی: "خوایه دەتكەم به گژ (أبو جهل) كوڕی (هشام)، وه (عتبة) كوڕی (ربیعة)، وه (شیبه)

کوڕی (ربیعة) وه (ولید) کوڕی (عقبة) ،وه (أمیة) کوڕی (خلف)، وه (عتبة) کوڕی (أبو معیط).." حەوتەمیشی وت کە من بیرم نەماوە، سوێند بەو کەسەی کە محمدی (ﷺ) بەڕاستی ناردووە، لە ڕۆژی بەدردا هەموو ئەوانەم بە کوژراوی بینی کە ناوی بردن، پاشان ڕاکێشران بۆ (قلیب) بیرەکەی بەدر. أبو أسحاق وتی: ولید کوڕی عقبة لەم فەرموودەیەدا بە هەڵە هاتووە، ڕاستیەکەی (ولید کوڕی عتبة)یە وەك لە شەرحی النوویدا هاتووە)

**( ٦ ) ئارامگرتنی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەسەر ئازاردانی گەلەکەی**

**٦١٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الْانبياء ضَرَبَهُ قَوْمُهُ، وهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وجْهِهِ ويَقُولُ: "رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٩٠)**

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵێ: هەر دەڵێی چاوم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)یە باسی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دەکرد کە قەومەکەی لێیان دابوو، ئەویش خوێنەکەی لە دەموچاوی دەسڕی و دەیفەرموو: "پەروەردگارم لە قەومەکەم خۆش ببە ئەوان کەسانێکن نازانن".

**( ٧ ) کوشتنی ئەبو جەهل**

**٦١٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) "مَنْ يَنْظُرُ لَنَا مَا صَنَعَ أَبُو جَهْلٍ". فَانْطَلَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَوَجَدَهُ قَدْ ضَرَبَهُ ابْنَا عفراء حَتَّى بَرِكَ، قَالَ: فَأَخَذَ بِلِحْيَتِهِ فَقَالَ: آنْتَ أَبُو جَهْلٍ؟ فَقَالَ: وهَلْ فَوْقَ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ، أَوْ قَالَ: قَتَلَهُ قَوْمُهُ؟ قَالَ: وقَالَ أَبُو مِجْلَزٍ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: فَلَوْ غَيْرُ أَكَّارٍ قَتَلَنِي. (البخاري/ المغازي/ ٣٧٤٥)**

(أنس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "کێ سەیرێکمان بۆ دەکات (بزانێ) ئەبو جەهل چی لێهات". (ابن مسعود) ڕۆیشت و ئەبوجەهلی بینییەوە کە دوو کوڕەکەی عفراء لێیان داوە و کەوتوە و لە دوا هەناسەکانیدایە، (أنس) وتی: ڕاستەوخۆ ڕیشم گرت و وتم: تۆ (أبو جهل)ی؟ وتی: ئایا شانازی بەسەر کەسێکەوە دەکەیت کە ئێوە کوشتوتانە؟ (أبو مجلز)

**( ٨ ) کوشتنی کەعب**

**٦٢٤-عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) "مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ؟ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ ورَسُولَهُ". فَقَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ (رضي الله عنه): يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ قَالَ:**

"نَعَمْ". قَالَ: ائْذَنْ لِي فَلْأَقُلْ، قَالَ: "قُلْ". فَأَتَاهُ فَقَالَ لَهُ، وذَكَرَ مَا بَيْنَهُمَا، وقَالَ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ قَدْ أَرَادَ صَدَقَةً، وقَدْ عَنَّانَا. فَلَمَّا سَمِعَهُ قَالَ: وأَيْضًا واللَّه لَتَمَلُّنَّهُ. قَالَ: إِنَّا قَد اتَّبَعْنَاهُ الْآنَ، ونَكْرَهُ أَنْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظُرَ إِلَى أَيِّ شيء يَصِيرُ أَمْرُهُ، قَالَ: وقَدْ أَرَدْتُ أَنْ تُسْلِفَنِي سَلَفًا، قَالَ: فَمَا تَرْهَنُنِي؟ (قَالَ: مَا تُرِيدُ، قَالَ): تَرْهَنُنِي نساءكُمْ، قَالَ: أَنْتَ أَجْمَلُ الْعَرَبِ. أَنَرْهَنُكَ نساءنَا؟ قَالَ: لَهُ تَرْهَنُونِي أَوْلَادكُمْ، قَالَ يُسَبُّ ابْنُ أَحدنَا، فَيُقَالُ: رُهِنَ فِي وسْقَيْنِ مِنْ تَمْرٍ، ولَكِنْ نَرْهَنُكَ اللَّأْمَةَ، يَعْنِي السِّلَاحَ، قَالَ: فَنَعَمْ، وواعَدَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ بِالْحَارِث وأَبِي عَبْسِ بْنِ جَبْرٍ وعَبَّاد بْن بِشْرٍ، قَالَ: فَجاءوا فَدعَوْهُ لَيْلًا، فَنَزَلَ إِلَيْهِمْ. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ غَيْرُ عَمْرٍو: قَالَتْ (لَهُ) امْرَأَتُهُ: إِنِّي لَأَسْمَعُ صَوْتًا كَأَنَّهُ صَوْتُ دَمٍ. قَالَ: إِنَّمَا هَذَا مُحَمَّدُ (بْنُ مَسْلَمَةَ) ورَضِيعُهُ وأَبُو نَائِلَةَ، إِنَّ الْكَرِيمَ لَوْ دُعِيَ إِلَى طَعْنَةٍ لَيْلًا لَأَجَابَ. قَالَ مُحَمَّدٌ: إِنِّي إِذَا جاء فَسَوْفَ أَمُدُّ يَدِي إِلَى رَأْسِه، فَإِذَا اسْتَمْكَنْتُ مِنْهُ فَدُونَكُمْ. قَالَ: فَلَمَّا نَزَلَ نَزَلَ وهُوَ مُتَوَشِّحٌ، فَقَالُوا: نَجِدُ مِنْكَ رِيحَ الطِّيبِ، قَالَ: نَعَمْ، تَحْتِي فُلَانَةُ، هِيَ أَعْطَرُ نساء الْعَرَبِ، قَالَ: فَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَشُمَّ مِنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ فَشُمَّ، فَتَنَاوَلَ فَشَمَّ، ثُمَّ قَالَ: أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أَعُودَ؟ قَالَ فَاسْتَمْكَنَ مِنْ رَأْسِه، ثُمَّ قَالَ: دُونَكُمْ، قَالَ فَقَتَلُوهُ. (البخاري/ المغازي/ ٣٨١١)

(جابر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "کێ بۆ (کعب) کوڕی (الاشرف) بێ؟" واتە (کێ کعب کوڕی الاشرفم بۆ دەکوژێ؟) چونکە ئەو ئازاری خوا و پێغەمبەرەکەیی داوە. (محمد) کوڕی (مسلمة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەیت بیکوژم؟ فەرمووی: "بەڵێ". وتی: مۆڵەتم بدە تا شتێکت لەسەر بڵێم، فەرمووی: "بڵێ" محمد هاتە لای (کعب) و باس و خواسی نێوان خۆیانی کرد، ئینجاوتی: بەڕاستی ئەم پیاوە خێری لێمان دەوێ، لە ڕاستیدا ماندووی کردوین و زەحمەتی داوین، هەر کە (کعب) ئەمەی لێبیست، وتی: بەخوا دواجار لێی بێزار دەبن، (محمد) وتی: ئێستا ئێمە شوێنی ئەو کەوتووین و، حەزناکەین وازی لێبهێنین تا بزانین چارەنووسی ئەم کارەی بەچی دەگات، وتی: ئێستا دەمەوێ قەرزێکم بدەیتێ، (کعب) وتی: چیم بە بارمتە دەدەیتێ؟ (وتی: هەر چیت دەوێ) وتی: ژنەکانتانم بدەنێ بە بارمتە، وتی: تۆ جوانترینی هەموو عەرەبی ئایا ژنەکانمان بخەینە بارمتەی تۆ؟ وتی: منداڵەکانتانم بە بارمتە بدەنێ، وتی: کوڕی یەکێکمان جوێنی پێدەدرێ و دەوترێ: دراوە بە بارمتەی دوو بار حوشتر لە خورما، بەڵکو

چەکەکەمان دەکەین بە بارمتەت (واتە:چەك) وتی: زۆر باشە، ئەمجا مەوعیدی دایە کە  بێتەوە لای و (حارث) و أبي عبس بن جبرٍ و عباد بن شبرٍ لەگەڵدا بێت، وتی: بەشەو هاتنەوە و بانگیان لێکرد، هاتە خوارەوە بۆلایان، سفیان وتی: جگە لە عمرو وتی: ژنەکەی (پێی) وت: من دەنگێ دەبیستم وەك دەنگی خوێن بێت، وتی: ئەوە (محمد) (کوڕی مسلمة)یە و أبو نائلەی برا شیریمە، بەخشندە ئەگەر بەشەو بانگی لێکرا بە شیر و ڕم لێی بدرێ هەر دەچێ بەدەم بانگەکەوە. موحەممەد وتی: هەر کە هات من دەستم درێژ دەکەم بۆ سەری، هەر کە توند گرتم ئێوە و ئەو، کاتێ (لە قەلاکە) دابەزی، و پۆشاکی جەنگی بە تەواوی پۆشیبوو وە چەکەکەی ڕاست و چەپ کرد بوو بە ملیدا، وتیان: بۆنی عەترت لێبەدی دەکەین، وتی: بەڵێ، ژنەکەم فلانە کەسە، کە بۆن خۆشترین ژنانی عەرەبە، (محمد) وتی: مۆڵەتم بدەیت بۆنێکی ئەو عەترە بکەم؟ وتی: بەڵێ بۆنی بکە، سەری گرت و بۆنی کرد، دووبارە وتی: ئایا مۆڵەتم دەدەیت جارێکی تر بۆنت بکەم؟ جابر دەڵێ: ئەمجارە توند سەری گرت، پاشان وتی: دەی ئێوە و ئەو، وتی: ئەمجا کوشتیان.

## ( ٩ ) جەنگی الرِّقاع

**٦١٨ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ، بَيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ، قَالَ: فَنَقِبَتْ أَقْدَامُنَا، فَنَقِبَتْ قَدَمَايَ وَسَقَطَتْ أَظْفَارِي، فَكُنَّا نَلُفُّ عَلَى أَرْجُلِنَا الْخِرَقَ، فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ، لِمَا كُنَّا نُعَصِّبُ عَلَى أَرْجُلِنَا مِنَ الْخِرَقِ. قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَحَدَّثَ أَبُو مُوسَى بِهَذَا الْحَدِيثِ ثُمَّ كَرِهَ ذَلِكَ، قَالَ: كَأَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يَكُونَ شَيْئًا مِنْ عَمَلِهِ أَفْشَاهُ... وفي رواية: وَاللَّهُ يُجْزِي بِهِ. (البخاري/ المغازي/ ٣٨٩٩)**

(أبو موسی) (ﷺ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕۆیشتین بۆ جەنگێك، ئێمە شەش کەس بووین، حوشترێکمان پێبوو بە نۆرە سواری دەبووین، هەر دوو پێم شەق شەق بوو بوون و نینۆکەکانم کەوتبوون، پەڕۆمان دەپێچا بە قاچمانەوە و دەمانبەست، ئەو جەنگە ناونرا بە جەنگی (ذات الرِّقاع)، چونکە ئێمە بە پەڕۆ قاچەکانمان دەبەست، (أبو بردة) وتی: (أبو موسی) ئەم قسەیەی  دەگێڕایەوە پاشان بە باشی نەدەزانی باسی بکات، وتی: هەروەك بە باشی نەزانیبێ شتی نهێنی لەو کردەوەیەیدا بووبێ و بیخاتە ڕوو... وە لە ڕیوایەتێکدا: خوا پاداشتی بداتەوە لەسەری.

٦١٩ـ عَنْ الْبراء (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الْأَحْزَابِ يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ، ولَقَدْ وارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِه، وهُوَ يَقُول:

"وَاللَّهِ لَوْلَا أَنْتَ مَا اهْتَدَيْنَا  وَلَا تَصَدَّقْنَا ولَا صَلَّيْنَا
فَأَنْزِلَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا  إِنَّ الْأُلَى قَدْ أَبَوْا عَلَيْنَا"

قَالَ: ورُبَّمَا قَالَ:

"إِنَّ الْمَلَا قَدْ أَبَوْا عَلَيْنَا  إِذَا أَرَادُوا فِتْنَةً أَبَيْنَا"

وَيَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ. (البخاري/ الجهاد/ ٢٨٧٠)

(البراء) (ﷺ) دەڵێ: لە ڕۆژی الأحزاب دا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵماندا خۆڵی دەگواستەوە، بەجۆرێ کە خۆڵ سپیایی سکی داپۆشیبوو، ئەو دەیفەرموو:

بە خوا بەتۆ نەبێ هیدایەتمان وەرنەدەگرت  نەخێرمان دەکرد و نەنوێژمان دەکرد
ئارامی داباریێنە سەرمان  چونکە ئەوان یاخی بوون لێمان

البراء دەڵێ: لەوانەیە فەرمووبێتی:

ئەوانە یاخی بوون لێمان  ڕازیمان نیە فیتنە گێڕیان

بە وتنی هۆنراوەکە دەنگی بەرز دەکردەوە.

٦٢٠ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ (ﷺ) كَانُوا يَقُولُونَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا  عَلَى الْإِسْلَامِ مَا بَقِينَا أَبَدًا

أَوْ قَالَ: عَلَى الْجِهَادِ أبداً –شَكَّ حَمَّادٌ– والنَّبِيُّ (ﷺ) يَقُولُ:

"اللَّهُمَّ إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَهْ  فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ والمُهَاجِرَهْ".

(البخاري/ الجهاد/ ٢٦٨٠)

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: هاوەڵانی (محمد) (ﷺ) ڕۆژی (الخندق) دەیانووت:

ئێمە ئەوانەین پەیمانمان دا بە محمد  لەسەر ئیسلام بمێنین هەتا ئەبەد

یا وتی:

لەسەر (جهاد) بمێنین هەتا ئەبەد[1] – پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو:

---

[1] حماد کوڕی سلمە یەکێك لە ڕیوایەت کەرانی فەرموودەکەیە. گومانی هەیە دەڵێ لەوانەیە (أنس) وتبێتی.

خوایە خێر و خۆشی تەنها هی ئەو جیهانە   دەخۆش ببە لەو پشتیوان و کۆچبەرانە

(١٠) **باسی بنو قريظة**

**٦٢١-عَنْ عَبْدِ اللَّه بن عمر (رضي الله عنه) قَالَ: نَادَى فِينَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمَ انْصَرَفَ عَنِ الْأَحْزَابِ أَنْ: "لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الظُّهْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ". فَتَخَوَّفَ نَاسٌ فَوْتَ الْوَقْتِ فَصَلَّوْا دُونَ بَنِي قُرَيْظَةَ، وقَالَ آخَرُونَ: لَا نُصَلِّي إِلَّا حَيْثُ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وإِنْ فَاتَنَا الْوَقْتُ. قَالَ: فَمَا عَنَّفَ واحِدًا مِنَ الْفَرِيقَيْنِ. (البخاري/ صلاة الخوف/ ٩٠٤)**

(عبدالله) کوڕی (عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی الأحزاب گەڕایەوە بانگی کردین و فەرمانی پێداین کە: "با هیچ کەس نوێژی نیوەڕۆ نەکات لە بني قريظة نەبێ". هەندێ کەس ترسان لەوە کە کاتەکە بگوزەرێ پێش ئەوەی بگەنە (بني قريظة) نوێژیان کرد، کەسانێکی تر وتیان: ئێمە نوێژ ناکەین تا نەگەینە ئەو شوێنە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوین با کاتەکەشمان لە دەست بچێ (عبدالله) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ یەکێ لەو دوو گروپەی سەرزەنشت نەکرد.

( ١١ ) **ئاشتەوایی حودەیبیە**

**٦٢٢ـ عَنِ الْبراء بن عازب(رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا أُحْصِرَ النَّبِيُّ (ﷺ) عِنْدَ الْبَيْتِ صَالَحَهُ أَهْلُ مَكَّةَ عَلَى أَنْ يَدْخُلَهَا فَيُقِيمَ بِهَا ثَلَاثًا، ولَا يَدْخُلَهَا إِلَّا بِجُلُبَّانِ السِّلَاحِ: السَّيْفِ وقِرَابِهِ، ولَا يَخْرُجَ بِأَحَدٍ مَعَهُ مِنْ أَهْلِهَا، ولَا يَمْنَعَ أَحَدًا يَمْكُثُ بِهَا مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ، قَالَ لِعَلِيٍّ (رضي الله عنه): "اكْتُبِ الشَّرْطَ بَيْنَنَا: بِسْمِ اللَّه الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)". فَقَالَ لَهُ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّه تَابَعْنَاكَ، ولَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّه، فَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يَمْحَاهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَا واللَّه لَا أَمْحَاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَرِنِي مَكَانَهَا". فَأَرَاهُ مَكَانَهَا، فَمَحَاهَا وكَتَبَ: "ابْنُ عَبْدِ اللَّه". فَأَقَامَ بِهَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا أَنْ كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ، قَالُوا لِعَلِيٍّ (رضي الله عنه): هَذَا آخِرُ يَوْمٍ مِنْ شَرْطِ صَاحِبِكَ، فَأْمُرْهُ فَلْيَخْرُجْ. فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ: "نَعَمْ". فَخَرَجَ. (البخاري/ الصلح/ ٢٥٥١)**

(البراء) کوڕی (عازب) (رضي الله عنه) دەڵێ: کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی لێگیرا لەوە کە بچێت بۆ کەعبە، دانیشتوانی مەککە ڕێکەوتننامەی ئاشتیان لەگەڵدا مۆر کرد، کە (ساڵی داهاتوو)بێتە مەککەو سێ ڕۆژ تیایدا بمێنێتەوە، بەو مەرجەش بێ کە نابێ

بچێته ناوی تا شمشێرەکان لەناو کێلاندا نەبن، نابێ کەسێ لە خەڵکی مەککە لەگەڵ خۆی ببات، نابێ کەس قەدەغە بکات لەمانەوە تیایدا لەو خەڵکەی لەگەڵیدان، فەرمووی بە علي (رضي الله عنه) "مەرجەکە لە نێوانماندا بنووسە: بسم الله الرحمن الرحیم: موحەممەد پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە ڕێکەوت" بێباوەڕەکان وتیان پێی: ئەگەر بمانزانیایە کە تۆ پێغەمبەری خوایت شوێنت دەکە وتین، بەڵام بنووسن موحەممەد کوڕی عبدالله، فەرمانیدا بە عەلی کە (رسول الله) بکوژێنێتەوە، عەلی وتی: نە بە خوا نایکوژێنمەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی "شوێنەکەیم نیشان بدە". شوێنەکەی نیشاندا، بە دەستی خۆی کوژاندیەوەو نووسی: "کوڕی عبدالله"، ساڵی داهاتوو هاتنەوە، سێ ڕۆژ لەمەککەدا مایەوە، هەر کە ڕۆژی سێیەم هات، وتیان بە علي (رضي الله عنه) ئەمڕۆ دوایەمین ڕۆژی مەرجی هاوەڵەکەتە، پێی بڵێ با دەربچێت، (علي) ئاگاداری کرد، ئینجا فەرمووی: "بەڵێ"و دەرچوو

## ( ١٢ ) جەنگاوەرانی خەیبەر

**٦٢٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى خَيْبَرَ، فَفَتَحَ اللَّهُ عَلَيْنَا، فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا ولَا ورِقًا، غَنِمْنَا الْمَتَاعَ والطَّعَامَ والثِّيَابَ، ثُمَّ انْطَلَقْنَا إِلَى الْوَادِي، ومَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَبْدٌ لَهُ وهَبَهُ لَهُ رَجُلٌ مِنْ جُذَامَ، يُدْعَى رِفَاعَةَ بْنَ زَيْدٍ مِنْ بَنِي الضُّبَيْبِ، فَلَمَّا نَزَلْنَا الْوَادِي قَامَ عَبْدُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَحُلُّ رَحْلَهُ فَرُمِيَ بِسَهْمٍ، فَكَانَ فِيهِ حَتْفُهُ، فَقُلْنَا: هَنِيئًا لَهُ الشَّهَادَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كَلَّا والَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عَلَيْهِ نَارًا، أَخَذَهَا مِنَ الْغَنَائِمِ يَوْمَ خَيْبَرَ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ". قَالَ: فَفَزِعَ النَّاسُ، فَجَاء رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَبْتُ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ. أَوْ: شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ".**
**(البخاري/ المغازي/ ٣٩٩٣)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ڕۆیشتین بۆ خیبر، خوای گەورە سەرکەوتووی کردین، دەستکەوتی جەنگیمان ئاڵتون و زیو نەبوو، بەڵکو دەستکەوتمان شمەك و خواردەمەنی و پۆشاك بوو، پاشان دەرچووین بەرەو دۆڵەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەندەیەکی لە گەڵدا بوو کە پیاوێکی (جذام)ی پێی بەخشیبوو، (بەندەکە) ناوی (رفاعة) کوڕی (زید) لە (بني الضُّبیب)، کاتێ دابەزینە دۆڵەکە بەندەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەریکی داگرتنی بارەکەیبوو، تیرێکی

تێگیرا و، بوە هۆی مردنی، ئێمەش وتمان: شەهیدبوونی پیرۆز بێت ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "نەخێر و سوێند بێ بەو کەسەی گیانی (محمد) بەدەستیەتی، ئەو پۆشاکەی کەلەبەریدایە دەبێتە ئاگر و گڕ دەگرێ بەسەریدا، ڕۆژی خیبر لە نێو دەستکەوتەکانی جەنگدا هەڵیگرتوە و بەریەشکردن نەکەوتوە"، خەڵکی شڵەژان و پیاوێك بەقایشێك یان دووقایشەوە هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمەم لە ڕۆژی خیبردا هەڵگرتووە. پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: "قایشێك لە ئاگر، یان دوو قایش لە ئاگر".

## (١٣) کۆچبەران بەخشراوەکان دەگێڕنەوە بۆ یارمەتیدەران

٦٢٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ مِنْ مَكَّةَ الْمَدِينَةَ، قَدِمُوا ولَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شيء، وكَانَ الْأَنْصَارُ أَهْلَ الْأَرْضِ والْعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الْأَنْصَارُ عَلَى أَنْ أَعْطَوْهُمْ أَنْصَافَ ثِمَارِ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ، ويَكْفُونَهُمُ الْعَمَلَ والْمَئُونَةَ، وكَانَتْ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وهِيَ تُدْعَى أُمَّ سُلَيْمٍ، وكَانَتْ أُمُّ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ كَانَ أَخًا لِأَنَسٍ لِأُمِّهِ، وكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عِذَاقًا لَهَا، فَأَعْطَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلَاتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتَالِ أَهْلِ خَيْبَرَ، وانْصَرَفَ إِلَى الْمَدِينَةِ، رَدَّ الْمُهَاجِرُونَ إِلَى الْأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ، قَالَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أُمِّي عِذَاقَهَا، وأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وكَانَ مِنْ شَأْنِ أُمِّ أَيْمَنَ أُمِّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه): أَنَّهَا كَانَتْ وَصِيفَةً لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وكَانَتْ مِنَ الْحَبَشَةِ، فَلَماءلَدَتْ آمِنَةُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ أَبُوهُ فَكَانَتْ أُمُّ أَيْمَنَ تَحْضُنُهُ، حَتَّى كَبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَأَعْتَقَهَا، ثُمَّ أَنْكَحَهَا زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، ثُمَّ تُوُفِّيَتْ بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِخَمْسَةِ أَشْهُرٍ. **(البخاري/ الهبة/ ٢٤٨٧)**

(أنس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: کاتێ کە کۆچکەران لە مەککەوە هاتنە مەدینە ، بە دەستی خاڵی هاتن، یارمەتیدەرەکانیش خاوەنی زەوی و زار و خانووبەرە بوون، یارمەتیدەران کۆچبەرانیان کردە برابەشی خۆیان، لەسەر ئەوەی کە هەموو ساڵێ نیوەی بەروبوومی سامانی خۆیانیان بدەنێ، هەر ئەوەیان لێدەویست ئیشی تێدا بکەن و ئاوی بدەن، دایکی (أنس) کوڕی (مالك)یش کە ناوی (أم سليم) بوو، دایکی (عبدالله) کوڕی (طلحة) بوو، کە (عبدالله) برای دایکی (أنس) بوو، دایکی

(أنس) دارخورمایەکی خۆی دابوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دارخورماکەی دابە دایکی (أیمن) کە دایکی (أسامە) کوڕی (زید)ە کە زوو لە ماڵی خۆیاندا بوو، (أبن شهاب) وتی: (أنس) کوڕی (مالك) هەواڵی پێدام: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێبوویەوە لە جەنگی (خیبر) و، گەڕایەوە بۆ مەدینە، کۆچبەران ئەو دارخورمایانەیان گێڕایەوە بۆ یارمەتیدەران کە پێشتر بەروبومەکەیان پێبەخشیبوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دارخورمایەکەی گێڕایەوە بۆ دایکم، لە جێگەکەیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەباغەکەی خۆی بەشی دایکی (أم أیمن)یدا، (أبن شهاب) وتی: لە باسی دایکی (أیمن) وە کە دایکی أسامة کوڕی زیدە (رضي الله عنه)، ئەوە هەیە کە لە کاتی خۆیدا کەنیزەکی (عبدالله) کوڕی (عبدالمطلب) بووە، (لەنەژاد) دا خەڵکی حەبەشە بوو، کاتی (آمنة) پێغەمبەری خوای (ﷺ) لێبوو لە دوای مردنی باوکی، (أم أیمن) دایەنی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد، هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەورە بوو ئینجا ئازادی کردو مارەی کرد لە زەیدی کوڕی حارثة، ئەویش پێنج مانگ دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد.

## ( ١٤ ) فڕێدانی بتەکانی دەوری کەعبە

**٦٢٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بن مسعود (رضي الله عنه) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (ﷺ) مَكَّةَ، وحَوْلَ الْكَعْبَة ثَلَاثُ مائَةٍ وستُّونَ نُصُبًا، فَجعَلَ يطْعُنُها بعُودٍ كَانَ بيَده، ويَقُولُ: (جاء الْحَقُّ وزَهَقَ الْبَاطلُ إِنَّ الْبَاطلَ كَانَ زَهُوقًا) (الاسراء:٨١) (جاء الْحَقُّ ومَا يُبْدئُ الْبَاطلُ ومَا يُعيدُ) (سبأ: ٤٩) زَادَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: يَوْمَ الْفَتْحِ. (البخاري/ المظالم/ ٢٣٤٦)**

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) چووە ناو مەککە، بە دەوری کەعبەدا سێسەد و شەست بت هەبوون، بەدارێك کەبە دەستیەوە بوو کەوتە لێدانیان و ئەم ئایەتەی سەرەوەی دەفەرموو کە ئەمە ماناکەیەتی: (حەق هات و ناحەقی تیاچوو، لە ڕاستیدا نا حەق تیا چووە). (هەق هات و ناهەقی جارێکی تر سەر هەڵناداتەوە و دوبارە نابێتەوە) (سبأ: ٤٩) کوڕەکەی (أبو عمر) دەڵێ: لە ڕۆژی فەتحدا ئەمەی فەرمووە.

## ( ١٥ ) پەیمانی دوای فەتح

**٦٢٦-عَنْ مُجَاشِعُ بْنُ مَسْعُودٍ السُّلَمِيُّ (رضي الله عنه) قَالَ: جِئْتُ بِأَخِي أَبِي مَعْبَدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ الْفَتْحِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَايِعْهُ عَلَى الْهِجْرَةِ. قَالَ: "قَدْ مَضَتِ الْهِجْرَةُ**

بِأَهْلِهَا". قُلْتُ: فَبِأَيِّ شيء تُبَايِعُهُ؟ قَالَ: "عَلَى الْإِسْلَامِ والْجِهَادِ والْخَيْرِ". قَالَ أَبُو عُثْمَانَ، يعني النهدي: فَلَقِيتُ أَبَا مَعْبَدٍ، فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ مُجَاشِعٍ، فَقَالَ: صَدَقَ. (البخاري/ المغازي/ ٤٠٤٥)

(مجاشع) كوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: له دوای فەتح (أبو معبد)ی برامم هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، پەیمانی لێوەربگرە لەسەر کۆچکردن فەرمووی: "سەردەمی کۆچ تێپەڕی و کاتی نەما، وە خەڵکەکەشی تێپەڕین" وتم: ئەی لەسەر چی پەیمانی لێوەردەگریت؟ فەرمووی: "لەسەر ئیسلامەتی و تێکۆشان و چاکەکردن" أبو عثمانی النهدي وتی: گەیشتم بە (أبو معبدٍ)، وتەکەی (مجاشع)م بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: ڕاست دەکات.

## ( ١٦ ) فەرماندان بە چاکەکردن بۆ کەسێ کۆچی لەلاگران بێت

٦٢٧ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْهِجْرَةِ؟ فَقَالَ: "وَيْحَكَ، إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ لَشَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "فَهَلْ تُؤْتِي صَدَقَتَهَا". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "فَاعْمَلْ مِنْ وراء الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا". (البخاري/ الزكاة / ١٣٨٤)

(أبو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ: عەرەبێکی دەشتەکی لەبارەی کۆچکردنەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد،؟ فەرمووی: "کۆستت کەوێ، ئەرکی کۆچکردن سەختە، ئایا حوشترت هەیە؟" وتی: بەڵێ، فەرمووی: "ئایا زەکاتەکەی دەدەیت؟" وتی: بەڵێ فەرمووی: "کاری چاکە بکە لەودیو دەریاکانیشەوە بێ —واتە لەهەر کوێ بویت— خوای گەورە هیچ لە خێری کردارەکانت کەم ناکاتەوە".

## ( ١٧ ) ژیان لە دەشتا

٦٢٨–عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (ﷺ): أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ الْأَكْوَعِ ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ، تَعَرَّبْتَ؟ قَالَ: لَا، ولَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَذِنَ لِي فِي الْبَدْوِ. (البخاري/ الفتن/ ٦٦٧٦)

(سلمة) کوڕی (الأکوع) (ﷺ) دەڵێ: چوەتە لای (حجاج)و (حجاج) وتویەتی: ئەی کوڕی (أکوع) گەڕاویتەوە دۆخی جارانت، بویتەوە بە دەشتەکی؟ وتی: نەخێر، بەڵکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی پێداوم کە لە بیاباندا بژیم.

**( ١٨ ) جەنگی حونەین**

**٦٢٩ـ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى الْبراء فَقَالَ: أَكُنْتُمْ ولَّيْتُمْ يَوْمَ حُنَيْنٍ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟ فَقَالَ: أَشْهَدُ عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ) ماءلَّی، ولَكِنَّهُ انْطَلَقَ أَخفًا و مِنَ النَّاس وحُسَّرٌ، إِلَى هَذَا الْحَيِّ مِنْ هَوَازِنَ، وهُمْ قَوْمٌ رُمَاةٌ، فَرَمَوْهُمْ بِرِشْقٍ مِنْ نَبْلٍ كَأَنَّهَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، فَانْكَشَفُوا، فَأَقْبَلَ الْقَوْمُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ (رضي الله عنه) يَقُودُ بِهِ بَغْلَتَهُ، فَنَزَلَ ودعاءاسْتَنْصَرَ وهُوَ يَقُولُ: "أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ. اللَّهُمَّ أَنَزِّلْ نَصْرَكَ". قَالَ الْبراء: كُنَّا واللَّهِ إِذَا احْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِهِ، وإِنَّ الشُّجَاعَ مِنَّا لَلَّذِي يُحَاذِي بِهِ، يَعْنِي النَّبِيَّ (ﷺ).(البخاري/ المغازي/ ٤٠٦١)**

(أبو أسحاق) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای (براء) وتی: ئەی (أبو عُمارة) ئایا ئێوە بوون لە رۆژی (حنین)دا پشتتان هەڵكرد؟ ئەویش وتی: شاهیدی دەدەم لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە ئەو پشتی هەڵنەكرد، بەڵكو كەسانێ لە خەڵكی كە كۆڵ سوك بوون و زرێپۆشیان نەبوو رۆیشتن بۆ ئەو تیرەیەی (هوازن)، ئەوانیش خەڵكانێكی تیرئەندازبوون، كە بە (لێشاو) بە باقە تیریان تێدەگرتن، هەر وەك قاچە كولله، تا دوژمن زاڵ بوو بەسەریاندا، خەڵكەكە ڕوویان كردە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە (أبو سفیان) كوڕی (حارث) (رضي الله عنه) ئێسترەكەی ڕادەكێشا، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دابەزی و پاڕایەوەو داوای سەركەوتنی دەكردو دەیفەرموو: "من پێغەمبەرم، درۆنیە، من رۆڵەی عبدالمطلبم، خوایە سەركەوتنی خۆت دابەزێنە" (براء) وتی: سوێند بە خوا هەر كاتێ كە شەڕ وترس سەخت دەبوو ئێمە خۆمان دەدایە پەنای ئەوو ئازاشمان ئەو كەسە بوو شان بەشانی پێغەمبەر (ﷺ) بێت.

**(١٩)جەنگی طائف**

**٦٣٠-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنه) قَالَ: حَاصَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَهْلَ الطَّائِفِ، فَلَمْ يَنَلْ مِنْهُمْ شَيْئًا، فَقَالَ: "إِنَّا قَافِلُونَ إِنْ شَا و اللَّهُ (تعالى)". قَالَ أَصْحَابُهُ: نَرْجِعُ ولَمْ نَفْتَتِحْهُ؟ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ". فَغَدَوْا عَلَيْهِ، فَأَصَابَهُمْ جِرَاحٌ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا". قَالَ: فَأَعْجَبَهُمْ ذَلِكَ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ).(البخاري/ المغازي/ ٤٠٧٠)**

(عبدالله) كوڕی (عمرو) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆی خەڵكی (طائف)یدا، هیچی پێنەكردن، فەرمووی: "ئێمە دەگەڕێینەوە بەویستی خوای (بالا

دەست)". هاوەڵانی عەرزیان کرد: دەگەڕێینەوەو ڕزگاریشمان نەکرد؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێیان: "سبەینێ بچن بۆ جەنگ". بۆ سبەینێ چوونەوە توشی برینداریەکی زۆر هاتن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پێیان: "ئێمە سبەینێ دەگەڕێینەوە" ئەمجارە ئەمەیان پێخۆش بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی.

## ( ٢٠ ) ژمارەی جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ )

**٦٣١ـ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ يَزِيدَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي بِالنَّاسِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ اسْتَسْقَى، قَالَ: فَلَقِيتُ يَوْمَئِذٍ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ، وقَالَ: لَيْسَ بَيْنِي وبَيْنَهُ غَيْرُ رَجُلٍ، أَوْ بَيْنِي وبَيْنَهُ رَجُلٌ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: كَمْ غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ (غزوة). فَقُلْتُ: كَمْ غَزَوْتَ أَنْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: فَمَا أَوَّلُ غَزْوَةٍ غَزَاهَا؟ قَالَ: ذَاتُ الْعُسَيْرِ أَوِ الْعُشَيْرِ. (بخاري/ الاستسقا و/ ٩٧٦. المغازي/ ٣٧٣٣)**

(أبو أسحاق) دەڵێ: (عبدالله) کوڕی (یزید) ڕۆیشت نوێژەبارانە بکات بۆ خەڵکی، دوو ڕکات نوێژی کرد و لەپاشان دۆعای باران بارینی کرد، دەڵێ: ئەو ڕۆژە گەیشتم بە (زید)ی کوڕی (أرقم)، جگە لە پیاوێ کەسی تر نەبوو لە نێوانماندا، یان نێوان من و ئەو پیاوێك بوو، پێم وت: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند جەنگی کردووە؟ وتی: نۆزدە جەنگ، منیش وتم: ئەی تۆ چەند جەنگت کردوە لە خزمەتیدا؟ وتی: حەڤدە جەنگ، ئەمجاوتم: یەکەم جەنگ کە کردی کام جەنگ بوو؟ وتی: ذات العُسیر یان (العُشَیر).

**٦٣٢–مكرّر ـ عَنْ بُرَيْدَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تِسْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً، قَاتَلَ فِي ثَمَانٍ مِنْهُنَّ. (البخاري/ المغازي/ ٤٢٠٣)**

(بریدة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ نۆزدە جەنگ چووە، لە هەشتیاندا کەوتوەتە جەنگەوە.

# بەشی سی و چوارەم: فەرمانڕەوایی (كتاب الإمارة)

## (١) دانانی جێنشین و دانەنانی

٦٣٣ــ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ (ﷺ) فَقَالَتْ: أَعَلِمْتَ أَنَّ أَبَاكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: مَا كَانَ لِيَفْعَلَ، قَالَتْ: إِنَّهُ فَاعِلٌ، قَالَ: فَحَلَفْتُ أَنِّي أُكَلِّمُهُ فِي ذَلِكَ، فَسَكَتُّ حَتَّى غَدَوْتُ وَلَمْ أُكَلِّمْهُ، قَالَ: فَكُنْتُ كَأَنَّمَا أَحْمِلُ بِيَمِينِي جَبَلًا، حَتَّى رَجَعْتُ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْ حَالِ النَّاسِ وَأَنَا أُخْبِرُهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ لَهُ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ مَقَالَةً، فَآلَيْتُ أَنْ أَقُولَهَا لَكَ، زَعَمُوا أَنَّكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ، وَإِنَّهُ لَوْ كَانَ لَكَ رَاعِي إِبِلٍ أَوْ رَاعِي غَنَمٍ، ثُمَّ جَاءَكَ وَتَرَكَهَا رَأَيْتَ أَنْ قَدْ ضَيَّعَ، فَرِعَايَةُ النَّاسِ أَشَدُّ. قَالَ: فَوَافَقَهُ قَوْلِي، فَوَضَعَ رَأْسَهُ سَاعَةً ثُمَّ رَفَعَهُ إِلَيَّ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَحْفَظُ دِينَهُ، وَإِنِّي لَئِنْ لَا أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَمْ يَسْتَخْلِفْ، وَإِنْ أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ) قَدِ اسْتَخْلَفَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلَّا أَنْ ذَكَرَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَأَبَا بَكْرٍ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَعْدِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَحَدًا، وَأَنَّهُ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ. **(بخاري/ الأحكام/ ٦٧٩٢)**

(أبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: سەردانی (حفصة)م (ﷺ) كرد، وتی: ئایا زانیوتە كە باوكت كەسی دانەناوە بە جێنشینی خۆی؟ وتم: لەو كەسانە نەبوو شتی وا بكات، وتی: كردوویەتی، سوێندم خوارد دەبێ لەوبارەیەوە بیدوێنم، بێدەنگ بووم و تا بەیانی هیچم لەگەڵدا نەوت، لە حاڵێكدا بووم هەر وەك شاخێكم بە شانی ڕاستم هەڵگرتبێ، تا گەڕامەوە و چوومە لای، هەواڵی خەڵكی لێپرسیم و منیش ئاگادارم دەكرد، پاشان پێم وت: لە خەڵكیم بیست كە قسەیەكیان دەكرد، سوێندمخوارد كە هەر دەبێ پێت بڵێم، دەڵێن گوایە تۆ كەست دانەناوە بەجێنشینی خۆت، ئەم كارەت وەك ئەوە وایە شوانێكی حوشتر یان شوانێكی مەڕت هەبێ و، پاشان بەجێیان بهێڵێت و بێتەوە بۆ لات، دەبینی كە ماڵیاتەكەی زایە كردوە، خۆ چاودێری كردنی خەڵكی لەوە قورستر و سەختترە، ابن عمر دەڵێ: باوكم ڕازی بوو بە قسەكەم، ماوەیەك سەری دانەواندو پاشان بەرزی كردەوە و ڕووی تێكردم و وتی: خوای (ﷻ) ئاینی خۆی دەپارێزێ، جا ئەگەر منیش جێنشین دانەنێم خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)یش جێنشینی دانەناوە، ئەگەر جێنشینیش دابنێم ئەوا (أبو بكر) (ﷺ)

جێنشینی دانا، أبن عمر دەڵێ: سوێند بەخوا هەر ئەوەندە بوو تا ناوی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و أبو بکری هێنا، ئینجا بۆم دەرکەوت کە ئەو هیچ کەس ناکات بە هاوشانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەویش جێنشینی دانەناوە".

## ( ٢ ) وەفاکردن بە بەیعەتی جێنشینەکان یەك لەدوای یەك

٦٣٤ـ عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: قَاعَدْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) خَمْسَ سِنِينَ، فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الْأنبياء، كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وإِنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي، وسَتَكُونُ خُلَفَا و تَكْثُرُ". قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: "فُوا بِبَيْعَةِ الْأَوَّلِ فَالْأَوَّلِ، وأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ). **(البخاري/ الانبياء/ ٣٢٦٧)**

(أبو حازم) دەڵێ: پێنج ساڵ لەگەڵ (أبو هريرة)دا (رضي الله عنه) هاونشین بووم، لێم بیست لە پێغەمبەری (ﷺ) دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی: "پێغەمبەران کاروباری (بنو ئیسرائیل)یان دەبرد بەڕێوە، هەرکاتێ پێغەمبەرێکیان تیاچووبێ، پێغەمبەرێکی تر بوەتە جێگەداری، بەڕاستی لەدوای منەوە پێغەمبەری تر نیە، بەڵکو لەدوای من جێنشین دێن و زۆریش دەبن" وتیان: فەرمانمان بە چی پێدەکەیت؟ فەرمووی: "وەفادار بن بەو بەیعەتەی دەیدەن پێیان یەك لەدوای یەك، مافی خۆیانیان بدەنێ، خوای گەورەیش پرسیاریان لێدەکات لەوەی کە ئەوان کراونەتە سەرپەرشتیاری".

## ( ٣ ) هەمووتان چاودێرن و هەمووشتان بەرپرسن

٦٣٥ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "أَلَا كُلُّكُمْ رَاعٍ وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، والرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، والْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا ووَلَدِهِ، وهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، والْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ". **(بخاري/ العتق/ ٢٤١٦)**

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئاگاداربن کە هەمووتان چاودێر و شوانن، هەموشتان بەرپرسیارن لەژێر دەستەکانتان، کاربەدەستی خەڵکی شوانەو بەرپرسیارە لە ژێر دەستەکانی، پیاویش شوانی ماڵ و خێزانەکەیەتی و بەرپرسە لێیان، ئافرەتیش شوانی ماڵی مێردەکەی و منداڵەکانیەتی و بەرپرسیشە لێیان، کۆیلەش شوانە بەسەر ماڵی گەورەکەیەو بەرپرسە لێی، دە ئاگاداربن هەمووتان شوانن، هەموویشتان بەرپرسن لە ژێر دەستەکانتان"

## (٤) نابەجێی سوربوون لەسەر داوای فەرمانڕەوایی

٦٣٦ـ عَنْ أَبِي ذَر (رضي الله عنه) : أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "يَا أبا ذَر انِي أرَاكَ ضَعِيفاً، وانِي أُحِبُ لَكَ مَا أُحِبُ لِنَفْسِي ، لاَ تَأمَرَنَّ عَلَى اثْنَينِ، ولاَ تَولَيَنَّ مَالَ يَتِيمٍ" ((البخاري/ أوائل الأيمان والنذور/٦٢٤٨)).

(عبدالرحمن) کوڕی (سمرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی پێم: "ئەی عبدالرحمن، داوای فەرمانڕەوایەتی مەکە، چونکە ئەگەر لەسەرداواکردنی خۆت پێت درا، ئەوا خوا دەت داتە دەست خۆت، بەڵام ئەگەر بەبێ داواکردنی خۆت پێتدرا، ئەوا یارمەتی دەدرێیت لەسەری".

## (٥) کار ناسپێرین بە کەسێك خۆی داوای بکات

**٦٣٧**ـ عَنْ أَبي بُرْدَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى (رضي الله عنه): أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) ومَعِي رَجُلَانِ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ، أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِي والْآخَرُ عَنْ يَسَارِي، فَكِلَاهُمَا سَأَلَ الْعَمَلَ، والنَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَاكُ، فَقَالَ: "مَا تَقُولُ يَا أَبَا مُوسَى؟ أَوْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ". قَالَ: فَقُلْتُ: والَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَطْلَعَانِي عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمَا، ومَا شَعَرْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ، قَالَ: وكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى سِوَاكِهِ تَحْتَ شَفَتِهِ وقَدْ قَلَصَتْ، فَقَالَ: "لَنْ -أَوْ لَا- نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ، ولَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ يَا أَبَا مُوسَى، أَوْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ". فَبَعَثَهُ عَلَى الْيَمَنِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ قَالَ: انْزِلْ، وأَلْقَى لَهُ وِسَادَةً، وإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ، قَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ، ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السَّوْ و فَتَهَوَّدَ، قَالَ: لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَا و اللَّهِ ورَسُولِه، فَقَالَ: اجْلِسْ، نَعَمْ، قَالَ: لَا أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَا و اللَّهِ ورَسُولِه. ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ، ثُمَّ تَذَاكَرَا الْقِيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا -مُعَاذٌ- أَمَّا أَنَا فَأَنَامُ وأَقُومُ، وأَرْجُو فِي نَوْمَتِي مَا أَرْجُو فِي قَوْمَتِي. **(بخاري/ استتابة المرتدين والمعاندين/ ٦٥٢٥)**

(أبو بُردة) دەڵێ: (ابو موسى) (رضي الله عنه) وتی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دوو پیاو لە ئەشعەریەکانم لەگەڵدا بوو، یەکێکیان لەلای ڕاستمەوە و ئەوی تریان لەلای چەپمەوە، هەردووکیان داوای کار بەدەستیان کرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سیواکی دەکرد، ئینجا فەرمووی: "ئەی (أبو موسى)ـ تۆچی دەڵێیت؟ یان: ئەی (عبدالله) کوڕی (قیس)؟ منیش وتم: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ڕەوانەکردووە، ئاگاداریان نەکردووم بەوەی کە لە دڵیاندایە وەهەستم نەکردوە کە داوای کار

بەدەستی دەکەن، هەروەك ببینم دەڵێی چاوم لێیە کە سیواکەکەی لە ژێر لێویدایە و لێـــوی هاتوەتەیـــەك و بەرزبوەتـــەوە، فـــەرمووی: "نـــەخێر، کەســـێ ناخەینـــە سەرکاروفەرمانمان کە خۆی بیەوێت، بەڵام ئەی أبو موسی تۆ برۆ، یان: ئەی عبـدالله کوڕی قیس". بەکاربەدەستی ناردی بۆ یەمەن، (معاذ) کـوڕی (جبـل)یشـی نـارد بـە دوایدا، کاتێ کە (معاذ) گەیشتە لای، وتی: دابەزە، (أبو موسی) سەرینێکی، بۆ دانا، لەوساتەدا پیاوێ لای أبوموسـی کـۆت و زنجیرکرابـوو، (معـاذ) وتـی: ئـەوە چییە؟ وتی: ئەمە جولەکـە بـووە پاشـان موسـڵمان بـووە، دوایـی گەڕاوەتـەوە سـەر ئاینـە خراپەکەی خۆی و بوەتەوە بە جولەکە، وتی: دانانیشم هەتا نەکوژرێ، حوکمی خـوا و پێغەمبەرەکەیەتی، أبو موسی وتی: دانیشە، باشە، وتی: هەتا نەکوژرێ دانانیشم، حوکمی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، سێ جـار ئەمـەی وت، (أبـو موسـی) فـەرمانی داو کوژرا، پاشان کەوتنە وتووێژ لەسەر شەونوێژ، یەکێکیان وتی –کە معاذ بوو– بـەڵام مـن دەخـەوم و شـەویش هەڵدەسـتم، چـەندە بەتـەمای پاداشـتی شـەونوێژەکەمم، ئەوەندەش بەتەمای پاداشتی خەوتنەکەمم.

**( ٦ ) ئایینْ ئامۆژگارییە**

**٦٣٨ـ عَنْ جَرِيرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وإِيتَا و الزَّكَاةِ، والنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. (البخاري/ الإيمان/ ٥٧)**

(جریـر) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پەیمانمـدا بـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەسـەر ئـەوە کـە نوێژبکەم و، زەکات بدەم، ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێکیش بکەم کەدڵسۆزی هەبێت بۆیان.

**٦٣٩–عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: عَادَ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ الْمُزَنِيَّ (رضي الله عنه) فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَقَالَ مَعْقِلٌ: إِنِّي مُحَدِّثُكَ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، لَوْ عَلِمْتُ أَنَّ لِي حَيَاةً مَا حَدَّثْتُكَ بِهِ، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْتَرْعِيهِ اللَّهُ رَعِيَّةً، يَمُوتُ يَوْمَ يَمُوتُ وَهُوَ غَاشٌّ لِرَعِيَّتِهِ، إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ". (البخاري/ الأحكام/ ٦٧٣١)**

(حسن) دەڵێ: (عبیدالله) کوڕی (زیـاد) سـەردانی (معقـلِ) کـوڕی (یسـار) المُزَنـيّ (رضي الله عنه) کرد لەو نەخۆشیەیدا کە بوە هۆی مردنی، (معقل) وتـی: من فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمـەوە کـە لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیسـتوە، ئەگـەر بمزانیایـە کـە ژیـانم

بەبەریـەوە مـاوە نەمدەگێڕایـەوە بـۆت، مـن لـە پێغەمبـەری خـوام (ﷺ) بیسـتوە دەیفەرموو: "هەر بەندەیەك خوا بیکاتـە کاربەدەسـت و چـاودێری کۆمـەڵێك خـەڵك، پاشان هـەر ڕۆژێ بمـرێ و غەشـی کردبـێ لـە ژێردەسـتەکانی، ئـەوا خـوا بەهەشـتی لێحەرام دەکات".

## ( ٧ ) خیانەتی فەرمانڕەواکان لە دەستکەوتی جەنگی

٦٤٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) ذَاتَ يَوْمٍ فَذَكَرَ الْغُلُولَ، فَعَظَّمَهُ وعَظَّمَ أَمْرَهُ، ثُمَّ قَالَ: "لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه بَعِيرٌ لَهُ رُغَا و، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه شَاةٌ لَهَا ثُغَا و، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه نَفْسٌ لَهَا صِيَاحٌ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه رِقَاعٌ تَخْفِقُ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِي و يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِه صَامِتٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ". **(البخاري/ الجهاد/ ٢٩٠٨)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆژێ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لەناوماننـدا هەسـتاو کەوتـە باسکردنی خیانەت لە دەستکەوتی جەنگی، تاوانەکـەی بـە گـەورە باسـکرد، پاشـان فەرمووی: "باکەسێکتان نەبینم کە لە ڕۆژی قیامەتدا بێـت و حوشـترێ لەسـەر ملـی بێت و بقۆڕێنێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش بڵـێم: دەسـەڵاتم نیـە هیچ شتێکت بۆ بکەم، کاتی خۆی پـێم ڕاگەیاندویت و، باکەسـێکتان نـەبینم کـە لـە ڕۆژی قیامەتدا بێت ئەسپی بەسەر ملیەوە بێت و بحیلکێنێ، بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، فریـام کـەوە، منـیش بڵـێم: دەسەڵاتم نیـە هـیچ شـتێکت بـۆ بکـەم، خـۆ پـێم ڕاگەیاندوی، با کەسێکتان نەبینم کە لە ڕۆژی قیامەت دا بێت و مەڕێ بەسـەرملیەوە بێت و بباڕێنێ، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منـیش بڵـێم: دەسـەڵاتم نیـە هیچ شتێکت بۆ بکەم، پێم ڕاگەیاندوویت، باکەسێکتان نەبینم کەلـە ڕۆژی قیامەتـدا بێت و گیانلەبەرێك بەسەرملیەوە بێت و هاوار بکات، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام

کەوە، منیش بڵێم: دەسەڵاتم نیە هیچ شتێکت بۆ بکەم، خۆ پێم ڕاگەیاندویت، با کەسێکتان نەبینم کە لەڕۆژی قیامەتدا بێت و چەند پارچە قوماشێ بەسەرملیەوە بن و بشەکێنەوە و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش بڵێم: دەسەڵاتم نیە هیچ شتێکت بۆ بکەم، خۆ پێم ڕاگەیاندویت، باکەسێکتان نەبینم کە لە ڕۆژی قیامەتدا بێت و ئاڵتون و زیو و شتومەك بەسەملیەوە بێت و، بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش بڵێم: دەسەڵاتم نیە هیچ شتێکت بۆ بکەم، کاتێ خۆی پێم ڕاگەیاندویت".

## ( ٨ ) دیاری بۆ فەرمانڕەواکان

**٦٤١ـ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعدِيِّ (ﷺ) قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلًا منَ الْأَسد عَلَى صَدَقَاتِ بَنِي سُلَيْمٍ يُدْعَى ابْنَ اللّبنية، فَلَمَّا جاء حَاسَبَهُ، قَالَ: هَذَا مَالُكُمْ وهَذَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "فَهَلَّا جَلَسْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وأُمِّكَ حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادقًا". ثُمَّ خَطَبَنَا فَحَمدَ اللَّهَ وأَثْنَى عَلَيْه، ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ منْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مماءلّاني اللَّهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا مَالُكُمْ، وهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، أَفَلَا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيه وأُمِّه حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادقًا؟ واللَّه لَا يَأْخُذُ أَحَدٌ منْكُمْ منْهَا شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّه إِلَّا لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقيَامَة، فَلَأَعْرِفَنَّ أَحَدًا منْكُمْ لَقِيَ اللَّهَ يَحْملُ بَعِيرًا لَهُ رُغَا و، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ" ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْه حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطَيْه يقول: "اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ". بَصُرَ عَيْنِي، وسَمِعَ أُذُنِي. (بخاري/ الحيل/ ٦٥٧٨)**

(أبو حميد الساعدي) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی (أسد)[1]ی کردە کارمەندی کۆکەرەوەی زەکاتی (بني سُلَيم) ناودەبرا بە (ابن اللتبيّة)، کاتێ هاتەوە کەوتە لێپرسینەوەی، وتی: ئەم سامانە هی ئێوەیە و ئەمە دیاریە بۆ من، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر ڕاستگۆیت بۆ دانەنیشتی لەماڵی دایك و باوکتدا هەتا دیاریەکەتت بۆ بێت". پاشان وتاری بۆ داین و سوپاس و ستایشی خوای (ﷻ)ی کرد، ئینجا فەرمووی: "لەپاشان، من پیاوێ لە ئێوە دەکەمە کارمەند بەسەر ئەو ئیشەوە کە خوا داویەتە دەستم، کەچی دێت و دەڵێ: ئەوە سامانەکەی

---

[1] الأسد: پێیان دەوترێ الأزد.

ئێوەیە، ئەوەش دیارییە دراوە بە من، ئەی بۆ لە ماڵی باوك و دایكیدا دانەنیشت، دیاریەكەی بۆ بێت ئەگەر ڕاستگۆیە؟ بەخوا هەریەكێ لە ئێوە شتێك وەربگرێ كە بە حەقی خۆی نەبێ كە ڕۆژی قیامەت گەیشت بەخوای باڵادەست دەبێ بە كۆڵیەوە بێت. یەكێك لە ئێوە دەناسمەوە كە بە خوای (عز وجل) دەگات حوشترێ بە كۆڵیەوەیەتی و باڕەباڕیەتی، یان مانگایەك قوڕەی لێدێ یان مەڕێك باعەباعیەتی". پاشان هەردوو دەستی بەرز كردەوە هەتا سپیایی هەردوو بن باڵی بینرا و دەیفەرموو: "خوایە، ئەوا گەیاندم". (أبو حمید) دەڵێ: چاوم بینی و گوێم بیستی.

## (٩) پەیمانی ژێر درەختەكە دەربارەی ڕانەكردن و پشت هەڵنەكردن

٦٤٢–عن جابر بن عبدالله قال كنا يوم الحديبية الفا واربع مائة، فبايعناه وَعُمَرُ (رضي الله عنه) آخذٌ بِيَدِهِ تَحْتَ الشَّجَرَةِ، وهِيَ سَمُرَةٌ، وقَالَ: بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لَا نَفِرَّ، ولَمْ نُبَايِعْهُ عَلَى الْمَوْتِ. (البخاري/ المغازي/ ٣٩٢١)

(جابر) كوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژی حودەیبیەدا هەزار و چوارسەد بووین، پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)و (عمر) (رضي الله عنه) لە ژێر درەختی (سَمُرة)دا دەستی بە دەستیەوە بوو، پەیمانمان پێدا لە جەنگدا ڕانەكەین، بەڵام پەیمانی مردنمان نەدایە.

٦٤٣ـ عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ الشَّجَرَةِ أَلْفًا وثَلَاثَ مِائَةٍ، وكَانَتْ أَسْلَمُ ثُمْنَ الْمُهَاجِرِينَ. (البخاري/ المغازي/ ٣٩٢٤)

"عبدالله) كوڕی (أبو أوفی) (رضي الله عنه) دەڵێ: هاوەڵانی درەختەكە هەزار و سێسەد كەس بوون، هۆزی (أسلم)یش هەشت یەكی كۆچكەرەكان بوون.

## (١٠) پەیماندان لەسەر مردن

٦٤٤ـ عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ: عَلَى أَيِّ شيء بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ. (البخاري/ المغازي/ ٣٩٣٦)

(یزید) كوڕی (أبو عبید) دەڵێ: بە (سلمة)م وت: لە ڕۆژی حودەیبیەدا لەسەر چ شتێ پەیمانتان بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)دا؟ وتی: لەسەر مردن.

## (١١) پەیماندان لەسەر گوێڕایەڵی و ملكەچی بە پێی توانا

٦٤٥ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى السَّمْعِ والطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَا: "فِيمَا اسْتَطَعْتَ". (البخاري/ الأحكام/ ٦٧٧٦)

(أبـن عمـر) (ﷺ) دەڵـێ: پـەیمانمان دەدا بـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەسـەر گوێڕایەڵی و ملکەچی، پێمانی دەفەرموو: "بەپێی توانات".

## (١٢) پەیماندان لەسەر گوێڕایەڵی مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینن

٦٤٦ـ عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (ﷺ) وهُوَ مَرِيضٌ، فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا –أَصْلَحَكَ اللَّهُ– بِحَدِيثٍ يَنْفَعُ اللَّهُ بِهِ، سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَ: دَعَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَبَايَعْنَاهُ، فَكَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا: أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ والطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا ومَكْرَهِنَا وعُسْرِنَا ويُسْرِنَا، وأَثَرَةٍ عَلَيْنَا وأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ. قَالَ: "إِلَّا أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ". (البخاري/ الفتن/ ٦٦٤٧)

(جُنادة) کوڕی (أبو أمیة) دەڵێ: چووینە سەردانی (عبادە) کوڕی (صامت) (ﷺ) نەخۆش بوو، وتمـان: –خـوا چـاکت بـۆ بکـا– فەرموودەیەکمان بـۆ بگێـڕەرەوە لـە پێغەمبەری خوات (ﷺ) بیستبێ تا سوودی لێـوەرگرین، (عُبـادة) وتـی: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـانگی کـردین و پـەیمانمان پێـدا، لـەو خاڵانـەی کـە لێـی وەرگـرتین: پـەیمانمان پێـدا لەسـەر گوێڕایـەڵی و ملکەچـی، لـە خۆشـیمان و ناخۆشـیماندا و لەتەنگانـەمان و لـە ئاسـودەییماندا، بافـەرمانڕەواکانیش هەنـدێ مافمـان بـەرن بـۆ خۆیان، پەیماندا کە ململانێ نەکەین لەگەڵ کەسێ کە شایستەی فەرمانڕەوایی بێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "مەگەر کوفرێکی ئاشـکرا ببیـنن و بەڵگـەتان لای خـواوە هەبێت لەسەری".

## (١٣) تاقیکردنەوەی ئافرەتە باوەڕدارەکان

٦٤٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَت الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُمْتَحَنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا ولَا يَسْرِقْنَ ولَا يَزْنِينَ) إِلَى آخر الْآيَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ فَقَدْ أَقَرَّ بِالْمِحْنَةِ، وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "انْطَلِقْنَ فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ". ولَا واللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلَامِ. قَالَتْ عَائِشَةُ (ﷺ): واللَّهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى النساء قَطُّ إِلَّا بِمَا أَمَرَهُ اللَّهُ تَعَالَى، ومَا مَسَّتْ كَفُّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كَفَّ امْرَأَةٍ قَطُّ، وكَانَ يَقُولُ لَهُنَّ إِذَا أَخَذَ عَلَيْهِنَّ: "قَدْ بَايَعْتُكُنَّ" كَلَامًا. (البخاري/ الطلاق/ ٤٩٨٣)

(عائشـة) (رضـي الله عنهـا) هاوســەری پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) دەڵـێ: هـەرکاتێ ئافرەتــە باوەڕدارەکــان کۆچــیانبکردایە بــۆ لای پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) بــەم فەرموودەیەی سەرەوەی خوای (ﷻ) تاقی دەکرانەوە کە ئەمە ماناکەیـەتی: "ئـەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پـەیمانیان پێـدایت بـا هـیچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خـوا بڕیارنـەدەن، زینـا نەکـەن، ڕۆڵـەکانی خۆیـان نـەکوژن، هـیچ جۆرە بوختانێك نەکەن لە نێوان دەست و پێـی خۆیانـدا" هـەتا کۆتـایی ئایەتەکـە ، عائشە وتی: هەر کام لە ئافرەتە باوەڕدارەکـان دانـی بنایـە بـەوەدا ئـەوا، دانیـدەنا، بەبەرگەگرتنی تاقیکردنەوەکەدا، جا ئەگەر بە وتەی خۆیان دانیان بنایە بەوەدا ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو پێیان: "بڕۆن ئەوا پـەیمانم لێـوەرگرتن". سـوێند بە خوا هەرگیز دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەکەوتوە لە دەستی هیچ ئافرەتێك، بـەڵکو هـەر بـە قسـە پـەیمانی لێـوەردەگرتن، عائشـە (ﷺ) دەڵـێ: سـوێند بـە خـوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر پەیمانێکی لە ئافرەتان وەرگرتبێت هـەر ئـەوە بـووە کـە خوا فەرمانی پێکردووە، هەرگیز ناو لەپی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) نەکـەوتوە لـە نـاو لەپی هیچ ئافرەتێك، هـەر کاتـێ بەیعـەتی لێوەربگرتنایـە هـەر بـە قسـە دەیفـەرموو پێیان: "ئەوا پەیمانم لێوەرگرتن".

### ( ١٤ ) گوێڕایەڵی کردنی پێشەوا

**٦٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ الْأَمِيرَ فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ الْأَمِيرَ فَقَدْ عَصَانِي". (البخاري/ الأحكام/ ٦٧١٨)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: "هەرکەسـێ گوێڕایـەڵی مـن بکات ئەوا گوێڕایەڵی خوای کردووە، هەر کەسێ سەرپێچی من بکات ئەوا سەرپێچـی خوای کردووە، هەر کەسـێ گوێڕایـەڵی فەرمانڕەواکـەی بکـات ئـەوا گوێڕایـەڵی منـی کردووە، هەر کەسێ سەرپێچی فەرمانڕەواکەی بکات ئەوا سەرپێچی منی کردووە".

### ( ١٥ ) گوێڕایەڵی بۆ چاکە و سەرپێچی لە خراپە

**٦٤٩ـ عَنْ عَلِيٍّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا، فَأَوْقَدَ نَارًا وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الْآخَرُونَ: إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: "لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا**

إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ". وقَالَ لِلْآخَرِينَ قَوْلًا حَسَنًا، وقَالَ: "لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ". (البخاري/ التمني/ ٦٨٣٠)

(علي) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی نارد و پیاوێکی کردە فەرماندەیان، ئەمیش ئاگرێکی کردەوە و وتی: بچنە ناوی، کەسانێك ویستیان بچنە ناو ئاگرەکە، کەسانێکی تریش وتیان: ئێمە لە ئاگر ڕامانکردووە، ئەم ڕووداوە باس کرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش بەوانەی فەرموو کە ویستیان بچنە ناو ئاگرەکە: "ئەگەر بڕۆشتنایەتە ناوی هەتا ڕۆژی دوایی تیایدا دەبوون" وە فەرموودەیەکی چاکیشی بەوانی تر فەرموو، ئینجا فەرمووی: "گوێڕایەڵی ناکرێ بۆ سەرپێچی خوا، بەڵکو گوێڕایەڵی بۆ چاکەیە و بەس".

## ( ١٦ ) ئەگەر فەرماندرا بە تاوان گوێڕایەڵی ناکرێت

**٦٥٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "عَلَى الْمَرْءِ و الْمُسْلِمِ السَّمْعُ والطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وكَرِهَ، إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ ولَا طَاعَةَ". (البخاري/ الأحكام/ ٦٧٢٥)**

(أبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "پێویستە کەسی موسڵمان گوێڕایەڵ و ملکەچ بێت لەو شتەدا پێی خۆشە یان پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بدرێ بە تاوان جا ئەگەر فەرمانی پێدرا بە تاوان ئەوا نەگوێڕایەڵ بێ و نەملکەچ".

**٦٥١-عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "إِنَّهُ يُسْتَعْمَلُ عَلَيْكُمْ أُمَرَا و، فَتَعْرِفُونَ وتُنْكِرُونَ، فَمَنْ كَرِهَ فَقَدْ بَرِئَ، ومَنْ أَنْكَرَ فَقَدْ سَلِمَ، ولَكِنْ مَنْ رَضِيَ وتَابَعَ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نُقَاتِلُهُمْ؟ قَالَ: "لَا، مَا صَلَّوْا". أَيْ مَنْ كَرِهَ بِقَلْبِهِ وأَنْكَرَ بِقَلْبِهِ.**

(أم سلمة) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "کەسانێك دەکرێتە فەرمانڕەواتان، کاری وایان لێدەبینی کە هەندێکیان پەسەندی شەرعن و هەندێکیان پەسەندی شەرع نین، هەر کەسێ پێی ناخۆش بێ (واتە ناشەرعیەکان) ئەوا بێتاوانە، وە هەرکەسێکیش نکوڵی لێبکا ئەوا سەلامەتە لە تاوان، بەڵام (تاوانبار) کەسێکە کە ڕازی بێت (بەو ناشەرعیانە) و شوێنکەوتە بێت". وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): ئەی نەجەنگێین لەگەڵیاندا؟ فەرمووی: "نەخێر، تا نوێژ بکەن".

## ( ١٧ ) ئارامگرتن له كاتی جیاوازیكردندا

٦٥٢ – عن اسيد بن حضير (رضي الله عنه) ان رجلا من الانصار خلا برسول الله (ﷺ) فَقَالَ: أَلَا تَسْتَعْمِلُنِي كَمَا اسْتَعْمَلْتَ فُلَانًا، فَقَالَ: "إِنَّكُمْ سَتَلْقَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوْنِي عَلَى الْحَوْضِ". (البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٨١)

(أسَيد) كوڕی (حُضَير) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك لە یارمەتیدەران لە پەنایەكەوە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)ی وت: بۆچی نامكەیتە كار بەدەست، هەر وەك فلان كەست كردوە بە كار بەدەست؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئێوە لە دوای من دەگەن بە ڕۆژێك كە ڕێزی (فضلی) خەڵكی دەدرێت بەسەرتاندا، ئارام بگرن هەتا لەسەر حەوزەكە بەمن بگەن".

## ( ١٨ ) دەست گرتن بە كۆمەڵی موسڵمانانەوە كاتی سەرهەڵدانی فیتنە

٦٥٣ـ عنْ حذيفة بن اليمان (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْخَيْرِ، وكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وشَرٍّ، فَجَاءنَا اللَّهُ بِهَذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هَذَا الْخَيْرِ شَرٌّ؟ قَالَ: "نَعَمْ". فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: "نَعَمْ، وفِيهِ دَخَنٌ". قُلْتُ: ومَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: "قَوْمٌ يَسْتَنُّونَ بِغَيْرِ سُنَّتِي ويَهْدُونَ بِغَيْرِ هَدْيِي، تَعْرِفُ مِنْهُمْ وتُنْكِرُ، فَقُلْتُ: هَلْ بَعْدَ ذَلِكَ الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ: "نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا". فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صِفْهُمْ لَنَا. قَالَ: "نَعَمْ، قَوْمٌ مِنْ جِلْدَتِنَا ويَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا تَرَى إِنْ أَدْرَكَنِي ذَلِكَ؟ قَالَ: "تَلْزَمُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وإِمَامَهُمْ". فَقُلْتُ: فَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُمْ جَمَاعَةٌ ولَا إِمَامٌ؟ قَالَ: "فَاعْتَزِلْ تِلْكَ الْفِرَقَ كُلَّهَا، ولَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ، حَتَّى يُدْرِكَكَ الْمَوْتُ وأَنْتَ عَلَى ذَلِكَ". (البخاري/ المناقب/ ٣٤١١)

(حذيفة) كوڕی (اليمان) (رضي الله عنه) دەڵێ: خەڵكی لەبارەی چاكەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەكرد، منیش لە بارەی خراپەوە پرسیارم لێدەكرد لە ترسی ئەوە نەبادا توشم ببێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە پێشتریش لە نەفامی و خراپەدا بووین، خوا ئەم چاكەیەی بۆ هێناین، ئایا لە دوای ئەم چاكەیە خراپە هەیە؟ فەرمووی: "بەڵێ" ئینجا عەرزم كرد: ئایا لە دوای ئەو خراپەیەش چاكە هەیە؟ فەرمووی: "بەڵێ هەیە، بەڵام لێڵی تێدایە" وتم: لێلیەكەی چییە؟ فەرمووی: "كەسانێك ڕەفتارێك دەكەن بەدەر لە ڕەفتار و سوننەتی من شوێن ڕێنماییەك

دەکەون بەدەر لە ڕێنمایی من، هەندێ شتیان پێچاکە و هەندێ شتیشیان پێ خراپە" دیسان وتم: ئایا لە دوای ئەو چاکەیەوە خراپە هەیە؟ فەرمووی: "بەڵێ بانگخوازانێك هەن لەسەر دەرگای دۆزەخ وەستاون، هەر کەس بچێت بەدەم بانگەوازەکەیانەوە فڕێی دەدەنە ناوی" دووبارە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفیان بکە بۆمان، فەرمووی: "بەڵێ، کەسانێکن لە خۆمان و بە زمانی خۆشمان قسەدەکەن" وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)،ئەگەر گەیشتم بەوانە دەبێ چی بکەم؟ فەرمووی: "دەست بگرە بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە"، ئینجاوتم: ئەی ئەگەر نە کۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا؟ فەرمووی: "خۆت بە دوور بگرە لە هەموو گروپەکان، با بەتەنهاش قەپ بکەی بە بن دارێکدا، هەتا مردن یەخەت دەگرێ تۆ لەسەر ڕاستی بە".

### ( ١٩ ) ڕەتکردنەوەی کاری داهێنراو

**٦٥٤ـ عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: سَأَلْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ رَجُلٍ لَهُ ثَلَاثَةُ مَسَاكِنَ، فَأَوْصَى بِثُلُثِ كُلِّ مَسْكَنٍ مِنْهَا. قَالَ: يُجْمَعُ ذَلِكَ كُلُّهُ فِي مَسْكَنٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ". (البخاري/ الصلح/ ٢٥٥٠)**

(سعد) کوڕی (إبراهیم) دەڵێ: پرسیارم کرد لە (قاسم) کوڕی (محمد) لەبارەی پیاوێکەوە کە سێ خانووی هەیە، وەسیەتی کردوە بەسێیەکی هەریەك لەو خانووانە. وتی: ئەو سیانە لەیەك خانوودا کۆدەکرێنەوە، پاشان وتی: عائشة (ﷺ) ئاگاداری کردم: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر کەسێ کارێ بکات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوا ڕەت دەکرێتەوە".

### ( ٢٠ ) ئەو کەسەی فەرمان دەدات بە چاکە و خۆی نایکات

**٦٥٥ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (ﷺ) قَالَ: قِيلَ لَهُ: أَلَا تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ؟ فَقَالَ: أَتَرَوْنَ أَنِّي لَا أُكَلِّمُهُ إِلَّا أُسْمِعُكُمْ؟ وَاللَّهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ. مَا دُونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ، وَلَا أَقُولُ لِأَحَدٍ يَكُونُ عَلَيَّ أَمِيرًا: إِنَّهُ خَيْرُ النَّاسِ، بَعْدَ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ، فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ، فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى، فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ: يَا فُلَانُ مَا لَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ؟ فَيَقُولُ: بَلَى، قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا آتِيهِ، وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ". (البخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٩٤)**

(أسامة) كورِی (زيد) (ﷺ) دەڵێ: پێی وترا: بۆ ناچیتە لای عثمان و بیدوێنی؟ وتی: ئایا ئێوە وا دەزانن کە ئێوە گوێتان لێ نیە ئیتر من قسەی لەگەڵ ناکەم سوێند بەخوا دوو بە دوویی قسەم لەگەڵدا کردووە، بەبێ ئەوەی دەرگای کارێك بکەمەوە کە حەز ناکەم یەکەم کەس بم لە کردنەوەیدا، بە کەسێکیش کە فەرمانڕەوابێ بەسەرمەوە ناڵێم: ئەو چاکترین کەسە، لەپاش ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)م بیستووە دەیفەرموو: "لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێ دەهێنرێ‌و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر، ناوسك و ڕێخۆڵەکانی هاتونەتە دەرەوە، خەڵکانی نێو دۆزەخ لێی کۆدەبنەوەو دەڵێن: فلانە کەس ئەوە چیتە؟ ئەی تۆ نەبووی فەرمانت دەدا بە چاکە و ڕێگریت دەکرد لە خراپە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ من فەرمانم دەدا بە چاکە و خۆم نەمدەکرد، وە ڕێگریم دەکرد لە خراپە و خۆم دەمکرد".

# بەشی سی و پێنجەم: ڕاو و سەربڕین

## (١) ڕاوکردن بە تیر و ناوی خواهێنان لە کاتی تەقاندنی

٦٥٦ـ عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّه، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ، وإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ ولَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ فَكُلْهُ، وإِنْ وجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ –وَقَدْ قَتَلَ– فَلَا تَأْكُلْ فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهُمَا قَتَلَهُ، وإِنْ رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ غَابَ عَنْكَ يَوْمًا فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلَّا أَثَرَ سَهْمِكَ فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، وإِنْ وجَدْتَهُ غَرِيقًا فِي الماء فَلَا تَأْكُلْ". (البخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥١٦٧)

(عدي) کوڕی (حاتم) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) پێـی فـەرمووم: "هـەر کات سەگەکەتت[1] کردە نێچیرەکە ناوی خوا بهێنە، جا ئەگـەر نێچیری بۆ گرتـی و بەزیندوویی پیاگەیشتی سەری ببڕە، ئەگەر گەیشتیتە سەر نێچیرەکە کوژرا بوو لێـی نـەخواردبوو ئـەوا بیخـۆ، بـەڵام ئەگـەر لەگـەڵ سـەگەکەتدا سـەگێکی تـرت بینـی و (نێچیرەکە کوژرابوو) ئەوا نەیخۆیت، چونکە تـۆ نـازانی کـە کامییـان کوشـتوویەتی، هـەر کـە تیرەکـەتت تەقانـد نـاوی خـوا ببـە، هـەروەها ئەگـەر بۆمـاوەی ڕۆژێـك نێچـیرەکەت لێ وون بـوو پاشـان دۆزیتـەوە هـیچ هۆکـارێکی تـری کوشـتنت پێیـەوە نەبینیەوە جگە لەتیرەکەی خۆت ئەگەر ویستت ئەوا بیخۆو ئەگـەر دۆزیتـەوەو لـەناو ئاودا خنکابوو ئەوا مەیخۆ".

## (٢) ڕاوکردن بە کەوان و سەگی فێرکراو و فێرنەکراو

٦٥٧ـ عنَ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ (ﷺ) قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ نَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ. وأَرْضِ صَيْدٍ: أَصِيدُ بِقَوْسِي، وأَصِيدُ بِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ، أَوْ بِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، فَأَخْبِرْنِي مَا الَّذِي يَحِلُّ لَنَا مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: "أَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكُمْ بِأَرْضِ قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ تَأْكُلُونَ فِي آنِيَتِهِمْ: فَإِنْ وجَدْتُمْ غَيْرَ آنِيَتِهِمْ فَلَا تَأْكُلُوا فِيهَا، وإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا ثُمَّ كُلُوا فِيهَا. وأَمَّا مَا ذَكَرْتَ أَنَّكَ بِأَرْضِ صَيْدٍ: فَمَا أَصَبْتَ بِقَوْسِكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ثُمَّ كُلْ، ومَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ

---

[1] سەگی فێرەڕاو

فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ ثُمَّ كُلْ، ومَا أَصَبْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ". **(البخاري/ الذبائح والصيد/ ٥١٦١)**

(أبو ثعلبة الخُشني) (ﷺ) دەڵێ: هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە خاکی خەڵکانێك داین کە خاوەن پەڕاوی ئاسمانین لە قاپ و قاچاغیاندا شت دەخۆین، لە خاکێکی ڕاوکردنداین: بە کەوانەکەم ڕاو دەکەم و، بەسەگە فێرە ڕاوەکەم ڕاو دەکەم، یان بەو سەگەی کە فێرەڕاو نیە، ئاگادارم بکە بزانم چی لەوانە بۆ ئێمە حەڵاڵە؟ فەرمووی: دەربارەی ئەوەی کە باست کرد ئێوە لە خاکی خەڵکانێکی خاوەن پەڕاوی ئاسمانیدان و لە قاپ و قاچاغیاندا دەخۆن، ئەگەر قاپ و قاچاغی ترتان دەست کەوت ئەوا لە هی ئەواندا مەخۆن، جا ئەگەر هی ترتان دەست نەکەوت ئەوا قاپ و قاچاغەکەیان بشۆن و پاشان تیایدا بخۆن، دەربارەی ئەوەش کە وای لە خاکێکی ڕاودا: ئەو نێچیرەی کە بەکەوانەکەت پێکات ناوی خوای لەسەر بهێنە و پاشان بیخۆ، ئەوەش کە بەسەگە فێرەڕاوەکەت دەیگریت، ناوی خوای لەسەر بهێنە و پاشان بیخۆ، ئەو نێچیرەی کە بە سەگە فێر نەکراوەکەت دەیگریت ئەگەر فریای سەربڕینی دەکەویت ئەوا بیخۆ".

## (٣) ڕاوکردن بە نەقیزە و ناوی خواهێنان کاتی ناردنی سەگی فێرەڕاو

٦٥٨ـ عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) عَنِ الْمِعْرَاضِ؟ فَقَالَ: "إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِه فَقَتَلَ فَإِنَّهُ وقِيذٌ، فَلَا تَأْكُلْ". وسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) عَنِ الْكَلْبِ؟ فَقَالَ: "إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وذَكَرْتَ اسْمَ اللَّه فَكُلْ، فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّهُ إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسه". قُلْتُ: فَإِنْ وجَدْتُ مَعَ كَلْبِي كَلْبًا آخَرَ، فَلَا أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَهُ؟ قَالَ: "فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ ولَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ". **(البخاري/ الذبائح والصيد/ ٥١٥٨)**

(عدي) کوڕی (حاتم) (ﷺ) دەڵێ: لەبارەی ڕاوکردن بە نەقیزە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش فەرمووی: "ئەگەر بە سەرە تیژەکەی نێچیری کوشت ئەوا بیخۆ، بەڵام ئەگەر بە باری پانی پیاکێشا و کوشتی ئەوە مردارەبووە و، نەیخۆیت". لەبارەی سەگەوە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد؟ فەرمووی: "ئەگەر سەگەکەت تێکرد و ناوی خوات هێنا ئەوا نێچیرەکە بخۆ، ئەگەر لێی خواردبێ ئیتر مەیخۆ، چونکە ئەوە تەنها بۆخۆی گرتووە". وتم: ئەگەر لەگەڵ

سەگەکەی خۆمدا سەگێکی ترم بینی و نەمزانی کامیان گرتوویەتی؟ فەرمووی: "نەیخۆیت، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت بردوە و ناوی خوات بۆ ئەوی تر نەبردووە".

**( ٤ ) دروستە سەگی راوو سەگی شوان رابگیرێ**

**٦٥٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنِ اتَّخَذَ كَلْبًا –إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ– انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ". قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَذُكِرَ لِابْنِ عُمَرَ قَوْلُ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَقَالَ: يَرْحَمُ اللَّهُ أَبَا هُرَيْرَةَ، كَانَ صَاحِبَ زَرْعٍ. (بخاري/ الذبائح والصيد/ ٥١٦٣)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەو کەسەی سەگێ رابگرێ –جگە لەسەگی شوان و ڕاوو کشتوکاڵ– هەموو ڕۆژێ بە ڕادەی یەك قیراط لە پاداشتی چاکەکانی کەم دەکات". (زُهري)دەڵێ: وتەکەی (أبو هريره) باسکرا بۆ (أبن عمر) ئەویش وتی: خوا ڕەحم بە (أبو هريره) بکات، ئەو خاوەنی کشتوکاڵ بوو.

**( ٥ ) سەگ کوشتن**

**٦٦٠ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِقَتْلِ الْكِلَابِ، حَتَّى إِنَّ الْمَرْأَةَ تَقْدَمُ مِنَ الْبَادِيَةِ بِكَلْبِهَا فَنَقْتُلُهُ، ثُمَّ نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ قَتْلِهَا، وقَالَ: "عَلَيْكُمْ بِالْأَسْوَدِ الْبَهِيمِ ذِي النُّقْطَتَيْنِ، فَإِنَّهُ شَيْطَانٌ". (بخاري/ المزارعة/ ٢١٩٧)**

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێکردین بە کوشتنی سەگ، تەنانەت کە ئافرەتێك لەبیابانەوە بەسەگەکەیەوە بهاتایە سەگەکەیمان دەکوشت، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ڕیگری کرد لە کوشتنیان و فەرمووی: "سەگی ڕەشی تۆخ بکوژن کە دوو خاڵی تێدایە، ئەوە وەك شەیتان وایە".

**( ٦ ) رێگرییکردن لە بەنیشانەنانەوەی گیانلەبەران**

**٦٦١ـ عَنْ هِشَامَ بْنَ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ جَدِّي أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) دَارَ الْحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَإِذَا قَوْمٌ قَدْ نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ (ﷺ): نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ. (البخاري/ الذبائح والصيد/ ٥١٦٢)**

(هشام) کوڕی (زید) کوڕی (أنس) کوڕی (مالك) دەڵێ: لەگەڵ باپیرەم (أنس) کوڕی (مالك) دا (ﷺ) چوومە ماڵی (حکم) کوڕی (أیوب) ، کەسانێك مریشکێکیان (بە زیندوویی) دانابوو بە نیشانە و تیریان تێ‌دەگرت، دەڵێ: (أنس) (ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە کە بێ‌زمانان بنرێنەوە بە نیشانە.

## (٧) سەربڕین بە شتێ کە خوێن فیشقە پێ بکات نەك بە ددان و نینۆك

٦٦٢ـ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (ﷺ)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّا لَاقُو الْعَدُوِّ غَدًا، ولَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى؟ قَالَ (ﷺ): "أَعْجِلْ –أَوْ: أَرْنِي– مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وذُكِرَ اسْمُ اللَّه فَكُلْ، لَيْسَ السِّنَّ والظُّفُرَ، وسَأُحَدِّثُكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ". قَالَ: وأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وغَنَمٍ، فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ لِهَذِهِ الْإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ، فَإِذَا غَلَبَكُمْ مِنْهَا شيء فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا". (البخاري/ الذبائح والصيد/ ٥١٩٠)

(رافع) کوڕی (خَدیج) (ﷺ) دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، سبەینێ ئێمە بە دوژمن دەگەین و چەقۆمان پێ‌نیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "پەلە بکە — یان دەستت سوککە— هەرچی خوێن فیشقە پێ‌بکات و ناوی خوایشی لەسەربرابێ بیخۆ، نەك بە ددان و نینۆك، با پێت بڵێم: کە ددان ئێسقانەو نینۆکیش چەقۆی حەبەشیەکانە". دەڵێ: لە حوشتر و مەڕ دەستکەوتی جەنگمان دەست کەوت، حوشترێکیان یاخی بوو، پیاوێك تیرێکی تێتەقاند و ڕای گرت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەم حوشترانە هەیانە یاخی دەبێ هەروەك یاخی بوونی کێوییەکان، ئەگەر یەکێکیان لێتان یاخی بوو ئێوەش ئاوای لەگەڵدا بکەن".

# بەشی سی و شەشەم: قوربانیی

## (١) کاتی قوربانیی سەربڕین

٦٦٣ـ عَنْ جُنْدَبُ بْنُ سُفْيَانَ (ﷺ) قَالَ: شَهِدْتُ الْأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَلَمْ يَعْدُ أَنْ صَلَّى وفَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ سَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ يَرَى لَحْمَ أَضَاحِيَّ قَدْ ذُبِحَتْ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلَاتِهِ، فَقَالَ: "مَنْ كَانَ ذَبَحَ أُضْحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ -أَوْ نُصَلِّيَ- فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، ومَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ". (البخاري/ الذبائح والصيد/ ٤١٨١)

(جُندب) کوڕی (سفیان) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان بووم، زۆری نەخایاند نوێژی کرد و سەلامی دایەوە، یەکسەر گۆشتی قوربانیی بینی کە سەربڕابوو پێش ئەوەی کە لە نوێژەکەی ببێتەوە، ئینجا فەرمووی: "ئەو کەسەی قوربانیی سەربڕیوە لە پێش ئەوەی نوێژ بکات -یان نوێژ بکەین- با یەکێکی تر لە جێگاکەیدا سەرببڕێ، ئەو کەسەی کە قوربانیەکەی سەرنەبڕیوە با بەناوی خواوە سەری ببڕێت".

## (٢) قوربانیی سەربڕین لە پێش نوێژی جەژندا دروست نیە

٦٦٤ ـ عَنِ الْبراء بْن عَازِبٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَنْحَرُ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، ومَنْ ذَبَحَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِه، لَيْسَ منَ النُّسُك فِي شيء". وكَانَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ (ﷺ) قَدْ ذَبَحَ، فَقَالَ: عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ. فَقَالَ: "اذْبَحْهَا، ولَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ". (البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٤٠)

(البراء) کوڕی (عازب) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "یەکەمین کارێ کە لەم ڕۆژەماندا دەستی پێدەکەین ئەوەیە کە نوێژ بکەین، پاشان بگەڕێینەوە و قوربانیی سەربڕین، هەر کەسێ بەمجۆرەی کردبێ ئەوا لەسەر سوننەتی ئێمەیە، هەر کەسێکیش سەری بڕی بێ (پێش نوێژی جەژن) ئەوە گۆشتێکە و پێشکەشی ماڵ و منداڵی کردوە، ئەوە بە هیچ جۆرێ قوربانیی نییە" (أبو بُردة) کوڕی (نیار) (ﷺ) پێشتر سەری بڕی بوو، پاشان وتی: گیسکێکم هەیە باشترە لەو حەیوانەی کە دوو ساڵی تەواو کردوە، فەرمووی: "سەری ببڕە، بەڵام لە دوای تۆ ئیتر بۆ کەسی تر دروست نییە".

### ( ٣ ) قوربانیی کردن بە گیسك

٦٦٥ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِينَا ضَحَايَا، فَأَصَابَنِي جَذَعٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أَصَابَنِي جَذَعٌ؟ فَقَالَ: "ضَحِّ بِهِ". (البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٢٧)

(عقبة) کوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڕێ حەیوانی بەسەردا دابەشکرین کە بیکەینە قوربانی، من گیسکێکم بەرکەوت، عەرزم کرد، ئەی پێغەمبەری خوا، من گیسکێکم بۆ ماوەتەوە؟ فەرمووی: "بیکە بە قوربانیی".

### ( ٤ ) چاکترین قوربانیی

٦٦٦ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، قَالَ: ورَأَيْتُهُ يَذْبَحُهُمَا بِيَدِهِ، ورَأَيْتُهُ واضِعًا قَدَمَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا، قَالَ: وسَمَّى وكَبَّرَ. (البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٣٨)

(أنس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو بەرانی بۆری شاخداری کردە قوربانی، بینیم کە بەدەستی خۆی سەریان دەبڕێ، بینیم قاچی خستبووە لاملی هەردووکیان، ناوی خوای هێنا و الله أکبری کرد.

### ( ٥ ) ڕێگری لە خواردنی گۆشتی قوربانی لەدوای سێ شەو

٦٦٧ـ عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ: أَنَّهُ شَهِدَ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (ﷺ)، قَالَ: ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ)، قَالَ: فَصَلَّى لَنَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ نَهَاكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا لُحُومَ نُسُكِكُمْ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، فَلَا تَأْكُلُوا. (البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٥١)

(أبو عبيد) کارگوزاری (أبن أزهر) دەڵێ: لەگەڵ (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) ئامادەی نوێژی جەژن بووە، دواتر لەگەڵ (علي) کوڕی (أبي طالبیش) (ﷺ) نوێژم کردووە، پێش وتار نوێژی بۆ کردین، ئینجاوتاری بۆ خەڵکی داو وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری لێکردوون کە لە دوای سێ شەو گۆشتی قوربانیەکەتان بخۆن، کەواتە ئێوەش مەیخۆن.

### ( ٦ ) مۆڵەتدان بە هەڵگرتنی گۆشتی قوربانی دوای سێ شەو

٦٦٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَاقِدٍ (ﷺ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ،

فَقَالَتْ: صَدَقَ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) تَقُولُ: دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حَضْرَةَ الْأَضْحَى، زَمَنَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ادَّخِرُوا ثَلَاثًا ثُمَّ تَصَدَّقُوا بِمَا بَقِيَ". فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ يَتَّخِذُونَ الْأَسْقِيَةَ مِنْ ضَحَايَاهُمْ، وَيَجْمُلُونَ مِنْهَا الْوَدَكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "وَمَا ذَاكَ". قَالُوا: نَهَيْتَ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلَاثٍ، فَقَالَ: "إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِي دَفَّتْ، فَكُلُوا وادَّخِرُوا وتَصَدَّقُوا". **(البخاري/ الأضاحي/ ٥٢٥٠)**

(عبدالله) كوڕی (ابو بكر) له (عبدالله) كوڕی (واقد)هوه (رضي الله عنه) دهڵێ: پێغهمبهری خوا (ﷺ) ڕێگری كرد له خواردنی گۆشتی قوربانی له سێ ڕۆژ بهدواوه، (عبدالله) كوڕی (أبو بكر) دهڵێ: ئهمهم بۆ (عَمرَة) باسكرد، ئهویش وتی: ڕاست دهكات، له عائشهم بیستوه (رضي الله عنها) دهیوت: خهڵكانێ له دانیشتوانی بیابان له سهردهمی پێغهمبهری خوادا (ﷺ) له ڕۆژی جهژنی قورباندا هاتنه مهدینه، پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرمووی: "بهشی سێ ڕۆژ ههڵبگرن پاشان ئهوهی كه مایهوه بیكهنه خێر". له دوای ئهوه به ماوهیهك وتیان: ئهی پێغهمبهری خوا خهڵكی هیزه دروست دهكهن له قوربانیهكانیان و بهز و پیوی تێدا ههڵدهگرن، پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرمووی: "جا ئهوه چی تیایه". وتیان: ڕێگریت كرد له گۆشتی قوربانیهكان له دوای سێ شهو بخورێ، فهرمووی: "من لهبهر ئهوه ڕێگریم لێكردن لهبهر ئهو میوانانهی دهرهوه كه هاتبوونه ئێره، ئێستە، بیخۆن و ههڵیبگرن و خێری لێ بكهن".

## ( ٧ ) نۆسكەی حوشتر و سەربڕین لە دە ڕۆژی یەكەمی ڕەجەبدا

٦٦٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ". زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِي رِوَايَتِهِ: وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ، فَيَذْبَحُونَهُ. **(البخاري/ العقيقة/ ٥٢٥٦)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دهڵێ: پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرمووی: "نۆسكه سهرمهبڕن و له دهڕۆژی یهكهمی ڕهجهبیشدا سهرمهبڕن". أبن رافع له ڕیوایهتێكدا ئهمهی زیاد كردوه: (فرع): نۆسكهی حوشتره كه سهریان بڕیوه[1].

---

[1] پێغهمبهر (ﷺ) ڕێگری كردووه لهم جۆره سهربڕینه چونكه له نهفامیدا سهربڕراه.

# بەشی سی و حەوتەم: خواردنەوەکان

## (١) حەرام کردنی ئارەق

٦٧٠ـ عَنْ عَلِيّ بن أبي طالب -(رضي الله عنه)- قَالَ: كَانَتْ لِي شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِي مِنَ الْمَغْنَمِ يَوْمَ بَدْرٍ، وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أعْطَانِي شَارِفًا مِنَ الْخُمُسِ يَوْمَئِذٍ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَنِيَ بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) واعَدْتُ رَجُلًا صَوَّاغًا مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ يَرْتَحِلُ مَعِيَ، فَنَأْتِي بِإِذْخِرٍ أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ مِنَ الصَّوَّاغِينَ، فَأَسْتَعِينَ بِهِ فِي وَلِيمَةِ عُرْسِي، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَيَّ مَتَاعًا مِنَ الْأَقْتَابِ والْغَرَائِرِ والْحِبَالِ، وشَارِفَايَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، ورَجَعتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ فَإِذَا شَارِفَايَ قَد اجْتُبَّتْ أَسْنِمَتُهُمَا، وبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَاءأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَيَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ مِنْهُمَا، قُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ قَالُوا: فَعَلَهُ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، غَنَّتْهُ قَيْنَةٌ وأَصْحَابَهُ، فَقَالَتْ فِي غِنَائِهَا: أَلَا يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَا و، فَقَامَ حَمْزَةُ بِالسَّيْفِ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا، وبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا فَأَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا. فَقَالَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه): فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) وعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، قَالَ: فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي وجْهِيَ الَّذِي لَقِيتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا لَكَ". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، واللَّه مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ، عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَاءبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا، وهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ. قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِرِدَائِه فَارْتَدَاهُ ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي، واتَّبَعْتُهُ اناءزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ حَتَّى جاء الْبَابَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُ، فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ فَإِذَا حَمْزَةُ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ إِلَى رُكْبَتَيْه، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِه، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ فَنَظَرَ إِلَى وجْهِه، فَقَالَ حَمْزَةُ: وهَلْ أَنْتُمْ إِلَّا عَبِيدٌ لِأَبِي؟ فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَنَّهُ ثَمِلٌ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى، وخَرَجَ وخَرَجْنَا مَعَهُ. **(البخاري/ الخمس/ ٢٩٢٥)**

(علی) کوڕی (أبو طالب) (رضي الله عنه) دەڵێ: حوشترێکی پیرم هەبوو کە لە دەستکەوتی جەنگی بەدر بەرمکەوتبوو، هەر لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوایش (ﷺ) حوشترێکی پیری تری پێدام لە پێنج یەك کاتێ کە ویستم (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بگوێزمەوە، بەڵێنم دابوو بە پیاوێکی زەرەنگەر لەجوولەکەی

(بنی قینقاع) کەلەگەڵمدا بێت و، گیای (اذخر)[1] بهێنین بیفرۆشم بە زەرەنگەرەکان تا بیکەمە خەرجی خوانی شاییەکەم، لە کاتێکدا کە سەرقاڵی کۆکردنەوەی جلی سەرپشتی حوشترەکانم و کۆڵ و بار و گوریسەکانم بووم، دوو حوشترەکەشم چۆکیان دادابوو بە تەنیشت ماڵی پیاوێکەوە لە یارمەتیدەران، لە دوای کۆکردنەوەی ئەوەی بۆم کۆکرایەوە گەڕامەوە سەیرم کرد کۆپارەی هەردوو حوشترەکەم براون، سکیان هەڵدڕاوە و لەجگەری هەردووکیان بڕاوە، هەر کە ئەو دیمەنەم بە هەردووکیانەوە بینی ئیتر هەردوو چاوم پەڕینە تەوقی سەرم، وتم: کێ ئەوەی کردووە؟ وتیان: (حمزة) کوڕی (عبد المطلب) کردویەتی. ئێستا ئەو لەوماڵەدایە لە ناو کۆمەڵێ ئارەق خۆری أنصاردا. ئافرەتێکی گۆرانی بێژ گۆرانی دەوت بۆ خۆی و هاوەڵەکانی، لە گۆرانیەکانیدا دەیوت: ئەها ئەی (حمزە) بۆ ئەو حوشترە قەڵەوانە، ئینجا (حمزة) بە شمشێرەکەیەوە هەستا و کۆپارەی هەردووکیانی بڕی، سکی هەڵدڕین و لە جگەرەکانیانی برد، علی (ﷺ) دەڵێ: بەپڕتاو ڕۆیشتم تا چوومە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە (زید) کوڕی (حارثة)ی لەلابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕوخسارمدا گورج زانی کە چیم تووش بووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "چیتە" عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بێ بەخوا هەرگیز ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە، (حمزة) داویەتی بەسەر حوشترەکانمداو کۆپارەی هەردووکیانی بڕیوە و سکی هەڵدڕیون، ئائەوەتا لەماڵێکدایەو ئارەق خۆرانی لەگەڵدایە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای عەباکەی کردو کردیە بەری و بەپرتاو ڕۆیشت، من و (زید) کوڕی (حارثە)یش بەشوێنیەوە بووین تا گەیشتە دەرگای ئەو ماڵەی کە (حمزة)ی تێدابوو، داوای مۆڵەتی کرد و مۆڵەتیان دا، ئەوان لە خواردنەوەدا بوون پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە سەرزەنشت کردنی (حمزة) لەوەی کە کردبووی، (حمزة) هەردووچاوی سور هەڵگەڕابوون، (حمزة) کەوتە سەیرکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاشان چاوی هەڵبڕی بۆ هەردوو ئەژنۆی موبارەکی، پاشان چاوی بەرزکردەوە و سەیری ناوکی کرد، دواتر چاوی هەڵبڕی و کەوتە سەیرکردنی ڕوخساری موبارەکی پێغەمبەر، ئینجا (حمزة) وتی: ئەی ئێوە کۆیلەی باوکم نین؟

---

[1] اذخر: جۆرە گیایەکە کەئاگری پێ دەکرێتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زانی کە سەرخۆشە، گەڕایەوە دواوە و پشتی هەڵکرد و چووە دەرەوە و ئێمەش لەگەڵیدا چووینە دەرەوە.

### (٢) هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بكات حەرامە

**٦٧١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ: "كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ". (البخاري/ الأشربة/ ٥٢٦٣)**

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرا لەبارەی ئارەقی هەنگوینەوە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "هەر خواردنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بكات ئەوە حەرامە".

### (٣) ئەوەی لە دونیادا ئارەق بخواتەوە لە رۆژی دواییدا نایخواتەوە مەگەر تەوبە بكەن

**٦٧٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ، إِلَّا أَنْ يَتُوبَ". (البخاري/ أول كتاب الأشربة: ٥٢٥٣)**

(أبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەو كەسەی كە لە دونیادا ئارەق بخواتەوە ئەوا لە رۆژی دواییدا نایخواتەوە، مەگەر پەشیمان ببێتەوە".

### (٤) ئارەق لە خورمای كاڵ و خورمای گەییو

**٦٧٣ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ أَسْقِي أَبَا طَلْحَةَ وأَبَا دُجَانَةَ ومُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (رضي الله عنهم)، فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَدَخَلَ عَلَيْنَا دَاخِلٌ فَقَالَ: حَدَثَ خَبَرٌ، نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، فَأَكْفَأْنَاهَا يَوْمَئِذٍ، وإِنَّهَا لَخَلِيطُ الْبُسْرِ والتَّمْرِ. قَالَ قَتَادَةُ: وقَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: لَقَدْ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ وكَانَتْ عَامَّةُ خُمُورِهِمْ يَوْمَئِذٍ خَلِيطَ الْبُسْرِ والتَّمْرِ. (البخاري/ الأشربة/ ٥٢٦٠ ـ ٥٢٦٢)**

(أنس) كوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئارەقم دەدا بە (أبو طلحة) و(أبو دجانة) و (معاذ كوڕی جبل) (رضي الله عنهم) لەناو دەستەیەك لە یارمەتیدەراندا، لەناكاودا یەكێ هاتە ناویان و وتی: ڕوداوێكی چاك ڕویدا، حەرامكردنی ئارەق دابەزی، هەر لەو ساتەدا ڕژاندمانە سەرزەوی، كە تێكەڵەیە لەفەریكە خورماو خورما بوو، (قتادة) و (أنس) كوڕی (مالك) وتیان: لە ڕاستیدا ئارەق حەرامكرا، كە لەو ڕۆژەدا ئارەقەكەیان بە گشتی تێكەڵەی فەریكە خورماو خورما بوو.

## ( ٥ ) ئارەق لە پێنج شتە

**٦٧٤-عن ابن عمر (رضي الله عنه ) قال: خطب عمر (رضي الله عنه) على منبر رسول الله (ﷺ) فحمد الله وأَثْنَى عَلَيْه، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ، أَلَا وإِنَّ الْخَمْرَ نَزَلَ تَحْرِيمُهَا يَوْمَ نَزَلَ وهِيَ منْ خَمْسَةَ اشياء: منَ الْحِنْطَة، والشَّعِيرِ، والتَّمْرِ، والزَّبِيب، والْعَسَل، والْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ، وثَلَاثَةُ اشياء ودِدْتُ -أَيُّهَا النَّاسُ- أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ عَهِدَ إِلَيْنَا فِيهَا: الْجَدُّ، والْكَلَالَةُ، وأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا. (البخاري/ الاشربة/ ٥٢٦٦)**

(أبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: عمر (رضي الله عنه) لەسەر دوانگەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتاری داو، سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان وتی: بزانن کە کاتێ حەرامکردنی ئارەق دابەزی، لە ڕۆژی دابەزینیدا لە پێنج شت دروست دەکرا: لە گەنم و، لە جۆو خورماو، لە مێوژ و، لە هەنگوین، ئارەقیش ئەوەیە کەعەقڵ تێکدەدات -ئەی خەڵکینە- خۆزگە پێغەمبەری خوا سێ شتی بە تەواوی بۆ ڕوون دەکردینەوە:

١) بەشی باپیر لە میراتدا.

٢) (الكلالة) میراتی کەسێ بمرێ و باوك و منداڵی لەدوا بەجێ نەمابێ.

٣) چەند بەشێك لە بەشەکانی سوو.

## ( ٦ ) ڕێگری لە تێکەڵکردنی مێوژوو خورما بۆ خواردنەوە

**٦٧٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه الْأَنْصَارِيِّ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ والزَّبِيبُ جَمِيعًا، ونَهَى أَنْ يُنْبَذَ الرُّطَبُ والْبُسْرُ جَمِيعًا. (بخاري/ الأشربة/ ٥٢٧٩)**

(جابر) کوڕی (عبدالله الانصاري) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ): ڕێگری کردووە کە مێوژو و خورما تێکەڵ بەیەك بکرێن بۆ خواردنەوە، هەروەها ڕێگری کردووە کە خورمای تەڕ و بەرسیلەی خورما تێکەڵ بەیەك بکرێن بۆ خواردنەوە.

## ( ٧ ) دا پۆشینی دەفر

**٦٧٦- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِديُّ (رضي الله عنه) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) بِقَدَحِ لَبَنٍ منَ النَّقِيعِ لَيْسَ مُخَمَّرًا، فَقَالَ: "أَلَّا خَمَّرْتَهُ، ولَوْ تَعْرُضُ عَلَيْه عُودًا". قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: إِنَّمَا أُمِرَ بِالْأَسْقِيَةِ أَنْ تُوكَأَ لَيْلًا، وبِالْأَبْوَابِ أَنْ تُغْلَقَ لَيْلًا. (البخاري/ الاشربة/ ٥٢٨٣)**

(أبو حميد الساعدي) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە (بقيع)ەوە جامێ شیرم هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە سەری دانەپۆشرابوو، فەرمووی: "بادات پۆشیایە، ئەگەر چیلکەیەکیشت

بخستایە بەسەریدا هەرباش بوو" أبوحمید وتی: لە ڕاستیدا ئێمە فەرمانمان پێدرابوو کە بەشەودا دەمی کوندە ببەستین و دەرگاکانیش داخەین.

## ( ٨ ) دەفرەکان دا پۆشن و دەمی کوندە ببەستن

٦٧٧ـ عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ –أَوْ أَمْسَيْتُمْ– فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وأَغْلِقُوا الْأَبْوَابَ، واذْكُرُوا اسْمَ اللَّه، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وأَوْكُوا قِرَبَكُمْ واذْكُرُوا اسْمَ اللَّه، وخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ واذْكُرُوا اسْمَ اللَّه، ولَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئًا، وأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ". **(البخاري/ بدء الخلق/ ٣١٠٦)**

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر تاریکایی شەو داهات –یان ئێوارەتان بەسەردا هات– منداڵەکانتان قەدەغە بکەن لە چوونە دەرەوە، چونکە شەیتان لەوکاتەدا بڵاوە دەکات، هەر کە سەعاتێ لەشەو تێپەڕی وازیان لێبێنن، دەرگاکانتان دابخەن و ناوی خوا بهێنن، چونکە شەیتان ناتوانێ دەرگای داخراو بکاتەوە، هەروەها دەمی کوندە و مەشکەکانتان ببەستن و ناوی خوا بهێنن، دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خوا بهێنن، باشتێکیشتان ڕایەڵ کردبێ بەسەریدا، چراکانیشتان بکوژێننەوە".

## ( ٩ ) خواردنەوەی هەنگوین و خۆشاوو خواردنەوەی شیرو ئاوو سرکە

٦٧٨ـ عَنْ الْبراء (ﷺ) قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَة، قَالَ: فَأَتْبَعَهُ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِك بْنِ جُعْشُمٍ، قَالَ: فَدَعَا عَلَيْه رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَسَاخَتْ فَرَسُهُ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي ولَا أَضُرُّكَ، قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ، قَالَ: فَعَطِشَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَمَرُّوا بِرَاعِي غَنَمٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (ﷺ): فَأَخَذْتُ قَدَحًا، فَحَلَبْتُ فِيه لِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، فَأَتَيْتُهُ بِه فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ. **(البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٩٦)**

(براء) (ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەککەوە هات بۆ مەدینە، (سراقە)ی کوڕی (مالك) کوڕی (جُعشُم)شوێنی کەوتبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دۆعای لێکردو ئەسپەکەی چەقی، ئینجا وتی: لای خوا دۆعام بۆ بکە زیانم بۆت نابێ، لەخوا پاڕایەوە، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) تینووی بوو، تێپەڕین بەلای شوانی مەڕێکدا، ئەبوبکر الصدیق (ﷺ) وتی: جامۆڵکەیەکم هەڵگرت و، کەمێ شیرم دۆشییە ناوی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، هێنام بۆی وخواردیەوە.

٦٧٩–عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ): إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا فَأَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ. (البخاري/ التفسير/ ٤٤٣٢)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: ئەو شـەوەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) شـەوڕەوی پێکـرا لـە (ایلیاء –بیت المقدس) پەرداخێ شیر و پەرداخێ ئارەقیان بۆ هێنا، سەیرێکی کـردن و شیرەکەی وەرگرت، جبریل (ﷺ) پێـی فـەرموو: سـوپاس بـۆ خـوا کـە ڕێنومـایی کردیت بۆ سروشتی پاك ، ئەگەر ئارەقەکەت هەڵگرتایە ئوممەتەکەت گومڕا دەبوو.

## ( ١٠ ) خواردنەوە لە جامۆڵکەدا

٦٨٠ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) امْرَأَةٌ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ أَنْ يُرْسِلَ إِلَيْهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَقَدِمَتْ، فَنَزَلَتْ فِي أُجُمِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى جَاءَهَا فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَإِذَا امْرَأَةٌ مُنَكِّسَةٌ رَأْسَهَا، فَلَمَّا كَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، قَالَ: "قَدْ أَعَذْتُكِ مِنِّي". فَقَالُوا لَهَا: أَتَدْرِينَ مَنْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: لَا، فَقَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) جَاءَكِ لِيَخْطُبَكِ، قَالَتْ: أَنَا كُنْتُ أَشْقَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ سَهْلٌ: فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَئِذٍ حَتَّى جَلَسَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: "اسْقِنَا" لِسَهْلٍ، قَالَ: فَأَخْرَجْتُ لَهُمْ هَذَا الْقَدَحَ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا فِيهِ، قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ بَعْدَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ (ﷺ)، فَوَهَبَهُ لَهُ. (البخاري/ الأشربة/ ٥٣١٤)

(سهل) کوڕی (سعد) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێکی عەرەب لای پێغەمبەری خـوا (ﷺ) باسکرا۔ فەرمانی دا بە (أبو أُسَيدٍ) کە بنێرێ بە دوایدا، ناردی بە شوێنیدا و هات، لە قەڵای (بني ساعدة) لایدا، پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ڕۆیشـت تـا گەیشـتە لای و چـووە ژوورەوە بۆ لای کە دی ئافرەتێکە سەری داخستبوو، هەر کە پێغەمبەری خـوا (ﷺ) قسەی لەگەڵدا کرد، ئافرەتەکـە وتـی: پـەنا ئـەگرم بـە خـوا لـەتۆ، فـەرمووی: "تـۆ پارێزراوی لە من" پێیان وت: (ئەی ئافرەت) ئایا دەزانی ئەوە کێیـە؟ وتـی: نـەخێر، وتیان: ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هـاتووە بـۆلات بتخـوازێ، وتـی: مـن ئەوەنـدە بەختەوەر نیم بمخوازێ، (سهل) وتی: هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە خۆی و هاوەڵانی لە (سقيفة بني ساعدة) دانیشتن، پاشان فەرمووی بە (سهل): "ئـاو بگێڕە بۆمان". وتی: ئەو جامۆڵکەیەم بـۆ دەرهێنـاو ئـاوم گێـڕا بۆیـان تیایـدا، (أبـو

حازم) وتی: (سهل) ئەو جامەی بۆ دەرهێناین و ئاومان تێدا خواردەوە، وتی: پاشان (عمر) کوڕی (عبدالعزیز) (ﷺ) داوای لێکرد کە پێی ببەخشێ، ئەویش پێی بەخشی.

## (١١) ڕێگری کردن لەدەمەو خوارکردنەوەی کوندە

٦٨١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَنِ اخْتِنَاثِ الْأَسْقِيَةِ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا. وفي رواية: واخْتِنَاثُهَا أَنْ يُقْلَبَ رَأْسُهَا ثُمَّ يُشْرَبَ مِنْهُ. **(البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٢)**

(ابو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگری کردووە لەدەمەو خوارکردنەوەی کوندەو خواردنەوە لەدەمەکەیەوە، لەریوایەتێکدا سەرەوخوار بکرێتەوەو ئینجا لێی بخورێتەوە.

## (١٢) ڕێگری لە خواردنەوە لە دەفری ئاڵتون و زیودا

٦٨٢- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُكَيْمٍ قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ (ﷺ) بِالْمَدَائِنِ، فَاسْتَسْقَى حُذَيْفَةُ، فَجَاءَهُ دِهْقَانٌ بِشَرَابٍ فِي اناء مِنْ فِضَّةٍ، فَرَمَاهُ بِهِ وقَالَ: إِنِّي أُخْبِرُكُمْ أَنِّي قَدْ أَمَرْتُهُ أَنْ لَا يَسْقِيَنِي فِيهِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا تَشْرَبُوا فِي اناء الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَا تَلْبَسُوا الدِّيبَاجَ وَالْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَهُوَ لَكُمْ فِي الْآخِرَةِ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ". **(البخاري/ الأطعمة/ ٥١١٠)**

(عبدالله) کوڕی (عکیم) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ (حذیفة)دا (ﷺ) لە (مدائن) بووین، (حذیفة) داوای ئاوی کرد، سەرگەورەی (مدائن) خواردنەوەیەکی بۆ هێنا لەناو دەفرێکی زیویندا، دەفرەکەی پێدایەوەو وتی: من ئاگادارتان دەکەم کە من فەرمانم پێداوە کە لەناو ئەو دەفرە زیوەدا دەرخواردم نەدات، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "لە دەفری ئاڵتون و زیودا خواردنەوە مەخۆنەوە، پۆشاکی (دیباج) و ئاوریشم مەپۆشن، ئەوە لە دونیادا بۆ ئەوانە و (واتە بۆ بێباوەڕان) لە ڕۆژی دوایشدا بۆ ئێوەیە، واتە لە ڕۆژی قیامەتدا".

٦٨٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "الَّذِي يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ إِنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِهِ نَارَ جَهَنَّمَ". وفي رواية: "أَنَّ الَّذِي يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ...". **(البخاري/ الأشربة/ ٥٣١١)**

(أم سلمة) (ﷺ) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەو کەسەی لە دەفری زیودا بخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ لەناوسکیدا

قوڵتە قـوڵتی دێـت". لـە ڕیوایـەتێکی تـردا: "ئـەو کەسـەی خـۆراك یـان خواردنـەوە بخواتەوە لەناو دەفری زیو و ئاڵتوندا...".

### (١٣) لای ڕاست لە پێشترە

٦٨٤ـ عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي دَارِنَا فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً، ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ ماء بِئْرِي هَذِه، قَالَ: فَأَعْطَيْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، وأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِه، وعُمَرُ (رضي الله عنه) وجَاهَهُ، وأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِه، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) مِنْ شُرْبِه، قَالَ عُمَرُ: هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّه، يُرِيه إِيَّاهُ، فَأَعْطَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الْأَعْرَابِيَّ وتَرَكَ أَبَا بَكْرٍ وعُمَرَ، وقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "الْأَيْمَنُونَ الْأَيْمَنُونَ الْأَيْمَنُونَ". قَالَ أَنَسٌ: فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ فَهِيَ سُنَّةٌ. **(البخاري/ الهبة/ ٢٤٣٢)**

(أنس) کـوڕی (مالـك) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) هـات بۆ ماڵمـان و داوای خواردنەوەیەکی کرد، ئێمەش مەڕێکمان بۆ دۆشی، پاشان لە ئاوی ئەو بـیرەم تێکەڵ کرد، وتی: دام بە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواردیەوە، (أبو بکر) لای چەپیەوە بوو، (عمـر) (رضي الله عنه) بەرانبـەری بـوو، عـەرەبێکی دەشـتەکیش لەلای ڕاستیەوە بـوو، کاتـێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەخواردنەوەکـەی لێبوویـەوە، (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئـەوە (أبـو بکـر)ە، پیشـانیدا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دای بـە عەرەبـە دەشـتەکیەکە نـەك (أبـوبکر) و (عمـر)و، فـەرمووی: "ئەوانەی لای ڕاستەوەن، ئەوانەی لای ڕاستەوەن". أنس وتی: ئەوە سوننەتە، ئەوە سوننەتە، ئەوە سوننەتە.

### (١٤) مۆڵەت وەرگرتن لە بچوك تا بدرێ بە بەساڵاچوان

٦٨٥ـ عَنْ سَهْل بْنِ سَعْدٍ السَّاعديِّ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وعَنْ يَمِينِه غُلَامٌ وعَنْ يَسَارِه أَشْيَاخٌ، فَقَالَ لِلْغُلَامِ: "أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَ هؤلاء". فَقَالَ الْغُلَامُ: لَا واللَّه، لَا أُوثِرُ بِنَصِيبِي مِنْكَ أَحَدًا. قَالَ: فَتَلَّهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي يَدِه. **(البخاري/ المظالم/ ٢٣١٩)**

(سهل) کوڕی (سعد الساعدي) (رضي الله عنه) دەڵێ: خواردنەوەیەك هێنـرا بـۆ پێغەمبـەری خوا (ﷺ) و لێی خواردەوە، مێردمنداڵێك لای ڕاسـتیەوە و چـەند بەساڵاچوویەکیش لای چەپیەوە بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بە کوڕەکەی فەرموو: "مۆڵەتم دەدەیـت بیـدەم

بەوان". کوڕەکە وتی: نەبەخوا ئەو بەشەی لە تۆوە پێم دەگات، کەس پێشی خۆم ناخەم، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دایە دەستی.

### ( ١٥ ) ڕێگری لە فووکردن بە دەفری خواردنەوەدا

**٦٨٦ـ عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الْاناء. (البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٧)**

(أبو قتادة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕیگری کردووە کە فووبکرێت بە دەفری خواردن و خواردنەوەدا.

### ( ١٦ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەخواردنەوەدا هەناسەی دەدا

**٦٨٧ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلَاثًا، ويَقُولُ: "إِنَّهُ أَرْوَى وأَبراءأَمْرَأُ". قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أَتَنَفَّسُ فِي الشَّرَابِ ثَلَاثًا. (البخاري/ الأشربة/ ٥٣٠٨)**

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتی خواردنەوەدا سێ جار هەناسەی دەدا و دەیفەرموو: "ئاوا باشتر تینویەتی دەشکێنێ و، سەلامەت ترەو، ئاسانتریش دەچێتە گەدەوە". (أنس) وتی: منیش لەکاتی خواردنەوەدا سێ جار هەناسەم دەدا.

### ( ١٧ ) مۆڵەت دان بە خواردنەوەی ئاوی زمزم بە پێوە

**٦٨٨ـ عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ قَائِمًا، واسْتَسْقَى وهُوَ عِنْدَ الْبَيْتِ. (البخاري/ الحج/ ١٥٥٦)**

(إبن عباس) (رضي الله عنهما) دەڵێ: ئاوی زمزممدا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپێوە خواردیەوە، ئەوکاتە لای (کەعبە)دابوو کە داوای ئاویکرد.

# بەشی سیو هەشتەم: خواردەمەنیەکان

## (١) بخۆر لەبەردەمی خۆیەوە بخوات

٦٨٩ـ عَنْ عُمَر بْنِ أَبِي سَلَمَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّه (صلى الله عليه وسلم)، وكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي: "يَا غُلَامُ، سَمِّ اللَّهَ وكُلْ بِيَمِينِكَ وكُلْ مِمَّا يَلِيكَ". (البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٦١)

(عمر) کوڕی (أبو سلمة) (رضي الله عنه) دەڵێ: من لە بەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووم، دەستم بە هەموولایەکی قاپەکەدا دەگێرا، پێی فەرمووم: "ڕۆڵە، ناوی خوا بهێنە و بەدەستی ڕاستت بخۆ، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ".

## (٢) کەسێ کە شوێنی کەسێکی دەعوەت کراو دەکەوێ

٦٩٠ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو شُعَيْبٍ وكَانَ لَهُ غُلَامٌ لَحَّامٌ، فَرَأَى رَسُولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) فَعَرَفَ فِي وجْهِه الْجُوعَ، فَقَالَ لِغُلَامِه: ويْحَكَ، اصْنَعْ لَنَا طَعَامًا لِخَمْسَةِ نَفَرٍ، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) خَامِسَ خَمْسَةٍ. قَالَ: فَصَنَعَ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَدَعَاهُ خَامِسَ خَمْسَةٍ، واتَّبَعَهُمْ رَجُلٌ، فَلَمَّا بَلَغَ الْبَابَ قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): "إِنَّ هَذَا اتَّبَعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، وإِنْ شِئْتَ رَجَعَ". قَالَ: لَا، بَلْ آذَنُ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّه. (البخاري/ البيوع/ ١٩٧٥٤)

(أبو مسعود الأنصاري) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە یارمەتیدەران پێی دەوترا (أبو شعیب)، کارگوزارێکی هەبوو گۆشت فرۆش بوو، أنصاریەکە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) بینی و لە ڕوخساریدا برسێتی بەدی کرد، بەکارگوزارەکەی وت: کۆستت کەوێ، خواردنێکمان بۆ دروست بکە بەشی پێنج کەس بکات، من دەمەوێ دەعوەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەم و یەکێ بێ لە پێنج کەسەکە. دروستیکرد، پاشان هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە یەکێك بوو لە پێنج کەس، پیاوێك شوێنیان کەوت، کاتێ گەیشتە دەرگاکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "ئەمە شوێنمان کەوتوە ئەگەر دەتەوێ مۆڵەتی بدەیت، ئەگەر نا دەگەڕێتەوە". وتی: نەخێر، نایگێڕمەوە، بەڵکو مۆڵەتی دەدەم ئەی پێغەمبەری خوا.

## (٣) پێشخستنی مافی میوان

٦٩١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنِّي مَجْهُودٌ، فَأَرْسَلَ إِلَى بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقَالَتْ: والَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلَّا ماء، ثُمَّ

أَرْسَلَ إِلَى أُخْرَى فَقَالَتْ مِثْلَ ذَلِكَ، حَتَّى قُلْنَ كُلُّهُنَّ مِثْلَ ذَلِكَ: لَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عِنْدِي إِلَّا ماء، فَقَالَ: "مَنْ يُضِيفُ هَذَا اللَّيْلَةَ رَحِمَهُ اللَّهُ". فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَحْلِهِ فَقَالَ لِامْرَأَتِهِ: هَلْ عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لَا إِلَّا قُوتُ صِبْيَانِي، قَالَ: فَعَلِّلِيهِمْ بِشَيْءٍ، فَإِذَا دَخَلَ ضَيْفُنَا فَأَطْفِئِ السِّرَاجَ وَأَرِيهِ أَنَّا نَأْكُلُ، فَإِذَا أَهْوَى لِيَأْكُلَ فَقُومِي إِلَى السِّرَاجِ حَتَّى تُطْفِئِيهِ، قَالَ: فَقَعَدُوا وَأَكَلَ الضَّيْفُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، فَقَالَ: "قَدْ عَجِبَ اللَّهُ مِنْ صَنِيعِكُمَا بِضَيْفِكُمَا اللَّيْلَةَ". **(البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٨٧)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواو (ﷺ) عەرزی كرد: برسێتی ناڕەحەتی كردووم، پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی نارد بۆ لای یەكێ لە خێزانەكانی، وتی: سوێند بێ بەو كەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە كردووە جگە لە ئاو هیچی ترم لانیە، پاشان ناردی بۆلای یەكێكی تریان ئەویش هەمان وتەی دووبارە كردەوە، هەتا هەرهەموویان هەر ئەوەیان وت: نەخێر سوێندبی بەو كەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە كردوە جگە لە ئاو هیچی ترم لەلانیە. ئینجا فەرمووی:"ڕەحمەتی خوا لەو كەسەبێت ئەمشەو میوانداری ئەم پیاوە دەكات". پیاوێك لە یارمەتیدەران هەستا و وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پیاوەكەی بردەوەماڵی خۆیی و بە خێزانەكەی وت: ئایا شتێكت لاهەیە؟ وتی:نەخێر جگە لە خۆراكی منداڵەوردەكان، وتی: خەریكیان بكە بەشتێكەوە، هەر كە میوانەكەمان هاتە ژوورەوە، چراكە زۆر كز بكە وا دەربخە كە ئێمە خەریكی خواردنین، هەركە ئەو كەوتە خواردن هەستە و چراكە بكوژێنەرەوە، وتی: خۆیان دانیشتن و میوانەكە نانی خوارد، كەرۆژ بوویەوە، هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش فەرمووی: "خوای گەورە ئەوكارەی پەسەند كردن و ڕازی بوو لە كردەوەی ئەمشەوتان".

## ( ٤ ) خواردەمەنی دوو كەس بەشی سێ كەس دەكات

**٦٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "طَعَامُ الِاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ، وطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الْأَرْبَعَةِ". (البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٧٧)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "خواردەمەنی دوو كەس بەشی سێ كەس دەكات، خواردەمەنی سیانیش بەشی چواركەس دەكات".

## ( ٥ ) خواردنی کوولەکە

٦٩٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: دَعَا رَسُولَ اللَّه (ﷺ) رَجُلٌ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجِي و بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبًّا و، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَأْكُلُ مِنْ ذَلكَ الدُّبَّا و ويُعْجِبُهُ، قَالَ: فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلكَ جَعَلْتُ أُلْقيه إِلَيْه ولَا أَطْعَمُهُ، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: فَمَا زِلْتُ بَعْدُ (ذلك) يُعْجِبُنِي الدُّبَّا و. (البخاري/ الأطعمة/ ٥١٢٣)

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەعوەت کرد، لە خزمەتیدا ڕۆیشتم، شلە بەگۆشتێك هێنرا کە کولەکەی تێدابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە خواردنی کولەکەکە و بەلایەوە خۆش بوو، وتی: هەرکە ئەوەم بینی کولەکەکەم خستە لای ئەوەوە و خۆم نەم خوارد، أنس وتی: ئیتر لە دوای ئەوەوە بەردەوام کولەکەم لابەلەزەت بوو.

## ( ٦ ) ڕێگری لەخواردنی خورما بەدوو دوو

٦٩٤ـ عَنْ جَبَلَةَ بْنَ سُحَيْمٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ الزُّبَيْر (ﷺ) يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، قَالَ: وقَدْ كَانَ أَصَابَ النَّاسَ يَوْمَئِذٍ جَهْدٌ، وكُنَّا نَأْكُلُ فَيَمُرُّ عَلَيْنَا ابْنُ عُمَرَ ونَحْنُ نَأْكُلُ فَيَقُولُ: لَا تُقَارِنُوا، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) نَهَى عَنِ الْإِقْرَانِ، إِلَّا أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ. قَالَ شُعْبَةُ: لَا أُرَى هَذه الْكَلِمَةَ إِلَّا مِنْ كَلِمَةِ ابْنِ عُمَرَ، يَعْنِي الِاسْتِئْذَانَ. (البخاري/ الأطعمة/ ٥١٣١)

(جَبَلة) کوڕی (سُحَيم) دەڵێ: (أبن زبير) خورمای پێدەداین، خەڵکی لەوڕۆژەدا برسێتی ناڕەحەتی کردبوون، ئێمە خورمامان دەخوارد و (أبن عمر) سەری لێداین، ئێمەش لەوکاتەیا خورمامان خوارد دەیوت: دوو دوو خورما مەخۆن، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕیگریی کردووە لە بەجووت خواردنی خورما. مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێ کە پیاو مۆڵەت لەبراکەی وەربگرێت، (شعبة) وتی: ئەم وشەیەم نەبینیوە لە وتەی أبن عمردا نەبێ. واتە مۆڵەت خواستنەکە.

## ( ٧ ) خواردنی ترۆزی بە خورماوە

٦٩٥–عَنْ عَبْد اللَّه بْن جَعْفَر (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَأْكُلُ الْقِثَّا و بِالرُّطَبِ. (البخاري/ الأطعمة/ ٥١٣٢)

(عبدالله)ی کوڕی (جعفر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی ترۆزیو خورمای تەڕی پێکەوە دەخوارد.

## ( ٨ ) بەری ڕەشی داری ئەراك

**٦٩٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) بِمَرِّ الظَّهْرَانِ وَنَحْنُ نَجْنِي الْكَبَاثَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "عَلَيْكُمْ بِالْأَسْوَدِ مِنْهُ". قَالَ: فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّكَ رَعَيْتَ الْغَنَمَ؟ قَالَ: "نَعَمْ، وَهَلْ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا وَقَدْ رَعَاهَا". أَوْ نَحْوَ هَذَا مِنَ الْقَوْلِ. (البخاري/ الأطعمة/ ٥١٣٨)**

(جابر) كوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لە (مَرَّ الظهران)[1]دا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، خەریكی ڕنینی بەری داری ئەراك[2] بووین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ڕەشەكەی بڕنن" ئێمەش وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەروەك شوانی مەڕ بوو بیت؟ فەرمووی: "بەڵێ ، ئایا پێغەمبەرێ هەیە شوانێتی مەڕی نەكردبێ" یان شتێكی وای فەرموو.

## ( ٩ ) خواردنی گۆشتی كەروێشك

**٦٩٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَرْنَا فَاسْتَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَوْا عَلَيْهِ فَلَغَبُوا، قَالَ: فَسَعَيْتُ حَتَّى أَدْرَكْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِوَرِكِهَا وَفَخِذَيْهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَأَتَيْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَبِلَهُ. (البخاري/ الهبة/ ٢٤٣٣)**

(أنس) كوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: ڕۆیشتین و لە (مرَّ الظهران) كەروێشكێكمان لە شوێنی خۆی هەڵسان، خەڵكی ڕایان كرد بەدوایدا بیگرن، ماندوو بوون، منیش ڕامكرد بە دوایدا هەتا گەیشتمە سەری و گرتم، هێنام بۆ لای (أبو طلحة) و سەری بڕی، سمتە جوڵەكەی و هەردوو ڕانی نارد بۆ پێغەمبەری خواو (ﷺ) منیش هێنام بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وەری گرت.

## ( ١٠ ) خواردنی گۆشتی بزن مژە

**٦٩٨ـ عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (ﷺ) ـالَّذِي يُقَالُ لَهُ سَيْفُ اللَّهِـ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ**

---

[1] مرَّ الظهران: شوێنێكی نزیكە لە مەككەوە

[2] داری ئەراك : ئەو درەختەیە سیواكی لێ دروست دەكرێت.

نَجْدٍ، فَقَدَّمَت الضَّبَّ لرَسُول اللَّه (ﷺ)، وكَانَ قَلَّمَا يُقَدَّمُ إِلَيْه طَعَامٌ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ ويُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَت امْرَأَةٌ منَ النِّسْوَة الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) بِمَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ: هُوَ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّه، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيد: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: "لَا، ولَكنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ". قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ، ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَنْظُرُ فَلَمْ يَنْهَنِي. **(البخاري/ الأطعمة/ ٥٠٧٦)**

(عبدالله) كوڕی (عباس) (ﷺ) دەڵێ: (خالد) كوڕی (ولید) (ﷺ) —كە پێی دەوترا شمشێری خوا— هەواڵی پێداوە، كە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) چوو بۆلای (میمونە)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) كە پووری ئەوو (أبن عباس) بوو لەدایكەوە، بزن مژەیەكی برژاوی لەلای بینی، كە (حفیدة) كچی (حارث)ی خوشكی لە (نەجدە)وە بۆی هێنابوو، (میمونە) بزن مژەكەی خستە بەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، كە بەدەگمەن خواردنێكی بخرایەتە بەردەم هەتا باسی بۆ نەكرایا و ناوی نەبرایا بۆی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی برد بۆ بزن مژەكە، یەكێ لەو ئافرەتانەی كە لەوێدا ئامادە بوون وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداربكەن بەوەی كە بۆتان داناوە، وتیان خواردنەكە بزن مژەیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی كێشایەوە، ئینجا (خالد) كوڕی (ولید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: "نەخێر، بەڵام لەخاكی قەومەكەی مندا نەبووە، بۆیە دەبینی دڵم ناچێتە سەری". خالد وتی: لەتم كرد و خواردم، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) سەیری كردم وڕێگری لێنەكردم.

### ( ١١ ) خواردنی كوللە

٦٩٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ أَبِي أَوْفَى (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ. **(البخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥١٧٦)**

(عبدالله) كوڕی (أبو أوفى) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) حەوت جەنگمان كردووە و كوللەمان خواردووە.

### ( ١٢ ) خواردنی گیانداری دەریایی و ئەوەی دەریا فڕێی دەدا

٧٠٠ـ عَنْ جَابِرٍ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، وأَمَّرَ عَلَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ، نَتَلَقَّى عِيرًا لِقُرَيْشٍ، وزَوَّدَنَا جِرَابًا مِنْ تَمْرٍ لَمْ يَجِدْ لَنَا غَيْرَهُ، فَكَانَ أَبُو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرَةً

تَمْرَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِهَا؟ قَالَ: نَمَصُّهَا كَمَا يَمَصُّ الصَّبِيُّ، ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهَا مِنَ الماء، فَتَكْفِينَا يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ، وكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنَا الْخَبَطَ، ثُمَّ نَبُلُّهُ بالماء فَنَأْكُلُهُ، قَالَ: وانْطَلَقْنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَرُفِعَ لَنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ كَهَيْئَةِ الْكَثِيبِ الضَّخْمِ، فَأَتَيْنَاهُ فَإِذَا هِيَ دَابَّةٌ تُدْعَى الْعَنْبَرَ، (قَال): قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ، ثُمَّ قَالَ: لَا، بَلْ نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وقَدِ اضْطُرِرْتُمْ فَكُلُوا. قَالَ: فَأَقَمْنَا عَلَيْهِ شَهْرًا، ونَحْنُ ثَلَاثُ مِائَةٍ، حَتَّى سَمِنَّا. قَالَ: ولَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْتَرِفُ مِنْ وقْبِ عَيْنِهِ بِالْقِلَالِ الدُّهْنَ، ونَقْتَطِعُ مِنْهُ الْقِدَرَ كَالثَّوْرِ، أَوْ كَقَدْرِ الثَّوْرِ، فَلَقَدْ أَخَذَ مِنَّا أَبُو عُبَيْدَةَ ثَلَاثَةَ عَشَرَ رَجُلًا فَأَقْعَدَهُمْ فِي وقْبِ عَيْنِهِ، وأَخَذَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلَاعِهِ فَأَقَامَهَا، ثُمَّ رَحَلَ أَعْظَمَ بَعِيرٍ مَعَنَا، فَمَرَّ مِنْ تَحْتِهَا. وتَزَوَّدْنَا مِنْ لَحْمِهِ وشَائِقَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: "هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّهُ لَكُمْ، فَهَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٍ فَتُطْعِمُونَا". قَالَ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْهُ فَأَكَلَهُ. (البخاري/ المغازي/ ٤١٠٢-٤١٠٤)

(جابر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردینی بۆ جەنگ و أبو عبیدەی کردە فەرماندەمان، بەدوای کاروانی قورەیشدا دەگەڕاین، توێشە بەرەیەك لە خورمای کردە توێشومان و هیچی تری لا نەبوو بۆمان جگە لەوە، (أبو عبیدە) دەنکە خورمای دەداینێ. منیش وتم: ئەی ئێوە چیتان لێدەکرد؟ وتی: دەمانمژی هەروەك چۆن منداڵ دەیمژێ، پاشان ئاومان دەخواردەوە بەسەریدا، ئەو ڕۆژە تا شەوەکەی بەشی کردین، بەدارەکانی دەستمان گەڵای دارمان دەوەراند، پاشان بەئاو تەڕمان دەکرد و دەمانخوارد، بەکەناری دەریاکەدا ڕۆیشتین، لەکەناری دەریاکە تارماییەکمان دی وەکو تەپۆڵکە وابوو کە گەیشتینە لای سەیردەکەین گیاندارێکە پێی دەوترا (عَنبَر) أبو عبیدە وتی: ئەوە مرداربوەیە، پاشان وتی:نەخێر بەڵکو ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ین و لە پێناوی خوادا هاتووین، بەڕاستی ناچاربووین بیخۆن، وتی: ئێمە کە سێسەد کەس بووین یەك مانگ لەسەریماینەوە هەتا قەڵەو بووین، وتی: ئێمەت ببینیایا لە چاڵی چاویدا بە گۆزەی گەورە ڕۆنمان هەڵدەگۆزی، پارچە گۆشتمان لێدەبڕی ، یان بەقەدەر گایەك دەبوو، (أبو عبیدة) سیانزە پیاوی لێبردین و لە چاڵی چاویدا داینیشاندن، پەراسویەکی لێهەڵگرت و دایچەقاند، پاشان گەورەترین حوشترێ کە پێمان بوو بردی بەژێریدا ، لە

گۆشـتەکەی زۆرێکمـان لیٚ زەرد کـرد و کردمانـە توێشـوی (ڕێ) کاتـێ گەڕاینـەوە مەدینـە، هاتینـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـواو (ﷺ) ئـەو باسـەمان بـۆ گێڕایـەوە، فـەرمووی: "ئـەوە ڕزقێکـە خـوا بـۆ ئێـوەی هێناوەتـە دەرێ، ئایـا شـتیك لـە گۆشـتەکەیتان پێیـە بیدەنـە دەرخواردمـان". وتـی: لـە گۆشـتەکەیمان نـارد بـۆ پێغەمبەری خواو (ﷺ) خواردی.

## ( ١٣ ) خواردنی گۆشتی ئەسپ

٧٠١ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، وأذِنَ فِي لُحُومِ الْخَيْلِ. **(البخاري/ المغازي/ ٣٩٨٢)**

(جابر) کـوڕی (عبـدالله) (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە ڕۆژی (خیـبر)دا ڕێگری کرد لـە خـواردنی گۆشـتی گوێدرێـژی مـاڵی، مۆڵەتیـدا بـە خـواردنی گۆشـتی ئەسپ.

٧٠٢ـ عَنْ اسماء (رضي الله عنها) قَالَتْ: نَحَرْنَا فَرَسًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَكَلْنَاهُ. **(بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٠)**

(اسماء) (رضي الله عنها) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) ئەسپێکمان سەربڕی و خواردمان.

## ( ١٤ ) ڕێگریی لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی

٧٠٣ـ عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لُحُومَ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ. **(بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٦)**

(أبو ثعلبة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆشتی گوێدرێـژی مـاڵی حـەرام کردووە.

٧٠٤ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) خَيْبَرَ، أَصَبْنَا حُمُرًا خَارِجًا مِنَ الْقَرْيَةِ فَطَبَخْنَا مِنْهَا، فَنَادَى مُنَادِي رَسُولِ اللَّه (ﷺ): أَلَا إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يَنْهَيَانِكُمْ عَنْهَا، فَإِنَّهَا رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ. فَأُكْفِئَتِ الْقُدُورُ بِمَا فِيهَا وَإِنَّهَا لَتَفُورُ بِمَا فِيهَا. **(بخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٠٨)**

(أنـس) (رضي الله عنه) دەڵـێ: کاتـێ کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خەیبـەری ڕزگـار کـرد، لەدەرەوەی گوندەکە چەند گوێدرێـژێك کەوتنـە دەسـتمان و، هەنـدێکمان لێکوڵانـد، بانگکەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد: ئاگاداربن، ئـەوە خـواو پێغەمبەرەکـەی

ڕێگریتان دەکەن لەوە، ئەوە زۆر پیسەو لەکاری شەیتانە، مەنجەڵەکان سەرەونخون کرانەوە بەوەی کە تیایاندا بوو، لە کاتێکدا کە قوڵپەی کوڵانیان دەهات.

### ( ١٥ ) عەیبدارنەکردنی خواردن

**٧٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَابَ طَعَامًا قَطُّ، كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ سَكَتَ. (البخاري/ المناقب/ ٣٣٧٠)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەبینیوە کە خواردنێ عەیبدار بکات، ئەگەر حەزی لێ بکردایە دەیخوارد، ئەگەر حەزیشی لێ نەکردایە بێدەنگ دەبوو.

# بەشی سی و نۆیەم: پۆشاك و ڕازاوەیی

## (١) ئەو پیاوەی لە دونیادا ئاوریشم دەپۆشێ لەو دونیادا بێبەشە

٧٠٦-عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَى عُمَرُ بن الخطاب (رضي الله عنه) عُطَارِدًا التَّمِيمِيَّ يُقِيمُ بِالسُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، وكَانَ رَجُلًا يَغْشَى الْمُلُوكَ ويُصِيبُ مِنْهُمْ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي رَأَيْتُ عُطَارِدًا يُقِيمُ فِي السُّوقِ حُلَّةً سِيَرَاءَ، فَلَوِ اشْتَرَيْتَهَا فَلَبِسْتَهَا لِوُفُودِ الْعَرَبِ إِذَا قَدِمُوا عَلَيْكَ، وأَظُنُّهُ قَالَ: ولَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّمَا يَلْبَسُ الْحَرِيرَ فِي الدُّنْيَا مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ فِي الْآخِرَةِ". فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِحُلَلٍ سِيَرَاءَ، فَبَعَثَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، وبَعَثَ إِلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ بِحُلَّةٍ، وأَعْطَى عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) حُلَّةً وقَالَ: "شَقِّقْهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ". قَالَ: فَجَاءَ عُمَرُ بِحُلَّتِهِ يَحْمِلُهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ، وقَدْ قُلْتَ بِالْأَمْسِ فِي حُلَّةِ عُطَارِدٍ مَا قُلْتَ؟ فَقَالَ: "إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ بِهَا إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، ولَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُصِيبَ بِهَا". وأَمَّا أُسَامَةُ فَرَاحَ فِي حُلَّتِهِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) نَظَرًا عَرَفَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ أَنْكَرَ مَا صَنَعَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَنْظُرُ إِلَيَّ، فَأَنْتَ بَعَثْتَ إِلَيَّ بِهَا؟ فَقَالَ: "إِنِّي لَمْ أَبْعَثْ إِلَيْكَ لِتَلْبَسَهَا، ولَكِنِّي بَعَثْتُ بِهَا إِلَيْكَ لِتُشَقِّقَهَا خُمُرًا بَيْنَ نِسَائِكَ". **(البخاري/ الهبة/ ٢٤٧٠)**

(أبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: (عمر) کوڕی (خطاب) (رضي الله عنه) (عطاردی تميمي) لە بازاڕدا بيبنی، کە قاتێکی ئاوریشمی خەت خەتی خستبووە سەرسەودا، (عطارد) پیاوێ بوو سەردانی پادشایانی دەکرد و دەستکەوتی لێیان دەبوو، (عمر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (عطارد)م بينی لەبازاڕدا قاتێکی ئاوریشمی خەت خەتی خستبووە سەر سەودا، خۆزگایە لێت بکڕیایە و لەوکاتانەدا کە نوێنەری تیرەکانی عەرەب دەهاتنە خزمەتت لەبەرت بکردایە، وا بزانم وتی: ڕۆژی جومعەش لەبەرت بکردايە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: "کەسێ لە دونیادا ئاوریشم دەپۆشێ، کەلە ڕۆژی دواييدا بێبەش بێت لێی" لە دوای ئەوەوە چەند قاتێکی لەو جۆرە هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) قاتێکی نارد بۆ (عمر)، قاتێکی تری نارد بۆ (أسامة)ی کوڕی (زيد)، قاتێکیشی دابە (علي) کوڕی (أبو طالب) (رضي الله عنه) و، فەرمووی: "پارچە پارچەی بکە بۆ سەرپۆش و دابەشی بکە لەنێوان هاوسەرەکانتاندا". دەڵێ: (عمر)

قاتەکەی خۆی هەڵگرتبوو هات، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەمەت ناردووە بۆم، دوێنێ لەسەر قاتەکەی (عطارد)یش ئەوەت فەرمووکە فەرمووت؟ فەرمووی: "من بۆ ئەوە بۆم نەناردویت کە لەبەری بکەیت، بەڵکو بۆ ئەوە بۆم ناردوویت کە سوودی لێببینیت". بەلاّم (أسامة) قاتەکەی لەبەرکردو هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەیرکردنێ سەیری (أسامة)ی کرد، زانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردەوەکەی پێ ناخۆش بووە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چییە واسەیرم دەکەیت، تۆ خۆت ناردوتە بۆم؟ فەرمووی: "من بۆ ئەوە بۆم نەناردویت کەلەبەری بکەیت، بەڵکو بۆم ناردوویت تا پارچە پارچەی بکەی بۆسەرپۆش‌و دابەشی بکەیت لە نێوان ژنەکانتا".

## (٢) هەر کەس لە دونیادا ئاوریشم لەبەربکات لە رۆژی دواییدا لەبەری ناکات

**٧٠٧- عَنْ خَلِيفَةَ بْنِ كَعْبٍ (أَبِي ذِبْيَانَ) قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ يَخْطُبُ يَقُولُ: أَلَا لَا تُلْبِسُوا نِساءَكُمْ الْحَرِيرَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا تَلْبَسُوا الْحَرِيرَ، فَإِنَّهُ مَنْ لَبِسَهُ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الْآخِرَةِ". (البخاري/ اللباس/ ٥٤٩٢)**

(خليفه) کوڕی (کعب) (أبو ذبيان) دەڵێ: گوێم لێبوو (عبدالله)ی کوڕی (زبير) وتاری دەداو دەیوت: وریا بن نەکەن ئاوریشم بکەنە بەر ژنەکانتان، من لە (عمر) کوڕی (الخطاب)م بیستوە دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئاوریشم لەبەرمەکەن، هەر کەس لە دونیادا لەبەری بکات لە رۆژی دوایدا لەبەری ناکات"[1].

## (٣) بۆ لە خواترسان شیاو نییە ئاوریشمی درزدار لەبەر بکەن

**٧٠٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ، فَلَبِسَهُ ثُمَّ صَلَّى فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: "لَا يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ". (البخاري/ الصلاة في الثياب/ ٣٦٨)**

(عقبة) کوڕی (عامر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پۆشاکێکی ئاوریشمی لەدواوە درزدار کرایە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەبەری کرد و پاشتر نوێژیشی پێوە کرد، کە لە

---

[1] پێشەوا نەوەوی: ئەوە مەزهەبی (أبن الزبير)ە ، زانایان هاودەنگن کە ئاوریشم حەلاڵە بۆ ئافرەت، فەرموودەی پێشووتر بەڵگەیە لەسەرئەوە.

نوێژەکەی بویەوە زۆر بە توندی و بەپەلە لەبەری خۆی دایماڵی وەك یەکێ کە حەزی پێنەکات، پاشان فەرمووی: "ئەمە بۆ لەخواترسان شیاونیە".

### ( ٤ ) ڕێگری لە پۆشینی ئاوریشم بە ئەندازەی دوو پە نجە نەبێ

٧٠٩ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ إِلَيْنَا عُمَرُ (ﷺ) وَنَحْنُ بِأَذْرَبِيجَانَ: يَا عُتْبَةُ بْنَ فَرْقَدٍ، إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ كَدِّكَ وَلَا مِنْ كَدِّ أَبِيكَ وَلَا مِنْ كَدِّ أُمِّكَ، فَأَشْبِعِ الْمُسْلِمِينَ فِي رِحَالِهِمْ مِمَّا تَشْبَعُ مِنْهُ فِي رَحْلِكَ، وَإِيَّاكُمْ وَالتَّنَعُّمَ وَزِيَّ أَهْلِ الشِّرْكِ وَلَبُوسَ الْحَرِيرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) نَهَى عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ قَالَ: إِلَّا هَكَذَا، وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ وَضَمَّهُمَا. قَالَ زُهَيْرٌ: قَالَ عَاصِمٌ: هَذَا فِي الْكِتَابِ، قَالَ: وَرَفَعَ زُهَيْرٌ إِصْبَعَيْهِ. **(البخاري/ اللباس/ ٥٤٩٢)**

(أبو عثمان) دەڵێ: ئێمە لە ئازربایجان بووین (عمر) (ﷺ) نامەیەکی بۆ نووسین کە: ئەی (عُتبة) کوڕی (فرقد) ئەوە نەبەرهەمی ڕەنجی خۆتە و نەڕەنجی باوکتە و نەڕەنجی دایکتە، موسڵمانان تێربکە لە نێوماڵەکانیاندا هەرلەوە کە خۆتی لێتێر دەکەیت لە ماڵەکەتدا، وریابن نەکەن بەژیانی ناسکی بژین و، پۆشاکی خەڵکانی بێباوەڕو ئاوریشم، لەبەر بکەن، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کردوە لە پۆشینی ئاوریشم، وتی: مەگەر بەم شێوەیە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو پەنجەی شەهادەت و ناوەڕاستی بەرز کردەوە و خستنیە پاڵ یەك، (زهیر) دەڵێ: (عاصم) وتی: ئەمە لەنامەکە دابوو، زهیریش هەردوو پەنجەی بەرز کردەوە.

### ( ٥ ) مۆڵەت دان بە پۆشینی ئاوریشم بۆ نەخۆشی

٧١٠ـ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، فِي الْقُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ، مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا أَوْ وَجَعٍ كَانَ بِهِمَا. وفي رواية: شَكَوا الى رسول الله القَمْل. **(البخاري/ الجهاد/ ٢٧٦٢)**

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆڵەتی دا بە (عبدالرحمن) کوڕی (عوف) و، (زبیر) کوڕی (عوام)، بە پۆشینی کراسی ئاوریشم لەسەفەردا، لەبەر خوراندنێ یان ئازارێ کە پێیانەوە بوو لە ڕیوایەتێکدا: لەتاو ئەسپێ سکاڵایان گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

### ( ٦ ) پارچە پارچە کردنی ئاوریشم بۆ سەرپۆش

٧١١ـ عَنْ عَلِيٍّ (بن أبي طالب) (ﷺ): أَنَّ أُكَيْدِرَ دُومَةَ أَهْدَى إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) ثَوْبَ حَرِيرٍ، فَأَعْطَاهُ عَلِيًّا (كرم الله وجهه) فَقَالَ: "شَقِّقْهُ خُمُرًا بَيْنَ الْفَوَاطِمِ". **(البخاري/ الهبة/ ٢٤٧٢)**

(علـي) كـوڕی (أبـو طالـب) (ﷺ) دەڵـێ: فـەرمانڕەوای (دومـة)[2] پۆشـاكێكی ئاوریشمی بەدیاری ناردبوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دای بـە علـي (كرم الله وجهه) فەرمووی: "پارچە پارچەی بكە بۆ سەرپۆش و دابەشی بكە لەنێوان (فاطمة)كاندا"(فاطمەی خێزانیو فاطمەی دایكیو فاطمەی برازنی).

## ( ٧ ) پێچەوانەی جوولەكە و گاوران بن لە ڕەنگكردندا

**٧١٢ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى لَا يَصْبُغُونَ، فَخَالِفُوهُمْ". (البخاري/ الانبياء/ ٣٢٧٥)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "جوولەكـە و گـاوران بۆیـاخ ناكەن ئێوە پێچەوانەی ئەوان بكەن".

**٧١٣–عَنْ قَتَادَةُ قَالَ: قُلْنَا لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَيُّ اللِّبَاسِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ أَوْ: أَعْجَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: الْحِبَرَةُ. (البخاري/ اللباس/ ٥٤٧٥)**

(قتادة) دەڵێ: بە (أنس) كوڕی (مالك)مان (ﷺ) وت: ئایا پێغەمبەری خـوا (ﷺ) حەزی لە چ پۆشاكێك بوو؟ یان: لەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) كام جۆری جل وبـەرگ باشتر بوو؟ وتی: پۆشاكی سەوزی نەخشدار.

## ( ٨ ) ڕاخەری نەرم و نۆڵ

**٧١٤ــ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا تَزَوَّجْتُ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَتَّخَذْتَ أَنْمَاطًا". قُلْتُ: وأَنَّى لَنَا أَنْمَاطٌ؟ قَالَ: "أَمَا إِنَّهَا سَتَكُونُ". قَالَ جَابِرٌ: وعِنْدَ امْرَأَتِي نَمَطٌ، فَأَنَا أَقُولُ: نَحِّيهِ عَنِّي، وتَقُولُ: قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّهَا سَتَكُونُ". (البخاري/ المناقب/ ٣٤٣٢)**

(جابر) (ﷺ) دەڵێ: كاتـێ كـە ژنمهێنـا پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) پێـی فـەرمووم : "ئایا ڕاخەری نەرم و نۆڵت ئامادە كردووە". وتم: ڕاخـەری نـەرممان لـە كـوێ بـوو؟ فەرمووی: "بەڵام لەمەولا پەیدا دەبێـت".جـابر وتـی: خێزانەكـەم ڕاخـەرێكی نـەرمی لابوو، من دەمووت: دووری خەرەوە لـێم، ئـەویش دەیـووت: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمووی: "پەیدا دەبێت".

---

[2] دومة: شارۆچكەیەكە لە نێوان شامو مەدینەدا.

### ( ٩ ) لەسەر پشت ڕاكشان و دانانی قاچێ لەسەر قاچێكی تر دروستە

٧١٥ـ عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ (ﷺ)، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ، واضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى. **(البخاري/ المساجد/ ٤٦٣)**

(عَبَّاد) كوڕی (تميم) لەمامەیەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینیوە كەلەناو مزگەوتدا لەسەر پشت ڕاكشابوو، قاچێكی لەسەر قاچێكی تری دانابوو.(ئەمەش بۆ كاتێكە مرۆڤ شەڕواڵی لەپێدا بێت).

### ( ١٠ ) خوا سەیری كەسێ ناكات كە بۆ فیز كراسەكەی بخشێنێ لە زەوی

٧١٦ـ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (ﷺ) –وَرَأَى رَجُلًا يَجُرُّ إِزَارَهُ، فَجَعَلَ يَضْرِبُ الْأَرْضَ بِرِجْلِهِ، وهُوَ أَمِيرٌ عَلَى الْبَحْرَيْنِ– وهُوَ يَقُولُ: جاء الْأَمِيرُ جاء الْأَمِيرُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى مَنْ يَجُرُّ إِزَارَهُ بَطَرًا". **(البخاري/ اللباس/ ٥٤٥١)**

(محمد) كوڕی (زیاد) دەڵێ: بیستومە لە (أبوهريره) (ﷺ) لەكاتێكدا كە پیاوێكی بینی كراسەكەی بەدوای خۆیدا بە زەویدا ڕادەكێشا بەقاچی پێی دەكوتا بە زەویدا، ئەو كەسە فەرمانڕەوای (بەحرەین) بوو– كە دەیوت: فەرمانڕەواكە هات، فەرمانڕەواكە هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "خوا سەیری كەسێك ناكات كە بۆفیز كراسەكەی بەزەویدا ڕابكێشێ".

### ( ١١ ) ئەو كەسەی بە فیزەوە پۆشاكەكەی دەخشێنێ بە زەویدا

٧١٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثِيَابَهُ مِنَ الْخُيَلَا و لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". **(البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٦٥)**

(عبدالله) كوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەو كەسەی بەفیزەوە پۆشاكەكەی ڕادەكێشێ بە زەویدا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری ناكات".

### ( ١٢ ) سزای هەموو وێنە كێشێ لە ڕۆژی قیامەتدا

٧١٨ـ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي رَجُلٌ أُصَوِّرُ هَذِهِ الصُّوَرَ فَأَفْتِنِي فِيهَا، فَقَالَ لَهُ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: ادْنُ مِنِّي، فَدَنَا حَتَّى وضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ، قَالَ: أُنَبِّئُكَ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)؟ سَمِعْتُ

رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ، يَجْعَلُ لَهُ بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا، فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ". و قَالَ: إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَاصْنَعِ الشَّجَرَ وَمَا لَا نَفْسَ لَهُ. **(البخاري/ البيوع/ ٢١١٢)**

(سعيد) كوڕى (أبو الحسن) دەڵێ: پیاوێك هات بۆلای (أبن عباس) و وتی: من كەسێكم ئەم وێنانە دەكێشم، لەبارەیانەوە فتوایەكم بۆ بدە، (أبن عباس) پێی وت: نزیك بەرەوە لێم، نزیك بوویەوە لێی دیسان وتی: لێم نزیك بەرەوە، نزیك بوویەوە تا (أبن عباس) دەستی خستە سەر سەری، ئینجاوتی: ئاگادارت بكەم بەوەی كە لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە؟ لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەموو وێنە كێشێ لە ئاگردایە، هەموو وێنەیەك كە دەیكێشێ لێی دەكرێتە نەفسێكی زیندوو، ئەو نەفسە سزای دەدات، لە دۆزەخدا". ئینجا (أبن عباس) وتی: ئەگەر تۆ چارت نیە و هەر دەبێ وێنە بكێشیت ئەوا وێنەی درەخت و هەر شتێكی تر كە بێگیانە دروست بكە. (مەبەست ئەو وێنانەیە بۆ تەقدیس و پەرستن دەكێشرێن).

## (١٣) ڕێگریكردن لە ئەنگوستیلەی ئاڵتون وخواردنەوە لە دەفری زیوو پۆشینی ئاوریشم

٧١٩- عَنْ الْبراء بْنِ عَازِبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِسَبْعٍ، ونَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، واتِّبَاعِ الْجَنَازَةِ، وتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وإِبْرَارِ الْقَسَمِ أَوِ الْمُقْسِمِ، ونَصْرِ الْمَظْلُومِ، وإِجَابَةِ الدَّاعِي، وإِفْشَا و السَّلَامِ. ونَهَانَا عَنْ خَوَاتِيمَ -أَوْ: عَنْ تَخَتُّمٍ- بِالذَّهَبِ، وعَنْ شُرْبٍ بِالْفِضَّةِ، وعَنِ الْمَيَاثِرِ، وعَنِ الْقَسِّيِّ، وعَنْ لُبْسِ الْحَرِيرِ، والْإِسْتَبْرَقِ، والدِّيبَاجِ. **(البخاري/ الأشربة/ ٥٣٢١)**

(براء) كوڕی (عازب) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێكردووین كە حەوت شت بكەین و، ڕێگری لێكردووین لە حەوت شت: فەرمانی پێكردووین بە سەردانی نەخۆش، شوێنكەوتنی جەنازە، دۆعای خێر بۆ پژمیو، پشتگیری لە سوێندخۆر تا سوێندی نەكەوێ، یارمەتیدانی ستەملێكراو، چوون بەدەم دەعوەتەوە، بڵاوكردنەوەی سەلام، ڕێگریشی لێكردووین لە ئەنگوستیلەكان -یان ئەنگوستیلەی ئاڵتون كردنە پەنجە[1]، خواردنەوە لە دەفری زیوداو، لەزینی ئاوریشم

---

[1] مەبەست پەنجەی پیاوە

بۆ ولاغی سواری و، لە پۆشاکی کەتان کە تێکەڵ بێت بە ئاوریشم و، لە پۆشینی ئاوریشم، لە (أستبرق) و (دیباج) کە دوو جۆرن لە پۆشاکی ئاوریشمی بەنرخ.

٧٢٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بن عمر (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) اصْطَنَعَ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، فَكَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ فِي بَاطِنِ كَفِّه إِذَا لَبِسَهُ، فَصَنَعَ النَّاسُ، ثُمَّ إِنَّهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَنَزَعَهُ فَقَالَ: "إِنِّي كُنْتُ أَلْبَسُ هَذَا الْخَاتَمَ، وأَجْعَلُ فَصَّهُ مِنْ دَاخِلٍ". فَرَمَى بِهِ، ثُمَّ قَالَ: "وَاللَّهِ لَا أَلْبَسُهُ أَبَدًا". فَنَبَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ. (البخاري/ اللباس/ ٥٥٢٨-٥٥٢٩)

(عبدالله) کوڕی (عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتونی کردە پەنجەی، هەرکاتێ بیکردایەتە پەنجەی یاقوتەکەی دەخستە دیوی لەپی دەستیەوە، خەڵکیش ئەوەیان کرد، دواتر چووە سەر دوانگەکە و دایکەند و فەرمووی: "من پێشتر ئەم ئەنگوستیلەیەم دەکردە پەنجەم و یاقوتەکەیم دەخستە دیوی لەپی دەستمەوە". ئینجا فڕێی داو، فەرمووی: "بەخوا ئیتر هەرگیز نایکەمە پەنجەم". خەڵکیش هەموو ئەنگوستیلەکانیان لابرد لەپەنجەیاندا.

## (١٤) ئەنگوستیلە زیوینەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە (محمد رسول الله)ی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، جێنشینەکانیش دوای خۆی دەیانکردە پەنجەیان

٧٢١ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَاتَمًا مِنْ ورِقٍ، فَكَانَ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنه)، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُمَرَ (رضي الله عنه)، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ (رضي الله عنه)، حَتَّى وقَعَ مِنْهُ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ، نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. (البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٥)

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنگویستیلەیەکی زیوینی هەبوو دەیکردە دەستی پاشان لە دەستی ئەبوبەکردا بوو (رضي الله عنه)، پاشتر لە دەستی عمردا بوو (رضي الله عنه)، دوای ئەویش لە دەستی عثمان دابوو (رضي الله عنه)، تا دواجار کەوتە ناو بیری (أویس)، نوسینی (محمد رسول الله)ی لەسەر هەڵکۆڵرابوو.

٧٢٢ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، ونَقَشَ فيه مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه، وقَالَ لِلنَّاسِ: "إِنِّي اتَّخَذْتُ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، ونَقَشْتُ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، فَلَا يَنْقُشْ أَحَدٌ عَلَى نَقْشِهِ". (البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٧)

(أنـس) كـوڕی (مالـك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ئەنگوسـتیلەیەکی زیـوینی دروستکرد، نەقشی (محمد رسول الله)ی لەسـەر هـەڵکۆڵرابوو، بـە خـەڵکی وت: "مـن ئەنگوستیلەیەکی زیوینم کردووە و، نەقشی (محمد رسول الله)م تێدا هەڵکۆلیوە، با هیچ کەسێ نەقشی لە شێوەی ئەو نەقشە دروست نەکات".

٧٢٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى كِسْرَى وَقَيْصَرَ وَالنَّجَاشِيِّ، فَقِيلَ: إِنَّهُمْ لَا يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلَّا بِخَاتَمٍ، فَصَاغَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَاتَمًا حَلْقَتُهُ فِضَّةٌ، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. **(البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٩)**

(أنس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ویستی نامە بنێرێ بۆ (کیسری) و (قیصر)و (نجاشی)، وترا: ئەوان نامەی مۆرنـەکراو وەرنـاگرن، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)مـۆرێکی دروست کرد کە ئەڵقەکەی زیو بوو، نەقشی (محمد رسول الله)یشی تێدا هەڵکۆڵی.

## ( ١٥ ) ئەنگوستیلەی زیوین

٧٢٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ، فِيهِ فَصٌّ حَبَشِيٌّ، كَانَ يَجْعَلُ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ. **(البخاري/ اللباس/ ٥٥٣٤)**

(أنـس) کـوڕی (مالـك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەنگوسـتیلەیەکی زیوینی کردە پەنجەی دەستی ڕاستی کە یاقوتەکـەی حەبەشـی هـەبوو، یاقوتەکـەی دەخستە دیوی ناو لەپی دەستیەوە.

## ( ١٦ ) لە پێی ڕاستەوە پێڵاو لە پێ دەکرێ، کە داکەنرابا لە پێی

٧٢٥ـعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، وَلْيُنْعِلْهُمَا جَمِيعًا أَوْ لِيَخْلَعْهُمَا جَمِيعًا". **(البخاري/ اللباس/ ٥٥١٧ـ ٥٥١٨)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: "ئەگـەر یـەکێکتان پێڵاوی لەپێکرد با لەپێی ڕاستیەوە دەست پێبکـات، ئەگـەر دایکەنـد بـا لەچـەپەوە دەست پێبکات، هەروەها یاهەردووکیان لەپێ بکات یان هەردووکیان داکەنێت".

## ( ١٧ ) ڕێگری کردن لە لکاندنی قژی ژنێك بە قژی ژنێکی ترەوە

٧٢٦ـ عَنْ اسماء بِنْت أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) قَالَتْ: جاءت امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي ابْنَةً عُرَيِّسًا، أَصَابَتْهَا حَصْبَةٌ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا، أَفَأَصِلُهُ؟ فَقَالَ: "لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ". **(البخاري/ اللباس/ ٥٥٩٧)**

(اسماء)کچی (أبو بکر) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کچێکم هەیە بووکە، توشی سورێژە بوو و قژی هەڵوەریووە ، ئایا قژی تری پێوە ببەستم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "نەفرینی خوا لەو ئافرەتە کە قژ دەلکێنێ و ئەو ئافرەتەش کە قژەکەی بۆ دەلکێنن".

## ( ۱۸ ) هەڕەشەکردن لەو ئافرەتە کەشتێ دەلکێنێ بە قژیەوە

**٧٢٧ـ عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ (ﷺ) عَامَ حَجَّ وهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ –وَتَنَاوَلَ قُصَّةً مِنْ شَعَرٍ كَانَتْ فِي يَدِ حَرَسِيٍّ– يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ أَيْنَ عُلَمَاؤُكُمْ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذِهِ، ويَقُولُ: "إِنَّمَا هَلَكَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ حِينَ اتَّخَذَ هَذِهِ نِسَاؤُهُمْ". (البخاري/ اللباس/ ٥٥٨٨)**

لە(حمید) کوڕی (عبدالرحمن) کوڕی (عوف)ەوە: کە گوێی لە (معاویە) کوڕی (أبوسفیان) بووە (ﷺ) ئەو ساڵەی حەجی کرد لەسەر دوانگەکە وەستابوو –لەوکاتەدا پارچەیەك قژی پێشەوەی سەری لەدەست پاسەوانەکەیی وەرگرت– و دەیوت: ئەی خەڵکی مەدینە زاناکانتان کوان؟ لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستوە کە ڕێگری دەکرد لەم جۆرە شتەو، دەیفەرموو: "بنو إسرائیل کاتێ فەوتان کە ژنەکانیان ئەم جۆرە کارەیان دەکرد".

## ( ۱۹ ) نەفرین کردن لە ئافرەتی خاڵ کوت و ئەو ئافرەتەی ددان باریك دەکەنەوە

**٧٢٨-عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ الْوَاشِمَاتِ والْمُسْتَوْشِمَاتِ، (وَالنَّامِصَاتِ) والْمُتَنَمِّصَاتِ، والْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ. قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ، وكَانَتْ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، فَأَتَتْهُ فَقَالَتْ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكَ، أَنَّكَ لَعَنْتَ الْوَاشِمَاتِ والْمُسْتَوْشِمَاتِ والْمُتَنَمِّصَاتِ والْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ اللَّهِ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: ومَا لِي لَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ (ﷻ)؟ فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ لَقَدْ قَرَأْتُ مَا بَيْنَ لَوْحَيِ الْمُصْحَفِ فَمَاءجَدْتُهُ، فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتِ قَرَأْتِيهِ لَقَدْ وجَدْتِيهِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ ومَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا) (الحشر: ٧). فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: فَإِنِّي أَرَى شَيْئًا مِنْ هَذَا عَلَى امْرَأَتِكَ الْآنَ؟**

قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي، قَالَ: فَدَخَلَتْ عَلَى امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ فَلَمْ تَرَ شَيْئًا، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، فَقَالَ: أَمَا لَوْ كَانَ ذَلِكَ لَمْ نُجَامِعْهَا. **(البخاري/ التفسير/ ٤٦٠٤)**

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: خوانەفرینی کردووە لە ئافرەتی خاڵ کوت و ئەو ئافرەتەی خاڵی بۆ دەکوتێ و ، (مووهەڵگر) موو بۆ هەڵگیراو، هەروەها ئەو ئافرەتەی ددانی شاش دەکات بەمەبەستی جوانکردن، کە دروستکراوی خوا دەگۆڕن، وتی: ئەم هەواڵە گەیشتە ئافرەتێکی (بني أسد) پێی دەوترا دایکی (یعقوب)، ئافرەتێکی قورئان خوێن بوو، هاتە لای (أبن مسعود)و وتی: ئەو قسەیە چییە کە لەتۆوە پێم گەیشتوە، کە تۆ نەفرینت کردووە لەو ئافرەتەی خاڵ دەکوتێ و ئەو ئافرەتەی ددانی خۆی شاش دەکات بۆجوانیی، ئەوانەی کەبەنیازی گۆڕینی دروستکراوی خوا ئەوکارانە دەکەن؟ (عبدالله) وتی: چۆن نەفرین ناکەم لەیەکێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرینی لێکردووە (دیارە لەقورئانیشدا فەرمانکراوە بەگوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)؟ ئافرەتەکە وتی: هەموو ئەوەم خوێندووەتەوە کە لە نێوان هەردوو بەرگی قورئانەکەدایە ئەوەم نەبینیوە، (أبن مسعود) وتی: ئەگەر بت خوێندایەتەوە بێگومان دەتدۆزیەوە، خوای (ﷻ) لەو ئایەتەدا دەفەرمووێ کە ئەمە ماناکەیەتی: (ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەری بگرن و ئەوەش کە لێی قەدەغەی کردوون وازی لێبهێنن". ئینجا ئافرەتەکە وتی: من هەر ئا ئێستە شتێ لەوە دەبینم بە ژنەکەتەوە؟ وتی: بڕۆ سەیر بکە، وتی: چووە لای ژنەکەی (عبدالله)و هیچی نەبینی، (ژنەکە) هاتەوە بۆلای و وتی: هیچم نەبینی، ئینجا (أبن مسعود) وتی: جا ئەگەر وابوایا ئەوا لەگەڵیدا تێکەڵیم نەدەکرد.

## ( ٢٠ ) خۆ هەڵکێشانی کەسێ بە شتێکەوە کە نەیدرابێتێ

٧٢٩ـ عَنْ اسماء (ﷺ) قَالَت: جاءتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَتْ: إِنَّ لِي ضَرَّةً، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ أَتَشَبَّعَ مِنْ مَالِ زَوْجِي بِمَا لَمْ يُعْطِنِي؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ". **(البخاري/ النكاح/ ٤٩٢١)**

(اسماء) (ﷺ) دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەرو (ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) من هەوێیەکم هەیە، ئایا گوناهبار دەبم کە بڵێم مێردەکەم لەسامانی خۆی فڵان شت و فڵان شتی دامێ لەکاتێدا کە نەشیدابێ پێم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئەو کەسەی خۆی هەڵبکێشێ بە ماڵێکەوە کە نەیدرابێتێ وەك ئەو کەسە وایە کە قاتێکی درۆینەی پۆشیبێ".

## ( ٢١ ) پچڕاندنی ملوانكەی ملی ئاژەڵ

٧٣٠- عَنْ أَبي بَشِيرٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (*)فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، قَالَ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) رَسُولًا -قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ- وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ: "لَا يَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلَادَةٌ مِنْ وَتَرٍ -أَوْ قِلَادَةٌ- إِلَّا قُطِعَتْ". قَالَ مَالِكٌ: أُرَى ذَلِكَ مِنَ الْعَيْنِ. **(البخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٣)**

له (أبو بشير الأنصاري)یەوە (ﷺ)" له سەفەرێكیدا كەلە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووه دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نێردراوێكی نارد بۆلای خەڵكەكە، (عبدالله)ی كوڕی (أبوبكر) وتی: گومان وادەبەم كە (أبو بشير) لەشوێنی جێمانەوەی شەویاندا بوون، پێی ڕاگەیاندن كە فەرموویەتی: "با هیچ ملوانكەیەكی دەزوو یان ملوانكە- لەملی حوشترەكاندا نەمێنێ هەموویان بپچڕێنن". مالك دەڵێ: وادەبینم مەبەستی ئەوانە بوو كەوەك چاوەزار كردبوویانە ملیان.

**٧٣١**- عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِرْبَدًا وَهُوَ يَسِمُ غَنَمًا - قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ- فِي آذَانِهَا. **(البخاري/ الذبائح و الصيد/ ٥٢٢٢)**

(أنس) (ﷺ) دەڵێ: چووینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پەچەیەكدابوو مەڕێكی نیشانە دەكرد -وابزانم وتی- لە گوێیدا.

## ( ٢٢ ) نیشانەكردنی پشت بەداخكردنی

٧٣٢- عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: لَماءلَدَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ قَالَتْ لِي: يَا أَنَسُ، انْظُرْ هَذَا الْغُلَامَ فَلَا يُصِيبَنَّ شَيْئًا حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) يُحَنِّكُهُ، قَالَ: فَغَدَوْتُ فَإِذَا هُوَ فِي الْحَائِطِ، وعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ حُرَيْتِيَّةٌ، وهُوَ يَسِمُ الظَّهْرَ الَّذِي قَدِمَ عَلَيْهِ فِي الْفَتْحِ. **(البخاري/ اللباس/ ٥٤٨٦)**

(أنس) (ﷺ) دەڵێ: كاتێ كە (أم سليم) منداڵی بوو پێی وتم: وریای ئەو منداڵە به با هیچ نەخوات هەتا دەیبەیتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا دەمی شیرین بكات. بردم و پێغەمبەر (ﷺ) لەناو باخەكەدا بوو، پۆشاكێكی خەتداری (بني حُريثي) لەبەردابوو، خەریكی نیشانەكردنی پشتی ئەو حوشترەی بوو كە لە ڕزگاركردنی (مەككە)دا بەدیاری بۆی هاتبوو.

# بەشی چلەم: ئادابەکان

## (١) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ناوی من بنێن بەڵام نازناوم هەڵمەگرن"

٧٣٣ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: نَادَى رَجُلٌ رَجُلًا بِالْبَقِيعِ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، إِنَّمَا دَعَوْتُ فُلَانًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تَسَمَّوْا بِاسْمِي ولَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي". **(البخاري/ البيوع/ ٢٠١٥)**

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە بەقیع پیاوێك پیاوێکی تری بانگ کرد: هۆ (أبو قاسم)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوڕی لێدایەوە، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستم تۆ نەبوو، بەڵکو بانگی فلانەکەسم کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بەناوی منەوە ناوبنێن، بەڵام بەنازناومەوە نازناو مەنێن".

## (٢) ناونانی منداڵ بە (عبدالله) و (عبدالرحمن)

٧٣٤ـ عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: ولِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلَامٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقُلْنَا: لَا نَكْنِيكَ أَبَا الْقَاسِمِ ولَا نُنْعِمُكَ عَيْنًا، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: "أَسْمِ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ". **(البخاري/ الأدب/ ٥٨٣٢)**

(جابر) کوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە کوڕێکیان بوو ناوی نا (قاسم) وتمان: ئێمە بە نازناوی (أبو القاسم) بانگت ناکەین و، ناهێڵین دڵت خۆش ببێ بەو نازناوە، پیاوەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوەی بۆ باس کرد، فەرمووی: (کوڕەکەت ناو دەنێم عبدالرحمن).

**٧٣٥**ـ عَنْ عُرْوَةَ بْنُ الزُّبَيْرِ وفَاطِمَةُ بِنْتُ الْمُنْذِرِ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّهُمَا قَالَا: خَرَجَتْ اسماء بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ حِينَ هَاجَرَتْ وهِيَ حُبْلَى بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رضي الله عنه)، فَقَدِمَتْ قباء فَنُفِسَتْ بِعَبْدِ اللَّهِ بِقباء، ثُمَّ خَرَجَتْ حِينَ نُفِسَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لِيُحَنِّكَهُ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْهَا فَوَضَعَهُ فِي حَجْرِهِ، ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ، **(قَالَ)**: قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَكَثْنَا سَاعَةً نَلْتَمِسُهَا قَبْلَ أَنْ نَجِدَهَا، فَمَضَغَهَا ثُمَّ بَصَقَهَا فِي فِيهِ فَإِنَّ أَوَّلَ شيء دَخَلَ بَطْنَهُ لَرِيقُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ قَالَتْ اسماء: ثُمَّ مَسَحَهُ وصَلَّى عَلَيْهِ وسَمَّاهُ عَبْدَ اللَّهِ، ثُمَّ جاء وهُوَ ابْنُ سَبْعِ سِنِينَ أَوْ ثَمَانٍ لِيُبَايِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، وأَمَرَهُ بِذَلِكَ الزُّبَيْرُ (رضي الله عنه)، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُ مُقْبِلًا إِلَيْهِ ثُمَّ بَايَعَهُ. **(البخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٩٧)**

(عروة)ی کوڕی (زبیر) و(فاطمة)ی کچی (منذر)ی کوڕی (زبیر) دەڵێن: کاتێ اسماء کچی أبو بکر کۆچی بۆ (مەدینە)کرد سکی پڕبوو بە (عبدالله) کوڕی (زبیرە)وە (ﷺ) گەیشتە (قباء)و لە (قباء) زەیسان کەوت بە (عبدالله) وە، پاش ئەوە کە عبدالله لەدایك بوو چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی شیرین بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) عبدالله ی لێگرت و خستیە کۆشیەوە، پاشان داوای خورمایەکی کرد، عائشة وتی: ماوەیەك گەڕاین بە دوای دەنکە خورمایەکدا تا دۆزیمانەوە، لەناودەمیدا جووی و پاشان خستیە ناودەمی (عبدالله)وە،یەکەمین شتی کە چووە ناو سکیەوە، ئەو خورمایەی ناودەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بوو، لەپاشاندا (اسماء) وتی: دوای ئەوە پێغەمبەری خوا دەستی پیاهێنا و دۆعای خێری بۆکرد و ناوی نا (عبدالله)، پاشان کەتەمەنی گەیشتە حەوت یان هەشت ساڵ هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تا پەیمانی پێ بدات ، (زبیر)ی باوکی ئەو فەرمانەی پێدابوو (ﷺ) کاتی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی وا بەرەو ڕووی هات زەردەخەنە گرتی و پاشان پەیمانی لێی وەرگرت.

٧٣٦ـ عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): قَالَ كَانَ ابْنٌ لِأَبِي طَلْحَةَ يَشْتَكِي، فَخَرَجَ أَبُو طَلْحَةَ فَقُبِضَ الصَّبِيُّ، فَلَمَّا رَجَعَ أَبُو طَلْحَةَ قَالَ: مَا فَعَلَ ابْنِي؟ قَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ: هُوَ أَسْكَنُ مِمَّا كَانَ فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ الْعَشَا و فَتَعَشَّى، ثُمَّ أَصَابَ مِنْهَا، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَتْ: وارُوا الصَّبِيَّ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَبُو طَلْحَةَ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: "أَعْرَسْتُمُ اللَّيْلَةَ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمَا". فَوَلَدَتْ غُلَامًا، فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: احْمِلْهُ حَتَّى تَأْتِيَ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ)، فَأَتَى بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) وبَعَثَتْ مَعَهُ بِتَمَرَاتٍ فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: "أَمَعَهُ شيء". قَالُوا: نَعَمْ تَمَرَاتٌ، فَأَخَذَهَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَمَضَغَهَا، ثُمَّ أَخَذَهَا مِنْ فِيهِ فَجَعَلَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ، ثُمَّ حَنَّكَهُ وسَمَّاهُ: عَبْدَ اللَّهِ. **(البخاري/ العقيقة/ ٥١٥٣)**

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: کوڕێکی (أبو طلحة) نەخۆش بوو، (أبو طلحة) دەرچوو لەماڵ و کوڕەکەی مرد، کاتێ (أبو طلحة) گەڕایەوە وتی: کوڕەکەم چۆنە؟ (أمُ سَليم) وتی: لەجاران ئارامترە، نانی ئێوارەی بۆداناو نانی خوارد، پاشان نزیکی (أمُ سَليم) کەوت. کاتێ لێبوویەوە ژنەکەی وتی: کوڕەکەت داپۆشە، کاتێ ڕۆژ بوویەوە (أبو طلحة) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هەواڵەکەی پێدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەمشەو تێکەڵیتانکرد؟". وتی: بەڵێ، فەرمووی:

"خوایه فەرپدارو پیرۆزی بکه بۆیان" پاشتر خێزانەکەی کوڕێکی بوو، (أبو طلحة) پێی وتم: هەڵیبگرە هەتا ئەیهێنیتە لای پێغەمبەر (ﷺ)، هێنایە لای پێغەمبەرو (ﷺ) چەند دنکە خورمایەکی لەگەڵ نارد، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵی گرت و فەرمووی: "شتێکی لەگەڵە؟". وتیان: بەڵێ چەند دەنکە خورمایەکی لەگەڵە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خورماکەی هەڵگرت و لەدەمی خۆیدا جووی و پاشان لەدەمی خۆی دەریهێناو خستیە دەمی منداڵەکەوە، پاشان هێنای بەدەم و مەلاشۆی داو، ناوی نا: (عبدالله).

## ( ٣ ) ناونانی منداڵ بە ( ابراهیم )و( منذر )

**٧٣٧ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: ولِدَ لِي غُلَامٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَسَمَّاهُ: إِبْرَاهِيمَ، وحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ. (البخاري/ العقيقة/ ٥١٥٠)**

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: کوڕێکمان بوو، هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش ناوی نا: أبراهیم و بەخورمایەك دەمی شیرین کرد.

**٧٣٨ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: أُتِيَ بِالْمُنْذِرِ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ ولِدَ، فَوَضَعَهُ النَّبِيُّ (ﷺ) عَلَى فَخِذِهِ، وأَبُو أُسَيْدٍ جَالِسٌ، فَلَهِيَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِشَيْءٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَمَرَ أَبُو أُسَيْدٍ بِابْنِهِ، فَاحْتُمِلَ مِنْ عَلَى فَخِذِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَقْلَبُوهُ، فَاسْتَفَاقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: "أَيْنَ الصَّبِيُّ". فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أَقْلَبْنَاهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: "مَا اسْمُهُ". قَالَ: فُلَانٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "لَا، ولَكِنِ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ". فَسَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ: الْمُنْذِرَ. (البخاري/ الأدب/ ٥٨٣٨)**

(سهل) کوڕی (سعد) دەڵێ: کە(منذر)ی کوڕی (أبو أُسید) لەدایکبوو (ﷺ) هێنرا بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) خستیە سەر ڕانی، باوکی أُسیدیش دانیشتبوو، پێغەمبەر (ﷺ) سەرقاڵی شتێك بوو کە لەبەردەستیدا بوو، فەرمانی دابە (أبو أُسَید) کە کوڕەکەی ببات. ئەویش لەسەر ڕانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵیگرت و بردیانەوە بۆ ماڵەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئاگاهاتەوە، فەرمووی: "کوا منداڵەکە؟". (أبو أُسید) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بردمانەوە بۆ ماڵەوە، فەرمووی: "ناوی چییە؟". وتی: فلان ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: (نا، بەڵکو ناوی (منذر)ە". هەر ئەو ڕۆژە ناوی نا (المنذر).

## ( ٤ ) تری ناو بردن بە بەخشندە ( کَرْم )

**٧٣٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِلْعِنَبِ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ". (البخاري/ الأدب/ ٥٨٢٩)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (باکەسێکتان بە ترێ نەڵێ (کَرْم) واتە (بەخشندە)، بەڵکو بە خشندە پیاوی موسڵمانە".

## ( ٥ ) نازناودان بە منداڵ

٧٤٠ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا، وكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ –قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ– **(كَانَ)** فَطِيمًا، قَالَ: فَكَانَ إِذَا جاء رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَرَآهُ قَالَ: "أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ". قَالَ: فَكَانَ يَلْعَبُ بِهِ. **(البخاري/ الأدب/ ٥٨٥٠)**

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاکترین کەس بوو لە ڕەوشتدا، منیش برایەکم هەبوو پێی دەوترا: (أبو عُمیر) وابزانم وتی کە لەشیر براوبوویەوە، وتی: هەر کاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بهاتایا و چاوی پێبکەوتایە یاریو سوعبەتی لەگەڵ ئەکرد، دەیفەرموو: "أبا عُمیر چۆلەکەکە چی لێهات؟"، دەڵێ: چۆلەکەیەك هەبوو یاری پێدەکرد.

## ( ٦ ) نزمترین ناو لای خوا ناوی کەسێکە پێی بوترێ شاهنشاه

٧٤١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ أَخْنَعَ اسْمٍ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الْأَمْلَاكِ". وفِي رِوَايَةٍ: "لَا مَالِكَ إِلَّا اللَّهُ". قَالَ سُفْيَانُ –يعني ابن عيينة– مِثْلُ شَاهَانْ شَاهْ. و قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: سَأَلْتُ أَبَا عَمْرٍو عَنْ "أَخْنَعَ" فَقَالَ: أَوْضَعَ. **(البخاري/ الأدب/ ٥٨٥٣)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "نزمترین ناوێ لای خوا ناوی پیاوێکە کە ناو ببرێ بە شای شاهان". لە ڕیوایەتێکدا: "کەس خاوەن موڵك (پادشا) نیە جگە لەخوا". (سفیان واتە: أبن عيَيْنَة) دەڵێ: وەکو –شاهنشاه– (احمد)ی کوڕی (حنبل) دەڵێ: پرسیارم لە (ابوعمرو) کرد کە(أخنع) مانای چییە؟ وتی: واتە: (نزمترین).

## ( ٧ ) مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان پێنج شتن

٧٤٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "خَمْسٌ تَجِبُ لِلْمُسْلِمِ عَلَى أَخِيهِ: رَدُّ السَّلَامِ، وتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ، وإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، واتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ". **(البخاري/ الجنائز/ ١١٨٣)**

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فـەرمووی: "موسـڵمان پێـنج ئەرکی براکەی لەسەرە: وەڵام دانەوەی سەلام، دۆعای خێر بۆ پژمیو، چوون بـەدەم دەعوەتەوە، سەردانی نەخۆش، شوێن کەوتنی جەنازە".

## ( ٨ ) ڕێگری لە دانیشتنی سەر ڕێگا

٧٤٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا، نَتَحَدَّثُ فِيهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا أَبَيْتُمْ إِلَّا الْمَجْلِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ". قَالُوا: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ: "غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الْأَذَى، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ". **(البخاري/ المظالم/ ٢٣٣٣)**

(أبـو سـعيد الخـدري) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "نەکـەن لەسـەر ڕێگاکان دابنیشن" وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چارەمان نیە و شوێنی دانیشـتنمانە و وتو وێژی تێدا دەکەین؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەگـەر هـەر دەتانـەوێ دانیشن ئەوا مافی ڕێگا بدەن". وتیان: ئەی مافی چییە؟ فـەرمووی: "چاوداخسـتن، ئازارنەدان، وەڵام دانەوەی سەلام، فەرمان کردن بە چاکەو کـاری پەسـەند، ڕێگـری کردن لە خراپەو کاری بێزراو ناشایستە".

## ( ٩ ) دەستوری سەلام کردن

٧٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ". **(البخاري/ الاستئذان/ ٥٨٧٨)**

واتە :(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "سوار سەلام بکات لە پیادە، پیادەش لە دانیشتوو، کەمیش لە زۆر".

## ( ١٠ ) کە لە دەرگا دەدەی مەڵێ منم

٧٤٥-عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: "مَنْ هَذَا". فَقُلْتُ: أَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "أَنَا أَنَا". وفي رواية: كَأَنَّهُ كَرِهَ ذَلِكَ. **(البخاري/ الاستئذان/ ٥٨٩٦)**

(جابر) کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: داوای مۆڵەتم کرد تا بچمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ، فەرمووی: "ئەوە کێیە" منیش وتم: منم، پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بوو ،

فەرمووی: "منم، منم" (مەبەست ئەوەیە ئەبوایە ناوی خۆی بوتایە)، لە ڕیوایەتێکدا: وەك ئەو وەڵامەی منی پێناخۆش بووبێ.

### ( ١١ ) ڕێگریی لە سەرەتاتکێ

**٧٤٦ـ** عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِديَّ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ فِي جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، ومَعَ رَسُول اللَّه (ﷺ) مدْرًى يَحُكُّ بِه رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَآهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْتَظِرُنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ". وقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ". **(البخاري/ الديات/ ٦٥٠٥)**

(سهل) كوڕی (سعد الساعدي) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك لە كونی دەرگای ماڵی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) دەیڕوانیە ژوورەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاسنێكی شێوە شانەی پێبوو سەری خۆی پێدەخوراند، هەر كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی پێیكەوت فەرمووی: "ئەگەر بمزانیایە سەیرم دەكەیت ئابەمە لە چاوتم دەدا". پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "مۆڵەت خواستن بۆ ئەوە دانراوە تا چاو داخەیت و عەیب و عاری خەڵكی نەبینی".

### ( ١٢ ) كەسێ بڕوانێتە ماڵی خەڵكی بەبێ مۆڵەت

**٧٤٧ـ** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَوْ أَنَّ رَجُلًا اطَّلَعَ عَلَيْكَ بِغَيْرِ إِذْنٍ فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ مِنْ جُنَاحٍ". **(البخاري/ الديات/ ٦٤٩٣)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر بەبێ مۆڵەتی خۆت پیاوێك سەیری ماڵەكەتی كرد، تۆیش بەردێكت تێگرت و چاوت تەقاند، گوناهبار نابیت".

### ( ١٣ ) ئەو كەسەی دەچێتە كۆڕی دانیشتن با سەلام بكات و دابنیشێ

**٧٤٨ـ** عَنْ أَبِي واقدٍ اللَّيْثِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ والنَّاسُ مَعَهُ إِذْ أَقْبَلَ نَفَرٌ ثَلَاثَةٌ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُول اللَّه (ﷺ) وذَهَبَ واحدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُول اللَّه (ﷺ)، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَة فَجَلَسَ فِيهَا، وأَمَّا الْآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهَمْ، وأَمَّا الثَّالثُ فَأَدْبَرَ ذَاهبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "أَلَا أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلَاثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّه فَآوَاهُ اللَّهُ، وأَمَّا الْآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وأَمَّا الْآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ". **(البخاري/ العلم/ ٦٦)**

(أبو واقد الليثي) (﵁) دەڵێ: لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوت دانیشتبوو خەڵکیش لە خزمەتیدا بوون، لەکتوپڕدا سێ کەس هاتن، دووانیان ڕوویان کردە پێغەمبەری خواو (ﷺ) یەکێکیان ڕۆیشت، بەبەردەم پێغەمبەری خوادا (ﷺ) وەستان، یەکێکیان بۆشاییەکی لە ئەڵقەی کۆڕەکەدا بینی و تیایدا دانیشت، ئەوی دیکەیان لەدوایانەوە دانیشت، بەڵام سێیەمیان پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت، کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێبوویەوە فەرمووی: "هەواڵی ئەو سێ کەسەتان نەدەمێ؟ یەکێکیان پەنای هێنا بەخوا، خوایش جێگەی کردەوە، ئەوی تریان شەرمی کرد خوای گەورە مەعزەرەتی قبوڵ کرد، بەڵام سێیەمینیان پشتی هەڵکرد و خوایش پشتی لەو هەڵکرد".

## ( ١٤ ) ڕێگریی لە هەستاندنی کەسێ لەمەجلیسا بۆئەوەی خۆی دابنیشێ

٧٤٩ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ الرَّجُلَ مِنْ مَقْعَدِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، ولَكِنْ تَفَسَّحُوا وتوسعوا". وفي رواية: قُلْتُ: فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَغَيْرِهَا. وكان ابن عمر إذا قام له رجل عن مجلسه لم يجلس فيه. **(البخاري/ الجمعة/ ٨٦٩)**

(أبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "باکەس کەسێکی تر هەڵنەستێنێ و خۆی لەجێگەکەیدا دابنیشێ، بەڵکو بڵاوە بکەن و جێی یەکتر بکەنەوە، جا ئەگەر کەسێ لە شوێنەکەی خۆی هەستابایەو چۆڵی بکردایە بۆ (أبن عمر)، (أبن عمر) لە جێگەی ئەو کەسەدا دانەدەنیشت.

## ( ١٥ ) ڕێگریی لەچپەکردنی دووکەس

٧٥٠ـعن عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود(ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ". **(البخاري/ الأستئذان/ ٥٩٣٢)**

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون ، با دوانتان نەکەونە چپەکردن جیا لەویتر، هەتا تێکەڵ دەبن بەخەڵکانیتر، چونکە ئەوکەسە دڵگران دەبێت".

## ( ١٦ ) سەلامکردن لە منداڵان

٧٥١ـ عَنْ سَيَّارٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وحَدَّثَ ثَابِتٌ: أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ أَنَسٍ فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وحَدَّثَ أَنَسٌ: أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. **(البخاري/ الأستئذان/ ٥٨٩٣)**

(سیّار) دەڵـێ: لەگـەڵ (ثابـت البنـاني)دا دەڕۆیشـتم بەڕێگـەدا —تێپـەڕی بـەلای چەند منداڵێکدا و سەلامی لێکردن، (ثابت) گێڕایەوە: کە لەگەڵ (أنس) دا دەڕۆیشت، تێپەڕی بەلای چەند منداڵێکدا و سەلامی لێکردن، (أنس)یش گێڕایەوە کەلە خزمەتی پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) دەڕۆیشـت، تێپـەڕی بـەلای چـەند منداڵێـکدا و سـەلامی لێکردن.

## ( ١٧ ) ڕێگریی لە چوونە دەرەوەی ئافرەتـان

٧٥٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ أَزْوَاجَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ، وهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ، وكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) يَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ): احْجُبْ نِساءكَ، فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَفْعَلُ، فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ —زَوْجُ النَّبِيِّ (ﷺ)— لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَا و، وكَانَت امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ (رضي الله عنه): أَلَا قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يُنْزَلَ الْحِجَابُ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ الْحِجَابَ. **(البخاري/ الوضوء/ ١٤٦)**

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەشەودا دەچوونە دەرەوە بۆ چـوونە سـەرئاو، کـە دەشـتێکی فـراوان بـوو، (عمـر) کـوڕی (خطـاب) (رضي الله عنه) بـە پێغەمبـەری خـوای (ﷺ) دەوت: بـا خێزانـەکانت دەرنەکـەون بـۆ خـەڵك، پێشـتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی نەدەکرد، شەوێك لەشەوان لەکاتی عیشـادا (سـودە)ی کچـی (زمعـة) ــ خێزانـی پێغەمبـەر (ﷺ) ــ کـە ئـافرەتێکی بالآبـەرز بـوو ڕۆیشـتە دەرەوە، (عمـر) (رضي الله عنه) بـانگی کـرد، ئـەی (سـودة) ئاگاداربـە دەتناسـین (عمـر) بـە پەرۆشەوە بوو کە ئایەتی حیجاب دابەزێ، عائشە وتی: خـوا (جل جلاله) ئایـەتی حیجـابی دابەزاند.

## ( ١٨ ) مۆڵەت بەچوونە دەرەوەی ئافرەتـان

٧٥٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: خَرَجَتْ سَوْدَةُ (رضي الله عنها) بَعْدَ مَا ضُرِبَ عَلَيْهَا الْحِجَابُ لِتَقْضِيَ حَاجَتَهَا، وكَانَت امْرَأَةً جَسِيمَةً تَفْرَعُ النساء جِسْمًا، لَا تَخْفَى عَلَى مَنْ يَعْرِفُهَا، فَرَآهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) فَقَالَ: يَا سَوْدَةُ، واللَّهِ مَا تَخْفَيْنَ عَلَيْنَا فَانْظُرِي كَيْفَ تَخْرُجِينَ. قَالَتْ: فَانْكَفَأَتْ رَاجِعَةً، ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَيْتِي وإِنَّهُ لَيَتَعَشَّى وفِي يَدِهِ عَرْقٌ، فَدَخَلَتْ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي خَرَجْتُ، فَقَالَ لِي عُمَرُ: كَذَا وكَذَا. قَالَتْ: فَأُوحِيَ إِلَيْهِ، ثُمَّ رُفِعَ عَنْهُ وإِنَّ الْعَرْقَ فِي يَدِهِ ماءضَعَهُ، فَقَالَ: "إِنَّهُ قَدْ أُذِنَ لَكُنَّ أَنْ تَخْرُجْنَ لِحَاجَتِكُنَّ". **(البخاري/ التفسير/ ٤٥١٧)**

(عائشة) (ﷺ) دەڵێ: لەپاش ئەوەی کە حیجاب لەسەرمان فەرز کرا (سودة) چووە دەرەوە بۆ چوونە سەرئاو، ئافرەتێکی قایم و قۆڵ و باڵا بەرز بوو، لەناو ئافرەتەکاندا دیاربوو، نەدەشاردرایەوە لە کەسێ کە بیناسیایە، (عمر) کوڕی (خطاب) (ﷺ) بینیو وتی: ئەی (سودة)، بەخوا لێمان ون نابیت جا ئیتر بزانە چۆن دەچیتە دەرەوە، ئەویش گەڕایەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵی مندابوو نانی ئێوارەی خوارد و ئێسقانێکی بەدەستەوە بوو، (سودة) هاتە ژوورەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من چوومە دەرەوە، (عمر) ئەوە و ئەوەی پێوتم، (عائشة) دەڵێ: وەحی هات بۆ پێغەمبەر، پاشان تەواو بوو، هێشتا ئێسقانەکە بەدەستیەوە بوو داینەنابوو ئینجا فەرمووی: "ئێوە ژنان مۆڵەتتان پێدراوە کە بۆ پێویستیەکانتان بچنە دەرەوە".

## (١٩) لەدواوە سوارکردنی ئافرەتی مەحرەم لە سواریدا

٧٥٤_ عَنْ اسماء بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِي الزُّبَيْرُ، ومَا لَهُ فِي الْأَرْضِ مِنْ مَالٍ ولَا مَمْلُوكٍ ولَا شيء غَيْرَ فَرَسِهاأَعْلفُ فَرَسَهُ وأَكْفيه مَئُونَتَهُ وأَسُوسُهُ، وأَدُقُّ النَّوَى لنَاضحه، وأَعْلفُهُ، وأَسْتَقِي الماء وأَخْرُزُ غَرْبَهُ وأَعْجنُ، ولَمْ أَكُنْ أُحْسنُ أَخْبِزُ، وكَانَ يَخْبِزُ لِي جَارَاتٌ منَ الْأَنْصَارِ، وكُنَّ نسْوَةَ صدْقٍ، قَالَتْ: وكُنْتُ أَنْقُلُ النَّوَى منْ أَرْضِ الزُّبَيْرِ الَّتِي أَقْطَعَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلَى رَأْسِي، وهِيَ عَلَى ثُلُثَيْ فَرْسَخٍ، قَالَتْ: فَجِئْتُ يَوْماءالنَّوَى عَلَى رَأْسِي، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) ومَعَهُ نَفَرٌ منْ أَصْحَابِه، فَدَعَانِي ثُمَّ قَالَ: "إِخْ إِخْ" لِيَحْملَنِي خَلْفَهُ، قَالَتْ: فَاسْتَحْيَيْتُ وعَرَفْتُ غَيْرَتَكَ، فَقَالَ: واللَّه لَحَمْلُك النَّوَى عَلَى رَأْسك أَشَدُّ منْ رُكُوبك مَعَهُ. قَالَتْ: حَتَّى أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) بَعْدَ ذَلِكَ بِخَادِمٍ، فَكَفَتْنِي سِيَاسَةَ الْفَرَسِ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَتْنِي. **(البخاري/ النكاح/ ٤٩٢٦)**

(اسماء) کچی (أبو بکر) (ﷺ) دەڵێ: (زبیر) گواستمیەوە و، لەم سەرزەویەدا نە سامان و نە کارگوزار و نە هیچ شتێکی تری نەبوو جگە لە ئەسپەکەی، دەڵێ: ئالفم دەدا بە ئەسپەکەی و پێداویستیم دابین دەکرد و ئەسپەکەیم پاك دەکردەوە و ڕامم دەکرد، ناوکە خورمام دەکوتا بۆ حوشترەکەی کە سواری دەبوو و ئاوی پێڕادەکێشا، ئالفم دەدا و ئاوم دەهێنا و دۆڵچەکەم دەدوریەوە و هەویرم دەشێلا، بەلام نەمدەزانی باش نان بکەم، چەند ئافرەتێکی دراوسێم لە یارمەتیدەران نانیان بۆ دەکردم، بەڕاستی ئافرەت بوون، دەڵێ: لە زەویەکەی زوبێرەوە کە پێغەمبەری

خوا (ﷺ) بۆی دابڕیبوو ناوکە خورمام لەسەر سەر دەگواستەوە کەدوو لەسەرسێی قۆناغێك دوور بوو، ڕۆژێکیان دەگەڕامەوە ناوکە خورما لەسەر سەرم بوو، گەیشتم بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە چەند هاوەڵێك لە خزمەتیدا بوون، بانگی کردم و پاشان فەرمووی: "ئیخ ئیخ" بۆ ئەوەی حوشترەکە دانەوێت و لەدوای خۆیەوە هەڵم بگرێ، دەڵێ: خۆم شەرمم کرد و غیرەتی تۆشم دەزانی، (زبیر) وتی: بەخوا هەڵگرتنی ئەو ناوکە خورمایانە لەسەر سەرت لەلام قورسترە تا سواربوونت لەدوای پێغەمبەرەوە (ﷺ)، (اسماء) وتی: لە دوای ئەوەوە (أبو بکر) (رضي الله عنه) خزمەتکارێکی بۆ ناردم، بوو بەهۆی ئەوەی ڕزگارم ببێ لە بەخێوکردنی ئەسپەکە، وەك ئەوەی کە ئازادی کردبم لە کۆیلەیەتی.

## ( ٢٠ ) کەسێ ئافرەتی لەگەڵدابێ و بەلای خەڵکدا تێپەڕببێ با ناوی ئافرەتەکە بڵێ

٧٥٥ـ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) مُعْتَكِفًا، فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلًا، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ لِأَنْقَلِبَ فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي -وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه)- فَمَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ (ﷺ) أَسْرَعَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ". فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: "إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الْإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَرًّا". أَوْ قَالَ: "شيئًا". **(بخاري/ الاعتكاف/ ١٩٣٠)**

(صفية) کچی (حُيَيٍّ) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە (أعتكاف)دا بوو، شەوێك هاتمە خزمەتی و سەردانم کرد و، لەگەڵیدا دوام، پاشان هەستام بگەڕێمەوە ئەویش لەگەڵمدا هەستا ڕەوانەم بکات -ماڵی (صفية) لە ماڵی (أسامة) کوڕی (زيد) بوو (رضي الله عنه)- دوو پیاوی (أنصار)ی تێپەڕین، هەر کە پێغەمبەریان (ﷺ) بینی پەلەیان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لەسەر خۆتان، ئەوە (صفية)ی کچی (حُيَی) ئەوانیش وتیان: سبحان الله ئەی پێغەمبەری خوا! (جەنابت جێی گومان بیت) فەرمووی: "لەڕاستیدا شەیتان وەك خوێن بەلەشتاندا دەگەڕێ، منیش ترسام لەوە کەگومانێکی خراپ بخاتە دڵەکانتانەوە".

## ( ٢١ ) ڕێگریی کردن لەمانەوەی پیاو لای ئافرەتی نامەحرەم

٧٥٦ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النساء". فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الْحَمْوَ؟ قَالَ: "الْحَمْوُ

الْمَوْتُ". قَالَ اللَّيْثَ بْنَ سَعْدٍ: يَقُولُا الْحَمْوُ أَخُ الزَّوْجِ ومَا أَشْبَهَهُ مِنْ أَقَارِبِ الزَّوْجِ، ابْنُ الْعَمِّ ونَحْوُهُ. (بخاري/ النكاح/ ٤٩٣٤)

(عقبه)ی كوڕی (عامر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "وریا بن تەنیا مەكەون لەگەڵ ئافرەتدا". پیاوێك لە یارمەتیدەران وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر شوو برا یان خزمی مێردەكەی بوو؟ فەرمووی "شووبرا مردنە" (واتە: لەبەرئەوە تێكەڵی زیاترە ئەبێ زیاتر خۆی لەتێكەڵی بپارێزێ).

## ( ٢٢ ) كوژاندنەوەی ئاگر كاتی خەوتن

٧٥٧ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ بِالْمَدِينَةِ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا حُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِشَأْنِهِمْ، قَالَ: "إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ". (بخاري/ الاستئذان/ ٥٩٣٦)

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: شەوێك لە مەدینە ماڵێك سوتا بە سەرخەڵكەكەیدا، كاتێ لە بارەیانەوە هەواڵ درا بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بەڕاستی ئەم ئاگرە دوژمنتانە، هەر كاتێ خەوتن لە خۆتانی بكوژێننەوە".

# بەشی چل و یەکەم: نوشتە و دوعا (كتاب الرُّقى)

## (١) جادوکردنی جولەکە لە پێغەمبەر (ﷺ)

٧٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُود بَنِي زُرَيْق، يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَم، قَالَتْ: حَتَّى كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشيء ومَا يَفْعَلُهُ، حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ -أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ- دعَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، ثُمَّ دَعَا ثُمَّ دعَا، ثُمَّ قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْت أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيه؟ جاءني رَجُلَان، فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي والْآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذي عِنْدَ رِجْلَيَّ، أو الَّذي عِنْدَ رِجْلَيَّ لِلَّذي عِنْدَ رَأْسِي: ماءجَعُ الرَّجُل؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَ: فِي أَيِّ شيء؟ قَالَ فِي مُشْطٍ ومُشَاطَةٍ قَالَ وجُفِّ طَلْعَة ذَكَر، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْر ذِي أَرْوَانَ". قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِه، ثُمَّ قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، واللَّه لَكَأَنَّ ماءهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّا و، ولَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُوسُ الشَّيَاطِين". قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَفَلَا أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: "لَا، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ، وكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَى النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ". (بخاري/ الطب/ ٥٤٣٠)

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: جولەکەیەك لە جولەکەکانی (بني زريق) کە پێی دەوترا (لبيد بن الاعصم) جادویکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) هەتا پێغەمبەر (ﷺ) وادەهات بە خەیاڵیدا کەشتێکی کردووە نەیشی کردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك- پێغەمبەر (ﷺ) پاڕایەوە، هەر پاڕایەوە هەرپاڕایەوە، پاش ئەوە فەرمووی: "ئەی عائشة ئایاهەستت کرد خوا ئاگاداری کردم لەوشتەی داوام لێکرد ئاگادارم کات؟ دوپیاو هاتن بۆ لام یەکێکیان لای سەرم و ئەوی تریان لای قاچم دانیشت، ئەمەی لای سەرم بەوەی لای قاچم یان ئەوەی لای قاچم بەوەی لای سەرمی وت: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ وتی: جادوی لێکراوە، وتی: کێ جادوی لێکردووە؟ وتی: (لبيد)ی کوڕی (أعصم) وتی: لە چ شتێکدا؟ وتی: لەشانەیەك و چەند تاڵێك موو کەبەدەم شانەکردنی سەر، یان ڕیشەوە دەکەونە خوارەوەلەناو قاوغی گوڵی دارخورمایەکی نێردا، وتی: وا لەکوێدا؟ وتی: وا لەناو بیری (ذي أروان)دا".

عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانیدا چوو بۆ لای ئەو بیرە، لەپاشدا فەرمووی: "ئەی عائشە سوێند بەخوا ئاوی ئەو بیرە وەك خەنەی

تێکرابێ وەهابوو، دارخورماکانیشی وەك سەری شەیتانەکان بوون" عائشة دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نەتسوتاند؟! فەرمووی: "نەخێر، چونکە من خوا شیفای دام، پێیشم ناخۆش بوو شەڕ بئاڵۆزێنم بۆ خەڵکی، فەرمانمدا لەبیرەکە دەریان هێنا و خستیانە ژێر گڵەوە".

## ( ٢ ) خوێندنی ( قل أعوذ )وەکان بەسەر نەخۆشدا

**٧٥٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا مَرِضَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِه نَفَثَ عَلَيْهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ، فَلَمَّا مَرِضَ مَرَضَهُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ جَعَلْتُ أَنْفُثُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُهُ بِيَدِ نَفْسِه، لِأَنَّهَا كَانَتْ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْ يَدِي. (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٨)**

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: ئەگەر یەکێ لەکەسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) نەخۆش بکەوتایە (قل أعوذ)وەکانی بەسەردا دەخوێند و فوی دەکرد بەسەریدا، کاتێ خۆی نەخۆشکەوت لەنەخۆشینی وەفاتیدا، من فوم دەکرد بەسەریدا و بەدەستی خۆی ڕومەتیم دەماڵی لەبەر ئەوەی دەستی ئەو لەدەستی من پیرۆز تر بوو.

## ( ٣ ) نوشتەی گەزراو

**٧٦٠ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه): أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) كَانُوا فِي سَفَرٍ، فَمَرُّوا بِحَيٍّ مِنْ أَحْيَا و الْعَرَبِ، فَاسْتَضَافُوهُمْ فَلَمْ يُضِيفُوهُمْ، فَقَالُوا لَهُمْ: هَلْ فِيكُمْ رَاقٍ؟ فَإِنَّ سَيِّدَ الْحَيِّ لَدِيغٌ، أَوْ مُصَابٌ؟ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: نَعَمْ، فَأَتَاهُ فَرَقَاهُ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَبَرَأَ الرَّجُلُ، فَأُعْطِيَ قَطِيعًا مِنْ غَنَمٍ، فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَهَا، وقَالَ: حَتَّى أَذْكُرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (ﷺ)، فَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، واللَّه مَا رَقَيْتُ إِلَّا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. فَتَبَسَّمَ وقَالَ: "وَمَا أَدْرَاكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ". ثُمَّ قَالَ: "خُذُوا مِنْهُمْ، واضْرِبُوا لِي بِسَهْمٍ مَعَكُمْ". (بخاري/ الإجارة/ ٢١٥٦)**

لە (أبي سعيد الخدري)ەوە (رضي الله عنه)، کە چەند کەسێك لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێکدا بوون تیپەڕین بەلای خێڵێك لە خێڵەکانی عەرەب، داوای میواندایان لێکردن، بەمیوان وەریان نەگرتن، وتیان کەستان تیایە دوعاخوێن بێت؟ چونکە گەورەی خێڵ گەزراوە، یان نەخۆشە، پیاوێکیان وتی: بەڵێ، ڕۆیشت بۆ لای سورەتی فاتیحەی بەسەردا خوێند، پیاوەکە چاك بوویەوە، مێگەلێکیان پێبەخشی، وەری نەگرت وتی: دەبێ بچم پرس بە پێغەمبەر (ﷺ) بکەم، ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێڕایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تەنها سورەتی فاتیحەم

بەسەردا خوێندوە، پێغەمبەر (ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "چۆن زانیت فاتیحە نوشتەیە؟" پاشان فەرمووی: "برۆن لێیان وەرگرن بەشێکیش بۆمن دانێن".

### ( ٤ ) نوشتە لەهەموو گیان لەبەرێکی ژەهراوی

٧٦١- عَنْ الْأَسْوَدِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنِ الرُّقْيَةِ؟ فَقَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي الرُّقْيَةِ مِنْ كُلِّ ذِي حُمَةٍ. **(بخاري/ الطب/ ٥٤٠٩)**

(أسود)دەڵێ: پرسیارم کرد لە (عائشة) سەبارەت بەنوشتە، فەرمووی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگەی داوە بە بنەماڵەیەکی (أنصار) نوشتە بکەن لە هەموو گیاندارێکی ژەهراوی.

### ( ٥ ) نوشتە لە چاوی پیس

٧٦٢- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَأْمُرُنِي أَنْ أَسْتَرْقِيَ مِنَ الْعَيْنِ. **(بخاري/ الطب/ ٥٤٠٦)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێدەکردم نوشتە بکەم لەچاوی پیس.(نوشتە دەبێ یا ئایەتی قورئان بێت یان فەرموودەی پێغەمبەر)

### ( ٦ ) نوشتەی تێڕوانینی جنۆکە

٧٦٣- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ لِجَارِيَةٍ فِي بَيْتِ أُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ)، رَأَى بِوَجْهِهَا سَفْعَةً، فَقَالَ: "بِهَا نَظْرَةٌ، فَاسْتَرْقُوا لَهَا". يَعْنِي بِوَجْهِهَا صُفْرَةً. **(بخاري/ الطب/ ٥٤٠٧)**

(أم سلمة)(ﷺ)ی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) کەنیزەکێکی بینی لە ماڵی (أم سلمة)دا ڕوومەتی زەرد هەڵگەڕابوو فەرمووی: "ئەم کەنیزەکە جنۆکە تێیڕوانیووە نوشتە و دوعای بەسەردا بخوێنن".

### ( ٧ ) نوشتەکردن بەگڵی زەوی

٧٦٤-عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ إِذَا اشْتَكَى الْإِنْسَانُ الشيء مِنْهُ، أَوْ كَانَتْ بِهِ قَرْحَةٌ أَوْ جُرْحٌ، قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) بِإِصْبَعِهِ هَكَذَا -وَوَضَعَ سُفْيَانُ سَبَّابَتَهُ بِالْأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَهَا-: "بِاسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى بِهِ سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا". قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: "يُشْفَى سقيمنا" و قَالَ زُهَيْرٌ: "لِيُشْفَى سَقِيمُنَا". **(بخاري/ الطب/ ٥٤١٣)**

له (عائشة)وه (ﷺ) دهگێڕنهوه که پێغهمبهری خوا (ﷺ) ئهگهر یهکێك شوێنێکی ئازاری ببوایه، یان برینێکی پێوهبوایه، پێغهمبهر (ﷺ) پهنجهی شایهتمانی دهخسته سهر ئهرزهکه، نهوهوی لهشهرحهکهیدا دهڵێ: له پێشدا تۆزێ تفی ئهدا له پهنجهی، ئهمجا دهیفهرموو: "بهناوی خواوه خۆڵی زهویهکهمان لهگهڵ کهمێك تفی ههندێکمان بۆ ئهوهی ببێت به شیفای نهخۆشهکه به فهرمانی خوا".

**٧٦٥**-عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا اشْتَكَى مِنَّا إِنْسَانٌ مَسَحَهُ بِيَمِينِهِ ثُمَّ قَالَ: "أَذْهِبِ الْبَا وسَ رَبَّ النَّاسِ، واشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَا و إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَا و لَا يُغَادِرُ سَقَمًا". فَلَمَّا مَرِضَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وثَقُلَ أَخَذْتُ بِيَدِهِ لِأَصْنَعَ بِهِ نَحْوَ مَا كَانَ يَصْنَعُ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ مِنْ يَدِي، ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، واجْعَلْنِي مَعَ الرَّفِيقِ الْأَعْلَى". قَالَتْ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ، فَإِذَا هُوَ قَدْ قَضَى. **(بخاري/ الطب/ ٥٤١١)**

(عائشة)دهڵێ: ئهگهریهکێ له ئێمه ئازاری ببوایه پێغهمبهر (ﷺ) دهستی ڕاستی دههێنا بهسهر ئازارهکهیدا و دهیفهرموو: "ئهم ئازاره لابهره ئهی پهروهردگاری ئادهمیزاد! ، شیفای بده تۆ شیفا بهخشی شیفانیه جگه له شیفای تۆ شیفایهك نهخۆشی جێنههێڵێت". لهکاتێکدا پێغهمبهر (ﷺ) نهخۆش کهوت و دهردهکهی گران بوو، دهستیم گرت بۆ ئهوهی بهدهستی خۆی وهك خۆی بکهم، دهستی ڕاپسکان له دهستم، لهپاشدا فهرمووی: "خوایه لێم ببوره و بمگهێنه به بهرزترین هاوهڵ"، عائشه دهڵێ: تهماشام کرد، گیانی سپاردبوو.

# بەشی چل‌و دووەم: نەخۆشی و پزیشکی (كتاب المرض و الطب)

## (١) ئەوەی توشی موسڵمان دێت لە نەخۆشی و ئازار

٧٦٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (ﷺ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ يُوعَكُ، فَمَسِسْتُهُ بِيَدِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ لَتُوعَكُ وعْكًا شَدِيدًا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَجَلْ، إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلَانِ مِنْكُمْ". قَالَ: فَقُلْتُ: ذَلِكَ أَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَجَلْ". ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، مِنْ مَرَضٍ فَمَا سِوَاهُ، إِلَّا حَطَّ اللَّهُ بِهِ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ ورَقَهَا". (بخاري/ المرضى/ ٥٣٢٤)

(عبدالله)ی كوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: چومە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تاوئازاری هەبوو بەدەستی خۆم دەستم لێدا، وتم: یا رسول الله تۆ تایەكی سەختت هەیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڵێ من تام لێدێ بە ئەندازەی دوو پیاو لە ئێوە". وتم: ئەمە لەبەر ئەوەی دوو پاداشتت هەبێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڵێ" لەپاشدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هیچ موسڵمانێك نیە كە توشی ئازارێك بێت لە نەخۆشی یان غەیری نەخۆشی ئیللا خوای گەورە تاوانەكانی پێدەوەرێنێ وەك چۆن دار، گەڵا ڕێزان دەكات".

## (٢) مەڵێ دەرونم پیس بووە

٧٦٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي، ولَكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي". (بخاري/ الأدب/ ٥٨٢٥)

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هیچ كەسێ لەئێوە نەڵێت: دەروونم پیسبووە، بەڵكو بڵێت دەروونم بێزاربووە".

## (٣) تا، لە كلپ و كۆی دۆزەخە بە ئاو ساردی كەنەوە

٧٦٨ـ عَنْ اسماء (ﷺ): أَنَّهَا كَانَتْ تُؤْتَى بِالْمَرْأَةِ الْمَوْعُوكَةِ، فَتَدْعُو بالماء فَتَصُبُّهُ فِي جَيْبِهَا، وتَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "ابْرُدُوهَا بِالماء". وقَالَ: "إِنَّهَا مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ". (بخاري/ الطب/ ٥٣٩٢)

له (اسماء)ەوە (ﷺ) هەرکات ئافرەتی تاداریان دەهێنا بۆ لای ئاوی دەپرژاند بەیەخەی کراسەکەیدا و دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بەئاو ساردی کەنەوە، بەڕاستی (تا) لە کلّپ و کۆی دۆزەخە".

## ( ٤ ) فێ و پاداشتەکەی

**٧٦٩ـ عَنْ عطاء بْنُ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَلَا أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَا و، أَتَت النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللَّهَ لِي. قَالَ: "إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ ولَكِ الْجَنَّةُ، وإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ". قَالَتْ: أَصْبِرُ، قَالَتْ: فَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللَّهَ أَنْ لَا أَتَكَشَّفَ فَدَعَا لَهَا. (بخاري/ المرضى/ ٥٣٢٨)**

(عطاء)ی کوڕی (أبی رباح) دەڵێ: (أبن عباس) (ﷺ) پێی وتم: ئایا ئافرەتێکی بەهەشتیت نیشان بدەم؟ وتم: بەڵێ وتی: ئەو ئافرەتە ڕەش پێستە، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: من فێ دەمگرێ و خۆم دەردەخەم بۆم بپاڕێرەوە، فەرمووی: "ئەگەر دەتەوێت صەبرت هەبێت بەهەشتی دەبیت، وە ئەگەر دەشتەوێت بۆت دەپاڕێمەوە لە خوای بەرز و بڵند شیفات بدات" وتی: صەبر دەگرم، بەس خۆم دەردەخەم بۆم بپاڕێرەوە گیانم دەرنەخەم، بۆی پاڕایەوە".

## ( ٥ ) شیرەوا[1] غەمرەوێنە بۆ دڵی نەخۆش

**٧٧٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهَا كَانَتْ إِذَا مَاتَ الْمَيِّتُ مِنْ أَهْلِهَا، فَاجْتَمَعَ لِذَلِكَ النساء ثُمَّ تَفَرَّقْنَ إِلَّا أَهْلَهَا وخَاصَّتَهَا، أَمَرَتْ بِبُرْمَةٍ مِنْ تَلْبِينَةٍ فَطُبِخَتْ، ثُمَّ صُنِعَ ثَرِيدٌ فَصُبَّتِ التَّلْبِينَةُ عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: كُلْنَ مِنْهَا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "التَّلْبِينَةُ مُجِمَّةٌ لِفُؤَادِ الْمَرِيضِ، تُذْهِبُ بَعْضَ الْحُزْنِ". (بخاري/ الأطعمة/ ٥١٠١)**

لە (عائشة)(ﷺ)ی خێزانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە هەرکات یەکێ لەکەسەکانی بمردایە، ئافرەتان لێی کۆدەبوونەوە دوایی بڵاوەیان دەکرد جگە لەکەسە

---

[1] (تلبینة)م بە شیرەوا مانا کرد چونکە لەماناکەیدا دەڵێن: شۆرربایەکە دروست دەکرێت لە ئارد یان سوس تێکلاو دەکرێ بەشیرو هەنگوین، بۆیە وەها ناونراوە چونکە سپیەو ڕوونەوەك شیر: إرشاد الساری، ب٩: ٤٧، لسان العرب: (لَبَن) دەگونجێ (شیرەواو پیرخەنیلە)ی کوردەواریش لەمەوە دروست بوبێت.

تايبەتەكانى، ئەويش فەرمانى دەدا قازانگێك شيرەوايان دەكولاند،پاشان تريتيان بۆ دەكرد و شيرەواكەيان دەكرد بەسەريدا، ئەمجا دەيوت: بخۆن لەو شيرەوايە، بەڕاستى من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بيستووە دەيفەرموو: "شيرەوا سەبوورييە بۆ دڵى نەخۆش و هەندێ خەفەت لادەبات".

## ( ٦ ) تيماركردن بەهەنگوين خواردن

٧٧١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّ أَخِي اسْتَطْلَقَ بَطْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اسْقِه عَسَلًا". فَسَقَاهُ، ثُمَّ جاءهُ فَقَالَ: إِنِّي سَقَيْتُهُ عَسَلًا فَلَمْ يَزِدْهُ إِلَّا اسْتِطْلَاقًا، فَقَالَ لَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ جاء الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: "اسْقِه عَسَلًا". فَقَالَ: لَقَدْ سَقَيْتُهُ فَلَمْ يَزِدْهُ إِلَّا اسْتِطْلَاقًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "صَدَقَ اللَّهُ، وكَذَبَ بَطْنُ أَخِيكَ". فَسَقَاهُ فَبَرَأَ. **(بخاري/ الطب/٥٣٦٠)**

(أبو سعيد الخدري)(رضي الله عنه) دەڵێ: پياوێك هات بۆ خزمەتى پێغەمبەر (ﷺ) وتى: براكەم سكى دەچێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: "هەنگوينى دەرخوارد بدە" هەنگوينى دەرخوارد دا، پاشان هاتەوە وتى: هەنگوينم دەرخوارد دا زياتر سكى پێيچوو، سێ جار ئەمەى پێفەرموو، لەجارى چوارەمدا هاتەوە هەر فەرمووى: "هەنگوينى دەرخوارد بدە"، وتى: هەنگوينم دەرخوارد داوە زياتر سكى پێيچوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: "سكى براكەت درۆ دەكات"، دووبارە هەنگوينى دايە تا چاكبوويەوە.

٧٧٢ –عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "إِنَّ فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَا و شِفَا و مِنْ كُلِّ دَا و، إِلَّا السَّامَ". والسَّامُ: الْمَوْتُ، والْحَبَّةُ السَّوْدَا و: الشُّونِيزُ. **(بخاري/ الطب/ ٥٣٦٤)**

لە(أبو هريرة)وە (رضي الله عنه) كەلە پێغەمبەرى (ﷺ) بيستووە دەيفەرموو: "ڕەشكە دەرمانى هەموو دەردێكى تێدايە جگە لە مردن".

## ( ٧ ) هەر كەس بەيانيان خورماى عەجوە بخوات ژار و جادو زيانى پێناگەيەنن

٧٧٣ـ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وقَّاصٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ عَجْوَةً لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ ولَا سِحْرٌ". **(بخاري/ الأطعمة/ ٥١٣٠)**

واتە (سعد)ی کوڕی (أبی وقاص (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەر کەس ژەمی بەیانیی حەوت دەنك خورمای (عَجوة)[1] بێت ئەو ڕۆژە ژار و جادو زیانی پێناگەیەنن".

## ( ٨ ) دۆمەڵان لەگەزۆیە ئاوەکەیشی شیفایە بۆ چاو

٧٧٤ـ عَنْ سَعيد بْنِ زَيْدِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ الَّذي أَنْزَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وتَعَالَى عَلَى موسى، ومَاؤُهَا شِفَا و لِلْعَيْنِ". (بخاري/ الطب/ ٥٣٨١)

لە (سعید)ی کوڕی (زید)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "دۆمەڵان لە گەزۆیە (واتە لەو ڕزقە بێ ئەرکەیە) خوا نازڵی کرد بۆ موسی ئاوەکەیشی شیفایە بۆ چاو".

## ( ٩ ) تیمارکردن بەداری هیندی کە پێی دەوترێ ( کوست )

٧٧٥ـ عنْ عُبَيْدُ اللَّه بْنُ عَبْد اللَّه بْنِ عُتْبَةَ (بْنِ مَسْعُود): أَنَّ أُمَّ قَيْسٍ بِنْتَ مِحْصَنٍ –وكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ اللَّاتي بَايَعْنَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، وهِيَ أُخْتُ عُكَّاشَةَ بْنِ مِحْصَنٍ أَحَدِ بَنِي أَسَدِ بْنِ خُزَيْمَةَ– قَالَ: أَخْبَرَتْني: أَنَّهَا أَتَتْ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) بِابْنٍ لَهَا لَمْ يَبْلُغْ أَنْ يَأْكُلَ الطَّعَامَ، وقَدْ أَعْلَقَتْ عَلَيْه مِنَ الْعُذْرَة –قَالَ يُونُسُ: أَعْلَقَتْ غَمَزَتْ، فَهِيَ تَخَافُ أَنْ يَكُونَ بِه عُذْرَةٌ– قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "عَلَامَهْ تَدْغَرْنَ أَوْلَادَكُنَّ بِهَذَا الْإِعْلَاقِ؟ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْعُودِ الْهِنْديِّ –يَعْني بِه الْكُسْتَ– فَإِنَّ فيه سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْهَا ذَاتُ الْجَنْبِ". قَالَ عُبَيْدُ اللَّه: وأَخْبَرَتْني أَنَّ ابْنَهَا ذَاكَ بَالَ في حَجْرِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَدَعَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِماءٍ فَنَضَحَهُ عَلَى بَوْلِه ولَمْ يَغْسِلْهُ غَسْلًا". (بخاري/ الطب/ ٥٣٨٥)

لە (عبیدالله) کوڕی (عبدالله)وە، کە (أم قیس)ی کچی (محصن) کە خوشکی (عکاشە)ی کچی (محصن)ەو یەکێکە لە تیرەی (بنو أسد) ی کوڕی خوزەیمە و یەکێکە لە کۆچبەرە پێشینەکان کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: ئەو ئافرەتە هەواڵی دامێ کە ئەو ساوایەکی هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا خۆراکی نەخواردبوو، لەبەرنەخۆشی عوزرە[2]ناوگەرووی بریندار کردبوو، پێغەمبەر

---

[1] (عجوة) جۆرێکە لە خورمای مەدینە،وتراوە پێغەمبەر (ﷺ) بەدەستی پیرۆزی خۆی چاندویەتی، لە خورمای خەستەوی عیراقی دەچێت.

[2] عوزرە (العذرة) نەخۆشییەکە لە گەرودا، دەبێتە هۆی پەیدابونی ئازار بەهۆی کۆبونەوەی خوێنی پیس لەو شوێنەدا، بە دوری نازانم ئەم نەخۆشییە (لوزتین) بێت. (ذات الجنب)یش ئازارێکە لە لاکەلەدا

(ﷺ) پێـی فـەرمووی: "لەبەرچـی گـەروی منداڵـەکانتان برینـدار دەکـەن، بـەم دارە هیندییە تیماریان بکەن، بەڕاستی ئەو دارە حەوت جۆر شیفای تێدایە، یـەکێ لەوانـە (ذات الجنب)ە ئازاری لاکەلەکە. عبدالله دەڵـێ: ئـەو ئافرەتـە هـەواڵی دامـێ کـە ئـەو کـوڕەی میـزی کـرد بـەدامێنی پێغەمبـەردا (ﷺ) پێغەمبـەر (ﷺ) داوای ئـاوی کـرد پرژاندی بەسەر میزەکەیدا ئیتر بەشۆردن نەیشۆرد.

## ( ١٠ ) تیمارکردن بەدەرمان تکاندنە مەلاشوو

**٧٧٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: لَدَدْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي مَرَضِه، فَأَشَارَ أَنْ لَا تَلُدُّونِي، فَقُلْنَا: كَرَاهِيَةَ الْمَرِيضِ لِلدَّوَا و، فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ: "لَا يَبْقَى أَحَدٌ مِنْكُمْ إِلَّا لُدَّ غَيْرُ الْعَبَّاسِ، فَإِنَّهُ لَمْ يَشْهَدْكُمْ". (بخاري/ المغازي/ ٤١٨٩)**

(عائشة)(ﷺ) دەفەرمووێ: دەرمانمان تکاندە مەلاشوی پێغەمبـەر (ﷺ) لـەکاتی نەخۆشینەکەیدا، ئاماژەی کرد دەرمان مەکەنە مەلاشوم، ئێمـەیش وتمـان: نـەخۆش دەرمانی پێناخۆشە، (واتا: نەوەستاین لەو کـارە) کاتـێ هۆشـی هاتـەوە فـەرمووی: "جگە لە عەباس کەلەوکاتەدا ئامادە نەبوو لەگەڵتان، دەبێ هەریەك لە ئێوە دەرمان بتکێنرێتە لاتەنیشتی دەمی".

## ( ١١ ) کەڵە شاخ گرتن و دەرمان تکاندنە لووت

**٧٧٧ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) احْتَجَمَ، وأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ، واسْتَعَطَ. (بخاري/ الطب/ ٥٣٦٧)**

لە (أبن عباس)ەوە (ﷺ) کە پێغەمبـەر (ﷺ) کەڵـە شـاخی گرتـووە، کرێـی داوە بەکەڵە شاخگرو، دەرمانی کردۆتە لوتی.

## ( ١٢ ) تیمارکردن بە کەڵەشاخ و داخ

**٧٧٨ـ عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ قَالَ: جاءنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) فِي أَهْلِنَا، ورَجُلٌ يَشْتَكِي خُرَاجًا بِه أَوْ جِرَاحًا، فَقَالَ: مَا تَشْتَكِي؟ قَالَ: خُرَاجٌ بِي قَدْ شَقَّ عَلَيَّ. فَقَالَ: يَا غُلَامُ ائْتِنِي بِحَجَّامٍ، فَقَالَ لَهُ: مَا تَصْنَعُ بِالْحَجَّامِ يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَنْ أُعَلِّقَ فِيهِ مِحْجَمًا، قَالَ: واللَّهِ إِنَّ الذُّبَابَ لَيُصِيبُنِي أَوْ يُصِيبُنِي الثَّوْبُ فَيُؤْذِينِي، ويَشُقُّ**

---

پەیدا دەبێت بە هۆی دومەڵو برینێکەوە کەلە ژێر پەراسوەکاندا دروست دەبێت. بڕوانە: لسان العرب، مادة: (عذر،عجنب) هەروەها: اقتران النيرين: ٧/٢٥٣/٢٥٤

عَلَيَّ. فَلَمَّا رَأَى تَبَرُّمَهُ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِنْ كَانَ فِي شيءٍ مِنْ أَدْوِيَتِكُمْ خَيْرٌ فَفِي شَرْطَةِ مِحْجَمٍ، أَوْ شَرْبَةٍ مِنْ عَسَلٍ، أَوْ لَذْعَةٍ بِنَارٍ". قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "وَمَا أُحِبُّ أَنْ أَكْتَوِيَ". قَالَ: فَجاء بِحَجَّامٍ فَشَرَطَهُ، فَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ. (بخاري/ الطب/ ٥٣٥٩)

(عاصم)ى كوڕى (عمر)ى كوڕى (قتادة) دەڵێ: (جابر)ى كوڕى (عبدالله) (ﷺ) هاتە لامان لەماڵەوە، پیاوێك ئازارى هەبوو لەتاو دومەڵێك یان برینێك، وتى: ئازارت چییە؟ وتى: دومەڵێك بەگیانمەوەیە زۆر تاوى لێسەندووم، وتى: ئەى غولام كەڵەشاخگرێكم بۆ بهێنە، ئەویش پێى وت: ئەى باوكى (عبدالله) چى دەكەیت بەكەڵەشاخگر؟ وتى: دەمەوێ كەڵەشاخێك لەو دومەڵە بگرم، وتى: سوێند بە خوا مێشێكم پێوە دەنیشێ یان جلەكەم بەرى دەكەوێت ئازارم دەدات و زۆر سەختە لەسەرم، كاتێ بینى زۆر سڵ دەكاتەوە و دەترسێ لەوە، وتى: من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "ئەگەر شتێك لە تیمارەكانى ئێوە خێرى تیابێت، ئەوە لەدەرزیى كەڵەشاخگردا و، خواردنەوەى هەنگوین دا، یان ئاگر پیاچزاندندایە" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: "من پێم خۆش نیە داخ بكەم" عاصم دەڵێ: كەڵەشاخگرێكى هێنا كەڵەشاخى لێگرت، ئازارەكەى نەما.

# بەشی چل و سێیەم: چاوەقووڵە (تاعون)

## (١) چاوەقووڵە سزای گشتییە، مەچنە ناوی و لێی ڕامەکەن

٧٧٩ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: "إِنَّ هَذَا الْوَجَعَ –أَوِ: السَّقَمَ– رِجْزٌ عُذِّبَ بِهِ بَعْضُ الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ، ثُمَّ بَقِيَ بَعْدُ بِالْأَرْضِ، فَيَذْهَبُ الْمَرَّةَ وَيَأْتِي الْأُخْرَى، فَمَنْ سَمِعَ بِهِ بِأَرْضٍ فَلَا يَقْدَمَنَّ عَلَيْهِ، وَمَنْ وَقَعَ بِأَرْضٍ وَهُوَ بِهَا فَلَا يُخْرِجَنَّهُ الْفِرَارُ مِنْهُ". (بخاري/ الحيل/ ٦٥٧٣)

لە(أسامة)ی کوڕی (زيد)ەوە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە فەرموویەتی: "ئەم ئازارە –یان ئەم نەخۆشییە– سزایەکی گشتییە، هەندێ گەلەکانی پێش ئێوەی پێ سزا دراوە، دوای ئەوە لەزەویدا ماوەتەوە، هەندێ جار دەڕوا و هەندێ جار دێتەوە، هەرکەسێ بیستی چاوەقوڵە لە ئەرزێکدا کەوتۆتەوە نەچێت بۆ ئەوێ، هەرکەسیش لەئەرزێکدابوو چاوەقۆڵەی تێکەوت لەدەست ئەو دەردە ڕانەکات".

٧٨٠ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) خَرَجَ إِلَى الشَّامِ، حَتَّى إِذَا كَانَ بِسَرْغَ لَقِيَهُ أَهْلُ الْأَجْنَادِ: أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ وَأَصْحَابُهُ، فَأَخْبَرُوهُ أَنَّ الْوَبَا و قَدْ وَقَعَ بِالشَّامِ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقَالَ عُمَرُ: ادْعُ لِيَ الْمُهَاجِرِينَ الْأَوَّلِينَ. فَدَعَوْتُهُمْ، فَاسْتَشَارَهُمْ وَأَخْبَرَهُمْ أَنَّ الْوَبَا و(قَدْ) وَقَعَ بِالشَّامِ، فَاخْتَلَفُوا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: قَدْ خَرَجْتَ لِأَمْرٍ وَلَا نَرَى أَنْ تَرْجِعَ عَنْهُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: مَعَكَ بَقِيَّةُ النَّاسِ وَأَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَلَا نَرَى أَنْ تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَا و. فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِيَ الْأَنْصَارَ. فَدَعَوْتُهُمْ لَهُ، فَاسْتَشَارَهُمْ، فَسَلَكُوا سَبِيلَ الْمُهَاجِرِينَ وَاخْتَلَفُوا كَاخْتِلَافِهِمْ، فَقَالَ: ارْتَفِعُوا عَنِّي، ثُمَّ قَالَ: ادْعُ لِي مَنْ كَانَ هَاهُنَا مِنْ مَشْيَخَةِ قُرَيْشٍ مِنْ مُهَاجِرَةِ الْفَتْحِ. فَدَعَوْتُهُمْ فَلَمْ يَخْتَلِفْ عَلَيْهِ رَجُلَانِ، فَقَالُوا: نَرَى أَنْ تَرْجِعَ بِالنَّاسِ، وَلَا تُقْدِمَهُمْ عَلَى هَذَا الْوَبَا و، فَنَادَى عُمَرُ فِي النَّاسِ: إِنِّي مُصْبِحٌ عَلَى ظَهْرٍ، فَأَصْبِحُوا عَلَيْهِ. فَقَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ: أَفِرَارًا مِنْ قَدَرِ اللَّهِ؟ فَقَالَ عُمَرُ: لَوْ غَيْرُكَ قَالَهَا يَا أَبَا عُبَيْدَةَ –وَكَانَ عُمَرُ يَكْرَهُ خِلَافَهُ– نَعَمْ نَفِرُّ مِنْ قَدَرِ اللَّهِ إِلَى قَدَرِ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَتْ لَكَ إِبِلٌ فَهَبَطَتْ وَادِيًا لَهُ عُدْوَتَانِ: إِحْدَاهُمَا خَصْبَةٌ وَالْأُخْرَى جَدْبَةٌ، أَلَيْسَ إِنْ رَعَيْتَ الْخَصْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ، وَإِنْ رَعَيْتَ الْجَدْبَةَ رَعَيْتَهَا بِقَدَرِ اللَّهِ؟ قَالَ: فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَكَانَ مُتَغَيِّبًا فِي بَعْضِ حَاجَتِهِ، فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي مِنْ هَذَا عِلْمًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)

يَقُولُ: "إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ فَلَا تَقْدَمُوا عَلَيْهِ، وإِذَا وقَعَ بِأَرْضٍ وأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ". قَالَ: فَحَمِدَ اللَّهَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) ثُمَّ انْصَرَفَ. (بخاري/ الطب/ ٥٣٩٧)

له (عبدالله)ی كوڕی (عباس)ەوه (ﷺ) كه (عمر)ی كوڕی (خطاب)(ﷺ) ڕۆیشت بۆ شام، كاتێ گەیشته (سَرغ) سەركردەكانی جەنگ (أبو عبیدة)ەی كوڕی (جّراح) و یاوەرەكانی، پێگەیشت هەواڵیان دایێ كه دەردێكی كوشنده بڵاوبۆتەوه له وڵاتی شام،، (أبن عباس) دەڵێ: (عمر)پێی وتم: كۆچبەرانی پێشینم بۆ بانگ بكه، بانگم كردن، ڕاوێژی پێكردن وهەواڵی دانێ كه دەردێكی گشتی كەوتۆته شام، جیاوازی ڕا كەوته نێوانیان، هەندێكیان وتیان: تۆ بەنیازی كارێك دەرچویت واناببینین لێی پەشیمان بیتەوه، هەندێكی تریان وتیان: ئەوەی ماوه له خەڵك و یارانی پێغەمبەر (ﷺ) وان لەگەڵ تۆدا، پێمان چاك نیه بیانخەیته ناو ئەو وەبا كوشندەوه فەرمووی: هەستن لەلام. لەپاشدا فەرمووی: پشتیوانان (الانصار)م بۆ بانگكه، بانگم كردن ڕاوێژی پێكردن، ئەوانیش هەر ڕێگای كۆچبەرانیان گرتو وەك ئەوان جیاواز بوون، فەرمووی: هەستن لەلام. ئەمجا فەرمووی: كێ لێرەیه له گەورە پیاوانی قورەیش ئەوانەی ساڵی ئازادكردنی مەككه كۆچیان كردووه، بۆمیان بانگ بكه، بانگم كردن، دوو كەس لەوان جیاوازی نەكەوته نێوانیان، بەیەكدەنگ وتیان: ئێمه وادەبینین ئەم خەڵكه بگێڕیتەوه و نەیانخەیته ناو ئەم وەبایه. (عمر) بانگەوازی كرد لەناو خەڵكەكەدا: من سبەینێ لەسەر پشتی زینم، سبەینێ هەموو سواربوون لەسەر پشتی وڵاخەكانیان. (أبو عبیدة)ی كوڕی (جراح) وتی لەچارەنووسی خوا ڕادەكەن؟ عمر وتی: كاشكی كەسێكی تر ئەمەی بگوتایه ئەی أبو عبیدة –چونكه عمر حەزی نەدەكرد له قسەی ئەو دەرچێت– بەڵێ ئێمه له چارەنووسی خوا ڕادەكەین بۆ لای چارەنوسی خوا، ئایا ئەگەر تۆ بڕگەیەك وشترت هەبێت و هەوار بخەیت لەناو شیوێكدا دووبەری هەبێت، بەرێكیان سەوزەڵان و پڕلەوەڕ، بەرەكەی تریان دەێم و بێپیت، ئایا ئەگەر وشترەكانت لەهەر بەرێكیان بلەوەڕێنی بەچارەنووسی خوا نیه؟

(أبن عباس) دەڵێ: لەو دەمەدا (عبدالرحمن)ی كوڕی (عوف) هات كه پێشتر لەوێ نەبوو چوبوو بۆ هەندێ پێویستی خۆی ، وتی: من زانیاریم لایه لەم بارەوه، بیستومه له پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "ئەگەر بیستتان چاوه قوڵه پەیدابووه له خاكێكدا مەچن بۆئەوێ، ئەگەر له خاكێكدا پەیدابوو ئێوەی تێدابوون لێی ڕامەكەن". (أبن عباس) دەڵێ: (عمر)ی كوڕی (خطاب)(ﷺ) سوپاسی خوای كرد و گەڕایەوه.

# بەشی چل‌و چوارەم: ڕەشبینی و تەنینەوەی نەخۆشی (كتاب الطِّيَرة و العدوى)

## (١) تەنینەوە و ڕەشبینی ومانگی سەفەر و بایەقوش کاریگەرنین

٧٨١ـ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ –بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) حِينَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا عَدْوَى، ولَا صَفَرَ، ولَا هَامَةَ". فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا بَالُ الْإِبِلِ تَكُونُ فِي الرَّمْلِ كَأَنَّهَا الظِّبَا و، فَيَجِي و الْبَعِيرُ الْأَجْرَبُ فَيَدْخُلُ فِيهَا فَيُجْرِبُهَا كُلَّهَا؟ قَالَ: "فَمَنْ أَعْدَى الْأَوَّلَ". وفِي رِوايَةٍ: "لَا عَدْوَى، ولَا طِيَرَةَ ولَا صَفَرَ، ولَا هَامَةَ". **(بخاري/ الطب/ ٥٣٨٧)**

له (أبي سلمة)ی کوڕی (عبدالرحمن)ەوە ئەویش لـە(ابـي هريـرة)وە (ﷺ) دەڵـێ: لەکاتێکدا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "تەنینـەوەی نەخۆشـی و مـانگی سـەفەر و بایەقوش کاریگەرییان نیە، دەشتەکی یەك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی بۆ چی وشترەکانی من لەناو لم دا دەڵێی ئاسکن، تاوشترێکی گـەڕۆڵ دێـت و دەکەوێتـە ناویان هەمویان گەڕۆڵ دەکات؟ فەرمووی: "ئەی کێ یەکەم وشتری توش کرد؟" لـە ڕیوایەتێکی تری فەرموودەکەدا: "تەنینەوە و ڕەشبینی و مانگی سەفەر و بایـەقوش کاریگەرییان نیە".

## (٢) خاوەن وشتری نەخۆش وشترەکانی نەباتە سەر ئاوی خاوەن وشتری ساغ

٧٨٢ـ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ: أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ حَدَّثَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا عَدْوَى". ويُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ". قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُهُمَا كِلْتَيْهِمَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ثُمَّ صَمَتَ أَبُو هُرَيْرَةَ بَعْدَ ذَلِكَ عَنْ قَوْلِهِ: "لَا عَدْوَى". وأَقَامَ عَلَى أَنْ: "لَا يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ". قَالَ: فَقَالَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِي ذُبَابٍ –وَهُوَ ابْنُ عَمِّ أَبِي هُرَيْرَةَ–: قَدْ كُنْتُ أَسْمَعُكَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ تُحَدِّثُنَا مَعَ هَذَا الْحَدِيثِ حَدِيثًا آخَرَ قَدْ سَكَتَّ عَنْهُ، كُنْتَ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَا عَدْوَى". فَأَبَى أَبُو هُرَيْرَةَ أَنْ يَعْرِفَ ذَلِكَ، وقَالَ: "لَا يُورِدُ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ". فَمَا رَآهُ الْحَارِثُ فِي ذَلِكَ حَتَّى غَضِبَ أَبُو هُرَيْرَةَ، فَرَطَنَ بِالْحَبَشِيَّةِ، فَقَالَ لِلْحَارِثِ: أَتَدْرِي مَاذَا قُلْتُ؟ قَالَ: لَا، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قُلْتُ: أَبَيْتُ. قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: ولَعَمْرِي لَقَدْ كَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يُحَدِّثُنَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "لَا عَدْوَى". فَلَا أَدْرِي: أَنَسِيَ أَبُو هُرَيْرَةَ، أَوْ نَسَخَ أَحَدُ الْقَوْلَيْنِ الْآخَرَ. **(بخاري/ الطب/ ٥٤٣٧)**

له (ابن شهاب)ەوه کـه (ابـا سـلمة)ی کـوڕی (عبـدالرحمن)ی کـوڕی (عـوف)پێـی وتووه که پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "تەنینـەوە نیـە، هـەروەها پێیشـی دەوت: که پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خاوەن وشتری نەخۆش وشترەکانی نەباتە سەرئاوی خاوەن وشتری ساغ".. (أبو سلمة)دەڵێ: أبو هريرة ئەم دوو فەرمووده یه هەردوکیانی دەگێڕایەوه له پێغەمبەر (ﷺ)، لەپاشدا بێدەنگ بـوو لـه فـەرموودەی: (لاعـدوی) واتـا: تەنینـەوەی نەخۆشـی نییـە، بـەردەوام بـوو لەسـەر فـەرموودەی: "خاوەن وشتری نەخۆش وشترەکانی نەباتە سەر ئاوی خاوەن وشتری سـاغ". (أبـو سلمة)دەڵێ: (حارث)ی کوڕی (أبي ذباب) که ئامۆزای (أبو هريرة)یە- دەیـوت: ئـەی أبو هريرة من لێم بیستویت فەرمودەیەکی ترت (لەم بارەوە) لەگەڵ ئەم فـەرموودەدا دەگێڕایـەوە ئێسـتا لێـی بێـدەنگ بـوی، دەتـوت: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "لاعدوی"، (أبو هريرة) ملی بەوه نەدا که ئەمه بزانێت، وتی: (نەخۆش نابرێتە سـەر ساغ)، (حارث) لەم بارەوه دەمە دەمێی لەگەڵ کرد هەتا (أبو هريرة) رقی هەستا و بەزمانی حەبەشی دای بەیەکدا و به (حارث)ی وت: تۆ دەزانیت من چیم وت؟ وتـی: نەخێر، أبو هريرة وتی: من وتم: (ابيتُ)واتا: خۆم گرتۆتەوه لەو فەرمووده، أبو سلمه دەڵێ: بەگیانی خۆم (أبو هريرة) بۆی دەگێڕاینەوه که پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "لاعدوی" جا نازانم (أبو هريرة) لەبیری چوبوو، یـان یـەکێ لـەم فەرمودانـە حـوکمی ئەوی دی لابردووه.

(ئەوەوی دەفـەرموێ: هـەردوو فەرموودەکـە صـەحیحن، مەبەسـت لـە (لاعـدوی) ئەوەیـە بـەبێ فـەرمانی خـوا ناتەنێتـەوە، نـەك خـۆت نـەپارێزی و وابزانیـت هـەر ناتەنێتەوە)

## (٣) گەشبینیو چاکوێژی

٧٨٣ـ عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: "لَا طِيَرَةَ، وخَيْرُهَا الْفَأْلُ". قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ومَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: "الْكَلِمَةُ الصَّالِحَةُ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ". (بخاري/ الطب/ ٥٤٢٣)

(أبـو هريـرة)دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) بیسـتوه دەیفـەرموو: "گەشـبینی و ڕەشبینی لەباڵندەدا نییە، باشترین گەشبینی (الفأل)ە" وترا: ئەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) (فأل) چییە؟ فەرمووی: "وتەیەکی جوانە که یەکێکتان دەیبیسێت"

# بەشی چل و پێنجەم: فاڵچی و کتێبگرەوە

### (١) ئەوەی جنۆکە دەیقۆزێتەوە

٧٨٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﭫ) قَالَتْ: سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَيْسُوا بِشيء". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا الشيء يَكُونُ حَقًّا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْجِنِّ يَخْطَفُهَا **(الْجِنِّيُّ)** فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كَذْبَةٍ". **(بخاري/ الطب/ ٥٤٢٩)**

(عائشة)(ﭫ) دەڵـێ: کەسـانێك پرسـیاریان کردلـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەربـارەی فاڵچیەکان، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "هـیچ نـین" وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا هەنـدێ جـار شـتێك دەڵـێن ڕاسـت دەردەچـێ؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "ئـەوە وشەیەکی ڕاسـتە جنۆکـە دەیقۆزێتـەوە و دەیچـپێنێ بـە گـوێی دۆسـتەکەی خۆیـدا، هەروەك چۆن مریشك دەقرتێنێ زیاتر لە صەد درۆی تێکەڵ دەکەن".

# بەشی چل و شەشەم: مار و شتی تر

## (١) ڕێگرتن لە کوشتنی ئەو گیاندارانەی ماڵیی بوون

٧٨٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَأْمُرُ بِقَتْلِ الْكِلَابِ يَقُولُ: "اقْتُلُوا الْحَيَّاتِ وَالْكِلَابَ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ وَالْأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ الْبَصَرَ، وَيَسْتَسْقِطَانِ الْحَبَالَى". قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَنُرَى ذَلِكَ مِنْ سُمَّيْهِماءاللَّهُ أَعْلَمُ. قَالَ سَالِمٌ: قَالَ عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمَرَ: فَلَبِثْتُ لَا أَتْرُكُ حَيَّةً أَرَاهَا إِلَّا قَتَلْتُهَا، فَبَيْنَا أَنَا أُطَارِدُ حَيَّةً يَوْمًا مِنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ مَرَّ بِي زَيْدُ بْنُ الْخَطَّابِ -أَوْ أَبُو لُبَابَةَ- وَأَنَا أُطَارِدُهَا، فَقَالَ: مَهْلًا يَا عَبْدَ اللَّه. فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَمَرَ بِقَتْلِهِنَّ، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ نَهَى عَنْ ذَوَاتِ الْبُيُوتِ. (بخاري/ بدء الخلق/ ٣١٢٣)

(أبن عمر)(رضي الله عنه) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی ئەدا بە کوشتنی سەگ و دەیفەرموو: "مار و سەگ بکوژن، ماری بازگ و کوڵەوەیباب بکوژن، چونکە ئەو دوانە چاوکوێردەکەن و منداڵ لەباری دوگیان دەبەن".

(زهری) دەڵێ: ئەم ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ لە ژارەکانیانەوە خواش زاناترە. (سالم) دەڵێ: (عبدالله ی کوڕی عمر) وتی: هەر مارێکم ببینایە وازم لێنەدەهێنا هەتا دەمکوشت، ڕۆژێك مارێکی ماڵیم ڕاودەنا (زید)ی کوڕی (خطاب) یان (أبو لبابة) تێپەڕی بەلامدا من مارەکەم ڕاودەنا، وتی: ئەی (عبدالله) لەسەر خۆبە. وتم: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە کوشتنیان، وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە لە (کوشتنی) شتە ماڵیەکان.

## (٢) کوشتنی مار

٧٨٦- عَنْ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي غَارٍ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ (وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا) فَنَحْنُ نَأْخُذُهَا مِنْ فِيهِ رَطْبَةً إِذْ خَرَجَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ، فَقَالَ: "اقْتُلُوهَا". فَابْتَدَرْنَاهَا لِنَقْتُلَهَا فَسَبَقَتْنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "وَقَاهَا اللَّهُ شَرَّكُمْ كَماءقَاكُمْ شَرَّهَا". (بخاري/ الإحصار وجزا و الصيد/ ١٧٣٣)

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) دەڵێ: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لە ئەشکەوتێکدا (والمرسلات عرفاً) نازڵ بوویە سەری، ئێمە بەتەڕی و تازەیی وەرمان دەگرت لەدەمی ئەو، لەناکاو مارێك دەرچووە ناومان فەرمووی: "بیکوژن"

پەلامارمان دایە دەرچوو لەدەسمان فەرمووی: "خوا ئەوی پاراست لە خراپەی ئێوە، وەك چۆن ئێوەی پاراست لە شەڕی ئەو"

**( ٣ ) کوشتنی مێروله**

**٧٨٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "نَزَلَ نَبِيٌّ مِنَ الْانبياء تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَلَدَغَتْهُ نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِجِهَازِهِ فَأُخْرِجَ مِنْ تَحْتِهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: فَهَلَّا نَمْلَةً واحِدَةً". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣١٤١)**

له(أبو هريرة)وه (ﷺ) ئەویش له پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران هەواری خست لەبن درەختێکدا، مێرولەیەك گەستی، فەرمانیدا جل وجێگەکەیان هەڵگرت ئەمجا فەرمانی دا شارە مێرولەکەیان سوتاند، خوای گەورە نیگای بۆ نارد: ئەی بۆچ تەنها یەك میرولەت نەسوتاند؟".

**( ٤ ) کوشتنی پشیله**

**٧٨٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابن عمر (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ، سَجَنَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، لَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا وسَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا، ولَا هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ". (بخاري/ المسقاة/ ٢٢٣٦)**

له(عبدالله)ی کوڕی (عمر)ەوە (ﷺ) كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئافرەتێك سزادرا لەسەر پشیلەیەك، بەندی کرد هەتا مرد، بەهۆیەوە چووە دۆزەخ، چونکە نەئەوە بوو خۆراك و ئاوی بداتێ کاتێ کە بەندی کردبوو نە ئەوەیش بوو بەرەڵلای کات خۆی لەجڕ و جانەوەری سەر زەوی بخوات".

**( ٥ ) ئاودانی ئاژەڵەکان**

**٧٨٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ):أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فيهَا فَشرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلَأَ خُفَّهُ ماء، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِيَ فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وإِنَّ لَنَا فِي (هَذِهِ) الْبَهَائِمِ لَأَجْرًا؟ فَقَالَ: "فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ". (بخاري/ المساقاة/ ٢٢٣٤)**

له (أبو هريرة)ەوە (ﷺ)، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لەکاتێکدا پیاوێك دەڕۆیشت بەڕێگایەکدا زۆر تینوی بوو، بیرێکی بینی دابەزییە ناوی و ئاوی

خواردەوە، پاشان هاتە سەر بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە و لەتینوا قەپ بە خۆڵەکەدا دەکات، پیاوەکە وتی: ئەم سەگە وەك منی لێ بەسەر هاتووە لە توینێتیدا، دابەزیەوە ناوبیرەکە و پێڵاوەکەی پڕکرد لە ئاوو بەقەپ گرتی هەتا سەرکەوت و سەگەکەی ئاودا، خوا ئەو کردەوەی لێوەرگرت و لێی بورد". وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەم ئاژەڵانەدا خێرمان دەستدەکەوێ؟ فەرمووی: "لە هەموو جەرگێکی تەڕدا پاداش هەیە".

# بەشی چل و حەوتەم: شیعر و شتی تر

## (١) ڕاستترین وشە کە شاعیر وتبێتی

٧٩٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا شَاعِرٌ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شيء مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ. وكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ". (بخاري/ الادب/ ٥٧٩٥)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ڕاست ترین وشە شاعیر وتبێتی وشەکەی (لبید)ە: ئاگاداربە هەموو شتێك جگە لەخوا بەتاڵە و،(أميّة)ی کوڕی (أبي الصَّلت) نزیك بووە موسڵمان بێت".

## (٢) مەدح و ستاییش کەراهەتی هەیە

**٧٩١ـ عن أَبِي بَكْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّه، مَا مِنْ رَجُلٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَفْضَلُ مِنْهُ فِي كَذَا وكَذَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) "وَيْحَكَ، قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ". مِرَارًا يَقُولُ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لَا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُ فُلَانًا -إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ- ولَا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا". (بخاري/ الشهادات/ ٢٥١٩)**

لە (ابي بكرة)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە باسی پیاوێك کرا لەلایدا، پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ پیاوێك نیە دوای پێغەمبەر (ﷺ) لەوپیاوە چاکتر بێت لەو شتەو لەوشتەدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "کۆستت کەوێ ملی هاوڕێکەی خۆتت شکاند" چەند جار ئەمەی فەرموو، لەپاشدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر یەکێ لە ئێوە ناچار بوو پیاهەڵدانی براکەی بکات بابڵێ: من وادەزانم -ئەگەر وادەهاتە پێش چاوی- من بۆشم نیە کەس بەپاك بزانم لەبەردەم خوادا".

# بەشی چل و هەشتەم: خەوبینین

## (١) خەوبینینی پێغەمبەر (ﷺ)

٧٩٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أُهَاجِرُ مِنْ مَكَّةَ إِلَى أَرْضٍ بِهَا نَخْلٌ، فَذَهَبَ وَهَلِي إِلَى أَنَّهَا الْيَمَامَةُ أَوْ هَجَرُ، فَإِذَا هِيَ الْمَدِينَةُ يَثْرِبُ، وَرَأَيْتُ فِي رُؤْيَايَ هَذِهِ أَنِّي هَزَزْتُ سَيْفًا فَانْقَطَعَ صَدْرُهُ، فَإِذَا هُوَ مَا أُصِيبَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، ثُمَّ هَزَزْتُهُ أُخْرَى فَعَادَ أَحْسَنَ مَا كَانَ، فَإِذَا هُوَ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْفَتْحِ وَاجْتِمَاعِ الْمُؤْمِنِينَ، وَرَأَيْتُ فِيهَا (أَيْضًا) بَقَرًا، وَاللَّهُ خَيْرٌ، فَإِذَا هُمُ النَّفَرُ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِذَا الْخَيْرُ مَا جَاءَ اللَّهُ بِهِ مِنَ الْخَيْرِ بَعْدُ، وَثَوَابُ الصِّدْقِ الَّذِي آتَانَا اللَّهُ بَعْدَ يَوْمِ بَدْرٍ". **(بخاري/ المناقب/ ٣٤٢٥)**

لە (أبي موسى الأشعري)یەوە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "لەخەودا دیم لەمەککەوە کۆچم دەکرد بۆ ئەرزێك دارخومای تێدابوو، زەینم بۆی چوو ئەو خاکە (یَمامة)بێت یان (هَجَر)، کەچی (مەدینە–یثرب)بوو، هەر لەو خەوەمدا دیم شمشێرێکم ڕاوەشاند سەرەکەی قرتا، ئەویش ئەوە بوو توشی باوەڕداران هات ڕۆژی ئوحود، پاش ئەوە شمشێرەکەم جارێکی تر ڕاوەشاند چاکتر لەجارانی لێهاتەوە، ئەویش ئەوە بوو خوا پێی داین لە ئازادکردنی (مەککە)و کۆبونەوەی باوەڕداران، هەر لەو خەوەدا چەند مانگایەکم دی (سەردەبڕان)و (پێیان وتم): (والله خیراً) ئەوانیش ئەو موسڵمانانە بوون ڕۆژی ئوحود (شەهیدکران)، خێرەکەش ئەو سەرکەوتنەبوو دواتر خوا پێیداین و پاداشتی ئەو ڕاستییە بوو، دواتر لە ڕۆژی بەدری (دووەمدا) خوا پێی بەخشین.

## (٢) پێغەمبەر (ﷺ) (مسیلمە)ی درۆزن و (عنسی) درۆزن لەخەودا دەبینێ

٧٩٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (ﷺ) الْمَدِينَةَ، فَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الْأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ. فَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ، فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ ابْنِ شَمَّاسٍ، وَفِي يَدِ النَّبِيِّ (ﷺ) قِطْعَةُ جَرِيدَةٍ، حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي أَصْحَابِهِ، قَالَ: "لَوْ سَأَلْتَنِي هَذِهِ الْقِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا، وَلَنْ أَتَعَدَّى أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ، وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ، وَإِنِّي لَأَرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ، وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّي". ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ:

**فَسَأَلْتُ عَنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): "إِنَّكَ أَرَى الَّذِي أُرِيتُ فِيكَ مَا أُرِيتُ" فَأَخْبَرَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ: أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا، فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي، فَكَانَ أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيَّ صَاحِبَ صنعاء، والْآخَرُ مُسَيْلِمَةَ صَاحِبَ الْيَمَامَةِ". (بخاري/ المناقب/ ٣٤٢٤)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: (مسیلمە)ی درۆزن لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتە مەدینە، دەیوت: ئەگەر موحەممەد دوای خۆی کارەکەی بداتە دەست من دوای دەکەوم، هات بۆ مەدینە لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لەگەلەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (ثابت)ی کوڕی (قیس)ی کوڕی (شماس)داهات بۆلای چڵێ دارخورمای بەدەستەوە بوو، هەتا وەستا بەلای (مُسیلمە)وە کەلەناو هاوڕێکانیدا بوو، فەرمووی: "گەر داوای ئەم چڵەدارەم لێبکەیت ناتدەمێ من لە فەرمانی خوا دەرناچم دەربارەی تۆ، ئەگەر لە ڕاستیش پشت هەڵکەیت خوا سەرت دەبڕێ، من دەتبینم بەو شێوەی لەخەودا پیشانی من دراوی، ئەویش (ثابت)ە لە بریتی من وەڵامت دەداتەوە" ئیتر بەجێی هێشت.

(أبن عباس) دەڵێ: پرسیارم کرد لەو فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ): "تۆ وا دێیتە پێش چاوم کە من لە لەخەودا پیشانم دراوە، ئەوەی پیشانم دراوە" أبو هریرە هەواڵی پێدام کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لەکاتێکدا من خەوتبووم دوو بازنەی ئاڵتونیم دی لەهەردوو دەستمدا، زۆر بەلامەوە گران بوو، هەر لەو خەوەدا نیگام بۆ هات: فویان لێکە، فوم لێکردن بابردنی، بەدوو درۆزن خەو پرژێنم کردن، دوای من پەیدا دەبن، یەکێکیان (عنسی) خەڵکی (صنعاء)بوو، ئەوی دیکەشیان (مسیلمة)ی خەڵکی (یمامە) بوو.

**( ٣ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ): "هەرکەس لەخەودا بمبینێ ئەوە منی دیوە"**

**٧٩٤ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ، أَوْ: لَكَأَنَّمَا رَآنِي فِي الْيَقَظَةِ، لَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي". وقَالَ: فَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو قَتَادَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ". (بخاري/ التعبير/ ٦٥٩٢)**

(أبو هريرة)دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "هەر کەس لەخەودا من ببینێ ئەوە لە بێداریشدا هەر دەمبینێ، یان: وەك ئەوە وەهایە لە بێداریدا منی دیبێ، شەیتان نایەتە شێوەی منەوە".

أبو هريره وتى: لـه (أبـو سـلمة)ەوە: لـە (أبـو قتـادة)ەوە : كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويەتی: "هەركەس منی لەخەودا بينی ئەوە هەقی بينيـوە" (واتـە: خەوەكـەی ڕاستە و هەڵەشەو پەڵەشە نيە).

## ( ٤ ) خەوی باش لەخواوەیە خەوی خراپ لە شەیتانەوەیە

٧٩٥- عن أبي سَلَمَةَ قالَ: سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ (رضي الله عنه) يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "الرُّؤْيَا مِنَ اللَّه والْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ولْيَتَعَوَّذْ بِاللَّه مِنْ شَرِّهَا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ". فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنْ جَبَلٍ، فَمَا هُوَ إِلَّا أَنْ سَمِعْتُ بِهَذَا الْحَدِيثِ فَمَا أُبَالِيهَا. **(بخاري/ الطب/ ٥٤١٥)**

(أبـي سـلمة)دەڵـێ: لـە (أبـو قتـادة)م بيسـتووە دەيـوت: لـە پێغەمبـەرم (ﷺ) بيستووە، دەيفەرموو: "خەوی باش لەخواوەیە خـەوی خـراپ لەشـەيتانەوە، ئەگـەر يەكێ لە ئێوە خەوێكی دی پێی ناخۆش بوو باسیٚ جار تف بكـات بـەلای چـەپيدا و، پەنابگرێت بەخوا لە خراپەی ئەو خەوە ئيتر ئەو خەوە زيانی پێناگەيەنێت".

(أبو سلمه) دەڵێ: خەوی وام دەبينی لە كێوێك قورستر بوو بەلامـەوە هـەتا ئـەم فەرموودەيەم بيست ئيتر دوای ئەوە گوێم نەئەدايە.

## ( ٥ ) خەوی خراپ مەگێڕەرەوە

٧٩٦- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي، قَالَ: فَلَقِيتُ أَبَا قَتَادَةَ فَقَالَ: وأَنَا كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "إِنَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّه، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلَا يُحَدِّثْ بِهَا إِلَّا مَنْ يُحِبُّ. وإِنْ رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتْفُلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثًا، ولْيَتَعَوَّذْ بِاللَّه مِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وشَرِّهَا، ولَا يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ". **(بخاري/ التعبير/ ٦٦٣٧)**

(أبي مسلمة)دەڵێ: من خەوی وام دەبينی نەخۆشی دەخستم تاگەيشـتم بـە (أبـو قتـادة) ئـەويش وتـی: منـيش خـەوم دەبينـی نەخۆشـی دەخسـتم هـەتا بيسـتم لـە پێغەمبەر (ﷺ) دەيفەرموو: "بەڕاستی خەوی چـاك لەخواوەيـە، هەركـەس لـە ئێـوە خەوێكی بينی پێيخۆش بوو باسی نەكات لای كەسێ نەبێ كە خۆشـی دەوێ، ئەگـەر شتێكی بينی بەلايەوە ناخۆش بوو باسیٚ جار تف بكات بـەلای چـەپيدا وپـەنابگرێت بەخوا لە خراپەی شەيتان و خراپـەی ئـەو خـەوە، بـۆ كەسيشـی نەگێڕێتـەوە، ئـيتر ئەوخەوە زيانی بۆی نابێت".

## ( ٦ ) خەوی باوەڕدار بەشێکە لەچل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی

٧٩٧ـ عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامت (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْ و مِنْ سِتَّةٍ وأَرْبَعِينَ جُزْ وا مِنَ النُّبُوَّةِ". (بخاري/ التعبير/ ٦٥٨٦)

(عبادة)ی کوڕی (صامت) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خەوی باوەڕدار بەشێکە لە چل وشەش بەشی پێغەمبەرایەتی".

## ( ٧ ) خەوی چاك بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی

٧٩٨ـ مکرر ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْ و مِنْ سَبْعِينَ جُزْ وا مِنَ النُّبُوَّةِ" بخارى / التعبير / ٦٥٦٨.

(أبن عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خەوی چاك بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتی".

## ( ٨ ) لە ئاخر زەماندا خەوی موسڵمان زۆربەی دێتەدی

٧٩٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ، وأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا، ورُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْ و مِنْ خَمْسٍ وأَرْبَعِينَ جُزْ وا مِنَ النُّبُوَّةِ، والرُّؤْيَا ثَلَاثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنَ اللَّهِ، ورُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ، ورُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْ و نَفْسَهُ، فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ، ولَا يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ". قَالَ: "وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وأَكْرَهُ الْغُلَّ، والْقَيْدُ ثَبَاتٌ فِي الدِّينِ". فَلَا أَدْرِي هُوَ فِي الْحَدِيثِ أَمْ قَالَهُ ابْنُ سِيرِينَ. (بخاري/ التعبير/ ٦٦١٤)

لە(أبـو هريـرة)وە (ﷺ) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویـەتی: "هـەرکات دوا ڕۆژ نزیك بوویەوە نزیکە خەوی موسڵمان بەدرۆ دەرنەچێ، ئەوەتان کە زۆرترین خـەوی بەراست دەگەڕێ ڕاستگۆترینتانە، خەوی موسڵمان بەشێکە لـە چـل و پێـنج بەشـی پێغەمبەرایەتی، خەو سێجۆرە خەوی چاك مـوژدەی خواییـە، خـەوی خەفـەتئامێز لەشەیتانەوەیە، خەوێکیش دالغەی دەرونی ئەو کەسەخۆیەتی، ئەگەر یەکێ لە ئێوە خەوی ناخۆشی بینی باهەستێ و نوێژ بکات و، بۆ خەڵکی نەگێڕێتەوە".

(ڕاوی) فەرمودەکە دەڵێ: من پێوەندم پێخۆشە و کۆتی ملم پێناخۆشە، پێوەند دامەزراوییە لە ئایندا، نازانم ئەوە لەفەرموودەکەدا بووە یان أبن سيرين وتوویەتی.

## ( ٩ ) دەربارەی خەو پرژێن

٨٠٠–عن عبيدالله بن عبدالله: ان ابن عباس كان يحدث :ان رجلا أتى رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي أَرَى اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطفُ السَّمْنَ والْعَسَلَ، فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ منْهَا بأَيْديهِمْ، فَالْمُسْتَكْثِرُ والْمُسْتَقلُّ، وأَرَى سَبَبًا واصلًا منَ السماء إِلَى الْأَرْض، فَأَرَاكَ أَخَذْتَ به فَعَلَوْتَ، ثُمَّ أَخَذَ به رَجُلٌ منْ بَعْدكَ فَعَلَا، ثُمَّ أَخَذَ به رَجُلٌ آخَرُ فَعَلَا، ثُمَّ أَخَذَ به رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ به، ثُمَّ وصلَ لَهُ فَعَلَا. قَالَ أَبُو بَكْر (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّه، بأَبِي أَنْتَ، واللَّه لَتَدعَنِّي فَلَأَعْبُرَنَّهَا. قَالَ: رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اعْبُرْهَا". قَالَ أَبُو بَكْر: أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّةُ الْإِسْلَامِ، وأَمَّا الَّذي يَنْطفُ منَ السَّمْن والْعَسَل فَالْقُرْآنُ حَلَاوَتُهُ ولينُهُ، وأَمَّا مَا يَتَكَفَّفُ النَّاسُ منْ ذَلكَ فَالْمُسْتَكْثرُ منَ الْقُرْآن والْمُسْتَقلُّ (منه). وأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصلُ منَ السماء إِلَى الْأَرْض فَالْحَقُّ الَّذي أَنْتَ عَلَيْه. تَأْخُذُ به، فَيُعْليكَ اللَّهُ (به) ثُمَّ يَأْخُذُ به رَجُلٌ منْ بَعْدكَ فَيَعْلُو به، ثُمَّ يَأْخُذُ به رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو به، ثُمَّ يَأْخُذُ به رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطعُ به، ثُمَّ يُوصَلُ لَهُ فَيَعْلُو به، فَأَخْبِرْني يَا رَسُولَ اللَّه بأَبِي أَنْتَ (وأمي) أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَصَبْتَ بَعْضًا وأَخْطَأْتَ بَعْضًا". قَالَ: فَوَاللَّه يَا رَسُولَ اللَّه لَتُحَدِّثَنِّي مَا الَّذي أَخْطَأْتُ؟ قَالَ: "لَا تُقْسمْ". (بخاري/ التعبير/ ٦٦٣٩)

لە (عبيد الله)ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (عتبە)وە کە (أبن عباس)(ﷺ) فەرموودەیەکی گێڕایەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من ئەمشەو لەخەودا دیم پارچە هەورێك ڕۆن و هەنگوینی لێدەتکا، خەڵکم دەبینی دەستیان بۆ دەگرتەوە، هەیانبوو زۆری دەگرتەوە، هەیانبوو کەم، گوریسێکم بینی لە ئاسمانەوە شۆڕ بوبویەوە بۆسەر زەمین، تۆم دی ئەوگوریسەت گرت وپێیدا سەرکەوتی، دوای تۆ پیاوێك گرتی و سەرکەوت، دوای ئەویش پیاوێکی تر گرتی وسەرکەوت، دوای ئەویش پیاوێکی تر گرتی و بچڕا، بۆیان گەیاندەوەیەك و سەرکەوت. (أبوبکر)(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا –باوکم فیداتبێ– سوێند بەخوا لێم دەگەڕێی خەوپرژێنی دەکەم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خەو پرژێنی بکە" أبوبکر وتی: پارچە هەورەکە سێبەری ئیسلامە، ئەوەشی لێی دەتکا لەڕۆن و هەنگوین شیرینی و نەرم و نیانی قورئانە، ئەوەیشی خەڵك دەیانگرتەوە زۆر وەرگرتنیانە لە قورئان، یان کەم وەرگرتنیانە لەو. ئەو گوریسەش لە ئاسمانەوە هاتبووە سەر زەمین ئەو ڕاستییەیە تۆی لەسەری و دەستی پێوەدەگریت و

خوابەرزت دەکاتەوە پێی، دوای تۆ پیاوێکی تر دەیگرێ و پێی بەرز دەبێتەوە، دوای ئەویش پیاوێکی تر دەیگرێ و پێی بەرز دەبێتەوە دوای ئەویش پیاوێکی تر دەیگرێت و دەبچڕێ، ئەمجا بۆی گرێدەدەنەوە و پیاسەردەکەوێت، هەواڵم بدەرێ ئەی پێغەمبەری خوا باوکو دایکم فیدات بێ، ئایا پێکام یان هەڵەم کرد؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەندێکت پێکا و هەندێکت هەڵە کرد" وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا دەبێ پێم بڵێی چیم هەڵەکرد؟ فەرمووی: "سوێند مەخۆ".

# بەشی چل و نۆیەم: پلەوپایەکان ( كتاب الفضائل )

## پلەوپایەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

### (١) نموونە بۆ ئەو ڕێنمایی و زانستەی خوا بە پێغەمبەردا (ﷺ) ناردویەتی

٨٠١ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ مَثَلَ مَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ عَزَّ وجَلَّ مِنَ الْهُدَى والْعِلْمِ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَتْ مِنْهَا طَائِفَةٌ طَيِّبَةٌ قَبِلَت الماء، فَأَنْبَتَت الْكَلَأَ والْعُشْبَ الْكَثِيرَ. وكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَت الماء، فَنَفَعَ اللَّهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا مِنْهَا وسَقَوْا ورعَوْا. وأَصَابَ طَائِفَةً مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ ماء ولَا تُنْبِتُ كَلَأً. فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللَّهِ ونَفَعَهُ بِمَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ، فَعَلِمَ وعَلَّمَ، ومَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، ولَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ". (بخاري/ العلم/ ٧٩)

(أبـو موسـی الأشـعري)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "بەڕاسـتی نموونەی ئـەم ڕێنمـایی و زانسـتەی خـوای گـەورە بـە منـدا ناردویـەتی وەك بارانێك وەهایە دەدا لەزەوییەك، ئەو زەوییـە بەشـێکی بەپیتـە ئاوەکـە هەڵدەمـژێ، ڕوەك و گژوگیای زۆر دەڕوێنێ، هەندێکیشی خاکێکی بێپیتە ئاوەکەی تیادەمێنێتەوە و خوا دەیکات بەهۆی سوودی خەڵکی ئاوی لێدەخۆنەوە و ئاژەڵ و مـەزرای پێئـاودەدەن، هـەر ئـەو بارانـە دەدات لەپارچـەیەکی تـری ئـەو ئـەرزە کـە تـەخت و کرێنـە نـەئاو هەڵدەگرێت و نەگیا سەوز دەکات، ئەم نموونانە: بۆ کەسێکە کـە شـارەزا بوبێـت لـە ئاینی خوای (ﷻ) و خوا سودی پێبەخشیبێ بەو پەیامەی بەمندا ناردویەتی، خـۆی فێربووە و خەڵکیشی فێرکردووە، هەروەها نموونـەی کەسێکیشـە کـە ئـەو پەیامـەی پشت گوێ خستووە و ئەو ڕێنماییەی وەرنەگرتووە کە منی بۆ ڕەوانەکردووە".

٨٠٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ مَثَلِي ومَثَلَ مَا بَعَثَنِيَ اللَّهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمَهُ، فَقَالَ: يَا قَوْمِ إِنِّي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ، فَالنَّجَاء. فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِه فَأَدْلَجُوا فَانْطَلَقُوا عَلَى مُهْلَتِهِمْ، وكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ، فَأَهْلَكَهُمْ واجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي واتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، ومَثَلُ مَنْ عَصَانِي وكَذَّبَ مَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الْحَقِّ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١١٧)

لە(أبو موسی)وە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "نموونەی من و ئـەو پەیامەی خوا منـی پێنـاردوە، وەك پیاوێك وەهایـە چـووەتە لای گەلەکـەی و پێـی

وتوون: ئەی گەلەکەم من بەم دووچاوی خۆمە سوپاکەم بینی و، من هاواربەدەمی ڕووت و قوتم[1]، فریای خۆتان کەون، کۆمەڵێك لە گەلەکەی بەقسەیان کرد و هەر سەر لەئێوارە کەوتنە ڕێ لەسەرخۆ و بەئارامی، کۆمەڵێکی تر لەو گەلە هەواڵەکەیان بەدرۆ زانی لەشوێنی خۆیان نەجوڵان تابەیانی سوپاکە دای بەسەریاندا، لەناوی بردن و لە بنی هێنان، ئەمە نموونەی ئەو کەسەیە بەقسەی منی کردووە و دوای ئەو پەیامە کەوتووە کە هێناومە، نموونەی ئەو کەسەیش لەمن یاخی بووە و، ئەو پەیامە ڕاستەی من پێی هاتووم ئەو بەدرۆی زانیوە".

## ( ٢ ) کۆتایی هاتنی پێغەمبەران بە پێغەمبەر ( ﷺ )

**٨٠٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَثَلِي ومَثَلُ الْانبياء مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بُنْيَانًا فَأَحْسَنَهُ وأَجْمَلَهُ، إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ ويَعْجَبُونَ لَهُ ويَقُولُونَ: هَلَّا وضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ". (بخاري/ المناقب/ ٣٣٤٢)**

لە(ابو هريرة)وە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "نموونەی من و پێغەمبەرانی پێش من وەك نموونەی پیاوێك وەهایە کە بینایەکی دروست کردووە و زۆر چاك و جوانی کردووە، تەنها جێگای یەك خشت نەبێت، لە سوچێك لە سوچەکانیدا، خەڵك بەدەوریدا دەگەڕێن و سەرسام دەبن و دەڵێن: ئەی ئەم خشتە بۆچ دانەنراوە؟ فەرمووی: من ئەو خشتەم و من سەرمۆری پێغەمبەرانم".

## ( ٣ ) هەڵقوڵانی ئاو لە نێو پەنجەکانی پێغەمبەر ( ﷺ )

**٨٠٤ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) وأَصْحَابَهُ بِالزَّوراء –قَالَ: والزَّوراء بِالْمَدِينَةِ عِنْدَ السُّوقِ والْمَسْجِدِ فِيمَا ثَمَّهْ– دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ ماء، فَوَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ فَجَعَلَ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ جَمِيعُ أَصْحَابِهِ. قَالَ: قُلْتُ: كَمْ كَانُوا يَا أَبَا حَمْزَةَ؟ قَالَ: كَانُوا زُهَا و الثَّلَاثِ مِائَةِ. (بخاري/ الوضوء/ ١٦٧)**

لە (أنس)ی کوڕی (مالك)ەوە (ﷺ) کە پێغەمبەری خوا و(ﷺ) یارەکانی لە (زوراء)دابوون، –دەڵێ زوراء جێگایەکە لە مەدینە لای بازاڕ و مزگەوتدایە لەکاتێکدا

---

[1] هاوار بەدەمی ڕووتو قوت (النذير العريان) زاراوەیەکی عەرەبییە لەکاتی ترسی کوتوپڕدا بەکاری دێنن.بڕوانە (لسان العرب) مادة (نذر)

لەوێ بوو– بانگی کرد جامۆڵکەیەك ئاوی بۆ بهێنن لەپی خستە ناو ئاوەکە، ئاو لە نێوان پەنجەکانی هەڵدەقوڵا، هەموو یارەکانی دەسنوێژیان گرت، (قتادە) دەڵێ: وتم چەند کەس بوون ئەی باوکی حەمزە؟ وتی: ئەندازەی سێسەد کەس دەبوون.

**(٤) بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە خواردندا**

**٨٠٥ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه) قالَ: لَمَّا حُفِرَ الْخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) خَمَصًا، فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِي فَقُلْتُ لَهَا: هَلْ عِنْدَكِ شيء؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) خَمَصًا شَدِيدًا، فَأَخْرَجَتْ لِي جِرَابًا فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، ولَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ، قَالَ: فَذَبَحْتُهَا وطَحَنَتْ فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِي، فَقَطَّعْتُهَا فِي بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالَتْ: لَا تَفْضَحْنِي بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) ومَنْ مَعَهُ، قَالَ: فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّا قَدْ ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وطَحَنَتْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ فِي نَفَرٍ مَعَكَ. فَصَاحَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وقَالَ: "يَا أَهْلَ الْخَنْدَقِ، إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ لَكُمْ سُورًا، فَحَيَّ هَلًا بِكُمْ". وقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، ولَا تَخْبِزُنَّ عَجِينَتَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ". فَجِئْتُ وجاء رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَقْدَمُ النَّاسَ، حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِي، فَقَالَتْ: بِكَ وبِكَ! فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِي قُلْتِ لِي، فَأَخْرَجْتُ لَهُ عَجِينَتَنَا فَبَصَقَ فِيهَا وبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا فَبَصَقَ فِيهَا وبَارَكَ، ثُمَّ قَالَ: "ادْعِي خَابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ، واقْدَحِي مِنْ بُرْمَتِكُمْ ولَا تُنْزِلُوهَا". وهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللَّه لَأَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ، وانْحَرَفُوا وإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِيَ، وإِنَّ عَجِينَتَنَا -أَوْ كَمَا قَالَ الضَّحَّاكُ- لَتُخْبَزُ كَمَا هُوَ. (بخاري/ المغازي/ ٣٨٧٦)**

(جابر)ی کوڕی (عبدالله)(رضي الله عنه) دەڵێ: لەکاتێکدا خەنەك هەڵدەکەنرا دیم پێغەمبەر (ﷺ) برسیەتی، گەڕامەوە بۆ لای خێزانمو پێم وت: ئایا هیچت لا هەیە؟ من برسێتیەکی زۆرم بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بینی، توێشەبەرەیەکی بۆ دەرهێنام مەنێ جۆی تێدابوو، کاوڕێکی بچکۆلەی ماڵیشمان هەبوو سەرم بڕی، خێزانیشم جۆکەی هاڕی و لەگەڵ لێبوونەوەی مندا ئەویش لێبوویەوە، گۆشتەکەم ورد کردە ناو مەنجەڵەکەی خێزانم، پاشان گەڕامەوە، بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، خێزانم وتی: ئابڕوم مەبە، پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی لەگەڵیدایە بیهێنی، دەڵێ: هاتمە خزمەتی چرپاندم بەگوێیدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە کاوڕێکمان سەربڕیوە، مەنێ جۆیشمان هەبوو خێزانم هاڕیویەتی، تۆ و چەند کەسێك لەگەڵ خۆت بفەرموون،

پێغەمبەر (ﷺ) هاواری کرد: "ئەی خەڵکی خەندەق جابر دەعوەتی بۆکردوون خێرا وەرن" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "مەنجەڵەکە دامەگرن و هەویرەکەش مەکەن بەنان تا دێم". من هاتمەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) پێش خەڵکەکە کەوتبوو هات، هەتا گەیشتمە لای خێزانم، وتی: تۆ واو تۆوا! وتم: ئەوەی تۆ پێت وتم: وەهام کرد. هەویرەکەم دەرهێنا بۆ (پێغەمبەر (ﷺ)) تفی تێکردوو دوعای بەرەکەتی بۆکرد، ئەمجا ڕۆیشت بۆ لای مەنجەڵەکە و تفی تێکرد و دوعای بەرەکەتی بۆ کرد، پاشان بەخێزانمی فەرموو: "ئافرەتێك بانگ بکە نانت لەگەڵ بکات، لەو مەنجەڵەیش هەڵبگۆزن و دایمەگرن" ئامادەبوان هەزار کەس بوون، سوێندم بەخوا هەموو نانیان خوارد تا خۆیان وازیان هێنا و ڕۆیشتن، هێشتا، مەنجەڵەکەمان پڕ بوو وەك خۆی، هەویرەکەیشمان نانی لێدەکرا وەك خۆی.

**٨٠٦ـ عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثَلَاثِينَ ومائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ". فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جاء رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "أَبَيْعٌ أَمْ عَطِيَّةٌ". أَوْ قَالَ: "أَمْ هِبَةٌ". فَقَالَ: لَا بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى، قَالَ: وايْمُ اللَّهِ، مَا مِنَ الثَّلَاثِينَ ومائَةٍ إِلَّا حَزَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حُزَّةً (حُزَّةً) مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهُ، وإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَهُ، قَالَ: وجَعَلَ قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلْنَا مِنْهُمَا أَجْمَعُونَ وشَبِعْنَا، وفَضَلَ فِي الْقَصْعَتَيْنِ، فَحَمَلْتُهُ عَلَى الْبَعِيرِ. أَوْ كَمَا قَالَ. (بخاري/ الهبة/ ٢٤٧٥)**

(عبدالرحمن)ی کوڕی (ابو بکر) (ﷺ) دەڵێ: صەدو سی کەس لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، فەرمووی: "ئایە کەستان خواردنتان پێیە؟" پیاوێك مەنێ، یان نزیکی مەنێ خواردنی پێبوو، کرا بەهەویر، دوای ئەوە پیاوێکی موشریکی قژ گڤی درێژ هات بڕگەیەك مەری دابووەبەر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "فرۆشتنە، یان بەخشینە؟" وتی: نەخێر فرۆشتنە، مەڕێکی لێکڕی کرا بە (شۆربا ) ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانیدا جگەرەکەی ببرژێنرێ، عبدالرحمن دەڵێ: سوێند بەخوا ئەو صەد و سی کەسە کەسی نەماوە پێغەمبەر (ﷺ) پارچەیەك لەو جگەرەی بۆ لێنەکاتەوە، ئەگەر حازر بوایا پێی ئەدا، ئەگەر لەوێش ئەبوایا بۆی هەڵدەگرت، دەڵێ: هەرلەو مەڕە دولەگەن چێشتی دروست کرد هەموو لێمان خوارد و تێربووین، لێیشی مایەوە و خستمە سەرپشتی وشترەکە.

٨٠٧ـ عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ (ﷺ): أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا نَاسًا فُقَرَا و، وإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ مَرَّةً: "مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَلَاثَةٍ، ومَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ أَرْبَعَةٍ فَلْيَذْهَبْ بِخَامِسٍ، بِسَادِسٍ". أَوْ كَمَا قَالَ، وإِنَّ أَبَا بَكْرٍ جاء بِثَلَاثَةٍ، وانْطَلَقَ نَبِيُّ اللَّهِ (ﷺ) بِعَشَرَةٍ وأَبُو بَكْرٍ بِثَلَاثَةٍ، قَالَ: فَهُوَ واناءأَبِي وأُمِّي، ولَا أَدْرِي هَلْ قَالَ: وامْرَأَتِي وخَادِمٌ بَيْنَ بَيْتِنَا وبَيْتِ أَبِي بَكْرٍ، **(قَالَ):** وإِنَّ أَبَا بَكْرٍ (ﷺ) تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) ثُمَّ لَبِثَ حَتَّى صُلِّيَتِ الْعِشَا و، ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى نَعَسَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَجاء بَعْدَمَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَا و اللَّهُ، قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ: مَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ؟ – أَوْ قَالَتْ: ضَيْفِكَ– قَالَ: أَوَ مَا عَشَّيْتِهِمْ، قَالَتْ: أَبَوْا حَتَّى تَجِي و، قَدْ عَرَضُوا عَلَيْهِمْ فَغَلَبُوهُمْ، قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ، وقَالَ: يَا غُنْثَرُ، فَجَدَّعَ وسَبَّ، وقَالَ: كُلُوا لَا هَنِيئًا، وقَالَ: واللَّهِ لَا أَطْعَمُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ، إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرَ مِنْهَا، قَالَ: **(حَتَّى)** شَبِعْنَا وصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ (ﷺ)، فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ، قَالَ لِامْرَأَتِهِ: يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا، قَالَتْ: لَا –وقُرَّةِ عَيْنِي– لَهِيَ الْآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلَاثِ مِرَارٍ. قَالَ: فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وقَالَ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ. يَعْنِي يَمِينَهُ، ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً، ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، قَالَ: وكَانَ بَيْنَنَا وبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ، فَمَضَى الْأَجَلُ، فَعَرَّفْنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا، مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ، اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ، قَالَ: إِلَّا أَنَّهُ بَعَثَ مَعَهُمْ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ. أَوْ كَمَا قَالَ. **(بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٧٧)**

له (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبو بکر)ەوە : کە (أصحاب الصّفه)چەند کەسێکی هەژاربوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان فەرمووی: "هەر کەس خواردنی دوانی لاهەیە باسیان بەرێتەوە، هەرکەس چواری لا هەیە با پێنج، شەش بەرێتەوە". یان شتێکی لەم جۆرەی فەرموو، (أبو بکر)هاتەوە بەسێ کەسەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت بەدەکەسەوە، أبوبکر بەسیانەوە، وتی: ئەوو من و باوکم و دایکم، نازانم ئایا وتی: خێزانم و خزمەتکارێك لە نێوان ماڵی ئێمە و ماڵی أبوبکر دا، وتی: أبوبکر نانی ئێوارەی خوارد لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پاشان لەوێ مایەوە هەتا نوێژی عیشا کرا، دیسان گەڕایەوە و مایەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) خەو دایگرت، هاتەوە دوای ئەوەی شەو ئەوەندەی لێ ڕۆیی کەخوا ویستی، خێزانەکەی پێی وت: چی دوای خستی لەمیوانەکانت؟ –یان وتی: میوانەکەت– وتی: بۆچ نانی ئێوارەت

نەداونێ؟ وتی: نانیان نەخوارد تا تۆ بێیتەوە نانیشیان بۆ دانان، بەڵام قسەی خۆیان سەرخست، عبدالرحمن دەڵێ: من ڕۆیشتم خۆم شاردەوە (لەترسی باوکم) بانگی لێکردم: ئەی ڕەزیل، ئەی نەزان، دوعای لێکردم و قسەی پێوتم، وتی: نان بخۆن عافیەتتان نەبێ (والله) من قەت لەگەڵتان ناخۆم،(عبدالرحمن) دەڵێ: سوێندم بەخوا هەر پارویەکمان هەڵدەگرت لەبنەوە زیادی دەکرد زیاتر لەپاروەکە، دەڵێ: هەتا تێرمان خوارد زیاتر بوو لەجاران، (أبو بكر)(ﷺ) تەماشای کرد وەك خۆی مابوو یان زیاتر، بەخێزانەکەی وت: ئەمەچییە ئەی خوشکی (بني فراس)؟ وتی: نەخێر –چاوم ڕوون– ئێستە سێقات زیاترە لەجاران (عبدالرحمن) دەڵێ: ابوبکر لێیخوارد و وتی: ئەوەیش لە شەیتانەوە بوو. مەبەستی سوێندەکەی بوو، لەپاشدا پارویەکی لێخوارد و بردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) شەوتابەیانی لای ئەو مایەوە، دەڵێ: لەنێوان ئێمە و قەومێك پەیمانێك هەبوو ماوەکەی تەواو بوو (هاتن بۆ مەدینە) دوانزە کەسمان لێکردن بە (عەریف) هەر یەکێ لەوانیش چەندکەسێکیان لەگەڵ بوو، خوا دەزانێ یەکی چەند کەسیان لەگەڵ بوو، بەڵام پێغەمبەر بەواندا خواردنەکەی نارد (بۆیان) هەموویان بەگشتی لێیان خوارد.

## ( ٥ ) لەتبوونی مانگەشەو

**٨٠٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِمِنًى إِذَا انْفَلَقَ الْقَمَرُ فِلْقَتَيْنِ، فَكَانَتْ فِلْقَةٌ وراء الْجَبَلِ وفِلْقَةٌ دُونَهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اشْهَدُوا". (بخاري/ المناقب/ ٣٤٣٧)**

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) لە مینا (دیمان) مانگ بوو بەدوکەرتەوە کەرتێکیان لەپشتی چیاکەوە بوو کەرتێکیشیان لەملای چیاکەوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووین: "شایەت بن".

**٨٠٩ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فَأَرَاهُمُ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ مَرَّتَيْنِ. (بخاري/ المناقب/ ٣٤٣٨)**

لە(أنس)ی کوڕی (مالك)ەوە (ﷺ) کە خەڵکی مەککە داوایان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەیەکیان نیشان بدات، دوجار لەتبونی مانگی پیشاندان.

## ( ٦ ) پاراستنی پێغەمبەر لە کەسێك کە ویستی بیکوژێت

**٨١٠ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَأَدْرَكَنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَعَلَّقَ سَيْفَهُ بِغُصْنٍ مِنْ أَغْصَانِهَا، قَالَ: وَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الْوَادِي يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ (قَالَ): فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ رَجُلًا أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ فَأَخَذَ السَّيْفَ، فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي، فَلَمْ أَشْعُرْ إِلَّا وَالسَّيْفُ صَلْتًا فِي يَدِهِ، فَقَالَ لِي: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ فِي الثَّانِيَةِ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ، قَالَ: فَشَامَ السَّيْفَ، فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ". ثُمَّ لَمْ يَعْرِضْ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). (بخاري/ المغازي/ ٣٩٠٨)**

لە(جابر)ی کوڕی (عبدالله)وە (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) چووین بۆ جەنگێك لەلای نەجدەوە، توشی پێغەمبەر (ﷺ) هاتین لە دۆڵێکدا درەختی دڕکاوی زۆر تێدابوو، پێغەمبەر (ﷺ) لەبن درەختێکدا دابەزی و شمشێرەکەی هەڵواسی بەلقێك لە لقەکانیدا، دەڵێ: خەڵکیش بڵاوەی کرد لەو دۆڵەدا بۆ بن سێبەری درەختەکان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "پیاوێك هات بۆلام من خەوتبووم، شمشێرەکەی هەڵگرتبوو وەختێ خەبەر بوومەوە بەسەرسەرمەوە وەستابوو، شمشێرەکەی بەڕووتی بەدەستەوە گرتبوو،پێی وتم: کێ لەمن دەتپارێزێ؟ وتم: الله، جاری دووهەم وتی: کێ لە من دەتپارێزێ؟ وتم: الله، فەرمووی: "شمشێرەکەی کردەوە بەکێلانیدا، ئەوەتا ئێستا دانیشتووە، دوای ئەوەیش پێغەمبەر (ﷺ) هیچ سزایەکی نەدا.

## ( ٧ ) ژەهر و خواردنی مەڕی ژەهراوی

**٨١١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ): أَنَّ امْرَأَةً يَهُودِيَّةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَتْ: أَرَدْتُ لِأَقْتُلَكَ. قَالَ: "مَا كَانَ اللَّهُ لِيُسَلِّطَكِ عَلَى ذَاكِ". قَالَ: أَوْ قَالَ: "عَلَيَّ". قَالَ: قَالُوا: أَلَا نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: "لَا" قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). (بخاري/ الهبة/ ٢٤٧٤)**

لە(أنس)ەوە (ﷺ) کە ئافرەتێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، لێی خوارد، ئافرەتەکەیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پرسیاری لێکرد لەوبارەوە؟ وتی: ویستم بتکوژم، فەرمووی: "خوا توانای ئەوەت ناداتێ"، (أنس)

دەڵێ: یان وتی بەسەرمندا، وتیان ئەی نەیکوژین؟ فەرمووی: "نە" أنس دەڵێ: هەمووکات (شوێنەواری ئەو ژەهرەم) دەبینی لە زمانە بچکۆڵەی پێغەمبەردا (ﷺ).

## ( ٨ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) پێکاویەتی لە خەمڵاندندا

٨١٢ـ عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُول اللَّه (ﷺ) غَزْوَةَ تَبُوك، فَأَتَيْنَا وادِيَ الْقُرَى عَلَى حَدِيقَةٍ لامْرَأَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اخْرُصُوهَا". فَخَرَصْنَاهَا، وخَرَصَهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، وقَالَ: "أَحْصِيهَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَيْك إِنْ شَا و اللَّهُ". وانْطَلَقْنَا حَتَّى قَدِمْنَا تَبُوكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "سَتَهُبُّ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَةَ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَلَا يَقُمْ فِيهَا أَحَدٌ مِنْكُمْ، فَمَنْ كَانَ لَهُ بَعِيرٌ فَلْيَشُدَّ عِقَالَهُ". فَهَبَّتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ، فَقَامَ رَجُلٌ، فَحَمَلَتْهُ الرِّيحُ حَتَّى أَلْقَتْهُ بِجَبَلَيْ طَيِّئٍ، وجاء رَسُولُ ابْنِ الْعَلْماء صَاحِبِ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) بِكِتَابٍ، وأَهْدَى لَهُ بَغْلَةً بَيْضَا و، فَكَتَبَ إِلَيْه رَسُولُ اللَّه (ﷺ) وأَهْدَى لَهُ بُرْدًا، ثُمَّ أَقْبَلْنَا حَتَّى قَدِمْنَا وادِيَ الْقُرَى، فَسَأَلَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) الْمَرْأَةَ عَنْ حَدِيقَتِهَا كَمْ بَلَغَ ثَمَرُهَا؟ فَقَالَتْ: عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنِّي مُسْرِعٌ، فَمَنْ شَا و مِنْكُمْ فَلْيُسْرِعْ مَعِيَ، ومَنْ شَا و فَلْيَمْكُثْ". فَخَرَجْنَا حَتَّى أَشْرَفْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ: "هَذِه طَابَةُ، وهَذَا أُحُدٌ، وهُوَ جَبَلٌ يُحِبُّنَا ونُحِبُّهُ". ثُمَّ قَالَ: "إِنَّ خَيْرَ دُورِ الْأَنْصَارِ دَارُ بَنِي النَّجَّارِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي عَبْدِ الْحَارِث بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ دَارُ بَنِي سَاعِدَةَ، وفِي كُلِّ دُورِ الْأَنْصَارِ خَيْرٌ". فَلَحِقَنَا سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ: أَبُو أُسَيْدٍ: أَلَمْ تَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) خَيَّرَ دُورَ الْأَنْصَارِ، فَجَعَلَنَا آخِرًا؟ فَأَدْرَكَ سَعْدٌ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، خَيَّرْتَ دُورَ الْأَنْصَارِ، فَجَعَلْتَنَا آخِرًا؟ فَقَالَ: "أَوَ لَيْسَ بِحَسْبِكُمْ أَنْ تَكُونُوا مِنَ الْخِيَارِ". **(بخاري/ الزكاة/ ١٤١١)**

(أبو حميد) (رضي الله عنه) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) چووین بۆ جەنگی تەبووك، لە(وادی القری)دا تێپەڕین بەلای باخی ئافرەتێکدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بیخەملێنن". ئێمە خەملاندمان، پێغەمبەریش (ﷺ) خەملاندی بە دە ویسق و فەرمووی: "بیژمێرە تا دەگەڕێینەوە (أنشاالله) ڕۆیشتین تا چووینە تەبووك، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەمشەو بایەکی زۆر سەخت هەڵدەکات لەسەرتان، کەس لەئێوە لەوکاتەدا هەڵنەسێ، هەرکەس وشتری هەیە باگوریسەکەی توندکات" بایەکی زۆر توند هەڵیکرد پیاوێك هەستا بابردی هەتا لە کێوی (طیئ)دا فڕێیدا، نێردراوی (أبن العلمط )و فەرمانداری (أیلە) هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) نامەیەکی بۆ

هێنابوو هێسترێکی سپیشی به دیاری بۆ ناردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵام نامەی بۆ نوسیەوە و عەبایەکیشی بەدیاری بۆ نارد، پاشان هاتین تا گەیشتینە (وادی القری)، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری کرد له ئافرەتەکە: "بەروبومی باخەکە چەند بوو؟" وتی: دە ویسق دەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "من پەلەمە ، هەرکەس دەیەوێت لەگەڵم پەلە بکات، هەر کەس دەیەوێت بابمێنێتەوە" ڕۆیشتن هەتا مەدینەمان لێوە دەرکەوت، فەرمووی: "ئەمە (طابة)یە و، ئەویش (أحد)ە شاخێکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێت، دوای ئەوە فەرمووی: "چاکترین بنەماڵەی یاریدەدەرەکان بنەماڵەی (بنی النجار)ە ئینجا بنەماڵەی (بنی عبدالاشهل)ە، ئینجا بنەماڵەی (بني حارث بن الخزرج)ە ئینجا بنەماڵەی (بني ساعدة)یەو لەهەموو بنەماڵەی یاریدەدەرەکاندا چاکە هەیە، (سعد)ی کوڕی (عُبادة)پێمانگەیشت، (أبو أسَید)پێی وت: نەتزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بنەماڵەی یاریدەدەرەکانی هەڵسەنگاند بەخێر، ئێمەی خستە دواوە، (سعد) خۆی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) وتی: یا رسول الله بنەماڵەی یاریدەدەرەکانت هەڵسەنگان بەخێر ئێمەت خستە پاشکۆوە؟ فەرمووی: "ئەی ئەوەندەتان بەس نیە کە لەچاکەکان بن؟".

## ( ٩ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) من پشتێنەتان دەگرم

٨١٣ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَثَلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَلَمَّا أَضَا وتْ مَا حَوْلَهَا جَعَلَ الْفَرَاشُ وهَذه الدَّوَابُّ الَّتي في النَّارِ يَقَعْنَ فيهَا، وجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ ويَغْلِبْنَهُ فَيَتَقَحَّمْنَ فيهَا، قَالَ: فَذَلِكُمْ مَثَلِي ومَثَلُكُمْ، أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، هَلُمَّ عَنِ النَّارِ، فَتَغْلِبُونِي تَقَحَّمُونَ فِيهَا". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١١٨)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "نموونەی من وئێوە وەك پیاوێك وەهایە ئاگرێکی خۆشکردبێت لەکاتێکدا دەوروبەری خۆی ڕوونکردەوە، پەپولە و چرپوجانەوەر خۆیان دەخەنە ناو ئاگرەکە، ئەو هەر ئەیەوێ ڕێگایان لێبگرێ، بەڵام زاڵدەبن بەسەریدا و خۆیان فڕێدەدەنە ناو ئاگرەکە، فەرمووی: "ئەمە نموونەی من و ئێوەیە، من پشتێنەتان دەگرم لەو ئاگرە و (دەڵێم دورکەونەوە لە ئاگر دورکەونەوە لە ئاگر، کەچی ئێوە لە دەستم دەردەچن و خۆتان فڕێ دەدەنە ناو ئاگرەکە)".

## ( ١٠ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) خواناسترین کەسە

٨١٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فِي أَمْرٍ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَغَضِبَ حَتَّى بَانَ الْغَضَبُ فِي وجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: "مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْغَبُونَ عَمَّا رُخِّصَ لِي فِيهِ؟ فَوَاللَّهِ لَأَنَا أَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً". **(بخاري/ الأدب/ ٥٧٥٠)**

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگایدا بەكارێك هەندێ كەس لەوخەڵكە نەیانكردو بەلایانەوە باش نەبوو، ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕقی هەستا هەتا لە ڕوخساریدا دیاربوو، پاشان فەرمووی: "هۆی چییە هەندێ كەس دەبینم خۆیان لائەدەن لەشتێك ڕێگای پێدراوە؟ سوێند بەخوا من خواناسترین كەسیانم لە هەموویشیان زیاتر لە خوا دەترسم".

**٨١٥ـ** عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، ومَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِنَفْسِهِ إِلَّا أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ عَزَّ وجَلَّ. **(بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٧)**

(عائشة)(رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچكات سەرپشك نەكراوە لە نێوان دوو كاردا مەگەر كامیان ئاسانە ئەوەیانی هەڵبژاردووە ئەگەر تاوان نەبووبێت، ئەگەر تاوان بووبێت ئەوە دوورترین كەس بووە لێی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ كات تۆڵەی بۆ نەفسی خۆی نەسەندووە، مەگەر سنووری خوای گەورە پێشێل كرابێت".

## ( ١١ ) نوێژكردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) هەتا هەردوو پێی ئاوساوە

٨١٦ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) صَلَّى حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَكَلَّفُ هَذَا، وقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ ومَا تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ: "أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا" (بخاری / التهجر/ ١٠٧٨).

لە(مغیرة)ی كوڕی (شعبه)وە (رضي الله عنه) كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە نوێژكرد هەتا قاچەكانی ئاوسان، پێی وترا: بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەكەیت، خۆ خوا لە گوناهی ڕابووردوت و داهاتووت خۆشبووە، فەرمووی: "ئەی من بەندەیەكی سوپاسگوزار نەبم؟".

**( ١٢ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) من پێشەنگی کاروانتانم بۆ سەر حەوزەکە**

٨١٧ـ عن جُنْدَب (رضي الله عنه) قالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: "أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦٢٧١)**

(جندب)(رضي الله عنه) دەڵێ: بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "من پێشەنگی کاروانتانم بۆ سەر حەوزەکە".

**( ١٣ ) گەورەیی حەوزەکەی پێغەمبەر ( ﷺ )**

٨١٨ـ عن عَبْدُ اللَّه بْنُ عَمْرِو ابْنِ الْعَاصِ (رضي الله عنه) قَالَ: رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، وزَوَايَاهُ سواء، ومَاؤُهُ أَبْيَضُ منَ الْوَرِقِ، وريحهُ أَطْيَبُ منَ الْمسْك، وكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السماء، فَمَنْ شَرِبَ منْهُ فَلَا يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا". قَالَ: وقَالَتْ اسماء بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنها): قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنِّي عَلَى الْحَوْضِ حَتَّى أَنْظُرَ مَنْ يَرِدُ عَلَيَّ مِنْكُمْ، وسَيُؤْخَذُ أُنَاسٌ دُونِي فَأَقُولُ: يَا رَبِّ مِنِّي ومِنْ أُمَّتِي، فَيُقَالُ: أَمَا شَعَرْتَ مَا عَمِلُوا بَعْدَكَ، واللَّه مَا بَرِحُوا بَعْدَكَ يَرْجِعُونَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ". قَالَ: فَكَانَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ أَنْ نَرْجِعَ عَلَى أَعْقَابِنَا، أَوْ (أَنْ) نُفْتَنَ عَنْ دِينِنَا. **(بخاري/ الرقاق/ ٦٢٠٦، ٦٢٠٨، ٦٢١٩، ٦٢٢٠)**

(عبدالله) کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عاص) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "حەوزەکەی من مانگێ ڕێگایە، سوچەکانی یەکسانن ئاوەکەی سپیترە لە زیو، بۆنی خۆشترە لە میسك، سوراحییەکانی ئەوەندەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەس لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینوی نابێت" (عبدالله)و (اسماء)ی کچی أبوبکر (رضي الله عنهم) دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "من لەسەر حەوزەکەم، تەماشا دەکەم کێ لەئێوە دێت بۆلام، کەسانێك ڕێی لای منیان لێدەگیرێ، دەڵێم: ئەی پەروەردگار ئەوانە لە منن، لە ئوممەتی منن، دەوترێ: ئەی نازانیت دوای تۆ چییان کردووە؟ سوێند بەخوا دوای تۆ هەر خەریکی پاشگەزبوونەوە بوون (لەئاینەکەت)".

بۆیە (أبن أبي مُليكة)دەپاڕایەوە: "ئەی خوایە پەنا دەگرین بەتۆ لەوەی پاشگەزببینەوە یان توشی تاقیکردنەوەی لادان لەدین ببین".

٨١٩ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا كَمَا بَيْنَ جرباء وأَذْرُحَ"، وفِي رِوَايَةٍ: "حَوْضِي". وفِي رِوَايَةٍ: قَالَ عُبَيْدُ اللَّه: فَسَأَلْتُهُ –يعني نافعاً– فَقَالَ: قَرْيَتَيْنِ بِالشَّأْمِ، بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ ثَلَاثِ لَيَالٍ، وفِي رِوَايَةٍ: ثلاثة أيام. **(بخاري/ الرقاق/ ٦٢٠٦، ٦٢٠٨، ٦٢١٩، ٦٢٢٠)**

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لەبەردەمتاندا حەوزێك هەیە بەپانی نێوان (جرباء) و (أذرح) لەڕیوایەتێکدا: (حەوزەکەی من) لەڕیوایەتێکدا عبیدالله دەڵێ: پرسیارم کرد لە (نافع) وتی: ئەو دوو شوێنە دوو گوندن لەشام نێوەندیان سێ شەو ڕێگایە، لە ڕیوایەتێکی تردا: سێ ڕۆژ.

**٨٢٠ـ عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: "إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ وأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وإِنِّي واللَّهِ لَأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الْآنَ، وإِنِّي قَدْ أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الْأَرْضِ، أَوْ: مَفَاتِيحَ الْأَرْضِ، وإِنِّي واللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، ولَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَتَنَافَسُوا فِيهَا". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٩)**

(عَقبة)ەی کوڕی (عامر) (رضي الله عنه) دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو نوێژی کرد لەسەر شەهیدەکانی (اُحد) وەك نوێژی مردوو، پاشان چووە سەر مینبەر و فەرمووی: "من پێشەنگی ئێوەم ومن شایەتم لەسەرتان، سوێندم بەخوا ئێستا من تەماشای حەوزەکەم دەکەم، من کلیلی گەنجینەکانی زەوی، یان کلیلی زەویم پێبەخشراوە، سوێندم بەخوا ناترسم لێتان کە دوای من هاوەڵ بۆ خوا بڕیاربدەن، بەڵام لەوە دەترسم لەسەردنیا کێبەرکێ بکەن".

## (١٤) شێوەو تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ)

**٨٢١ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ ولَا بِالْقَصِيرِ، ولَيْسَ بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ ولَا بِالْآدَمِ، ولَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ ولَا بِالسَّبِطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ وبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً ولَيْسَ فِي رَأْسِهِ ولِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَا و. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٥)**

(أنس)ی کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر باڵا بەرز نەبوو، کورتە باڵاش نەبوو، زۆر سپی و گەچین نەبوو زۆر گەنم ڕەنگیش نەبوو، زۆر قژی لول نەبوو زۆریش نەرم و خاو نەبوو، خوای گەورە لەچل ساڵیدا کردی بەپێغەمبەر (ﷺ)، دەساڵ لە مەککە مایەوە، دەساڵیش لەمەدینە، خوای گەورە شەصت ساڵیدا گیانی کێشا هێشتا سەر و ڕیشی بیست مووی سپی تێ نەکەوتبوو.

٨٢٢ـ عن الْبراء (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) رَجُلًا مَرْبُوعًا، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ، عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَا و، مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ (ﷺ). (بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٨)

(براء)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی میانەباڵا و ناوشان پان بوو، قژی بەردەدایەوە تاسەر نەرمەی گوێی، دەستێ جلی سووری لەبەر دەکرد، هیچ شتێکم لەو جوانتر نەبینیوە.

## ( ١٥ ) مۆری پێغەمبەرایەتی

٨٢٣ـ عن السَّائبَ بْنَ يَزِيدَ (ﷺ) قالَ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي ودَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وضُوئِه، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الْحَجَلَةِ. (بخاري/ الوضوء/ ١٨٧)

(سائب)ی کوڕی (یزید)دەڵێ: پورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم خوشکەزایەم ئازاری هەیە، دەستی هێنا بەسەرمدا دوعای پیرۆزبوونی بۆ کردم، لەدواییدا دەستنوێژی گرت و لەئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، ئەمجا هەستام و چوومە پشتییەوە تەماشای مۆرەکەیم کرد لە نێوەندی هەردوو شانیدا وەك هێلکەی کۆتر بوو.

## ( ١٦ ) شێوەی ڕیشی پێغەمبەر ( ﷺ )

٨٢٤ـ عَنْ أَنَس بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: كان يُكْرَهُ أَنْ يَنْتفَ الرَّجُلُ الشَّعْرَةَ الْبَيْضَا و مِنْ رَأْسِه ولِحْيَتِه، قَالَ: ولَمْ يَخْتَضِبْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، إِنَّمَا كَانَ الْبَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ وفِي الصُّدْغَيْنِ، وفِي الرَّأْسِ نَبْذٌ. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٧)

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی ناخۆش بوو پیاو مووی سپی لەسەر و ڕیشی هەڵبکەنێت، دەڵێ: خەنەشی نەگرتۆتە سەر و ڕیشی، چونکە تەنها کەمێك لەچەناگەی و لاجانەکانی و چەند تاڵێك لەسەری سپی بوو بوو.

## ( ١٧ ) مووی سپی پێغەمبەر ( ﷺ )

٨٢٥ـ عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَبْيَضَ قَدْ شَابَ، كَانَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيّ (ﷺ) يُشْبِهُهُ. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٥٠، ٣٣٥٢)

(أبي جحيفة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەرم دی (ﷺ) سپی و رووگەش بوو چەند تاڵێك مووی سپی بوو حەسەنی كوڕی عەلی (رضي الله عنه) لەو دەچوو.

### ( ١٨ ) شێوەی مووی پێغەمبەر ( ﷺ )

**٨٢٦ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ. (بخاري/ اللباس/ ٥٥٦٣)**

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: مووی سەری پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیشتە هەردوو شانی.

**٨٢٧ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ. (بخاري/ اللباس/ ٥٥٦٤)**

(أنس)(رضي الله عنه) دەڵێ: مووی سەری پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیشتە ناوەڕاستی هەردوو گوێی.

### ( ١٩ ) بەردانەوەی مووی پێغەمبەر ( ﷺ ) جیاكردنەوەی

**٨٢٨ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدُلُونَ أَشْعَارَهُمْ، وكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُ ووسَهُمْ، وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ بِهِ، فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَاصِيَتَهُ ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٥)**

(أبـن عبـاس) (رضي الله عنه) دەڵـێ: خـاوەن پەیامـەكان (أهـل الكتـاب) قـژیان شـۆڕ دەكردەوە، بت پەرستەكانیش دەیانكرد بە دوو پارچەوە بەلای ڕاست و چەپدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزیدەكرد وەك ئەهلی كیتاب بكات لەشتێكدا كە فەرمانی بۆ نەهاتبایە، بۆیە ماوەیەك بەسـەر ناوچەوانیدا بەریدایـەوە، دواتـر جیـای دەكـردەوە بەڕاست و چەپی سەریدا.

### ( ٢٠ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) شەرمن تربوو لەگەورە كچی ناو پەردە

**٨٢٩ـ عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رضي الله عنه) قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَشَدَّ حَيَا و منَ الْعَذْرَا و فِي خِدْرِهَا، وكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا عَرَفْنَاهُ فِي وجْهِهِ. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٩)**

(أبو سعيد الخدري)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) لەگەورەكچـی ناوپـەردە زیـاتر شەرمی دەكرد و، ئەگەر شتێكی لاناخۆش بوایە لەڕومەتیا دەمانزانی.

### ( ٢١ ) بۆنخۆشیی پێغەمبەر و نەرمیی لە پی

**٨٣٠ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَزْهَرَ اللَّوْنِ، كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، ولَا مَسِسْتُ دِيبَاجَةً ولَا حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، ولَا شَمِمْتُ مِسْكَةً ولَا عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). (بخاري/ المناقب/ ٣٣٦٨)**

(أنس)ی كوڕی (مالك) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) سپی و گەش بوو، عەرەقی وەك مرواری وەهابوو، كەدەڕۆیی بەڕێدا لەنجەی دەكرد بەڕاست و چەپدا، دەستم لەهیچ ئاوریشمێك نەداوە لەناولەپی پێغەمبەر (ﷺ) نەرمتر بوبێت، بۆنی هیچ میسك و عەنبەرێكم نەكردووە لەبۆنی ئەو خۆشتر بووبێت.

## (٢٢) عەرەق كردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەرزی سەرمادا لەكاتی وەحی بۆ هاتنیدا

٨٣١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: إِنْ كَانَ لَيُنْزَلُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي الْغَدَاةِ الْبَارِدَةِ، ثُمَّ تَفِيضُ جَبْهَتُهُ عَرَقًا. **(بخاري/ بدء االوحي/ ٢)**

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: بەیانی زۆر سارد وەحی دادەبەزییە سەر پێغەمبەر (ﷺ)، ناوچەوانی ئارەقی لێهەڵدەنیشت.

٨٣٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ سَأَلَ النَّبِيَّ (ﷺ): كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ: "أَحْيَانًا يَأْتِينِي فِي مِثْلِ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ، ثُمَّ يَفْصِمُ عَنِّي وقَدْ وعَيْتُهُ، وأَحْيَانًا مَلَكٌ فِي مِثْلِ صُورَةِ الرَّجُلِ، فَأَعِي مَا يَقُولُ". **(بخاري/ بدء االوحي/ ٢)**

لە(عائشة)ەوە (رضي الله عنها) كە (حارث)ی كوڕی (هشام) پرسیاری كرد لە پێغەمبەر (ﷺ): چۆن وەحیت بۆ دێ؟ فەرمووی: "هەندێ كات وەك دەنگی زەنگ بۆم دێت، ئەمەیان سەختترین جۆریانە لەسەرم، لەپاشا لێم جیا دەبێتەوە كاتێ تەواو تێیگەیشتم، هەندێ جاریش فریشتەیەكە لەوێنەی پیاوێكدا، ئەوەی دەیڵێ تێی دەگەم.

**٨٣٣ـ** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: دَخَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ عِنْدَنَا، فَعَرِقَ، وجاءتْ أُمِّي بِقَارُورَةٍ فَجَعَلَتْ تَسْلُتُ الْعَرَقَ فِيهَا، فَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: "يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ". قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ، نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا، وهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ. (بخاری / الاستئذان/ ٥٩٢٥)

(أنس)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لامان و نیوەڕۆ خەوی كرد لای ئێمە، ئارەقی كرد، دایكم شوشەیەكی هێنا ئارەقەكەی دەسڕیە ناوی، پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری بویەوە فەرمووی: "ئەی (أم سلیم) ئەوەچی دەكەیت؟ وتی: ئەوە ئارەقی تۆ دەكەینە ناو گوڵاوەكانمان، كە خۆشترین بۆنە.

## ( ٢٣ ) پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەبەزەییترین کەس بووە بۆ منداڵ و خێزان

٨٣٤ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَرْحَمَ (الناس) بِالْعِيَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: كَانَ إِبْرَاهِيمُ مُسْتَرْضِعًا لَهُ فِي عَوَالِي الْمَدِينَةِ، فَكَانَ يَنْطَلِقُ وَنَحْنُ مَعَهُ فَيَدْخُلُ الْبَيْتَ وَإِنَّهُ لَيُدَّخَنُ، وكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا، فَيَأْخُذُهُ فَيُقَبِّلُهُ، ثُمَّ يَرْجِعُ. قَالَ عَمْرٌو: فَلَمَّا تُوُفِّيَ إِبْرَاهِيمُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ إِبْرَاهِيمَ ابْنِي، (وَإِنَّهُ) مَاتَ فِي الثَّدْيِ، وَإِنَّ لَهُ لَظِئْرَيْنِ تُكَمِّلَانِ رَضَاعَهُ فِي الْجَنَّةِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٤١)

(أنس)ی کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: هیچ کەسم نەدیوە بەبەزەییتر بووبێت بۆ خێزانی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ: (أبراهيم) درابوو بە دایەن لە گوندەکانی دەوروبەری مەدینە، جاری وابوو دەچوو بۆلای و ئێمەیش لەگەڵی بووین، دەچووە ئەو ماڵە کە چەڕە دووکەڵی لێهەڵدەستا چونکە مێردی شیردەرەکەی (ابراهيم) ئاسنگەر بوو، پێغەمبەر (ﷺ)دەیگرت و ماچی دەکرد و پاشان دەگەڕایەوە. (عمرو) دەڵێ: کاتێ إبرهيم مرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ابراهيم کوڕی من بوو، ئەو مرد لەکاتێکدا دەم بە مەمك بوو، دوو شیردەری هەن لەبەهەشتدا ماوەی شیردانەکەی بۆ تەواو دەکەن".

تێبینیی: لەئەصلەکەدا (يكملان) هاتووە واتە مەبەست دوو شیردەرەکەیە.

٨٣٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ أَبْصَرَ النَّبِيَّ (ﷺ) يُقَبِّلُ الْحَسَنَ، فَقَالَ: إِنَّ لِي عَشْرَةً مِنَ الْوَلَدِ، مَا قَبَّلْتُ واحِدًا مِنْهُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّهُ مَنْ لَا يَرْحَمْ لَا يُرْحَمْ". (بخاري/ الأدب/ ٥٦٥١)

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: (أفرع)ی کوڕی (حابس) پێغەمبەری (ﷺ) دی (حسین)ی ماچ دەکرد، (اقرع) وتی: بەڕاستی من دە منداڵم هەیە کەسیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەرکەس ڕەحمی نەبێت ڕەحمی پێناکرێت".

## ( ٢٤ ) بەزەیی پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ ئافرەتان

٨٣٦ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِه، وغُلَامٌ أَسْوَدُ يُقَالُ لَهُ أَنْجَشَةُ يَحْدُو، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقًا بِالْقَوَارِيرِ". (بخاري/ الأدب/ ٥٧٩٧)

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێکدا غولامێکی ڕەشیان لەگەڵدابو پێی دەوترا (أنجشة) گۆرانی دەوت بۆ ئەوەی وشترەکان خێرا بڕۆن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەی (أنجشة) نەرم و نیانبە بۆ لێخوڕینی وشتری شوشەکان". (مەبەستی ئافرەتەکان بوو).

## ( ٢٥ ) ئازايەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) و پێشڕەوی بۆ جەنگ

**٨٣٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ، وكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ، وكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ، ولَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ نَاسٌ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَتَلَقَّاهُمْ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) رَاجِعًا، وقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ، وهُوَ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ فِي عُنُقِه السَّيْفُ، وهُوَ يَقُولُ: "لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا". قَالَ: "وَجَدْنَاهُ بَحْرًا. أَوْ: إِنَّهُ لَبَحْرٌ". قَالَ: وكَانَ فَرَسًا يُبَطَّأُ. (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٥١)**

(أنس)ی كوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوانترین كەس بوو، سەخیترین كەس بوو، ئازاترین كەس بوو، شەوێكیان خەڵكی مەدینە بەدەم دەنگێكەوە ڕاچڵەكان و بەرەو ڕووی دەنگەكە دەرچوون، پێغەمبەر (ﷺ) پێیانگەیشت لەوسەرەوە دەگەڕایەوە، چونكە ئەو بەرلەوان ڕۆیشتبوو بۆ هەواڵی ئەو دەنگە، بەسواری ئەسپەكەی (أبو طلحة)كە پشتی ڕوت بوو پێغەمبەر (ﷺ) شمشێرێك لەملیدابوو، دەیفەرموو: "مەترسن، مەترسن". أنس دەڵێ: ئەو ئەسپەمان دی زۆر خێرا دەڕۆیشت یان وەك دەریا شەپۆلی دەدا، لەكاتێكدا پێشتر بە ئەسپێكی سست و تەمبەڵ ناسرابوو.

## ( ٢٦ ) پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بەدوای هەلی گونجاودا دەگەڕا بۆ ئامۆژگاریمان

**٨٣٨ـ عَنْ شَقِيقٍ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّه يُذَكِّرُنَا كُلَّ يَوْمِ خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّا نُحِبُّ حَدِيثَكَ ونَشْتَهِيه، ولَوَدِدْنَا أَنَّكَ حَدَّثْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ. فَقَالَ: مَا يَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ إِلَّا كَرَاهِيَةُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) كَانَ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الْأَيَّامِ، كَرَاهِيَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا. (بخاري/ العلم/ ٧٠)**

(شقيق أبو وائل) دەڵێ: عبدالله هەموو ڕۆژێكی پێنج شەممە ئامۆژگاری دەكردین، پیاوێك پێی وت: ئەی (ابو عبدالرحمن) ئێمە قسەكانی تۆمان پێخۆشە و حەزی پێدەكەین، پێمان خۆشە هەموو ڕۆژێك ئامۆژگاریمان بكەیت، وتی: من هیچ شتێ ڕێگرم نیە لەقسە بۆ كردنتان هەموو ڕۆژێك، ئەوە نەبێت پێم ناخۆشە بێزارتان بكەم، لەڕاستیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوبەناو لەهەلی گونجاودا ئامۆژگاری دەكردین لەترسی ئەوەی نەكو بێزار ببین.

## ( ٢٧ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) سەخیترین کەس بووە

٨٣٩ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، إِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السَّلَام كَانَ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ سَنَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ. **(بخاري/ بدء الوحي/٦)**

(أبن عباس)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەخیترین کەس بوو بۆ بەخشندەیی، سەخیترین کاتی لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، بەڕاستی (جبریل) (عليه السلام) هەموو ساڵێك لە ڕەمەزاندا تا تەواو دەبوو دەهات و، پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی ئاراستە دەکرد کاتێ جبریل پێی دەگەیی پێغەمبەر (ﷺ) لەبایەکی خێراو بەردەوام سەخیتر بوو.

**٨٤٠ـ** عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) شَيْئًا قَطُّ فَقَالَ: لَا. **(بخاري/ الأدب/ ٥٦٨٧)**

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز داوای شتێکی لێنەکراوە بفەرمووێ نەخێر.

## ( ٢٨ ) بەڵێنەکانی پێغەمبەر ( ﷺ )

٨٤١ـ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَوْ قَدْ جاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ، لَقَدْ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا". وقَالَ بِيَدَيْهِ جَمِيعًا، فَقُبِضَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَبْلَ أَنْ يَجِي و مَالُ الْبَحْرَيْنِ، فَقَدِمَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنه) بَعْدَهُ، فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: مَنْ كَانَتْ لَهُ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) عِدَةٌ أَوْ دَيْنٌ فَلْيَأْتِ. فَقُمْتُ فَقُلْتُ: إِنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "لَوْ قَدْ جاءَنَا مَالُ الْبَحْرَيْنِ أَعْطَيْتُكَ هَكَذَا وهَكَذَا وهَكَذَا". فَحَثَى أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) مَرَّةً، ثُمَّ قَالَ لِي: عُدَّهَا، فَعَدَدْتُهَا فَإِذَا هِيَ خَمْسُ مِائَةٍ، فَقَالَ: خُذْ مِثْلَيْهَا. **(بخاري/ الكفالة/ ٢١٧٤)**

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر سامانی بەحرەینمان بۆ بهاتایە، بەدڵنیاییەوە ئەوندە و ئەوەندە و ئەوەندەم پێدەبەخشیت" هەردوو دەستی کۆکردەوە و ئاماژەی پێکرد، پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی سامانی بەحرەین بگات، دوایی هاتەوە بۆ لای أبو بکر (رضي الله عنه) ئەویش فەرمانیدا بە جاڕچیەك جاریدا: کێ قەرزێك یان بەڵێنێکی هەیە لەسەر پێغەمبەر

(ﷺ) بابێت، من هەستام وتم: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر ماڵی بەحرەینمان بۆ بێت ئەوەندەو ئەوەندە و ئەوەندەت دەدەمێ" ئەبوبەکر هەردوو مشتی پڕکرد، لەپاشدا وتی بیژمێرە ژماردم پێنجسەد بوو فەرمووی دوو ئەوەندەی تریش وەرگرە.

## ( ٢٩ ) ژمارەی ناوەکانی پێغەمبەر ( ﷺ )

**٨٤٢ـ عن جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ لِي اسماء: أَنَا مُحَمَّدٌ، وأَنَا أَحْمَدُ، وأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ، وأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمَيَّ، وأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ". وقَدْ سَمَّاهُ اللَّهُ رَ ووفًا رَحِيمًا. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٣٩)**

لە(جبیر)ی کوڕی (مطعم)ەوە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "من چەند ناوێکم هەیە: من (محمد)م، من (أحمد)م من (ماحی)م واتا: لابەرم، خوا کوفر بەمن لادەبات، من (حاشر)م واتە ئەو کۆکەرەوەم کە خەڵك لەسەردەمی مندا حەشردەکرێت، من (عاقب)م واتە ئەو دوا کاروانەم کە کەسی تری بەدوادا نایەت، خوایش ناوی بردووە بە (رؤوف و رحيم).

## ( ٣٠ ) پێغەمبەر ( ﷺ ) چەند لەمەککە و مەدینە مایەوە؟

**٨٤٣ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِمَكَّةَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ (سَنَةً) يُوحَى إِلَيْهِ، وبِالْمَدِينَةِ عَشْرًا، ومَاتَ وهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وسِتِّينَ (سَنَةً). (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٨٩)**

(أبن عباس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە سیازدە ساڵ مایەوە وەحی بۆ دەهات، لەمەدینەیش دەساڵ، کاتێ وەفاتی کرد تەمەنی شەستو سێ ساڵ بوو.

**٨٤٤ـعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَقَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِمَكَّةَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، يَسْمَعُ الصَّوْتَ ويَرَى الضَّوْ و سَبْعَ سِنِينَ، ولَا يَرَى شَيْئًا، وثَمَانَ سِنِينَ يُوحَى إِلَيْهِ، وأَقَامَ بِالْمَدِينَةِ عَشْرًا. (بخاري/ فضال الصحابة/ ٣٦٩٠)**

(أبن عباس) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پازدە ساڵ لە مەککە مایەوە، حەوت ساڵیان دەنگی فریشتەی دەبیست و نووری دەبینی،بەڵام خودی فریشتەکەی نەدەبینی، هەشت ساڵیش وەحی بۆ دەهات، دە ساڵیش لەمەدینە مایەوە.

## ( ٣١ ) فەرموودەی خوا ( فَلَا ورَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ )

**٨٤٥ـ عن عَبْدَ اللَّه بْنَ الزُّبَيْرِ (رضي الله عنه): أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الماء يَمُرُّ.**

فَأَبَى عَلَيْهِمْ، فَاخْتَصَمُوا عِنْدَ رَسُول اللَّه (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) للزُّبَيْر: "اسْق يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِل الماء إِلَى جَارِكَ". فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وجْهُ نَبِيِّ اللَّه (ﷺ)، ثُمَّ قَالَ: "يَا زُبَيْرُ اسْق، ثُمَّ احْبِس الماء حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْر". فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّه إِنِّي لَأَحْسِبُ هَذه الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: (فَلَا وربِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ) الآية. (بخاري/ المساقاة/ ٢٢٣١)

له (عبدالله)ی کوڕی (زُبیر)ەوە (ﷺ) کە پیاوێك لە ئەنصارەکان دەمەقاڵێی بوو لەگەڵ (زبیر)دا لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) لەسەر جۆگەی (الحّره) کە خورماکانیان پێ ئاو دەدا، ئەنصارییەکە وتی: ئاوەکە بەردە بابڕوات زبیر ڕازی نەبوو، سکالایان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: "زوبێر تۆ مەزراکەت ئاودە و دوای ئەوە ئاوەکە بەردە بۆ دراوسێکەت" ئەنصارییەکە ڕقی هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر ئەوەی کە پورزاتە؟ ڕەنگی پێغەمبەر (ﷺ) تێکچوو، پاشان فەرمووی: "ئەی زوبێر مەزراکەت ئاودە و لەوەدوا ئاوەکە بگرەوە بابگەڕێتەوە بۆ پەنگاوەکان (زبیر) دەڵێ: والله من وادەزانم ئەم ئایەتە لەم بارەوە هاتە خوارەوە، ئەمەش واتاکەیەتی: (سوێند بێ بەخوا باوەڕیان تەواو نیە هەتا تۆ دەکەن بەحەکەم لەهەموو ئەو ناکۆکیانەی لەنێوانیاندا پەیدا دەبێ..)

## (٣٢) شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەی خوایش (ولا تسألوا عن اشياء ان تبدلكم تسؤكم)

٨٤٦ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: بَلَغَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) عَنْ أَصْحَابِه شيء، فَخَطَبَ فَقَالَ: "عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ والنَّارُ، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الْخَيْرِ والشَّرِّ، ولَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحكْتُمْ قَليلًا ولَبَكَيْتُمْ كَثيرًا". قَالَ: فَمَا أَتَى عَلَى أَصْحَاب رَسُول اللَّه (ﷺ) يَوْمٌ أَشَدُّ مِنْهُ. قَالَ: غَطَّوْا رُ ووسَهُمْ ولَهُمْ خَنِينٌ، قَالَ: فَقَامَ عُمَرُ (ﷺ) فَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّه رَبًّا، وبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا. قَالَ: فَقَامَ ذَاكَ الرَّجُلُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: "أَبُوكَ فُلَانٌ". فَنَزَلَتْ هذه الأية: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ اشياء إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) (المائدة: ١٠١). (بخاري/ الفتن/ ٦٦٧٨)

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: هەواڵگەیی بەپێغەمبەر (ﷺ) کە یارەکانی شتێکیان وتووە، وتاری دەخوێندەوەو فەرمووی: "بەهەشت و دۆزەخم پیشاندرا، ڕۆژی وەك ئەمڕۆم نەدی لەبینینی چاکە و خراپەدا، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم بتانزانیایە کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان" دەڵێ: یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی

لەوە سەختتریان بەسەردا نەهاتبوو، سەریان داپۆشیبوو دەگریان، (عمر)ی کوڕی (خطاب)(ﷺ) هەستا و وتی: ئێمە ڕازین بەوەی خوا پەروەردگارمان بێت. ئەمجا ئەو پیاوە هەستا وتی: کێ باوکی منە؟ فەرمووی: "باوکت فلان کەسە" دوای ئەوە ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە ئەمە واتاکەیەتی: (ئەی باوەڕداران پرسیار مەکەن لەهەندێ شت چونکە ئەگەر وەڵامەکەی بزانن پێتان ناخۆش دەبێت).

٨٤٧ـ عن سَعْدِ بن أبي وقاص (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ شيء لَمْ يُحَرَّمْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَحُرِّمَ عَلَيْهِمْ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ". (بخاري/ الاعتصام بالكتاب و السنة/ ٦٨٥٩)

(سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) (ﷺ) دەڵێ: تاوانبارترین موسڵمان لەنێو موسڵماناندا کەسێکە پرسیاربکات لەشتێك حەرام نەکرابێ بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام بکرێت.

## ( ٣٣ ) وازهێنان لەوشتەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕێگری لێکردووە

٨٤٨ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ، ومَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ، واخْتِلَافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ". (بخاري/ الاعتصام بالكتاب و السنة/ ٦٨٥٨)

لە(أبي هريرة)وە (ﷺ) کەلە پێغەمبەری بیستووە (ﷺ) دەیفەرموو: "ئەوەی ڕێگریم لێکردون خۆتانی لێبپارێزن، ئەوەی فەرمانم پێداون بەگوێرەی تواناتان ئەنجامی بدەن، بەڕاستی ئەو شتەی ئوممەتەکانی پێش ئێوەی لەناوبردووە، زۆر پرسیارکردنیان و لەفەرمانی پێغەمبەران دەرچوونیان بووە".

## ( ٣٤ ) خۆزگە خواستن بە بینینی پێغەمبەر ( ﷺ )

٨٤٩ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ فِي يَدِهِ، لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُمْ يَوْمٌ ولَا يَرَانِي، ثُمَّ لَأَنْ يَرَانِي أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ ومَالِهِ مَعَهُمْ". قَالَ أَبُو إِسْحَقَ –يعني ابن محمد بن سفيان–: الْمَعْنَى فِيهِ عِنْدِي: لَأَنْ يَرَانِي مَعَهُمْ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ أَهْلِهِ ومَالِهِ، ثم لا يراني. وهُوَ عِنْدِي مُقَدَّمٌ ومُؤَخَّرٌ". (بخاري/ المناقب/ ٣٣٩٤)

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) دەفـەرموێ: سـوێند بـەوەی گیـانی موحەممەدی بەدەستە ڕۆژێ دێ بەسەر یەکێ لەئێوەدا کە نامبینێ، ئەگەر بمبینـێ بەلایەوە خۆشترە لە خێزان و ماڵیشـی لەگـەڵ منداڵـەکانی" (أبـو اسـحاق) کـە (ابـن محمد)ی کوڕی (سفیان)ە دەڵێ: لای من مانای ئەم فەرموودە بەم شێوەیە: "ئەگـەر منی لەگەڵ ماڵ و منداڵی بینی منی پێخۆشـترە، بـەڵام نامبینـێ"، کەواتـە وشـەکان پاش وپێش خراون.

# بەشی پەنجا: پێغەمبەران و گەورەییان

**(١) خەتەنەکردنی إبراهیم (عليه السلام)**

٨٥٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلَام –وَهُوَ ابْنُ ثَمَانِينَ سَنَةً– بِالْقَدُومِ". **(بخاري/ الانبياء/ ٣١٧٨)**

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "ئیبراهیم پێغەمبەر (عليه السلام) لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا بەتەشوێ خەتەنە کراوە".

**(٢) فەرموودەی إبراهیم (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوتى)**

٨٥١–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذْ قَالَ: (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوتى قَالَ أَوَ لَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي) **(البقرة: ٢٦٠)**. **(قَالَ)** وَيَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ طُولَ لَبْثِ يُوسُفَ لَأَجَبْتُ الدَّاعِيَ". **(بخاري/ الانبياء/ ٣١٩٢)**

له(أبي هريرة)وە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "ئێمە شیاوترین لە (إبراهیم) بەگومانبردن لەکاتێکدا فەرمووی: "ئەی پەروەردگار پیشانم بدە کە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ فەرمووی: ئایا باوەڕت نیە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام با دڵم ئاو بخواتەوە، (فەرمووی) خوا ڕەحم بە لووط بکات، بەڕاستی پەنای گرتبوو بە پەناگایەکی بەهێز، ئەگەر من بە قەدەر یوسف لە زینداندا بمایامەوە وەڵامی بانگخوازەکەی (پادشام) ئەدایەوە.

**(٣) فەرمودەی إبراهیم (عليه السلام): (أني سقيم، بل فعله كبيرهم)**

٨٥٢–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "لَمْ يَكْذِبْ إِبْرَاهِيمُ النَّبِيُّ عَلَيْهِ السَّلَام قَطُّ إِلَّا ثَلَاثَ كَذَبَاتٍ ثِنْتَيْنِ فِي ذَاتِ اللَّهِ: قَوْلُهُ (إِنِّي سَقِيمٌ) **(الصافات: ٨٩)** و **(الثانية)** قَوْلُهُ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا) **(الانبياء: ٦٣)**. وَوَاحِدَةٌ فِي شَأْنِ سَارَةَ، فَإِنَّهُ قَدِمَ أَرْضَ جَبَّارٍ وَمَعَهُ سَارَةُ، وَكَانَتْ أَحْسَنَ النَّاسِ، فَقَالَ لَهَا: إِنَّ هَذَا الْجَبَّارَ إِنْ يَعْلَمْ أَنَّكِ امْرَأَتِي يَغْلِبْنِي عَلَيْكِ، فَإِنْ سَأَلَكِ فَأَخْبِرِيهِ أَنَّكِ أُخْتِي، فَإِنَّكِ أُخْتِي فِي الْإِسْلَامِ، فَإِنِّي لَا أَعْلَمُ فِي الْأَرْضِ مُسْلِمًا غَيْرِي وَغَيْرَكِ. فَلَمَّا دَخَلَ أَرْضَهُ رَآهَا بَعْضُ أَهْلِ الْجَبَّارِ. أَتَاهُ فَقَالَ لَهُ: لَقَدْ قَدِمَ أَرْضَكَ امْرَأَةٌ لَا يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تَكُونَ إِلَّا لَكَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا فَأُتِيَ بِهَا، فَقَامَ إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام إِلَى الصَّلَاةِ، فَلَمَّا دَخَلَتْ عَلَيْهِ لَمْ يَتَمَالَكْ أَنْ

بَسَطَ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَقُبِضَتْ يَدُهُ قَبْضَةً شَدِيدَةً، فَقَالَ لَهَا: ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي ولَا أَضُرُّك، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَةِ الْأُولَى، فَقَالَ لَهَا مِثْلَ ذَلِكَ، فَفَعَلَتْ، فَعَادَ فَقُبِضَتْ أَشَدَّ مِنَ الْقَبْضَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ، فَقَالَ: ادْعِي اللَّهَ أَنْ يُطْلِقَ يَدِي، فَلَكِ اللَّهَ أَنْ لَا أَضُرَّك، فَفَعَلَتْ، وأُطْلِقَتْ يَدُهُ، ودَعَا الَّذِي جاء بِهَا فَقَالَ لَهُ: إِنَّكَ إِنَّمَا أَتَيْتَنِي بِشَيْطَانٍ ولَمْ تَأْتِنِي بِإِنْسَانٍ، فَأَخْرِجْهَا مِنْ أَرْضِي وأَعْطِهَا هَاجَرَ، قَالَ: فَأَقْبَلَتْ تَمْشِي، فَلَمَّا رَآهَا إِبْرَاهِيمُ عَلَيْهِ السَّلَام انْصَرَفَ فَقَالَ لَهَا: مَهْيَمْ؟ قَالَتْ: خَيْرًا، كَفَّ اللَّهُ يَدَ الْفَاجِرِ وأَخْدَمَ خَادِمًا". قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَتِلْكَ أُمُّكُمْ يَا بَنِي ماء السماء. **(بخاري/ الانبياء/ ٣١٧٩)**

لـه(أبـی هريـره)وه (ﷺ) كـه پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموويـەتی: "ابـراهيم پێغەمبەر (ﷺ) قەت درۆی نەكردووه سێ درۆ نەبێ دوانيان لەبەر خوا: يەكەم وتی "مـن نەخۆشـم" (صـافات: ٨٩)، دووەم: وتـی ئەمـە گـەورەی بتـەكان كردوويـەتی (الانبياء:٦٣) سێهەميش لەبەر سارابوو، چونكە جارێك إبراهيم سارەيشی لەگەڵ بوو چووە شوێنێك پاشايەكی ستەمكاری لێبوو، سارەيش جوانترين كـەس بـوو، إبـراهيم پێی وت: ئەم ستەمكارە گەر بزانێ تۆ ژنی منی تۆم لێداگیر دەكات، ئەگەر پرسياری لێكردی هەواڵی بدەرێ كە تۆخوشكی منی، چـونكە تـۆ خوشـكمی لـە ئیسـلامدا مـن لەسەر ڕووی زەميندا موسڵمانێكی تر نازانم جگە لەخۆم و خۆت. كاتێ گەيشـتە ئـەو خاكە هەندێ لەدەست و پێوەندی ئەوستەمكارە سارای بينـی چووە لای پادشا و پێی وت: ئافرەتێك هاتوەتە ئەم خاكەی تۆ شياونيە بەكەسی تر جگە لـەتۆ، ناردی بەدوايدا و هێنايان، إبراهيم (ﷺ) هەستا بۆ نوێژ و پاڕانەوە، لەكاتێكدا سارا چـووە لای، ستەمكارە كە خۆی نەگرت دەستی بۆ درێژكرد دەستی گرمۆڵە بـوو، پێـی وت: بپاڕێرەوە دەستم بەربێت زيانم بۆت نابێت، پاڕايەوە،(دەستی بەربوو)دەسـتی درێـژ كردەوە، ئەمجارە توند تر لەجارەكەی پێشو گرمۆڵە بوو پێی وت: لەخوا بپـاڕێرەوە دەسـتم بـەردات، زيـانم بـۆت نابـێ، پاڕايـەوە (ديسـان) گەڕايـەوە تونـدتر لەهـەردو جارەكـەی پێشـوو گرمۆڵـە بـوو، وتـی: بـۆم بپـاڕێرەوە خـوا لەبـەينمانابێت زيانـت پێناگەيەنم، بۆی پاڕايەوە و دەستی بەربوو، بانگی كرد لەو كەسەی هێنـابووی پێـی وت: تـۆ شـەيتانت بـۆ مـن هێنـاوە، مرۆڤـت بـۆ نـەهێناوم لـە خـاكی مـن دەريكـە و (هاجر)يشی بدەرێ، دەڵێ: دەرچوو ڕۆيشت، كاتێ إبـراهيم (ﷺ) بينـی نوێژەكـەی

تەواو کردو وتی: (مَهـیَم) واتـە: چـی ڕوویدا لێـت؟ وتـی: خێـرە، خـوا دەسـتی ئـەو تاوانکارەی گرت خزمەتکارێکیشی پێبەخشیم" (أبو هريـرة) وتـی: ئـەو خزمـەتکارە دایکی ئێوەیە ئەی کوڕانی ئاوی ئاسمان.

**( ٤ ) باسی موسى** ( عليه السلام )

**٨٥٣ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام رَجُلًا حَيِيًّا، قَالَ: فَكَانَ لَا يُرَى مُتَجَرِّدًا، قَالَ: فَقَالَ بَنُو إِسْرَائِيلَ: إِنَّهُ آدَرُ، قَالَ: فَاغْتَسَلَ عِنْدَ مُوَيْهٍ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ فَانْطَلَقَ الْحَجَرُ يَسْعَى، واتَّبَعَهُ بِعَصَاهُ يَضْرِبُهُ: ثَوْبِي حَجَرُ، ثَوْبِي حَجَرُ. حَتَّى وقَفَ عَلَى مَلَإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ. ونَزَلَتْ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وجِيهًا) (الاحزاب: ٦٩). (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٢٣)**

لە(أبي هريرة)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: موسى پیاوێکی شەرمن بوو، هـیچ کـات بـەڕووتی نەدەبینرا، بەنوئیسرائیل وتیـان: هێلکـەی گـونی ئاوسـاوە، لـەناو تەنکاوێکدا خـۆی شـۆرد، جلـەکانی دانـا لەسـەر بـەردێك، بەردەکـە کەوتـەڕێو ڕۆیشـت، موسـی بـە عەساکەیەوە دوای کەوت و لێی دەدا و دەیفەرموو: ئـەی بـەرد جلـەکانم، ئـەی بـەرد جلەکانم. هەتا گەیشـتە لای کۆمـەڵێك لـە (بـني إسـرائيل) وەسـتا، لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتە نازڵ بوو کـە ئەمـە واتاکەیـەتی: (ئـەی بـاوەڕداران وەك ئەوانـە مـەبن ئـازاری حەزرەتی موسییان دەدا هـەتا خـوا خـاوێنی کـرد لـەو تۆمەتانـەی ئـەوان دەیـانوت چونکە موسا لای خوا خاوەن ڕێز و پلە وپایەیە).

**( ٥ ) چیرۆکی موسى و خضر** ( عليه السلام )

**٨٥٤ـ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): إِنَّ نَوْفًا الْبِكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام صَاحِبَ بَنِي إِسْرَائِيلَ، لَيْسَ هُوَ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ عَلَيْهِ السَّلَام. فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ اللَّهِ، سَمِعْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: "قَامَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ، قَالَ فَعَتَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ: أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ مُوسَى: أَيْ رَبِّ كَيْفَ لِي بِهِ؟ فَقِيلَ لَهُ: احْمِلْ حُوتًا فِي مِكْتَلٍ، فَحَيْثُ تَفْقِدُ الْحُوتَ فَهُوَ ثَمَّ، فَانْطَلَقَ، وانْطَلَقَ مَعَهُ فَتَاهُ وهُوَ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ، فَحَمَلَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام حُوتًا فِي مِكْتَلٍ، وانْطَلَقَ هُوَ وفَتَاهُ يَمْشِيَانِ**

حَتَّى أَتَيَا الصَّخْرَةَ، فَرَقَدَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام وفَتَاهُ، فَاضْطَرَبَ الْحُوتُ فِي الْمِكْتَلِ حَتَّى خَرَجَ مِنَ الْمِكْتَلِ فَسَقَطَ فِي الْبَحْرِ، قَالَ: وأَمْسَكَ اللَّهُ عَنْهُ جِرْيَةَ الماء حَتَّى كَانَ مِثْلَ الطَّاقِ، فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا وكَانَ لِمُوسَى وفَتَاهُ عَجَبًا، فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِماءلَيْلَتِهِمَا، ونَسِيَ صَاحِبُ مُوسَى أَنْ يُخْبِرَهُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام قَالَ لِفَتَاهُ: (آتِنَا غَدَا ونَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا). قَالَ: ولَمْ يَنْصَبْ حَتَّى جَاوَزَ الْمَكَانَ الَّذِي أُمِرَ بِهِ، قَالَ: (أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ ومَا أَنْسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ واتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا). قَالَ مُوسَى: (ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا) قَالَ: يَقُصَّانِ آثَارَهُمَا، حَتَّى أَتَيَا الصَّخْرَةَ فَرَأَى رَجُلًا (نائماً) مُسَجًّى عَلَيْهِ بِثَوْبٍ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى، فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ: أَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلَامُ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى، قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: إِنَّكَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّه عَلَّمَكَهُ اللَّهُ لَا أَعْلَمُهُ، وأَنَا عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّه عَلَّمَنِيه لَا تَعْلَمُهُ. قَالَ لَهُ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام: (هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا. قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا. وكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا. قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَا و اللَّهُ صَابِراءلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا). قَالَ لَهُ الْخَضِرُ: (فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شيء حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا). قَالَ: نَعَمْ، (قَالَ): فَانْطَلَقَ الْخَضِرُ ومُوسَى يَمْشِيَانِ عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ، فَمَرَّتْ بِهِمَا سَفِينَةٌ فَكَلَّمَاهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمَا، فَعَرَفُوا الْخَضِرَ فَحَمَلُوهُمَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَعَمَدَ الْخَضِرُ إِلَى لَوْحٍ مِنْ أَلْوَاحِ السَّفِينَةِ فَنَزَعَهُ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخَرَقْتَهَا (لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا. قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا. قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ ولَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا). ثُمَّ خَرَجَا مِنَ السَّفِينَةِ، فَبَيْنَمَا هُمَا يَمْشِيَانِ عَلَى السَّاحِلِ إِذَا غُلَامٌ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَ الْخَضِرُ بِرَأْسِهِ فَاقْتَلَعَهُ بِيَدِهِ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ مُوسَى: (أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَاكِيَةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا. قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا). قَالَ –وَهَذِهِ أَشَدُّ مِنَ الْأُولَى– (قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شيء بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْرًا. فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ). يَقُولُ: مَائِلٌ، قَالَ الْخَضِرُ بِيَدِهِ هَكَذَا فَأَقَامَهُ. قَالَ لَهُ مُوسَى: قَوْمٌ أَتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُضَيِّفُونَا ولَمْ يُطْعِمُونَا: (لَوْ شِئْتَ لَتَخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا. قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا) قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): يَرْحَمُ

**اللَّهُ مُوسَى، لَوَدِدْتُ أَنَّهُ كَانَ صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَخْبَارِهِمَا". قَالَ: وقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كَانَتِ الْأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا". قَالَ: "وَجاءَ عُصْفُورٌ حَتَّى وقَعَ عَلَى حَرْفِ السَّفِينَةِ، ثُمَّ نَقَرَ فِي الْبَحْرِ، فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ: مَا نَقَصَ عِلْمِي وعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ إِلَّا مِثْلَ مَا نَقَصَ هَذَا الْعُصْفُورُ مِنَ الْبَحْرِ". قَالَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ: وكَانَ (ابن عباس (رضي الله عنه)) يَقْرَأُ: (وكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا). وكَانَ يَقْرَأُ: (وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ كَافِرًا). (بخاري/ الانبياء/ ٣٢١٩)**

(سعيد)ی کوڕی (جبير) دەڵێ: وتم: بە (أبن عباس)(رضي الله عنه) (نوف البكالى) واگومان دەبات کە موسای بنی ئیسرائیل جیایە لە موسای هاوڕێی (خدر). وتی: ئەو دوژمنی خوا درۆ دەکات، لە (أُبي)کوڕی (کعب) م بیستووە: دەیوت: بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "موسا هەستا لەناو بنی ئیسرائیلدا وتاری خوێندەوە، پرسیاری لێکرا: کێ زاناترین کەسە لە ئادەمیزاد؟ فەرمووی: من زاناترین کەسم، خوای گەورە سەرزەنشتی کرد لەبەر ئەوەی زانستەکەی نەگێڕایەوە بۆ خوا، ئەمجا خوا وەحی بۆ نارد کە بەندەیەك لەبەندەکانی من وا لە (مجمع البحرين) لە تۆ زاناترە، موسا فەرمووی: ئەی خوایە چۆن پێی دەگەم؟ پێی وترا ماسییەك هەڵگرە لەزەمیلەیەکدا و بڕۆ، لەهەرلایەکدا ماسیەکەت لێبزر بوو ئەو لەوێدایە، موسا و هاوڕێکەی کە (یوشع)ی کوڕی (نون)بوو کەوتنە ڕێ، موسا ماسیەکی هەڵگرت لەناو زەمیلەیەکدا، خۆی و هاوڕێکەی ڕۆیشتن تا گەیشتنە لای گابەردێك موسی و هاوڕێکەی خەویان لێکەوت، ماسیەکەش لە زەمیلەکە کەوتە جوڵە جوڵ و دەرچوو خۆی خستە ناو دەریاکەوە، خوایش ئاوە ڕەوانەکەی وەستان هەتا وەك تاقێکی سەرگیراوی لێهات، بوو بەڕێگا بۆ ماسیەکە و بوبە جێگای سەرسوڕمانیش بۆ موسی و هاوڕێکەی، ئەو ڕۆژ و شەوە ڕێیان کرد، هاوڕێکەی موسی یادی چوو هەواڵی ماسی یەکە بگەیەنێ بە موسی، کاتێ ڕۆژ بوویەوە موسا بە هاوڕێکەی فەرموو: (خوارنەکەی بەیانیمان بۆ بهێنە بەڕاستی لەم سەفەرەماندا ماندووین). دەفەرموێ: ماندوش نەبوون هەتا لەو شوێنە تێپەڕی کە فەرمانی پێکرابوو، هاوڕێکەی پێی وت: (لەبیرتە لەو کاتەدا کەلەپەنا گابەردەکەدا سرەوتین، لەیادم چوو باسی ماسیەکەت بۆ بکەم، شەیتان لەبیری بردمەوە، کە چۆن بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێگای خۆی گرتەبەر بۆ ناو دەریاکە) موسا فەرمووی : (ئەوە ئەو مەبەستەیە ئێمە دەمانەوێ بۆیە هەر

بەشـوێنی خۆیانـدا گەڕانـەوە)شـوێن پێـی خۆیـان هەڵـدەگرت هـەتا گەیشـتنە لای بەردەکە، پیاوێکی بینی خەوتبوو بەپارچە جلێك خۆی داپۆشـیبوو، موسـا سـەلامی لێکرد، خدر پێی وت: کەی لەم ئەرزەی تۆدا سەلام هەیە؟ وتـی: مـن موسـام، وتـی: موسای بەنی ئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ، وتی بەڕاستی تۆ زانستێکت لاهەیـە خـوا فـێری کردویت من نایزانم، منیش زانستێکم لاهەیە خوا فێـری کـردووم تـۆ نایزانیـت، موسـا (عليه السلام) پێی وت: ئایا لەگەڵتابێم بۆ ئەوەی هەندێ لـەو ڕێنماییانـەی کـە فێرکراویـت فێری منیشی بکەیت؟ وتی: بەڕاستی تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت بگریت. ئایـا چـۆن دەتوانی خۆت بگریت لەسەر شتێك کەپەی بەئاکامی نابەیت، وتی: دەمبینی —انشاء الله—خۆگردەبم و لەفەرمانی تۆ دەرناچـم. خـدر پێـی وت: (ئەگـەر دوای مـن کـەوتی پرسیاری هیچ شتێکم لێمەکە هەتا دواتر بۆت باس دەکەم) وتی: بەڵێ، خدر و موسا ڕۆیشتن بەکەناری دەریاکەدا کەشتییەك تێپەڕی بەلایاندا قسەیان لەگەڵ کرد هەڵیان گرێت، خدریان ناسی هەڵیان گرتن بەبێ کرێ، کەچی (خدر) پەلاماریدا تەختەیەك لە تەختەکانی ئەو کەشـتییەی هەڵکێشـا، موسـی پێـی وت: کۆمـەڵێك بێکـرێ ئێمـەیان هـەڵگرت کەچـی تـۆ پـەلاماری کەشـتییەکەیانت دا و کونـت کـرد،)بـۆ ئـەوەی دانیشتوەکانی بخنکێن لە ئاودا، بەڕاستی شتێکی زۆر گەورە و ناڕەوات کـرد. وتـی: من نەموت،تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت بگریت، وتـی: ئـەم لەبیرچـونەم لـێ مـەگرە و تەنگەتاویشم مەکە لەم کارەمدا). دوای ئەوە دەرچـوون لـە کەشـتیەکە و بەکـەناری دەریادا دەڕۆیشتن توشی منداڵێك هاتن لەگەڵ مندالان یـاری دەکـرد، (خـدر)گرتـیو کوشـتی، موسـا پێـی وت: (ئایـا کەسـێکی بێتاوانـت کوشـت بـێ ئـەوەی ئـەو هـیچ کەسێکی کوشتبێ بەڕاستی کارێکی زۆر ناشرینیت کـرد، وتـی: مـن پـێم نـەوتی: تـۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت بگریت) ئەمجارەیان توند تر بـوو لـە جـاری ڕابـردوو، موسـا فەرمووی: (ئەگەر جارێکی تر من پرسیارم لێکـردی ئـیتر هاوڕێیـەتیم مەکـە) چـونکە لەگەڵ من گەیشتیتە ئەو ئاستەی گلەییت لێ ناکرێت. ڕۆیشتن.. تا گەیشتنە گونـدێك و داوای خواردنیان کرد لە خەڵکی ئەو گونـدە، بـەلام ئـەوان میوانـدارییان نـەکردین، هەر لەو گوندە توشی دیوارێك هاتن خوار بوبوویەوە ڕاستی کردەوە). دەڵێ: کەمێك خواربوو بوو خدر دەستی دایە ژێری و راستی کردەوە، موسا پێـی وت: هاتینـە نـاو گونـدێك بـە میـوان وەریـان نـەگرتین، نانیـان نـەداینێ"گـەر بتویسـتایە کرێیـەکت

وەردەگرت لەسەر ئەم دیوار ڕاستکردنەوەت. خدر وتی: ئەمە جیابونەوەی نێوان من و تۆیە، ئێستە ئاگاداریشت دەکەم لەسەر ئەو شتانەی توانات نەبوو خۆت بگری لەسەری" پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "خوا ڕەحم بە موسی بکات پێم خۆش بوو خۆی بگرتبایە هەتا هەواڵیان زیاتر بۆ ئێمە باسکرایە" ڕاوی دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "یەکەم پرسیاری موسا لەبیرچوون بوو" هەروەها فەرموویەتی: "چۆلەکەیەك هاتە سەر لێواری کەشتیەکە دەنوکی دا لە دەریاکە، خدر بە موسای فەرموو: زانستی من و تۆ لە زانستی خوای کەم نەکردۆتەوە مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی ئەو چۆلەکە لەدەریاکەی کەم کردەوە،"

## ( ٦ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ): "کەس بەگەورەتر دامەنێن لەکەسی تر لە نێوان پێغەمبەرانی خوادا"

٨٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: بَيْنَمَا يَهُودِيٌّ يَعْرِضُ سِلْعَةً لَهُ أُعْطِيَ بِهَا شَيْئًا كَرِهَهُ، أَوْ لَمْ يَرْضَهُ –شَكَّ عَبْدُ الْعَزِيزِ– قَالَ: لَا والَّذِي اصْطَفَى مُوسَى (عليه السلام) عَلَى الْبَشَرِ. قَالَ: فَسَمِعَهُ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَلَطَمَ وجْهَهُ قَالَ: تَقُولُ: والَّذِي اصْطَفَى مُوسَى (عليه السلام) عَلَى الْبَشَرِ، ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) بَيْنَ أَظْهُرِنَا؟ قَالَ: فَذَهَبَ الْيَهُودِيُّ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِنَّ لِي ذِمَّةً وعَهْدًا، وقَالَ: فُلَانٌ لَطَمَ وجْهِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لِمَ لَطَمْتَ وجْهَهُ". قَالَ: قَالَ –يَا رَسُولَ اللَّه– والَّذِي اصْطَفَى مُوسَى (عليه السلام) عَلَى الْبَشَرِ، وأَنْتَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا. قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حَتَّى عُرِفَ الْغَضَبُ فِي وجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: "لَا تُفَضِّلُوا بَيْنَ انبياء اللَّه، فَإِنَّهُ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ، فَيَصْعَقُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ ومَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَا و اللَّهُ. قَالَ: ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ بُعِثَ، أَوْ: فِي أَوَّلِ مَنْ بُعِثَ، فَإِذَا مُوسَى (عليه السلام) آخِذٌ بِالْعَرْشِ، فَلَا أَدْرِي أَحُوسِبَ بِصَعْقَتِهِ يَوْمَ الطُّورِ، أَوْ بُعِثَ قَبْلِي، ولَا أَقُولُ: إِنَّ أَحَدًا: أَفْضَلُ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى". **(بخاري/ الانبياء/ ٣٢٣٣)**

(ابي هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: "لەکاتێکدا جولەکەیەك کوتاڵێکی ئاراستەی فرۆشتن کردبوو نرخێکیان دایێ پێی ڕازی نەبوو، وتی: سوێند بەو کەسەی موسای هەڵبژاردووە بەسەر مرۆڤدا، بەو نرخە نابێ، پیاوێکی ئەنصاری گوێی لێبوو زلەیەکیدا لە جولەکەکەو وتی: وا دەڵێی لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) لەناوماندایە، جولەکەکە چووە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی أبو القاسم من لەناو ئێوەدا

پەیمانی گەردن پارێزیم هەیە و فلان کەسیش زلەی لێدام. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بۆچ زلەت لێداوە؟" وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (بۆیە لێمدا) وتی سوێند بەو کەسەی موسای هەڵبژاردووە بەسەر مرۆڤدا، تۆیش های لەناوماندا، پێغەمبەر (ﷺ) ڕقی هەستا، هەتا ڕقەکە لە ڕوخساریدا هەست دەکرا، ئەمجا فەرمووی: "لەنێو پێغەمبەرانی خوادا کەسیان لەکەسیان بەچاکتر مەزانن، بەڕاستی کاتێ فوو دەکرێت بە (صور)دا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندایە هەمووی لەناو دەچێ، مەگەر کەسێ خوا بیەوێ، دوای ئەوە جارێکی دی فوی پیا دەکرێتەوە، من یەکەم کەسم زیندو دەکرێمەوە، یان لەناو یەکەم تاقمدا زیندو دەکرێمەوە، دەبینم موسا دەستی گرتووە بەعەرشەوە، نازانم ئایە پاداشتی ئەوەی دراوەتەوە کە لە ڕۆژی (طوردا)بێهۆش کەوت، یان پێش من زیندو کراوەتەوە، من نالێم هیچ کەس گەورەترە لە یونسی کوڕی مەتا"

## ٧-کۆچی دوایی مووسا ( عليه السلام )

**٨٥٦**-عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "جاء مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام، فَقَالَ لَهُ: أَجِبْ رَبَّكَ، قَالَ: فَلَطَمَ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلَام عَيْنَ مَلَكِ الْمَوْتِ فَفَقَأَهَا، قَالَ: فَرَجَعَ الْمَلَكُ إِلَى اللَّه تَعَالَى فَقَالَ: إِنَّكَ أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لَكَ لَا يُرِيدُ الْمَوْتَ، وقَدْ فَقَأَ عَيْنِي، قَالَ: فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْه عَيْنَهُ، وقَالَ: ارجِعْ إِلَى عَبْدِي فَقُل: الْحَيَاةَ تُرِيدُ؟ فَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْحَيَاةَ، فَضَعْ يَدَكَ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ، فَمَا تَوَارَتْ يَدُكَ مِنْ شَعْرَةٍ فَإِنَّكَ تَعِيشُ بِهَا سَنَةً. قَالَ: ثُمَّ مَهْ؟ قَالَ: ثُمَّ تَمُوتُ. قَالَ: فَالْآنَ مِنْ قَرِيبٍ. رَبِّ أَمِتْنِي مِنَ الْأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ". قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "وَاللَّه لَوْ أَنِّي عِنْدَهُ لَأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ، إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ عِنْدَ الْكَثِيبِ الْأَحْمَرِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٧٤)

(أبي هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "فریشتەی گیانکێشان هات بۆ لای موسا و پێی وت: وەڵامی پەروەردگارت بدەرەوە، فەرمووی: موسا زلەیەکیدا لە چاوی، چاوی تەقاند ئەمجا فریشتەکە گەڕایەوە خزمەتی خوای گەورە، وتی: بەڕاستی تۆ منت نارد بۆ لای بەندەیەکی خۆت کە مردنی ناوێت و چاوی تەقاندم، فەرمووی: خوا چاوی چاك کردەوە و فەرمووی: بچۆرەوە بۆلای بەندەکەم و پێی بڵێ: ژیانت دەوێ؟ ئەگەر ژیانت دەوێ دەست دانێ لەسەر پشتی گایەك چەند تاڵ موو کەوتە ژێر دەستت، ئەوەندە ساڵ دەژیت. فەرمووی: ئەی دوای ئەوە،

فەرمووی: دوای ئەوە دەمریت. فـەرمووی: دەی ئێستا تـا زووە ئـەی خوایـە نـزیکم خەیتەوە لە خاکی پـیرۆز (الارض المقدسـة) بەئەنـدازەی بـەرد هاوێـژێك" پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "سوێند بەخوا ئەگەر لەلای ئەو بوایەم گۆڕەکـەیم پیشـان ئـەدان وا لەکەناری ڕێگەکەدا لای کۆمەڵە لمە سورەکەدا".

**( ٨ ) باسی یوسف** ( عليه السلام )

**٨٥٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّه مَنْ أَكْرَمُ النَّاس؟ قَالَ: "أَتْقَاهُمْ". قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: "فَيُوسُفُ نَبِيُّ اللَّه، ابْنُ نَبِيِّ اللَّه، ابْنِ نَبِيِّ اللَّه، ابْنِ خَلِيلِ اللَّه". قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: "فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي؟ خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا". (بخاري/ الانبياء/ ٣١٧٥)**

لە(أبي هريرة)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: وترا ئەی پێغەمبەری خوا کێ بەڕێزترینی خەڵکە فـەرمووی: "کامیـان زیـاتر تـەقوا کاربێـت" وتیـان: پرسـیاری ئـەوەت لێناکـەین، فەرمووی: "یوسف پێغەمبەری خوا، کوڕی پێغەمبەری خوا، کوڕی پێغەمبەری خوا، کـوڕی خۆشەویسـتی خـوا" وتیـان لـەوەش پرسـیارت لێناکـەین، فـەرمووی: "لـەکانزاکانی عـەرەب پرسـیارم لێدەکـەن؟ کامیـان لـە (جاهليـە)دا چـاکبوبێت لـە ئیسلامیشدا هەر چاك دەبێت، ئەگەر شارەزای ئاین بوون".

**٨٦٤–عن ابی هريرة (رض) عن النبی () انه قال –يعنی الله (عز وجل)– لَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ لِي –و قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: لِعَبْدِي– أَنْ يَقُولَ أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٣٤)**

له (أبي هريرة)وە (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "خـوا دەفـەرمووێ: (ناگونجێ بۆ بەندەی من بڵێ من باشترم لە یونس ی کوڕی (متی)".

**( ٩ ) باسی عیسی** ( عليه السلام )

**٨٥٨–عن ابی هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) : "انا اولی الناس بعيسى ابن مريم فی الاولی وَالْآخِرَةِ". قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: "الْأنبياء إِخْوَةٌ مِنْ عَلَّاتٍ، وأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى ودِينُهُمْ وَاحِدٌ، فَلَيْسَ بَيْنَنَا نَبِيٌّ". (بخاري/ الانبياء/٣٢٥٩)**

لـە(ابـی هريـرە)ەوە (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "مـن لەبـەرترم لەهەمو کـەس بـە عیسـای کـوڕی مـریم لـە دنیـا و لـە قیامەتـدا، وتیـان: چۆن ئـەی

پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: "پێغەمبەران کوڕی یەك باوکن، دایکیان جیایە، ئاینیان یەکە، لەنێوان من و ئەودا پێغەمبەرێکی تر نیە" (واتا: بنج و بناوانی ئاینە ئاسمانیەکان یەکن لەخوا بەیەك زانین و بڕوابوون بە قیامەت، هەر چەند لەهەندێ وردەشتدا جیاوازبن).

**(١٠) فەرموودەی عیسى (عليه السلام): باوەڕم بەخوا هێنا و خۆمم بەدرۆ خستەوە**

**٨٥٩ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلًا يَسْرِقُ، فَقَالَ لَهُ عِيسَى: سَرَقْتَ؟ قَالَ: كَلَّا والَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، فَقَالَ عِيسَى: آمَنْتُ بِاللَّهِ وكَذَّبْتُ نَفْسِي". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٦٠)**

لە(ابي هريرة)وە (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "(عیسى)ی کوڕی (مريم) پیاوێکی دی دزی دەکرد، عیسى پێی وت: ئەوە دزیت کرد؟ وتی: نەخێر سوێند بەو کەسەی جگە لەو خوایەکی تر نیە، عیسى فەرمووی: بڕوام بەخوا هێناو، خۆمم بەدرۆ خستەوە".

# بەشی پەنجاو یەکەم: پلەوپایەی یارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

## پلەوپایەی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه)

### (١) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): "گومانت چۆنە بە دوو کەس خوا سێیەمیان بێت"

٨٦٠ـ عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ (رضي الله عنه) حَدَّثَهُ قَالَ: نَظَرْتُ إِلَى أَقْدَامِ الْمُشْرِكِينَ عَلَى رُؤوسِنَا ونَحْنُ فِي الْغَارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ إِلَى قَدَمَيْهِ أَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ. فَقَالَ: "يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٥٣)**

لە(أنس)ی کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) کە أبو بكر الصديق (رضي الله عنه) قسەی بۆ کردووە دەڵێ: تەماشای قاچی بێباوەڕەکانم دەکرد لەسەرمانەوە بوو لەکاتێکدا لەئەشکەوتەکەدا بووین، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا گەریەکێکیان سەردانەوێنێ بۆئاستی قاچەکانی ئێمە دەبینی. فەرمووی: "ئەی ئەبوبەکر گومانت چییە بەرانبەر بە دوو کەس کە خوا سێهەمیان بێت".

### (٢) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): "منەتکارترین کەس لە سەرمن بە ماڵی و بە یاوەریی (أبو بكر)ە"

٨٦١ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: "عَبْدٌ خَيَّرَهُ اللَّهُ بَيْنَ أَنْ يُؤْتِيَهُ زَهْرَةَ الدُّنْيَا وبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَهُ". فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) وبَكَى، فَقَالَ: فَدَيْنَاكَ بِآبَائِنَا وأُمَّهَاتِنَا، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هُوَ الْمُخَيَّرُ، وكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَا بِهِ، وقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي مَالِهِ وصُحْبَتِهِ أَبُو بَكْرٍ، ولَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلًا لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلًا، ولَكِنْ أُخُوَّةُ الْإِسْلَامِ، لَا تُبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ خَوْخَةٌ إِلَّا خَوْخَةَ أَبِي بَكْرٍ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٩١)

لە(أبي سعيد الخدري)ەوە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت لەسەر دوانگە و فەرمووی: "بەندەیەك خواسەرپشکی کردووە لە نێوان جوانی دنیا و ژیانی لای

پەروەردگار، ئەو ئەوەی هەڵبژاردوە کەلای پەروەردگارە" ئەبوبەکر (ﷺ) گریا و وتی: باوك و دایکم فیدات بێت، وتی: سەرپشك کراوەکە پێغەمبەربوو (ﷺ)، (أبو بکر)یش زاناترین کەسمان بوو بەو فەرمودە،. هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "منەتکارترین کەس لەسەر من بەماڵی و بەهاوڕێیەتی (أبو بکر)ە، ئەگەر من خۆشەویستم هەڵبژاردایە أبوبکرم هەڵدەبژارد، بەڵام برایەتی ئیسلام لەنێوانماندایە، هیچ دەرگا چکۆلەیەك بۆ سەر مزگەوت ناهیلرێت جگە لە دەرگا چکۆلەکەی أبوبکر".

**( ٣ ) خۆشەویستترین کەس لای پێغەمبەر ( ﷺ ) ( أبوبکر )ە ( رضی اللہ عنه وأرضاه )**

**٨٦٢ـ** عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَهُ عَلَى جَيْشِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ. فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: "عَائِشَةُ". قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ؟ قَالَ: "أَبُوهَا". قُلْتُ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: "ثم عُمَرُ" فَعَدَّ رِجَالًا. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٦٢)

(لە أبي عثمان)ەوە دەڵێ: (عمرو)ی کوڕی (عاص) (ﷺ) هەواڵی دامێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بۆ فەرماندەیی سوپای (ذات السلاسل)، هاتمە خزمەتی وتم: کێ زۆر خۆشەویستە لات؟ فەرمووی: "عائشة"وتم: لەپیاوان فەرمووی: "باوکی عائشە" وتم: دوای ئەو کێ ؟ فەرمووی: "عمر"، چەند پیاوێکی ژمارد.

**( ٤ ) فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ): "من باوەڕم پێی هەیە و ( أبوبکر و عمر )یش"**

**٨٦٣-** أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بَيْنَمَا رَجُلٌ يَسُوقُ بَقَرَةً لَهُ قَدْ حَمَلَ عَلَيْهَا الْتَفَتَتْ إِلَيْهِ الْبَقَرَةُ فَقَالَتْ: إِنِّي لَمْ أُخْلَقْ لِهَذَا، ولَكِنِّي إِنَّمَا خُلِقْتُ لِلْحَرْثِ". فَقَالَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللَّهِ -تَعَجُّبًا وفَزَعًا- أَبَقَرَةٌ تَكَلَّمُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَإِنِّي أُومِنُ بِهِ وأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ". قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بَيْنَا رَاعٍ فِي غَنَمِهِ عَدَا عَلَيْهِ الذِّئْبُ، فَأَخَذَ مِنْهَا شَاةً، فَطَلَبَهُ الرَّاعِي حَتَّى اسْتَنْقَذَهَا مِنْهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ الذِّئْبُ فَقَالَ لَهُ: مَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ؟ يَوْمَ لَيْسَ لَهَا رَاعٍ غَيْرِي". فَقَالَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللَّهِ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "فَإِنِّي أُومِنُ بِذَلِكَ اناءأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٨٤)

لـه(أبـي هريـرة)وه (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "لەکاتێـدا پیاوێـك مانگایەکی لێدەخوڕی بارێکی لێنابوو، مانگاکە لای کـردەوە بەلایـدا و وتـی: مـن بـۆ ئەمە دروست نەکراوم، بەڵکو بۆزەوی کێڵان دروست کراوم" خەڵك وتیان: سبحان الله —بەسـەر سـوڕمان و ترسـەوە— مانگـا قسـە دەکـات؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "بەڕاستی من و أبو بکر و عمر باوەڕمان بەمـە هەیـە" أبـو هریـرة دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "لەکاتێکدا شـوانێك لـەناو مەڕەکانیدا بـوو، گـورگ پـەلاماری دا و مـەڕێکی لێ فڕانـد، شـوانەکە کەوتـە دوای و مەڕەکـەی ڕزگـار کـرد، گورگەکـە لای کردەوە بەلایدا و پێی وت: ئەی لە ڕۆژی دڕندەدا کێ فریای دەکەوێت؟ لـە ڕۆژێکـدا شوانی نابێت جگە لە من، خەڵکەکە وتیان: سـبحان اللـە پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "بەڕاستی من باوەڕم بەمە هەیە أبو بکر و عمریش".

## ( ٥ ) هاوڕێیەتی ( صدیق ) و ( فاروق ) بۆ پێغەمبەر ( ﷺ )

**٨٦٤ــ عن ابْنَ عَبَّاسٍ (ﷺ) قالَ: وضِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (ﷺ) عَلَى سَرِيرِه، فَتَكَنَّفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُثْنُونَ وَيُصَلُّونَ عَلَيْه قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وأَنَا فِيهِمْ، قَالَ: فَلَمْ يَرُعْنِي إِلَّا بِرَجُلٍ قَدْ أَخَذَ بِمَنْكِبِي مِنْ ورَائِي، فَالْتَفَتُّ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ (ﷺ)، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ وَقَالَ: مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِه مِنْكَ، وَايْمُ اللَّه إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَذَاكَ أَنِّي كُنْتُ أُكَثِّرُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "جِئْتُ اناءأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ، ودَخَلْتُ اناءأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ، وخَرَجْتُ اناءأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ، فَإِنْ كُنْتُ لَأَرْجُو –أَوْ: لَأَظُنُّ– أَنْ يَجْعَلَكَ اللَّهُ مَعَهُمَا". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٧٤)**

لـە(أبـن عبـاس)ەوە (ﷺ) دەڵـێ: (عمـر)ی کـوڕی (خطـاب) دانرابـوو لەسـەر دارتەرمەکەی، خەڵك دەورەیان داو بـۆی دەپاڕانـەوە و، چـاکەیان دەوت و، نوێـژیان لەسەر دەکرد، پێش ئەوەی هەڵگیرێت، منیش لەناویاندا بـووم پیاوێـك لـە پشـتەوە شانی گرتم و ڕایچڵەکاندم، کـە لامکـردەوە علـی بـوو (ﷺ)، ڕەحمـەتبوونی (عمـر)ی کردو وتی: هیچ کەست دوای خۆت بەجێنەهێڵاوە کە مـن حـەز بکـەم لەسـەر وێنـەی کردەوەی ئەو بگەم بە خزمەت خوا زیاتر لەتۆ. سوێندم بەخوا من وامدەزانی کە خوا لەگـەڵ دووهاوڕێکـەت داتـدەنێ، چـونکە زۆر جـار دەمبیسـت لـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەیفەرموو: "من و أبوبکر و عمر هاتین، من و أبوبکر و عمر چووینە ژوورەوە، مـن و أبوبکر و عمر دەرچووین، بەڕاستی من ئومێدم وەهابوو، یان وامدەزانی خـوا بتخاتـە لای ئەوان".

## ( ٦ ) دانانی صدیق ( رضي الله عنه ) بەجێنشین

٨٦٥ـ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رضي الله عنه): أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) شَيْئًا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ جِئْتُ فَلَمْ أَجِدْكَ. قَالَ أَبِي: كَأَنَّهَا تَعْنِي الْمَوْتَ. قَالَ: "فَإِنْ لَمْ تَجِدِينِي فَأْتِي أَبَا بَكْرٍ". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٥٩)**

له محمدی کوڕی (جبیر)ی کوڕی (مطعم)ەوە ئەویش لەباوکییەوە (رضي الله عنه): کە ئافرەتێك داوای شتێکی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی: یارسول الله ئەگەر هاتم و تۆم دەسنەکەوت –وەك ئەوەی مەبەستی مردن بێت– فەرمووی: "ئەگەر منت دەستگیر نەبوو وەرە بۆلای أبو بکر".

## ( ٧ ) پلەوپایەی ( عمر )ی کوڕی ( الخطاب )( رضي الله عنه )

٨٦٦ـ عن أبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ، وعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، ومِنْهَا مَا يَبْلُغُ دُونَ ذَلِكَ، ومَرَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ وعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ". قَالُوا: مَاذَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "الدِّينَ". **(بخاري/ الإيمان/ ٢٣)**

(ابي سعيد الخدري)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لەکاتێکدا من خەوتبووم، دیم کەسانێکیان پیشان دەدام کراسیان لەبەردابوو، کراسی وایان هەبوو دەگەیشتە سەرمەمك، هەیان بوو دەگەیشتە خوارتر لەوە، عمری کوڕی خطاب تێپەڕی کراسێکی لەبەردابوو رایدەکێشا بەزەویدا". وتیان: چۆن خەوپرژێنت کرد ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: "بە دینداری".

٨٦٧ـ عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ رَأَيْتُ قَدَحًا أُتِيتُ بِهِ –فيه لَبَنٌ– فَشَرِبْتُ مِنْهُ حَتَّى إِنِّي لَأَرَى الرِّيَّ يَجْرِي فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ". قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "الْعِلْمَ". **(بخاري/ العلم/ ٨٢)**

لە(عبدالله)ی کوڕی (عمر)ەوە (رضي الله عنه)، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "لەکاتێکدا خەوتبووم پەرداخێکم دی بۆیان هێنام، شیری تیابوو، لێم خواردەوە هەتا دیم نینۆکەکانمی پێ پاراو بوویەوە، دوای ئەوە پاشماوەکەم دا بە عمری کوڕی (خطاب) وتیان: چۆنت خەو پرژێن کرد ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: "بە زانست".

٨٦٨ـ عن أَبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه (ﷺ) يَقُولُ: "بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي عَلَى قَلِيبٍ عَلَيْهَا دَلْوٌ، فَنَزَعْتُ مِنْهَا مَا شَا و اللّهُ، ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ فَنَزَعَ بِهَا ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ، وفِي نَزْعِه -وَاللّهُ يَغْفِرُ لَهُ- ضَعْفٌ، ثُمَّ اسْتَحَالَتْ غَرْبًا، فَأَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَنْزِعُ نَزْعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٦٤)**

لە(ابي هريرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیست دەیفەرموو: "لەکاتێکدا خەوتبووم خۆم دی بەسەربیرێکەوە دوڵچەیەکی لەسەر بوو، ئەوەندەی خواویستی ئاوم لێهەڵگۆزی، لەپاشدا کوڕەکەی (أبو قحافە) دۆڵچەکەی وەرگرت دۆڵچەیێ، دو دۆڵچە ئاوی هەڵگۆزی، لە هەڵگۆزینەکەشیدا -خوا لێی ببورێ- لاواز بوو، لەپاشدا دۆڵچەکە بوو بەدۆڵچەیەکی گەورە (عمر)ی کوڕی (خطاب)وەریگرت هیچ ئازاییو لێزانیەکم لە ئادەمیزاد نەدیوە بەوێنەی (عمر) ئاو هەڵبکێشێ، هەتا ئەوەندەی هەڵکێشا خەڵك وشترەکانیان پاراو کرد و بردیانن بۆ مۆڵگا".

٨٦٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللّه (ﷺ): أَنَّهُ قَالَ: "بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا امْرَأَةٌ تَوَضَّأُ إِلَى جَانِبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ لِمَنْ هَذَا؟ فَقَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ. فَذَكَرْتُ غَيْرَةَ عُمَرَ فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا". قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَبَكَى عُمَرُ ونَحْنُ جَمِيعًا فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ مَعَ رَسُولِ اللّه (ﷺ)، ثُمَّ قَالَ: عُمَرُ بِأَبِي أَنْتَ وأُمي يَا رَسُولَ اللّه، أَعَلَيْكَ أَغَارُ؟ **(بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٧٠)**

لە(أبي هريرة)ەوە (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: "لەکاتێکدا من خەوتبووم خۆم لەبەهەشتدا دی، ئافرەتێکم دی لەپەنا کۆشکێکدا دەستنوێژی دەگرت، وتم: ئەم کۆشك و ئافرەتە هی کێیە؟ وتیان: هی (عمر)ی کوڕی (خطاب)ە، غیرەتی (عمر)م یادکەوتەوە بۆیە خێرا پشتم هەڵکرد".

أبو هريره دەڵێ: عومەر گریا، ئێمەش گشتمان گریاین لەو مەجلیسەدا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ). ئەمجا عومەر وتی: دایك و باوکم فیدات بێ -یارسول الله- من بەرانبەر تۆ غیرەت بمگرێ و بەدگومان بم؟

٨٧٠ـ عن سَعْد بْنِ أَبِي وقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ عَلَى رَسُولِ اللّه (ﷺ)، وعِنْدَهُ نساء مِنْ قُرَيْشٍ يُكَلِّمْنَهُ ويَسْتَكْثِرْنَهُ، عَالِيَةً أَصْوَاتُهُنَّ، فَلَمَّا اسْتَأْذَنَ عُمَرُ قُمْنَ يَبْتَدِرْنَ الحِجَابَ، فَأَذِنَ لَهُ رَسُولُ اللّه (ﷺ) ورَسُولُ اللّه (ﷺ) يَضْحَكُ، فَقَالَ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللّهُ سِنَّكَ يَا رَسُولَ اللّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (ﷺ): "عَجِبْتُ مِنْ هؤلاء اللَّاتِي كُنَّ

**عِنْدي، فَلَمَّا سَمِعْنَ صَوْتَكَ ابْتَدَرْنَ الْحِجَابَ". قَالَ عُمَرُ: فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّه أَحَقُّ أَنْ يَهَبْنَ. ثُمَّ قَالَ عُمَرُ: أَيْ عَدُوَّات أَنْفُسِهِنَّ، أَتَهَبْنَنِي ولَا تَهَبْنَ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)؟ قُلْنَ: نَعَمْ، أَنْتَ أَغْلَظُ وأَفَظُّ مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ). قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ قَطُّ سَالِكًا فَجًّا إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣١٢٠)**

(سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) (رضي الله عنه) دەڵێ: عومەر داوای مۆڵەتی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا کە کۆمەڵێ ئافرەتی لابوو قسەیان لەگەڵ دەکرد و، داوای ئامۆژگاری زیاتریان دەکرد، دەنگیان هەڵبڕیبوو کاتێ عومەر مۆڵەتی خواست هەستان و خێرا عەباکانیان پێچا بەخۆیانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بەدەم پێکەنینەوە ڕێگای (عمر)یدا، عومەر فەرمووی: خوا دڵخۆشت بکات ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی: "سەرم لەم ئافرەتانە سوڕما کەلای من دانیشتبوون لەکاتێکدا دەنگی تۆیان بیست خێرا عەباکانیان پێچالەخۆیانەوە"، عومەر وتی: هەقیان وایە لە تۆ زیاتر بترسن. لەپاشدا عومەر بە ئافرەتەکانی وت: ئەی ئافرەتانێك کە دوژمنی خۆتانن لەمن دەترسن و لە پێغەمبەر (ﷺ) ناترسن؟ وتیان: بەڵێ، تۆ ڕەقتری و وشك تری لە پێغەمبەر (ﷺ). پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ کات شەیتان بەتۆ نەگەیشتووە لەسەر ڕێگایەکدا مەگەر ئەو ڕێگایەکی تری گرتووە (واتە: شەیتان ڕێگای خۆی گۆڕیووە).

**٨٧١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: "قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الْأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ، فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ". قَالَ ابْنُ وَهْبٍ: تَفْسِيرُ مُحَدَّثُونَ: مُلْهَمُونَ.(بخارى / فضائل الصحابة /٣٤٨٦)**

لە(عائشة)وە (رضي الله عنها) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: "ئوممەتەکانی بەرلە ئێوە وابوون کەسانی بەهرەمەند (مُلهَم)یان هەبووە، ئەگەر لە ئوممەتی من یەکێ لەوان هەبێ ئەوە (عمر)ی کوڕی (خطاب) لەوانە".

**٨٧٢ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ عُمَرُ (رضي الله عنه): وافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلَاثٍ: فِي مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ، وفِي الْحِجَابِ، وفِي أُسَارَى بَدْرٍ. (بخاري/ القبلة/ ٣٩٣)**

(أبن عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: عمر (رضي الله عنه) وتویەتی: لەسێ شتدا بۆچوونەکانم یەکیگرت لەگەڵ فەرموودەی پەروەردگارمدا: لە مەقامی ئیبراهیم دا، لە پەردەپۆشی (حجاب)دا، لەدیلەکانی بەدردا.

٨٧٣ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّه ابْنُ أُبَيّ ابْنُ سَلُولَ، جاء ابْنُهُ عَبْدُ اللَّه بْنُ عَبْد اللَّه إِلَى رَسُول اللَّه (ﷺ) فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ أَنْ يُكَفِّنَ فيه أَبَاهُ، فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ عُمَرُ (ﷺ)، فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُول اللَّه (ﷺ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه أَتُصَلِّي عَلَيْهِ وقَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللَّهُ (ﷻ) فَقَالَ: (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً) **(التوبة: ٨٠)**. وسَأَزِيدُ عَلَى سَبْعِينَ". قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّه (ﷺ)، وأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ) **(التوبة: ٨٤)**. **(بخاري/ التفسير/ ٤٣٩٣)**

(ابن عمر) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا (عبد الله) ی کوڕی (أبيّ)کوڕی (سلول) مرد، عبدالله ی کوڕی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێکرد کراسەکەی خۆی بداتێ تا بیکات بەکفنی باوکی، داییێی، ئەمجا داوای لێکرد نوێژی لەسەر بکات، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا بۆئەوەی نوێژی لەسەر بکات، عومەر (ﷺ) هەستا و چمکی جلەکەی گرت و وتی: ئەی پێغەمبەر ی خوا نوێژی لەسەر دەکەیت لەکاتێکدا خوا نەهی لێ کردوویت نوێژی لەسەر بکەیت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی خوا سەرپشکی کردووم و فەرموویەتی: (أستغفر لهم..) واتا: (داوای لێبوردنیان بۆ بکەی یان داوای لێبوردن نەکەی بۆیان ، ئەگەر حەفتاجار داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت خوا لێیان نابورێت). فەرمووی: "من لە حەفتایش زیادی دەکەم". (عمر) وتی: بێگومان ئەو مونافیقە، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کە ئەمە ماناکەیەتی: (نوێژ مەکە لەسەر هیچ کەس لەو مونافیقانە کە دەمرن لەسەر گۆڕەکەشیان مەوەستە بۆ پارانەوە بۆیان).

## ( ٨ ) پلەو پایەی ( عثمان )ی کوڕی ( عفان ) ( ﷺ )

٨٧٤ـعَنْ سَعِيد بْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ (ﷺ): أَنَّهُ تَوَضَّأَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: لَأَلْزَمَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) ولَأَكُونَنَّ مَعَهُ يَوْمِي هَذَا. قَالَ: فَجاء الْمَسْجِدَ، فَسَأَلَ عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالُوا:خَرَجَ وجَّهَ هَاهُنَا، قَالَ: فَخَرَجْتُ عَلَى أَثَرِه أَسْأَلُ عَنْهُ حَتَّى دَخَلَ بِئْرَ أَرِيسٍ، قَالَ: فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، وبَابُهَا مِنْ جَرِيدٍ، حَتَّى قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَاجَتَهُ وتَوَضَّأَ، فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ جَلَسَ عَلَى بِئْرِ أَرِيسٍ

وتَوَسَّطَ قُفَّهَا، وكَشَفَ عَنْ سَاقَيْه ودَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ، قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْه، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، فَجَلَسْتُ عِنْدَ الْبَابِ، فَقُلْتُ: لَأَكُونَنَّ بَوَّابَ رَسُول اللَّه (ﷺ) الْيَوْمَ، فَجاء أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) فَدَفَعَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: نعم، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: "ائْذَنْ لَهُ وبَشِّرْهُ بِالْجَنَّة". قَالَ: فَأَقْبَلْتُ حَتَّى قُلْتُ لِأَبِي بَكْرٍ: ادْخُلْ ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) يُبَشِّرُكَ بِالْجَنَّة. قَالَ: فَدَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَجَلَسَ عَنْ يَمِينِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) مَعَهُ فِي الْقُفِّ، ودَلَّى رِجْلَيْه فِي الْبِئْرِ، كَمَا صَنَعَ النَّبِيُّ (ﷺ) وكَشَفَ عَنْ سَاقَيْه. ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، وقَدْ تَرَكْتُ أَخِي يَتَوَضَّأُ ويَلْحَقُنِي، فَقُلْتُ: إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلَانٍ –يُرِيدُ أَخَاهُ– خَيْرًا يَأْتِ بِه، فَإِذَا إِنْسَانٌ يُحَرِّكُ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْه، وقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ يَسْتَأْذِنُ؟ فَقَالَ: "ائْذَنْ لَهُ وبَشِّرْهُ بِالْجَنَّة". فَجِئْتُ عُمَرَ (ﷺ) فَقُلْتُ: أَذِنَ ويُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِالْجَنَّة، قَالَ: فَدَخَلَ فَجَلَسَ مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فِي الْقُفِّ عَنْ يَسَارِه، ودَلَّى رِجْلَيْه فِي الْبِئْرِ. ثُمَّ رَجَعْتُ فَجَلَسْتُ، فَقُلْتُ إِنْ يُرِدِ اللَّهُ بِفُلَانٍ خَيْرًا –يَعْنِي أَخَاهُ– يَأْتِ بِه، فَجاء إِنْسَانٌ فَحَرَّكَ الْبَابَ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقَالَ: عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَقُلْتُ: عَلَى رِسْلِكَ، قَالَ: وجِئْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: "ائْذَنْ لَهُ، وبَشِّرْهُ بِالْجَنَّة، مَعَ بَلْوَى تُصِيبُهُ". قَالَ: فَجِئْتُ فَقُلْتُ: ادْخُلْ، ويُبَشِّرُكَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِالْجَنَّة مَعَ بَلْوَى تُصِيبُكَ، قَالَ: فَدَخَلَ فَوَجَدَ الْقُفَّ قَدْ مُلِئَ، فَجَلَسَ وجَاهَهُمْ مِنَ الشِّقِّ الْآخَرِ. قَالَ شَرِيكٌ: فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ: فَأَوَّلْتُهَا قُبُورَهُمْ.
**(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٧١)**

(سعيد)ی کوڕی (مسيّب) دەڵێ: (أبـو موسـى الاشـعري) (ﷺ) هەواڵیدامێ کەلـە ماڵی خۆیان دەستنوێژی گرت و، پاشـان دەرچـوو وتـی: دەبـێ ئـەمڕۆ لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا (ﷺ) بـبم و لێـی جیانەبمـەوە، دەڵـێ: هاتـە مزگـەوت و پرسـیاری کـرد وتیان: دەرچووە و ئاوا ڕووی ناوە، دەڵێ: بەدوایدا ڕۆیشـتم پرسـیارم دەکـرد هـەتا گەیشتمە بیری (أريس) لای دەرگاکەیدا دانیشـتم، دەرگاکەیشـی لـە لقـی دارخورمـا تەنرابوو، هەتا پێغەمبەر (ﷺ) چـووە سـەر ئـاوو پاشـان دەسـتنوێژی گـرت، ئینجـا هەستام چووم بۆلای لەسـەر بیرەکـە دانیشـتبوو لەناوەڕاسـتی سـەکۆی بیرەکـەدا و هەردوو قوڵی ڕووتکردبوو شۆڕی کردبوونەوە نـاو بیرەکـە، سـەلامم لێکـرد و، دوایـی ڕۆیشتم و لای دەرگاکە دانیشتم و وتم دەبێ ئەمڕۆ دەرگاوانی پێغەمبەربم (ﷺ)، (ابو

بكر)(ﷺ) هات پاڵی نا بە دەرگاکەوە وتم: کێیە؟ وتی: ئەبوبەکرم وتم: پەلەمەکە، وتی: بەڵێ پاشان ڕۆیشتم وتم: یارسول الله ئەوە ئەبوبەکرە، داوای مۆڵەت دەکات؟ فەرمووی: "مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتیشی بدەرێ" هاتمەوە بە ئەبوبەکرم وت: وەرە ژوورەوە لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی بەهەشتت دەداتێ. دەڵێ: ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە لای ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لەپەنا ئەودا هەر لەسەر سەکۆکە دانیشت و، قاچەکانی شۆڕ کردەوە ناو بیرەکە و، بەوێنەی پێغەمبەر (ﷺ) قوڵی ڕووتکرد. دیسان گەڕامەوە دانیشتم،کاتێ من لەماڵ هاتم براکەم جێهێشت دەستنوێژ بگرێت و بەدوامدا بێت، بۆیە وتم: ئەگەر خوا ویستی چاکەی بەفلان ببێ –مەبەستی براکەی بوو– دەیهێنێ بۆ ئێرە، لەناکاو یەکێك دەرگاکەی جوڵان، وتم ئەوە کێیە؟ وتی: (عمر)ی کوڕی (خطاب)ە، وتم: پەلەمەکە، لەپاشدا چووم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) سەلامم لێکرد و وتم: ئەوە (عمر)ە داوای مۆڵەت دەکات؟ فەرمووی: "مۆڵەتی بدە و موژدەی بەهەشتی بدەرێ" هاتمەوە لای عومەر وتم: پێغەمبە مۆڵەتی دایت و موژدەی بەهەشتیشت دەداتێ. دەڵێ: هاتە ژوور دانیشت لەگەڵ پێغەمبەر لەسەر سەکۆکە و لەلای چەپیەوە و، هەردوو قاچی شۆڕکردەوە ناوبیرەکە. دیسان هاتمەوە دانیشتم وتم: ئەگەر خوا ویستی چاکەی بە فلان هەبێت دەیهێنێ بۆئێرە –مەبەستی براکەی بوو– یەکێ هات دەرگاکەی جوڵاند، وتم: ئەوە کێیە؟ وتی: (عثمان)ی کوڕی (عفان) وتم: پەلەمەکە، هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵم دایێ، فەرمووی: "مۆڵەتی بدە و، موژدەی بەهەشتی بدەرێ لەگەڵ بەڵایەکدا تووشی دەبێ" هاتم وتم: وەرە ژوورەوە و پێغەمبەریش موژدەی بەهەشتت دەداتێ لەگەڵ بەڵایەکدا کە توشت دێ. دەڵێ: هاتە ژوورەوە سەرسەکۆکە جێگە نەمابوو، لەو بەرەوە بەرانبەر ئەوان دانیشت. (شريك)ی ڕاوی دەڵێ: سعیدی کوڕی (مسيب) وتی: وام ماناکرد کە ئەوە گۆڕەکانیانە.

## ( ٩ ) پلەو پایەی علی کوڕی أبی طالب ( ﷺ )

**٨٧٥ـ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: خَلَّفَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُخَلِّفُنِي فِي النساء وَالصِّبْيَانِ؟ فَقَالَ: "أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، غَيْرَ أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي". (بخاري/ المغازي/ ٤١٥٤)**

(سعد)ی کوڕی (أبو وقاص)(ﷺ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ جەنگی (تبوك) (علی)کوڕی (أبو طالب)ی کرد بە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە، وتی: یارسول الله جێم دێڵی لەگەڵ ژن ومنداڵدا؟ فەرمووی: "ئایا ڕازی نابیت تۆ بۆ من وەك هارون بیت بۆ موسی، ئەوەندە هەیە دوای من پێغەمبەر نایەت".

٨٧٦ـ عن سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ يَوْمَ خَيْبَرَ: "لَأُعْطِيَنَّ هَذِه الرَّايَةَ رَجُلًا يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْه، يُحِبُّ اللَّهَ ورَسُولَهُ، ويُحِبُّهُ اللَّهُ ورَسُولُهُ". قَالَ: فَبَاتَ النَّاسُ يَدُوكُونَ لَيْلَتَهُمْ أَيُّهُمْ يُعْطَاهَا، قَالَ: فَلَمَّا أَصْبَحَ النَّاسُ غَدَوْا عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) كُلُّهُمْ يَرْجُونَ أَنْ يُعْطَاهَا، فَقَالَ: "أَيْنَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ". فَقَالُوا: هُوَ يَا رَسُولَ اللَّه يَشْتَكِي عَيْنَيْه. قَالَ: "فَأَرْسِلُوا إِلَيْه". فَأُتِيَ بِه، فَبَصَقَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) في عَيْنَيْه ودَعَا لَهُ، فَبَرَأَ حَتَّى كَأَنْ لَمْ يَكُنْ بِه وجَعٌ، فَأَعْطَاهُ الرَّايَةَ، فَقَالَ عَلِيٌّ (ﷺ): يَا رَسُولَ اللَّه، أُقَاتِلُهُمْ حَتَّى يَكُونُوا مِثْلَنَا؟ فَقَالَ: "انْفُذْ عَلَى رِسْلِكَ حَتَّى تَنْزِلَ بِسَاحَتِهِمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ وأَخْبِرْهُمْ بِمَا يَجِبُ عَلَيْهِمْ مِنْ حَقِّ اللَّه فِيه، فَوَاللَّه لَأَنْ يَهْدِيَ اللَّهُ بِكَ رَجُلًا واحِدًا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ يَكُونَ لَكَ حُمْرُ النَّعَمِ". **(بخاري/ الجهاد/ ٣٧٨٣)**

(سەهل)ی کوڕی (سعد)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژی خەیبەر فەرمووی: "ئەم ئاڵایە دەدەمە دەستی پیاوێك خوا لەسەر دەستی ئەو سەرکەوتن ئەنجام دەدات، خوا و پێغەمبەری خۆشدەوێ و،خواو پێغەمبەریش خۆشیان دەوێت". دەڵێ: خەڵك ئەو شەوەیان ڕۆژ کردەوە بەو باسەوە: دەبێ کامیان ئەو ئاڵایەی بدرێتێ، کاتێ خەڵك ڕۆژیان لێبوویەوە، بەیانی زوو ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان خوازیاری ئەوە بوون ئەوئاڵایەیان بدرێتێ، فەرمووی: "علي کوڕی أبو طالب لە کوێیە؟". وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لەدەس ئازاری هەردوو چاوی دەناڵێنێ. فەرمووی: "بنێرن بە دوایدا" هێنایان پێغەمبەر (ﷺ) تفی کردە هەردووچاوی و بۆی پاڕایەوە، چاك بوو هەروەك ئازاری نەبوبێت، ئاڵاکەی دایە دەستی، علی (ﷺ) وتی: یارسول الله لەگەڵیان نەجەنگێن تاوەك ئێمە یان لێدێت؟ فەرمووی: "لەسەر خۆ بڕۆ ناویان تا دەگەیتە قەراغی ماڵەکانیان، دوایی بانگیان بکە بۆ ئیسلام هەواڵیان بدەرێ بەوەی واجبە لەسەریان لە ئەرکی خوایی، سوێند بەخوا، ئەگەر خوا بەهۆی تۆوە یەك کەس ڕێنمایی بکات بۆتۆ چاکترە لە هەرچی وشتری سوور هەیە".((مەبەست سامانی دنیایە)).

٨٧٧ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: اسْتُعْمِلَ عَلَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ مِنْ آلِ مَرْوَانَ، قَالَ: فَدَعَا سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ فَأَمَرَهُ أَنْ يَشْتِمَ عَلِيًّا، قَالَ: فَأَبَى سَهْلٌ، فَقَالَ لَهُ: أَمَّا إِذْ أَبَيْتَ فَقُلْ: لَعَنَ اللَّهُ أَبَا التُّرَابِ. فَقَالَ سَهْلٌ: مَا كَانَ لِعَلِيٍّ (رضي الله عنه) اسْمٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَبِي التُّرَابِ، وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ إِذَا دُعِيَ بِهَا. فَقَالَ لَهُ :أَخْبِرْنَا عَنْ قِصَّتِهِ، لِمَ سُمِّيَ أَبَا تُرَابٍ؟ قَالَ: جاء رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْتَ فَاطِمَةَ (رضي الله عنها) فَلَمْ يَجِدْ عَلِيًّا فِي الْبَيْتِ. فَقَالَ: "أَيْنَ ابْنُ عَمِّك". فَقَالَتْ: كَانَ بَيْنِي وبَيْنَهُ شيء فَغَاضَبَنِي، فَخَرَجَ فَلَمْ يَقِلْ عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِإِنْسَانٍ: "انْظُرْ أَيْنَ هُوَ". فَجاء فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ فِي الْمَسْجِدِ رَاقِدٌ، فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وهُوَ مُضْطَجِعٌ، قَدْ سَقَطَ رِدَاؤُهُ عَنْ شِقِّهِ فَأَصَابَهُ تُرَابٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَمْسَحُهُ عَنْهُ ويَقُولُ: "قُمْ أَبَا التُّرَابِ، قُمْ أَبَا التُّرَابِ". **(بخاري/ المساجد/ ٤٣٠)**

(سهل)ی كوڕی (سعد)(رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك لە تیرەی مەروان كرابە كارمەند لەسەر مەدینە، (سعد)ی بانگ كرد و وتی: دەبێ جنێو بە علی بدەیت، سهل بەقسەی نەكرد، وتی: وەك ئەوەت نەكرد، دەبڵێ: لەعنەتی خوا لە (أبو تراب)، (سهل) وتی: علی هیچ ناوێكی نەبووە لای شیرین تر بێت لە (أبو تراب) و زۆری پێخۆشبوو بەو شێوە بانگ بكرایە.

(أبو حازم الراوی) وتی: هەواڵمان بدەرێ بۆچ بە (أبو تراب) ناونراوە؟ وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دێت بۆ ماڵی (فاطمة)(رضي الله عنها) علی لەماڵ نابێت، دەفەرموێ: "ئامۆزاكەت لە كوێیە؟" دەڵێ: شتێك ڕویدا لە نێوانماندا لێم تۆراو دەرچوو، لای من نیوەڕۆ خەوی نەكرد، پێغەمبەر (ﷺ) بەكەسێكی فەرموو: "بزانە لە كوێیە؟" هاتەوە و وتی: یا رسول الله وا لە مزگەوت ڕاكشاوە، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای ڕاكشابوو عەباكەی لە لاتەنیشتی كەوتبووەخوارو پشتی خۆڵاوی بووبوو، پێغەمبەر (ﷺ) خۆڵەكەی دەسڕی و دەیفەرموو: "هەستە أبوتراب، هەستە ابو تراب".

## (١٠) پلەوپایەی طلحة كوڕی عبیدالله (رضي الله عنه)

٨٧٨ـ عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: لَمْ يَبْقَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الْأَيَّامِ الَّتِي قَاتَلَ فِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَيْرُ طَلْحَةَ وسَعْدٍ –عَنْ حَدِيثِهِمَا–. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥١٧)**

(أبو عثمان) دەڵێ: لەیەکێ لەو ڕۆژگارانەی پێغەمبەر (ﷺ) تیا جەنگا جگە لە (طلحة)و (سعد) کەسی تری لەگەڵ نەما. (مەبەست جەنگی أُحدە).

### (١١) پلەوپایەی (زبیر)ی کوڕی (عوام)

٨٧٩ـ عَنْ مُحَمَّد بْنِ الْمُنْكَدِر، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْد اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: نَدَبَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) النَّاسَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، ثُمَّ نَدَبَهُمْ فَانْتَدَبَ الزُّبَيْرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "لِكُلِّ نَبِيّ حَوَارِيٌّ وحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ". **(بخاري/ الجهاد/ ٢٦٩٢)**

(محمد)ی کوڕی (منکدر) دەڵێ: لە(جابر)ی کوڕی (عبدالله) م (رضي الله عنه) بیستووە دەیوت: لە ڕۆژی خەندەقدا پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکی هەڵنا (بۆ ئەوەی هەواڵی بنو قریظةی بۆ بزانن) (زبیر) ئامادەیی دەربڕی، جارێکی تر هەڵینان (زبیر) ئامادەیی دەربڕی، جارێکی تر هەڵینان هەر (زبیر) ئامادەیی دەربڕی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەموو پێغەمبەرێك هاوەڵی تایبەتی هەیە، (زبیر)یش هاوەڵی تایبەتی منە".

٨٨٠ـ عَنْ عَبْد اللَّه بْنِ الزُّبَيْر (رضي الله عنه) قَالَ: كُنْتُ اناءعُمَرُ بْنُ أَبِي سَلَمَةَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ مَعَ النِّسْوَةِ فِي أُطُمِ حَسَّانَ، فَكَانَ يُطَأْطِئُ لِي مَرَّةً فَأَنْظُرُ وأُطَأْطِئُ لَهُ مَرَّةً فَيَنْظُرُ، فَكُنْتُ أَعْرِفُ أَبِي إِذَا مَرَّ عَلَى فَرَسِهِ فِي السِّلَاحِ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ. قَالَ: وأَخْبَرَنِي عَبْدُ اللَّه بْنُ عُرْوَةَ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ الزُّبَيْرِ، قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِأَبِي، فَقَالَ: ورَأَيْتَنِي يَا بُنَيَّ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: أَماءاللَّه لَقَدْ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمَئِذٍ أَبَوَيْهِ، فَقَالَ: "فَدَاكَ أَبِي وأُمِّي". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥١٥)**

(عبدالله)ی کوڕی (زبیر) (رضي الله عنه) دەڵێ: ڕۆژی خەندەق من و (عمر)ی کوڕی (أبو سلمة)لەگەڵ ئافرەتاندا لە قەڵای (حسان) بووین، جارێك (عمر) پشتی بۆمن دادەنەواند و (دەچوومە سەر پشتی و) دەمڕوانی، جارێکی دی من پشتم بۆ ئەو دادەنەواند و (دەچووە سەر پشتم) دەیڕوانی، من باوکی خۆم دەناسییەوە بەسواری ئەسپەکەیەوە چەك بەدەس کەدەچوو بۆ ناو (بني قريظة) دەڵێ: (عبدالله)ی کوڕی (عُروة) هەواڵی دامێ، لە (عبدالله)ی کوڕی (زبیر)ەوە دەڵێ: من ئەم دیمەنەم باسکرد بۆ باوکم، وتی: ڕۆڵە منت بینی؟ وتم: بەڵێ، وتی: بزانە بەخوا ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوك و دایکی پێکەوە ناوبردوو فەرمووی: "باوك و دایکم فیداتبێ".

## (١٢) پلە و پایەی سعدی کوڕی أبو وەقاص (رضي الله عنه)

٨٨١ـ عن عَائشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: سَهِرَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) مَقْدَمَهُ الْمَدينَةَ لَيْلَةً، فَقَالَ: "لَيْتَ رَجُلًا صَالحًا منْ أَصْحَابي يَحْرُسُني اللَّيْلَةَ". قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلكَ سَمعْنَا خَشْخَشَةَ سلَاحٍ، فَقَالَ: "مَنْ هَذَا". قَالَ: سَعْدُ بْنُ أَبي وقَّاصٍ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا جَاء بكَ". قَالَ: وقَعَ في نَفْسي خَوْفٌ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَجِئْتُ أَحْرُسُهُ. فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثُمَّ نَامَ. **(بخاري/ الجهاد/ ٢٧٢٩)**

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەرەتای گەیشتنی بۆ مەدینە شەوێك نەخەوت، فەرمووی: "خۆزگە پیاوچاكێك لەیارەكانم ئەمشەو پاسەوانی منی بكردبایە"، دەڵێ: ئێمە لەو مشت و مڕەدا بووین، گوێمان لە خشەخشی چەكێك بوو، فەرمووی: "ئەوە كێیە؟" وتی: (سعدی كوڕی أبو (وقاص)ە، فەرمووی: "بۆچی هاتویت؟" وتی: دڵم ترسا لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) توشی شتێك بێت، هاتم پاسەوانی بكەم، پێغەمبەر (ﷺ) بۆی پارایەوە و ئەمجا خەوت.

٨٨٢ـ عَنْ عَامرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبيه (رضي الله عنه):، أَنَّ النَّبيَّ (ﷺ) جَمَعَ لَهُ أَبَوَيْه يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ منَ الْمُشْركينَ قَدْ أَحْرَقَ الْمُسْلمينَ، فَقَالَ لَهُ النَّبيُّ (ﷺ): "ارْمِ فدَاكَ أَبِي وأُمِّي". قَالَ: فَنَزَعْتُ لَهُ بِسَهْمٍ لَيْسَ فيه نَصْلٌ، فَأَصَبْتُ جَنْبَهُ فَسَقَطَ فَانْكَشَفَتْ عَوْرَتُهُ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى نَوَاجِذِهِ. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥١٩)**

(عامر)ی كوڕی (سعد)، لە باوكییەوە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر (ﷺ)، باوك و دایكی بۆ كۆكردەوە لە ڕۆژی (أُحد)دا، دەڵێ: پیاوێك لە كافرەكان موسڵمانەكانی سوتاند (واتە وەك ئاگر لەناوی دەبردن) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بتەقێنە دایك و باوكم فیدات بێ" دەڵێ: تیرێكم تێگرت سەرتیری نەبوو، دام لە تەنیشتی و دای بەئەرزا و عەورەتی دەركەوت، پێغەمبەر (ﷺ) پێكەنی هەتا چاوم كەوت بە خرێكانی.

## (١٣) پلە و پایەی (أبو عبیدة)ی كوڕی (جراح)

٨٨٣ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: جاء أَهْلُ نَجْرَانَ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه ابْعَثْ إِلَيْنَا رَجُلًا أَمينًا، فَقَالَ: "لَأَبْعَثَنَّ إِلَيْكُمْ رَجُلًا أَمينًا حَقَّ أَمينٍ حَقَّ أَمينٍ". قَالَ: فَاسْتَشْرَفَ لَهَا النَّاسُ، قَالَ: فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (رضي الله عنه). **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٣٤)**

(حذيفة) (ﷺ) دەڵێ: خەڵکی نجران هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێکی ئەمینمان بۆ بنێرە، فەرمووی: "دڵنیابن پیاوێکتان بۆ دەنێرم ئەمین بێت، بەحەق ئەمین، بەحەق ئەمین". دەڵێ: خەڵك حەزیان بەم سەروکاریەکرد وبەتەمای بوون، (أبو عبیدة)ی کوڕی (جراح)ی ناردن.

## (١٤) پلە وپایەی (حسن و حسین) (ﷺ)

**٨٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي طَائِفَةٍ مِنَ النَّهَارِ، لَا يُكَلِّمُنِي ولَا أُكَلِّمُهُ، حَتَّى جاء سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعَ، ثُمَّ انْصَرَفَ حَتَّى أَتَى خِبَا و فَاطِمَةَ (ﷺ)، فَقَالَ: "أَثَمَّ لُكَعُ، أَثَمَّ لُكَعُ". يَعْنِي حَسَنًا (ﷺ)، فَظَنَنَّا أَنَّهُ إِنَّمَا تَحْبِسُهُ أُمُّهُ لِأَنْ تُغَسِّلَهُ وتُلْبِسَهُ سِخَابًا، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جاء يَسْعَى، حَتَّى اعْتَنَقَ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ، فَأَحِبَّهُ وأَحْبِبْ مَنْ يُحِبُّهُ". (بخاري/ البيوع/ ٢٠١٦)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: دەرچووم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەساتەوەختی ڕۆژێکدا نە ئەو قسەی بۆدەکردم نە من قسەم بۆ دەکرد، هەتا گەیشتە بازاڕی (بنو قینقاع) ئینجا ڕۆیشت هەتا گەیشتە دەوارەکەی (فاطمة)(ﷺ) فەرمووی: "ئایا بچکۆل لێرەیە؟" مەبەستی حسن بوو (ﷺ)، واتێگەیشتین دایکی کەمێ بەندی بکات بۆئەوەی بیشوا و مێخەکبەندی لەمل بکات، زۆری پێنەچوو بەڕاکردن هات ، هەتا هەریەکەیان باوەشی کرد بەملی هاوڕێکەیدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەی خوایە من خۆشم دەوێ تۆیش خۆشت بوێ ئەو کەسەیشت خۆشبوێ کە خۆشی دەوێ".

## (١٥) پلەوپایەی (فاطمة) (ﷺ) کچی پێغەمبەر (ﷺ)

**٨٨٥ـ عن الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ (ﷺ)، أن عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، وعِنْدَهُ فَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا سَمِعَتْ بِذَلِكَ فَاطِمَةُ (ﷺ) أَتَتِ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ قَوْمَكَ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّكَ لَا تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحًا ابْنَةَ أَبِي جَهْلٍ. قَالَ الْمِسْوَرُ: فَقَامَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ، ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ، فَحَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وإِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ مُضْغَةٌ مِنِّي، وإِنَّمَا أَكْرَهُ أَنْ يَفْتِنُوهَا، وإِنَّهَا واللَّهِ لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ عِنْدَ رَجُلٍ واحِدٍ أَبَدًا". قَالَ: فَتَرَكَ عَلِيٌّ (ﷺ) الْخِطْبَةَ. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٢٣)**

(مِسوَر)ی کوڕی (مخرمة)(ﷺ) دەڵێ: علی کوڕی أبوطالب (ﷺ) خـوازبێنی کچـی (أبو جهل)ی کرد، لەوکاتـەدا فاطمـة (ﷺ) ئـەوەی بیسـت هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) و پێیـوت: قەومەوکـەت دەڵـێن کـە بەڕاسـتی تـۆ ڕقـت هەڵناسـێ بـۆ خـاتری کچەکانت (واتە گوێیان نادەیتێ) ئەوەتا، (علی) دەیەوێت کچی (أبو جهل)بخوازێت، (مسوَر)دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەستا گوێم لێبوو شایەتمانی هێنا و ئینجا فـەرمووی: "دوای ئەمە من ژنم دابە (أبو العاص)ی کوڕی (ربیـع) وادەی پێدام وڕاسـتی لەگـەڵ کردم، بەڕاستی (فاطمة)ی کچی موحەممەد پارچەیەکە لە من، تـەنها لـەوە دەترسـم توشی تاوان و تاقیکردنەوەی بکەن، بەڕاستی و سوێند بەخوا کچی پێغەمبەری خـوا و کچـی دوژمنـی خـوا قـەت کۆنابنـەوە لای پیاوێـك". ئـیتر علـی (ﷺ) وازی لـەو خوازبێنییە هێنا.

٨٨٦ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كُنَّ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (ﷺ) عِنْدَهُ، لَمْ يُغَادِرْ مِنْهُنَّ وَاحِدَةً، فَأَقْبَلَتْ فَاطِمَةُ (ﷺ) تَمْشِي، مَا تُخْطِئُ مِشْيَتُهَا مِنْ مِشْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) شَيْئًا، فَلَمَّا رَآهَا رَحَّبَ بِهَا فَقَالَ: "مَرْحَبًا بِابْنَتِي". ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ سَارَّهَا، فَبَكَتْ بُكًا و شَدِيدًا، فَلَمَّا رَأَى جَزَعَهَا سَارَّهَا الثَّانِيَةَ، فَضَحِكَتْ، فَقُلْتُ لَهَا: خَصَّكِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ بَيْنِ نِسَائِهِ بِالسِّرَارِ، ثُمَّ أَنْتِ تَبْكِينَ؟ فَلَمَّا قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) سَأَلْتُهَا: مَا قَالَ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)؟ قَالَتْ: مَا كُنْتُ أُفْشِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سِرَّهُ. قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قُلْتُ: عَزَمْتُ عَلَيْكِ بِمَا لِي عَلَيْكِ مِنَ الْحَقِّ لَمَا حَدَّثْتِنِي مَا قَالَ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). فَقَالَتْ: أَمَّا الْآنَ فَنَعَمْ، أَمَّا حِينَ سَارَّنِي فِي الْمَرَّةِ الْأُولَى فَأَخْبَرَنِي: "أَنَّ جِبْرِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ، وَإِنَّهُ عَارَضَهُ الْآنَ مَرَّتَيْنِ، وَإِنِّي لَا أُرَى الْأَجَلَ إِلَّا قَدِ اقْتَرَبَ، فَاتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي، فَإِنَّهُ نِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ". قَالَتْ: فَبَكَيْتُ بُكَائِي الَّذِي رَأَيْتِ، فَلَمَّا رَأَى جَزَعِي: سَارَّنِي الثَّانِيَةَ فَقَالَ: "يَا فَاطِمَةُ أَمَا تَرْضَيْ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ: سَيِّدَةَ نِسَاءِ هَذِهِ الْأُمَّةِ". قَالَتْ: فَضَحِكْتُ ضَحِكِي الَّذِي رَأَيْتِ. **(بخاري/ الاستئذان/ ٥٩٢٨)**

(عائشـة)(ﷺ) دەڵـێ: خێزانـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) هـەموویان لای بـوون هـیچ کامیان دەرنەچوبوو، (فاطمة)(ﷺ) ڕوی تێکردین و هات بۆلامان، ڕۆیشـتنەکەی هـیچ جیاواز نەبوو لەڕۆیشتنی پێغەمبەر (ﷺ)، کـاتێ بینـی مەرحـەبای کـرد و فـەرمووی: "مەرحەبا کچـەکەم" لـە پاشـدا داینیشـاند لـەلای ڕاسـتیەوە یـان چـەپیەوە، دوایـی

چپەیەکی بۆ کرد، گریا بەگریانێکی بەکوڵ، کاتی بینی زۆر بێتاقەت بووە، چپەیەکی تری بۆ کرد، ئەمجا پێکەنی، پێم وت: پێغەمبەر (ﷺ) تۆی تایبەت کرد لە نێوەندی خێزانەکانیدا بە نهێنی کەچی تۆ دەگریت؟ کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەستا لێم پرسی: پێغەمبەر (ﷺ) چی پێفەرمووی؟ وتی: من نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) نادرکێنم، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد پێم وت: سوێندت لێدەخۆم بەو مافانەی هەمانە لەسەرت پێم بڵێی: ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ) چی پێوتی؟ وتی: ئێستا بەڵێ، کاتێ جاری یەکەم چپەی بۆ کردم هەواڵی دامێ: "کە جبریلساڵی جارێك یان دوو جار قورئانم پێدەخوێنێتەوە، بەڵام ئێستا دوو جار پێی خوێندمەوە، بەڕاستی من وادەبینم ئەجەلم نزیك بوەتەوە، لەخوا بترسە و خۆبگرە من باشترین پێشینم بۆتۆ" دەڵێ: گریام بەو گریانەی دیت، کاتێ بێتاقەتی منی بینی دووەم جار چپانی بە گوێمدا: "ئەی (فاطمة)ڕازی نابیت بەوەی گەورەی ئافرەتانی باوەڕداران بیت، یان گەورەی ئافرەتی ئەم ئوممەتەبیت". منیش پێکەنیم بەو پێکەنینەی دیت.

## (١٦) پلە و پایەی عائشەی دایکی بڕواداران (رضي الله عنها)

٨٨٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ ثَلَاثَ لَيَالٍ، جاءنِي بِكِ الْمَلَكُ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ فَيَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ، فَأَكْشِفُ عَنْ وجْهِكِ، فَإِذَا أَنْتِ هِيَ، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِه". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٣٢)

لە(عاشە)وە (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "سێ جار تۆم نیشاندرا لەخەودا، فریشتەیەك تۆی دەهێنا بۆلام لەناو پارچەیەك ئاوریشمدا دەیوت: ئەمە خێزانەکەتە کە سەرم لادایت دەبینم تۆیت، منیش دەموت: ئەگەر ئەم خەوە لە خواوە بێت دەیهێنێتە دی

٨٨٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنِّي لَأَعْلَمُ إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً، وإِذَا كُنْتِ عَلَيَّ غَضْبَى". قَالَتْ: فَقُلْتُ: ومِنْ أَيْنَ تَعْرِفُ ذَلِكَ؟ قَالَ: "أَمَّا إِذَا كُنْتِ عَنِّي رَاضِيَةً فَإِنَّكِ تَقُولِينَ: لَا ورَبِّ مُحَمَّدٍ (ﷺ)، وإِذَا كُنْتِ غَضْبَى قُلْتِ: لَا ورَبِّ إِبْرَاهِيمَ". قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ –وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ– مَا أَهْجُرُ إِلَّا اسْمَكَ. (بخاري/ النكاح/ ٤٩٣٠)

لە(عائشة)وە (رضي الله عنها) پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتم: من دەزانم چ کاتێك تۆ لێم ڕازیت، و چ کاتێك لێم زویریت" دەڵێ: پێم وت: لەکوێوە ئەمە دەزانی؟ فەرمووی: "بەوەی

هەرکات لێم ڕازی بوویت دەڵێی: نەخێر بەخوای موحەممەد (ﷺ) و هەرکات لێم زویر بوویت دەڵێی: نەخێر بەخوای ئیبراهیم" دەڵێ: وتم: بەڵێ –والله ئەی پێغەمبەری خوا –تەنها ناوەکەی تۆ وازلێ دێنم".

٨٨٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّهَا كَانَتْ تَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَتْ: وكَانَتْ تَأْتِينِي صَوَاحِبِي فَكُنَّ يَنْقَمِعْنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَتْ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ. **(بخاري/ الأدب/ ٥٧٧٩)**

لە عائشەوە (رضي الله عنها) کە ئەو یاری بەبووکە شووشە دەکرد لای پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: چەند هاوڕێیەکم هەبوون دەهاتن بۆلام، کاتێ پێغەمبەریان (ﷺ) دەبینی خۆیان دەشاردەوە لەشەرمدا، پێغەمبەریش (ﷺ) یەکەیەکە دەیناردنەوە بۆ لام.

٨٩٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّ النَّاسَ كَانُوا يَتَحَرَّوْنَ بِهَدَايَاهُمْ يَوْمَ عَائِشَةَ، يَبْتَغُونَ بِذَلِكَ مَرْضَاةَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). **(بخاري/ الهبة/ ٢٤٣٥)**

لە (عائشە)وە (رضي الله عنها) کە خەڵك بەدوای ئەوەدا دەگەڕان لە ڕۆژی عائشەدا دیاریەکانیان بنێرن، مەبەستیان ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕازی و دڵخۆش بێ.

٨٩١ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لَيَتَفَقَّدُ، يَقُولُ: "أَيْنَ أَنَا الْيَوْمَ، أَيْنَ أَنَا غَدًا". اسْتِبْطَا و لِيَوْمِ عَائِشَةَ، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ يَوْمِي قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي ونَحْرِي. **(بخاري/ الجنائز/ ١٣٢٣)**

لە (عائشە)وە (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆسەرەی من دەگەڕا دەیفەرموو: "من ئەمڕۆ لە کوێم؟ من سبەینێ لە کوێم؟" چونکە حەزی دەکرد زووبگاتەوە ڕۆژەکەی عائشە، دەڵێ: کاتێ سەرەی من هاتەوە خوای گەورە گیانی کێشا لەنێوان سنگ و گەردنی مندا.

٨٩٢ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ، وهُوَ مُسْنِدٌ إِلَى صَدْرِهَا، وأَصْغَتْ إِلَيْهِ وهُوَ يَقُولُ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وارْحَمْنِي، وأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ". **(بخاري/ المغازي/ ٤١٧٦)**

لە(عائشە)وە (رضي الله عنها) کەلە پێغەمبەری (ﷺ) بیستووە –بەرلەوەفاتی لەکاتێکدا پاڵی دابوو بەسینگییەوە– گوێی لێگرت دەیفەرموو: "ئەی خوایە لێم ببورە و بەزەییت پیامدا بێتەوە و بمگەیەنە بە خۆشەویست" (مەبەستی پێغەمبەران و دانیشتوانی بەهەشتە)

٨٩٣ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ وهُوَ صَحِيحٌ: "إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يُرَى مَقْعَدُهُ فِي الْجَنَّة، ثُمَّ يُخَيَّرُ". قَالَتْ عَائِشَةُ: فَلَمَّا نَزَلَ بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) ورَأْسُهُ عَلَى فَخِذِي، غُشِيَ عَلَيْه سَاعَةً ثُمَّ أَفَاقَ، فَأَشْخَصَ بَصَرَهُ إِلَى السَّقْف، ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى". قَالَتْ عَائِشَةُ: قُلْتُ: إِذًا لَا يَخْتَارُنَا، قَالَتْ عَائِشَةُ: وعَرَفْتُ الْحَدِيثَ الَّذِي كَانَ يُحَدِّثُنَا بِه وهُوَ صَحِيحٌ فِي قَوْله: "إِنَّهُ لَمْ يُقْبَضْ نَبِيٌّ قَطُّ حَتَّى يَرَى مَقْعَدَهُ منَ الْجَنَّة، ثُمَّ يُخَيَّرُ". قَالَتْ عَائِشَةُ: فَكَانَتْ تلْكَ آخرَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) قَوْلَهُ: "اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى". **(بخاري/ المغازي/ ٤١٩٤)**

لـه(عائشـة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەکاتێکـدا لـەش سـاغ بـوو دەیفەرموو: "هیچ پێغەمبەرێك گیانی نەکێشراوە هـەتا جێگـەی لەبەهەشـتدا نیشـان نەدرابێ، دوای ئەوە سەرپشك کراوە"، عائشـة دەڵـێ: لەکاتێکدا نەخۆشـی دابەزیـە سەر پێغەمبەر (ﷺ) سەری لەسەر ڕانی مـن بـوو، ساتێك بێهۆشـبوو ئـەمجا هۆشـی هاتەوە و چاوی بڕیە سەقفەکە و فەرمووی: "ئەی خوایە بـەرزترین هـاوڕێ" عائشـة دەڵێ: وتم کەوابوو ئێمە هەڵنابژێرێ، ئەو فەرمودەیشم زانی کەلە حاڵی لەش ساغیدا پێی دەفەرموویین: "هیچ پێغەمبـەرێك گیـانی ناکێشـرێت هـەتا جێگـەی لەبەهەشـتدا نیشان نەدرێت، پاش ئەوە سەرپشك دەکرێت" عائشە دەڵـێ: دوا وشـەی پێغەمبـەر (ﷺ) کەلەدەمی دەرچوو فەرموودەی "اللّهم الرفيق الاعلى" بوو.

٨٩٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا خَرَجَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائه، فَطَارَت الْقُرْعَةُ عَلَى عَائِشَةَ وحَفْصَةَ، فَخَرَجَتَا مَعَهُ جَمِيعًا، وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا كَانَ بِاللَّيْلِ سَارَ مَعَ عَائِشَةَ يَتَحَدَّثُ مَعَهَا، فَقَالَتْ حَفْصَةُ لِعَائِشَةَ: أَلَا تَرْكَبِينَ اللَّيْلَةَ بَعِيرِي وأَرْكَبُ بَعِيرَك، فَتَنْظُرِينَ وأَنْظُرُ؟ قَالَتْ: بَلَى، فَرَكِبَتْ عَائِشَةُ عَلَى بَعِيرِ حَفْصَةَ، وركِبَتْ حَفْصَةُ عَلَى بَعِيرِ عَائِشَةَ (ﷺ)، فَجَاء رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِلَى جَمَلِ عَائِشَةَ وعَلَيْه حَفْصَةُ، فَسَلَّمَ ثُمَّ سَارَ مَعَهَا حَتَّى نَزَلُوا، فَافْتَقَدَتْهُ عَائِشَةُ، فَغَارَتْ، فَلَمَّا نَزَلُوا جَعَلَتْ تَجْعَلُ رِجْلَهَا بَيْنَ الْإِذْخِرِ وتَقُولُ: يَا رَبِّ سَلِّطْ عَلَيَّ عَقْرَبًا أَوْ حَيَّةً تَلْدَغُنِي، رَسُولُكَ، ولَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقُولَ لَهُ شَيْئًا. **(بخاري/ النكاح/ ٤٩١٣)**

له(عائشه)وە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) هەرکات سەفەری بکردایە تیروپشـکی دەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا، جارێك تیروپشکەکە بـۆ (عائشـة و حفصـه) دەرچـوو،

هەردوكیان لەگەڵی دەرچوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر بەشەو ڕێگای بكردایە لەگەڵ عائشە دەڕۆیی و قسەی لەگەڵ دەكرد، جارێكیان (حفصە) بەعائشەی وت: ئایا ئەمشەو تۆسواری وشترەكەی من نابیت، منیش سواری وشترەكەی تۆ ببم،هەتابزانین چی ڕوودەدات؟ عائشة وتی: بەڵێ، عائشە سواری وشترەكەی حفصە بوو، حفصەیش سواری وشترەكەی عائشە بوو (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای وشترەكەی عائشە حفصەی لەسەر بوو سەلامی لێكرد و لەگەڵی ڕۆیی هەتا دابەزین، عائشە پێغەمبەری لێونبوو غیرەت گرتی، كاتێ دابەزین عائشە پێی دەخستە ناو درك و دەیوت: ئەی پەروەردگار دوپشكێ مارێكم بۆ بنێرە بمگەزێت، ئەوە پێغەمبەری تۆیە و ناتوانم هیچی لەڕوودا بڵێم.

**٨٩٥ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "كَمَلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، ولَمْ يَكْمُلْ مِنَ النساء غَيْرُ مَرْيَمَ بِنْتِ عِمْرَانَ، وآسِيَةَ امْرَأَةِ فِرْعَوْنَ، وإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النساء كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٣٠)**

لە(أبی موسی)وە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "پیاوان زۆریان لێ كامڵ بوون، بەڵام ئافرەتان كامڵیان تیانەبووە، جگە لە (مریم ی كچی عمران) و (آسیة ی خێزانی فرعون)، بەڕاستی ڕێزی عائشە بەسەر ئافرەتانی تردا، وەك ڕیزی گۆشتاو وایە بەسەر خواردنەكانی تردا".

**٨٩٦ـ عن عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَا عَائِشُ، هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ". قَالَتْ: فَقُلْتُ: وعَلَيْهِ السَّلَامُ ورَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَتْ: وهُوَ يَرَى مَا لَا أَرَى. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٥٧)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەی عائشە ئەوە (جبریل)ە سەلامت لێدەكات (وتی:) (علیە السلام ورحمة الله) ئەو شتی وای دەبینی من نەمدەبینی. (مەبەستی پێغەمبەرە (ﷺ)

**٨٩٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) أَنَّهَا قَالَتْ: جَلَسَ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً، فَتَعَاهَدْنَ وتَعَاقَدْنَ أَنْ لَا يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئًا، قَالَتِ الْأُولَى: زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ غَثٌّ، عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ وعْرٍ، لَا سَهْلٌ فَيُرْتَقَى ولَا سَمِينٌ فَيُنْتَقَى. قَالَتِ الثَّانِيَةُ: زَوْجِي لَا أَبُثُّ خَبَرَهُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ لَا أَذَرَهُ، إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وبُجَرَهُ. قَالَتِ الثَّالِثَةُ: زَوْجِي الْعَشَنَّقُ، إِنْ أَنْطِقْ أُطَلَّقْ، وإِنْ أَسْكُتْ أُعَلَّقْ. قَالَتِ الرَّابِعَةُ: زَوْجِي كَلَيْلِ تِهَامَةَ، لَا حَرٌّ ولَا قُرٌّ، ولَا**

مَخَافَةَ ولَا سَآمَةَ. قَالَت الْخَامسَةُ: زَوْجي إِنْ دَخَلَ فَهدَ وإِنْ خَرَجَ أَسدَ، ولَا يَسْأَلُ عَمَّا عَهدَ، قَالَت السَّادسَةُ: زَوْجي إِنْ أَكَلَ لَفَّ، وإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ، وإِن اضْطَجَعَ الْتَفَّ، ولَا يُولجُ الْكَفَّ ليَعْلَمَ الْبَثَّ. قَالَت السَّابعَةُ: زَوْجي غَيَايَا و –أَوْ عَيَايَا و– طَبَاقَا و، كُلُّ دَا و لَهُ دَا و، شَجَّك أَوْ فَلَّك، أَوْ جَمَعَ كُلًّا لَك. قَالَت الثَّامنَةُ: زَوْجي الرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ، والْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ. قَالَت التَّاسعَةُ: زَوْجي رَفيعُ الْعمَاد، طَوِيلُ النِّجَاد، عَظيمُ الرَّمَاد، قَرِيبُ الْبَيْت منَ النَّادي. قَالَت الْعَاشرَةُ: زَوْجي مَالكٌ، ومَا مَالكٌ؟ مَالكٌ خَيْرٌ منْ ذَلك، لَهُ إِبلٌ كَثيرَاتُ الْمَبَارِك قَليلَاتُ الْمَسَارِح، إِذَا سَمعْنَ صَوْتَ الْمزْهَر أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هوَالكُ. قَالَت الْحَاديَةَ عَشْرَةَ: زَوْجي أَبُو زَرْعٍ فَمَا أَبُو زَرْعٍ؟ أَنَاسَ منْ حُليٍّ أُذُنَيَّ، ومَلَأَ منْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ، وبَجَّحَني فَبَجحَتْ إِلَيَّ نَفْسي، وجَدَني في أَهْل غُنَيْمَةٍ بشقٍّ، فَجَعَلَني في أَهْل صَهيلٍ وأَطيطٍ ودَائسٍ ومُنَقٍّ، فَعنْدَهُ أَقُولُ فَلَا أُقَبَّحُ، وأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ، وأَشْرَبُ فَأَتَقَنَّحُ. أُمُّ أَبي زَرْعٍ، فَمَا أُمُّ أَبي زَرْعٍ؟ عُكُومُهَا رَدَاحٌ، وبَيْتُهَا فَسَاحٌ. ابْنُ أَبي زَرْعٍ، فَمَا ابْنُ أَبي زَرْعٍ؟ مَضْجَعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ، ويُشْبعُهُ ذرَاعُ الْجَفْرَة. بنْتُ أَبي زَرْعٍ، فَمَا بنْتُ أَبي زَرْعٍ؟ طَوْعُ أَبيهَا وطَوْعُ أُمِّهَا، وملْ و كسَائهَا وغَيْظُ جَارَتهَا. جَاريَةُ أَبي زَرْعٍ، فَمَا جَاريَةُ أَبي زَرْعٍ؟ لَا تَبُثُّ حَديثَنَا تَبْثيثًا، ولَا تُنَقِّثُ ميرَتَنَا تَنْقيثًا. ولَا تَمْلَأُ بَيْتَنَا تَعْشيشًا. قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ والْأَوْطَابُ تُمْخَضُ، فَلَقيَ امْرَأَةً معَهَا ولَدَان لَهَا كَالْفَهْدَيْن، يَلْعَبَان منْ تَحْت خَصْرِهَا برُمَّانَتَيْن، فَطَلَّقَني ونَكَحَهَا. فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلًا سَريًّا، رَكبَ شَريًّا، وأَخَذَ خَطِّيًّا، وأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَمًا ثَريًّا، وأَعْطَاني منْ كُلِّ رَائحَةٍ زَوْجًا، قَالَ: كُلي أُمَّ زَرْعٍ، وميري أَهْلَك. فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شيء أَعْطَاني مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنيَة أَبي زَرْعٍ. قَالَتْ عَائشَةُ: قَالَ لي رَسُولُ اللَّه (ﷺ): **"كُنْتُ لَك كَأَبي زَرْعٍ لأُمِّ زَرْعٍ". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٩٣)**

**(عائشة)(ﷺ)** دەڵێ: یازدە ژن دانیشتن پەیمانیان لەگەڵ یەکتربەست هەرکەس باسی مێردی خۆی بەڕاستی بکات و هیچی لێ نەشارێتەوە:

یەکەمیان وتی: مێردەکەی من گۆشتی وشترێکی لەڕ و لاوازە، وابەسەر چیایەکی سەختەوە، نەڕێگایەکی ئاسانە لەبەر ئاسانی بۆی سەرکەوی، نەقەڵەویشە لەبەرقەڵەوی بەزی لێبگیرێت. (مەبەستی ئەوەیە زۆر ڕژد و بێکەڵك و توڕەیە)؟

دووەمیان وتی: هەواڵی مێردەکەم بڵاوناکەمەوە، من دەترسم لەوەی گەر لێی نەگەڕێم، چونکە گەر باسی بکەم دەبێ باسی هەموو گرێ و دەمارە ڕەق و وشکەکانی لاشەی و ناوسکی بکەم. (مەبەستی ئەوەیە گەر باسی بکەم دەبێ باسی هەموو خراپەکانی بکەم ئەوەیش ناکرێت، چونکە پێی دەگاتەوە و تەڵاقم دەدات).

سێهەمیان وتی: مێردەکەی من درێژێکی بەدکارە، ئەگەر قسە بکەم تەڵاق دەدرێم، ئەگەر قسەیش نەکەم بە مۆڵەقی دەمێنمەوە. (چونکە نەبێوەژنم شوبکەم و نەمافی ژن و مێردایەتیشم هەیە لای ئەو)

چوارەمیان وتی: مێردەکەی من وەك شەوی وڵاتی حیجازە، نەگەرم و نەساردە، نەلێی دەترسم و نەلێی بێزارم. (واتە لێك ڕازین و یەکیان خۆشدەوێت).

پێنجەمیان و وتی: مێردەکەی من کەهاتەوە دەڵێی وێزە (فهد) پرسیار ناکات لەشتومەك و ماڵ کە پێشتر داینـاوە، کە دەریشچوو دەڵێی شێرە لەگەڵ دوژمن (بڕگەی یەکەم مەبەستی ئەوەیە وەك وێز زۆر دەخەوێ، یان زۆر پەلاماری خێزانی دەدا و باوەشی پیادەکات، بڕگەکانی تریش ڕوونە).

شەشەمیان وتی: مێردەکەم گەر خواردی لوولی ئەدا، گەر خواردیەوە چۆڕی لێئەبڕێت، کەپاڵیش کەوت خۆی دەئاڵێنێ لە لێفەکەی و دەست ناخاتە ناو دەستم تابە ئازار و ئارەزووەکانم بزانێت (مەبەستی ئەوەیە زۆر خۆرە، ڕژدە، خەمی منداڵەکانی نیە، یاری لەگەڵ خێزانی ناکات).

حەوتەمیان وتی: مێردەکەم هیچ نەزانە گەوجە، هیچی پێناکرێت، هەموو دەردێك لەوا کۆیە، یان سەرت دەشکێنێ، یان ئێسکت دەقرتێنێ، یان هەردووکیانت پێکەوە بۆ بەجێدێنێ.

هەشتەمیان وتی: مێردەکەی من بۆنی خۆشە وەك (زَرنب) (گیایەکی بۆن خۆشە) نەرم و شلیشە وەك کەروێشك (دەگونجێ مەبەستی ڕەوشت بەرزی و شیرین خوویی بێت).

نۆهەمیان وتی: مێردەکەم کۆڵەکەی ماڵەکەی بەرزە، قایشی شمشێرەکەی درێژە، خۆڵەمێشی کوانووی زۆرە، ماڵەکەی لەیانەی قەومەکەیەوە نزیکە. (بڕگەی یەکەم ئاماژەیە بەدەوڵەمەندی و سەربەرزی، دووەم بەباڵابەرزی، سێهەم بەمیوانداری زۆر، چوارەم بەوەی ماڵی هەردەم جێگای ڕاوێژی کەسەکانیەتی).

دەیەم وتی: مێردەکەی من ساماندارە، بەڵام چ سامانداریێك ؟ سامانداریێکە؟ چاکتر لەوەی من بۆتانی باس دەکەم، وشترەکانی مۆڵگەی شەویان زۆرە لەوەڕگایان کەمە، هەرکات دەنگی گۆرانی و زوڕنایان بیست دڵنیادەبن لەوەی لەناو دەچن. (مەبەستی ئەوەیە، وشترەکانی لە مۆڵگادا زۆرن، بەڵام ئەوەندەیان لێ سەر دەبڕن

بۆ کەمدەبنەوە لەوەڕگا ، هەرکات شایی و گۆرانی هەبوو ئەوان بەتەمای ژیان نامێنن).

یازدەهەم وتی: مێردەکەی من (أبو زرع)ە کام (أبو زرع)؟ گوێمی خستبووە لەرزە بە گوارە و ئاڵتوون، بازۆڵەی قەڵە وو پڕپەزکردبووم، زۆر دڵخۆشی کردبووم، زۆر بەخۆم دڵخۆشبووم، منی دەرهێنا لە شوێنێکی ئاژەڵدار و سەختگوزەراندا، گواستمیەوە بۆ ماڵێکی دەوڵەمەند و پڕ لەحیلکەی ئەسپ و، وشتری بەبار، کەلە گرانی بارەکانیاندا جیڕەی کۆپانەکانیان دەهات، بۆ ماڵێکی پڕلە مەزرا و خەرمانی چاك و ڕزق و و ڕۆزی ئەخەوتم و بەیانی خەوم دەکرد، دەم خواردەوە تا پاراو دەبووم، دایکی (أبو زرع)، کام دایکی (أبو زرع)؟ خەرار و جەواڵەکانی قورس و پڕە، ماڵەکەی بەرپان و فراوانە. کوڕەکەی أبوزرع کام کوڕی أبو زرع جێگاخەوەکەی وەك شمشێری لە کێلان دەرهاتوو بوو، یان وەك لقی دارخورمای سەوزی لەگەڵا ڕووتکراو (واتە: کەم گۆشت و ناوقەد باریك)دەستی کارژۆڵەیەك تێری دەکرد، (واتە کەمخۆر بوو).

کچەکەی أبو زرع، کام کچی أبو زرع گوێڕایەڵی باوك و دایکی، قەڵەو و خرپن وپڕپەکراسەکەی، ڕقی هەوێکەی هەڵدەسان (ئەوەندە جوان بوو).

کەنیزەکی أبو زرع، کام کەنیزەکی أبو زرع؟ نهێنی یەکانمانی نەدەبردە دەرەوە، خواردن و ڕۆزییەکانی بەفیڕۆ نەدەدا و دزی لێنەدەکرد ماڵەکەی نەدەکرد بە هێلانەی بەدکاری وبەدکاران، یان ماڵەکەمانی پڕ نەدەکرد لە زبڵ و پیسی.

ڕۆژێك (أبو زرع) دەرچوو لەماڵ ئەوەندە زوو بوو مەشکەکان دەژەنران، تووشی ئافرەتێك هات دوو منداڵی پێبوو وەك دوو وێز وابوون یاریان دەکرد لەژێر کەلەکەیدا، بەدوو هەنار، (مەبەستی مەمکەکانییەتی) منی تەڵاق دا و ئەوی مارەکرد، دوای ئەو شوم کرد بەپیاوێکی سەخی و ئابڕومەند، سواری ئەسپی دوژمن شکێن دەبوو، ڕمی (خطی)زۆر چاکی بەدەستەوە بوو، ئاژەڵ و وشتری چاکی دامێ، لە هەموو جۆرێك ئاژەڵ بەشی دام، پێی وتم: ئەی (أم زرع) بخۆ و، بەشی کەس و کاریشت بنێرە، ئەگەر هەموو ئەو شتانەی ئەو پێیداوم کۆی بکەمەوە لەلای من ناگاتە تەنها جامۆڵکە بچکۆلەیەکی (أبو زرع).

عائشه دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووی: "من بۆ تۆ وەك أبـو زرع وام بـۆ ام زرع".

**(١٧ پلە و پایەی خەدیجەی دایکی باوەڕداران (رضي الله عنها))**

**٨٩٨ـ عن عَبْدَ اللَّه بْنَ جَعْفَرٍ قالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا (رضي الله عنه) بِالْكُوفَةِ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ". قَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: وأَشَارَ وكِيعٌ إِلَى السماء والْأَرْض. (بخاري/ فضائل الصحابة/٣٠٦٤)**

لـە(عبـدالله) ی کـوڕی (جعفـر)ەوە دەڵـێ: بیسـتوومە لـە علـی (رضي الله عنه) لەکوفـەدا دەیوت: بیستومە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەیفـەرموو: "باشـترین ئـافرەتی سـەرزەمین (مریم ی کچی عمران)ە (واتـە لەسـەردەمی خۆیـدا) باشـترین ئـافرەتی سـەر زەمـین (خدیجـەی کچـی خوەیلـد)ە (ئـەویش هەرلەسـەردەمی خۆیـدا) أبـو کُرَیـب کەئـەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە دەڵێ: (وکیع) لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەکەدا ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان و زەمین، (واتە: ڕاناوی (نسائها) ئەوەدەگەیـەنێ لـەنێوان ئاسمـان و زەمیندا لەو دوانە چاکتر نەبوون).

**٨٩٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَت: اسْتَأْذَنَتْ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ أُخْتُ خَدِيجَةَ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَعَرَفَ اسْتِئْذَانَ خَدِيجَةَ، فَارْتَاحَ لِذَلكَ، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ هَالَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ". فَغِرْتُ. فَقُلْتُ: ومَا تَذْكُرُ مِنْ عَجُوزٍ مِنْ عَجَائِزِ قُرَيْشٍ حَمْرَا و الشِّدْقَيْنِ، هَلَكَتْ فِي الدَّهْرِ فَأَبْدَلَكَ اللَّهُ خَيْرًا مِنْهَا. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٠٧، ٣٦٠٩)**

لـە(عائشـة)وە (رضي الله عنها) دەڵـێ: جارێـك (هالـە)ەی کچـی (خویلـد) خوشـکی خدیجـة مۆڵەتی خواست لە پێغەمبەر (ﷺ) یادی مۆڵـەت خواسـتنەکەی خدیجـەی کەوتـەوە (چونکە دەنگیان بەیەك دەچوو) پێی دڵخۆش بوو فەرمووی: "ئەی خوایە (هالـە)ی کچی خویلد) بێت!" منیش غیرەت گرتمی و وتم: یادی چی دەکەیتەوە لە پیرەژنێـك لە پیرەژنەکانی قورەیش، شەویلە سووری پوك بـەدەرەوە بـووی دان لەدەمانـەماو، کە چەند ساڵێکە مردووە، خوای گەورە باشتر لەوی پێ بەخشیویت.

**٩٠٠ـعَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَسْرَعُكُنَّ لَحَاقًا بِي أَطْوَلُكُنَّ يَدًا". قَالَتْ: فَكُنَّ يَتَطَاوَلْنَ أَيَّتُهُنَّ أَطْوَلُ يَدًا. قَالَتْ: فَكَانَتْ أَطْوَلَنَا يَدًا زَيْنَبُ، لِأَنَّهَا كَانَتْ تَعْمَلُ بِيَدِهَا وتَصَدَّقُ. (بخاري/ الزكاة/ ١٣٥٤)**

(عائشــة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "ئـەوەتان کـە زوتـر بـەدوای مندابێن، ئەوەتانە کە دەستی لەهەمووتان درێژ تـرە". خێزانـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەستیان درێژ دەکرد بـزانن کامیـان دەسـتی درێـژە؟ بـەلآم زەینـەب لـە هـەموویان دەستی درێژتر بوو، چونکە بەدەستی خۆی ئیشی دەکرد و خێری لێدەکرد (ئـەویش یەکەم کەس بوو لە خێزانەکانی دوای خـۆی وەفـاتی کـرد، ئـەمجا زانیـان مەبەسـتی بەدەستی درێژ چیبووە؟).

**٩٠١ــ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) لَا يَدْخُلُ عَلَى أَحَدٍ مِنَ النساء إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِ، إِلَّا أُمِّ سُلَيْمٍ فَإِنَّهُ كَانَ يَدْخُلُ عَلَيْهَا، فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ. فَقَالَ: "إِنِّي أَرْحَمُهَا، قُتِلَ أَخُوهَا مَعِي". (بخاري/ الجهاد/ ٢٦٨٩)**

(انـس)ی کـوڕی (مالـك) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) نەدەچـوو بـۆ مـاڵی هـیچ ئافرەتێك جگەلە خێزانەکانی و، جگە لە (أم سـليم) کەدەچـوو بـۆ دیـدەنی ئـەویش، لەم بارەوە پرسـیاری لێکـرا فـەرمووی: "بەڕاسـتی بـەزەییم پیایـدا دێتـەوە براکـەی لەگەڵ مندا کوژرا". (براکەی (حرام)ی کوڕی (ملحان)بوو)

## (١٨) پلەو پایەی زەید کوڕی حارثة و ئوسامەی کوڕی زەید (ﷺ)

**٩٠٢ــ عَنْ ابن عمر (ﷺ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا كُنَّا نَدْعُو زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ إِلَّا زَيْدَ بْنَ مُحَمَّدٍ، حَتَّى نَزَلَ فِي الْقُرْآنِ: (ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ) (الأحزاب: ٥). (بخاري/ التفسير / ٤٥٠٤)**

له (ابن عمر)ەوە (ﷺ) دەڵێ: ئێمە (زید کوڕی حارثة)مان بە (زید کـوڕی محمـد) بانگ دەکردهەتا قورئان نازڵ بوو: (ادعوهم لآبائهم هو اقسط عند الله) الاحزاب:٥

واتە: "بەناوی باوکیانەوە بانگیان بکەن ئەوە دادگەرترە لای خوا".

**٩٠٣ــ عَنْ ابن عمر (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ وهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ: "إِنْ تَطْعَنُوا فِي إِمَارَتِهِ –يُرِيدُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ– فَقَدْ طَعَنْتُمْ فِي إِمَارَةِ أَبِيهِ مِنْ قَبْلِهِ، وايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَخَلِيقًا لَهَا، وايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَأَحَبَّ النَّاسِ إِلَيَّ، وايْمُ اللَّهِ إِنَّ هَذَا لَهَا لَخَلِيقٌ –يُرِيدُ أُسَامَةَ ابْنَ زَيْدٍ– وايْمُ اللَّهِ إِنْ كَانَ لَأَحَبَّهُمْ إِلَيَّ مِنْ بَعْدِهِ، فَأُوصِيكُمْ بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ صَالِحِيكُمْ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٢٤)**

لـە(أبـن عمـر)ەوە (ﷺ) کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەسـەر مینبـەر فـەرمووی: "ئەگەر تانەبدەن لەسەرکردەیی ئەو –مەبەستی أسامەی کوڕی زید بوو–تانەیشـتان

دا له سه‌ركرده‌یی باوكی به‌رله‌خۆی، سوێندم به‌خوا ئه‌و شایسته‌یه سوێندم به خوا ئه‌و خۆشه‌ویسترین كه‌سه لای من، سوێندم به خوا ئه‌و شایسته‌یه بۆ ئه‌و كاره – واته اسامه‌ی كوڕی زید– سوێندم به‌خوا خۆشه‌ویسترین كه‌سه لای من دوای باوكی، ئامۆژگاریتان ده‌كه‌م به (أسامه) به‌ڕاستی ئه‌و له‌پیاوچاكه‌كانتانه".

## (١٩) پله‌و پایه‌ی بلالی كوڕی ره‌باح(رضي الله عنه)

٩٠٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِبِلَالٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ: "يَا بِلَالُ، حَدِّثْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ عِنْدَكَ فِي الْإِسْلَامِ مَنْفَعَةً، فَإِنِّي سَمِعْتُ اللَّيْلَةَ خَشْفَ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ". قَالَ بِلَالٌ: مَا عَمِلْتُ عَمَلًا فِي الْإِسْلَامِ أَرْجَى عِنْدِي مَنْفَعَةً مِنْ أَنِّي لَا أَتَطَهَّرُ طُهُورًا تَامًّا، فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ ولَا نَهَارٍ، إِلَّا صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي أَنْ أُصَلِّيَ. **(بخاري/ التهجد/ ١٠٩٨)**

له‌(ابي هريرة)وه (رضي الله عنه) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌بلال ی فه‌رمو و له نوێژی به‌یانیدا: "ئه‌ی بلال قسه‌م بۆ بكه به‌گه‌وره‌ترین كرده‌وه‌ت كه سوددار بوبێت له ئیسلامدا، به‌ڕاستی من ئه‌مشه‌و گوێم له خشه‌ی نه‌عله‌كانت بوو له‌به‌رده‌م مندا له‌به‌هه‌شتدا" بلال وتی: هیچ كرده‌وه‌یه‌كم نه‌كردووه له ئیسلامدا زیاتر ئومێدم پێی هه‌بێت، له‌وه‌ی كه هه‌ركات ده‌ستنوێژێكی ته‌واوم گرتبێ، له‌هه‌ركاتێكی شه‌و، یان ڕۆژدا، به‌و ده‌ستنوێژه‌وه نوێژم كردووه ئه‌وه‌نده‌ی خوا بۆی نوسیبم.

## (٢٠) پله‌و پایه‌ی ئه‌نه‌سی كوڕی مالك (رضي الله عنه)

٩٠٥ـ عن أَنَسٌ (رضي الله عنه) قَالَ: جاءتْ بِي أُمِّي أُمُّ أَنَسٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وقَدْ أَزَّرَتْنِي بِنِصْفِ خِمَارِهَا ورَدَّتْنِي بِنِصْفِه، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا أُنَيْسٌ ابْنِي أَتَيْتُكَ بِهِ يَخْدُمُكَ، فَادْعُ اللَّهَ لَهُ. فَقَالَ: "اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ ووَلَدَهُ". قَالَ أَنَسٌ: فَوَاللَّهِ إِنَّ مَالِي لَكَثِيرٌ، وإِنَّ وَلَدِي ووَلَدَ وَلَدِي لَيَتَعَادُّونَ عَلَى نَحْوِ الْمِائَةِ الْيَوْمَ. **(بخاري/ الصوم/ ١٨٨١)**

(أنس) (رضي الله عنه) ده‌ڵێ: دایكم هێنامی بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) نیوه‌ی سه‌رپۆشه‌كه‌ی خۆی كردبوو به‌شه‌رواڵ بۆم و نیوه‌كه‌ی تری كردبوو به كراس بۆم، وتی: یارسول الله ئه‌مه (أُنیس)ی كوڕمه بۆم هێناوی خزمه‌تت بكات، بۆی بپاڕێره‌وه له‌خوا فه‌رمووی: "ئه‌ی خوایه ماڵ و منداڵی زۆركه‌ی" أنس: ده‌ڵێ: والله ماڵه‌كه‌م زۆره، منداڵ و نه‌وه‌كانم ئه‌مڕۆ له‌سه‌د زیاترن.

٩٠٦- عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَمِعَتْ أُمِّي أُمُّ سُلَيْمٍ صَوْتَهُ، فَقَالَتْ: بِأَبِي وأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُنَيْسٌ. فَدَعَا لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ثَلَاثَ دَعَوَاتٍ قَدْ رَأَيْتُ مِنْهَا اثْنَتَيْنِ فِي الدُّنْيَا، وأَنَا أَرْجُو الثَّالِثَةَ فِي الْآخِرَةِ. **(بخاري/ الصوم/ ١٨٨١)**

له(انس)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی (بەلاماندا) دایکم دەنگی بیست و وتی: دایك و باوکم فیدات ئەی پێغەمبەر دوعا بۆ (أَنَيسْ) بکە پێغەمبەر (ﷺ) سێ دوعای بۆ کردم، دوانیانم لەدنیادا بەچاوی خۆم دیم سێهەمیشیان تکام وایە لە قیامەتدا ببینم.

٩٠٧- عن ثَابِت، عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: أَتَى عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وأَنَا أَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، قَالَ: فَسَلَّمَ عَلَيْنَا، فَبَعَثَنِي إِلَى حَاجَةٍ فَأَبْطَأْتُ عَلَى أُمِّي، فَلَمَّا جِئْتُ قَالَتْ: مَا حَبَسَكَ؟ قُلْتُ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِحَاجَةٍ، قَالَتْ: مَا حَاجَتُهُ؟ قُلْتُ: إِنَّهَا سِرٌّ. قَالَتْ: لَا تُحَدِّثَنَّ بِسِرِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَحَدًا. قَالَ أَنَسٌ: واللَّهِ لَوْ حَدَّثْتُ بِهِ أَحَدًا لَحَدَّثْتُكَ يَا ثَابِتُ. **(بخاري/ الاستئذان/ ٥٩٣١)**

له(ثابت)ەوە، له(أنس)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕی بەلامدا لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد، دەڵێ: سەلامی لێکردین و، منی نارد بۆ پێویستییەك درەنگ چوومەوە بۆلای دایکم، پێی وتم: بۆچ دواکەوتی؟ وتم: پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆ پێویستییەك، وتی: پێویستییەکەی چی بو؟ وتم: شتێکی نهێنییە، وتی: نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هیچ کەس باس نەکەیت، أنس وتی: ئەگەر قسەم بکردایە قسەم بۆتۆ دەکرد ئەی (ثابت).

## (٢١) پلەوپایەی (جعفر)ی کوڕی (أبي طالب)و (اسماء)ی کچی عمیس و دانیشتوانی کەشتییەکەیان (ﷺ)

٩٠٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: بَلَغَنَا مَخْرَجُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) ونَحْنُ بِالْيَمَنِ، فَخَرَجْنَا مُهَاجِرِينَ إِلَيْهِ اناءأَخَوَانِ لِي أَنَا أَصْغَرُهُمَا، أَحَدُهُمَا أَبُو بُرْدَةَ والْآخَرُ أَبُو رُهْمٍ، إِمَّا قَالَ: بِضْعًا، وإِمَّا قَالَ: ثَلَاثَةً وخَمْسِينَ، أَوِ اثْنَيْنِ وخَمْسِينَ رَجُلًا مِنْ قَوْمِي، قَالَ: فَرَكِبْنَا سَفِينَةً، فَأَلْقَتْنَا سَفِينَتُنَا إِلَى النَّجَاشِيِّ بِالْحَبَشَةِ، فَوَافَقْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (ﷺ) وأَصْحَابَهُ عِنْدَهُ، فَقَالَ جَعْفَرٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَنَا هَاهُنَا وأَمَرَنَا بِالْإِقَامَةِ، فَأَقِيمُوا مَعَنَا. فَأَقَمْنَا مَعَهُ، حَتَّى قَدِمْنَا جَمِيعًا. قَالَ: فَوَافَقْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ

افْتَتَحَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا أَوْ قَالَ: أَعْطَانَا مِنْهَا، وَمَا قَسَمَ لِأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنْهَا شَيْئًا إِلَّا لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ، إِلَّا لِأَصْحَابِ سَفِينَتِنَا مَعَ جَعْفَرٍ وَأَصْحَابِهِ، قَسَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ. قَالَ: فَكَانَ نَاسٌ مِنَ النَّاسِ يَقُولُونَ لَنَا -يَعْنِي لِأَهْلِ السَّفِينَةِ- نَحْنُ سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، قَالَ: فَدَخَلَتْ اسماء بِنْتُ عُمَيْسٍ -وَهِيَ مِمَّنْ قَدِمَ مَعَنَا- عَلَى حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ) زَائِرَةً، وَقَدْ كَانَتْ هَاجَرَتْ إِلَى النَّجَاشِيِّ فِيمَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِ، فَدَخَلَ عُمَرُ (رضي الله عنه) عَلَى حَفْصَةَ واسماء عِنْدَهَا. فَقَالَ عُمَرُ حِينَ رَأَى اسماء: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: اسماء بِنْتُ عُمَيْسٍ. قَالَ عُمَرُ (رضي الله عنه): الْحَبَشِيَّةُ هَذِهِ؟ الْبَحْرِيَّةُ هَذِهِ؟ فَقَالَتْ اسماء: نَعَمْ. فَقَالَ عُمَرُ: سَبَقْنَاكُمْ بِالْهِجْرَةِ، فَنَحْنُ أَحَقُّ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْكُمْ. فَغَضِبَتْ، وَقَالَتْ كَلِمَةً: كَذَبْتَ يَا عُمَرُ، كَلَّا وَاللَّهِ كُنْتُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يُطْعِمُ جَائِعَكُمْ، وَيَعِظُ جَاهِلَكُمْ، وَكُنَّا فِي دَارٍ -أَوْ فِي أَرْضٍ- الْبُعَدَا و البغضاء، فِي الْحَبَشَةِ، وَذَلِكَ فِي اللَّهِ وَفِي رَسُولِهِ (ﷺ)، وَايْمُ اللَّهِ لَا أَطْعَمُ طَعَامًا وَلَا أَشْرَبُ شَرَابًا حَتَّى أَذْكُرَ مَا قُلْتَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَنَحْنُ كُنَّا نُؤْذَى وَنُخَافُ، وَسَأَذْكُرُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَأَسْأَلُهُ، و وَاللَّهِ لَا أَكْذِبُ وَلَا أَزِيغُ، وَلَا أَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ. قَالَ: فَلَمَّا جاء النَّبِيُّ (ﷺ) قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ إِنَّ عُمَرَ قَالَ كَذَا وَكَذَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "لَيْسَ بِأَحَقَّ بِي مِنْكُمْ، وَلَهُ وَلِأَصْحَابِهِ هِجْرَةٌ وَاحِدَةٌ، وَلَكُمْ أَنْتُمْ أَهْلَ السَّفِينَةِ هِجْرَتَانِ". قَالَتْ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَأَصْحَابَ السَّفِينَةِ يَأْتُونَنِي أَرْسَالًا، يَسْأَلُونَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، مَا مِنَ الدُّنْيَا شيء هُمْ بِهِ أَفْرَحُ وَلَا أَعْظَمُ فِي أَنْفُسِهِمْ مِمَّا قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: فَقَالَتْ اسماء: فَلَقَدْ رَأَيْتُ أَبَا مُوسَى وَإِنَّهُ لَيَسْتَعِيدُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنِّي. **(بخاري/ المغازي/ ٣٩٩٠)**

له(أبو موسى) (رضي الله عنه) دهڵێ: ئێمه كه سەرهەڵدانی پێغەمبەرمان (ﷺ) پێگەیشت لەوكاتەدا لەیەمەن بووین دەرچووین خۆم و دوو برام بووین من بچوكەكەیان بووم، یەكێكیان (أبو بردة)و ئەوی دی (أبورهم) بوو، وتی: لەگەڵ چەند پیاوێك، یان پەنجاو سێ، یان پەنجاو دوو پیاوی هۆزەكەمان، سواری كەشتیەك بووین كەشتییەكە لەحەبەشە دایبەزاندین لای پاشای نەجاشی، لەوێ توشی (جعفر)ی كوڕی (ابوطالب) ویارەكانی هاتین، جعفر وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی ناردووە و فەرمانیشی پێداوین لێرە بمێنین، ئێوەش لەگەڵ ئێمەبن، لەگەڵ ئەوان ماینەوە هەتا پێكەوە هاتین، بە كۆمەڵ گەیشتین بە پێغەمبەر (ﷺ) لەكاتی ئازاد كردنی (خیبر)دا لەوماڵ و سامانە بەشداری كردین، یان وتی: پێی بەخشین، بەشی كەسی تریشی

نەدا لەوانەی لەکاتی ئازاد کردنیدا لەوێ نەبوون، جگە لە دانیشتوانی ئەو کەشتیەی ئێمە و، (جعفر) و یارەکانی، لەگەڵ ئەواندا بەشی داین. دەڵێ: هەندێ کەس پێیان دەوتین —واتە: بە ئەهلی کەشتییەکە— ئێمە بەکۆچ پێشتان کەوتووین، (اسماء)ی کچی (عمیس) کە یەکێ بوو لەوانەی لەگەڵ ئێمە هاتبوون چوو بۆ دیدەنی (حفصە)ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)، کە ئەویش کۆچی کردبوو بۆ لای نەجاشی لەناو ئەوانەدا کە کۆچیان کردبوو، عومەر (ﷺ) هات بۆلای حفصة، اسماء لای دانیشتبوو، عمر کاتێ (اسماء)ی بینی وتی: ئەمە کێیە؟ وتی: (اسماء)کچی (عمیس)ە، عمر (ﷺ) وتی: ئەمە حەبەشییەکەیە؟ ئەمە بەحرییەکەیە؟ اسماء وتی: بەڵێ، عومەر وتی: ئێمە لێتان پێشکەوتووین بە کۆچ، ئێمە لەپێشترین بە پێغەمبەری خوا لە ئێوە، اسماء ڕقی هەستا و وشەیەك لەدەمی دەرچو: درۆ دەکەیت ئەی عومەر نە (والله) ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر بوون (ﷺ) برسیتانی تێر دەکرد، نەزانتانی فێردەکرد، ئێمە لە خاکی دورخراوەکان و ڕق لێگیراوەکاندا بووین، لەحەبەشە، ئەمەیش لە پێناوی خوا و پێغەمبەری خوا (ﷺ)،سوێند بەخوا نان ناخۆم و ئاو ناخۆمەوە، هەتا ئەوەی تۆ وتت باسی نەکەم بۆ پێغەمبەر، ئێمە ئازاردەدراین و دەترسێنراین، ئەمە باس دەکەم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێدەکەم، درۆ ناکەم و لە ڕاستیی لانادەم و زیاتر لەمە نالێم. دەڵێ: کاتی پێغەمبەر هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا عومەر ئاوا و ئاوای وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : "ئەو لەپێشترنیە بەمن لە ئێوە، ئەوو یارەکانی یەك کۆچیان هەیە، ئێوە خەڵکی کەشتییەکە دوو کۆچتان هەیە". اسماء دەڵێ: دیم أبو موسی و یارانی ئەو کەشتییە پۆل پۆل دەهاتن بۆلام و پرسیاری ئەم فەرموودەیان لەمن دەکرد، لەدنیادا هیچ شتێ نەبوو دڵخۆشکەر تر و گەورەتر بێت لای ئەوان لەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووبوون، (أبو بُردة) دەڵێ: اسماء دەڵێ: من (أبو موسی)م بینی داوای دووبارە کردنەوەی ئەم فەرموودەی لەمن دەکرد.

## (٢٢) پلەو پایەی عبدالله ی کوڕی عباس (ﷺ)

**٩٠٩ـ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَتَى الْخَلَا و، فَوَضَعْتُ لَهُ وضُو وا، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ: "مَنْ وضَعَ هَذَا". —فِي رِوَايَةِ زُهَيْرٍ— قَالُوا— وفِي رِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ: قُلْتُ— ابْنُ عَبَّاسٍ. قَالَ: "اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدين". (بخاري/ الوضوء/ ١٤٣)**

(أبـن عبـاس) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) چـووە سـەر پێشـاو، منـیش ئـاوی دەسنوێژم بۆ ئامادەکرد، کاتێ دەرچـوو فـەرمووی: "کـێ ئـەم ئـاوەی دانـاوە؟" — لەریوایەتی زهیردا— وتیان، —لەڕیوایەتی بکردا— وتم: أبن عبـاس. فـەرمووی: "ئـەی خوایە شارەزای بکە لەدیندا".

## (٢٣) پلەو پایەی عبداللەی کوڕی عمر (ﷺ)

**٩١٠ـ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا أَقُصُّهَا عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ)، قَالَ: وكُنْتُ غُلَامًا شَابًّا عَزَبًا، وكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وإِذَا لَهَا قَرْنَانِ كَقَرْنَيِ الْبِئْرِ، وإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، قَالَ: فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ فَقَالَ لِي: لَمْ تُرَعْ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ". قَالَ سَالِمٌ: فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بَعْدَ ذَلِكَ لَا يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلَّا قَلِيلًا. (بخاري/ التهجد/ ١٠٧٠)**

عبداللە ی کوڕی عمر (ﷺ) دەڵێ: هـەرپیاوێ لـە ژیـانی پێغەمبـەردا (ﷺ) خـەوی دەبینی دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ). منیش خۆزگـەم دەخواسـت خـەوێك ببیـنم وبیگێڕمـەوە بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، دەڵـێ: مـن کـوڕێکی گـەنجی بـێخێزان بـووم، لـە مزگەوتدا دەخەوتم لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)، لەخەودا دیم: دوو فریشتە گرتمیـان و بردمیان بۆ دۆزەخ، کە دیم هەر وەکو بیر هەڵچنرابوو، دوو شاخیشـی هـەبوو وەك شاخی بیر، کەسانێکی تیابوو دەمناسینەوە، منیش دەموت: پەنا دەگـرم بـەخوا لـە ئاگر، پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگر، پەنا دەگرم بەخوا لە ئاگر، دەڵێ: فریشتەیەکی تـر گەیشت بەم دوو فریشتە بەمنی وت: مەترسە زیانت پێناگات، ئەم خەوەم گێڕایـەوە بۆ حفصە، ئەویش گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "عبـداللە پیـاوی چـاکە گـەر شـەونوێژی بکردایـە". سـالم دەڵـێ: دوای ئـەوە عبـداللە بەشـەو نەدەخەوت کەمێکی نەبێت. (مەبەست لە شاخی بیر ئـەو دوو کۆڵەکەیە کـە شیشـی چەرخەکەیان لەسەر دادەنرێ بۆ ئاو هەڵکێشان).

٩١١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ لِابْنِ الزُّبَيْرِ: أَتَذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) انا وأَنْتَ وابْنُ عَبَّاسٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَحَمَلَنَا وتَرَكَكَ. **(بخاري/ الجهاد/ ٢٩١٦)**

له(عبدالله)ی کوڕی (ابی ملیکه)وه دەڵێ: (عبدالله) ی کوڕی (جعفر) به (أبن الزبیر)ی وت: ئایا بیرت دێ که چووین بەپیریی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، من و تۆ و أبن عباس؟ وتی: بەڵێ ئێمەی هەڵگرت و تۆی بەجێهێشت.

## ( ٢٤ ) پلەو پایەی عبداللەی کوڕی مسعود ( رضي الله عنه )

٩١٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) قَالَ: قَدِمْتُ انا وأَخِي مِنَ الْيَمَنِ، فَكُنَّا حِينًا ومَا نُرَى ابْنَ مَسْعُودٍ وأُمَّهُ إِلَّا مِنْ أَهْلِ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، مِنْ كَثْرَةِ دُخُولِهِمْ ولُزُومِهِمْ لَهُ **(بخاری/ فضائل الصحابة/٣٥٥٢)**

له(أبی موسی)وه (رضي الله عنه) دەڵێ: من و براکەم لەیەمەنەوە هاتین، کە هاتین (أبن مسعود)و دایکیمان وەها دەبینی کە لەکەس وکار (أهل البیت)ی پێغەمبەرن (ﷺ) لەبەر ئەوەی زۆر دەچوونە ماڵی و پەیوەست بوون پێیەوە.

٩١٣ـ عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ قَالَ: كُنَّا فِي دَارِ أَبِي مُوسَى مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ عَبْدِ اللَّهِ، وهُمْ يَنْظُرُونَ فِي مُصْحَفٍ، فَقَامَ عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: مَا أَعْلَمُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) تَرَكَ بَعْدَهُ أَعْلَمَ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ هَذَا الْقَائِمِ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَمَا لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ لَقَدْ كَانَ يَشْهَدُ إِذَا غِبْنَا، ويُؤْذَنُ لَهُ إِذَا حُجِبْنَا. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٥٢)**

له(أبی الاحوص)ەوە دەڵێ: ئێمە لەماڵ (أبوموسی)دا بووین لەگەڵ کۆمەڵێك لەیارانی عبدالله، کە تەماشای قورئانیان دەکرد، عبدالله هەستا، أبو مسعود وتی: وانازانم پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆی کەسێکی جێهێشتبێ زاناتر بێ لەوەی کەخوا نازڵی کردووە لەم وەستاوە، (أبو موسی) وتی: تۆ ئەوە دەڵێی ئاگاداری ئەوەیش بە، ئەو حازر دەبوو کاتێ ئێمە لەوێ نەدەبووین، ڕێگایشی پێدەدرا لەکاتێکدا ئێمە ڕێگامان لێ بگیرایە.

٩١٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ (وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) **(آلعمران: ١٦١)**. ثُمَّ قَالَ: عَلَى قراءة مَنْ تَأْمُرُونِي أَنْ أَقْرَأَ؟ فَلَقَدْ قَرَأْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِضْعًا وسَبْعِينَ سُورَةً، ولَقَدْ عَلِمَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنِّي أَعْلَمُهُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ (عز وجل)، ولَوْ أَعْلَمُ (أَنَّ) أَحَدًا أَعْلَمُ مِنِّي لَرَحَلْتُ إِلَيْهِ. قَالَ شَقِيقٌ: فَجَلَسْتُ فِي

**حلَقِ أصْحَابِ مُحَمَّدٍ (ﷺ)، فَمَا سَمِعْتُ أحَدًا يَرُدُّ ذَلِكَ عَلَيْهِ ولَا يَعِيبُهُ. (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧١٤)**

له(عبدالله)ی کوڕی (مسعود)ەوه (ﷺ) دەڵێ: (وَمَن يغلُل يأت بما غلّ يوم القيامة) (العمران: ١٦١) لەپاشدا فەرمووی: لەسەر (قراءة)ی کێ فەرمانم پێدەکەن بخوێنم بەڕاستی من حەفتا و ئەوەندە سورەتم لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) خوێندووە، یارانی پێغەمبەر (ﷺ) دەزانن من لەهەموویان زاناترم بەپەیامی خوای گەورە، ئەگەر بمزانیایا کەسێکیتر هەیە زاناتر لەمن کۆچم دەکرد بۆلای، (شقیق) دەڵێ: دانیشتووم لە ئەڵقەکانی یارانی موحەممەد (ﷺ) نەمبیستووە کەسێك بەرپەرچی ئەم قسەی بداتەوە، یان ناتەواوی تیا بدۆزێتەوە.

**٩١٥ـ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو (ﷺ)، فَذَكَرْنَا حَدِيثًا عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ فَقَالَ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ لَا أَزَالُ أُحِبُّهُ بَعْدَ شيء سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) يَقُولُهُ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "اقْرَءوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ، مِنِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ -فَبَدَأَ بِهِ- ومِنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، ومِنْ سَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، ومِنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٤٨)**

له(مَسّروق)ەوە دەڵێ: لای (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)بووین باسی فەرموودەیەکمان کرد لە (أبن مسعود)ەوە، فەرمووی: "ئەو پیاوە من بەردەوام خۆشم ویستووە دوای ئەوەی شتێکم لە پێغەمبەر (ﷺ) بیست کە دەیفەرموو: "قورئان بخوێنن لەدەمی چوار کەسەوە: لە کوڕەکەی (أم عبد) -کردی بەیەکەم کەس- لە (أبَيّ)کوڕی (کعب)، لە (سالم)ی کارگوزاری (أبو حذیفة) لە (معاذ)ی کوڕی (جبل).

## (٢٥) پلە وپایەی عبدالله ی کوڕی عمروی کوڕی حرام (ﷺ)

**٩١٦ـ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه (ﷺ) قَالَ: أُصِيبَ أَبِي يَوْمَ أُحُدٍ، فَجَعَلْتُ أَكْشِفُ الثَّوْبَ عَنْ وجْهِهِ وأَبْكِي، وجَعَلُوا يَنْهَوْنَنِي، ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) لَا يَنْهَانِي، قَالَ: وجَعَلَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ عَمْرٍو تَبْكِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "تَبْكِيهِ أَوْ لَا تَبْكِيهِ، مَا زَالَتِ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رَفَعْتُمُوهُ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٣١)**

(جابر)ی کوڕی (عبدالله) (ﷺ) دەڵێ: باوکم لە ڕۆژی (أُحد)دا پێکرا، جلەکەم لەسەر ڕوومەتی لادەبرد و دەگریام، نەهیان لێدەکردم لە گریان، پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێ نەکردم، دەڵێ: فاطمة ی کچی عمرو بۆی دەگریا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

"بۆی دەگریت، یان بۆی ناگریت، لەوکاتەوە فریشتەکان سێبەریان بۆ دەکرد، بەباڵەکانیان هەتا هەڵتان گرت".

## پلەو پایەی عبدالله کوری سلام

**٩١٧-عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ لِحَيٍّ يَمْشِي: "إِنَّهُ فِي الْجَنَّةِ" إِلَّا لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٠١)**

لە(عامر)ی کوڕی (سعد)ەوە، دەڵێ: لەباوکمم بیستووە دەیوت: نەمبیستووە پێغەمبەر (ﷺ) بەهیچ، زیندوویەك بڵێ: "بەڕاستی لەبەهەشتدایە" جگە لەعبدالله ی کوڕی سلام.

**٩١٨ـ عَنْ خَرَشَةَ بْنِ الْحُرِّ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا فِي حَلَقَةٍ فِي مَسْجِدِ الْمَدِينَةِ، قَالَ: وَفِيهَا شَيْخٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ وَهُوَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلَامٍ، قَالَ: فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُمْ حَدِيثًا حَسَنًا، قَالَ: فَلَمَّا قَامَ قَالَ الْقَوْمُ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَأَتْبَعَنَّهُ فَلَأَعْلَمَنَّ مَكَانَ بَيْتِهِ، قَالَ: فَتَبِعْتُهُ، فَانْطَلَقَ حَتَّى كَادَ أَنْ يَخْرُجَ مِنَ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ دَخَلَ مَنْزِلَهُ. قَالَ: فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَأَذِنَ لِي. فَقَالَ: مَا حَاجَتُكَ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: سَمِعْتُ الْقَوْمَ يَقُولُونَ لَكَ لَمَّا قُمْتَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا، فَأَعْجَبَنِي أَنْ أَكُونَ مَعَكَ. قَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ، وَسَأُحَدِّثُكَ مِمَّ قَالُوا ذَاكَ، إِنِّي بَيْنَمَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أَتَانِي رَجُلٌ فَقَالَ لِي: قُمْ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: فَإِذَا أَنَا بِجَوَادَّ عَنْ شِمَالِي، (قَالَ): فَأَخَذْتُ لِآخُذَ فِيهَا، فَقَالَ لِي: لَا تَأْخُذْ فِيهَا فَإِنَّهَا طُرُقُ أَصْحَابِ الشِّمَالِ، قَالَ: فَإِذَا جَوَادُّ مَنْهَجٌ عَلَى يَمِينِي، فَقَالَ لِي: خُذْ هَاهُنَا. فَأَتَى بِي جَبَلًا، فَقَالَ لِي: اصْعَدْ. قَالَ: فَجَعَلْتُ إِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَصْعَدَ خَرَرْتُ عَلَى اسْتِي. قَالَ: حَتَّى فَعَلْتُ ذَلِكَ مِرَارًا، قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى أَتَى بِي عَمُودًا رَأْسُهُ فِي السماء وَأَسْفَلُهُ فِي الْأَرْضِ، فِي أَعْلَاهُ حَلْقَةٌ، فَقَالَ لِيَ: اصْعَدْ فَوْقَ هَذَا، قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ أَصْعَدُ هَذَا وَرَأْسُهُ فِي السماء؟ قَالَ: فَأَخَذَ بِيَدِي فَزَجَلَ بِي، قَالَ: فَإِذَا أَنَا مُتَعَلِّقٌ بِالْحَلْقَةِ، قَالَ: ثُمَّ ضَرَبَ الْعَمُودَ فَخَرَّ، قَالَ: وَبَقِيتُ مُتَعَلِّقًا بِالْحَلْقَةِ حَتَّى أَصْبَحْتُ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَصَصْتُهَا عَلَيْهِ، فَقَالَ: "أَمَّا الطُّرُقُ الَّتِي رَأَيْتَ عَنْ يَسَارِكَ فَهِيَ طُرُقُ أَصْحَابِ الشِّمَالِ". قَالَ: "وَأَمَّا الطُّرُقُ الَّتِي رَأَيْتَ عَنْ يَمِينِكَ فَهِيَ طُرُقُ أَصْحَابِ الْيَمِينِ، وَأَمَّا الْجَبَلُ فَهُوَ مَنْزِلُ الشُّهَدَا و وَلَنْ تَنَالَهُ، وَأَمَّا الْعَمُودُ فَهُوَ عَمُودُ الْإِسْلَامِ، وَأَمَّا الْعُرْوَةُ فَهِيَ عُرْوَةُ الْإِسْلَامِ، وَلَنْ تَزَالَ مُتَمَسِّكًا بِهَا حَتَّى تَمُوتَ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٠٢)**

لە(خَرَشة)ی کوڕی (حُرّ)ەوە دەڵێ: دانیشتبووم لە ئەڵقەی مزگەوتی مەدینەدا، پیرێکی شێوە شیرینی تیدابوو، کە (عبداللە)ی کوڕی (سلام)بوو، قسەی جوانی بۆ دەکردن، کاتێ هەستا خەڵکەکە وتیان: هەرکەس حەزدەکات تەماشای ئەهلی بەهەشت بکات با تەماشای ئەمە بکات. وتم: سوێند بەخوا دەبێ دوای بکەوم تا شوێنی ماڵەکەی بزانم، دوای کەوتم ئەویش ڕۆیی تا زۆری نەمابوو لەمەدینە دەرچێت، ئەمجا چووە ماڵەکەی خۆی، داوای ئیزنم کرد، ڕێگای دام و وتی: پێویستیت چییە ئەی برازام؟ وتم: لەوخەڵکەم بیست کاتێ هەستایت پێیان دەوتی: هەرکەس پێی خۆشە تەماشای ئەهلی بەهەشت بکات باتەماشای ئەمە بکات، بۆیە پێمخۆشبوو لەگەڵت بم، وتی: خوا زاناترە بە خەڵکی بەهەشت، قسەشت بۆ دەکەم ئەو خەڵکە بۆچ وایان وتووە: من لە کاتێکدا خەوتبووم پیاوێك هات و پێی وتم: هەستە، دەستی گرتم و لەگەڵی چووم، تاکاتێك دیم چەند ڕێگەیەك هەیە لەلای چەپم، ویستم پیایاندا بڕۆم، وتی: لەوێوە مەڕۆ ئەوە ڕێگای هاوەڵانی چەپن، لەلای ڕاستیشمەوە چەند ڕێگایەکی ڕاست و ڕەوان هەبوو، وتی: ئێرە بگرە، هێنامی بەرەو چیایەك وتی: سەرکەوە، هەرچەند دەمویست سەرکەوم دەکەوتم بەپشتا هەتا چەندجار ئەمەم کرد پاشان بردمی هەتا گەیاندمیە لای کۆڵەکەیەك سەری لەئاسمان بوو بنی لە زەوی، لەلای سەرەوە ئەڵقەیەکی پێوەبوو وتی: سەرکەوە بەم کۆڵەکەدا وتم: چۆن سەرکەوم کەسەری لەئاسمانە؟ دەڵێ: بەرزی کردمەوە و هەڵیدام، وەختێکم زانی دەستم گرتووە بە ئەڵقەکەوە، ئەمجا دای لەکۆڵەکەکە و خستی بەزەویدا منیش بە ئەڵقەکەوە هەڵواسرابووم هەتا ڕۆژم کردەوە، ئەمجا هاتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) خەوەکەم بۆ گێڕایەوە فەرمووی: "ئەو جادانەی لای چەپت ئەوە ڕێگای یارانی چەپن، ئەوانەیشی لای ڕاستت بوون ئەوە ڕێگای یارانی ڕاستن، چیاکەیش پلەو پایەی شەهیدەکانە و تۆ نایگەیتێ، کۆڵەکەکەیش کۆڵەکەی دینە، قوڵفەکەی سەرەوەیش ئەوە قوڵفی ئیسلامەو، تۆ بەردەوام دەستت پێوەی دەبێت تا دەمریت".

## ( ٢٦ ) پلەو پایەی سعد ی کوڕی معاذ (رضي الله عنه)

**٩١٩ـ عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وجَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ: "اهْتَزَّ لَهَا عَرْشُ الرَّحْمَنِ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٢)**

لە(جابر)ی کوڕی (عبدالله) وە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتێکدا تەرمەکەی سعدی کوڕی معاذ لەبەردەستیاندا بوو فەرمووی: "عەرشی خوا بۆ ئەم تەرمە هاتە لەرزە".

٩٢٠ـ عن الْبراء (ﷺ) قالَ: أُهْديَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) حُلَّةُ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ أَصْحَابُهُ يَلْمِسُونَهَا ويَعْجَبُونَ مِنْ لِينِهَا، فَقَالَ: "أَتَعْجَبُونَ مِنْ لِينِ هَذِهِ؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْهَا وأَلْيَنُ". **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٢)**

لە(براء)ەوە (ﷺ) دەڵێ: قاتێ جلی ئاوریشم بەدیاری هێنرا بۆ پێغەمبەرو (ﷺ)، یارەکـانی دەسـتیان لێ دەدا و سەرسـام بـوون لەنـەرم و شـلیەکەی، فـەرمووی: "سەرسـام دەبـن لەنـەرمی ئـەم جلـە، دەسـتە سـڕەکانی (سـعد)ی کـوڕی (معـاذ) لەبەهەشتدا لەمە چاکتر و نەرمترە".

## (٢٧) پلە و پایەی (أبي طلحة)ی (الانصاری) و(أم سلیم)ی خێزانی (ﷺ)

٩٢١ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: مَاتَ ابْنٌ لِأَبِي طَلْحَةَ مِنْ أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ لِأَهْلِهَا: لَا تُحَدِّثُوا أَبَا طَلْحَةَ بِابْنِهِ حَتَّى أَكُونَ أَنَا أُحَدِّثُهُ. قَالَ: فَجاء، فَقَرَّبَتْ إِلَيْهِ عَشَا و فَأَكَلَ وشَرِبَ، فَقَالَ: ثُمَّ تَصَنَّعَتْ لَهُ أَحْسَنَ مَا كَانَ تَصَنَّعُ قَبْلَ ذَلِكَ، فَوَقَعَ بِهَا، فَلَمَّا رَأَتْ أَنَّهُ قَدْ شَبِعَ وأَصَابَ مِنْهَا قَالَتْ: يَا أَبَا طَلْحَةَ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ قَوْمًا أَعَارُوا عَارِيَتَهُمْ أَهْلَ بَيْتٍ، فَطَلَبُوا عَارِيَتَهُمْ، أَلَهُمْ أَنْ يَمْنَعُوهُمْ؟ قَالَ: لَا. قَالَتْ: فَاحْتَسِبِ ابْنَكَ. قَالَ: فَغَضِبَ، وقَالَ: تَرَكْتِنِي حَتَّى تَلَطَّخْتُ ثُمَّ أَخْبَرْتِنِي بِابْنِي. فَانْطَلَقَ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأَخْبَرَهُ بِمَا كَانَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بَارَكَ اللَّهُ لَكُمَا فِي غَابِرِ لَيْلَتِكُمَا". قَالَ: فَحَمَلَتْ، قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ وهِيَ مَعَهُ، وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَتَى الْمَدِينَةَ مِنْ سَفَرٍ لَا يَطْرُقُهَا طُرُوقًا، فَدَنَوْا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَضَرَبَهَا الْمَخَاضُ، فَاحْتُبِسَ عَلَيْهَا أَبُو طَلْحَةَ، وانْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: يَقُولُ أَبُو طَلْحَةَ: إِنَّكَ لَتَعْلَمُ يَا رَبِّ إِنَّهُ يُعْجِبُنِي أَنْ أَخْرُجَ، مَعَ رَسُولِكَ إِذَا خَرَجَ، وأَدْخُلَ مَعَهُ إِذَا دَخَلَ، وقَدِ احْتَبَسْتُ بِمَا تَرَى. قَالَ: تَقُولُ أُمُّ سُلَيْمٍ: يَا أَبَا طَلْحَةَ، مَا أَجِدُ الَّذِي كُنْتُ أَجِدُ، انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْنَا. **(قَالَ):** وضَرَبَهَا الْمَخَاضُ حِينَ قَدِمَا، فَوَلَدَتْ غُلَامًا، فَقَالَتْ لِي أُمِّي: يَا أَنَسُ لَا يُرْضِعُهُ أَحَدٌ حَتَّى تَغْدُوَ بِهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). فَلَمَّا أَصْبَحَ احْتَمَلْتُهُ، فَانْطَلَقْتُ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: فَصَادَفْتُهُ ومَعَهُ مِيسَمٌ، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: "لَعَلَّ أُمَّ سُلَيْمٍ ولَدَتْ". قُلْتُ: نَعَمْ. فَوَضَعَ الْمِيسَمَ، **(قَالَ):** وجِئْتُ بِهِ فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ، ودَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِعَجْوَةٍ

مِنْ عَجْوَةِ الْمَدِينَةِ، فَلَاكَهَا فِي فِيهِ حَتَّى ذَابَتْ، ثُمَّ قَذَفَهَا فِي فِي الصَّبِيِّ، فَجَعَلَ الصَّبِيُّ يَتَلَمَّظُهَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "انْظُرُوا إِلَى حُبِّ الْأَنْصَارِ التَّمْرَ". قَالَ: فَمَسَحَ وجْهَهُ وسَمَّاهُ: عَبْدَ اللَّهِ. (بخاري/ اللباس/ ٥٤٨٦)

له(أنس)ەوە (ﷺ) دەڵێ: کوڕێکی (أبـو طلحـة)لـە (أم سـليم) مـرد، (أم سـليم) بەکەس و کارەکەی وت: کەس باسی ئەم کوڕەنەکات بۆ (أبو طلحة)تـا خـۆم قسـەی بۆ دەکەم، (ابو طلحة) هاتەوە و شێوی بۆ داناو، نان و ئاوی خوارد و، لەپاشدا، (أم سليم) خۆی بۆ ڕازاندەوە جوانتر لەهـەموو کاتـەکانی پێشـووتری ، هـەتا سـەرجێیی لەگەڵ کرد، کاتێ زانی کەتێری خواردووە و کـاری خـۆی کـردووە، وتـی: ئـەی (أبـو طلحة) ئایا ڕات چۆنە گەر کەسێك ئەمانەتێك بدات بەکەسێکی تـر، دوایـی داوای ئـەو ئەمانەتەی لێبکاتەوە بۆی هەیە نەیداتەوە؟ وتی: نەخێر، وتی: تۆیش داوای ئەجر و پاداشتی کوڕەکەت لە خوا بکە. (أبوطلحة) ڕقی هەسـتا و وتـی: وازت لێهینـام هـەتا گیانی خۆم پیس کرد، دوای ئەوە هەواڵی کوڕەکەمم دەدەیتێ. ڕۆیشت هـەتا چـووە لای پێغەمبـەر (ﷺ)ڕووداوەکـەی بـۆ گێڕایـەوە ، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: "خـوا شەوی ڕابوردوتان لێ پیرۆز بکات".

(أم سليم) سکی پڕبوو، پێغەمبەری خوا چوو بۆ سەفەرێك ئەویشـی لەگـەڵ بـوو، پێغەمبەری خوا ئەگەر لەسەفەر بهاتایەتەوە بۆ مەدینـە شـەو نەدەچـووە نـاو شـار، نزیکی مەدینە بوونەوە، (ام سليم) ژانگرتی، (أبو طلحة) بەلایەوە مایەوە، پێغەمبـەر (ﷺ) کەوتـەڕێ، (أبوطلحـة)دەیـوت: ئـەی خوایـە خـۆت دەزانـی مـن زۆرم پێخۆشـە لەگەڵ پێغەمبەرەکەت دەرچم کـاتی کـە دەرچـوو، لەگـەڵی بچمەوە نـاو شـار کاتـێ چووەوە، وامـن گـیرم خـواردووە بـەم حاڵـەوە کـە دەبینـی، (أم سـليم) وتـی: ئـەی (أبوطلحة) ئەو ژانە سـکەی هـەمبوو نـەما، بـڕۆ، دەڵـێ: ڕۆیشـتین، کـاتی گەیشـتینە مەدینە ژانەسکەکەی بۆهاتەوە و کوڕێکی بـوو، دایکم پێـی وتم: ئـەی (أنـس) کـەس گۆشی ناکات هەتا نەیبەیتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، کـە ڕۆژ بوویـەوە هـەڵم گرتـوو بـردم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) کـاتی مـن چـووم مەقاشـێکی بەدەسـتەوە بـوو، کەمنی دی فەرمووی: "وا دیارە (أم سليم) منـداڵی بـووە" وتم: بـەڵێ، مەقاشـەکەی داناو منداڵەکـەم بـۆ هێنـا لـە دامێنیـدا دامنـا، پێغەمبـەر (ﷺ) بـانگی کـرد دەنکـێ خورمای مەدینەیان بۆ هێنا لەدەمی خۆیدا جـوی هـەتا توایـەوە، لەپاشـدا خسـتییە

دەمی منداڵەکە، منداڵەکە خواردی و هەرچیش بەلێوییەوە مابوو، دەیلێسایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بڕوانن (أنصار) چەندە خورمایان خۆشدەوێ"، ئەمجا دەستی هێنا بە ڕوومەتیدا و ناوی نا (عبدالله).

## ( ٢٨ ) پلە و پایەی ( أبيّ کوڕی کعب )( رضي الله عنه )

**٩٢٢ــ عن أَنَس (رضي الله عنه) قال: جَمَعَ الْقُرْآنَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) أَرْبَعَةٌ كُلُّهُمْ مِنَ الْأَنْصَارِ: مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وأَبُو زَيْدٍ. قَالَ قَتَادَةُ: قُلْتُ لِأَنَسٍ: مَنْ أَبُو زَيْدٍ؟ قَالَ: أَحَدُ عُمُومَتِي. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٩)**

لە(أنس)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: چوارکەس لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) قورئانیان کۆکردەوە هەموویان لە ئەنصاربوون: (معاذ کوڕی جبل)، (أبيّ ی کوڕی کعب)، (زیدی کوڕی ثابت)، (أبو زید). قتادە دەڵێ: بە (أنس)م وت: أبو زید کێیە؟ وتی: یەکێکە لە مامەکانی من.

**٩٢٣**–عن ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ (ﷺ) بِمَكَّةَ، قَالَ لِأَخِيه **(أنيس):** ارْكَبْ **(وسر)** إِلَى هَذَا الْوَادِي، فَاعْلَمْ لِي عِلْمَ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ يَأْتِيهِ الْخَبَرُ مِنَ السماء، فَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِي. فَانْطَلَقَ الْآخَرُ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ وسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِي ذَرٍّ، فَقَالَ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الْأَخْلَاقِ، و **(يقول)** كَلَامًا مَا هُوَ بِالشِّعْرِ. فَقَالَ: مَا شَفَيْتَنِي فِيمَا أَرَدْتُ، فَتَزَوَّدَ وحَمَلَ شَنَّةً لَهُ فِيهَا ماء، **(وسار)** حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، فَأَتَى الْمَسْجِدَ فَالْتَمَسَ النَّبِيَّ (ﷺ) ولَا يَعْرِفُهُ، وكَرِهَ أَنْ يَسْأَلَ عَنْهُ، حَتَّى أَدْرَكَهُ –يَعْنِي اللَّيْلَ– فَاضْطَجَعَ، فَرَآهُ عَلِيٌّ (رضي الله عنه)، فَعَرَفَ أَنَّهُ غَرِيبٌ، فَلَمَّا رَآهُ تَبِعَهُ، فَلَمْ يَسْأَلْ واحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شيء حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ احْتَمَلَ قِرْبَتَهُ وزَادَهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَظَلَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ **(فيه)** ولَا يَرَى النَّبِيَّ (ﷺ) حَتَّى أَمْسَى، فَعَادَ إِلَى مَضْجَعِهِ، فَمَرَّ بِهِ عَلِيٌّ (رضي الله عنه) فَقَالَ: مَا أَنَى لِلرَّجُلِ أَنْ يَعْلَمَ مَنْزِلَهُ؟ فَأَقَامَهُ فَذَهَبَ بِهِ مَعَهُ، ولَا يَسْأَلُ واحِدٌ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ عَنْ شيء، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الثَّالِث فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَأَقَامَهُ عَلِيٌّ (رضي الله عنه) مَعَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: أَلَا تُحَدِّثُنِي مَا الَّذِي أَقْدَمَكَ هَذَا الْبَلَدَ؟ قَالَ: إِنْ أَعْطَيْتَنِي عَهْدًا ومِيثَاقًا لَتُرْشِدَنِّي فَعَلْتُ، فَفَعَلَ، فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: فَإِنَّهُ حَقٌّ وهُوَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَإِذَا أَصْبَحْتَ فَاتَّبِعْنِي، فَإِنِّي إِنْ رَأَيْتُ شَيْئًا أَخَافُ عَلَيْكَ قُمْتُ كَأَنِّي أُرِيقُ الماء، فَإِنْ مَضَيْتُ فَاتَّبِعْنِي حَتَّى تَدْخُلَ مَدْخَلِي، فَفَعَلَ. فَانْطَلَقَ يَقْفُوهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ (ﷺ) ودَخَلَ مَعَهُ، فَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ (ﷺ) وأَسْلَمَ مَكَانَهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (ﷺ): "ارْجِعْ

إِلَى قَوْمِكَ فَأَخْبِرْهُمْ حَتَّى يَأْتِيَكَ أَمْرِي". فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأَصْرُخَنَّ بِهَا بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ. فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى الْمَسْجِدَ، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، و (أشهد) أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. وَثَارَ الْقَوْمُ فَضَرَبُوهُ حَتَّى أَضْجَعُوهُ على الأرض، فَأَتَى الْعَبَّاسُ (بن عبدالمطلب (ﷺ)) فَأَكَبَّ عَلَيْهِ، فَقَالَ: وَيْلَكُمْ أَلَسْتُمْ تَعْلَمُونَ أَنَّهُ مِنْ غِفَارٍ، وَأَنَّ طَرِيقَ تُجَّارِكُمْ إِلَى الشَّامِ عَلَيْهِمْ؟ فَأَنْقَذَهُ مِنْهُمْ، ثُمَّ عَادَ مِنَ الْغَدِ بِمِثْلِهَا، وَثَارُوا إِلَيْهِ فَضَرَبُوهُ، فَأَكَبَّ عَلَيْهِ الْعَبَّاسُ فَأَنْقَذَهُ. (بخاري/ المناقب/ ٣٣٢٨)

له(أبن عباس)هوه (ﷺ) دهڵێ: لهكاتێكدا (أبوذر)ههواڵی ناردنی پێغهمبهری (ﷺ) پێگهیشت، به (أنیس)ی برای وت: سواربهو برۆ بۆ ئهو دۆڵه، ههواڵی ئهو پیاوهم بۆ بزانه كه وادهزانێت پێغهمبهرهو له ئاسمانهوه ههواڵی بۆ دێ، گوێ لهوتهكانی بگره و وهرهوه بۆ لام، (أنیس) كهوته ڕێ تاگهیشته مهككه و گوێی لهوتهكانی گرت و، گهڕایهوه بۆلای (أبو ذر)و وتی: دیم فهرمانی دهكرد به ڕهوشته بهرزهكان وقسهیهكی (دهوت) شیعر نهبوو، وتی: دڵنیات نهكردم لهوهی كهویستم، ئهمجا خۆی توێشووی ههڵگرت و كونهیهكی لهگهڵ خۆی برد ئاوی تیابوو، ڕۆیی ههتا گهیشته مهككه، هاته مزگهوت و بهدوای پێغهمبهردا (ﷺ) دهگهڕا ونهیشیدهناسی، حهزیشی نهدهكرد پرسیار بكات، ههتا شهوی بهسهرداهات، ڕاكشا (علی) (ﷺ) بینی، زانی غهریبه، خولكی كرد، ئهویش دوای كهوت، بهڵام كهسیان پرسیاری هیچیان لهكهسی تریان نهكرد ههتا ڕۆژبوویهوه، دیسانهوه كونه ئاوهكه و توێشووهكهی ههڵگرت بهرهو مزگهوت، ئهو ڕۆژهیش تا ئێواره لهوێ مایهوه و پێغهمبهری (ﷺ) نهبینی، گهڕایهوه جێگه خهوهكهی، علی (ﷺ) بهلایدا تێپهڕی وتی: ئهم پیاوه كاتی ئهوهی نههاتووه خانه خوێكهی بزانێت؟ ههڵیساند و لهگهڵ خۆی بردیهوه، هیچیان پرسیاریان لهوی تریان نهكرد، ههتا له ڕۆژی سێههمدا ههروهك دووهمی كرد، علی (ﷺ) لهگهڵ خۆی ههڵیساند و پاشان پێی وت: ئایا پێم ناڵێی چی تۆی هێناوهته ئهم شاره؟ وتی: ئهگهر بهڵێنم بدهیتێ كه ڕێنمایم بكهیت پێت دهڵێم، بهڵێنی دایێ، ئهویش پێی وت، ئهمجا (علی) وتی: دڵنیابه ئهو ڕاست دهكا پێغهمبهری خوایه (ﷺ)، ههركات ڕۆژت لێبوویهوه دوای من بكهوه، من ئهگهر شتێكم بینی جێگای مهترسی بوو بۆتۆ ڕادهوهستم (لهپهنا دیوارێكدا) وهك ئهوهی دهست بهئاو بگهیهنم، ئهگهر ڕۆیشتم دوامكهوه تادهگهیته ئهو شوێنهی منی

بۆدەچم، (أبوذر) بەو شێوەی کرد و دوای کەوت هەتا گەیشتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش لەگەڵیدا چوو، فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) بیست و موسڵمان بوو لە شوێنی خۆیدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بگەڕێرەوە ناو هۆزەکەت هەواڵی ئەم دینەیان پێبگەیەنە هەتا فەرمانی منت بۆدێ". وتی: سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە لەنێوەندی قورەیشەکاندا هاوار دەکەم، ڕۆیشت هەتاهاتە مزگەوت، بە بەرزترین دەنگی هاواری کرد (أشهد ان لا اله الا الله و أشهد أن محمداً رسول الله) خەڵکەکە پەلاماریان دایی و کەوتنە لێدانی، تاکودایان بەزەویدا، (عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب)هات خۆیدا بەسەریدا و وتی: ئەی بەدبەختانە ئەی نازانن ئەمە لە هۆزی غیفارە و ڕێگای بازرگانیتان بۆ شام بەسەر ئەواندایە، دەری هێنا لەژێر دەستیان، کەچی سبەینێ بەهەمان شێوەی کردەوە و پەلاماریان دایێ و لێیاندا دیسانەوە هەر (عباس) خۆی دابەسەریاو ڕزگاری کرد لە دەستیان.

## (٢٩) پلە و پایەی أبي موسى الاشعري (ﷺ)

٩٢٤ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَال: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) وهُوَ نَازِلٌ بِالْجِعْرَانَةِ بَيْنَ مَكَّةَ والْمَدِينَةِ، ومَعَهُ بِلَالٌ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: أَلَا تُنْجِزُ لِي يَا مُحَمَّدُ ماءعَدْتَنِي؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَبْشِرْ". فَقَالَ لَهُ الْأَعْرَابِيُّ: أَكْثَرْتَ عَلَيَّ مِنْ أَبْشِرْ. فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى أَبِي مُوسَى وبِلَالٍ كَهَيْئَةِ الْغَضْبَانِ، فَقَالَ: "إِنَّ هَذَا قَدْ رَدَّ الْبُشْرَى، فَاقْبَلَا أَنْتُمَا". فَقَالَا: قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. ثُمَّ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بِقَدَحٍ فِيهِ ماء، فَغَسَلَ يَدَيْهِ ووَجْهَهُ فِيهِ، ومَجَّ فِيهِ ثُمَّ قَالَ: "اشْرَبَا مِنْهُ، وأَفْرِغَا عَلَى وجُوهِكُمَاءنُحُورِكُماءأَبْشِرَا". فَأَخَذَا الْقَدَحَ، فَفَعَلَا مَا أَمَرَهُمَا بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَنَادَتْهُمَا أُمُّ سَلَمَةَ مِنْ وراء السِّتْرِ: أَفْضِلَا لِأُمِّكُمَا مِمَّا فِي إِنَائِكُمَا. فَأَفْضَلَا لَهَا مِنْهُ طَائِفَةً. **(بخاري/ المغازي/ ٤٠٧٣)**

لە(أبی موسی الاشعری)یەوە (ﷺ) دەڵێ: من لای پێغەمبەر (ﷺ) بووم، کەدابەزیبو لە (جعرانە) لەنێوان مەککە و مەدینەدا، (بلال)یشی لەگەڵ بوو، پیاوێکی ئەعرابی هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وتی: ئەی موحەممەد ئایە ئەو بەڵێنانەی کە پێت دابووم بۆم جێبەجێ ناکەیت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "موژدە وەرگرە" کابراوتی: زۆرت پێوتووم موژدە وەرگرە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕویکردە (أبوموسی)و (بلال) شێوەی وەك توڕەبووبێت، وتی: ئەمە موژدەکەی منی داوەتە دواوە، ئێوە

وەریگرن، وتیان وەرمان گرت، ئەی پێغەمبەری خوا. دوای ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) پەرداخێ ئاوی داواکرد دەستی و ڕوومەتی تێداشۆرد و ئاوی دەمی ڕۆکردەوە ناوی ئەمجا فەرمووی: "لێی بخۆنەوە و بیشیکەن بەڕوخسار وگەردنیشتاندا و مـوژدە وەرگرن، پەرداخەکەیان وەرگرت و ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدان کردیان (أم سلمه) لەپشتی پەردەوە بانگی کردن، لەوەی ناو قاپەکەتان بەشی دایکیشتان بهێڵنەوە، هەندێکیان هێشتەوە بۆ (أم سلمه).

## (٣٠) **پلەو پایەی (أبی موسی) و، (أبی عامر)ی الاشعری (رضي الله عنهما)**

٩٢٥ـ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ: عَنْ أَبِيهِ قَالَ: لَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ (ﷺ) مِنْ حُنَيْنٍ بَعَثَ أَبَا عَامِرٍ عَلَى جَيْشٍ إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقِيَ دُرَيْدَ بْنَ الصِّمَّةِ، فَقُتِلَ دُرَيْدٌ **(بن الصمة)** وهَزَمَ اللَّهُ أَصْحَابَهُ، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: وبَعَثَنِي مَعَ أَبِي عَامِرٍ، قَالَ: فَرُمِيَ أَبُو عَامِرٍ فِي رُكْبَتِهِ، رَمَاهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِي جُشَمٍ بِسَهْمٍ فَأَثْبَتَهُ فِي رُكْبَتِهِ، فَانْتَهَيْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: يَا عَمِّ مَنْ رَمَاكَ؟ فَأَشَارَ أَبُو عَامِرٍ إِلَى أَبِي مُوسَى فَقَالَ: إِنَّ ذَاكَ قَاتِلِي تَرَاهُ، ذَلِكَ الَّذِي رَمَانِي. قَالَ أَبُو مُوسَى: فَقَصَدْتُ لَهُ فَاعْتَمَدْتُهُ فَلَحِقْتُهُ، فَلَمَّا رَآنِي وَلَّى عَنِّي ذَاهِبًا، فَاتَّبَعْتُهُ وجَعَلْتُ أَقُولُ لَهُ: أَلَا تَسْتَحْيِي؟ أَلَسْتَ عَرَبِيًّا؟ أَلَا تَثْبُتُ؟ فَكَفَّ، فَالْتَقَيْتُ اناءهُوَ، فَاخْتَلَفْنَا اناءهُوَ ضَرْبَتَيْنِ، فَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ فَقَتَلْتُهُ، ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى أَبِي عَامِرٍ فَقُلْتُ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ قَتَلَ صَاحِبَكَ. قَالَ: فَانْزِعْ هَذَا السَّهْمَ، فَنَزَعْتُهُ، فَنَزَا مِنْهُ الماء، فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأَقْرِئْهُ مِنِّي السَّلَامَ، وقُلْ لَهُ: يَقُولُ لَكَ أَبُو عَامِرٍ: اسْتَغْفِرْ لِي. قَالَ: واسْتَعْمَلَنِي أَبُو عَامِرٍ عَلَى النَّاسِ، ومَكَثَ يَسِيرًا، ثُمَّ إِنَّهُ مَاتَ، فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) دَخَلْتُ عَلَيْهِ، وهُوَ فِي بَيْتٍ عَلَى سَرِيرٍ مُرْمَلٍ وعَلَيْهِ فِرَاشٌ، وقَدْ أَثَّرَ رِمَالُ السَّرِيرِ بِظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وجَنْبَيْهِ، فَأَخْبَرْتُهُ بِخَبَرِنَا وخَبَرِ أَبِي عَامِرٍ، وقُلْتُ لَهُ: قَالَ: قُلْ لَهُ يَسْتَغْفِرْ لِي. فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بماء فَتَوَضَّأَ مِنْهُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعُبَيْدٍ أَبِي عَامِرٍ". حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: "اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَوْقَ كَثِيرٍ مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ: مِنَ النَّاسِ". فَقُلْتُ: ولِي يَا رَسُولَ اللَّهِ فَاسْتَغْفِرْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ ذَنْبَهُ، وأَدْخِلْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُدْخَلًا كَرِيمًا". قَالَ أَبُو بُرْدَةَ: إِحْدَاهُمَا لِأَبِي عَامِرٍ، والْأُخْرَى لِأَبِي مُوسَى. **(بخاري/ المغازي/ ٤٠٦٨)**

لـه(ابـي بـردة)وه، لهباوكيـهوه دهڵـێ: لهكاتێكـدا پێغهمبـهر (ﷺ) لـه (جـهنگی حونـهین لێ بوویـهوه (ابـو عـامر)ی كـرد بهسـهركردهی سـوپایهك و، نـاردی بـۆ (أوطاس)گهیشت به (دُرید)ی كوڕی (الصّمّة)(دُریـد)ی كـوڕی (الصـّمّه) كـوژرا و خـوا هاوڕێكانیشی تێكشكاند، دهڵێ: منیشی لهگهڵ (أبوعامر) نارد، تیرێكیاندا له ئهژنۆی (أبوعامر) ،پیاوێك له (بني جُشم) تێیگـرت و چـهقاندیه ئـهژنۆی گهیشـتمه لای، وتم: ئهی مامهم كێ تێیگرتـی؟ (أبـو عـامر) ئامـاژهی كـرد وبـه (ابوموسـی)ی وت: ئـهوه بكوژهكهمه دهیبینیت، ئهوهیه تیری تێگـرتم. (أبوموسـی) دهڵـێ: بـۆی چـووم دوای كهوتم، كاتێ منی دی ڕۆیشت، دوای كهوتم و بانگم لێكرد ئایا شهرم ناكهیت؟ ئایه تۆ عــهرهب نیــت؟ بۆخــۆت ناگریــت؟ وهســتا، مــن و ئــهو هــاتین بهیهكــدا و یــهكی شمشمێرێكمان داهێنایهوه بۆیهك (بهرنهكه وتین) ئهمجا شمشێرێكم لێدا و كوشـتم، دوایـی گهڕامـهوه بـۆ لای أبـو عـامر وتم: خـوا بكوژهكـهی كوشـتی. وتـی ئـهو تـیره دهربهێنه، تیرهكهم دهرهێنا، ئاوی لێدهڕۆیشت و نهدهوهستایهوه، وتی: ئهی بـرازام بڕۆ بۆلای پێغهمبهر (ﷺ) سهلامی منی پێبگهیهنه و بڵـێ: (أبوعـامر) دهیـوت: داوای لێبوردنم بۆ بكات، دهڵێ: (ابوعامر) منی كرد بهسهركردهی خهڵكهكه خۆیشی كهمێك مایـهوه لـهدوا وهفـاتی كـرد، كاتـێ گهڕامـهوه لای پێغهمبـهر چـووم بـۆ خزمـهتی، لهماڵێكدا بوو لهسهر قهرهوێڵهیهك كه به گـهڵای دارخورمـا چـنرابوو جلیشـی لهسـهر داخرابوو شوێنهواری لق وپۆی سهر ئهو قهرهوێڵه ، له پشت وكهلهكهكانیدا دیاربوو، ههواڵم دایێ بهههواڵی خۆمان و ههواڵی (أبو عامر)، عهرزم كرد. عامر وتی: پێی بڵێ: داوای لێبوردنم بـۆ بكـات، پێغهمبـهر (ﷺ) داوای ئـاوی كـرد، دهسـتنوێژی لێگـرت و ئهمجا دهستی بهرزكردهوه و فهرمووی: "ئهی خوایـه خۆشـببه لـه (عُبیـدی كـوڕی عامر)" ههتا سپێتی بن باڵهكانیم دی، دوای ئهوه فهرمووی: "ئـهی خوایـه لـه ڕۆژی قیامهتـدا بیخهیتـه سـهرووی زۆرێـك لـه خـهڵكی، یـان لـه ئـادهمیزاد" وتم: ئـهی پێغهمبهری خوا داوای لێبوردن بۆ منیش بكه، پێغهمبهر فهرمووی: "ئهی خوایـه لـه تاوانهكانی (عبدالله)ی كوڕی (قیس) ببوره و، له ڕۆژی قیامهتـدا بیخـهره جێگایـهكی بهڕێزهوه". أبـو بـرده دهڵـێ: دوعایـهكیان بـۆ (أبـو عـامر) و ئـهوی تریـان بـۆ (أبـو موسی) بوو.

## ( ٣١ ) پله و پایەی ( أبوهريرة )ەی دەوسی ( رضي الله عنه )

٩٢٦ـ عن عُرْوَةَ، عن عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: أَلَا يُعْجِبُكَ أَبُو هُرَيْرَةَ؟ جاء فَجَلَسَ إِلَى جَنْبِ حُجْرَتِي، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يُسْمِعُنِي ذَلِكَ، وكُنْتُ أُسَبِّحُ، فَقَامَ قَبْلَ أَنْ أَقْضِيَ سُبْحَتِي، ولَوْ أَدْرَكْتُهُ لَرَدَدْتُ عَلَيْهِ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيثَ كَسَرْدِكُمْ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: يَقُولُونَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَدْ أَكْثَرَ، واللَّهُ الْمَوْعِدُ، ويَقُولُونَ: مَا بَالُ الْمُهَاجِرِينَ والْأَنْصَارِ لَا يَتَحَدَّثُونَ مِثْلَ أَحَادِيثِهِ؟ وسَأُخْبِرُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: إِنَّ إِخْوَانِي مِنَ الْأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَلُ أَرَضِيهِمْ، وإِنَّ إِخْوَانِي مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالْأَسْوَاقِ، وكُنْتُ أَلْزَمُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى مِلْءِ بَطْنِي فَأَشْهَدُ إِذَا غَابوا،وأَحْفَظُ إِذَا نَسوا،ولَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (*)يَوْمًا أَيُّكُمْ يَبْسُطُ ثَوْبَهُ فَيَأْخُذُ مِنْ حَدِيثِي هَذَا ثُمَّ يَجْمَعُهُ إِلَى صَدْرِهِ فَإِنَّهُ لَمْ يَنْسَ شَيْئًا سَمِعَهُ فَبَسَطْتُ بُرْدَةً عَلَيَّ حَتَّى فَرَغَ مِنْ حَدِيثِهِ ثُمَّ جَمَعْتُهَا إِلَى صَدْرِي فَمَا نَسِيتُ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ شَيْئًا حَدَّثَنِي بِهِ ولَوْلَا آيَتَانِ أَنْزَلَهُمَا اللَّهُ فِي كِتَابِهِ مَا حَدَّثْتُ شَيْئًا أَبَدًا (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ والْهُدَى) إِلَى آخِرِ الْآيَتَيْنِ. **(بخاري/ المناقب/ ٣٣٧٥)**

لە(عروة)وە لە (عائشة)ەوە (رضي الله عنها) دەڵێ: ئایا سەرت سوڕنامێنێ لە (ابوهريره) هات و لەپەنا حوجرەکەی مندا دانیشت و فەرمودەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕایەوە و، دەیدا بە گوێی مندا، منیش نوێژی سوننەتم دەکرد، ئەو هەستا بەرلەوەی من نوێژەکەم تەواو کەم، ئەگەر فریای بکەوتایەم بەرپەرچم دەدایەوە: کە بەڕاستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك ئێوە فەرمودەی زۆر لەسەر یەك نەخوێندۆتەوە. (أبن شهاب) لە (ابن المسيب)ەوە کە (ابو هريره) وتی: دەڵێن: (أبوهريرة) فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە، لای خوا وادەمان بێت (دەردەکەوێ گەر درۆم کردبێ) دەڵێن: هۆی چیە یاریدەدەران و کۆچکەران وەك (أبوهريره) فەرموودە ناگێڕنەوە؟ من پێتان دەڵێم: کاتێ برا (أنصاری)یەکانم سەرگەرمی کاربوون لەناو زەویەکانیاندا، برا (مهاجر)ەکانیشم سەرگەرمی مامەڵەی بازار بوون، بەڵام من هەر سکم تێر بووایا ئیتر لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جیانەدەبوومەوە، من ئامادە دەبووم کاتێ ئەوان لەوێ نەبوون، من لەبەرم دەکرد کاتێ ئەوان لەبیریان دەچوو، ڕۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "کێتان جلەکەی ڕادەخات هەتا لەم فەرموودەی من وەربگرێت و کۆی بکاتەوە لەسینگیدا، بەڕاستی هەرچی بیست ئیتر لەبیری ناچێتەوە". بوردەکەی

بەرم ڕاخست هەتا لێبوویەوە لە فەرموودەکانی، ئەمجا کۆم کردەوە بۆ سەرسینگم دوای ئەو ڕۆژە هیچ شتێکم بیرنەچوو لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم. ئەگەر لەبەر دوو ئایەتیش نەبێت کە خوای (ﷻ) نازڵی کردوون لە قورئانەکەیدا بەهەتا هەتایی هیچم نەدەگێڕایەوە: (ان الذين يكتمون ما انزلنا من البينات و الهدى) (واتە: ئەوانەی ئەو ڕوونکردنەوەو ڕێنماییانەی ئێمە دامانبەزاندووە دەشاردنەوە..) تا کۆتایی هەردوو ئایەتەکە.

## پلەوپایەی حسان کوری ثابت

**٩٢٧-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ عُمَرَ (رضي الله عنه) مَرَّ بِحَسَّانَ وَهُوَ يُنْشِدُ الشِّعْرَ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَحَظَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أُنْشِدُ وفيه مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْكَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ أَسَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "أَجِبْ عَنِّي اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ"؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ. (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٤٠)**

لە (ابی هریرە)ەوە (رضي الله عنه) کە (عمر)ی کوڕی (خطاب) (رضي الله عنه) تێپەڕی بەلای (حسان)دا لە مزگەوتەکەدا هۆنراوەی دەخوێندەوە، (عمر) بۆی ڕوانی، حسان وتی: لەکاتێکدا لەتۆ چاکتریشی تیابوو من شیعرم دەخوێندەوە، پاشان (عمر) لایکردەوە بەلای (أبو هريرة)دا وتی: بەناوی خوا داوات لێدەکەم ئایا بیستووتە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەیەفەرموو: "وەڵام بدەرەوە لە بریتی من، ئەی خوایە پشتگیری لێبکە بە (روح القدس)–کە (جبريل)ە (عليه السلام) أبو هريرة وتی: بەڵێ سوێند بەخوا.

**٩٢٨ـ عَنْ الْبراء بْنَ عَازِبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ: "اهْجُهُمْ، أَوْ: هَاجِهِمْ، وجِبْرِيلُ مَعَكَ". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٤١)**

لە(براء)ی کوڕی (عازب)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) بە (حسانی کوڕی (ثابت)ی فەرمووی: "هەجویان بکە، جبریل لەگەڵت بێت".

**٩٢٩ـ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ (رضي الله عنها) وعِنْدَهَا حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ يُنْشِدُهَا شِعْرًا يُشَبِّبُ بِأَبْيَاتٍ لَهُ، فَقَالَ:**

**حَصَانٌ رَزَانٌ مَا تُزَنُّ بِرِيبَةٍ وتُصْبِحُ غَرْثَى مِنْ لُحُومِ الْغَوَافِلِ**

**فَقَالَتْ لَهُ عَائِشَةُ: لَكِنَّكَ لَسْتَ كَذَلِكَ. قَالَ مَسْرُوقٌ: فَقُلْتُ لَهَا: لِمَ تَأْذَنِينَ لَهُ يَدْخُلُ عَلَيْكِ؟ وقَدْ قَالَ اللَّهُ: (وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (النور: ١١). فَقَالَتْ: فَأَيُّ عَذَابٍ أَشَدُّ مِنَ الْعَمَى؟ فقالت:إِنَّهُ كَانَ يُنَافِحُ –أَوْ: يُهَاجِي– عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). (بخاري/ المغازي/ ٣٩١٥)**

له(مسروق)ەوە دەڵێ: چوو بۆ خزمەتی عائشة (ﷺ) (حسان) لای بوو شیعری دەخوێندەوە و بەچەند شیعرێکی خۆی مەدحی دەکرد:

حَصانٌ رزانٌ ماتُزَنُّ بِريبةٍ وتُصبِح غَرثى من لحوم الغوافِلِ

واتە: عائشە دامێن پاکە، بەڕێز و ویقارە، تۆمەتبار ناکرێت بە گومان. بێدەنگە لە ئاستی ئافرەتانی دڵپاك و ڕەوشت بەرز و بێئاگا لەخەتا.

عائشە فەرمووی: بەڵام تۆ وانیت، مەسروق دەڵێ: بەعائشەم وت: بۆچ ڕێگای ئەدەیت هات وچۆت بکات؟ لەکاتێکدا خوا دەفەرموێ: (والذی تولّی کبره له عذاب عظیم؟(النور:١١) عائشة فەرمووی: چ سزایەك سەختترە لە کوێری؟ ئینجا فەرمووی: بەڕاستی داکۆکیشی دەکرد لە پێغەمبەر.

## (٣٢) پلە و پایەی (جریر)ی کوڕی (عبدالله)ی (البجلي)(ﷺ)

**٩٣٠ـ عَنْ جَرِيرٍ (ﷺ) قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُنْذُ أَسْلَمْتُ، ولَا رَآنِي إِلَّا تَبَسَّمَ فِي وجْهِي. (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٥٧)**

له(جریر)ەوە (ﷺ) دەڵێ: لەوکاتەوە موسڵمان بووم هیچ کات پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگای چوونە ژوورەوەی لێنەگرتووم، هەرکاتیش منی دیبێ بەزەردەخەوە ڕووبەڕووم بۆتەوە.

**٩٣١ـ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يَا جَرِيرُ، أَلَا تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ". بَيْتٍ لِخَثْعَمَ كَانَ يُدْعَى كَعْبَةَ الْيَمَانِيَةِ، قَالَ: فَنَفَرْتُ فِي خَمْسِينَ ومِائَةِ فَارِسٍ، وكُنْتُ لَا أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَضَرَبَ يَدَهُ فِي صَدْرِي فَقَالَ: "اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ، واجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا". قَالَ: فَانْطَلَقَ فَحَرَّقَهَا بِالنَّارِ، ثُمَّ بَعَثَ جَرِيرٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) رَجُلًا يُبَشِّرُهُ -يُكْنَى أَبَا أَرْطَاةَ- مِنَّا، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لَهُ: مَا جِئْتُكَ حَتَّى تَرَكْنَاهَا كَأَنَّهَا جَمَلٌ أَجْرَبُ. فَبَرَّكَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى خَيْلِ أَحْمَسَ ورِجَالِهَا خَمْسَ مَرَّاتٍ. (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٧١)**

له(جریر)ەوە (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم: "ئەی (جریر) ئایا ڕزگارم ناکەیت لە (ذی الخلصة) ماڵێکی (خثعم) بوو ناودەبرا بە کەعبەی یەمانی، دەڵێ: بەسەدوپەنجا ئەسپ سوارەوە بۆی چووم، خۆیشم بۆ نەدەگیرا لەسەر ئەسپ، ئەمەم باسکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دابەسنگمداو فەرمووی: "ئەی خوایە دامەزراوی بکە و بیگێڕە بە ڕێنمایی کار و ڕێنمایی کراو" جریر ڕۆیی و ئەو

ماڵەی ئاگر تێبەردا و، ئەمجا پیاوێکی نارد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) مـوژدەی پێبـدات، پێی دەوترا (أبو ارطأ)، هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: وەختێ جێمـانهێڵا و مـن هاتم بۆ ئێرە دەتوت وشتری گەڕە و قەتران کراوە بەسـەریدا، پێغەمبـەر (ﷺ) پێـنج جار دوعای پیرۆزیی کرد بۆ ئەسپەکانی هۆزی (أحمس) وپیاوەکانیشی.

## ( ٣٣ ) پلە و پایەی ئەو کەسەی ئامادەی ( بدر ) بووە

٩٣٢ـ عن عَلِيٍّ (ﷺ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) اناءالزُّبَيْرَ والْمِقْدَادَ (ﷺ)، فَقَالَ: "ائْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا". فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا، فَإِذَا نَحْنُ بِالْمَرْأَةِ، فَقُلْنَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ، فَقَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ. فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللَّه (ﷺ)، فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى نَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَا حَاطِبُ مَا هَذَا". قَالَ: لَا تَعْجَلْ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ –قَالَ سُفْيَانُ: كَانَ حَلِيفًا لَهُمْ، وَلَمْ يَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا– وَكَانَ مِمَّنْ كَانَ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ لَهُمْ قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ، فَأَحْبَبْتُ –إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ– (أَنْ) أَتَّخِذَ فِيهِمْ يَدًا يَحْمُونَ بِهَا قَرَابَتِي، وَلَمْ أَفْعَلْهُ كُفْرًا وَلَا ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي، وَلَا رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الْإِسْلَامِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "صَدَقَ". فَقَالَ عُمَرُ (ﷺ): دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّه أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ: "إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ". فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ اولياء) (الممتحنة: ١). وَجَعَلَهَا –يعني الآيَةَ– إِسْحَقُ فِي رِوَايَتِهِ مِنْ تِلَاوَةِ سُفْيَانَ. (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٥)

لـە(علـی)وە (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) مـن و(زبـیر)و (مقـداد)ی (ﷺ) نـارد فـەرمووی: "بڕۆنـە (روضـة خـاخ)لـەوێ ئـافرەتێکی تێدایـە نامەیـەکی پێیـە لێـی وەربگرن" ڕۆیشـتین ئەسـپەکانمان تـاودا، هـەتا گەیشـتینە لای ئافرەتەکـە، وتمـان: نامەکـە دەرکـە، وتـی: نامـەم پێنیـە، وتمـان: نامەکـە دەردەکـەیت، یـان جلـەکانت دەگەڕێین، نامەکەی دەرهێنـا لـەناو پەلکیـدا بـوو، هێنامانـەوە بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، کەچی نامەیەك بوو لـە (حاطـب)ی کـوڕی (بلتعـة)ەوە بـۆ کەسـانێك لـە بێبـاوەڕانی خـەڵکی مەککـە، هـەواڵیان دەداتـێ بەهەنـدێ کاروبـاری پێغەمبـەر (ﷺ)، پێغەمبـەر

(ﷺ) فەرمووی: "ئەی حاطب ئەمە چییە؟" وتی: ئەی پێغەمبەر پەلەم لێ مەکە، من پیاوێکم خۆم هەڵواسیوە بە قورەیشدا –سفیان دەڵێ: هاوپەیمانیان بوو لەوان نەبوو– ئەوانەیشی لەگەڵ تۆدان لە کۆچکەران هەموو خزمیان هەیە و کەسەکانیان بەو خزمایەتییە دەپارێزن، منیش –کە خزمم نیە– حەزم کرد چاکەیان لەگەڵ بکەم بەڵکو بەوهۆیەوە کەسەکانم بپارێزن من ئەوەم نەکردووە لەبەر بێباوەڕی، یان پاشگەزبوونەوە لەدینەکەم، یان ڕازی بوون بە کوفر دوای موسڵمان بوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ڕاست دەکات" عمرو وتی: یارسول الله، وازم لێ بهێنە بابدەم لە گەردنی ئەم دوڕووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەو ئامادەی بەدر بووە، تۆچوزانی نزیکە خوا بەچاوی بەزەیی تەماشای ئەهلی بەدری کردبێت و پێی فەرمووبن: چیتان دەوێ بیکەن بەڕاستی من لێتان بوردم، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نازڵ کرد: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وعَدُوَّكُمْ اولياء) (الممتحنة:١) اسحاق لەڕیوایەتەکەی خۆیدا دەڵێ: سفیان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (واتە لە فەرموودەکەدا نەهاتووە).

## ٣٤ ) پلەو پایەی قورەیش و ( أنصار ) و کەسانی تریش

**٩٣٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قُرَيْشٌ والْأَنْصَارُ ومُزَيْنَةُ وجُهَيْنَةُ وأَسْلَمُ وغِفَارُ وأَشْجَعُ مَوَالِيَّ، لَيْسَ لَهُمْ مَوْلًى دُونَ اللَّهِ ورَسُولِهِ". (بخاري/ المناقب/ ٣٣١٣)**

لە(أبي هريرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "قورەیش و أنصار و مزینە و، جهینە و، أسلم و، غِفار و، اشجع، دۆست و یاری منن، جگەلە خواو و پێغەمبەر گەورەیان نیە".

## ( ٣٥ ) ئافرەتانی قورەیش

**٩٣٤ـ عن أبي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "نساء قُرَيْشٍ خَيْرُ نساء رَكِبْنَ الْإِبلَ، أَحْنَاهُ عَلَى طفلٍ، وأَرْعَاهُ عَلَى زَوْجٍ فِي ذَاتِ يَده". قَالَ: يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ عَلَى إِثْرِ ذَلِكَ: ولَمْ تَرْكَبْ مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ بَعِيرًا قَطُّ. (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٥١)**

لە(أبي هريرة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "ئافرەتانی قورەیش باشترین ئافرەتن کە سواری وشتربووبن، بەبەزەیی ترین ئافرەتن بۆ کۆرپەکانیان، پارێزگارترین ئافرەتیشن بۆ ماڵ و سامانی مێرد کەلە بەردەستیاندایە، ڕاوی دەڵێ: أبوهريره دوای ئەمە فەرمووی: (مريم)ی کچی (عمران) قەت سواری وشتر نەبووە. (واتە ئەمان لەو چاکتر نەبوون).

## ( ٣٦ ) پلە و پایەی الانصار (رضي الله عنهم)

٩٣٥ـ عَنْ جَابِرِ ابْنِ عَبْدِ اللَّه (رضي الله عنه) قَالَ: فِينَا نَزَلَتْ: (إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلَا واللَّهُ وليُّهُمَا) (آل‌عمران: ١٢٢): بَنُو سَلِمَةَ وبَنُو حَارِثَةَ، ومَا نُحِبُّ أَنَّهَا لَمْ تَنْزِلْ، لِقَوْلِ اللَّه عَزَّ وجَلَّ: (وَاللَّهُ ولِيُّهُمَا). (بخاري/ المغازي/ ٣٨٢٥)

(جابر)ی کوڕی عبدالله (رضي الله عنه)دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە (بنو سلمة و بنو حارثة)هاتە خوارەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: (لەکاتێکدا دو هۆز لە ئێوە (بنو سلمە) و (بنو حارثة) نزیك بوو بگەڕێنەوە و پاشەکشە بکەن لە جەنگی (أحد) لە ترسا و بەپیلانی سەرۆکی دوڕووەکان کە (عبدالله) کوڕی (أُبَـيْ)ە خوایش سەرپەرشتیار و چاودێری ئەو هۆزەیە..) حەزیش ناکەین نازڵ نەبوایە لەبەر فەرموودەی خوای گەورە (والله ولیهما) واتە: خوا دۆست و سەرپەرشتیاریانە.

٩٣٦ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رضي الله عنه): قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ، ولِأَبْنَا و الْأَنْصَارِ، وأَبْنَا و أَبْنَا و الْأَنْصَارِ". (بخاري/ التفسير/ ٤٦٢٣)

(زید)ی کوڕی (أرقم) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: "خوایە خۆشبیت لە ئەنصار و کوڕەکانی ئەنصار و کوڕانی کوڕانی ئەنصار".

٩٣٧ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) رَأَى صِبْيَانا ونساء مُقْبِلِينَ مِنْ عُرْسٍ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّه (ﷺ) مُمْثِلًا، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ، اللَّهُمَّ أَنْتُمْ مِنْ أَحَبِّ النَّاسِ إِلَيَّ". يَعْنِي الْأَنْصَارَ. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٧٥)

(أنس)(رضي الله عنه)دەڵێ کە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ منداڵ و ژنی بینی لەشاییەك دەگەڕانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەستایە سەرپێ و فەرمووی: "سوێندم بەخوا ئێوە خۆشەویستترین کەسن لام، سوێندم بەخوا ئێوە خۆشەویستترین کەسن لام" مەبەستی ئەنصارەکان بوو.

٩٣٨ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الْأَنْصَارَ كَرِشِيءعَيْبَتِي، وإِنَّ النَّاسَ سَيَكْثُرُونَ ويَقِلُّونَ، فَاقْبَلُوا مِنْ مُحْسِنِهِمْ واعْفُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٠)

لە(انس)ەوە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "(أنصار) نهێنی پارێز و جێگای متمانەی منن، خەڵك زۆریش دەبن و، کەمیش دەبنەوە، قسەوەرگرن لەچاکەکاریان و لێبوردنتان هەبێ بەرانبەر خراپەکاریان".

## ( ٣٧ ) چاكترین بنەماڵەی ئەنصار

٩٣٩ـ عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ)، يَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "خَيْرُ دُورِ الْأَنْصَارِ بَنُو النَّجَّارِ، ثُمَّ بَنُو عَبْدِ الْأَشْهَلِ، ثُمَّ بَنُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، ثُمَّ بَنُو سَاعِدَةَ، وفِي كُلِّ دُورِ الْأَنْصَارِ خَيْرٌ". قَالَ أَبُو سَلَمَةَ: قَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: أُتَّهَمُ أَنَا عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)؟ لَوْ كُنْتُ كَاذِبًا لَبَدَأْتُ بِقَوْمِي بَنِي سَاعِدَةَ. وبَلَغَ ذَلِكَ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فَوَجَدَ فِي نَفْسِه وقَالَ: خُلِّفْنَا فَكُنَّا آخِرَ الْأَرْبَعِ، أَسْرِجُوا لِي حِمَارِي آتِي رَسُولَ اللَّه (ﷺ). وكَلَّمَهُ ابْنُ أَخِيهِ سَهْلٌ، فَقَالَ: أَتَذْهَبُ لِتَرُدَّ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، ورَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَعْلَمُ، أَوَ لَيْسَ حَسْبُكَ أَنْ تَكُونَ رَابِعَ أَرْبَعٍ؟ فَرَجَعَ وقَالَ: اللَّهُ ورَسُولُهُ أَعْلَمُ، وأَمَرَ بِحِمَارِهِ فَحُلَّ عَنْهُ. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٧٨)**

(ابـو اسـيد الانصـارى) (ﷺ) شـايەتی دەدات كـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويـەتی: "باشترین بنەماڵەی ئەنصـار (بنـو النجـار)ە، دوای ئـەوان (بنـو عبدالاشـهل)ە، دوای ئەوان (بنو الحارث بن الخزرج)ە، دوای ئەوان (بنو ساعدة)ەیە، لەهەموو بنەماڵەكانی ئەنصاردا چاكە هەیە". أبو سلمة دەڵێ: أبوأسيد وتی: من گومانم پـێ‌دەبرێ بـەدەم پێغەمبەرەوە (ﷺ) شت بڵێم؟ ئەگەر درۆزن بوایەم هۆزەكـەی خـۆم (بـني سـاعدة)م پێشدەخست. ئەمە گەیشت بە (سعد)ی كوڕی (عبادە)، شتێك لە دڵیدا دروست بـوو وتی: ئێمە كراین بە كۆتایی چوار هۆز، گوێدرێژەكەم بۆ زینكەن، دەچم بـۆ خزمـەتی پێغەمبەر (ﷺ)، سهلی برازای قسەی لەگەڵ كرد و پێی وت: ئایە دەچیت بەرپەرچی پێغەمبـەر (ﷺ) بدەیتـەوە؟ پێغەمبـەر (ﷺ) زانـاترە، ئایـا ئـەوەت بـەس نیـە كـە چوارەمی چوار بیت ؟ ئیتر گەڕایەوە وتی: خوا و پێغەمبەرەكەی زانـاترن، فـەرمانی دا جلیان لە گوێدرێژەكە گرتەوە.

## ( ٣٨ ) چاكەكاریی لەگەڵ ( أنصار )( ﷺ )

٩٤٠ـعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه الْبَجَلِيِّ فِي سَفَرٍ، فَكَانَ يَخْدُمُنِي، فَقُلْتُ لَهُ: لَا تَفْعَلْ. فَقَالَ: إِنِّي قَدْ رَأَيْتُ الْأَنْصَارَ تَصْنَعُ بِرَسُولِ اللَّه (ﷺ) شَيْئًا آلَيْتُ أَنْ لَا أَصْحَبَ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلَّا خَدَمْتُهُ. **و(زَادَ)** فِي رواية: وكَانَ جَرِيرٌ أَكْبَرَ مِنْ أَنَسٍ. **(بخاري/ الجهاد/ ٢٧٣١)**

(أنس)ی كوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: دەرچووم لەگەڵ (جریـر)ی كـوڕی (عبـدالله)ی (البجلی)دا بۆ سەفەرێك، (جریر)خزمەتی دەكردم، پێم وت: وامەكە، وتی: (أنصـار)م

دیـوە، کارێکیـان کـردووە بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ)، بۆیـە سـوێندم خـواردووە، نابـێ هاورێیەتی هیچ کام لەوان بکەم مەگەر خزمەتی بکەم، لەڕیوایەتێکی تـردا ئەمەیشـی زیادکردووە: (جریر)یش گەورەتر بوو لە انس.

## (٣٩) پلە و پایەی (أشعری) یەکان (رضي الله عنهم)

**٩٤١ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنِّي لَأَعْرِفُ أَصْوَاتَ رُفْقَةِ الْأَشْعَرِيِّينَ بِالْقُرْآنِ حِينَ يَدْخُلُونَ بِاللَّيْلِ، وأَعْرِفُ مَنَازِلَهُمْ مِنْ أَصْوَاتِهِمْ بِالْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، وإِنْ كُنْتُ لَمْ أَرَ مَنَازِلَهُمْ حِينَ نَزَلُوا بِالنَّهَارِ، ومِنْهُمْ حَكِيمٌ إِذَا لَقِيَ الْخَيْلَ –أَوْ قَالَ: الْعَدُوَّ– قَالَ لَهُمْ: إِنَّ أَصْحَابِي يَأْمُرُونَكُمْ أَنْ تَنْظُرُوهُمْ". (بخاري/ المغازي/ ٣٩٩١)**

لە(ابی موسی)وە (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "من دەنگـی هـاوڕێ ئەشـعەریەکان دەناسمـەوە بـە قورئـان خوێنـدنیان کاتـێ شـەو دەچـنە ماڵـەوە، ماڵەکانیشیان هەربەدەنگی قورئان دەناسمەوە، بەشەو هەرچەند پێشتر ماڵـەکانیانم نەدیوە کەبە ڕۆژ تیایدا دابەزیون، ئەوان پیاوێکی (حکیم)یان تێدایە کاتـێ گـەیی بـە ئەسپ سـوارەکان یـان فـەرمووی– دوژمـن– پێیـان دەڵـێ: هاوڕێکـانی مـن داواتـان لێدەکەن مۆڵەتیان بدەن" (واتە: دەیەوێ غافڵ گیریان بکات).

**٩٤٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "إِنَّ الْأَشْعَرِيِّينَ إِذَا أَرْمَلُوا فِي الْغَزْوِ، أَوْ قَلَّ طَعَامُ عِيَالِهِمْ بِالْمَدِينَةِ، جَمَعُوا مَا كَانَ عِنْدَهُمْ فِي ثَوْبٍ واحِدٍ، ثُمَّ اقْتَسَمُوهُ بَيْنَهُمْ فِي اناء واحِدٍ بِالسَّوِيَّةِ، فَهُمْ مِنِّي وأَنَا مِنْهُمْ". (بخاري/ الشركة/ ٢٣٥٤)**

لـە(أبـو موسـی)وە (رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "بەڕاسـتی ئەشعەریەکان هەرکات لە غەزاکاندا توێشویان کەم بوایە، یان خۆراکی خێزانیان کەم بوایە لە مەدینەدا هەرچیان هەیە لەسەر یەك جل کۆیان دەکردەوە دواتر بەیەکسانی بە قاپێك دابەشیان دەکرد بەسەر هەموویاندا ئەوان لە منن منیش لەوانم".

## (٤٠) پاڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ (غفار) و (أسلم)

**٩٤٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "أَسْلَمُ سَالَمَهَا اللَّهُ، وغِفَارُ غَفَرَ اللَّهُ لَهَا، أَمَا إِنِّي لَمْ أَقُلْهَا، ولَكِنْ قَالَهَا اللَّهُ (عز وجل)". (بخاري/ المناقب/ ٣٣٢٣)**

لە (أبو هريرة)وە (رضي الله عنه) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "(اسلم) خوا بیپـارێزێ، (غِفـار)یـش خـوا لێـی ببـورێ ئاگـاداربن مـن ئەمـەم نـەوتووە بـەڵکو خـوای گـەورە فەرموویەتی".

## ( ٤١ )پله وپایەی ( مزینه ) و ( جهینه )ەو ( غفار )

٩٤٤ـ عنْ أَبِي بَكْرَةَ (ﷺ): أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ جاء إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: إِنَّمَا بَايَعَكَ سُرَّاقُ الْحَجِيجِ مِنْ أَسْلَمَ وغِفَارَ ومُزَيْنَةَ -وَأَحْسِبُ- جُهَيْنَةَ. مُحَمَّدٌ الَّذِي شَكَّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ أَسْلَمُ وغِفَارُ ومُزَيْنَةُ -وَأَحْسِبُ- جُهَيْنَةُ خَيْرًا مِنْ بَنِي تَمِيمٍ، وبَنِي عَامِرٍ، وأَسَدٍ وغَطَفَانَ، أَخَابواءخَسِرُوا". فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهُمْ لَأَخْيَرُ منهم". (بخاري/ المناقب/ ٣٣٢٥)

له(أبي بكرة)ەوە (ﷺ) كە (أقرع)ی كوڕی (حابس)هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) پێیوت: ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ بەستووی لە (أسلم) و (غفار)و (مزينه)ەو -وابزانم (جهنيه)یش گومانەكە لە موحەممەدی (ڕاوی)یەوەیە- حاجییە دزەكانیانن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ڕات چۆنە ئەگەر (اسلم)و (غفار) و (مزينه) و وابزانم (جهينه)یش چاكتربن لە (بنی تميم) و (بنی عامر)و، (أسد) و (غطفان) ئایە ئەمانەی دوایی بەدبەخت و خەسارۆمەندبوون؟" وتی: بەڵێ، فەرمووی: "سوێندم بەوكەسەی گیانی منی بەدەستە ئەوان چاكترن لەمان".

## ( ٤٢ )ئەوەی دەربارەی ( دەوس ) هاتووە

٩٤٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَدِمَ الطُّفَيْلُ وأَصْحَابُهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه إِنَّ دَوْسًا (قَدْ) كَفَرَتْ وأَبَتْ، فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا. فَقِيلَ: هَلَكَتْ دَوْسٌ، فَقَالَ: "اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْسًا وائْتِ بِهِمْ". (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٧٩)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: (طُفَيل)و یارەكانی هاتن وتیان: یارسول الله بەڕاستی دەوس كافربوون و یاخی بوون و دوعایان لێبكە، وتیان: دەوس لەناوچوو، فەرمووی: "خوایە ڕێنمایی دەوس بكەو بیانهێنە"

## ( ٤٣ )پله وپایەی ( بنو تميم )

٩٤٦ـ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ): لَا أَزَالُ أُحِبُّ بَنِي تَمِيمٍ مِنْ ثَلَاثٍ سَمِعْتُهُنَّ مِنْ رَسُولِ اللَّه (ﷺ)، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "هُمْ أَشَدُّ أُمَّتِي عَلَى الدَّجَّالِ". قَالَ: وجاءتْ صَدَقَاتُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "هَذِهِ صَدَقَاتُ قَوْمِنَا". قَالَ: وكَانَتْ سَبِيَّةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ عَائِشَةَ (ﷺ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَعْتِقِيهَا، فَإِنَّهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَعِيلَ". (بخاري/ العتق/ ٢٤٠٥)

(ابوزرعة) دەڵێ: أبوهريره (ﷺ) وتی: من هەمووكات (بنو تميم)م خۆشدەوێ لەبەر سێ شت كە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە، بیستوومە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "ئەوان توندترینی ئەو ئوممەتی منن بۆ دەجاڵ" دەڵێ: كاتێ زەكاتەكەیشیان هات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەمە زەكاتی خزمەكانمانە" كەنیزەكێكی ئەو هۆزە لای عائشە بوو (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئازادی بكە چونكە ئەو لەوەچەی (اسماعیل)ە".

**٩٤٧ـ عَنْ عَاصِمٌ الْأَحْوَلُ قَالَ: قِيلَ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: بَلَغَكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَا حِلْفَ فِي الْإِسْلَامِ؟. فَقَالَ أَنَسٌ: قَدْ حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَيْنَ قُرَيْشٍ والْأَنْصَارِ فِي دَارِهِ. (بخاري/ الكفالة/ ٢١٧٢)**

(عاصم الاحول) دەڵێ: وترا بە (انس)ی كوڕی (مالك) پێت گەیشتووە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئیسلام هاوپەیمانیی تێدا نییە؟" وتی: لەڕاستیدا پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانی بەست لە نێوان قورەیش و(أنصار)دا لەخانووەكەی خۆیدا.

## (٤٤) كەسێك پێغەمبەری (ﷺ) دیبێ یان یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێ یان كەسێكی دیبێ یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێ

**٩٤٨ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يُبْعَثُ مِنْهُمُ الْبَعْثُ، فَيَقُولُونَ: انْظُرُوا هَلْ تَجِدُونَ فِيكُمْ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ. ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّانِي، فَيَقُولُونَ: هَلْ فِيهِمْ مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ. ثُمَّ يُبْعَثُ الْبَعْثُ الثَّالِثُ، فَيُقَالُ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ مَنْ رَأَى مَنْ رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ ثُمَّ يَكُونُ الْبَعْثُ الرَّابِعُ، فَيُقَالُ: انْظُرُوا هَلْ تَرَوْنَ فِيهِمْ أَحَدًا رَأَى مَنْ رَأَى أَحَدًا رَأَى أَصْحَابَ النَّبِيِّ (ﷺ)؟ فَيُوجَدُ الرَّجُلُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ بِهِ". (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٤٠)**

(ابوسعید الخدری) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "زەمانێك دێ بەسەر خەڵكیدا، سوپایەكیان لێڕەوانە دەكرێت، دەڵێن: وردبنەوە ئایە كەسێك دەبینن لەناوتاندا لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ)، پیاوێك دەدۆزنەوە، بەهۆی ئەوەوە سەركەوتن بەدەست دێنن، لەپاشدا سوپای دووەم ڕەوانە دەكرێت، دەڵێن: وردببنەوە ئایە كەسێكیان تیایە یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ بەهۆی ئەوەوە سەركەتن بەدەست دێنن، لەدوا سوپای سێهەم ڕەوانە دەكرێت، دەوترێت:

وردببنەوە ئایە کەسێکیان لەناودا هەیە کەسێکی دیبێت کە یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ ئەمجا سوپای چوارەم ڕەوانە دەکرێت، دەوترێت: وردببنەوە ئایا کەسێکیان تیا دەبینن کە کەسێکی دیبێت ئەو کەسە کەسێکی تری دیبێت کە ئەو یارانی پێغەمبەری (ﷺ) دیبێت؟ پیاوێك پەیدا دەبێ و بەهۆی ئەوەوە سەرکەوتن بەدەس دێنن".

## (٤٥) باشترین سەدە سەدەی هاوەڵانە، ئەمجا ئەوانەی بەدوایاندا دێن ئەمجا ئەوانەی بەدوایاندا دێن

**٩٤٩ـ عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ خَيْرَكُمْ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ". قَالَ عِمْرَانُ: فَلَا أَدْرِي أَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) بَعْدَ قَرْنِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةً. "ثُمَّ يَكُونُ بَعْدَهُمْ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَخُونُونَ وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَنْذِرُونَ وَلَا يُوفُونَ، وَيَظْهَرُ فِيهِمُ السِّمَنُ". (بخاري/ الشهادات/ ٢٥٠٨)**

لە(عمران)ی کوڕی (حصین)ەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "باشترین سەدە سەدەی منە، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن، دوایی ئەوانەی بەدوایاندا دێن" (عمران) دەڵێ: نازانم ئایا پێغەمبەر (ﷺ) دوای سەدەکەی خۆی دوو جار یان سێ جاری فەرموو، "دوای ئەوە قەومێك دێن شایەتیدەدەن بێئەوەی داوایان لێبکرێ، (واتە پەلەی تیادەکەن و لەخوا ناترسن) خیانەت دەکەن و جێی متمانە نین، نەزر دەکەن و جێبەجێی ناکەن، قەڵەوییان تیا دەردەکەوێ".

## (٤٦) خەڵکی کانزای جۆراو جۆرن

**٩٥٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، فَخِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا. وَتَجِدُونَ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ فِي هَذَا الْأَمْرِ أَكْرَهُهُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ فِيهِ. وَتَجِدُونَ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ ذَا الْوَجْهَيْنِ: الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ". (بخاري/ المناقب/ ٣٣٠٤)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "دەبینن خەڵك وەك کانزا وەهان، چاکترین کەسیان لەنافامیدا چاکترینیانە لە ئیسلامدا بەمەرجێك شارەزای

ئایین بن، دەبینن باشترین کەس بۆ بەڕێوەبردنی بەرپرسیاریی ئەم دینە ئەو کەسەیانە زۆری لاناخۆش بێت بەرلەوەی یەخەگیری بێت، دەبینن خراپترین کەس دووڕووەکانە: ئەوانەی دەچنە لای ئەم کۆمەڵە بەڕوویەکەوە و دەچنە لای کۆمەڵێکی تر بەڕوویەکی ترەوە".

## (٤٧) فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) سەد ساڵ تێنا پەڕێ لەسەر زەویدا گیاندارێك لەوانە بمێنێ کە لەسەری بووە

**٩٥١ـ عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) ذَاتَ لَيْلَةٍ صَلَاةَ الْعشَا و في آخر حيَاته، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: "أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذه؟ فَإِنَّ عَلَى رَأْس مائَة سَنَةٍ منْهَا لَا يَبْقَى ممَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْض أَحَدٌ". قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَوَهَلَ النَّاسُ في مَقَالَة رَسُول اللَّه (ﷺ) تلْكَ، فيمَا يَتَحَدَّثُونَ منْ هَذه الْأَحَاديث عَنْ مائَة سَنَةٍ، وإِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا يَبْقَى ممَّنْ هُوَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْض أَحَدٌ" يُرِيدُ بذَلكَ أَنْ يَنْخَرِمَ ذَلكَ الْقَرْنُ". (بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٧٦)**

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) شەوێك نوێژی عیشای بۆکردین لە کۆتایی ژیانیدا، کاتێ سەلامیدایەوە فەرمووی: "ئایا دەزانن لە ئەمشەوی ئێوەوە هەتا سەد ساڵی تر یەك کەس لەوانەی ئێستە لەسەر پشتی زەوین، نامێنن"؟ خەڵکەکە خراپ تێگەیشتن لەم فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە قسەیان لەم سەد ساڵە کرد، ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوەبوو یەك کەس نامێنێ لەوەی ئێستا لەسەر ڕووی زەمینە" مەبەستی ئەوە بوو ئەو جیلەی ئێستا هەیە نامێنێ.

## (٤٨) ڕێگیری لە جنێودان بەیارانی پێغەمبەر (ﷺ)

**٩٥٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي. فَوَالَّذي نَفْسِي بِيَده، لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدهمْ ولَا نَصِيفَهُ". (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٧٠)**

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "جنێو مەدەن بەیارانی من، جنێو مەدەن بەیارانی من، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە گەریەکێ لە ئێوە بەئەندازەی (أُحد) ئاڵتون بکات بەخێر، ناگات بە مشتی یەکێ لەوان و، بەنیوەی مشتێکیش".

## ( ٤٩ ) خەڵك وەك سەد وشتر وەهان كە بارە بەرێكيان تيا دەسناكەوێت

٩٥٣ــ عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ، لَا يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٣)**

(أبن عمر) (رضي الله عنهما) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: "دەبينن خەڵك وەك صەد وشتر وەهان كە پياو لەناوياندا يەك دانەى دەست نەكەوێت بە كەڵكى سوارى و باربێت". (واتە: مرۆڤى چاك و پاك كەم دەبێت).

# بەشی پەنجاو دووەم: چاکەو پەیوەندی خزمایەتی

## (١) چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایکدا

٩٥٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) فَقَالَ: مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: "أُمُّكَ". قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: "ثُمَّ أُمُّكَ". (قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: "ثُمَّ أُمُّكَ"). قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: "ثُمَّ أَبُوكَ". (بخاري/ الأدب/ ٥٦٢٦)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: کێ لەهەموو کەس شایستە ترە کە من چاکەکار بم لەگەڵیدا، فەرمووی: (دایکت). وتی: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: (پاشان دایکت). وتی: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: (پاشان دایکت). وتی: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: (پاشان باوکت).

## (٢) چاکە کردن لەگەڵ باوك و دایکدا لە عیبادەتی سوننەت لە پێشترە

٩٥٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلَّا ثَلَاثَةٌ: عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ، وصَاحِبُ جُرَيْجٍ، وكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلًا عَابِدًا، فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا، فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ، أُمِّي وصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِه، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِه، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ (وَهُوَ يُصَلِّي) فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أُمِّي وصَلَاتِي؟ فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِه، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لَا تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وجُوهِ الْمُومِسَاتِ. فَتَذَاكَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ جُرَيْجاءعِبَادَتَهُ، وكَانَتِ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ شِئْتُمْ لَأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ. قَالَ: فَتَعَرَّضَتْ لَهُ فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا، فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِه فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَحَمَلَتْ، فَلَماءلَدَتْ قَالَتْ: هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ فَاسْتَنْزَلُوهُ، وهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ، وجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ. فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا: زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ. فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ؟ فَجَاءُوا بِهِ. فَقَالَ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ، فَصَلَّى، فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِيَّ فَطَعَنَ فِي بَطْنِه وقَالَ: يَا غُلَامُ مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: فُلَانٌ الرَّاعِي. قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ ويَتَمَسَّحُونَ بِه، وقَالُوا: نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: لَا، أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ فَفَعَلُوا. وبَيْنَا صَبِيٌّ يَرْضَعُ مِنْ أُمِّه، فَمَرَّ رَجُلٌ رَاكِبٌ عَلَى دَابَّةٍ فَارِهَةٍ، وشَارَةٍ حَسَنَةٍ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذَا، فَتَرَكَ الثَّدْيَ وأَقْبَلَ إِلَيْه، فَنَظَرَ إِلَيْه،

فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهِ، فَجَعَلَ يَرْتَضِعُ -قَالَ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) وَهُوَ يَحْكِي ارْتِضَاعَهُ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ فِي فَمِهِ فَجَعَلَ يَمُصُّهَا-. قَالَ: وَمَرُّوا بِجَارِيَةٍ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا، وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، وَهِيَ تَقُولُ: حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَقَالَتْ أُمُّهُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَتَرَكَ الرَّضَاعَ وَنَظَرَ إِلَيْهَا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا، فَهُنَاكَ تَرَاجَعَا الْحَدِيثَ. فَقَالَتْ: حَلْقَى، مَرَّ رَجُلٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ، فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ! وَمَرُّوا بِهَذِهِ الْأَمَةِ وَهُمْ يَضْرِبُونَهَا وَيَقُولُونَ: زَنَيْتِ سَرَقْتِ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهَا، فَقُلْتَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا! قَالَ: إِنَّ ذَاكَ الرَّجُلَ كَانَ جَبَّارًا، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ لَا تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ، وَإِنَّ هَذِهِ: يَقُولُونَ لَهَا: زَنَيْتِ وَلَمْ تَزْنِ، وَسَرَقْتِ وَلَمْ تَسْرِقْ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٥٣)

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموويـەتی: "لـەناو لانکـەدا کـەس گفتوگۆی نەکردووە، سێ کەس نەبێ: عیسی کوڕی مریم، ئـەو منداڵـەی کـە بـەهۆی جورەیجەوە هاتە ئاخاوتن. جورەیج پیاوێکی خوا پەرست بـوو، خەڵوەتگایـەکی بـۆ خۆی دانابوو، کە بەندایـەتی تیـا دەکـرد، دایکـی هـات بـۆلای -لەکاتێکدا جـورەیج نوێژی دەکرد- و پێی وت: کوڕم جورەیج! ئەویش وتی: (لەدڵی خۆیدا) خوایـە تیـا ماووم لە نێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟. پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، دایکی گەڕایەوە، بۆ بەیانی بەهەمان شێوە، دایکی هاتەوە بۆ لای، ئەو هەر نوێژی دەکـرد، دایکـی وتـی: ئـەی جـورەیج! ئـەویش وتـی (خوایـە تیـا مـاوم لـە نێـوان دایکـم و نوێژەکەمدا؟ پاشان بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی، بۆ بەیانی سـێهەمیش هاتـەوە، ئەو هەر نوێژی دەکرد، بۆیە دایکی وتی: ئەی جورەیج. ئەویش وتی: خوایە تیاماووم لە نێوان دایکم و نوێژەکەمدا؟ بـەردەوام بـوو لەسـەر نوێژەکـەی بۆیـە دایکـی نـزای لێکردوو وتی: خوایە مەیمرێنـە هـەتا ڕوخسـاری داوێـن پیسـان دەبینێـت! ئـالێرەدا ئیسرائیلیەکان کەوتنە باسی جورەیج و عیبادەتەکەی.

ئافرەتێکی بەد ڕەوشت هەبوو، کە نموونە بوو لە جوانیدا پێی وتن: ئەگەر ئێـوە بتانـەوێت، ئـەوا مـن جـورەیج لـە خشـتە دەبـەم و پاشـان ئافرەتەکـە چـوو بـۆ لای جورەیج و، ڕێگای پێگـرت، بـەڵام جـورەیج گـوێی پێنـەدا، ئافرەتەکـە چـوو بـۆ لای شوانێك کە سەردانی خەڵوەتگای جورەیجی دەکرد، خۆی دایەدەستی و کاری داوێن

پیسی لەگەڵدا ئەنجام داو، سکی پڕ بوو، کاتێك کە منداڵەکەی بوو، وتی: ئەم منداڵە لە جورەیجە. خەڵکەکە چوون بۆلای جورەیج و، خەڵوەتگاکەیان ڕووخاند و، لە خەڵوەتگاکە دایان گرت و دەستیان کرد بە لێدانی جورەیج، وتی: چیتانە! بۆ وام لێدەکەن؟ وتیان تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەدڕەوشتە کاری داوێن پیسیت ئەنجام داوە، منداڵی بووە لە تۆ، جورەیج وتی: کوا منداڵەکە منداڵەکەیان هێنا بۆلای وتی: وازم لێبێنن هەتا نوێژ دەکەم، پاشان دەستیکرد بە نوێژکردن، کاتێك لێبوویەوە، هات بۆ لای منداڵەکە و، دەستی مالّی بە سکی منداڵەکەدا و وتی: کوڕە باوکت کێیە؟ منداڵەکە هاتە گۆ و وتی: فلان کەسی شوانە. خەڵکەکە ڕویان کردە جورەیج و، پاشان ماچیان کرد و، دەستیان بەسەردا دەهێنا، وتیان: خەڵوەتگاکەت بە زێڕ و زیو بۆ دروست دەکەینەوە، جورەیج وتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆی لێبکەنەوە — کەلە گڵ و قوڕ بوو— ئەوانیش ئەو کارەیان ئەنجام دا. (سێهەم) منداڵێکیش خەریکی شیر خواردن بوو، پیاوێکی جوانخاس کە سواری ئەسپێکی خۆشڕەو بوبوو بەوێدا تێپەڕی، دایکی منداڵەکە وتی: خوایە! ئەم کوڕەم وەك ئەم سوارە لێبکەیت، منداڵەکە، وازی لە مەمکی دایکی هێنا و ڕوی کردە پیاوەکە و، سەیری کرد و وتی: خوایە وەکو ئەوم لێنەکەیت. پاشان دەستی کردەوە بە مژینی شیری دایکی. (أبو هريرة) دەڵێ: (ئەو دیمەنەم لەبەرچاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم چیرۆکەی دەگێڕایەوە و پەنجەی شایەتمانی خستبۆوە نێو دەمیەوە و دەیمژی) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەم منداڵ و دایکە" بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕین کە بەتوندی لێیان دەدا و، دەیان وت: داوین پیسیت کردوە، دزیت کردووە، ئافرەتەکەش دەیوت: خوام بەسە و تەنها پشتم بەو قایمە، دایکی وتی: خوایە! ئەم کوڕەم وەك ئەم ئافرەتە لێنەکەیت. (جارێکی تر) منداڵەکە وازی لە شیرخواردن هێنا و سەیرێکی ئافرەتەکەی کرد و وتی: خوایە وەك ئەوم لێبکەیت، پاشان دایکی لەگەڵی کەوتە گفتوگۆ و بەسەرسامیەوە وتی: لاڵ بیت، پیاوێکی شەنگ و شۆخ تێپەڕی وتم: خوایە کوڕەکەم وەکو ئەو لێبکەیت؟ کەچی تۆ وتت: خوایە وەك ئەوم لێنەکەیت، پاشان هاتین بەسەر ئەو کەنیزەکەی کە لێیان دەدا و، پێیان دەوت: داوێن پیسی و دزیت کردووە تێپەڕین و منیش وتم: خوایە کوڕەکەم وا لێنەکەیت (کەچی تۆ بەپێچەوانەوە) وتت: خوایە وەك ئەوم لێبکەیت! منداڵەکە وتی: پیاوەکە کەسێکی تاوان بار بوو بۆیە

منيش وتم خوايه وەك ئەوم لێنەکەيت، ئافرەتەکەش کە پێيان دەوت: داوێن پيسى و دزيت کردووە، نەداوێن پيسى کردبوو، نـەدزى، بۆيـە منـيش وتم: خوايـە وەك ئـەوم لێبکەيت.

**٩٥٦-عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (ﷺ) قَالَ: أَقْبَلَ رَجُلٌ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ وَالْجِهَادِ، أَبْتَغِي الْأَجْرَ مِنَ اللَّهِ (ﷻ). قَالَ: "فَهَلْ مِنْ وَالِدَيْكَ أَحَدٌ حَيٌّ". قَالَ: نَعَمْ، بَلْ كِلَاهُمَا. قَالَ: "فَتَبْتَغِي الْأَجْرَ مِنَ اللَّهِ ﷻ". قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: "فَارْجِعْ إِلَى وَالِدَيْكَ فَأَحْسِنْ صُحْبَتَهُمَا". (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٤٢)**

(لە (عبدالله) کوڕی (عمرو) کـوڕی (عـاص) (ﷺ) وتـی:پياوێـك هـات بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ)، وتـی: پـەيمانی کـۆچ کـردن و تێکۆشـانت دەدەمـاو، مەبەستيشـم پاداشتی پەروەردگارە، پێغەمبەر فەرمووی: "ئايا دايك و باوکت کەسيان زيندووە؟" وتـی: بـەڵێ بـەڵکو هـەردووکيان زينـدوون، فـەرمووی: "پاداشـتت دەوێ لای پەروەردگار؟" وتی بەڵێ، فەرمووی: "کەواتە بگەڕێرەوە بۆلای باوك و دايکت و چاك خزمەتيان بکە و، بەباشی هەڵوسکەوتيان لەگەڵدا بکە".

## ( ٣ ) خوای گەورە ئازاردانی دايکانی قەدەغە کردووە

**٩٥٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الْأُمَّهَاتِ، وَوَأْدَ الْبَنَاتِ، وَمَنْعًا وَهَاتِ، وَكَرِهَ لَكُمْ ثَلَاثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ". (بخاري/ الاستقراض/ ٢٢٧٧)**

(مغيرة) کوڕی (شعبە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڕاستی خـوای گـەورە قەدەغـەی کـردووە لـە ئێـوە: ئـازاردانی دايکـان و سـپڵەيی و بـێ ئەمـەکی لەگەڵياندا. هەروەها زيندەبەچاڵ کردنی کچان و ئـەنجام نـەدانی ئـەرکی سەرشـان و وەرگرتنی شت بەناهەق، خوای گەورە سێ شتيشی پێناخۆشە، قسە هێنـانو بـردن و، زۆر پرسيار کردن و، ماڵ بەفيڕۆدان".

## ( ٤ ) چاکە کردن لەگەڵ کچاندا

**٩٥٨- عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا. فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (ﷺ) فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ، فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ، كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٥٠)**

(عائشـة) هاوسـەری پێغەمبـەر (ﷺ) دەڵـێ: ئافرەتێـك هـات بـۆلام و دوو كچـی لەگەڵدا بوو، داوای یارمەتی لێكردم، منیش هیچم لا نەبوو، تەنها یـەك دەنـك خورمـا نەبێت، دەنكە خورماكەم دایە و ئەویش كردی بە دوولەتەوە، دابەشی كرد لـە نێـوان هەردوو كچەكەیدا و، خۆی هیچی لێنەخوارد، پاشـان هەسـتاو لەگـەڵ دوو كچـەكەیدا ڕۆشتە دەرەوە. كاتێك پێغەمبـەر (ﷺ) گەڕایـەوە، ئـەم بەسـەرهاتەم بـۆ گێڕایـەوە، ئەویش فەرمووی: "ئەگەر كەسێك خوا تاقی بكاتەوە كچی پێببەخشێت، ئەویش بـە چاكیی ڕەفتاری لەگەڵدا بكات، ئـەوە ئـەو كچـانە دەبنـە بەربەسـت بـۆی لـە ئـاگری دۆزەخ".

## ( ٥ ) پەیوەندی خزمایەتی تەمەن درێژ دەكات

**٩٥٩ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ أَوْ يُنْسَأَ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ". (بخاري/ البيوع/ ١٩٦١)**

(أنـس) كـوڕی (مالـك) (ﷺ) دەڵـێ: بیسـتومە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) دەیفـەرموو: "هەركەسـێك پێـی خـۆش بێـت كـە ڕزق و ڕۆزی زیادبكـاتو تەمـەنی درێـژبێت و شوێنەواری چاكی بمێنێ ئەوا با سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنێ".

## ( ٦ ) پەیوەندی خزمایەتی و شوێنەواری بچڕاندنی

**٩٦٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُمْ قَامَتِ الرَّحِمُ فَقَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَمَا تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَذَاكِ لَكِ". ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: (فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ. أُولَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَى أَبْصَارَهُمْ. أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا) (محمد: ٢٢-٢٤). (بخاري/ الأدب/ ٥٦٤١)**

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "بەڕاسـتی خـوای بـاڵا دەست هەموو دروسـتكراوەكانی دروسـت كـرد، هـەتا كاتێـك كـە لێبوویـەوە، ڕەحـم هەستاو، وتی: ئەی خوایە، ئەمـە پـەناگای كەسـێكە كـە پـەنادەگرێت لـە پچـڕاندنی سـیلەی ڕەحـم، خـوا فـەرمووی بـەڵێ، ئایـا ڕازی نابیـت بـەوەی هـەر كـەس تـۆ بەسەربكاتەوە منیش دەیگەیێنم بەڕەحمەتی خۆم، ئەوەش تۆ دابڕێت، ئـەوا منـیش دای دەبڕم لە ڕەحمەتی خۆم؟ سیلەی ڕەحم وتی: بەڵێ، خوای گەورەش فەرمووی:

(دەی بڕیار بێت ئەوە بۆ تۆ بێت). پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن (کە ئەمە ماناکەیەتی): (ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لە غەزادا پشت هەڵبکەن ، یاخود دەسەڵاتتان کەوتە دەست، تۆوی ئاژاوە و فەسادو تاوان له زەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لەناوی بەرن؟! ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خوا نەفرینی لێکردوون و کەڕی کردوون و کوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا، ئایا ئەوە بۆچی ئەوانە وردبینی لە قورئاندا ناکەن و گوێی بۆ ناگرن؟ ئایا ئەوەیە دڵەکان لە ئاستی ڕاستیدا قفل دراوە؟"

**٩٦١ـ عنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ". قَالَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ: قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي قَاطِعَ رَحِمٍ. (بخاري/ الأدب/ ٥٦٣٨)**

(جوبێر) کوڕی (مطعم) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەو کەسەی کە سیلەی ڕەحم دەبڕێ ناچێتە بەهەشتەوە".

## ( ٧ ) پاداشتی یارمەتیدانی بێوەژن و هەژاران

**٩٦٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ والْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ" وأَحْسِبُهُ قَالَ: "وكَالْقَائِمِ لَا يَفْتُرُ، وكَالصَّائِمِ لَا يُفْطِرُ". (بخاري/ النفقات/ ٥٠٣٨)**

(ابو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەو کەسەی کە یارمەتی بێوەژن و هەژار دەدات، وەك ئەو کەسە وایە، کە لەپێناو خوادا جیهاد دەکات" (ڕاوی فەرموودەکە وتی) وادەزانم فەرموویشی "هەروەها وەك ئەو کەسە وایە کە بەردەوام خەریکی شەونوێژبێت و بێزارنەبێت لێی، هەروەها وەك ئەو کەسە وایە کە بەردەوام بە ڕۆژوبێتو نەیشکێنێت".

## ( ٨ ) مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت

**٩٦٣ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: "وَمَا أَعْدَدْتَ لِلسَّاعَةِ". قَالَ: حُبَّ اللَّهِ ورَسُولِه، قَالَ: "فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ". قَالَ أَنَسٌ: فَمَا فَرِحْنَا بَعْدَ الْإِسْلَامِ فَرَحًا أَشَدَّ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ (ﷺ): "فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ". قَالَ أَنَسٌ: فَأَنَا أُحِبُّ اللَّهَ ورَسُولَهُ وأَبَا بَكْرٍ وعُمَرَ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ وإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِأَعْمَالِهِمْ. (بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٤٨٥)**

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پیاوێك هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، قیامەت کەی دێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "چیت بۆ ئامادە کردوە؟" پیاوەکە وتی: خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "بەڕاستی تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت" أنس دەڵێ: لەدوای موسڵمان بوون، هیچ شتێك ئەوەندە خۆشحاڵی نەکردین، وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): "بەراستی تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدایت کە خۆشت دەوێت" أنس دەڵێ: بەڕاستی من خوا و پێغەمبەر و ئەبوبەکر و عومەرم خۆش دەوێت و، ئومێدم وایە لەگەڵ ئەواندابم، با کردەوەکانیشم وەك ئەوان نەبێت.

## ( ٩ ) خوا هەر کەسی خۆش بووێت لای بەندەکانیش خۆشەویستی دەکات

٩٦٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ (ﷺ) فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي السماء فَيَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السماء، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الْأَرْضِ. وإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ (ﷺ)، فَيَقُولُ: إِنِّي أُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضْهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي أَهْلِ السماء: إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلَانًا فَأَبْغِضُوهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُونَهُ، ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ البغضاء فِي الْأَرْضِ". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٣٧)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بەڕاستی خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشویست، ئەوا بانگی جوبرەئیل (ﷺ) دەکات و، پێی دەفەرموێت: بەڕاستی من فلانەکەسم خۆش دەوێت، دەی تۆش خۆشت بوێت. دەفەرموێت: ئیتر جوبرەئیلیش خۆشی دەوێت، پاشان لەئاسماندا جاڕدەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە فلانەکەسی خۆش دەوێت، دەی ئێوەش خۆشتان بوێت، ئیتر ئەوەی لە ئاسماندایە خۆشی دەوێت. دوای ئەوە لە زەویدا پەسەند دەکرێت".

ئەگەر خوای گەورە ڕقی لەبەندەیەك بوو، ئەوا جبريل (ﷺ) بانگ دەکات و پێی دەفەرمووێت: بەڕاستی من ڕقم لە فلانە کەسە، دەی تۆش ڕقت لێی بێت، ئیتر جبريل (ﷺ) ڕقی لێی دەبێتەوە، پاشان لە ئاسماندا جاڕ دەدات و دەڵێ: بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لە فلانەکەسە، دەی ئێوەش ڕقتان لێی بێت. ئەوانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە، دوای ئەوە ڕق و خۆش نەویستنی لە زەویدا بۆ دادەنرێت".

## ( ١٠ ) ڕۆحەکان سەربازی ڕاهێنراون

٩٦٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) –يَرْفَعُهُ– قَالَ: "النَّاسُ مَعَادِنُ كَمَعَادِنِ الْفِضَّةِ والذَّهَبِ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقُهُوا. والْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، ومَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ". (بخاري/ الانبياء/ ٣١٥٨)

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: خەڵکی کانزان، وەکو کانزای زیڕ و زیو، ئەوانەیان کەلە نەفامیدا چاك بوون، لە ئیسلامیشدا چاکن ئەگەر تێبگەن و دەرکیان هەبێت. ڕۆحەکانیش سەربازی ڕاهێنراون، ئەوانەیان یەکتری ناناسن لەیەك دوور دەکەونەوە. ئەوانەی هاوڕەوشت و هاوبیرن پێکەوە دەگونجێن، ئەوانەشیان سروشت و بیروباوەڕیان بەیەك ناخوات، لەیەکتر دوور دەکەونەوە و جیاواز دەبن".

## ( ١١ ) موسڵمان بۆ موسڵمان وەك بیناوایە

٩٦٦ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا". (بخاري/ المساجد/ ٤٦٧)

(أبو موسى) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "موسڵمان بۆ موسڵمان وەك بینا وایە، هەندێکی تر بەیەکەوە دەبەستێت". (واتە: هەمووی تێهاڵکێشە بەیەکەوە).

## ( ١٢ ) ئیمانداران یەك جەستەن لە سۆز و خۆشەویستیدا

٩٦٧ـ عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وتَرَاحُمِهِمْ وتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ والْحُمَّى". (بخاري/ الأدب/ ٥٦٦٥)

(نعمان) کوڕی (بشیر) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "نموونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی بۆ یەکتر و، هاوسۆزی و بەزەیی یەکدا وەکو یەك جەستەوان، ئەگەر ئەندامێکی ئازارێکی هەبوو ئەوا دەناڵێنێ لە تاو بێخەوی و گەرمە تا".

## ( ١٣ ) موسڵمان برای موسڵمانە، نەستەمی لێدەکات نە پشتی بەردەدات

٩٦٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "لَا تَحَاسَدُوا، ولَا تَنَاجَشُوا، ولَا تَبَاغَضُوا، ولَا تَدَابَرُوا، ولَا يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، ولَا يَخْذُلُهُ، ولَا يَحْقِرُهُ، التَّقْوَى هَاهُنَا" ويُشِيرُ

إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ "بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ: دَمُهُ ومَالُهُ وعِرْضُهُ". **(بخاري/ النكاح/ ٤٨٤٩)**

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "حەسـوودیی بەیـەکتر مەبەن، زەم بەسـەریەکتردا مەکـەن (بەمەبەسـتی بـەرز کردنـەوی نرخـی شـتەکان)، ڕقتان لەیەکتر نەبێتەوە، پشـت لەیـەکتر مەکـەن، مامەڵـە بەسـەر مامەڵـەی یـەکتردا مەکەن بەندەیەکی ڕاست و دروستی خوابن و، وەك برابن، موسڵمان برای موسڵمانە، ستەمی لێناکـات و، پشـتی بـەرنادات و، بەسـووك سـەیری ناکـات، لـەخوا ترسـان لێرەدایە" پێغەمبەر (ﷺ) سێجارئاماژەی کرد بـۆ سـنگی "بەسـە بـۆ خـراپ بـوونی مرۆڤێك، کە بەسـووك سـەیری بـرا موسـڵمانەکەی بکـات، هـەموو شـتێکی موسـڵمان لەسەر موسڵمان حەرام و قەدەغەیە، خوێنی و ماڵی و ناموسی"

## ( ١٤ ) **تکای دانیشتوان**

**٩٦٩ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا أَتَاهُ طَالِبُ حَاجَةٍ أَقْبَلَ عَلَى جُلَسَائِهِ فَقَالَ: "اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا، ولْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا أَحَبَّ". (بخاري/ الزكاة/ ١٣٦٥)**

(أبـو موسـی) (ﷺ) دەڵـێ: هـەرکاتێك خـاوەن پێویسـتیەك بهاتایەتـە خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ)، پێغەمبـەر (ﷺ) ڕووی دەکـردە دانیشـتوانی دەوری و دەیفـەرموو: "تکای بۆ بکەن بۆئەوەی پاداشتتان دەستکەوێت، با خـوای گـەورەش ئـەوەی پێـی خۆشە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ئەنجامی بدات".

## ( ١٥ ) **وێنەی هاونشینی چاك**

**٩٧٠ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ والْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ ونَافِخِ الْكِيرِ: فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً. ونَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً". (بخاري/ الذبائح والصيد/ ٥٢١٤)**

(أبو موسـی) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "نموونـەی هاونشـینی چاك و هاونشینی خراپ وەك هەڵگری میسك و کوورە دەمێن وایـە، هـەڵگری میسـك، یا بەشت دەدات، یا لێی دەکڕیت، یا بۆنێکی خۆش دێت بەسەرتا، کورەدەمێنیش یا جلەکانت دەسوتێنێت، یا بۆنێکی ناخۆش دێت بەسەرتا".

## ( ١٦ ) ئامۆژگاری بەچاکە لەگەڵ دراوسێدا

٩٧١- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيُوَرِّثَنَّهُ". **(بخاري/ الأدب/ ٥٦٦٨)**

(عائشة) (رضي الله عنها) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: "بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم دەربارەی چاکە لەگەڵ دراوسێدا، هەتا وامدەزانی دراوسێ دەبێتە میراتگری دراوسێ".

## ( ١٧ ) خوای گەورە نەرم و نیانی خۆش دەوێت

٩٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَا لَا يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ". **(بخاري/ الأدب/ ٥٦٧٨)**

(عائشة) (رضي الله عنها) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەی عائشة، بەڕاستی خوا نەرم و نیانە و نەرم ونیانیشی خۆش دەوێت، ئەوەی لە نەرم ونیانیدا دەیبەخشێت، لە توندڕەویدا نایبەخشێت لە هیچ بارودۆخێکی تریشدا نایبەخشێت".

## ( ١٨ ) پەناگرتن بەخوا لەکاتی تووڕەییدا

٩٧٣- عَنْ سُلَيْمَانُ بْنُ صُرَدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ)، فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا يَغْضَبُ وَيَحْمَرُّ وَجْهُهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (ﷺ) فَقَالَ: "إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ". فَقَامَ إِلَى الرَّجُلِ رَجُلٌ مِمَّنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) فَقَالَ: أَتَدْرِي مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) آنِفًا؟ قَالَ: "إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ ذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ". فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: أَمَجْنُونًا تَرَانِي؟ **(بخاري/ الأدب/ ٥٧٦٤)**

(سلمان کوڕی صرد) (رضي الله عنه) دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) جنێویان بەیەکتردا، یەکێکیان زۆر تووڕە دەبوو دەم و چاوی سوور هەڵدەگەڕا، پێغەمبەر (ﷺ) سەیری کابرای کرد و فەرمووی: "من وشەیەك دەزانم، ئەگەر ئەم پیاوە بیڵێت ئەوا ئەو حاڵەتەی لادەچێت: أعوذ بالله من الشیطان الرجیم.. پیاوێك لەوانەی گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو، هەستا و چوو بۆلای کابراو وتی: ئەزانی پێغەمبەر (ﷺ)

پێش تۆزێك چی فەرمووی فەرمووی: "من وشەیەك دەزانم ئەگەر ئەم پیاوە بیوتایە ئەوا ئەو حاڵەتەی لەسەر لادەچوو" أعوذ بالله من الشيطان الرجيم.. کەچی کابراوتی: بەشێتم دەزانیت؟

## ( ١٩ ) لابردنی بەردو داری سەرەڕێ

٩٧٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَرَّ رَجُلٌ بِغُصْنِ شَجَرَةٍ عَلَى ظَهْرِ طَرِيقٍ، فَقَالَ: واللَّهِ لَأُنَحِّيَنَّ هَذَا عَنِ الْمُسْلِمِينَ لَا يُؤْذِيهِمْ، فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ". **(بخاري/ الجماعة و الإمامة/ ٦٢٤)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "پیاوێك تیپەڕی بەلای چڵە دارێکدا کە چەقی ڕێگاکەی گرتبوو وتی: سوێند بەخوا دەبێت ئەو چڵەدارە لاببەم هەتا ئازاری موسڵمانان نەدات، بەوە خرایە بەهەشتەوە".

## ( ٢٠ ) ئەوەی تووشی موسڵمان دەبێت لە دڕك و نارەحەتی

٩٧٥ـ عَنِ الْأَسْوَدِ قَالَ: دَخَلَ شَبَابٌ مِنْ قُرَيْشٍ عَلَى عَائِشَةَ (ﷺ)، وهِيَ بِمِنًى، وهُمْ يَضْحَكُونَ، فَقَالَتْ: مَا يُضْحِكُكُمْ؟ قَالُوا: فُلَانٌ خَرَّ عَلَى طُنُبِ فُسْطَاطٍ، فَكَادَتْ عُنُقُهُ –أَوْ عَيْنُهُ– أَنْ تَذْهَبَ. فَقَالَتْ: لَا تَضْحَكُوا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فَمَا فَوْقَهَا إِلَّا كُتِبَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ، ومُحِيَتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ". **(بخاري/ المرضى/ ٥٣١٨)**

(أسود) دەڵێ: چەند گەنجێکی قورەیشی هاتن بۆ لای عائشە (ﷺ) لە کاتێکدا کە لە (مینا) بوو، پێدەکەنین. عائشە وتی: بەچی پێدەکەنن؟ وتیان: فلانە کەس کەوت بەسەر پەتی چادرێکدا و، خەریك بوو ملی –یان چاوی– لەدەست بدات. عائشة وتی: پێمەکەنن، من بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "هیچ موسڵمانێك نیە کە دڕکێك بچێت بە لەشیا یا لەدڕکێك زیاتر. ئەوە بەو کارە پلەیەکی بۆ دەنووسرێت و تاوانێکی لەسەر هەڵدەگیرێت".

## ( ٢١ ) ئەو شتانەی تووشی موسڵمان دەبێت لە ئازار و خەم

٩٧٦ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وأَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ وصَبٍ، ولَا نَصَبٍ، ولَا سَقَمٍ، ولَا حَزَنٍ، حَتَّى الْهَمِّ يُهَمُّهُ إِلَّا كُفِّرَ بِهِ مِنْ سَيِّئَاتِهِ". **(بخاري/ المرضى/ ٥٣١٨)**

(أبو سعيد الخدري) و(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێن: بیستومانە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر شتێك تووشی موسڵمان دەبێت لە ئازاری بەردەوام، هەروەها لە ماندووبوون و، نەخۆشی و خەفەت و غەمباریی، هەتا پەژارەیەکیش کە دڵی دادەگرێت، هەموو ئەوانە دەبن بەمایەی سڕینەوەی گوناهەکان".

**( ٢٢ ) حەسوودی و ڕق و کینە و پشت لەیەکتر کردن**

٩٧٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَا تَبَاغَضُوا، ولَا تَحَاسَدُوا، ولَا تَدَابَرُوا، وكُونُوا عِبَادَ اللَّه إِخْوَانًا. ولَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ". (بخاري/ الأدب/ ٥٧١٨)

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی وتی: "ڕق لەیەکتری هەڵمەگرن، ئێرەیی (حەسودی) بەیەکتری مەبەن، پشت لەیەکتر مەکەن، بەندەی خوا و برابن، ڕەوا نییە بۆ موسڵمان زیاد لە سێ ڕۆژ واز لە براکەی بهێنێت و قسەی لەگەڵ نەکات".

**٩٧٨ـ** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هَذَا ويُعْرِضُ هَذَا، وخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ". (بخاري/ الأدب/ ٥٧٢٧)

(أبو أيوب الأنصاري) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ڕەوانییە بۆ موسڵمان کە واز لە براکەی بهێنێت لەسەرو سێ ڕۆژەوە کە بەیەك دەگەن ئەم ڕوودەکات بەولاوە ئەویش ڕوودەکات بەملاوە، چاکترینیان ئەو کەسەیانە کە دەست پێشخەری دەکات بەسڵاو".

**( ٢٣ ) بەرگریکردن لەسیخوڕی و ململانێ و گومانی خراپ**

٩٧٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِيَّاكُمْ والظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، ولَا تَحَسَّسُواءلَا تَجَسَّسُوا، ولَا تَنَافَسُوا، ولَا تَحَاسَدُوا، ولَا تَبَاغَضُوا، ولَا تَدَابَرُوا، وكُونُوا عِبَادَ اللَّه إِخْوَانًا". (بخاري/ الأدب/ ٥٧١٧)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خۆتان بپارێزن لە گومانی خراپ، بەڕاستی بەدگومانیی زۆربەی درۆیە، بە دوای هەواڵی خەڵکدا مەڕۆن، سیخوڕی بەسەر یەکترەوە مەکەن و، ململانێی یەکتر مەکەن، ئێرەیی بەیەکتر مەبەن و، ڕقتان لەیەکتر نەبێت، پشت لەیەکتر مەکەن و، بەندەی ڕاستەقینەی خواو برای یەکترین".

## ( ٢٤ ) قسەهێنەر و قسەبەر ناچنە بەهەشتەوە

٩٨٠ـ عَنْ هَمَّامِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) فِي الْمَسْجِدِ، فَجَاء رَجُلٌ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْنَا، فَقِيلَ لِحُذَيْفَةَ: إِنَّ هَذَا يَرْفَعُ إِلَى السُّلْطَانِ اشياء. فَقَالَ حُذَيْفَةُ –إِرَادَةَ أَنْ يُسْمِعَهُ–: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: "لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ". (بخاري/ الأدب/ ٥٧٠٩)

(هُمام) کوڕی (حارث)دەڵێ: لەگەڵ (حذیفة) (رضي الله عنه) لە مزگەوتدا دانیشتبووین پیاوێك هاتەلامان و دانیشت. بە (حذیفة)یان وت ئەم پیاوە قسەدەبات بۆ کاربەدەستان. (حذیفة) وتی: –بەشێوەیەك کە کابرا گوێی لێبێت– بیستومە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: "قسەهێنو قسەبەر ناچێتە بەهەشتەوە".

## ( ٢٥ ) باسی ڕاستی و درۆ

٩٨١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا". (بخاري/ الأدب/ ٥٧٤٣)

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "پێویستە لەسەرتان ڕاستگۆ بن، بەڕاستی ڕاستگۆیی مرۆڤ ڕێنمونی دەکات بۆ چاکە، چاکەش ڕێنمویی دەکات بۆ بەهەشت، بەردەوام پیاو هەیە ڕاست دەکات و بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت، هەتا لای خوا بەڕاستگۆ تۆمار دەکرێ، خۆتان بپارێزن لە درۆ بەڕاستی درۆ مرۆڤ بەرەو کاری خراپە دەبات، کاری خراپەش مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات، بەردەوام پیاو هەیە درۆ دەکات و بەدوای درۆدا دەڕوات هەتا لای خوا بە درۆزن لە قەڵەم دەدرێت".

## ( ٢٦ ) درۆ لە چیدا دروستە

٩٨٢ـ عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ (رضي الله عنها) –وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ اللَّاتِي بَايَعْنَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)– أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) (وَهُوَ) يَقُولُ: "لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، وَيَقُولُ خَيْرًا وَيَنْمِي خَيْرًا". قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ كَذِبٌ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ: الْحَرْب، الإصلاح بين الناس، و

حديث الرجل امرأتهُ و حديث المرأةِ زوجَها. وفي رواية قالت: : ولَمْ أَسْمَعْ يُرَخَّصُ فِي شيء مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ. **(بخاري/ الصلح/ ٢٥٤٦)**

(أم كلثوم) كچی (عقبة)ی كوڕی (أبي معيط) (ﷺ) — ئەم ئافرەتـە یـەكێك بـووە لەو ئافرەتانەی كەلە سـەرەتادا كۆچـیان كـردووە و، پـەیمانیان بـە پێغەمبـەر (ﷺ) داوە —دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیفەرموو: "درۆزن نییـە ئـەوەی کـە ئاشتەوایی دەخاتە نێوان خەڵكییـەوە و، قەسـەی چـاك دەكـات، یـان قسـەی چـاك دێنێت و دەبات. (إبن شهاب) دەڵێ: نەمبیستووە ڕێگەی دابێت بە درۆ لەسێ شوێندا نەبێت: (كاتی) جـەنگ، ئاشـتەوایی لـە نێـوان خـەڵكی دا، كاتێـك پیـاو قسـە لەگـەڵ هاوسەریدا بكات یان ئافرەت قسە لەگەڵ مێردەكەیدا بكات (بەمەبەسـتی پیشـاندانی خۆشەویستی بۆ یەكتری و دروست نەبوونی كێشە).

## ڕێگریی لە بانگەوازی نەفامیی

**٩٨٣ـ** عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي غَزَاةٍ، فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: يَا لَلْأَنْصَارِ. وقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَا بَالُ دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ. فَقَالَ: "دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ". فَسَمِعَهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلُوهَا؟ واللَّهِ: لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ. قَالَ عُمَرُ: دَعْنِي أَضْرِبُ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ: "دَعْهُ، لَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ" (انظر الحديث: ١٨٣٢). **(بخاري/ المناقب/ ٣٣٣٠)**

(جـابر) (ﷺ) دەڵـێ: لەغەزایەكـدا لەگـەڵ پێغەمبـەردا (ﷺ) بـووین پیاوێـك لـە كۆچـبەرەكان شـەقێكی لـە پشـتیوانێك هەڵـدا كـابرای پشـتیوان هـاواری كـرد لـە پشتیوانیەكان، كۆچبەرەكەش هاواری برد بۆ كۆچـبەرەكان، ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەوە بۆ بانگەوازی نەفامی دەگەڕێتەوە ناوتان؟" وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێكی كۆچبەر شەقێكی هەڵدا لە پیاوێكی پشتیوان. پاشان پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "واز لەم ڕەفتارە بهێنن بەڕاستی بۆگەنـە" (عبـدالله) كـوڕی (أبـی) گـوێی لێبوو وتی: بەڕاستی كاری خۆیان كرد؟ سـوێند بـەخوا: ئەگـەر گەڕاینـەوەبۆ شـاری مەدینـە، دەسـەڵات دار و ناودارەكانمـان زەلیـل و هـەژارو نـەدارەكان دەردەكـەن. عومەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبـەر (ﷺ) وازم لێ بێنـە بـا بـدەم لـە گـەردنی ئـەم دوو

ڕووە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "وازی لێبێنە هەتا خەڵکی نەڵێن موحەممەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت"..

### ( ٢٧ ) ڕێگری لە جوێندان بە زەمانە

**٩٨٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ ونَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٤٩)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خوای گەورە دەفەرمووێت: ئادەمیزاد ئازارم دەدات و دەڵێ: داخ لەدەست زەمانە با هیچ کەسێك لە ئێوە وانەڵێت، بەڕاستی من بەدیهێنەری زەمانەم من شەو و ڕۆژەکەی بەدوای یەکدا دێنم، ئەگەر بمەوێت نایانهێڵم".

### ( ٢٨ ) ڕێگری لە ڕاکێشانی چەك لە ڕووی براکەیدا

**٩٨٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ إِلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي أَحَدُكُمْ لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ، فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ". (بخاري/ الفتن/ ٦٦٦١)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "باهیچ کەسێك لە ئێوە چەك لە ڕووی براکەیدا ڕانەکێشێت، چونکە نازانێت، لەوانەیە شەیتان لە دەستی وەربگرێت و بەهۆی ئەوەوە بکەوێتە چاڵێکی دۆزەخەوە".

### ( ٢٩ ) گرتنی سەری ڕم لە مزگەوتدا

**٩٨٦ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِي مَجْلِسٍ أَوْ سُوقٍ وبِيَدِهِ نَبْلٌ فَلْيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا، ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنِصَالِهَا". قَالَ: فَقَالَ أَبُو مُوسَى: واللَّهِ مَا مُتْنَا حَتَّى سَدَّدْنَاهَا بَعْضُنَا فِي وجُوهِ بَعْضٍ. (بخاري/ الفتن/ ٦٦٦٤)**

(ابو موسی) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر یەکێك لە ئێوە تێپەڕی بەناو کۆڕێکدا یان بەبازاڕێکدا، تیری بەدەستەوە بوو، ئەوا باسەری تیرەکانی بگرێت، دیسانەوە با سەری تیرەکانی بگرێت". أبو موسی دەڵێ: سوێند بەخوا نەمردین هەتا ڕووی تیرمان نەکردە یەکتری.

## ( ٣٠ ) ڕێگری له لێدانی دەم و چاو

٩٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "إِذَا قَاتَلَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلَا يَلْطِمَنَّ الْوَجْهَ". (بخاري/ العتق/ ٢٤٢٠)

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "ئەگەر یەكێك لە ئێوە شەری كرد لەگەڵ براكەیدا، با دەست لەدەم و چاوی نەوەشێنێت و لێی نەدات".

٩٨٨- عَنْ ابن عمر (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ وَلَا يُسْلِمُهُ، مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَا كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري/ المظالم/ ٢٣١٠)

لە (أبن عمر)ەوە (رضي الله عنه) كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێناكات و، وازی لێ ناهێنێت كەستەمی لێ بكرێت، ئەوەی پێویستیی براكەی جێبەجێ بكات، خوای گەورە پێویستییەكانی جێبەجێ دەكات. هەر كەسێكیش یارمەتی موسڵمانێك بدات و ناڕەحەتیەكی بۆ سوك بكات، ئەوە خوای گەورە ناڕەحەتیەك لە ناڕەحەتیەكانی ڕۆژی دوایی لەسەر سووك دەكات. هەر كەسێك كەموكوڕی موسڵمانێك بشارێتەوە و دەری نەخات ئەوە خوای گەورە كەموكوڕییەكانی لە ڕۆژی دواییدا دەشارێتەوە".

# بەشی پەنجاو سێیەم: ستەم

## (١) مۆڵەتدانی ستەمکار

٩٨٩ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ يُمْلِي لِلظَّالِمِ، فَإِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ". ثُمَّ قَرَأَ: (وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ) (الهود: ١٠٢). (بخاري/ التفسير/ ٤٤٠٩)

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بەڕاستی خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدات، هەرکاتێك گرتی ئیتر بەری نادات. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: (ئابەو شێوەیە تۆڵەسەندنی پەروەردگاری تۆ کاتێك تۆڵە دەسێنێت لە خەڵکی شار و دێهاتەکان لە حاڵێکدا کە یاخی و ستەم پیشەبوون، بەڕاستی تۆڵەسەندنەکەی زۆر بە ئێش و سەختە).

## (٢) ئەوانەی کە ستەمیان کردووە، نابێت سەردانی شوێنەکانیان بکەین مەگەر بەگریانەوە

٩٩٠ـ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، وهُوَ يَذْكُرُ الْحِجْرَ مَسَاكِنَ ثَمُودَ، قَالَ: سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّه: إِنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ (ﷺ) قَالَ: مَرَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) عَلَى الْحِجْرِ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ، حَذَرًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ". ثُمَّ زَجَرَ فَأَسْرَعَ حَتَّى خَلَّفَهَا. (بخاري/ الانبياء/ ٣١٩٨)

لە (أبن شهاب)ەوە لەکاتێکدا کە باسی شوێنی حجری دەکرد کە هەوارگەی ثموود بوو وتی (سالم بن عبدالله) دەڵێ: بەڕاستی عبدالله کوڕی عومەر (ﷺ) وتی: کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەسەر حجردا تێپەڕین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "مەچنە جێگا و ڕێگای ئەوانەی کە ستەمیان لەخۆیان کردووە مەگەر بەگریانەوە نەبێت" نەوەکو ئەوەی توشی ئەوان بوو توشی ئێوەش بێت. پاشان خۆیشی لە حوشترەکەی ئەدا هەتا بەپەلە ئەوێیان بەجێهێشت.

## (٣) ئاوهێنان لە بیری سزادراوان

٩٩١ـ عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ (ﷺ): أَنَّ النَّاسَ نَزَلُوا مَعَ رَسُولِ اللَّه (ﷺ) عَلَى الْحِجْرِ أَرْضِ ثَمُودَ، فَاسْتَقَوْا مِنْ آبَارِهَا وعَجَنُوا بِهِ الْعَجِينَ، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) أَنْ يُهَرِيقُوا مَا اسْتَقَوْا ويَعْلِفُوا الْإِبِلَ الْعَجِينَ، وأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْتَقُوا مِنَ الْبِئْرِ الَّتِي كَانَتْ تَرِدُهَا النَّاقَةُ. (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٠١)

(عبدالله بن عمر) (ﷺ) دەڵێ: بەڕاستی خەڵکی لەگەڵ پێغەمبەردا لـە زەوی حجـر دابەزین و ئاویان لەبیرەکانی دەرهێنا و هـەویریان پێ‌شـێلا، پاشـان پێغەمبـەر (ﷺ) فرمانی دا کە ئاوەکان بڕێژن و هەویرەکانیش بدەن بە حوشترەکان هەروەها فرمانی دا کەلەو ئاوە بهێنن کە حوشترەکە دەچێتە سەری.

# بەشی پەنجاو چوارەم: قەزا و قەدەر

## (١) باسی ئایەتی (إنَّا كُلَّ شيء خَلَقْنَاهُ بِقَدَر)

٩٩٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: جاء مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) فِي الْقَدَرِ، فَنَزَلَتْ: (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ. إِنَّا كُلَّ شيء خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) (القمر: ٤٨,٤٩).

لە (أبو هريره)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: کۆمەڵێ لە بێباوەڕەکانی قورەیش هاتن و لەگەڵ پێغەمبەردا کردیان بەهەرا و هوریا لەسەر قەدەر، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ. إِنَّا كُلَّ شيء خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ) (القمر: ٤٨,٤٩). کە ئەمە ماناکەیەت: (ڕۆژێك دێت کەلەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن لەناوئاگری دۆزەخدا پێیان دەوترێت دەبچێژن تاڵاوی دۆزەخ. بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاری کراو دروست کردووە).

## (٢) باسی قەدەر و گفتوگۆی ئادەم و موسی (عليهما السلام)

٩٩٣ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "احْتَجَّ آدَمُ ومُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلَام عِنْدَ رَبِّهِمَا، فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. قَالَ مُوسَى: أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ، ونَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِه، وأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ، وأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِه، ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الْأَرْضِ؟ فَقَالَ آدَمُ: أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِه وبِكَلَامِه، وأَعْطَاكَ الْأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شيء، وقَرَّبَكَ نَجِيًّا، فَبِكَمْ وجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ؟ قَالَ مُوسَى: بِأَرْبَعِينَ عَامًا. قَالَ آدَمُ: فَهَلْ وجَدْتَ فِيهَا: (وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى) (طه: ١٢١). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلًا كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً". قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى". (بخاري/ القدر/ ٦٢٤٠)

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "ئادەم و موسا کەوتنە گفتوگۆ لەنێوان خۆیان و لەبەردەم پەروەردگاریاندا و، ئادەم زاڵ بوو بەسەر موسادا موسا وتی: تۆ ئەو ئادەمەیت کە خوا بەدەستی توانای خۆی دروستی کردوویت و، لەڕۆحی خۆی فووی کرد بە بەرتاو کڕنووشی بە فریشتەکان برد بۆت و، لەبەهەشتدا جێگیری کردی و، پاشان بەهۆی هەڵە و تاوانتەوە، خەڵکت دابەزان بۆ سەر زەوی؟

ئادەم وتی: تۆ ئەو موسایەیت کە خوا بە هۆی پەیام و وشەکانی خۆیەوە هەڵیبژاردویت، ئەلواحی پێبەخشیت کە ڕۆشنکەرەوەی هەموو شتێکی تیایە و، نزیکی کردیتەوە و ڕزگاری کردی. بوونی تەورات چەندە پێش دروست کردنی من بووە؟ موسا وتی: بەچل ساڵ، ئادەم وتی: ئەم ئایەتەی تیابووە (وعصى آدم ربه فغوى) طه ١٢١ موسی وتی: بەڵێ، ئادەم وتی: باشە ئایا سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر کردەوەیەك کە پێش چل ساڵ لە دروست بوونم خوای گەورە نووسیویەتی".

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئادەم سەرکەوت بەسەر موسادا".

## (٣) باسی قەدەر و یاخیبوون و خۆشبەختیی

**٩٩٤ــ عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا فِي جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ، فَأَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقَعَدَ وقَعَدْنَا حَوْلَهُ ومَعَهُ مِخْصَرَةٌ، فَنَكَّسَ، فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِمِخْصَرَتِه، ثُمَّ قَالَ: "مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ، مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلَّا وقَدْ كَتَبَ اللَّهُ مَكَانَهَا مِنَ الْجَنَّةِ والنَّارِ، وإِلَّا وقَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً". قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا ونَدَعُ الْعَمَلَ؟ فَقَالَ: "مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، ومَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى عَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ. فَقَالَ: اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ. أَمَّا أَهْلُ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وأَمَّا أَهْلُ الشَّقَاوَةِ فَيُيَسَّرُونَ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى واتَّقَى وصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وأَمَّا مَنْ بَخِلَ واسْتَغْنَى وكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى). (بخاري/ الجنائز/ ١٢٩٦)**

(علي) (رضي الله عنه) دەڵێ: لەبەجێهێنانی کاری جەنازەیەك بووین لە (بەقیعی غەرقەد)دا پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنا و دانیشت و ئێمەش لەچوار دەوری دانیشتین، پێغەمبەر (ﷺ) گۆچانێکی پێبوو، سەری داخست وبە گۆچانەکەی هێڵی دەکێشا لەسەر زەوییەکە و، پاشان فەرمووی: "هیچ کەسێك لە ئێوە نییە و، هیچ نەفسێکی دروست کراو نییە، مەگەر خوای گەورە شوێنی لە بەهەشت و دۆزەخدا دیاری کردووە و، نوسراوە ئەگەر یاخی بێت یان خۆشبەخت بێت" پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەکرێت پشت ببەستین بەوەی کە بۆمان نووسراوە و واز لە کاروکردەوە بهێنین؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەو کەسەی لە دەستەی خۆشبەختان بێت، ئەوا بەرەو کاری خۆشبەختان دەڕوات، ئەوەش لە دەستەی یاخی بووان بێت، ئەوا بەرەو کاری یاخی بووان دەڕوات و، فەرمووی: "کار و

کردەوە بکەن، هەموو کەس خوا هۆکاری بۆ ئاسان کردووە کە بەرەو ئەو ڕێگایە بڕوات کە خۆی هەڵیبژاردووە، ئەوە لە تاقمی خۆشبەختان بێت ئەوا بەرەو ئەو ئاقارە دەبرێت و وای لێ دەکرێ کە کاری چاکە خوازی بکات، تاقمی خراپە کارانیش وایان لێ دەکرێ کە کاری خراپەکاریی ئەنجام بدەن. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:(فأما من أعطى..) کە ئەمە ماناکەیەتی: (جا ئەوەی (ماڵ و سامان و زانستی)دەبەخشێت و پارێزکار و لەخوا ترسە، بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاك و بەنرخی خوایی هەیە، ئەوە ڕێگەی چاکە و چاکەکاریی بۆ ئاسان دەکەین و، سەرەنجام دەیخەینە خێر و خۆشییەوە، بەڵام ئەوەی کە ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بە بێنیاز بزانێت، بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاکی خوایی و بەدرۆی بزانێت، ئەوە ئێمە ڕێبازی تەنگانە و ناخۆشی بۆ ئاسان دەکەین و سەرەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین).

# بەشی پەنجا و پێنجەم: زانست و زانیاری

## (١) هەڵگرتنی زانست و زانیاری و دەرکەوتنی نەزانین

٩٩٥ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَلَا أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي سَمِعَهُ مِنْهُ: "إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَذْهَبَ الرِّجَالُ وَتَبْقَى النِّسَاءُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً قَيِّمٌ وَاحِدٌ". (بخاري/ العلم/ ٨١)

(أنس) کوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: ئایا فەرموودەیەکتان بۆ باس نەکەم کەلە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بیستووە و کەس دوای من بۆتان باس ناکات کەلەوی بیستبێت. "بەڕاستی لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەت ئەوەیە: زانیاری بەرزدەبێتەوەو، نەزانین دەردەکەوێت، زینا و شەرواڵ پیسی بڵاودەبێتەوە، عەرەق دەخورێتەوە پیاوان دەڕۆن و ژنان دەمێننەوە، هەتاوای لێدێت پەنجا ژن یەك سەرپەرشتکاریان دەبێت".

## (٢) نەمانی زانست

٩٩٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ، وَيُقْبَضُ الْعِلْمُ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ، وَيُلْقَى الشُّحُّ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ". قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ؟ قَالَ: "الْقَتْلُ". (بخاري/ الفتن/ ٦٦٥٢)

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "زەمان نزیك دەبێتەوە و عیلمو زانیاری هەڵدەگیرێ، فتنە و ئاشوب دەردەکەوێت، بەخیلی و ڕژدی بڵاوەدەکات، هەرج زۆر دەبێت" وترا هەرج چییە؟. فەرمووی: "کوشتن".

## (٣) ئەوانەی کە بێجگە لە قورئان شتی تر دەنووسن و ترساندن لە درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)

٩٩٧ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: "إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٩)

(مغيرة) کوڕی (شعبة)(رضي الله عنه) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: "بەڕاستی درۆ بەدەم منەوە وەك درۆ بەدەم کەسەوە نییە، هەرکەسێك درۆ بەدەم منەوە بە ئەنقەست بکات، ئەوە با جێگا بۆ خۆی لە ئاگری دۆزەخدا ئامادەبکات".

٩٩٨ـ عَنْ سمرة بن جندب وعَن الْمُغيرَة بْن شُعْبَةَ (رضي الله عنه) قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "مَنْ حَدَّثَ عَنِّي بِحَدِيثٍ يُرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبِينَ". (بخاري/ الجنائز/ ١٢٢٩)

(سمرة)كوڕی (جندب) (رضي الله عنه) و (مغيرة) كوڕی (شعبة)(رضي الله عنه) دهڵێن: پێغهمبهر (صلى الله عليه وسلم) فهرموویهتی: "ههركهسێك قسهیهك بهزمانی منهوه بگێڕێتهوه و بشزانێ كه درۆیه، ئهوه خۆشی یهكێكه له درۆزنهكان".

# بەشی پەنجاو شەشەم: دۆعا و نزا

## (١) ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە

**٩٩٩-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لِلَّهِ تِسْعَةٌ وتِسْعُونَ اسْمًا، مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ". (بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٧)**

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموويـەتی: "خـوای گـەورە نەوەد و نۆ ناوی هەیە، هەرکەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە، بەڕاستی خوای گەورە تاکە و حەزی لە تاکە".

## (٢) دۆعا و نزای پێغەمبەر (ﷺ)

**١٠٠٠ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ: "اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وبِكَ آمَنْتُ، وعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وبِكَ خَاصَمْتُ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ، والْجِنُّ والْإِنْسُ يَمُوتُونَ". (بخاري/ التوحيد/ ٦٩٤٨)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "خوایە! خۆم تەسلیمی تۆ کردووە و، بڕوام تەنها بەتۆیە و، تەنها پشت بەتۆ دەبەستم و، بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە و، بەتۆ سەردەکەوم بەسەر دوژمندانمدا، خوایە! بەڕاستی من پەنا دەگرم بەگەورەیی تۆ ، هیچ خوایەك نیە تەنها تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم کە گومڕام نەکەیت، تۆ ئەو زیندووەیت کە هەرگیز نامرێت، جنۆکە و مرۆڤەکان هەموویان دەمرن".

**١٠٠١ـ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدعاء: "اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وجَهْلِي، وإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، ومَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي جِدِّي وهَزْلِي، وخَطَئِي وعَمْدِي، وكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ ومَا أَخَّرْتُ، ومَا أَسْرَرْتُ ومَا أَعْلَنْتُ، ومَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وأَنْتَ عَلَى كُلِّ شيء قَدِيرٌ". (بخاري/ الدعوات/ ٦٠٣٥)**

(أبـو موسـى أشـعري)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەم دۆعايـەی دەفـەرموو: "خوایە! لەتاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە، هەروەها لـە زیادەڕەویشم لەکارەکانمدا و، ئەوەش کە تۆ پێی زاناتریت لەمن.. خوایە! لەڕاست و گاڵتەکانم خۆش ببە، لـە

هەڵە و ئەنقەستەکانم لەوەش کەلای منە، خوایە لـەوەی کـە لەمـەو پـێش کردومـە و لەوەی لەمەودواش خۆش ببە، لەوەی کـە بـەنهێنی و ئاشـکرا کـردومن و لـەوەی کـە لەمن زاناتری پێی، تۆ پێش خەر و دواخەری و تۆ بەسەرهەموو شـتێکدا دەسـەڵاتت هەیە".

١٠٠٢ـ عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ –وَهُوَ ابْنُ صُهَيْبٍ– قَالَ: سَأَلَ قَتَادَةُ أَنَسًا (ﷺ): أَيُّ دَعْوَةٍ كَانَ يَدْعُو بِهَا النَّبِيُّ (ﷺ) أَكْثَرَ؟ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دَعْوَةٍ يَدْعُو بِهَا يَقُولُ: "اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وقِنَا عَذَابَ النَّارِ". قَالَ: وكَانَ أَنَسٌ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدَعْوَةٍ دَعَا بِهَا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ بِدعاء دَعَا بِهَا فِيهِ. **(بخاري/ الدعوات/ ٦٠٢٦)**

لە (عبدالعزين) (ﷺ) کە کوڕی (صهیب)ە وتی: قەتادە پرسیاری کرد لـە ئەنـەس (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) چ دۆعایەکی زۆرتر دەکرد، ئـەویش وتـی: زۆرتـرین دۆعـا و نزای ئەمە بوو: "خوایە لەدنیادا چاکەمان پێ ببەخشە، لەقیامەتیشدا هەر چـاکەمان پێ ببەخشەو لەئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە". ئەنەس ئەگەر بیویسـتایە یـەك دۆعـا بکات ئەوا بەم دۆعایە دۆعای دەکرد، هەروەها دۆعای زۆریشی هەر بەمەدەکرد.

## ( ٣ ) دۆعا بەوکردەوە چاکانەی بۆ خواکراوە

١٠٠٣– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "بَيْنَمَا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ يَتَمَشَّوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالًا عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ، فَادْعُوا اللَّهَ تَعَالَى بِهَا لَعَلَّ اللَّهَ يَفْرُجُهَا عَنْكُمْ. فَقَالَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ وامْرَأَتِي، ولِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ، أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا أَرَحْتُ عَلَيْهِمْ، حَلَبْتُ فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ فَسَقَيْتُهُمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وأَنَّهُ نَأَى بِي ذَاتَ يَوْمٍ الشَّجَرُ، فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا قَدْ نَامَا، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَجِئْتُ بِالْحِلَابِ فَقُمْتُ عِنْدَ رُ ووسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا مِنْ نَوْمِهِمَا، وأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ قَبْلَهُمَا، والصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ دَأْبِي ودَأْبَهُمْ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَا و وجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً نَرَى مِنْهَا السماء. فَفَرَجَ اللَّهُ مِنْهَا فُرْجَةً فَرَأَوْا مِنْهَا السماء. وقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَتْ لِيَ ابْنَةُ عَمٍّ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النساء، وطَلَبْتُ إِلَيْهَا نَفْسَهَا، فَأَبَتْ حَتَّى آتِيَهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَتَعِبْتُ حَتَّى جَمَعْتُ مِائَةَ دِينَارٍ، فَجِئْتُهَا بِهَا، فَلَماءقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اتَّقِ اللَّهَ ولَا تَفْتَحِ

الْخَاتَمَ إِلَّا بِحَقِّهِ. فَقُمْتُ عَنْهَا، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَا و وجْهِكَ، فَافْرُجْ لَنَا مِنْهَا فُرْجَةً. فَفَرَجَ لَهُمْ. وقَالَ الْآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنِّي كُنْتُ اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا. بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ فَرَقَهُ فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا ورِعَا وهَا، فَجاءنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ ولَا تَظْلِمْنِي حَقِّي. قُلْتُ: اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْبَقَرِ ورِعَائِهَا، فَخُذْهَا، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ ولَا تَسْتَهْزِئْ بِي، فَقُلْتُ: إِنِّي لَا أَسْتَهْزِئُ بِكَ، خُذْ ذَلِكَ الْبَقَرَ ورِعَا وهَا. فَأَخَذَهُ فَذَهَبَ بِهِ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَا و وجْهِكَ، فَافْرُجْ (لَنَا) مَا بَقِيَ. فَفَرَجَ اللَّهُ مَا بَقِيَ". (بخاري/ البيوع/ ٢١٠٢)

لە (عبدالله)ی کوڕی (عمر)ەوە (ﷺ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: "لەکاتێکدا سێ کەس کۆچبەر بوون بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشتن. باران دایکرد لێیان و ناچاری کردن بەوەی کە پەنا بەرنە بەر ئەشکەوتێ لە شاخێکدا. کەچی بەردێك لە شاخەکەوە بەر دەبێتەوە و دەمی ئەشکەوتەکەیان لێدەرێت. لەناو خۆیاندا بەیەکتری دەڵێن: بیر بکەنەوە بزانن لەمەوپێش چ کارێکی چاکتان لەبەرخوا ئەنجامداوە، بانگی خوای گەورەی پێبکەن. سابەڵکو خوا دەروومان لێبکاتەوە. یەکێکیان وتی: خوایە (خۆت ئەتزانی) کە باوك و دایکێکی پیر و بەساڵاچووم هەبوو لەگەڵ ژنەکەمدا. هەروەك چەند منداڵێکی بچوکم هەبوو شوانیم بۆ ئەکردن. کاتێ ئێواران دەهاتمەوە بۆلایان کە شیرەکەم ئەدۆشی پێش ئەوەی بیدەم بە منداڵەکانم بەوانم نۆش ئەکرد. ڕۆژێکیان ئێوارە درەنگ هاتمەوە ئەویش بەهۆی دوورکەوتنەوەم بە گەڵاوەراندن بۆ ئاژەڵەکانم. نەگەڕامەوە تا درەنگکەوتم. کاتێ گەڕامەوە دەبینم هەردووکیان نوستوون. منیش ئاژەڵەکانم دەدۆشی هەروەك لەوەپێش دەمدۆشی. بەکاسە شیرەکەوە بەسەر سەریانەوە ڕاوەستام. حەزم نەئەکرد لە خەو خەبەریان کەمەوە. حەزیشم نەئەکرد پێش ئەوان بیدەم بە منداڵەکان. لەگەڵ ئەوەیشدا منداڵەکان هەر زاق و زوقیان بوو لەبرسا لەبەرپێمدا. ئەمە حاڵی من و منداڵەکانم بوو تا بەیانی. جا ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ ئەنجامداوە. دەرومان لێبکەرەوە بەڕادەیەك ئاسمانی لێوە دیاربێت.. خوا کەلێنێکی بۆ کردنەوە ئاسمانیان لێوەی دەبینی. یەکێکی ترایان وتی: خوایە خۆت ئەزانی کە من کچێکی ئامۆزام هەبوو حەزم لێی بوو زۆرم خۆش ئەویست زیاد لە هەموو کەسێك کە ئافرەتی خۆش بوێت. داوام لێکرد کە بێ شەرعیم لەگەڵ بکات بەڵام ڕازی نەبوو

هەتا سەد دیناری نەدەمێ. منیش ماندوو بووم هەتا سەد دینارم کۆکردەوە و بۆم هێنا و کەوتمە نێوان دەردوو قاچیەوە (واتە ویستم کارەکە ئەنجام بدەم) ؟وتی: ئەی بەندەی خوا لە خوا بترسە و مۆری کچێنیم مەشکێنە بە حەقی خۆی نەبێ. منیش وازم لێهێنا. جا ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری تۆ ئەنجام داوە. کەلێنێکی ترمان بۆ بکەرەوە. ئیتر (بەردەکە جولا)و کەلێنێکی تریان بۆ کرایەوە. ئەوی تریان وتی: خوایە خۆت ئاگاداری کە من کرێکارێکم گرتبوو بە حەوت مەن. کاتێ ئیشەکەی تەواوکرد، وتی: حەقەکەمم بەرێ. منیش حەوت مەنەکەم پێداو ڕازی نەبوو. منیش بەردەوام هەر بۆم تۆو ئەکرد تا چەند سەر گاو شوانێکم بۆ لێگرت بۆیان. لەدوایدا هاتەوە بۆلام و وتی: لەخوا بترسە حەقم مەخۆ. وتم: بڕۆ هەموو ئەو گاگەلانە بە شوانەکانیشیانەوە هی تۆن. وتی: لەخوا بترسە و گاڵتەم پێمەکە. وتم: من گاڵتەت پێناکەم. بڕۆ ئەو گاگەلانە هەمووی بەرە بۆ خۆت بە شوانەکانیشیانەوە. ئیتر بردی و ڕۆیشت. جا خوایە ئەگەر من ئەمەم لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ کردووە ئەو دەرووەی کە ماوە بۆمان بکەرەوە. ئیتر ئەو دەرووەیشی لێکردنەوە".

**( ٤ ) دوعا لەکاتی ناڕەحەتیدا**

**١٠٠٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ ورَبُّ الْأَرْضِ ورَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ". (بخاري/ الدعوات/ ٥٩٨٦)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی ناڕەحەتیدا دەیفەرموو: "لااله الا الله العظيم الحكيم لا اله الا الله رب السماوات و رب الأرض، رب العرش الكريم".

**٦ ) دۆعا گیرایە ئەگەر پەلە نەکەیت**

**١٠٠٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "لَا يَزَالُ يُسْتَجَابُ لِلْعَبْدِ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، مَا لَمْ يَسْتَعْجِلْ". قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا الاسْتِعْجَالُ؟ قَالَ: "يَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ وقَدْ دَعَوْتُ فَلَمْ أَرَ يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَسْتَحْسِرُ عِنْدَ ذَلِكَ ويَدَعُ الدعاء". (بخاري/ الدعوات/ ٥٩٨١)**

(أبی هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بەردەوام دۆعا و نزای مرۆڤ وەردەگیرێت، مادام دوعایەکی گوناه، یان بڕینی پەیوەندی خزمایەتی نەبێت یا پەلەنەکات" وترا بە پێغەمبەر (ﷺ) پەلە کردن چییە؟ فەرمووی: "دەڵێ: دۆعام

کرد و دۆعام کرد و لێم وەرنەگیرا، ئەو کاتە واز لە دوعا دەهێنێ و داوا لەخوا ناکات".

**( ٧ ) دوعا و نزا لە کۆتایی شەودا**

١٠٠٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السماء الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ ومَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ ومَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ". **(بخاري/ التهجد/ ١٠٩٤)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ:پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە و باڵادەست هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، کاتێك کۆتایی سێیەکی شەوی دەمێنێت، دەفەرمووێت، کێ بانگم دەکات و نزام لا دەکات، هەتا بێم بەهانایەوە و نزاکەی گیرابکەم، کێ داوای شتم لێدەکات، هەتا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێدەکات هەتا لێی خۆش ببم".

**( ٨ ) دوعاکردن لەکاتی خوێندنی کەڵەشێردا**

١٠٠٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَة فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِه، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا. وإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا". **ãبخ بدء الخلق/ ٣١٢٧)**

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "هەرکاتێك گوێتان لە خوێندنی کەڵەشێر بوو، ئەوا داوای خێر وبەرەکەت لە خوا بکەن، چونکە ئەو فریشتەی بینیوە. هەرکاتێکیش گوێتان لە زەڕینی گوێدرێژ بوو ئەوا پەنا بگرن بە خوای گەورە لە خراپە و شەڕی شەیتان، چونکە ئەوە چاوی بەشەیتان کەوتووە".

**( ٩ ) ئاوات خواستنی مردن بەهۆی بەڵاوە باش نییە**

١٠٠٨ـ عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لَا بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي". **(بخاري/ الدعوات/ ٥٩٩٠)**

(أنس) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "باهیچ کەسێك لەئێوە ئاواتی مردن نەخوازێت لەبەر ئەوەی تووشی بەڵایەك بووە، ئەگەر زۆر پێویست بوو ئاوات بخوازێت، ئەوا بابڵێت "خوایە! ئەگەر ژیان چاکترە بۆم ئەوا بمژێینە، ئەگەر مردنیش چاکترە بۆم بممرێنە".

# بەشی پەنجاو حەوتەم: ذكر و یادی خوای گەورە

## (١) هاندان بۆ یادی خواو، نزیك بوونەوە لەخوا بە بەردەوامی یادكردنی

١٠٠٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي، وإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، وإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا، وإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً". (بخاري/ التوحيد/ ٦٩٧٠)

(أبـو هريـرة)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: "خـوای گـەورە دەفەرمووێت: من لەگەڵ گومانی بەندەی خۆمم، من لەگەڵیدام كاتێك یادم دەكات، ئەگەر لە دەروون و نەفسی خۆیدا یادم بكات، ئەوامنیش لەدەروون و نەفسی خۆمدا یادی دەكەم، ئەگەر لەناو كۆڕ و كۆمەڵدا یادم بكات، ئەوا منیش یادی دەكـەم لـەناو كۆڕ و كۆمەڵێكدا لەوەی خۆی چاكتربن، ئەگەر یەك بست لەمن نزیك ببێتەوە ئەوا من یەك باڵ لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر یەك باڵ لە من نزیك ببێتەوە ئـەوا مـن یـەك گـەز لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر بە ئاسایی بێت بـۆلام ، ئـەوا مـن بـەڕاكردن بـەرەو ڕووی دەچم".

## (٢) خێری كۆڕی زیكری خوا

١٠١٠ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "إِنَّ لِلَّهِ تَبَارَكَ وتَعَالَى مَلَائِكَةً سَيَّارَةً فُضُلًا، يَتَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وجَدُوا مَجْلِسًا فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ، حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وبَيْنَ السماء الدُّنْيَا، فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وصَعَدُوا إِلَى السماء. قَالَ: فَيَسْأَلُهُمُ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ وهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الْأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ، ويُكَبِّرُونَكَ، ويُهَلِّلُونَكَ، ويَحْمَدُونَكَ، ويَسْأَلُونَكَ. قَالَ: ومَاذَا يَسْأَلُونِي؟ قَالُوا: يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ. قَالَ: وهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: لَا أَيْ رَبِّ. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: ويَسْتَجِيرُونَكَ. قَالَ: ومِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي؟ قَالُوا: مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ. قَالَ: وهَلْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: لَا. قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: ويَسْتَغْفِرُونَكَ. قَالَ: فَيَقُولُ: قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا، وأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا. قَالَ: فَيَقُولُونَ: رَبِّ فِيهِمْ فُلَانٌ عَبْدٌ خَطَّا و، إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ

مَعَهُمْ. قَالَ: فَيَقُولُ: ولَهُ غَفَرْتُ، هُمُ الْقَوْمُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ". (بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٥)

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خوای بەرز و باڵا چەند فریشتەیەکی گەڕۆکی زیادەی هەیە، بەشوێن کۆڕی زیکردا دەگەڕێن، کاتێ کۆڕێکیان بینی یادی خوا دەکەن لەگەڵیان دادەنیشن بەباڵەکانیان یەکتری پەرژین دەکەن، تا وەکو نێوان خۆیان و نێوان ئاسمانی دونیا پڕدەکەن ، کاتێ ئەو کۆڕە بڵاوەی لێدەکەن ئەوانیش سەردەکەونەوە بۆ ئاسمان. دەڵێ: ئینجا خوای باڵادەست لێیان دەپرسێت لەکاتێکدا ئەو خۆی لەوان چاکتر دەزانێ "لە کوێوە هاتوون؟" دەڵێن لای چەند بەندەیەکی خۆتەوە هاتین لەسەر زەوییەوە هەمیشە (سبحان الله، الله اکبر، لااله الاالله و، الحمد لله)یان دەکرد و، لەتۆیش دەپاڕانەوە، فەرمووی: "داوای چیم لێدەکەن! دەڵێن: داوای بەهەشتەکەت دەکەن. دەفەرموێت: جا بەهەشتی منیان دیوە؟ دەڵێن: نەخێر ئەی پەروەردگار. دەفەرموێت: ئەی چۆن دەبوو ئەگەر بەهەشتەکەیان ببینیایا؟ دەڵێن: پەنایشت پێدەگرن. دەفەرموێت: لەچی پەنام پێ دەگرن؟ دەڵێن: لە ئاگرەکەت ئەی پەروەردگار. دەفەرموێت: ئایا! ئاگرەکەیان دیوم، دەڵێن: نەخێر. دەفەرموێت: ئەی چۆن دەبوو ئەگەر ئاگرەکەیان ببینایا؟ دەڵێن: داوای لێخۆشبونیشت لێدەکەن. ئەویش دەفەرموێت: ئەوا منیش لێیان خۆش بووم و، داوای چیشیان کردووە پێیان دەدەم و، پەنایشیان دەدەم لەوەی پەنام پێدەگرن ، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار فلان کەسیان تێدایە زۆر گوناهبارە و، هەر ڕابووردووە بەلایاندا، دانیشتووە لەگەڵیان. دەفەرموێت: وا لەویش خۆش بووم، ئەوانە کۆمەڵێکن دانیشتوو لەگەڵیان بەدبەخت نابێت".

## ( ٣ ) ئەو پیاو و ژنانەی یادی خوا دەکەن

١٠١١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَسِيرُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ، فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ جُمْدَانُ، فَقَالَ: "سِيرُوا، هَذَا جُمْدَانُ، سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ". قَالُوا: ومَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا والذَّاكِرَاتُ". (بخاري/ المغازي/ ٣٨٨٤)

(أبوهريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێی مەککەدا دەڕۆیشت بەلای کێوێکدا ڕابورد پێی دەوترا (جُمران) فەرمووی: "بڕۆن، ئەمە (جُمران)ە، یەکتاپەرستەکان

پێشکەوتن"، وتیان: یەکتاپەرستەکان کێن ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: "ئەو پیاوو ژنانەی کە یادی خوا زۆر دەکەن"

## ( ٤ ) دەنگ بەرزکردنەوە بە زیکرکردن

**١٠١٢ـ عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي سَفَرٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بِالتَّكْبِيرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، إِنَّكُمْ لَيْسَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا، إِنَّكُمْ تَدْعُونَ سَمِيعًا قَرِيبًا وَهُوَ مَعَكُمْ". قَالَ: وَأَنَا خَلْفَهُ، وَأَنَا أَقُولُ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، فَقَالَ: "يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ، أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ". فَقُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: "قُلْ: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ". (بخاري/ المغازي/ ٣٩٦٨)**

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) لەسەفەرێکا، خەڵکی بەدەنگی بەرزەوە (الله اکبر)یان دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "خەڵکینە لە سەرخۆبن، خۆ ئێوە بانگی کەسێ ناکەن کەڕ و نادیاربێت. ئێوە بانگی کەسێ دەکەن بیسەر و نزیکە هەمیشە لەگەڵتانە". دەڵێ: منیش لە دوایەوە بووم، دەموت: (لا حول ولاقوة الا بالله) فەرمووی: "ئەی (عبدالله)ی کوڕی (قیس)، ئایا گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی بەهەشتت پیشان نەدەم؟" وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بڵێ "لاحول ولاقوە الا بالله" واتا: هیچ هێز و دەسەڵاتێك نییە تەنها بە یارمەتی خوا نەبێت.

## ( ٥ ) ئەوەی لەکاتی خەوتندا دەوترێت

**١٠١٣ـ عَنْ عَلِي بن أبي طالب (ﷺ): أَنَّ فَاطِمَةَ (ﷺ) اشْتَكَتْ مَا تَلْقَى مِنَ الرَّحَى فِي يَدِهَا، وَأَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) سَبْيٌ، فَانْطَلَقَتْ فَلَمْ تَجِدْهُ، وَلَقِيَتْ عَائِشَةَ (ﷺ) فَأَخْبَرَتْهَا، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) أَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ بِمَجِي وَ فَاطِمَةَ (ﷺ) إِلَيْهَا. فَجَاءَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَيْنَا وَقَدْ أَخَذْنَا مَضَاجِعَنَا، فَذَهَبْنَا نَقُومُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (ﷺ): "عَلَى مَكَانِكُمَا". فَقَعَدَ بَيْنَنَا، حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمِهِ عَلَى صَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: "أَلَا أُعَلِّمُكُمَا خَيْرًا مِمَّا سَأَلْتُمَا؟ إِذَا أَخَذْتُمَا مَضَاجِعَكُمَا: أَنْ تُكَبِّرَا اللَّهَ أَرْبَعًا وَثَلَاثِينَ، وَتُسَبِّحَاهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، وَتَحْمَدَاهُ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ، فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمَا مِنْ خَادِمٍ". (وَزَادَ فِي أخرى: قَالَ عَلِيٌّ: مَا تَرَكْتُهُ مُنْذُ سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ (ﷺ). قِيلَ لَهُ: وَلَا لَيْلَةَ صِفِّينَ؟ قَالَ: وَلَا لَيْلَةَ صِفِّينَ). (بخاري/ الخمس/ ٢٩٤٥)**

(علـي)ی کـوڕی (أبـو طالـب) (ﷺ) دەڵـێ: (فاطمـة) (ﷺ) دادو بێـداد دەکـات لەدەست ئەوەی کە تووشی دەست و پلی دێت لە زۆری دەستاڕکردن، پێغەمبـەریش (ﷺ) چـەند دیلێکـی دەسـت کـەوت دەبێـت، ئـەویش دەچـێت بـۆ خزمـەتی و نایدۆزێتـەوە، دەگـات بـە عائشـة (ﷺ)، و باسـەکەی لا دەکاتـەوە، کاتـێ پێغەمبـەر (ﷺ) دێتەوە (عائشه) (ﷺ) باسی هاتنی (فاطمة)(ﷺ)ی بـۆ دەکـات، پێغەمبـەریش (ﷺ) هـات بۆلامـان لەکاتێکـدا ئێمـە چـووبووینە نـاو جێگـاوە، ویسـتمان هەسـتین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "لە شوێنی خۆتان بـن" لـە نێوانمانـدا دانیشـت، تـاوەکو هەستم بە ساردی پێی کرد لەسەر سـینگم، فـەرمووی: "ئـەرێ شـتێکتان فێرنەکـەم باشتر بێت لەوەی کە داواتان کردبوو؟ کاتێ چوونە نـاو نوێنـەوە: سـیو چـوار جـار (الله أكبر)و، سیو سێ جار (سبحان الله) و سیو سێجار (الحمد لله) بکەن، ئـەوە لـە خزمەتگوزار باشترە بۆتان. (لەڕیوایەتێکی تردا، علی وتی: لەوسـاوە لـە پێغەمبـەرم بیستوە ئەمانـەم تـەرك نـەکردووە، پێـی وتـرا: شـەوی (صـفین)یـش؟ وتـی: شـەوی (صفين)یش).

١٠١٤ـ عَنْ الْبراء بْنُ عَازِبٍ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وضُو وكَ للصَّلَاة، ثُمَّ اضْطَجعْ عَلَى شقّكَ الْأَيْمَن، ثُمَّ قُل: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ وجْهِي إِلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً ورَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجاءلَا مَنْجَا منْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بكتَابكَ الَّذي أَنْزَلْتَ، وبنَبيِّكَ الَّذي أَرْسَلْتَ. واجْعَلْهُنَّ منْ آخر كَلَامكَ، فَإِنْ مُتَّ منْ لَيْلَتكَ مُتَّ وأَنْتَ عَلَى الْفطْرَة". قَالَ: فَرَدَّدْتُهُنَّ لأَسْتَذْكرَهُنَّ، فَقُلْتُ: آمَنْتُ بِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ: "قُلْ: آمَنْتُ بِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ". (بخاري/ الوضوء/ ٢٤٤)

(البراء)ی کوڕی (عازب) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "کاتـێ ویستت بچیتە سەر جێگە دەست نوێژبگرە وەك چۆن دەست نوێژ دەگریت بۆ نوێـژ، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕاکشێ، پاشان بڵێ: خوایە من ڕووی ڕووخسـارم کـەچ کـرد بەرەولای تۆو، کاروباری خۆم حەواڵەی تۆ کرد و، پشت و پەنام دابەتۆو، بەئومێـدی (بەزەیی)تۆو، (ترسان) لە سزای تۆ، هیچ پەناو داڵدەیەك نییە لـە تـۆ مەگـەر بـەرەو لای تۆ نەبێت، باوەڕم هەیە بەو قورئانەی کە داتبەزاندووە و بەو پێغەمبـەرەیش کـە ڕەوانەت کردووە. با ئەمانە دواهەمین قسەبێت، ئەگەر لـەو شـەوەتدا بمریت لەسـەر

سروشتی پاك دەمریت". دەڵێ: منیش دووبارەم كردنەوە تا لەبەریان كەم، وتم: باوەڕم هێنابەو (نێردراوە)ی كەناردووتە، فەرمووی: "بلێ: باوەڕم هێنا بەو پێغەمبەرەی كە ناردووتە".

١٠١٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، وَلْيُسَمِّ اللَّهَ، فَإِنَّهُ لَا يَعْلَمُ مَا خَلَفَهُ بَعْدَهُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَلْيَقُلْ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبِّي، بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ". **(بخاري/ الدعوات/ ٥٩٦١)**

(أبو هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "كاتێ یەكێكتان چووە ناو جێگای نووستنەوە، با چمكێكی كراسەكەی بگرێت و، جێگاكەی پێبتەكێنێ و ناوی خوا ببات، چونكە خۆ ئەو نازانێ پاش خۆی چی هاتۆتە ناو جێگاكەی، هەر كاتێ ویستی بنوێت با لەسەر لای ڕاستی ڕاكشێت و بلێت: پەروەردگارم خوایە گیان پاك و بێگەری بۆ تۆ، بە پشتیوان تۆ لاتەنیشتم دادەنێم، بەپشتیوانی تۆیش بەرزی دەكەمەوە، ئەگەر گیانی منت گرتە لای خۆت لێی خۆش بە، ئەگەر بەریشتدا بیپارێزە بەوەی كە بەندە باشەكانی خۆتی پێدەپارێزیت".

## ( ٦ ) خێری ( سبحان الله ) كردن

١٠١٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ (ﷻ): سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ". **(بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٣)**

(أبي هريرة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "دوو وشە هەن سوكن لەسەر زمان قورسن لە تەرازوودا، خۆشەویستن لەلای خوای گەورە و میهرەبان: پاك و بێگەردیی و سوپاس و ستایش بۆ خوا، پاك و بێگەردیی بۆ خواوەندی مەزن".

## ( ٧ ) كەسێ لە ڕۆژێكدا سەد جار بلێت ( لا اله الاّ الله وحده لا شريك له )

١٠١٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "مَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ

حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ (ذَلِكَ) حَتَّى يُمْسِيَ، وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. وَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ". (بخاري/ الدعوات/ ٦٠٤٢)

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموويـەتی: "هـەر کـەس لـە ڕۆژێکدا سەد جـار بڵـێ: هـيچ پەرسـتراوێك نيـە جگـە لـە (الله) نـەبێت تـاك و تـەنياو بێهاوەڵە، موڵك و دەسەڵات هەر بۆ ئەوە و سوپاس و ستايشيش هەر شايانی ئـەوە، ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانايە، ئەوە وەك ئەوە وايە دە بەندەی ئازاد کردبێـت و، سەد چاکەی بۆ دەنوسرێت و سەد گوناهی لەسەر لادەبرێت و دەبێتە سـپێر بـۆی لە شەيتان لەو ڕۆژەيدا تا ئێوارە، کەس چاکتری نەکردووە لەوەی ئـەو کردوويـەتی، مەگەر کەسێك زياتر لەوەی کردبێت. هەر کەسيش لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵـێ: پـاك و بێگەردی بۆ خوا سوپاس و سـتايش بـۆ خـوا، گوناهـەکانی لێهەڵدەوەرێت بـاوەکوو کەفی دەرياش وابێت".

# بەشی پەنجاو هەشتەم: پەناگرتن بەخوا

## (١) پەناگرتن بە خوا لە شەڕی فیتنەو ئاشوب

١٠١٨-عنْ عَائِشَةَ (﵂): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) كَانَ يَدْعُو بِهؤلاء الدَّعوَات: "اللَّهُمَّ فَإِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وعَذَابِ النَّارِ، وفِتْنَةِ الْقَبْرِ وعَذَابِ الْقَبْرِ، ومِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى ومِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِماءِ الثَّلْجِ والْبَرَدِ، ونَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وبَاعِدْ بَيْنِي وبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ والْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ فَإِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ والْهَرَمِ، والْمَأْثَمِ والْمَغْرَمِ". **(بخاري/ الدعوات/ ٦٠١٦)**

(عائشه) (﵂) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ئەم نزایانەی دەکرد: "خوایە من پەنات پێدەگرم لە بەڵای ئاگر و سزای ئاگر و، بەڵای گۆڕ و سزای گۆڕ و، زیانی بەڵای دەوڵەمەندیی و زیانی بەڵای هەژاریی و، پەنات پێدەگرم لەزیانی بەڵای دەجالی گەڕیدە، ئەی خوایە هەڵە و تاوانەکانم بەبەفراو و تەرزە بشۆ و دڵودەروونم خاوێن کەرەوە لەهەڵەو تاوان وەك چۆن کراسی سپی لە چڵك و پیسی خاوێن دەبێتەوە، نێوان من و هەڵەکانم لێك دوور خەرەوە وەك چۆن نێوان خۆرهەڵات و خۆر ئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە من پەنات پێدەگرم لە تەمەڵی و تەوەزەلی و پیری و پەککەوتەییو تاوان و کاری قەرز و قۆڵە".

## (٢) پەناگرتن بەخوا لەدەستەوەستانی و تەمەڵی

١٠١٩ــ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (﵁) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ والْكَسَلِ، والْجُبْنِ والْهَرَمِ والْبُخْلِ، وأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، ومِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا والْمَمَاتِ". **(بخاري/ الدعوات/ ٢٦٦٨)**

(أنس)ی کوڕی (مالك) (﵁) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو: "خوایە من پەنات پێدەگرم لە بێدەسەلاتی و تەمەڵی و لە ترسنۆکی و پیریی و چاوچنۆکی و، پەنات پێدەگرم لە سزای گۆڕ و، لە بەڵای ژیان و مردن".

## (٣) پەناگرتن بەخوا لە چارە ڕەشی و بەدبەختی

١٠٢٠ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (﵁): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ سُو و الْقَضَا و، ومِنْ دَرَكِ الشَّقَا و، ومِنْ شَمَاتَةِ الْأَعْدَا و، ومِنْ جَهْدِ الْبَلَا و. قَالَ عَمْرٌو فِي حَدِيثِهِ: قَالَ سُفْيَانُ: أَشُكُّ أَنِّي زِدْتُ واحِدَةً مِنْهَا. **(بخاري/ الدعوات/ ٥٩٨٧)**

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) پەنای دەگرت بەخوا لە چارەڕەشی و بەدبەختی و لەهەرشتێك دەبێتە مایەی دڵخۆشی و شاگەشکەیی دوژمنان و، لەهەر بەلایەکی ئەوتۆ کە کەس دەرەقەتی نەیەت، (عمرو) لە ڕیوایەتەکەیدا دەڵێ: (سفیان) وتی: من واگومان دەبەم کە خۆم یەکێکیانم لێزیاد کردبێت.

## (٤) نزای خێرکردن بۆ کەسی پژمیو ئەگەر سوپاسی خوا بکات

١٠٢١ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: عَطَسَ عِنْدَ النَّبِيِّ (ﷺ) رَجُلَانِ، فَشَمَّتَ أَحَدَهُماءلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقَالَ الَّذي لَمْ يُشَمِّتْهُ، عَطَسَ فُلَانٌ فَشَمَّتَّهُ وعَطَسْتُ أَنَا فَلَمْ تُشَمِّتْنِي؟ قَالَ: "إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وإِنَّكَ لَمْ تَحْمَدِ اللَّهَ ﷻ". **(بخاري/ الأدب/ ٥٨٧١)**

(أنس) کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: دوو پیاو لای پێغەمبەرا (ﷺ) پژمین، دۆعای بۆ یەکێکیان کرد، بەلام بۆ ئەوی تریانی نەکرد، ئەوەیان کە دۆعای بۆ نەکرد وتی: فلان پژمی دۆعات بۆ کرد منیش پژمیم دۆعات بۆ نەکردم؟ فەرمووی: "چونکە ئەو سوپاسی خوای کرد، بەلام تۆ سوپاسی خوای مەزنت نەکرد".

# بەشی پەنجاو نۆیەم: تەوبە کردن

## (١) هاندان لەسەر تەوبەکردن

١٠٢٢ـ عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ أَعُودُهُ وهُوَ مَرِيضٌ، فَحَدَّثَنَا بِحَدِيثَيْنِ: حَدِيثًا عَنْ نَفْسِهِ، وحَدِيثًا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ مِنْ رَجُلٍ فِي أَرْضٍ دَوِّيَّةٍ مَهْلَكَةٍ، مَعَهُ رَاحِلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وشَرَابُهُ، فَنَامَ، فَاسْتَيْقَظَ وقَدْ ذَهَبَتْ، فَطَلَبَهَا حَتَّى أَدْرَكَهُ الْعَطَشُ، ثُمَّ قَالَ: أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِيَ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ فَأَنَامُ حَتَّى أَمُوتَ، فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى سَاعِدِهِ لِيَمُوتَ، فَاسْتَيْقَظَ وعِنْدَهُ رَاحِلَتُهُ وعَلَيْهَا زَادُهُ وطَعَامُهُ وشَرَابُهُ، فَاللَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ الْعَبْدِ الْمُؤْمِنِ مِنْ هَذَا بِرَاحِلَتِهِ وزَادِهِ". **(بخاري/ الدعوات/ ٥٩٤٩)**

(حارث)ی کوڕی (سُوَید) دەڵێ: چووم بۆ سەردانی (عبدالله) (ﷺ) کەنەخۆش بوو، دوو قسەی بۆکردین، قسەیەکیان هی خۆی بوو، قسەیەکیشیان لە پێغەمبەرەوە ، وتی: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "بەڕاستی خوا زۆر دڵخۆشترە لە تەوبەی بەندەیەکی باوەڕداری خۆی لەپیاوێك لەبیابانێکی چۆڵی فەوتێنەردا کە وڵاخی سواریەکەی خۆیی پێ بێت، خۆراك و خواردنەوەکەیی لەسەر بێت، خەوی پیابکەوێت، کاتێ خەبەری دەبێتەوە ) سەیر بکات( وڵاخەکەی ڕۆیشتووە، ئەویش بە شوێنیدا بگەڕێت تا تینوێتی زۆری بۆ دێنێت، پاشان لەبەرخۆیەوە بڵێت: ئەگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تیا بووم ئەخەومەوە تا دەمرم. سەرینێتەوە سەر باڵی تا بمرێت، بەڵام کاتێ خەبەری دەبێتەوە سەیر بکات وا وڵاخەکەی بەخواردن و خواردنەوەکەیەوە بەلایەوە وەستاوە، دەی خوا زۆر خۆشحاڵترە بەتەوبەی بەندەی باوەڕدار لەو پیاوە بە وڵاخ و توێشووەکەی".

## (٢) راستگۆیی لەتەوبەداو گوتەی خوای گەورە (وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا)

١٠٢٣ـ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: ثُمَّ غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَزْوَةَ تَبُوكَ، وهُوَ يُرِيدُ الرُّومَ ونَصَارَى الْعَرَبِ بِالشَّامِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبٍ –وكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ– قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، قَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا قَطُّ إِلَّا فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، غَيْرَ أَنِّي

قَدْ تَخَلَّفْتُ فِي غَزْوَةِ بَدْرٍ. وَلَمْ يُعَاتِبْ أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْهُ إِنَّمَا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَالْمُسْلِمُونَ يُرِيدُونَ عِيرَ قُرَيْشٍ، حَتَّى جَمَعَ اللَّهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهِمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ، وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ حِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الْإِسْلَامِ، وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ، وَإِنْ كَانَتْ بَدْرٌ أَذْكَرَ فِي النَّاسِ مِنْهَا، وَكَانَ مِنْ خَبَرِي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ: أَنِّي لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلَا أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُ قَبْلَهَا رَاحِلَتَيْنِ قَطُّ حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ، فَغَزَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي حَرٍّ شَدِيدٍ، وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا، وَاسْتَقْبَلَ عَدُوًّا كَثِيرًا، فَجَلَا لِلْمُسْلِمِينَ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ غَزْوِهِمْ، فَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِمِ الَّذِي يُرِيدُ، وَالْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كَثِيرٌ، وَلَا يَجْمَعُهُمْ كِتَابُ حَافِظٍ -يُرِيدُ بِذَلِكَ الدِّيوَانَ- قَالَ كَعْبٌ: فَقَلَّ رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ يَظُنُّ أَنَّ ذَلِكَ سَيَخْفَى لَهُ، مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيٌ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. وَغَزَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) تِلْكَ الْغَزْوَةَ حِينَ طَابَتِ الثِّمَارُ وَالظِّلَالُ فَأَنَا إِلَيْهَا أَصْعَرُ، فَتَجَهَّزَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَطَفِقْتُ أَغْدُو لِكَيْ أَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ، فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، وَأَقُولُ فِي نَفْسِي: أَنَا قَادِرٌ عَلَى ذَلِكَ إِذَا أَرَدْتُ، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى اسْتَمَرَّ بِالنَّاسِ الْجِدُّ، فَأَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) غَادِيًا وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ، وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جَهَازِي شَيْئًا، ثُمَّ غَدَوْتُ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا، فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى أَسْرَعُوا وَتَفَارَطَ الْغَزْوُ، فَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ فَأُدْرِكَهُمْ، فَيَا لَيْتَنِي فَعَلْتُ، ثُمَّ لَمْ يُقَدَّرْ ذَلِكَ لِي، فَطَفِقْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَحْزُنُنِي أَنِّي لَا أَرَى لِي أُسْوَةً إِلَّا رَجُلًا مَغْمُوصًا عَلَيْهِ فِي النِّفَاقِ، أَوْ رَجُلًا مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ مِنَ الضُّعَفَا وَ. وَلَمْ يَذْكُرْنِي (رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)) حَتَّى بَلَغَ تَبُوكَ، فَقَالَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْقَوْمِ بِتَبُوكَ: "مَا فَعَلَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ". قَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، حَبَسَهُ بُرْدَاهُ وَالنَّظَرُ فِي عِطْفَيْهِ. فَقَالَ لَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: بِئْسَ مَا قُلْتَ، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا. فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ رَأَى رَجُلًا مُبَيِّضًا يَزُولُ بِهِ السَّرَابُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "كُنْ أَبَا خَيْثَمَةَ". فَإِذَا هُوَ أَبُو خَيْثَمَةَ الْأَنْصَارِيُّ. وَهُوَ الَّذِي تَصَدَّقَ بِصَاعِ التَّمْرِ حِينَ لَمَزَهُ الْمُنَافِقُونَ. فَقَالَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ: فَلَمَّا بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ تَوَجَّهَ قَافِلًا مِنْ تَبُوكَ حَضَرَنِي بَثِّي، فَطَفِقْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ: بِمَ أَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَدًا؟ وَأَسْتَعِينُ عَلَى ذَلِكَ كُلَّ ذِي رَأْيٍ مِنْ أَهْلِي، فَلَمَّا قِيلَ لِي: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَدْ أَظَلَّ قَادِمًا، زَاحَ عَنِّي الْبَاطِلُ، حَتَّى عَرَفْتُ أَنِّي لَنْ أَنْجُوَ مِنْهُ بِشَيءٍ أَبَدًا، فَأَجْمَعْتُ صِدْقَهُ، وَصَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَادِمًا، وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ

بالْمَسْجِدِ فَرَكَعَ فيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ، فَلَمَّا فَعَلَ ذَلِكَ جَاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ فَطَفِقُوا يَعْتَذِرُونَ إِلَيْهِ، وَيَحْلِفُونَ لَهُ، وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلًا، فَقَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَانِيَتَهُمْ وَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَوَكَلَ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللَّهِ، حَتَّى جِئْتُ، فَلَمَّا سَلَّمْتُ تَبَسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ ثُمَّ قَالَ: "تَعَالَ". فَجِئْتُ أَمْشِي حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ لِي: "مَا خَلَّفَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ قَد ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي وَاللَّهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا لَرَأَيْتُ أَنِّي سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ، وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلًا، وَلَكِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثَ كَذِبٍ تَرْضَى بِهِ عَنِّي لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ، وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثَ صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ إِنِّي لَأَرْجُو فِيهِ عُقْبَى اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَانَ لِي عُذْرٌ، وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلَا أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقَ، فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ". فَقُمْتُ، وَثَارَ رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَاتَّبَعُونِي، فَقَالُوا لِي: وَاللَّهِ مَا عَلِمْنَاكَ أَذْنَبْتَ ذَنْبًا قَبْلَ هَذَا، لَقَدْ عَجَزْتَ فِي أَنْ لَا تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِمَا اعْتَذَرَ بِهِ إِلَيْهِ الْمُخَلَّفُونَ، فَقَدْ كَانَ كَافِيَكَ ذَنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) لَكَ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا زَالُوا يُؤَنِّبُونَنِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَأُكَذِّبَ نَفْسِي، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذَا مَعِي مِنْ أَحَدٍ؟ قَالُوا: نَعَمْ، لَقِيَهُ مَعَكَ رَجُلَانِ قَالَا مِثْلَ مَا قُلْتَ فَقِيلَ لَهُمَا مِثْلُ مَا قِيلَ لَكَ. قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعَةَ الْعَامِرِيُّ، وَهِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ. قَالَ: فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ قَدْ شَهِدَا بَدْرًا، فِيهِمَا أُسْوَةٌ. قَالَ: فَمَضَيْتُ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي. قَالَ: وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلَامِنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ. قَالَ: فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ، وَقَالَ: تَغَيَّرُوا لَنَا حَتَّى تَنَكَّرَتْ لِي فِي نَفْسِيَ الْأَرْضُ، فَمَا هِيَ بِالْأَرْضِ الَّتِي أَعْرِفُ، فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً، فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَاءقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ، وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ، فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَشْهَدُ الصَّلَاةَ وَأَطُوفُ فِي الْأَسْوَاقِ، وَلَا يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ، وَآتِي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَأَقُولُ فِي نَفْسِي: هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلَامِ أَمْ لَا؟ ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهُ وَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ، فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلَاتِي نَظَرَ إِلَيَّ، وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي، حَتَّى إِذَا طَالَ ذَلِكَ عَلَيَّ مِنْ جَفْوَةِ الْمُسْلِمِينَ مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ، وَهُوَ ابْنُ عَمِّي وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ السَّلَامَ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا قَتَادَةَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَنَّ أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ؟ قَالَ: فَسَكَتَ، فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ فَسَكَتَ. فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ، فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَفَاضَتْ عَيْنَايَ. وَتَوَلَّيْتُ

حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ، فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي فِي سُوقِ الْمَدِينَةِ إِذَا نَبَطِيٌّ مِنْ نَبَطِ أَهْلِ الشَّامِ، مِمَّنْ قَدِمَ بِالطَّعَامِ يَبِيعُهُ بِالْمَدِينَةِ، يَقُولُ: مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ؟ قَالَ: فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ إِلَيَّ حَتَّى جَاءَنِي، فَدَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ، وَكُنْتُ كَاتِبًا، فَقَرَأْتُهُ. فَإِذَا فِيهِ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنَا أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ، وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللَّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلَا مَضْيَعَةٍ، فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ. قَالَ: فَقُلْتُ حِينَ قَرَأْتُهَا: وَهَذِهِ أَيْضًا مِنَ الْبَلَاءِ، فَتَيَامَمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهَا بِهَا، حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ مِنَ الْخَمْسِينَ، وَاسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ، إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَأْتِينِي فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ. قَالَ: فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لَا، بَلِ اعْتَزِلْهَا فَلَا تَقْرَبَنَّهَا. قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ بِمِثْلِ ذَلِكَ، قَالَ: فَقُلْتُ لِامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِي هَذَا الْأَمْرِ، قَالَ: فَجَاءَتِ امْرَأَةُ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ شَيْخٌ ضَائِعٌ، لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ، فَهَلْ تَكْرَهُ أَنْ أَخْدُمَهُ؟ قَالَ: "لَا، وَلَكِنْ لَا يَقْرَبَنَّكِ". فَقَالَتْ: إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا بِهِ حَرَكَةٌ إِلَى شَيْءٍ، وَ وَاللَّهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ إِلَى يَوْمِهِ هَذَا. قَالَ: فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي: لَوِ اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِي امْرَأَتِكَ، فَقَدْ أَذِنَ لِامْرَأَةِ هِلَالِ بْنِ أُمَيَّةَ أَنْ تَخْدُمَهُ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: لَا أَسْتَأْذِنُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) وَمَا يُدْرِينِي مَاذَا يَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ؟ قَالَ: فَلَبِثْتُ بِذَلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ، فَكَمَلَ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نُهِيَ عَنْ كَلَامِنَا، قَالَ: ثُمَّ صَلَّيْتُ صَلَاةَ الْفَجْرِ صَبَاحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَّا، قَدْ ضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي وَضَاقَتْ عَلَيَّ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ، سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى سَلْعٍ يَقُولُ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ أَبْشِرْ، قَالَ: فَخَرَرْتُ سَاجِدًا، وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جَاءَ فَرَجٌ، **(قَالَ):** فَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) النَّاسَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلَاةَ الْفَجْرِ، فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا. فَذَهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ، وَرَكَضَ رَجُلٌ إِلَيَّ فَرَسًا، وَسَعَى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ قِبَلِي وَأَوْفَى الْجَبَلَ فَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنَ الْفَرَسِ، فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي فَنَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ فَكَسَوْتُهُمَا إِيَّاهُ بِبِشَارَتِهِ، وَاللَّهِ مَا أَمْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذٍ، وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ فَلَبِسْتُهُمَا، فَانْطَلَقْتُ أَتَأَمَّمُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، يَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجًا فَوْجًا يُهَنِّئُونِي بِالتَّوْبَةِ، وَيَقُولُونَ: لِتَهْنِئْكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ، حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَحَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّأَنِي، وَاللَّهِ مَا قَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرُهُ. قَالَ: فَكَانَ

كَعْبٌ لَا يَنْسَاهَا لِطَلْحَةَ، قَالَ كَعْبٌ: فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ –وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنَ السُّرُورِ– وَيَقُولُ: "أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ". قَالَ: فَقُلْتُ: أَمِنْ عِنْدِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ؟ فَقَالَ: "لَا بَلْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ". وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ كَأَنَّ وَجْهَهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ، قَالَ: وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ. قَالَ فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ (ﷺ). فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَمْسِكْ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ". قَالَ: فَقُلْتُ: فَإِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِيَ الَّذِي بِخَيْبَرَ، قَالَ: وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَنْجَانِي بِالصِّدْقِ، وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ لَا أُحَدِّثَ إِلَّا صِدْقًا مَا بَقِيتُ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ أَنَّ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَبْلَاهُ اللَّهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيثِ، مُنْذُ ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) **(إِلَى يَوْمِي هَذَا)** أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلَانِي اللَّهُ (ﷻ) بِهِ، وَاللَّهِ مَا تَعَمَّدْتُ كَذْبَةً مُنْذُ قُلْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى يَوْمِي هَذَا، وَإِنِّي لَأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِي اللَّهُ فِيمَا بَقِيَ. قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ) حتى باغ: (إِنَّهُ بِهِمْ رَ ووفٌ رَحِيمٌ. وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ) حَتَّى بَلَغَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ) **(التوبة:: ١١٧–١١٩)**. قَالَ كَعْبٌ: وَاللَّهِ مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ نِعْمَةٍ قَطُّ –بَعْدَ إِذْ هَدَانِي اللَّهُ لِلْإِسْلَامِ– أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) أَنْ لَا أَكُونَ كَذَبْتُهُ، فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا، إِنَّ اللَّهَ قَالَ لِلَّذِينَ كَذَبُوا حِينَ أَنْزَلَ الْوَحْيَ شَرَّ مَا قَالَ لِأَحَدٍ، وَقَالَ اللَّهُ (ﷻ): (سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَا و بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ) **(التوبة: ٩٥)** قَالَ كَعْبٌ: كُنَّا خُلِّفْنَا أَيُّهَا الثَّلَاثَةُ عَنْ أَمْرِ أُولَئِكَ الَّذِينَ قَبِلَ مِنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ حَلَفُوا لَهُ، فَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ، وَأَرْجَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَمْرَنَا حَتَّى قَضَى فِيهِ، فَبِذَلِكَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا) وَلَيْسَ الَّذِي ذَكَرَ **(اللَّهُ)** مِمَّا خُلِّفْنَا تَخَلُّفَنَا عَنِ الْغَزْوِ، وَإِنَّمَا هُوَ تَخْلِيفُهُ إِيَّانَا، وَإِرْجَاؤُهُ أَمْرَنَا عَمَّنْ حَلَفَ لَهُ وَاعْتَذَرَ إِلَيْهِ، فَقَبِلَ مِنْهُ. **(بخاري/ المغازي/ ٤١٥٦)**

(أبن شهاب) دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) غەزای (تبووك)ی کرد، کە ڕۆم وعەرەبە گاورەکانی شامی مەبەست بوو، دەڵێت: (عبدالرحمن)ی کوڕی (عبدالله) ی کوڕی (کعب)ی کوڕی (مالك) هەواڵی پێدام: کە (عبدالله)ی کوڕی (کعب)ی کوڕی

(مالك) –کەلە کوڕەکانیدا ئەو چاوساغیی (کعب)ی دەکرد، کاتێ کوێر بوو بوو– دەڵێت: گوێم لە (کعب)ی کوڕی (مالك) بوو کاتێ باسی دواکەوتنی خۆی دەکرد لە جەنگی (تبوك)و لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: لە هیچ جەنگێك لەو جەنگانەی پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی هەرگیز دوانەکەوتووم جگە لە جەنگی (تبوك)، بەڵام ئەوە هەیە لە جەنگی (بدر)یش دواکەوتم بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) گلەیی لە هیچ کەس نەکرد کە دواکەوتبێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کە دەرچوو لەگەڵ موسوڵمانەکان مەبەستیان کاروانەکەی قورەیش بوو، کەچی خوا لەگەڵ دوژمنەکانیان بەرەوڕووی کردنەوە بەبێ وادەی دیاری کراو، لە ڕاستیدا من ئامادەی شەوی (عەقەبە) بووم لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) کاتێ پەیمانمان بەست لەسەر ئیسلامەتی، کە پێم خۆش نییە بیگۆڕمەوە بە جەنگی بەدر، ئەگەر چی جەنگی (بدر) ناو وشۆرەتی لەناو خەڵکیدا زیاترە لەو شەوە، ئەو بەسەرهاتەش کەبەسەرمندا هات کەلە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دواکەوتم لەغەزای تەبوك ئەوە بوو: کەمن هیچ کاتێك لەوکاتەی کەلە پێغەمبەر (ﷺ) دواکەوتم بەهێزتر و بەگوڕتر و دەوڵەمەندتر نەبووم، بەخوا قەت لەوەو پێش دوو وڵاخی سواریم بەخۆمەوە نەدیووە، کەچی لەو جەنگەدا هەمبوو، پێغەمبەر (ﷺ) کەئەو جەنگەی کرد کاتەکەی زۆر گەرم بوو بەرەوڕووی ڕێیەکی دوور و، بیابانێکی پان وبەرین بوویەوە، هەروەك ڕووبەڕووی لەشکرێکی ئێجگار زۆری دوژمنان دەبوویەوە، هەربۆیە نیاز و مەرامی خۆی بۆیان ئاشکرا کرد، تا خۆیان ساز و ئامادە بکەن، هەر بۆیە ڕێڕەوی خۆیانی بۆ باس کردن کەبەرەو کوێ دەچن. موسڵمانانیش ئەو ڕۆژە لە خزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) زۆر بوون. سەرژمێر نەکرابوون لە تۆمارگەیەکدا، هەرکاتێك یەکێك بیویستایە خۆی بشارێتەوە ون دەبوو، مەگەر وەحی خوای گەورە ئاشکرای بکردایە. پێغەمبەریش (ﷺ) لەکاتێکدا کەئەو جەنگەی کرد میوە پێگەیشتبوو سێبەر خۆش بوو بوو، منیش زۆر حەزم لەو میوە و سێبەرە دەکرد، ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانەکان تفاقی خۆیان خست. منیش سەرلەبەیانی دەستم دایە خۆ ساز کردن کەچی دەگەڕامەوە و هیچیشم نەدەکرد. لە دڵی خۆمدا دەموت: من هەر کات بمەوێ ئەتوانم خۆم سازدەم، هەروا بەوشێوە مامەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان بەڕێکەوتن بێئەوەی من هیچ تفاقێکم ئامادەکردبێت، بۆ سبەینێ هەمدیسان دەڕۆیشتم تا خۆم ساز بکەم کەچی دەگەڕامەوە و هیچیشم نەدەکرد، بەردەوام لەسەر ئەوە حاڵە مامەوە تا سوپاکە

تاویان داو دوورکەوتنەوە، بەتەمابووم بڕۆم بەدوایاندا و پێیان بگەمەوە، خۆزگە وام بکردایە، بەڵام لەچارەم نەنوسرابوو، دوای ڕۆیشتنی پێغەمبەر (ﷺ) هەرکاتێ دەچوومە دەرەوە خەفەتبار دەبووم بەوەی کەسێکم نەدەبینی وەك خۆم وابێت، مەگەر پیاوێکی بە دووڕوو تۆمەتبارکراو، یان کەسێك کە خوا مۆڵەتیدابێت، وەکو لاواز و بێتواناکان.

پێغەمبەر (ﷺ) باسی نەکردبووم هەتا گەیشتبووە (تبوك)، لەوێ کاتێ لەناو خەڵکیدا دانیشتبوو فەرمووبووی: "(کعب)ی کوڕی (مالك) چی لێهات؟ پیاوێك لە (بني سلمة) وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا قاتەجلەکەیی و تەماشاکردنی ئەملاولای خۆی گیریداوە، (معاذ)ی کوڕی (جبل) پێی دەڵێ: خراپت وت، بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا خێر نەبێت هیچمان لێنەدیوە، پێغەمبەریش (ﷺ) بێدەنگ دەبێت، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەم حاڵەدابوو پیاوێکی سپی پۆشی بینی دڕی بەتراویلەکەکە (سراب) دەدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "دەی (أبو (خیثمة)بە"، کە دەرکەوت (أبو خیمة الانصاری) بوو. ئەویش ئەو پیاوە بوو، کە مەنێ خورمای کردبوو بە خێر و، لەوکاتەدا دووڕووەکان تانەوتەشەریان لێدابوو، (کعب)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: کاتی پێم گەیشتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڕانەوەدایە لە تبوك خەفەت دایگرتم. بیرم لە درۆ دروستکردن دەکردەوە، لەدڵی خۆمدا دەموت: چۆن وبەچی بتوانم سبەینێ خۆم لە توڕەیی پێغەمبەر (ﷺ) ڕزگار بکەم؟ بۆ ئەم مەبەستە کەوتمە ڕاو تەکبیر و هەر کەسێك لەماڵ و خێزان و کەس و کارم کە بتوانێ ڕێیەکم بۆ دابنێت، کاتێ پێموترا: وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە بەرەوە، هەموو خەیاڵێکم لە مێشکی خۆماڕەواندەوە و، عەزمی خۆم جەزم کرد و، دڵنیابووم لەوەی کە ناتوانم بەهیچ شتێك لە دەستی ڕزگاربیم، بۆیە بڕیارمدا ڕاستگۆبم لە خزمەتیدا، پێغەمبەر (ﷺ) سەرلەبەیانی گەیشتەوە ماڵەوە، عادەتی وابوو کاتێ لەسەفەرێك بگەڕایەتەوە، پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵەوە سەرەتا لە مزگەوت دوورکات نوێژی دەکرد، پاشان دادەنیشت بۆ پێشوازی لەخەڵك، کە ئەوەی کرد خەڵکە دواکەوتووەکان هاتن کەوتنە بڕوبیانوو هێنانەوە بۆی، سوێندیان بۆ دەخوارد، کە هەشتا و ئەوەندە کەس بوون، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕواڵەتی دەرەوەی لێ قبوڵکردن و، پەیمانی لەگەڵ بەستن و، داوای لێخۆش بوونی بۆ کردن، بەڵام نهێنی ناودڵیانی دایە دەست خوا منیش هاتم، کاتێ سەلامم کرد بزەو خەندەیەك گرتی وەك بزەو خەندەی کەسێکی توڕە پاشان

فەرمووی: "وەرە" منیش ڕۆیشتم تالە بەردەمیدا دانیشتم، پێی فەرمووم: "چی دوایخستی؟ ئەی تۆ وڵاخی سواریت نەکڕی؟" وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بەخوا ئەگەر من لای جگەلە تۆ لەپیاوانی دونیایی دانیشتمایا، دەمتوانی منیش بڕوبیانوو بێنمەوە و، خۆم لەتوڕەیی تۆ قوتار بکەم، خوا دەم و زمانی پێداوم، بەڵام بەخوا من چاك ئەزانم ، ئەگەر بێتوو ئەمڕۆ منیش درۆو دەلەسەت بۆ بێنمەوە تالێم ڕازی بیت، ئەوا دوور نییە خوا تووڕەت بکات لێم، بەڵام ئەگەر قسەی ڕاستت بۆ بکەم با تووڕەش ببی لێم لەسەر ئەو قسانە، ئەو بەئومێدی سەرەنجامی باشم لەخواوە، بەخوا من هیچ بیانوویەکم نەبووە کە دواکەوتم، بەخوا من هیچ کاتێ ئەمەندە بەهێز و دەوڵەمەند نەبووم ، وەك ئەوکاتەی کەدواکەوتم لێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "ئەمە ڕاست دەکات، دەهەستە با بزانین خوا چ فەرمانێك دەدات لەبارەتەوە" منیش هەستام، چەند پیاوێك لە (بني سلمة) وروژان و شوێنم کەوتن پێیان وتم: بەخوا وانازانین تۆ پیشی ئەمە تا ئێستا هیچ گوناهێکت کردبێت، تۆیش ئەتوانی وەکو دواکەوتووەکانی تر بڕووبیانوو بهێنیتەوە بۆ پێغەمبەری خوا، تۆ ئەوەندەت بەس بوو بۆ لێخۆشبوونی تاوانەکەت کە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات. دەڵێ: بەخوا وازیان لێم نەهێنا تا خەریك بوو بگەڕێمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆم بەدرۆ بخەمەوە، پاشان پێم وتن: کەسی کە هەیە وەکو من وەهابێت، وتیان بەڵێ، دووپیاوی تریش وەکو تۆ وان ئەوانیش هەمان قسەی تۆیان وتووە و، وەکو تۆیان پێوتراوە، وتم: ئەو دووانە کێن؟، وتیان: یەکێکیان (مرارە)ی کوڕی (ربیعه)ی (العامری)یە، ئەویتریشیان، (هلال) کوڕی (أمییە)ی (الواقفی)یە. باسی دوو پیاوی باشیان لاکردم کە ئامادەی جەنگی (بەدر) بووبوون، سەرمەشق بوون بۆ من. کەباسی ئەو دوانەیان بۆ کردم ڕۆیشتم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگری کرد لە موسڵمانانەکان کە قسە لەگەڵ ئەم سێکەسە بکەن، لەناو دواکەوتوەکاندا، خەڵکی لێمان لاگیر بوون، گۆڕان بەرامبەرمان، تاوام لێهات بێزم لەخۆم دەکردەوە، هەتا ڕقم لە زەوی دەبوویەوە، وام لێهات ئەم زەوییەی بەسەریدا دەڕۆیشتم بەلامەوە زەوییەکەی جاران نەبوو، پەنجا شەو بەو شێوەماینەوە، هەردوو هاوەڵەکەم لەماڵەوە دۆش دامابوون، دانیشتبوون دەگریان، بەڵام من لەهەردووکیان گەنج تر و تۆکمە تربووم، لەماڵ دەردەچووم ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبووم و، بەبازاڕدا دەگەڕام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم، دەهاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)

سەلامم لێدەکرد لەدوای نوێژ لە جێگەی خۆیدا، لەدڵی خۆمدا ئەموت: بڵێی لێوی جوڵاندبێت بەوەڵامدانەوەی سەلامەکە؟ پاشان لەنزیکیەوە نوێژم دەکرد، بەدزیەوە سەیرم دەکرد، کاتێ دەچوومە ناو نوێژەکەم سەیری دەکردم، کاتێك کە لام دەکردەوە بەلادا، ڕووی وەردەگێڕا، کاتێك سارد و سڕی موسڵمانانان درێژەی کێشا لەسەرم، ڕۆیشتم تاوەکو هەڵزنام بەقەد دیواری باخێکی (أبو قتادة)دا کەئامۆزام بوو خۆشەویسترین کەس بوو لام، سەلامم لێکرد، بەخوا ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، پێموت: ئەی (أبو قتادة) سوێندت دەدەم بەخوا ئایا وادەزانیت کە من خوا و پێغەمبەری خوام خۆش دەوێت؟ دەڵێت: بێدەنگ بوو، دیسانەوە لێی پاڕامەوە هەر بێدەنگ بوو، هەمدیسان لێی پاڕامەوە. وتی: خواو پێغەمبەرەکەی خوا باشتر دەزانن. منیش هەردووچاوم فرمێسکی لێهەڵنیشت، لەدوایدا پشتم هەڵکرد و بەدیوارەکەدا هەڵزنام، ئەمەو لەکاتێکدا بە بازاڕی مەدینەدا دەڕۆشتم، سەیردەکەم کابرایەکی جوتیار لە خەڵکی شام کە خۆراکی هێنابوو لە مەدینە بیفرۆشێت، دەیوت: کێ (کعب)ی کوڕی (مالك)م پێنیشان دەدات؟ دەڵێ: خەڵکی ئاماژەیان بۆ کرد بەرەو ڕووی من، تا هات بۆلام، نامەیەکی لەپادشای (غسّان)ەوە پێدام، منیش خوێندەوار بووم خوێندمەوە ئەمەی تێدابوو: وامان پێگەیشتۆتەوە کە هاوەڵەکەت، دڵی شکاندویت، خوای گەورە تۆی بەڕسواو ماف خوراو دانەناوە، بگە بەئێمە دڵنەوایت دەکەین، دەڵێت: منیش کاتێك خوێندمەوە وتم: ئەمەش بەڵایەکی تر، منیش بردم خستمە تەنورێکەوە و سوتاندم، کاتێ چل شەو تێپەڕی لە پەنجاشەوەکە و وەحی دوا کەوت. لەناکاو نێرراوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بۆلام وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانت پێدەدات: کەلە ژنەکەت دوور کەویتەوە، وتم: تەڵاقی بدەم یان چیبکەم؟ وتی: نا بەڵکو لێی دوورکەوەرەوە، توخنی مەکەوە، دەڵێت: هەمان جوابی ناردبوو بۆ هەردوو هاوەڵەکەی دیکەم. دەڵێت: بە ژنەکەمم وت بڕۆرەوە بۆماڵی باوکت لەوێبە تا بزانین خوا چیدەکات لەم بارەوە، دەڵێ: ژنەکەی (هلال)ی کوڕی (أمییە) دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دەڵێت: کە (هلال)ی کوڕی (أمییە) پیرە و ناتوانێت خزمەتی خۆی بکات، خزمەتکاری نیە، ئایا پێت ناخۆشە خزمەتی بکەم؟ فەرمووی: "نەخێر، بەس بانزیکت نەکەوێت".ئەویش وتی: کورە بەخوا ئەو هیچ شتێکی پێنەماوە، بەخوا لەو ڕۆژەوە ئەم بەسەرهاتەی لێڕوودواوە هەر خەریکی گریانە هەتا ئەمڕۆ، دەڵێ: منیش هەندێ

له خزمەكانم پێیان وتم: بریا تۆش مۆڵەتت لـه پێغەمبـەر (ﷺ) بخواستایە، ژنەکـەت بهێنایەتەوە، ئەوەتا مۆڵـەتی ژنەکـەی (هـلال)ی کـوڕی (أمیـە)ی داوە کـە خزمـەتی بکات، دەڵێ: وتم: داوای مۆڵەت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناکەم لەمبارەیـەوە، نـازانم ئەگەر داوای مۆڵەتم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد چیم پێدەڵێت؟ بەتایبـەت مـن پیـاوێکی گەنجم؟ دەشەویش بەو حاڵەوە مامەوە، تا پەنجا شەومان تـەواو کـرد، لەسـەرەتای قسە لەگەڵ نەکردنمانەوە لـە بـەیانی پەنجاهـەمین شـەوماندا، نوێـژی بـەیانیم کـرد، لەسەربانی ماڵێك لە ماڵەكانمان، لەکاتێکدا کە من لەسەر بانەکە دانیشـتبووم لەسـەر ئەو حاڵەی کە خوای گەورە دەربارەمان فەرموویەتی، دڵ و دەروونم تـەنگ بوویـوو، زەوی بەوفراوانیـەی خۆیـەوە، لـێم هـاتبووەوە یـەك، گـوێم لـەدەنگی زەلامێـك بـوو لەسەر کێوی (سَلع)ەوە بەو پەڕی دەنـگ بەرزیـەوە، هـاواری دەکـرد ئـەی (کعـب)ی کـوڕی (مالـك) موژدەبێـت، منـیش کـەوتم بەسـوژدەدا و زانـیم خـوا دەروویـەکی لێکردوینەتەوە، ئەویش ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا دوای نوێژی بەیانی خەڵکەکەی ئاگادار کردبوو کە خوا تۆبـەی لێوەرگرتـووین، خـەڵکی هـاتبوون مزگێنیـان بـدەنێ، چەند مزگێنی دەرێك چووبون بەرەو دوو هاوەڵەکە، پیاوێکیش بەسـوار ئەسـپێکەوە بەغار بەرەو من هات، کەسێکیش لە هۆزی (سَـلم) بـە ڕاکـردن بـەرەو ڕووم هـاتبوو، چووبوە سەر کێوەکەو هاواری کردبوو، دەنگەکەم پێش ئەسپەکە پێگەیشـت، کـاتێ ئەو کەسەی کە گوێم لەدەنگی بوو گەشـتە لام لـە خۆشـیدا قاتەجلەکـەی خـۆمم بـۆ داکەند و کردمە بەر ئەو ، سوێند بەخوا لەو قاتە زیاترم نەبوو لەورۆژەدا، قاتێ جلـم خواست و کردمە بـەرم، پاشـان چـووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خـەڵکی دەستە دەستە پێم دەگەیشتن پیرۆزباییان لێدەکردم[1] و دەیـانوت: لێخـۆش بـوونی خـوات لێـپیرۆز بێـت ، تـاوەکو گەشـتمە مزگـەوت، دەبیـنم پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دانیشتووە و خەڵکیش بەدەوریـدا دانیشـتوون، (طلحـة)ی کـوڕی (عبیـدالله) هەسـتا بەڕاکردن بەرەو ڕووم هـات و، تەوقـەی لەگـەڵ کـردم و، پیرۆزبـایی لێکـردم، بـەخوا کەس لە کۆچـەریەکان هەڵنەسا جگـە لـەو، دەڵـێ: (کعـب) هـەرگیز ئـەم هەڵوێسـتە جوامێرانەی (طلحة)ی لەبیر نەدەکرد، (کعب) دەڵێ: کاتێ سەلامم کرد لە پێغەمبەری خـوا (ﷺ)، کـە ڕوومـەتی لـە خۆشـیدا دەدرەوشـایەوە– فـەرمووی: "مـژدە بێـت

---

[1] پیرۆزبایی لەبۆنە خۆشەکاندا دروستە.

بەچاكترین ڕۆژ كەبەسەرتا تێدەپەڕێت، لەو ڕۆژەوە كە لەدایك بوویت". وتم: ئەم موژدەیە لە تۆوەیە، ئەی پێغەمبەری خوا یا لە خواوەیە؟ فەرمووی: "نەخێر بەڵكو لە خواوەیە"، پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێ دڵیخۆش بووایە ڕوخساری دەدرەوشایەوە، هەر دەدوت پارچەیەكە لە مانگ، دەڵێ: ئێمەش ئەمەمان دەزانی. دەڵێ: كاتێك لەبەردەمیدا دانیشتم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەبێت بەشێك لە تەوبەكەم ئەوەبێت كەلەماڵەكەم دەرچم و بیكەم بە خێر بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "هەندێك لەماڵەكەت گل بدەرەوە بۆ خۆت ئەوە باشترە بۆت". دەڵێ: وتم: كەوابوو ئەو پشكەی لە خەیبەر بەرمكەوتووە، دەیهێڵمەوە، وتم: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) خوا منی بەهۆی ڕاستگۆییەوە ڕزگار كرد، لەمەرجی تەوبەكەشم ئەوەیە كە دەبێ تاماوم ڕاستگۆ بم. سوێند بەخوا وانازانم هیچ كەس لە موسڵمانان خوا تاقی كردبێتەوە بە ڕاستگۆیی، لەو كاتەوە ئەوەم بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسكردووە هەتا ئەمڕۆ. چاكتر لەوەی كە خوای باڵادەست منی پێتاقی كردۆتەوە، بەخوا لەو كاتەوە ئەو بەڵێنەم بە پێغەمبەر (ﷺ) داوە، تا ئەمڕۆ پێ بزانم بەئەنقەست درۆم نەكردووە. ئومێدم وایە بۆ لەمەولاش خوا بمپارێزێت. خوای باڵادەست ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە كە ئەمە ماناكەیەتی: (بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ كرد لە پێغەمبەر و كۆچبەران و پشتیوانان ئەوانەی كە شوێنی پێغەمبەر كەوتبوون لە كاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا) تادەگاتە(بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بەسۆز و میهرەبانە لەگەڵیاندا. هەروەها تەوبەی ئەو سێكەسەشی وەرگرت كەلە غەزای تبووكدا دواخران، دوای ئەوەی كە زەوی بەو هەموو فراوانیەوە لێیان تەنگ بوبوویەوە، خۆشیان لە خۆیان بێزار بووبوون). تا دەگاتە(هەمیشە لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن). (التوبة ١١٧-١١٩) (كعب) دەڵێ: بەخوا لەپاش ئەوەی خوا ڕێنمونی كردم بۆ ئیسلام هیچ ناز و نیعمەتێكی بەسەرا نەڕشتووم گەورەتر بێت لەلای من لە ڕاستگۆییم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) كە درۆم لەگەڵ نەكرد، تا منیش تیا بچم وەك ئەوانەی كە درۆیان كرد و تیاچوون، خوا دەرهەق بەوانەی كە درۆیان كرد كاتێ وەحی دابەزاند خراپترین شتێ كە فەرمووبێتی بەكەسێك وەك لەم ئایەتەدا هاتووە كە ئەمە ماناكەیەتی: (كە ئێوە گەڕانەوە بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن، بەخوا بۆ ئەوەی وازیان لێبهێنن و سەرزەنشتیان نەكەن، جا ئێوەش وازیان لێبهێنن و پشتیان تێبكەن، چونكە بەڕاستی ئەوانە پیسن جێگایان دۆزەخە لە

پاداشتی ئەو کارەی کردیان، سوێندتان بۆ دەخوات لێیان ڕازی بن و چاوپۆشیان لێبکەن، خۆ ئەگەر ئێوە ڕازی بن لێیان ئەوا بێگومان خوا لە کەسانی لە ئاین دەرچوو ڕازی نابێت). (کعب) دەڵێ: تۆبەی ئەم سیانەمان دواخرا لەوانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بەهانەی لێوەرگرتن، کاتێ سوێندیان بۆ خوارد، بۆیە پەیمانی دانا و داوای لێبوردنی بۆ کردن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەکبیری ئێمەی دواخست تا خوای بالادەست خۆی بڕیاری تیابدات، هەر بۆیە خوای گەورە فەرمووی: (ئەوەی کە خوا باسی فەرمووە دەربارەی دوا کەوتنمان مانای دواکەوتنمان نیە لە جەنگەکە بەڵکو مانای دواخستنی دەرچوونی بڕیارە دەربارەی ئێمە بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە سوێندیان بۆ خوارد و بەهانەیان هێنایەوە و ئەویش لێیوەرگرتن).

## (٣) وەرگرتنی تەوبە لەوکەسەی سەد کەسی کوشتبوو

١٠٢٤ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْسًا، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْسًا، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: لَا، فَقَتَلَهُ، فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، ومَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وكَذَا، فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ، فَاعْبُدِ اللَّهَ (تعالى) مَعَهُمْ، ولَا تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ. فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ ومَلَائِكَةُ الْعَذَابِ، فَقَالَتْ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ: جاء تَائِبًا مُقْبِلًا بِقَلْبِهِ إِلَى اللَّهِ. وقَالَتْ مَلَائِكَةُ الْعَذَابِ، إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ. فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ، فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ، فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الْأَرْضَيْنِ، فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهُ، فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ فَقَبَضَتْهُ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ". قَالَ قَتَادَةُ: فَقَالَ الْحَسَنُ: ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ لَمَّا أَتَاهُ الْمَوْتُ نَأَى بِصَدْرِهِ. (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٨٣)

(أبو سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "پیاوێك لەوانەی لە پێش ئێوەوەبوون نەوەدونۆ کەس دەکوژێت، پرسیار دەکات دەربارەی زاناترین کەس لەسەر زەوی؟ ناونیشانی کابرایەکی(ڕاهب)ی بۆ هەڵدەدەن، ئەویش دێت بۆ لای و دەڵێ: نەوەدو نۆ کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە ئەویش دەڵێ: نەخێر، ئیتر ئەویش دەکوژێت و سەد تەواو دەکات، پاشان پرسیار دەکاتەوە لە

زاناترین خەڵکی سەرزەوی، ناونیشانی پیاوێکی زانای بۆ هەڵدەدەن، دەڵێ: ئەوە سەد کەسم کوشتووە ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ دەڵێت: بەڵێ، کێ هەیە ببێتە کۆسپ لەنێوان ئەوو تەوبەدا؟ بەڵام برۆ بۆ خاکی ئەوێ وئەوێ، لەوێدا کەسانێك هەن خەریکی پەرستنی خوای باڵادەستن، تۆیش برۆ خوای باڵادەست بپەرستە لەگەڵیان، مەگەڕێرەوە بۆ خاکی خۆت، چوونکە خاکێکی خراپە. ئەویش دەڕوات تا نیوەی رێگە دەبڕێت، مردن دامێنگیری دەبێت فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی سزا دەبێتە دەمە قاڵەیان دەمەتەقێیان لەسەری فریشتەی ڕەحمەت دەڵێ: کابرا بەتەوبەکاری هاتووە، بەدڵ رووی لەخوا کردووە، فریشتەی سزایش دەڵێ: ئەو هەرگیز چاکەی نەکردووە، فریشتەیەك لە شێوەی مرۆڤێکدا دێت بۆلایان، دەیکەن بە ناوبژیوان لە نێوان خۆیاندا. ئەویش دەڵێ: نێوان ئەودوو خاکە بپێون. بەلای کامیاندا نزیکتربوو ئەوە بۆ ئەوەیان، پێوایان کاتێ سەیردەکەن بەلای ئەوشوێنەدا نزیکترە کەویستوویەتی بۆی بچێت. ئیتر فریشتەی ڕەحمەت گیانی ئەکێشێت". (قتادة) دەڵێت: (حسن) وتوویەتی: وامان بۆ باسکراوە کە کاتێ مردن یەخەی پێدەگرێت سنگی دەباتە پێش.

## (٤) فراوانی ڕەحمەتی خوا

**١٠٢٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "لَمَّا قضى اللَّهُ الْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابِهِ على نفسه، فَهُوَ موضوع عِنْدَهُ: إِنَّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي". (بخاري/ التوحيد/ ٦٩٦٩)**

(أبو هريره) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "کاتێ خوا خەڵکی دروست کرد لەنامەکەیدا لەسەر خۆی نوسیووە و لای خۆی دانراوە کە: بێگومان بەزەیی من زاڵە بەسەر خەشم و قینمدا".

**١٠٢٦ـوَاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ وَالْبَهَائِمِ وَالْهَوَامِّ، فَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ، وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ، وَبِهَا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى وَلَدِهَا. وَأَخَّرَ اللَّهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً، يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري/ الأدب/ ٥٦٥٤)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خوا سەد ڕەحمەتی هەیە، یەك ڕەحمەتی بەش کردووە لە نێوان جنۆکە و ئادەمی و مەڕومالات و گیانلەبەران و مار ومێرودا، هەربەو بەشەیە کەلەناو خۆیاندا سۆزیان

بۆیەکتر هەیە و بەزەییان بەیەکدا دێتەوە، هەر بەو بەشەیشە کە گیانلەبەری کێوی بەزەیی بە بەچکەی خۆیدا دێتـەوە، بـەڵام نـەوەدونۆ ڕەحمـەتی تـری دواخسـتووە، کەبەزەیی بەبەندەکانی خۆیدا دێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا".

## ( ٥ ) بەزەیی و سزای خوا

١٠٢٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّه (عز وجل) مِنَ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ بِجَنَّتِه أَحَدٌ، وَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنَطَ مِنْ جَنَّتِه أَحَدٌ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٠٤)

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگـەر بـڕوادار بیزانیایـە خوا چەندە سزای لایە ئەوە هەرگیز کەس بەتـەمای بەهەشـتەکەی نـەدەبوو، ئەگـەر بێبـاوەڕیش بیزانیایـە خـوا چـەند ڕەحمـی بەلاوەیـە، ئـەوە هـەرگیز کـەس لەبەهەشتەکەی نائومێد نەدەبوو".

## ( ٦ ) خوا بەبەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لە دایك بۆ منداڵەکەی

١٠٢٨ـ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّه (ﷺ) بِسَبْيٍ، فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَبْتَغِي، إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَتَرَوْنَ هَذِه الْمَرْأَةَ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ". قُلْنَا: لَا وَاللَّه، وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لَا تَطْرَحَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِه مِنْ هَذِه بِوَلَدِهَا". (بخاري/ الأدب/ ٥٦٥٣)

(عمر)ی کوڕی (الخطاب)(رضي الله عنه) دەڵێ: چەند ژن و منداڵێك لە بێباوەڕەکان بـەدیلی هێنرانە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، ژنێکیان تێدابوو هەر ئەملاوئەولای دەکـرد. لـەناکاو منداڵێکی دۆزیەوە و هـەڵی گـرت و نووسـانی بەسـنگیەوە و شـیری دایـە، پێغەمبـەر (ﷺ) پێی فەرموو: "باوەڕدەکەن ئەم ژنە دەستی تێبچێت منداڵەکەی فڕێبداتـە نـاو ئـاگرەوە" وتمـان: نەبـەخوا، تـا لەتوانایـدا هـەبێت شـتی واناکـات، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: "دەی خوا بەبەزەیی ترە بۆ بەندەکانی لەو ژنە بۆ منداڵەکەی".

## ( ٧ ) کەس کردەوەی خۆی سەرفرازی ناکات

١٠٢٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (ﷺ): أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "سَدِّدُوا وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، فَإِنَّهُ لَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ أَحَدًا عَمَلُهُ". قَالُوا: وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: "وَلَا أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ مِنْهُ بِرَحْمَةٍ. وَاعْلَمُوا أَنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّه أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ". (بخاري/ الرقاق/ ٦٠٩٩)

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بۆبەرپێی خۆتان بڕوانن و میانەڕەوبن و مژدە دەربن، چونکە کەس کردەوەی خۆی نایباتە بەهەشت" وتیان: تۆیش ئەی پێغەمبەر خوا؟ فەرمووی: "تەنانەت منیش مەگەر خوا بەمیهرەبانی خۆی بمپۆشێت، بیشزانن خۆشەویستترین کردار لای خوا بەرداەوامترینیانە باکەمیش بێت".

## ( ٨ ) کەس لەخوا ئارامتر نییە

١٠٣٠ـ عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنُ قَيْسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَا أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ مِنَ اللَّه تَعَالَى، إِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ لَهُ نِدًّا وَيَجْعَلُونَ لَهُ وَلَدًا، وهُوَ مَعَ ذَلِكَ يَرْزُقُهُمْ ويُعَافِيهِمْ ويُعْطِيهِمْ". (بخاري/ الأدب/ ٥٧٤٨)

(عبدالله)ی کوڕی (قیس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "کەس لەخوای باڵادەست بەئارامتر نییە بەرامبەر وشەی ناڕەوا کە بیبیستێت، خەڵکی شەریك بۆ خوابڕیاردەدەن منداڵی بۆ بڕیاردەدەن، کەچی ئەو لەگەڵ ئەوەیشدا ڕزق وڕۆزیان پێئەبەخشێ و لەش ساغیان دەکات".

## ( ٩ ) کەس لەخوا بەغیرەت تر نییە

١٠٣١ـ عَنْ عَبْد اللَّه بْن مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْمَدْحُ مِنَ اللَّه عَزَّ وجَلَّ، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ مَدَحَ نَفْسَهُ، ولَيْسَ أَحَدٌ أَغْيَرَ مِنَ اللَّه (ﷻ)، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ حَرَّمَ الْفَوَاحِشَ، ولَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ الْعُذْرُ مِنَ اللَّهِ (ﷻ)، مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ أَنْزَلَ الْكِتَابَ وأَرْسَلَ الرُّسُلَ". (بخاري/ التفسير/ ٤٣٥٨)

(عبدالله) ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "کەس نییە مەدح و پیاهەڵدانی لەلا خۆشەویستتر بێت لە خوای گەورە، هەر لەبەر ئەوەیە مەدحی خۆی کردووە، کەسیش لەخوای گەورە بەغیرەتتر نییە، هەر لەبەر ئەوەیە کە بەدڕەفتاریی حەرامکردووە، کەسیش نییە پۆزش بۆ هێنانەوەی لەلا خۆشەویستتر بێت لەخوای گەورە، لەبەر ئەوەیشە کتێبی دابەزاندووە و پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووە".

١٠٣٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ يَغَارُ، وإِنَّ الْمُؤْمِنَ يَغَارُ، وغَيْرَةُ اللَّهِ أَنْ يَأْتِيَ الْمُؤْمِنُ مَا حَرَّمَ عَلَيْهِ". (بخاري/ النكاح/ ٤٩٢٥)

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "خـوا غـیرەت دەیگرێت و بڕواداریش غـیرەت دەیگرێـت، خـوا بـەوە غـیرەت دەیگرێـت کـە بـڕوادار بچێت بەلای شتێکدا کە لێی حەرام کردبێت".

## ( ١٠ ) داننانی بەندە بەتـاوانی پەنهانی خۆیدا

**١٠٣٣ــ عَنْ صَفْوَانَ بْنِ مُحْرِزٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِابْنِ عُمَرَ (ﷺ): كَيْفَ سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ فِي النَّجْوَى؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: "يُدْنَى الْمُؤْمِنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ رَبِّهِ عَزَّ وجَلَّ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ، فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُ؟ فَيَقُولُ: (أَيْ) رَبِّ أَعْرِفُ. قَالَ: فَإِنِّي قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا، وإِنِّي أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ. فَيُعْطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاتِهِ. وأَمَّا الْكُفَّارُ والْمُنَافِقُونَ: فَيُنَادَى بِهِمْ عَلَى رُ ووسِ الْخَلَائِقِ: هؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ". (بخاري/ المظالم/ ٢٣٠٩)**

(صفوان) کوڕی (محرز) دەڵێ: پیاوێك بە (ابن عمر)ی (ﷺ) وت: چۆنت بیسـتووە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) باسـی تاوانپۆشـی بـۆ کردبیـت؟ وتـی: لـێم بیسـتووە فەرموویــەتی: "لــە ڕۆژی قیامەتــدا بــڕوادار لــە پــەروەردگاری بالادەســتی نزیــك دەخرێتــەوە، تــاوەکو بــاڵی میهرەبــانی خــۆی بەســەردا دەکێشــێ، دانــی پێئــەنێت بەگوناهەکانیدا. دەفەرمووێ: ئایا ئەزانیت؟ ئەویش دەڵێ: ئەی پـەروەردگار دەزانم، دەفەرمووێ: دەمن لە دونیادا بۆم پۆشیت، ئەمڕۆیش لێت خۆش دەبم. ئینجا نامەی چاکەکانی پێدەدرێت، بـەلام بێبـاوەڕو دووڕووەکـان: لەبەرچـاوی هـەموو خەڵکیـەوە جاڕیان بۆ دەدرێت، ئەمانـە بـوون کـە درۆیـان بـەدەم خـوای بـەرز و بالادەسـتەوە دەکرد".

## ( ١١ ) ترسان لەخوای بـالادەست و سزای سەختی

**١٠٣٤ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لِأَهْلِهِ، إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ، ثُمَّ اذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ ونِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لَا يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ. فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ، فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ، وأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ. ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ، وأَنْتَ أَعْلَمُ. فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٩٤)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "پیاوێك کە هـەرگیز چاکەی لێنەوەشاوەتەوە بۆ خێزان و کەسوکارەکەی وتی: ئەگـەر مـردم بمسـوتێنن،

پاشان خۆڵەمێشەکەم پرش و بڵاوبکەنەوە، نیوەی بەوشکانیدا و، نیوەکەی تریش بەناو دەریادا، سوێند بە خوا ئەگەر خوا تەقدیری کردبێت لەسەری، ئەوا سزایەکی ئەوتۆی دەدات کە هیچ کەس لەخەڵکی جیهانیانی ئاوا سزا نەدابێت. کاتێك پیاوەکە مرد ئەوەی فەرمانی پێکردبوون بۆیان کرد. خوا فەرمانی کرد بەوشکانی چی تیابوو (لە ئەندامانی ئەو) کۆی کردەوە و، فەرمانی کرد بە دەریا چی تیابوو ئەویش کۆی کردەوە، پاشان فەرمووی: "بۆ ئەوەت کرد؟" وتی: لەترسی تۆ ئەی پەروەردگار. خۆیشت زاناتری. خوایش لێی خۆشبوو".

## (١٢) کەسێ گوناه بکات و پاشان داوای لێخۆش بوون بکات

١٠٣٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) –فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وجَلَّ– قَالَ: "أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، ويَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، ويَأْخُذُ بِالذَّنْبِ ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ ويَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ". قَالَ عَبْدُ الْأَعْلَى: لَا أَدْرِي أَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ: "اعْمَلْ مَا شِئْتَ". **(بخاري/ التوحيد/ ٧٠٦٨)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) –لەوشتانەی کەلە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە– دەفەرمووێ: بەندەیەك گوناهێکی کرد ئینجا وتی: خوایە لە گوناهەکەم خۆش ببە، خوای باڵادەست فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و، لەسەر گوناه سزا دەدات. پاشان هەمدیسان گوناهێکی تری کردەوە وتی: ئەی پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆش ببە، خوای باڵادەست فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد، زانی پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و، سزادەدات لەسەر گوناه، پاشان سەر لەنوێ گوناهێکی تری کردەوە. هەمدیسان وتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆش ببە. خوای باڵادەستیش فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و سزای دەدات لەسەر گوناه، پاشان سەرلەنوێ گوناهێکی تری کردووە، هەمدیسان وتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆشببە. خوای باڵادەستیش فەرمووی: "بەندکەم گوناهێکی کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه خۆش دەبێت و سزا دەدات لەسەر گوناه، چیدەکەیت بیکە ئەوا من لێت خۆشبووم" (عبد الأعلی) دەڵێ: نازانم داخۆ لە جاری سێهەمدا یاچوارەمدا فەرمووی: "چی دەکەیت بیکە".

# بەشی شەستەم: دووڕووەکان ( المنافقين )

## ( ١ ) دەربارەی فەرموودەی خوا ( إذا جاء المنافقون )

١٠٣٦ـ عَنْ زَيْدَ ابْنَ أَرْقَمَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي سَفَرٍ أَصَابَ النَّاسَ فِيهِ شِدَّةٌ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ لِأَصْحَابِهِ: (لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا) مِنْ حَوْلِهِ. قَالَ زُهَيْرٌ: وَهِيَ قِرَاءَةُ مَنْ خَفَضَ حَوْلَهُ. وَقَالَ: (لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ) قَالَ :فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) فَأَخْبَرْتُهُ بِذَلِكَ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ فَسَأَلَهُ، فَاجْتَهَدَ يَمِينَهُ مَا فَعَلَ، فَقَالَ: كَذَبَ زَيْدٌ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ). قَالَ: فَوَقَعَ فِي نَفْسِي مِمَّا قَالُوهُ شِدَّةٌ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَصْدِيقِي (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ) قَالَ: ثُمَّ دَعَاهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) لِيَسْتَغْفِرَ لَهُمْ. قَالَ: فَلَوَّوْا رُءُوسَهُمْ، و قَوْلُه: (كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُسَنَّدَةٌ). وقَالَ: كَانُوا رِجَالًا أَجْمَلَ شَيْءٍ. **(بخاري/ التفسير/ ٤٦١٧، ٤٦٢١)**

(زيد)ی کوڕی (ارقم) دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دەرچووین بۆ جەنگێك کە تێیدا تووشی سەختی و فەلاکەت هاتن (عبدالله)ی کوڕی (ابي) بەهاوەڵەکانی وت: (لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا) واتە: سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کەلەدەوری پێغەمبەری خوادان هەتا بڵاوەی لێبکەن. هەروەها وتی: (لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ) واتە: گەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ئەوەی بەڕێز و پیاوماقوڵە بێڕێز و بێدەسەلات لەشار دەربکەن، دەڵێ: منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) خەبەرمدایە بەوەی کە (عبدالله) وتی: ئەویش ناردی بە شوێن (عبدالله)ی کوڕی (أبی)دا پرسیاری لێکرد، ئەویش سوێندی قورسی خوارد کە نەیوتووە. وترا (زید) درۆی لەگەڵ پێغەمبەر کرد (ﷺ) دەڵێ: توشی زەحمەت بووم لەوەی خەڵکی وتیان. تاوەکو خوای بالادەست ڕاست گۆیی منی سەلماند. (إذا جاءك المنافقون) دەڵێ: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردن تا داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکا، ئەوانیش سەربادەدەن و لوت بەرزی دەکەن، هەروەك لەبارەی ئایەتی (كأنهم خشب مسندة) واتە: (هەر دەڵێی داری بەدیوارا هەڵپەسێراون). زید وتی: ئەوانە پیاوانێکی بە ڕواڵەت قۆز و پێکەوتوبوون.

## ( ٢ ) زەوی دووڕوو فڕێ دەدات

١٠٣٧ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ مِنَّا رَجُلٌ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ، قَدْ قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ، وكَانَ يَكْتُبُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَانْطَلَقَ هَارِبًا حَتَّى لَحِقَ بِأَهْلِ الْكِتَابِ،

قَالَ: فَرَفَعُوهُ. قَالُوا: هَذَا قَدْ كَانَ يَكْتُبُ لِمُحَمَّدٍ (ﷺ)، فَأُعْجِبُوا بِهِ، فَمَا لَبِثَ أَنْ قَصَمَ اللَّهُ عُنُقَهُ فِيهِمْ، فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ، فَأَصْبَحَتِ الْأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ، فَأَصْبَحَتِ الْأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، ثُمَّ عَادُوا فَحَفَرُوا لَهُ فَوَارَوْهُ، فَأَصْبَحَتِ الْأَرْضُ قَدْ نَبَذَتْهُ عَلَى وَجْهِهَا، فَتَرَكُوهُ مَنْبُوذًا. (بخاري/ المناقب/ ٣٤٢١)

(أنس)ی کوڕی (مالك) دەڵێ: پیاوێکمان تیابوو لە تیرەی (النجار) و (سورەتی)ی (البقرة) و (ألعمران)ی خوێند بوو، نووسەری پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ، کەچی ڕایکردوو بۆی دەرچوو، تا خۆی گەیاندە گاور و جولەکەکان، دەڵێ: (ئەوانیش ڕێزیان لێگرت وتیان: ئەمە نووسەری (محمد) بووە و زۆر سەرسام بوون پێی، کەچی ئەمەندەی پێنەچوو خوا ملی شکاند) چاڵیان بۆ هەڵکەند و شاردیانەوە، کەچی بۆ بەیانی زەوی دەمەوڕوو فڕێی دابووە دەرێ. دیسان سەرلەنوێ چاڵیان بۆ هەڵکەند وشاردیانەوە، کەچی بۆ بەیانی زەوی دەمەو ڕوو فڕێیدابوویەوە دەرێ. پاشان هەمدیسان چاڵیان بۆ هەڵکەندەوە، کەچی بۆ بەیانی زەوی هەمدیسان دەمەوڕوو فڕێی دابوویەوە دەرێ، ئیتر بە فڕێدراوی وازیان لێهێنا.

# بەشی شەستو یەکەم: ڕۆژی قیامەت

**( ١ ) خوا زەوی دەپێچێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ( والسموات مطويات بيمينه )**

**١٠٣٨ـ عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنُ عُمَرَ (﵄) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَطْوِي اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ بِشِمَالِهِ ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ". (بخاري/ التوحيد/ ٦٩٧٧)**

(ابن عمر)(﵄) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خوای باڵا دەست لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان دەپێچێتەوە، پاشان بەدەستی ڕاستی ڕایان دەگرێت، ئینجا دەفەرمووێ: منم پادشا، دەسەڵاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆبەزلزانەکان لە کوێن؟ پاشان زەویش بەدەستی چەپی دەپێچێتەوەو، دەفەرمووێ: منم پادشا، دەسەڵاتدارە بەزەبرەکان لە کوێن؟ خۆ بەزلزانەکان لەکوێن؟

**( ٢ ) شێوەی زەوی لە ڕۆژی قیامەتدا**

**١٠٣٩ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (﵁) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَا و عفراء، كَقُرْصَةِ النَّقِيِّ، لَيْسَ فِيهَا عَلَمٌ لِأَحَدٍ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٥٦)**

(سهل)ی کوڕی (سعد) (﵁) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە لەسەر زەوییەکی سپی خاکیی، وەك کولێرەیەکی دروست کراو لە ئاردێکی بێژراوە ئاڵای هیچ کەسی تێدا نییە".

**( ٣ ) زیندوو بوونەوە لەسەر کاروکردەوەکان**

**١٠٤٠ـ عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ (﵄) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ". (بخاري/ الفتن/ ٦٦٩١)**

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (﵄) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست، کەدەیفەرموو: "هەر کاتێك خوا ویستی سزای گەلێك بدات، سزاکە تووشی ئەو پیاوە چاکانەش دەبێت کەلەنێوانیاندان، پاشان خوا هەریەکەیان لەسەر کاروکردەوەی خۆیان زیندوو دەکاتەوە".

## ( ٤ ) خەڵكی بە پێی پەتی و ڕووتی و خەتەنەنەكراوی حەشر دەكرێن

**١٠٤١–عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا". قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، النساء والرِّجَالُ جَمِيعًا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ؟ قَالَ (ﷺ): "يَا عَائِشَةُ، الْأَمْرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٦٢)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست كە دەیفەرموو: "خەڵكی لە ڕۆژی قیامەتدا بەپێی پەتی و ڕووتو قووتیو خەتەنە نەكراوی حەشر دەكرێن" وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ژنان و پیاوان هەموو لەناویەكدا هەندێكیان تەماشای هەندێكیان دەكەن؟ ئەویش (ﷺ) فەرمووی: "كارەكە لەوە سەختترە كە هەندێكیان تەماشای هەندێكیان بكەن".

## ( ٥ ) خەڵكی لەسەر چەند حاڵەتێك كۆدەكرێنەوە[1]

**١٠٤٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ: رَاغِبِينَ، رَاهِبِينَ، واثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ. وتَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا: وتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٥٧٤)**

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "خەڵكی لەسەر سێ حاڵەت كۆدەكرێتەوە: هەیانە دڵخۆشە، هەیانە لە ترسو لەرزدایە، دووان لە سەر وشترێك و، سیان لەسەر وشترێك و، چوار لەسەر وشترێك، و دەلەسەر وشترێك، ئینجا ئەوانی تریان ئاگر كۆیاندەكاتەوە، شەویان لەگەڵ دەكاتەوە لە هەر كوێ شەو بكەنەوەو، نیوەڕۆ خەویان لەگەڵ دەكات لە هەركوێ نیوەڕۆ خەوبكەن و، ڕۆژیان لەگەڵ دەكاتەوە لەهەر كوێ ڕۆژ بكەنەوە، ئێوارەیان لەگەڵ دەكاتەوە لەهەر كوێ ئێوارە بكەنەوە".

## ( ٦ ) كافر لەسەر ڕوومەتی دەبرێت بەڕێوە

**١٠٤٣ـ عَنْ أَنَسُ بْن مَالِكٍ (ﷺ): أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: "أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى رِجْلَيْهِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا (عَلَى)**

---

[1] مەبەست كۆكردنەوەی دنیایە پێش فووكردنی یەكەم بە كەڕەنادا.

أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وعِزَّةِ رَبِّنَا. (بخاري/ الرقاق/ ٦١٥٨)

(أنس) كوڕى (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی قیامەتدا بێ باوەڕ چۆن لەسەر ڕوومەتی كۆدەكرێتەوە؟ فەرمووی: "ئەی ئەو كەسەی لە دونیادا لەسەر هەردوو قاچی توانای ڕۆشتنی پێداوە، ناتوانێت توانای ڕۆشتنی پێ بدات لەسەر ڕوومەتی لە ڕۆژی قیامەتدا". (قتادە) وتی: بەڵێ سوێند بە بەرز و بڵندی پەروەردگار.

## ( ٧ ) لەبارەی زۆریی عەرەق كردنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا

١٠٤٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "إِنَّ الْعَرَقَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَيَذْهَبُ فِي الْأَرْضِ سَبْعِينَ بَاعًا، وإِنَّهُ لَيَبْلُغُ إِلَى أَفْوَاهِ النَّاسِ. أَوْ: إِلَى آذَانِهِمْ". يَشُكُّ ثَوْرٌ أَيَّهُمَا قَالَ. (بخاري/ الرقاق/ ٦١٦٧)

(أبو هريرة) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "لە ڕۆژی قیامەتدا ئارەق حەفتا باڵ ڕۆدەچێت بەزەویدا و تا دەمی خەڵكیش دێت. یاخود تا گوێچكەیان" (ثور) دوودڵە كامیانی فەرموو.

## ( ٨ ) بێباوەڕ ( فدیە ) بدات بۆ ڕزگار بوون لە ڕۆژی قیامەتدا

١٠٤٥ـ عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وتَعَالَى لِأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا: لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا ومَا فِيهَا، أَكُنْتَ مُفْتَدِيًا بِهَا؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ: أَنْ لَا تُشْرِكَ –أَحْسِبُهُ قَالَ:– ولَا أُدْخِلَكَ النَّارَ، فَأَبَيْتَ إِلَّا الشِّرْكَ". (بخاري/ الانبياء/ ٣١٥٦)

(أنس) كوڕی (مالك) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "خوای بەرز و باڵادەست دەفەرموێ بە كەسێك كە سووكترین سزای هەیە لە دۆزەخدا: باشە ئەگەر دونیا و هەموو ئەوەی لە دونیادایە هی تۆ بوایە، ئایا لە تۆڵەی (ڕزگار) بوونی خۆتدا دەتدا؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، دەفەرموێت: من لەوە سووك ترم لێداواكردیت لە كاتێكدا تۆ لەپشتی ئادەمدا بووی: كە شەریك بۆ خوا دانەنێیت– وابزانم فەرمووی: منیش نەتخەمە ناو ئاگرەوە، بەڵام تۆ جگە لە هاوەڵ دانان بۆ خوا هیچت نەویست".

# بەشی شەستو دووەم: بەهەشت

## (١) یەکەم کۆمەڵ کە دەچێتە بەهەشتەوە

**١٠٤٦**-عَنْ مُحَمَّدٍ قَالَ: إِمَّا تَفَاخَرُوا، وإِمَّا تَذَاكَرُوا: الرِّجَالُ فِي الْجَنَّةِ أَكْثَرُ أَمِ النساء؟ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَوَ لَمْ يَقُلْ أَبُو الْقَاسِمِ (ﷺ): "إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، والَّتِي تَلِيهَا عَلَى أَضْوَإِ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السماء، لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَانِ اثْنَتَانِ، يُرَى مُخُّ سُوقِهِمَا مِنْ وراء اللَّحْمِ، ومَا فِي الْجَنَّةِ أَعْزَبُ". **(بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٧٣)**

(محمد) دەڵێ:: (خەڵکی) یان شانازیان دەکرد یان باسیان دەکرد: ئایا پیاوان لەبەهەشتا زۆرترن یا ژنان؟ (أبو هريره) (ﷺ) وتی: ئەی (أبو القاسم)(ﷺ) نەیفەرمووە: "یەکەمین دەستە کە دەچنە بەهەشتەوە لەسەرشێوەی مانگی چواردەن، دەستەی دوای ئەوانیش لەسەر شێوەی درەخشانترین ئەستێرەی درەوشاوەن لە ئاسماندا، هەر پیاوێك لەوان دوو ژنی هەیە، مۆخی لاقیان لەودیوی گۆشتەکەوە دیارە، لەبەهەشتا ڕەبەن نییە".

١٠٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ نَجْمٍ فِي السماء إِضَاءَةً، ثُمَّ هُمْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنَازِلُ، لَا يَتَغَوَّطُونَ ولَا يَبُولُونَ، ولَا يَمْتَخِطُونَ ولَا يَبْزُقُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، ومَجَامِرُهُمُ الْأَلُوَّةُ، ورَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، أَخْلَاقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ واحِدٍ، عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا". قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: "عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ". و قَالَ أَبُو كُرَيْبٍ: "عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ". و قَالَ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ: "عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ". **(بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٧٤)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "یەکەمین کۆمەڵ لە ئوممەتم کە دەچنە بەهەشتەوە، لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، لەپاشان ئەوانەی لە دوایانەوە دێن لەسەر شێوەی پرشنگدارترین ئەستێرەن لە ئاسمانا، ئەوانەی دوای ئەوانیش چەند پلەیەکن، نەمیز دەکەن و نە پیسایی و، نە چڵمیان هەیە و نەبەڵغەم، شانەیان لە زێڕە و، بخوردانیان دار عودە، ئارەقیان میسکە، خووڕەوشتیان یەك خووڕەوشتە لەسەر باڵای باوکە ئادەمیان شەست گەزن".

## ( ٢ ) هەموو كەس لەسەر شێوەی ئادەم دەچێتە بەهەشت

١٠٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ طُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا خَلَقَهُ قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ النَّفَرِ، وهُمْ نَفَرٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ جُلُوسٌ، فَاسْتَمِعْ مَا يُجِيبُونَكَ، فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. قَالَ: فَذَهَبَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلَامُ عَلَيْكَ ورَحْمَةُ اللَّهِ، قَالَ: فَزَادُوهُ ورَحْمَةُ اللَّهِ قَالَ فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ (ﷺ)، وطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الْآنَ". **(بخاري/ الاستئذان/ ٥٨٧٣)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خوای بالاّ دەست ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی دروست كردووە، درێژییەكەی شەست باڵ بووە كاتێ دروستی كرد فەرمووی: برۆ سەلام بكە لەسەر ئەو چەند كەسە، كە چەند كەسێك بوون لە فریشتە دانیشتبوون، گوێ بگرە بزانە چۆن سلاّوت دەستێننەوە، چونكە ئەوە دەبێت بە سلاّوی خۆت و سلاّوی نەوەكانت. ئینجا ڕۆیشت و وتی: سەلامتان لەسەربێت، ئەوانیش وتیان: سەلام و ڕەحمەتی خوا لەسەر تۆیش، دەفەرموێت: (ڕەحمەتی خوا)یان لێزیادكرد، هەركەسێك دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە سەلامی خوای لەسەر بێت كە شەست باڵ بالاّی بەرز بووە، ئیتر دوای ئەو خەڵك بەرەو كورت بوون هاتوون هەتا ئیستا".

## ( ٣ ) ڕازی بوونی خوا لە خەڵكی بەهەشت

١٠٤٩ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ. فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وسَعْدَيْكَ والْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: ومَا لَنَا لَا نَرْضَى يَا رَبِّ وقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَلَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُونَ: يَا رَبِّ، وأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ فَيَقُولُ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي، فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٣)**

(أبـو سـعيد)ی (الخـدري)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: "خـوای بالاّدەست بەبەهەشتیەكان دەفەرموێت: ئەی بەهەشـتیەكان ئـەوانیش دەڵـێن: ئێمـە ملكەچ و گوێڕایەڵی تۆین ئەی پەروەردگار، هەموو خێـر و بێرێـك لەدەسـتی تۆدایـە. دەفـەرمووێت: ڕازی بـوون؟ ئـەوانیش دەڵـێن پـەروەرگار داخـۆ بـۆچ ڕازی نـابین، لەكاتێكدا تۆ ئەمەندەت پێخەلاّت كردووین، كە بـەهیچ كـام لـە دروسـت كراوەكـانی

خۆتت خەڵات نەکردووە، دەفەرموویت: ئەی باشتر لەوەتان پێنەدەم؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگار دەبێت باشتر لەوە چی بێت؟ ئەویش دەفەرموویت: شایشتەی ڕەزامەندی خۆمتان دەکەم لەمەولا هەرگیز لێتان زویر نابم".

**(٤) بەهەشتیەکان لەگەڵ خاوەن پلەوپایە گەورەکانی لە بەهەشت یەکتر دەبینن**

**١٠٥٠ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﭬ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَا وَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَا وَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ مِنَ الْأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ". قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تِلْكَ مَنَازِلُ الْانبياء، لَا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: "بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٨٣)**

(أبو سعيد الخدري) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بەهەشتیەکان باڵە خانە نشینەکانی سەرو خۆیان دەبینن. هەرەك چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە درەوشاوە دەبینن کە لە ئاسۆی خۆر هەڵات بەرەو وئاوابوون دەچێت، لەبەر بەرزوبڵندی پلەی ئەوان لە مانیتر. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ): ئەمە پلەوپایەی پێغەمبەرانە جگە لەوان کەس پێی ناگات؟ فەرمووی: "بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە پیاوانێکن باوەڕیان بەخوا هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیووە (پێیان دەگەن).

**(٥) بەرفراوانی سێبەری درەختی بەهەشت**

**١٠٥١ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﭬ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لَا يَقْطَعُهَا". قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ النُّعْمَانَ بْنَ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيَّ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ (ﭬ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً، يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ مَا يَقْطَعُهَا". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٦)**

(سهل)ی کوڕی (سعد)(ﭬ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لەبەهەشتا درەختێك هەیە سەدساڵ سوار بە سێبەرەکەیدا دەڕواتو نایبڕێت" (أبو حازم) دەڵێ: ئەمەم بۆ (نعمان)ی کوڕی (أبو عیاش)ی (الزرقي) باس کرد، ئەویش وتی: (أبو سعید)ی الخدری قسەی بۆ کردووم ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە

فەرموویەتی: "لەبەهەشتا درەختێك هەیە، ئەسپ سواری چوست و چالاکی خێرا سەد ساڵ دەڕوات و نایبڕێت".

## ( ٦ ) شێوەی چادرەکانی بەهەشت

**١٠٥٢ـ عَنْ أَبِي موسى (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "فِي الْجَنَّة خَيْمَةٌ منْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا ستُّونَ مِيلًا، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الْآخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمنُ". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٩٨)**

(أبو موسى) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "لەبەهەشتا چادرێك هەیە لە مرواری ناو بۆش، پانیەکەی شەست میلە، لەهەر سوچێکیدا کۆمەڵێکی تێدایە، ئەوانی دیکە نابینن، بڕوادار بە سەریاندا دەگەڕێت".

## ( ٧ ) بەهەشت بەناخۆشی دەورە دراوە

**١٠٥٣ـ عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِه، وحُفَّت النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٢٢)**

(أنس)ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بەهەشت بەناڕەحەتی و ناخۆشی دەورە دراوە، بەڵام ئاگر بە ئارەزوو هەواو هەوەس دەورە دراوە".

## ( ٨ ) نیشانەی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان لەدونیادا

**١٠٥٤ـ عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وهْبٍ (ﷺ): سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْل الْجَنَّة". قَالُوا: بَلَى، قَالَ (ﷺ): "كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ، لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّه لَأَبَرَّهُ". ثُمَّ قَالَ: "أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ". قَالُوا: بَلَى، قَالَ: "كُلُّ عُتُلّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ". (بخاري/ التفسير/ ٤٦٣٤)**

لە(حارثة)ی کوڕی (وهب)(ﷺ) گوێی لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کە فەرموویەتی: "پێتان بڵێم بەهەشتیەکان کامانەن" وتیان: بەڵێ، فەرمووی: "هەموو کەسێکی لاوازی خۆ بەلاواز زان، کە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات داواکەی بۆ جێبەجێ ئەکات". پاشان فەرمووی: "پێتان بڵێم دۆزەخییەکان کامانەن" وتیان: بەڵێ، فەرمووی: "هەموو کەللە ڕەقێکی چاوبرسی خۆ پەرستی لە خۆبایی خۆبەزل زان".

## ( ٩ ) نەبڕانەوەی بەهەشت و دۆزەخ

**١٠٥٥ـ عَنْ عَبْد اللَّه بْنِ عُمَرَ ر: أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِذَا صَارَ أَهْلُ الْجَنَّة إِلَى الْجَنَّةِ وصَارَ أَهْلُ النَّارِ إِلَى النَّارِ: أُتِيَ بِالْمَوْتِ حَتَّى يُجْعَلَ بَيْنَ الْجَنَّةِ والنَّارِ، ثُمَّ يُذْبَحُ، ثُمَّ**

**يُنَادِي مُنَادٍ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ لَا مَوْتَ، ويَا أَهْلَ النَّارِ لَا مَوْتَ. فَيَزْدَادُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَرَحًا إِلَى فَرَحِهِمْ، ويَزْدَادُ أَهْلُ النَّارِ حُزْنًا إِلَى حُزْنِهِمْ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٢)**

لە(عبداللە)ى كوڕى (عمر)(ﷺ) ەوە: كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى: "كاتێ بەهەشتيەكان بەرەو بەهەشت يەكلايى كرانەوەو، دۆزەخيەكانيش بەرەو دۆزخ يەكلاكرانەوە. مردن دەهێنرێت، لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا سەر دەبڕێت، ئينجا جاڕ چيەك جاڕ دەدات: ئەى بەهەشتيەكان ئيتر مردن نييە و، ئەى دۆزەخيەكانيش ئيتر مردن نييە، ئينجا بەهەشتيەكانيش لەسەرو دڵ خۆشييەكەيانەوە هێندەى تر دڵخۆش دەبن، و دۆزەخييەكانيش لەسەرو خەفەتەكەيانەوە هێندەى تر خەفەت باردەبن".

# بەشی شەست و سێیەم: ئاگری دۆزەخ

## ( ١ ) سەختیی گەرمی دۆزەخ

١٠٥٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) قَالَ: "نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ و مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ". قَالُوا: واللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: "فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا". (بخاري/ بدء الخلق/ ٣٠٩٢)

(ابي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەم ئاگرەی کە ئادەمیزاد بۆ سوتاندن بەکاری دەهێنن بەشێکە لە حەفتا بەشی گەرمی دۆزەخ" وتیان: ئەگەر هەر ئەمەیش بوایا بەسبوو ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: "لە ڕاستیدا دۆزەخ شەست و نۆپلەی زیاترە لەو، هەر بەشێکی بەوێنەی ئەو گەرمە".

## ( ٢ ) سووکترین سزای دۆزەخ

١٠٥٧–النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ وشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ، يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ كَمَا يَغْلِ الْمِرْجَلُ، مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا، وإِنَّهُ لَأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٩٤)

(نعمان)ی کوڕی (بشیر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "سووکترین سزای ئەهلی دۆزەخ سزای کەسێکە کە جووتێ نەعلی ئاگرینی لەپێدایە، مێشکی سەری پێیانەوە دەکوڵێ وەك چۆن مەنجەڵی ئاو دەکوڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا وانابینێت کەکەس لەو سزای سەختتر بێت، کەچی ئەو لەهەموویان سزای سووکترە".

## ( ٣ ) دۆزەخ جێی خۆسەپێنەر و ستەمکارانە و بەهەشتیش جێی هەژار و لاوازەکانە

١٠٥٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ والنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ: أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ والْمُتَجَبِّرِينَ، وقَالَتِ الْجَنَّةُ: فَمَا لِي لَا يَدْخُلُنِي إِلَّا ضُعَفَا و النَّاسِ وسَقَطُهُمْ وغِرَّتُهُمْ؟ قَالَ اللَّهُ لِلْجَنَّةِ: إِنَّمَا أَنْتِ رَحْمَتِي، أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَا و مِنْ عِبَادِي. وقَالَ لِلنَّارِ: إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي، أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَا و مِنْ عِبَادِي، ولِكُلٍّ واحِدَةٍ

مِنْكُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ: فَلَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ اللَّهُ تَبَارَكَ وتَعَالَى رِجْلَهُ، تَقُولُ: قَطْ قَطْ قَطْ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ ويُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، ولَا يَظْلِمُ اللَّهُ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا. وأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٦٩)

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بەهەشت و دۆزەخ مشت و مڕیان بوو، دۆزەخ وتی: من تایبەت کراوم بە خۆبەزلزان و ملهوڕە ستەمکارەکان بەهەشتیش وتی: باشە من چیمە وا هەرکەسانی زەبوون و لاواز و بێسەرو ساختە و ڕازونیاز نەبێت نایەتە ناوم؟ خوای باڵا دەستیش بە بەهەشتی فەرموو: ئەی بەهەشت تۆ بەزەیی منی بەتۆ بەزەیی دەنوێنم بۆ هەر کەس بمەوێت لە بەندەکانم. بە دۆزەخیشی فەرموو: ئەی دۆزەخ تۆیش سزای منی، هەر کەس بمەوێت لەبەندەکانم بە تۆ سزای دەدەم، هەر یەك لە ئێوە پڕ بەپڕی خۆی هەیە، بەڵام ئاگر: پڕ نابێت تاوەکو خوای بەرز و بڵند پێیەکی (قودرەتی) پیادەنێت. ئینجا دۆزەخ دەڵێت: بەسمە، بەسمە، ئیتر لەوێدا دێتەوە یەك و پڕدەبێ ، خوایش ستەم لە هیچ کام لەدروست کراوەکانی ناکات. بەهەشتیش پڕ نابێت تا خوا جۆرە دروست کراوێکی بۆ بەدی دەهێنێ".

## ( ٤ ) گەورەیی خرێی بێ باوەڕ لە ئاگردا

١٠٥٩ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) –يَرْفَعُهُ– قَالَ: "مَا بَيْنَ مَنْكِبَيِ الْكَافِرِ فِي النَّارِ مَسِيرَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٨٥)

لە (أبو هريرة)ەوە (ﷺ) دەیگەیەنێ بە پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: "نێوانی هەردوو دەفەی شانی بێ باوەڕ لە ئاگردا سێ ڕۆژ ڕێگایە بۆ سواری خێرای چاپووك"

# بەشی شەست و چوارەم: ئاشووب و فیتنە

## (١) نزیك بونەوەی فیتنە و لەناوچوون كاتێ تاوان زۆر بوو

١٠٦٠ـ عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ (ﭫ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) اسْتَيْقَظَ مِنْ نَوْمِهِ وهُوَ يَقُولُ: "لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، ويْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍ قَد اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ". وعَقَدَ سُفْيَانُ بِيَدِهِ عَشَرَةً. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: "نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ". (بخاري/ الانبياء/ ٣١٦٨)

لە(زینب)ی كچی (جحش) (ﭫ)ەوە: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەو راپەڕی دەیفەرموو: "لا اله الا الله، هاوار بۆ عەرەب لە شەڕێك كە نزیك بۆتەوە، ئەمڕۆ لە بەربەستەكەی (یأجوج) و(مأجوج) ئەوەندەی ئەمە كونی تێبوو" (سفیان) ئامـاژەی بۆ ژمارە دەكرد. منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەناو دەچین لە كاتێكدا ئێمە (هێشتا) پیاوچاكانمان تێدایە؟. ئەویش فەرمووی: "بەڵێ كاتێك تاوان زۆر بوو"

١٠٦١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﭬ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ ومَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ". وعَقَدَ وهَيْبٌ بِيَدِهِ تِسْعِينَ. (بخاري/ الانبياء/ ٣١٦٩)

(أبي هريرة)(ﭬ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەمڕۆ لەبەربەستەكەی یاجوج و ماجوج و ئەوەندەی ئەمە كەلەبەری تێكەوت (وهیب) بەدەستی ئاماژەی بۆ نەوەد كرد.

**١٠٦٢**-عَنْ أُسَامَةَ (ﭬ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) أَشْرَفَ عَلَى أُطُمٍ مِنْ آطَامِ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ قَالَ: "هَلْ تَرَوْنَ مَا أَرَى؟ إِنِّي لَأَرَى مَوَاقِعَ الْفِتَنِ خِلَالَ بُيُوتِكُمْ كَمَوَاقِعِ الْقَطْرِ". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٧٩)

لە (أسامە)ی كوڕی (زید)(ﭬ)ەوە: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەر باڵەخانەیەك لە باڵەخانەكانی مەدینەدا سەركەوت و، پاشان فەرمووی: "ئایا ئەوەی من دەیبینم ئێوە دەیبینن؟ بێگومان من لە نێو ماڵەكانتانەوە شوێنگەی فیتنە دەبینم وەك شوێنگەی بارانی بەلێزمە".

## (٢) هاتنی فیتنە بەسەر دڵاندا پەیتا پەیتا

١٠٦٣ـ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ (ﭬ) فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ؟ فَقَالَ قَوْمٌ: نَحْنُ سَمِعْنَاهُ. فَقَالَ: لَعَلَّكُمْ تَعْنُونَ فِتْنَةَ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ

وجَاره؟ قَالُوا: أَجَلْ. قَالَ: تِلْكَ تُكَفِّرُهَا الصَّلَاةُ والصِّيَامُ والصَّدَقَةُ، ولَكِنْ أَيُّكُمْ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ الَّتِي تَمُوجُ مَوْجَ الْبَحْرِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: فَأَسْكَتَ الْقَوْمُ، فَقُلْتُ: أَنَا. قَالَ: أَنْتَ لِلَّهِ أَبُوكَ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) يَقُولُ: "تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالْحَصِيرِ عُودًا عُودًا، فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَا و، وأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَا و، حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ: عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا فَلَا تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ والْأَرْضُ، والْآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادًّا كَالْكُوزِ مُجَخِّيًا، لَا يَعْرِفُ مَعْرُوفًا ولَا يُنْكِرُ مُنْكَرًا، إِلَّا مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ". قَالَ حُذَيْفَةُ: وحَدَّثْتُهُ: أَنَّ بَيْنَكَ وبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا يُوشِكُ أَنْ يُكْسَرَ. قَالَ عُمَرُ: أَكَسْرًا لَا أَبَا لَكَ؟ فَلَوْ أَنَّهُ فُتِحَ لَعَلَّهُ كَانَ يُعَادُ. قُلْتُ: لَا، بَلْ يُكْسَرُ. وحَدَّثْتُهُ أَنَّ ذَلِكَ الْبَابَ رَجُلٌ يُقْتَلُ أَوْ يَمُوتُ، حَدِيثًا لَيْسَ بِالْأَغَالِيطِ. قَالَ أَبُو خَالِدٍ: فَقُلْتُ لِسَعْدٍ: يَا أَبَا مَالِكٍ مَا أَسْوَدُ مُرْبَادًّا؟ قَالَ: شِدَّةُ الْبَيَاضِ فِي سَوَادٍ. قَالَ: قُلْتُ: فَمَا الْكُوزُ مُجَخِّيًا؟ قَالَ: مَنْكُوسًا. (بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٠٢)

له(حذيفة)ەوە (ﷺ) دەڵێ: ئێمە لە کاتێکدا لە خزمەت (عمر)دا بووین وتی: کێتان بیستوویەتی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی فیتنەی کردبێت؟ خەڵکەکە وتیان: ئێمە بیستوومانە. ئەویش وتی: ڕەنگە ئێوە مەبەستان پێی ئەو فیتنە بێت کە پیاو بەهۆی ماڵ و منداڵ و دەرو دراوسێیەوە تووشی دێت؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەو جۆرە فیتنە نوێژ و ڕۆژو و خێر و خێرات دەیسڕێتەوە، بەڵام داخۆ ئێوە کامتان بیستوویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی لەو فیتنە کردبێت کە وەك دەریا شەپۆل دەدات. (حذيفة) دەڵێ: خەڵکەکە بێدەنگ بوون منیش وتم: من. وتی: تۆ باوکت بەڕەحمەت بێت؟ (حذيفة) وتی: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: "لەمەولا فیتنە و ئاشووب دێت بەسەر دڵاندا وەك چۆن حەسیر تاڵ تاڵ لەسەر یەك دادەنرێت، هەر دڵێکیش هەڵیمژێت زوو بیمژێت ئەوا خاڵێکی ڕەشی تێدا دروست دەبێت، بەڵام هەر دڵێك حەزی پێنەکات ئەوە خاڵێکی سپی تیدا دروست دەبێت. تاوەکو دڵەکان دەبن بە دوو جۆر دڵ: دڵێکی سپی و سافی وەك قوماشی سپی و ساف، هیچ فیتنەیەك زیانی لێنادات چەندە ئاسمانەکان و زەوی بەردەوام بن، دڵەکەی تریشیان دڵێکی ڕەش و تاریك وەك گۆزەی سەربەرەو خوار نەچاك بەچاك دەزاناو نەخراپ بە خراپ، مەگەر ئەوەی کە ئارەزووی خۆی دەیخوازێت" (حذيفة)

دەڵێ: بە (عمر)م وت: کەلە نیوان تۆو ئەودا (ئەو جۆرە فیتنەدا) دەرگایەکی داخراو هەیە نزیکە بشکێت. (عمر)یش وتی: بێباوك بیت بۆ شکاندن بێت؟ خۆ ئەگەر بکرێتەوە پێوە دەدرێتەوە، منیش وتم: نەخێر بەڵکو دەشکێنرێت. بۆم باس کرد کە ئەو دەرگایە بریتییە لە پیاوێك دەکوژرێت یا دەمرێت، ئەمە فەرموودەیە و هەڵەی تێدا نییە.

**١٠٦٤ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَقَامًا مَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلَّا حَدَّثَ بِهِ، حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ، قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِي هَؤُلاءِ، وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَيءِ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ، كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ، ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. (بخاري/ القدر/ ٦٢٣٠)**

(حذيفة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شوێنێکدا لەناوماندا ڕاوەستا هیچ شتێکی نەهێشتەوە کەلەوکاتەوە تاقیامەت ڕوودەدات هەر هەمووی باس کرد، ئەوەی لەبەری کرد لەبەری کرد و، ئەوەیش لەبیری چووە لەبیری چوو، هەموو ئەم هاوەڵانەم بەمە دەزانن، جاری واهەیە هەندێك لەوەی بیستوومە و لەبیرم چۆتەوە کە دەبینم (ڕوودەدات) بیرم دەکەوێتەوە، وەك پیاوێك ڕووخساری پیاوێك دێتەوە بیری کاتێك لێی وندەبێت. پاشان کاتێك بینیەوە دەیناسێتەوە.

## ( ٣ ) فیتنە لەخۆرهەڵاتەوە دێت

**١٠٦٥ـ عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنه)) قَالَ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ، مَا أَسْأَلَكُمْ عَنِ الصَّغِيرَةِ وَأَرْكَبَكُمْ لِلْكَبِيرَةِ! سَمِعْتُا أَبِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "إِنَّ الْفِتْنَةَ تَجِي و مِنْ هَاهُنَا -وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ- مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنَا الشَّيْطَانِ". وَأَنْتُمْ يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، وَإِنَّمَا قَتَلَ مُوسَى (عليه السلام) الَّذِي قَتَلَ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ خَطَأً، فَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لَهُ): (وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا) (طه: ٤٠). (بخاري/ الفتن/ ٦٦٨٠)**

(سالم)ی کوڕی (عبدالله) دەڵێ: (ابن عمر) (رضي الله عنه) وتی ئەی عێراقیەکان چەند پرسیار لە شتی بچووك و سادە دەکەن، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا لە هەموو کەس زیاتر گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن؟ گوێم لە (عبدالله) کوڕی (عمر) بوو دەیوت: لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە کە دەیفەرموو: "بێگومان فیتنە ئا لەوێوە دێت- بەدەستی ئامازەی کرد بەرەو خۆر هەڵات- لەوێوە هەردوو شاخی شەیتان

هەڵدێت". ئێوەش لەناو خۆتاندا هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان دەدەن، حەزرەتی موسا سەلامی خوای لەسەر بێت ئەو زەلامەی کە کوشت لەدەست و پێوەندی فیرعەون بەهەڵە کوشتی، کەچی خوای باڵا دەست (پێی)فەرموو کە ئەمە واتاکەیەتی: (زەلامێکت کوشت کەچی ئێمە لەدەست خەم و خەفەت تۆمان ڕزگار کرد و تۆمان توشی جۆرەها تاقیکردنەوەی سەخت کرد).

## ( ٤ ) دابەشکردنی گەنجینەکانی کیسرا و قەیسەر لە ڕێی خوادا

**١٠٦٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قَدْ مَاتَ كِسْرَى فَلَا كِسْرَى بَعْدَهُ، وإِذَا هَلَكَ قَيْصَرُ فَلَا قَيْصَرَ بَعْدَهُ، والَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتُنْفَقَنَّ كُنُوزُهُمَا فِي سَبِيلِ اللَّه". (بخاري/ الجهاد/ ٢٨٦٤)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "کیسرا مردووە کیسرایەکی تر پاش ئەو نابێت، کاتێك قەیسەریش مرد قەیسەرێکی تر پاش ئەو نابێت سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دڵنیابن گەنجینەکانیان لە ڕێی خوادا دەبەخشنەوە".

## ( ٥ ) لاسایی کردنەوەی خوو نەریتی پێشینان

**١٠٦٧ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ، شِبْرًا بِشِبْرٍ، وذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍّ لَاتَّبَعْتُمُوهُمْ". قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اَلْيَهُودَ والنَّصَارَى؟ قَالَ: "فَمَنْ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٦٩)**

(أبو سعيد)ی (الخدري) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بێگومان لەمەولا دەکەونە شوێن خوونەریتی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون. بست بە بست و، گەز بە گەز، تا وەکو بەڕادەیەك ئەگەر ئەوان خۆیان بکەن بە کونی بزنمژەدا ئێوەش شوێنیان دەکەون". وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، گاور و جولەکەکان؟ فەرمووی: "ئەی کێ؟".

## ( ٦ ) وازهێنان لە قورەیش

**١٠٦٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "يُهْلِكُ أُمَّتِي هَذَا الْحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ". قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: "لَوْ أَنَّ النَّاسَ اعْتَزَلُوهُمْ". (بخاري/ المناقب/ ٢٤٠٩)**

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: "ئومەتەکەم بەدەستی ئەم تیرەیە لە قورەیش لەناو دەچن". وتیان: ئەی فەرمانمان بەچی پێدەکەیت؟ فەرمووی: "ئەگەر خەڵکی وازیان لێبهێنایە لێیان دوورکەوتنایەتەوە"

## ( ٧ ) كاتێ دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان لە ڕووی یەکدا وەستاون

**١٠٦٩**–عَنِ الْأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: خَرَجْتُ وأَنَا أُرِيدُ هَذَا الرَّجُلَ، فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ: فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ يَا أَحْنَفُ؟ قَالَ: قُلْتُ: أُرِيدُ نَصْرَ ابْنِ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ). يَعْنِي عَلِيًّا (رضي الله عنه). قَالَ: فَقَالَ لِي: يَا أَحْنَفُ ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "(إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ والْمَقْتُولُ فِي النَّارِ". قَالَ: فَقُلْتُ –أَوْ قِيلَ–: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: "إِنَّهُ قَدْ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ". **(بخاري/ الإيمان/ ٣١)**

(أحنف)ی کوڕی (قیس) دەڵێ: بەنیازی ئەو پیاوە دەرچوومەدەر، (أبو بکر)م پێگەیشت وتی: دەتەوێ بۆ کوێ بچیت ئەی (أحنف)؟ دەڵێ: منیش وتم دەمەوێ یارمەتی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەم. مەبەستی (عەلی (رضي الله عنه) بوو. پێی وتم: ئەی (أحنف) بگەڕێرەوە، چونکە من لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە دەیفەرموو: "کاتێك دوو موسڵمان بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەك وەستان ئەوا بکوژ و کوژراو لە ئاگردایە". دەڵێ: من وتم یان وترا: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەمە بکوژ ئەی کوژراو بۆ؟ فەرمووی: "چونکە ئەویش ویستویەتی هاوەڵەکەی بکوژێ".

## ( ٨ ) تاقمە دەست درێژەکارەکە ( عمار ) دەکوژن

١٠٧٠ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): **"تَقْتُلُ عَمَّارًا الْفِئَةُ الْبَاغِيَةُ". (بخاري/ المساجد/ ٤٣٦)**

(أم سلمة)دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "تاقمە دەست درێژ کارەکە (عمار) دەکوژن".

**١٠٧١**–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): **"لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ، وتَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ، ودَعْوَاهُمَاءاحِدَةٌ". (بخاري/ المناقب/ ٣٤١٣)**

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "قیامەت هەڵناسێت تا دوو تاقمی گەورە کوشتار لەیەکتری نەکەن، لەنێوانیاندا کوشتارێکی زۆر گەورە دەبێت هەردووکیشیان یەك بانگەوازیان هەیە".( واتە ڕێبازیان هەیە).

## (٩) قیامەت هەڵناستێت تا پیاو خۆزگە بە مردوو نەخوازێت

١٠٧٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ عَلَى الْقَبْرِ فَيَتَمَرَّغُ عَلَيْه، وَيَقُولُ: يَا لَيْتَنِي كُنْتُ مَكَانَ صَاحِبِ هَذَا الْقَبْرِ، وَلَيْسَ بِه الدِّينُ، إِلَّا الْبَلَا و". (بخاري/ الفتن/ ٦٩٨٤)

(أبـو هريـرة) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "سـوێند بـەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، دونیا تەواو نابێت تاوەکو وایلێدێت پیاو بەلای گۆڕدا دەڕوات و تەپاوتلی لەسەر دەکات و دەڵێت: "ئای خۆزگە لەجێی ئەم خـاوەن گـۆڕە دەبووم، خۆ وەنەبێ لەبەر قەرزاری وا بکات، بەڵکو لەبەر بەلایە".

١٠٧٣-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ". قَالُوا: وَمَا الْهَرْجُ يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: "الْقَتْلُ الْقَتْلُ". (بخاري/ الاستسقا و/ ٩٨٩)

لـە(أبـو هريـره)ەوە (ﷺ) کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "قیامـەت هەڵناسێت تاوەکو (هرج) زۆر دەبێت" وتیان: (هرج) چییە ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ فەرمووی: "کوشتن، کوشتن".

## (١٠) دەرچوونی ئاگر لە خاکی حیجازەوە

١٠٧٤ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ، تُضِي و أَعْنَاقَ الْإِبِلِ بِبُصْرَى". (بخاري/ الفتن/ ٦٧٠١)

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "قیامەت هەڵناسێت تاوەکو ئاگرێك لە خاکی حیجازەوە دەردەچێت، لـە (بُصـری) ملـی حوشـتر ڕوونـاك دەکاتەوە".

## (١١) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو (فورات) کێوێکی زێڕین دەردەخات

١٠٧٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ، يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْه، فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ، وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ: لَعَلِّي أَكُونُ أَنَا الَّذِي أَنْجُو". (بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٢)

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "قیامەت هەڵناسێت تاوەکو فورات کێوێکی زێڕین دەردەخات، ئەوجا خەڵکی بەشەڕدێن لەسەری لەهـەر سەد کەسێك نەوەد و نۆیان دەکوژرێن، هەر پیاوێك لەوان دەڵێت: ئومێـدم وایـە ئـەو کەسەی ڕزگار دەبێت خۆم بم".

١٠٧٦ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلَا يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا". **(بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٢)**

(أبي هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "نزیکە فورات خۆی داماڵێت لە گەنجینەیەکی زێڕین، هەرکەس گەیشتە ئەو ڕۆژە با هیچی لێهەڵنەگرێت".

## (١٢) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو جەنگ لەگەڵ قەومێك دەکەن دەموو چاویان وەك قەڵغانی ڕوو پۆشە

١٠٧٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "تُقَاتِلُونَ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، كَأَنَّ وجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، حُمْرُ الْوُجُوهِ، صِغَارُ الْأَعْيُنِ". **(بخاري/ الجهاد/ ٢٧٧٠)**

لە(أبي هريرة)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "لە پێش هاتنی قیامەتدا لەگەڵ هۆزێکدا دەجەنگن کەوشیان لە مووە، دەموو چاویان هەردەڵێی قەڵغانی ڕووپۆش کراوە (واتا دەمووچاویان خڕو گۆشتنە)، ڕوومەت سوور و چاو بچکۆلەن"

## (١٣) قیامەت هەڵناسێت تاوەکو پیاوێکی ستەمکار لە (قحطان) دەردەچێت

١٠٧٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ". **(بخاري/ المناقب/ ٣٣٢٩)**

(ابي هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "قیامەت هەڵناسێت تاوەکوو پیاوێك لە هۆزی (قحطان) پەیدا دەبێت خەڵکی بە (زەبر)ی دار دەستەکەی دەبات بەڕێوە".

## (١٤) قیامەت هەر لەسەر خراپەکارەکان هەڵدەستێت

١٠٧٩ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ النَّاسِ". **(بخاري/ الفتن/ ٦٦٥٦)**

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: "قیامەت تەنها لەسەر پیاوخراپان هەڵدەسێت".

**( ١٥ ) قیامەت هەڵناسێت تاوەکوو چەند دەجاڵێکی درۆزن پەیدا نەبن**

**١٠٨٠-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلَاثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ". (بخاري/ المناقب/ ٣٤١٣)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: "قیامەت هەڵناسێت تاوەکو چەند کەسێکی درۆزنی ساختەچی پەیدادەبن کە نزیکەی سی کەسێکن، هەریەك لەوان خۆی بە پێغەمبەری خوا دەزانێت"

**( ١٦ ) جەنگ کردنی موسڵمانان لەگەڵ جوولەکەدا**

**١٠٨١ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ، فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ، حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وراء الْحَجَرِ والشَّجَرِ، فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ: يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللَّهِ، هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي، فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ. إِلَّا الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ". (بخاري/ الجهاد/ ٢٧٦٨)**

(أبي هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "قیامەت هەڵناسێت تاوەکوو موسڵمانەکان لەگەڵ جوولەکەدا دەجەنگن، ئەو کاتە موسڵمانەکان ئەوەندە کوشتاریان لێ دەکەن، تاوای لێدێت جوولەکە لە پشتی دارو بەردەوە خۆیان دەشارنەوە ئینجا دارەکە یا بەردەکە دەڵێت: ئەی موسڵمان ئەی بەندەی خوا ئەمە جوولەکەیەکە لە پشتمەوە وەرە بیکوژە، جگە لەدرەختی (غرقد) چونکە لە دەرختی جولەکەکانە".

**( ١٧ ) قوول باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێت**

**١٠٨٢-عن ابی هریره (رض) قال عن النبی (ص) : "يخرب الكعبة ذو السُّوَيْقَتَيْنِ مِنَ الْحَبَشَةِ". (بخاري/ الحج/ ١٥١٩)**

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "زەلامـە قـول باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێت".

**( ١٨ ) نەمانی ئیمان و ئەمانەت لەوڵاتدا**

**١٠٨٣- عن حذيفة (رض) قال :حدثنا رسول الله () حديثين، قد رأيت احدهماءانا،انْتَظِرُ الْآخَرَ، حَدَّثَنَا: "أَنَّ الْأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ نَزَلَ**

الْقُرْآنُ، فَعَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ وعَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ". ثُمَّ حَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِ الْأَمَانَةِ قَالَ: "يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْوَكْتِ. ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الْأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ، فَتَرَاهُ مُنْتَبِراءلَيْسَ فِيهِ شَيْء". ثُمَّ أَخَذَ حَصًى فَدَحْرَجَهُ عَلَى رِجْلِهِ "فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ، لَا يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الْأَمَانَةَ، حَتَّى يُقَالَ: إِنَّ فِي بَنِي فُلَانٍ رَجُلًا أَمِينًا، حَتَّى يُقَالَ لِلرَّجُلِ: مَا أَجْلَدَهُ، مَا أَظْرَفَهُ، مَا أَعْقَلَهُ؟ ومَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ". ولَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ ومَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ، لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ دِينُهُ، ولَئِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا لَيَرُدَّنَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، وأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ لِأُبَايِعَ مِنْكُمْ إِلَّا فُلَاناءفُلَانًا. (بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٢)

(حذيفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو فەرموودەی بۆ فەرموین، یەکێکیانم بینیووە (هاتۆتە دی) چاوەڕوانی ئەویتریشیانم، فەرمووی: "سەرەتا ئامانەت دابەزیە ناو ڕەگ و ڕیشەی دڵانی پیاوانەوە، ئنجا قورئان دابەزی، لە قورئان فێربوون و لە سونەتیش فێربوون" پاشان دەربارەی هەڵگرتنی ئەمانەت بۆمان دواو، فەرمووی: "پیاو هەر ئەمەندەی سەرخەوێك دەشكێنێت ئامانەت لە دڵیدا دەردەكێشرێت، شوێنەوارەكەی لە دڵیدا وەك خاڵێكی لێدێت، پاشان سەرخەوێكی دیكە دەشكێنێت و ئەمانەت لە دڵیدا دەردەكێشرێت تاوەكو شوێنەوارەكەی لە دڵیدا وەك تلۆقێكی لێدێت، وەك چۆن پشكۆیەك خلكەیتەوە بەسەر قاچتا و تلۆق بكات، دەبینی بەرز بۆتەوە و هیچیشی تێدانیە". (پاشان بەردێكی بچوكی هەڵگرت خلی كردەوە بەسەر پێیدا) "خەڵك وای لێدێت خەریكە كەس نەبێت پەیمان بەرێتە سەر هەتا وای لێدێت دەڵێن: فلان تیرە پیاوێكی ئەمانەت پارێزی تێدایە تەنانەت وای لێدێت بەپیاوێك دەڵێن: ئای چەندە ئازایە!، ئای چەندە لێزانە!، ئای چەندە ژیرە!، كەچی بە ئەندازەی دەنكە خەرتەلەیەك ئیمان لە دڵیدا نیە" ڕۆژگارێك بەسەرمدا تێپەڕی گوێم نەدایە پەیمان بە كێ دەدەم، چونكە ئەگەر موسڵمان بوایە دینەكەی پەیمانەكەمی دەپاراست ئەگەر گاور یا جولەكەش بوایە سەرپەرشتیارەكەی نەیدەهێشت پەیمانەكە بشكێنێت، بەڵام ئەمڕۆ پەیمان بە كەس نادەم مەگەر فلان و فلان.

**١٠٨٤ـ عَنْ حُذَيْفَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "لَأَنَا أَعْلَمُ بِمَا مَعَ الدَّجَّالِ مِنْهُ، مَعَهُ نَهْرَانِ يَجْرِيَانِ، أَحَدُهُمَا رَأْيَ الْعَيْنِ ماء أَبْيَضُ، والْآخَرُ رَأْيَ الْعَيْنِ نَارٌ تَأَجَّجُ، فَإِمَّا أَدْرَكَنَّ أَحَدٌ فَلْيَأْتِ النَّهْرَ الَّذِي يَرَاهُ نَارًا، ولْيُغَمِّضْ ثُمَّ لْيُطَأْطِئْ رَأْسَهُ فَيَشْرَبَ (مِنْهُ) فَإِنَّهُ ماء بَارِدٌ. وإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ، عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ، مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ، يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، كَاتِبٍ وغَيْرِ كَاتِبٍ". (بخاري/ الانبياء/ ٣٢٦٦)**

(حذيفة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "من لە دەجاڵ خۆی باشتر دەزانم چی پێیە. دووڕووبـاری ڕەوانـی لەگەڵـە، یـەکێکیان لـە پـێش چاودا ئاوێکی سپییە، ئەوی تریان لە پێش چاودا ئاگرێکە بڵێسە دەدات، جا ئەگەر کەسێك پێی گەیشت با بچێت بۆ ئەو ڕووبارەی کـە بـەئاگر دێتـە پـێش چـاوی و، باچـاوی بنوقێنێ و پاشان باسەری داخات و لێی بخواتەوە، چونکە ئاوێکی سـاردە، جـەجاڵ یەك چاوە، پێستێکی ئەستور لەسەرچاویەتی، لەنێوچاوانیدا نوسراوە (کافر) هـەموو بڕواداڕێك دەیخوێنێتەوە چ خوێندەوار و چ نەخوێندەوار".

**١٠٨٥ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلًا عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا حَدَّثَنَا قَالَ: "يَأْتِي —وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ— فَيَنْتَهِي إِلَى بَعْضِ السِّبَاخِ الَّتِي تَلِي الْمَدِينَةَ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ هُوَ خَيْرُ النَّاسِ —أَوْ: مِنْ خَيْرِ النَّاسِ— فَيَقُولُ لَهُ: أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِي حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، أَتَشُكُّونَ فِي الْأَمْرِ؟ فَيَقُولُونَ: لَا، قَالَ: فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ، فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ: واللَّه مَا كُنْتُ فِيكَ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الْآنَ، قَالَ: فَيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ يَقْتُلَهُ فَلَا يُسَلَّطُ عَلَيْهِ". قَالَ أَبُو إِسْحَقَ: يُقَالُ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ هُوَ الْخَضِرُ عَلَيْهِ السَّلَام. (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨٣)**

(أبي سعيد الخدري)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان باسێکی دوورو درێـژی بۆ کردین دەربارەی دەجال، هەندێك لەوەی کە بۆی باس کردین فەرمووی: "دێـت و —حەرامە لەسەری بچێتە ئـەو ڕێگـوزەرەی بـۆ مەدینـە دەچـێت— تادەگاتـە هەنـدێ خاکی وشـك و بـرن کـە لـەولای مەدینەوەیـە، لـەوڕۆژەدا پیـاوێکی لێرادەپـەڕێت کـە چاکترینی خەڵکە —یاله چاکترینی خەڵکە— پێی دەڵێ: شـایەتی دەدەم کـە تـۆ ئـەو دەجالەی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە بۆمان، دەجالیش دەڵێ: باشە پێم بڵـێن ئەگەر ئەمەم کوشت و پاشان زینـدووم کـردەوە ئایـا گومـان لـە کارەکـەدا دەکـەن؟

دەڵێن: نەخێر . ئـەویش دەیکوژێـت و پاشـان زینـدووی دەکاتـەوە، کاتـێ زینـدووی دەکاتەوە پیاوەکە دەڵێ: بەخوا هەرگیز لەمەوپێش لە ئێستا باشتر تۆم نەناسـیوە، دەجال دەیەوێت بیکوژێت و زاڵ نابێـت بەسـەریدا، (أبـو اسـحاق) وتـی: دەڵـێن ئـەو پیاوە (خدری زیندەیە) سەلامی خوای لێبێت.

١٠٨٦ـ عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الدَّجَّالِ أَكْثَرَ مِمَّا سَأَلْتُ، قَالَ: "وَمَا يُنْصِبُكَ مِنْهُ؟ إِنَّهُ لَا يَضُرُّكَ". قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ الطَّعَامَ وَالْأَنْهَارَ؟ قَالَ: "هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ". (بخاري/ الفتن/ ٦٧٠٥)

لە (مغیر)ی کوڕی (شعبة)ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ: هیچ کـەس لـەمن زیـاتر پرسـیاری لـە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەکردووە دەربارەی دەجال فـەرمووی: "چـیت داوە لێـی، خـۆ ئـەو زیانت پێ ناگەیەنێت". وتم: ئەی پێغەمبـەری خـوا ئـەوان دەڵـێن خـۆراك و ڕووبـاری لەگەڵە؟ فەرمووی: "ئەو لای خوا لەوە ڕیسواترە".

١٠٨٧ـ عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "لَيْسَ مِنْ بَلَدٍ إِلَّا سَيَطَؤُهُ الدَّجَّالُ، إِلَّا مَكَّةَ وَالْمَدِينَةَ، وَلَيْسَ نَقْبٌ مِنْ أَنْقَابِهَا إِلَّا عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ صَافِّينَ تَحْرُسُهَا، فَيَنْزِلُ بِالسِّبْخَةِ، فَتَرْجُفُ الْمَدِينَةُ ثَلَاثَ رَجَفَاتٍ، يَخْرُجُ إِلَيْهِ مِنْهَا كُلُّ كَافِرٍ وَمُنَافِقٍ". (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨٢)

(أنس)ی کوڕی (مالك)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) دەفـەرمووێت: "هـیچ وڵاتێك نییە دەجال پێی تێنەنێت، جگە لـە مەککـە و مەدینـە، هەرچـی ڕێگـەو بـانی مەدینە هەیە هەمووی فریشتە بەڕیز تیاوەستاون و پارێزگاری لێدەکەن، لەزەوییەکی ڕووتەنیدا کە گیای لێناڕوێت دادەبـەزێت، سـێ جـار مەدینـە دەلەرێنێتـەوە هەرچـی کافر و مونافیقی تێدایە هەموو دەڕوات بەرەولای جەجاڵ".

## ( ١٩ ) دابەزینی عیسا و شکاندنی خاچ و کوشتنی بەراز

١٠٨٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "وَاللَّه لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا، فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ، وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا، وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَا و وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ". (بخاري/ البيوع/ ٢١٠٩)

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: "سـوێند بـە خـوا کوڕی (مریم) دادەبـەزێت دەبێـت بـە فـەرمان ڕەوایـەکی دادوەر، خـاچ دەشـکێنێ و

بەراز دەکوژێت و، سەرانە هەڵدەگرێت و، حوشتری تازە ساڵ واز لێدەهێنرێت و کەس تاوی ناداتێ، ڕق و قینەبەرایەتی و حەسوودی دەڕوات و نامێنێ، خەڵکی بانگ دەکرێن بۆ ماڵ و سامان کەس وەریناگرێت".

١٠٨٩ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ، فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ". فَقُلْتُ لابْنِ أَبِي ذِئْبٍ: إِنَّ الْأَوْزَاعِيَّ حَدَّثَنَا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: "وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ". قَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ: تَدْرِي مَا "أَمَّكُمْ مِنْكُمْ"؟ قُلْتُ: تُخْبِرُنِي، قَالَ: فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ تَبَارَكَ وتَعَالَى وسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ (ﷺ). **(بخاري/ الانبياء/ ٣٢٦٥)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "حاڵتان چۆن دەبێت کاتێك کوڕی مریەم دادەبەزێتە ناوتان. پێشەواشتان لە خۆتانە.

ڕاوی دەڵێت: بە (أبن ذئب)م وت: کە (الاوزاعی) قسەی بۆ کردوم لە (الزهراوی)یەوە، ئەویش لە (نافع)ەوە، ئەویش لە (ابو هريره)ەوە فەرموودەکە بەم شێوەیە "و أمامكم منكم" (أبن أبي ذئب) دەڵێ: دەزانیت مانای "أمكم منكم) چییە؟ وتم: پێم بڵێ، وتی: پێشەوایەتیتان دەکات بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان".

## ( ٢٠ ) من و قیامەت ئاوەهاین

١٠٩٠ـ عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) يُشِيرُ بِإِصْبَعِهِ الَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ وَالْوُسْطَى وهُوَ يَقُولُ: "بُعِثْتُ اناءالسَّاعَةُ هَكَذَا". **(بخاري/ التفسير/ ٤٦٥٢)**

(سهل)ی کوڕی (سعد)(ﷺ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست بەپەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی دەکرد و دەیفەرموو: "من لەگەڵ قیامەتدا ئاوەها ڕەوانەکراوم".(واتە پێکەوەین)

## ( ٢١ ) نزیکی قیامەت

١٠٩١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ الْأَعْرَابُ إِذَا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) سَأَلُوهُ عَنِ السَّاعَةِ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَنَظَرَ إِلَى أَحْدَثِ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ، فَقَالَ: "إِنْ يَعِشْ هَذَا لَمْ يُدْرِكْهُ الْهَرَمُ قَامَتْ عَلَيْكُمْ سَاعَتُكُمْ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٦)**

عائشە (ﷺ) دەڵێ: دەشتەکیەکان کاتێ دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری قیامەتیان لێدەکرد، کەی قیامەت دێت؟ ئەویش تەماشای گەنجترین

کەسیانی کرد و فەرمووی: "ئەگەر ئەمە بژی تـا دەگاتـە (قۆنـاغی) پیریـی قیامـەتی ئێوە هەڵدەسێت".

**١٠٩٢-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) -يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)- قَالَ: "تَقُومُ السَّاعَةُ والرَّجُلُ يَحْلُبُ اللِّقْحَةَ، فَمَا يَصِلُ الْانَاء إِلَى فِيهِ حَتَّى تَقُومَ. والرَّجُلَانِ يَتَبَايَعَانِ الثَّوْبَ، فَمَا يَتَبَايَعَانِهِ حَتَّى تَقُومَ والرَّجُلُ يَلِطُ (فِي) حَوْضِهِ، فَمَا يَصْدُرُ حَتَّى تَقُومَ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٤١)**

لە(أبو هريرە)ەوە -ئەویش دەیگەیێنێتەوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)- کە فەرموویەتی: "قیامـەت دێـت کاتـێ کـەپیاوێك خەریکـە حوشـترە دۆشـەنیەکەی دەدۆشـێت، فریاناکەوێت جامەکە بگەیەنێتە دەمی قیامەت هەڵدەسێت، دووپیاو خەریکی کڕین و فرۆشـتنی پۆشـاکێك دەبـن، مامەڵەکـەیان نابڕێننـەوە قیامـەت دێـت، پیـاوێکیش خەریکی چاککردنی حەوزەکەیەتی، لێنابێتەوە قیامەت دێت".

**١٠٩٣-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): "مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ". قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ، قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: "ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنَ السماء ماء فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ، قَال: ولَيْسَ مِنَ الْإِنْسَانِ شيء إِلَّا يَبْلَى، إِلَّا عَظْماءاحِدًا وهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ، ومِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٣٦)**

(أبو هريرە)(رضي الله عنه) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: "مـاوەی نێـوانی هەردوو فووەکە چلە" وتیان: ئەی (ابو هريرە) چل ڕۆژ؟ وتی: نـەموت. وتیـان :چـل مانگ ؟ وتی نەموت. وتیان :چل ساڵ ؟ نەموت. فەرمووی: "پاشان خوا بارانێك لـە ئاسمانەوە دەبارێنێت (خەڵکی) سەوز دەبنەوە وەك چۆن دانەویڵە سەوز دەبێتەوە، هیچ شتێکیش نییە لە مرۆڤ کە نەڕزێت جگە لە یەك ئێسك ئـەویش کلێنچکەیە، لـەو کلێنچکەوە دروستکراوەکان پێکدەهێنرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا".

## ( ٢٣ ) ئافرەت خراپترین فیتنەیە بۆ پیاو

**١٠٩٤ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): "مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً هِيَ أَضَرُّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النساء". (بخاري/ النكاح/ ٤٨٠٨)**

(أسامە)ی کوڕی (زید) گێڕاویەتەوە کەلە پێغەمبـەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاویانەتـەوە کـە فەرموویەتی: "پاش خۆم لە نێو خەڵکیدا هیچ فیتنەیەکم جێ نەهێشتووە لە فیتنەی ژنان خراپتربێت بۆ پیاوان".

# بەشی شەست و پێنجەم: خۆشنەویستنی دنیا

## (١) نزای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بنەماڵەکەی

١٠٩٥ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَ آلِ مُحَمَّدٍ قُوتًا". (بخاري/ الرقاق/ ٦٠٩٥)

(أبو هريرة)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خوایە ڕزق و ڕۆزی بنەماڵە و نەوەی (محمد) هەر ئەمەندە بێت پێی بژین".

## (٢) سەختی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر و خاو خێزانی

١٠٩٦ـ عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: واللَّه -يَا ابْنَ أُخْتِي- إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلَالِ ثُمَّ الْهِلَالِ ثُمَّ الْهِلَالِ، ثَلَاثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ، وَمَا أُوقِدَ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) نَارٌ. قَالَ: قُلْتُ: يَا خَالَةُ فَمَا كَانَ يُعَيِّشُكُمْ؟ قَالَتْ: الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ والماء، إِلَّا أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) جِيرَانٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، وكَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ، فَكَانُوا يُرْسِلُونَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مِنْ أَلْبَانِهَا فَيَسْقِينَاهُ. (بخاري/ الهبة وفضلها/ ٢٤٢٨)

لە (عروە)ەوە، ئەویش لە (عائشە)ەوە (رضي الله عنها) کە دەیوت: بەخوا -ئەی خوشکەزام- ئێمە جاری وابووە مانگی یەکشەوەمان دیوە، دیسان دیومانە، دیسان دیومانە، سێ مانگی یەکشەوە لە دوو مانگدا، لە ماڵەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاگر نەکراوەتەوە، دەڵێت: وتم جا باشە پورێ بەچی دەژیان؟ وتی: بە دوو ڕەشکەلەکە :خورماو ئاو، بەڵام ئەوە هەیە پێغەمبەر (ﷺ) چەند دراوسێیەکی لە یاریدەدەران -الانصار- هەبوو کاسە دراوسێیان هەبوو، شیریان دەنارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەشی ئێمەی لێدەدا.

١٠٩٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (ﷺ) يَوْمَيْنِ مِنْ خُبْزِ بُرٍّ، إِلَّا وأَحَدُهُمَا تَمْرٌ. (بخاري/ الرقاق/ ٦٠٩٠)

(عائشة)(رضي الله عنها) دەڵێ: خاو خێزانی (محمد)(ﷺ) دوو ڕۆژ لەسەر یەك تێرنانی گەنمیان نەخواردووە بەڵکو ڕۆژێکیان هەر خورما بووە.

١٠٩٨ـ عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: رأيت أَبا هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) يشيرُ بإصْبَعه مراراً يَقول: والَّذي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ، مَا أَشْبَعَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَهْلَهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ تِبَاعًا مِنْ خُبْزِ حِنْطَةٍ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. (بخاري/ أوائل كتاب الأطعمة/ ٥٠٥٩)

(أبو حازم) دەڵێ: (أبو هريرة)م بينى چەندين جار بەپەنجەی ئاماژەی دەكرد دەيووت: سوێند بەو كەسەی گيانی (أبو هريرە)ی بەدەستە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خاو خێزانی سێ ڕۆژ لەسەريەك لەنانی گەنم تێر نەبوون تا دونيای بەجێهێشت.

١٠٩٩ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ومَا فِي رَفِّي مِنْ شيء يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلَّا شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. (بخاري/ الخمس/ ٢٩٢٩)

عائشة (رضي الله عنها) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ وەفاتی كرد لەسەر ڕەفەكەمان شتێ نەبوو كە زيندەوەر پێی بژی نيومەن جۆ نەبێت لەسەر ڕەفەيەكم، ماوەيەكی زۆر لێمخوارد، كاتێ پێوام تەواو بوو.

### ( ٣ ) زۆرترينی بەهەشتيەكان هەژارەكانن

١١٠٠ـ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ، وإِذَا أَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ، إِلَّا أَصْحَابَ النَّارِ فَقَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ. وقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النساء". (بخاري/ النكاح/ ٤٩٠٠)

(اسامە)ی كوڕی (زيد) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموويەتی: "لەسەر دەرگای بەهەشت وەستام زۆربەی ئەوانەی لە بەهەشتا بوون هەژارەكان بوون. دەوڵەمەندەكانيش گير درابوون، بەڵام دۆزەخيەكانيش فەرمانيان پێكرابوو بەرەو ئاگر، لەسەر دەرگای دۆزەخيش وەستام سەير دەكەم زۆربەی ئەوانەی لە دۆزەخدا بوون ژنان بوون".

### ( ٤ ) ترسان لە ململانێ لەسەر دنيا

١١٠١ـ عَنْ عَمْرِو بْنَ عَوْفٍ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ (رضي الله عنه) إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا، وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) هُوَ صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ، وأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعلاء بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ. فَسَمِعَتِ الْأَنْصَارُ بِقُدُومِ أَبِي عُبَيْدَةَ فَوَافَوْا صَلَاةَ الْفَجْرِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) انْصَرَفَ، فَتَعَرَّضُوا لَهُ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ رَآهُمْ، ثُمَّ قَالَ: "أَظُنُّكُمْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدِمَ بِشيء مِنَ الْبَحْرَيْنِ". فَقَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: "فَأَبْشِرُوا وأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ، فَوَاللَّهِ مَا الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، ولَكِنِّي أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا

عَلَيْكُمْ كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ". (بخاري/ الجزية والموادعة/ ٢٩٨٨)

(عمرو)ی كوڕی (عوف)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (أبو عبيدة)ی كوڕی (الجراح)ی (ﷺ)نارد بۆ بەحرەین تا باجی خاوەن كتێبەكان كۆبكاتەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ خەڵكی بەحرەین ڕێككەوتبوو، (العلاء)ی كوڕی (الحضرمي)یشی كردبوو بەلێپرسراویان، (أبو عبيدة) بەسامانێكەوە لەبەحرەینەوە گەڕایەوە، كاتێ یاریدەدەران (الانصار) بیستیان (أبو عبيدة)هاتۆتەوە هەموو زوو نوێژی بەیانیان لە خزمەت پێغەمبەرا (ﷺ) كرد. كاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژەكەی كرد ڕۆیشت ئەوانیش چوونە ڕێگەكەی، پێغەمبەریش (ﷺ) كاتێ بینی زەردەخەنە گرتی، پاشان فەرمووی: "وابزانم بیستووتانە كە (ابو عبيدة) شتێكی لەبەحرەینەوە هێناوەتەوە" وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی: "دە مژدەبێ و بەئومێدی ئەوە بن دڵخۆشتان دەكات، سابەخوا من لە هەژاری ناترسم لەسەر ئێوە بەڵكو من لەوە دەترسم كە دونیا ڕووتان تێ بكات وەك چۆن ڕووی كردە ئەوانەی پێش ئێوە، ئێوەیش كێ بڕكێی لەسەر بكەن وەك چۆن ئەوان كردیان، ئینجا لەناوتان بەرێت، وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد".

## (٥) تاقیكردنەوە بەدنیا و چۆنێتی ئیش كردن تیایدا

١١٠٢ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: "إِنَّ ثَلَاثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ: أَبْرَصَ وأَقْرَعَ وأَعْمَى، فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ: فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا، فَأَتَى الْأَبْرَصَ فَقَالَ: أَيُّ شيء أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ وجِلْدٌ حَسَنٌ، ويَذْهَبُ عَنِّي الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ. قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ، وأُعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وجِلْدًا حَسَنًا، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْإِبِلُ -أَوْ قَالَ: الْبَقَرُ، شَكَّ إِسْحَقُ، إِلَّا أَنَّ الْأَبْرَصَ أَوِ الْأَقْرَعَ، قَالَ أَحَدُهُمَا: الْإِبِلُ، وقَالَ الْآخَرُ: الْبَقَرُ- قَالَ: فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا. قَالَ: فَأَتَى الْأَقْرَعَ، فَقَالَ: أَيُّ شيء أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ، ويَذْهَبُ عَنِّي هَذَا الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ، قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ، (قَالَ): وأُعْطِيَ شَعَرًا حَسَنًا، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْبَقَرُ، فَأُعْطِيَ بَقَرَةً حَامِلًا، فَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ (تعالى) لَكَ فِيهَا. قَالَ: فَأَتَى الْأَعْمَى، فَقَالَ: أَيُّ شيء أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: أَنْ يَرُدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ. قَالَ: فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ، قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ

إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْغَنَمُ، فَأُعْطِيَ شَاةً والِدًا، فَأُنْتِجَ هَذَانِ، ووَلَّدَ هَذَا، (قَالَ): فَكَانَ لِهَذَا وادٍ مِنَ الْإِبِلِ، ولِهَذَا وادٍ مِنَ الْبَقَرِ، ولِهَذَا وادٍ مِنَ الْغَنَمِ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الْأَبْرَصَ فِي صُورَتِه وهَيْئَتِه، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ قَد انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلَا بَلَاغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّه (ﷻ)ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ والْجِلْدَ الْحَسَنَ والْمَالَ– بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي، فَقَالَ: الْحُقُوقُ كَثِيرَةٌ، فَقَالَ لَهُ: كَأَنِّي أَعْرِفُكَ، أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ، فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ؟ فَقَالَ: إِنَّماءرِثْتُ هَذَا الْمَالَ كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ: وأَتَى الْأَقْرَعَ فِي صُورَتِه فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا، ورَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَى هَذَا، فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وأَتَى الْأَعْمَى فِي صُورَتِه وهَيْئَتِه، فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ وابْنُ سَبِيلٍ، انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي، فَلَا بَلَاغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلَّا بِاللَّه ثُمَّ بِكَ، أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي. فَقَالَ: قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي، فَخُذْ مَا شِئْتَ ودَعْ مَا شِئْتَ، فَوَاللَّه لَا أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئًا أَخَذْتَهُ لِلَّه (ﷻ). فَقَالَ: أَمْسِكْ مَالَكَ، فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ، فَقَدْ رُضِيَ عَنْكَ وسُخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ". (بخاري/ الانبياء/٢٧٧٤)

(أبو هريرة)(ﷺ) له پێغەمبەری خوای (ﷺ)ی بیستووه کـه فەرموويـەتی: "سـێ كەس لـه نـەوەی (اسـرائيل) بەڵـەكێك و كەچـەڵێك و كوێرێـك، خـوا ويسـتی تاقیـان بكاتەوه، فریشتەیەكی نـارده لایـان، هـات بـۆلای بەڵەكەكـه وتـی: زۆرتـر حـەزت لـه چییه؟ وتی: ڕەنگێكی جوان و پێستێكی جوان، ئەوەشم لەسەر لاچێ كه بەهۆیـەوه خەڵكی بێزم لێدەكەنەوه دەڵێ: ئەویش دەسـتی بەسـەردا هێنـاو، ئـەوەی كەمایـەی بێزلێكردنەوه بوو لەسەری لاچوو، ڕەنگێك و پێستیكی جوانی پێ بەخشـرا. و وتـی: زۆرتر حەزت له چ سامانێكه؟ وتی: حوشتر یان وتی: مانگا، (أسحاق) دوودڵه، بـەڵام بەڵەكەكه یا كەچەڵەكه یەكێكیان وتی: حوشتر و ئەوی تریـان وتـی: مانگـا– دەڵـێ: حوشترێكی ئاوسی پێدرا سـكەكەی دەمـانگ بـوو، پێیـوت: خـوا فـەڕ و بەرەكـەتی تێخات بۆت. دەڵێ: ئینجا هات بۆلای كەچەڵەكه، وتی: زیاتر حـەز لەچـی دەكـەیت؟ وتی: قژێكی جوان، ئەوەشم لەسەر لاچێ كه خـەڵكی بەهۆیـەوه بێـزم لێدەكەنـەوه. دەڵێ: دەستی بەسەردا هێنا و ئەوەی لەسەر لاچـوو، قـژێكی جـوانی پـێ درا وتـی: ئەی زیاتر حەزت بەچ جۆره سامانێكه، وتی: مانگا، ئەویش مانگایەكی ئاوسی پێدرا و وتی: خوای بالادەست پڕ فەڕ و بەرەكەتی بكا بۆت ، ئینجا هات بـۆلای كوێرەكـه،

وتی: زیاتر حەزت بە چ شتێکە؟ وتی: خوا چاوم بۆ بگێڕێتەوە، خەڵکی پێببینم، دەڵێت: دەستی بەسەردا هێنا، خوا چاوی بۆ گەڕانەوە، وتی: ئەی زیاتر حەزت لە چ سامانێکە؟ وتی: مەڕ، مەڕێکی بزۆکیش بەو بەخشرا، وشتر و مانگاکە بەریان لێکەوتەوە و مەڕەکەیش بەرخی بوو، هەتا وای لێهات ئەمیان شیوێ وشتر و، ئەویان شیوێ گاگەل و، ئەمەی تریشیان شیوێك مەڕی هەبوو، دەڵێت: پاش ماوەیەك فریشتەکە لە سەر شێوە و وێنەی خۆی هاتەوە بۆلای بەڵەکەکەو، وتی: پیاوێکی هەژارم لەسەفەردا دەستی بەرودوام بڕاوە، ئەمڕۆ کەس شك نابەم بەهانامەوە بێت جگەلە خوا و پاشان تۆ نەبێت، تو ئەو کەسەی ئەو ڕەنگ و پێستە جوان وماڵەی پێخەڵات کردی داوات لێدەکەم وشترێکم بدەیتێ لەم سەفەرەمدا پێی بگەمە مەنزڵ، وتی: ئەرکی زۆرمان لەسەرە ، پێیوت: وەکو بت ناسم وایە، ئەی تۆ بەڵەك نەبوویت و خەڵکی بێزیان لێدەکردیتەوە، هەژار نەبویت خوا پێیدایت؟ وتی: من ئەم ماڵ و سامانەم لە باوباپیرەوە دەست بەدەست بۆ ماوەتەوە، وتی: دە ئەگەر درۆ دەکەیت خوا وەکو خۆتت لێبکاتەوە، دەڵێ: ئەمجا هات بۆلای کەچەڵەکە لەسەر شێوە و وێنەی جارانی خۆی، ئەوەی بەوی وت، بەمیشی وت، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، ئەویش وتی ئەگەر درۆ دەکەیت خوا وەکو خۆتت لێبکاتەوە، دەڵێ: ئەمجا هات بۆلای کوێرەکە لەسەر شێوە و وێنەی جارانی خۆی، وتی: کابرایەکی هەژارم ڕێبوارم، دەستی بەرودوام بڕاوە، کەس شك نابەم بە فریامەوە بێت جگە لە خوا و پاشان تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم تو ئەو کەسەی چاوی پێدایتەوە مەڕێکم بدەیتی لەم سەفەرەمدا پێی بگەمە مەنزڵ، وتی: من کوێر بووم خوا چاوی دامەوە بەخوا دەست ناهێنمە ڕێت، لە ڕێگەی خوای گەورەدا بە ئارەزووی خۆت چی دەبەیت ببیبە و چیش نابەیت مەیبە، ئەویش وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، ئێوە تاقیکرانەوە خوا لەتۆ ڕازی بوو خەشم و قینی گرت لە دوو هاوەڵەکەت.

## ( ٦ ) کەمی دونیا و ئارام گرتن لێی و گەڵای درەخت خواردن

١١٠٣- عَنْ سَعْدَ بْنَ أَبِي وقَّاصٍ (ﷺ) قَالَ: واللَّهِ إِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ منَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ولَقَدْ كُنَّا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) مَا لَنَا طَعَامٌ نَأْكُلُهُ إِلَّا ورَقُ الْحُبْلَةِ وهَذَا السَّمُرُ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ تُعَزِّرُنِي عَلَى الدِّينِ، لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وضَلَّ عَمَلِي. (بخاري/ الرقاق/ ٦٠٨٨)

(سعد)ی کوڕی (أبی وقاص) (ﷺ) دەڵێ: بەخوا من یەکەمین پیاوم لەعەرەب کە تیری تەقاندبێت لە ڕێی خوادا، ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) جەنگمان دەکرد، هیچ خۆراکێکمان نەبوو بیخۆین جگە لەگەڵای (الحبلة)و (السمر)، کە دوو درەختی دڕکاوین ، تا وامان لێهات وەك مەڕ پشقلمان دادەنا، ئێستەش وایلێهاتووە بەرەی (أسد) ئامۆژگاریم دەکەن لەسەر دین. ئەگەر وا بێ من ڕەنجەڕۆ بووم و کردەوەکانم پوچەڵ بۆتەوە.

## ( ٧ ) ئەوەی بۆ مردوو دەمێنێتەوە

**١١٠٤ـ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلَاثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ ويَبْقَى واحِدٌ: يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ ومَالُهُ وعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ ومَالُهُ، ويَبْقَى عَمَلُهُ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٤٩)**

(أنس) ی کوڕی (مالك) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "سێ شت شوێن مردوو دەکەوێت، دوانیان دەگەڕێتەوە و یەکێکیان دەمێنێتەوە، خزم و کەس و کار و ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، کردەوەکەی دەمێنێتەوە".

**١١٠٥-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ، ولَا تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لَا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ -قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ- عَلَيْكُمْ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٢٥)**

## ( ٨ ) تەماشای لە خۆتان خوارتر بکەن

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی "تەماشای لەخۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لە خۆتان ژوورتر مەکەن، ئەوە باشترە بۆ ئەوەی ناز و نیعمەتی خوا بەسەرتانەوە بەکەم تەماشا نەکەن".

## ( ٩ ) کەسێ بۆ ناوو شۆرەت رەنج بدات

**١١٠٦-عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللَّهُ بِهِ، ومَنْ رَا ىِ رَا ىِ اللَّهُ بِهِ". (بخاري/ الرقاق/ ٦١٣٤)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "کەسێك بۆ ناوبانگ بیستنەوە کار بکات خوا ناوی دەزڕێنێت، کەسێکیش بۆ بەرچاوێنی کار بکات، خوا لە پێش چاوی خەڵکی ئابڕوی دەبات".

## ( ١٠ ) چونه ناو دۆزەخ بەهۆی بەلاّی زمانەوە

١١٠٧ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) قَالَ: "إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَة مَا يَتَبَيَّنُ مَا فِيهَا، يَهْوِي بِهَا فِي النَّارِ أَبْعَدَ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ والْمَغْرِبِ". **(بخاري/ الرقاق/ ٦١١٢)**

(أبـو هريـرة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "جـاری واهەیـە بەندە قسەی ئەوتۆ دەکات کە بیر لـە سـەرەنجامەکەی ناکاتـەوە، خـوا بـەهۆی ئـەو قسەوە فرێی دەداتە ناو ئاگرەوە (بۆ قووڵایی) دوورتر لـە نێـوانی خۆرهـەڵاتو خـۆر ئاوا".

# بەشی شەست و شەشەم: گەورەیی قورئان

## (١) کۆتـاییەکانی سورەتی (البقرة)

١١٠٨ـ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "مَنْ قَرَأَ هَاتَيْنِ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ". **(بخاري/ المغازي/ ٣٧٨٦)**

(أبو مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "هەرکەس ئەو دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی (البقره) لە شەوێکدا بخوێنێت بەسیەتی".

## (٢) گەورەیی خوێندنی: "قل هو الله احد"

١١٠٩ـ عَنْ أَبِي الدرداء (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ". قَالُوا: وكَيْفَ يَقْرَأْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالَ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٧)**

(أبو الدرداء) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: "ئایا هیچ کام لە ئێوە ناتوانێت سێ یەکی قورئان بخوێنێت لە شەوێکدا" وتیان: جا سێ یەکی قورئان چۆن دەخوێندرێت؟ فەرمووی: "(قل هو الله احد) لەجێی سێ یەکی قورئانە".

١١١٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) بَعَثَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ، وكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلَاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِـ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) فَلَمَّا رَجَعُوا ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَ: "سَلُوهُ لِأَيِّ شيء يَصْنَعُ ذَلِكَ". فَسَأَلُوهُ، فَقَالَ: لِأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ". **(بخاري/ التوحيد/ ٦٩٤٠)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی کرد بە فەرماندەی هێزێك، ئەو پیاوە لەبەرنوێژی هاوەڵەکانیدا کە قورئانی دەخوێند و بە (قل هو الله احد) کۆتایی پێدەهێنا، کاتێك گەڕانەوە ئەوەیان لە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) باس کرد، فەرمووی: "لێی بپرسن بۆچی وا دەکات، ئەوانیش لێیان پرسی و وتی: لەبەر ئەوەی کە سیفەت و ناوەڵناوی خواوەندی بەخشندەیە، منیش حەز دەکەم بیخوێنم. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: "خەبەری پێبدەن کە خوایش ئەوی خۆش دەوێت".

## ( ٣ ) وێنەی قورئان خوێن و قورئان نەخوێن

١١١١ــ عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "مَثَلُ الْمُؤْمن الَّذي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الْأُتْرُجَّةِ رِيحهَا طَيِّبٌ وطَعْمُهَا طَيِّبٌ. ومَثَلُ الْمُؤْمن الَّذي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَة، لَا رِيحَ لَهَا وطَعْمُهَا حُلْوٌ. ومَثَلُ الْمُنَافق الَّذي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَة، رِيحهَا طَيِّبٌ وطَعْمُهَا مُرٌّ. ومَثَلُ الْمُنَافقِ الَّذي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَة، لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وطَعْمُهَا مُرٌّ". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٢)**

(أبـو موسـى)ی (الاشـعري)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "نموونەی بڕواداری قورئان خوێن وەك نموونەی بەهێیە، واتە بۆنی خۆشە و تامیشی خۆشە، بڕواداری قورئان نەخوێنیش وەك خورماوایـە، بـۆنی نییـە و تـامی شـیرینە، دووڕووی قورئان خوێن وەك ڕیحانە وایە بۆنی خۆشە و تامی تاڵە، دووڕووی قورئـان نەخوێنیش وەك کوژاڵکەوایە، بۆنی نییە و تامیشی تاڵە".

## ( ٤ ) کەسێك قورئان بەڕەوانی دەخوێنێ و کەسێکیش بە زەحمەت دەیخوێنێ

١١١٢ــ عَنْ عَائشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "الْمَاهرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، والَّذي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ ويَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ، لَهُ أَجْرَانِ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٦٥٣)**

(عائشـة)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "کەسـێ قورئـان بەڕەوانی بخوێنێتەوە لەگەڵ پێغەمبەران و فریشتەچاك و پاك و بـەڕێز و نزیکـەکانی (بارەگای خوایی) دەبێت، کەسـێکیش قورئـان دەخوێنێـت و دەمـی تەتەڵـە دەکات تیایدا و لەسەرشانی زەحمەتە، دوو پاداشتی هەیە".

## ( ٥ ) دابەزینی هێوری و ئارامی لەکاتی خوێندنەوەی قورئان

١١١٣ــ عَن الْبراء (ﷺ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْف، وعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْن، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدُورُ وتَدْنُو، وجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفرُ منْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: "تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٢٤)**

(البراء)(ﷺ) دەڵێ: پیاوێك سورەتی (الکهف)ی دەخوێند، ئەسپێکی لـەلاوە بـوو بە دوو گوریسی درێژ بەسـترا بوویـەوە، پەڵـە هـەوریك دایگرتـەوە، هەربەسـەریەوە سوڕی دەخوارد و لێی نزیك دەبوویەوە، ئەسپەکەیشی هەر لێی ئەسڵەمیەوە، کاتـێ

رۆژ بوویەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ باس کرد. فەرمووی: "ئەوە هێوری و ئارامی بووە لەبەر قورئان دابەزیوە".

١١١٤ـ عَنْ أَبي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه): أَنَّ أُسَيْدَ بْنَ حُضَيْرٍ (رضي الله عنه) بَيْنَمَا هُوَ لَيْلَةً يَقْرَأُ في مِرْبَدِهِ إِذْ جَالَتْ فَرَسُهُ، فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أُخْرَى، فَقَرَأَ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، قَالَ أُسَيْدٌ: فَخَشِيتُ أَنْ تَطَأَ يَحْيَى فَقُمْتُ إِلَيْهَا، فَإِذَا مِثْلُ الظُّلَّةِ فَوْقَ رَأْسِي فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا، قَالَ: فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَيْنَمَا أَنَا الْبَارِحَةَ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ أَقْرَأُ فِي مِرْبَدِي إِذْ جَالَتْ فَرَسِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اقْرَأْ ابْنَ حُضَيْرٍ". قَالَ: فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اقْرَأْ ابْنَ حُضَيْرٍ". قَالَ: فَقَرَأْتُ ثُمَّ جَالَتْ أَيْضًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اقْرَأْ ابْنَ حُضَيْرٍ". قَالَ: فَانْصَرَفْتُ، وكَانَ يَحْيَى قَرِيبًا مِنْهَا خَشِيتُ أَنْ تَطَأَهُ، فَرَأَيْتُ مِثْلَ الظُّلَّةِ فِيهَا أَمْثَالُ السُّرُجِ، عَرَجَتْ فِي الْجَوِّ حَتَّى مَا أَرَاهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "تِلْكَ الْمَلَائِكَةُ كَانَتْ تَسْتَمِعُ لَكَ، ولَوْ قَرَأْتَ لَأَصْبَحَتْ يَرَاهَا النَّاسُ مَا تَسْتَتِرُ مِنْهُمْ". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٠)**

(أبو سعيد الخدري)(رضي الله عنه) دەڵێ: (أسيد)ی کوڕی (حضير) (رضي الله عنه) شەوێك لە باخەکەیدا خەریکی قورئان خوێندنەوە بوو ئەسپەکەی کەوتە سمکۆڵان، دیسانەوە دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی، ئەسپەکەش دەستی کردەوە بە سمکۆڵان، (أسيد) دەڵێ: ترسام لەوەی کە (يحيى) بشێلێت منیش هەستام بەلایەوە، کاتێ تەماشا دەکەم شتێکی وەك پەڵە هەور بەسەر سەرمەوەیە، شتێکی لەناودایە وەك چراخان، هەڵکشا بە ئاسمانا هەتا لەبەرچاوم ون بوو، دەڵێ: بەیانی زوو چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا، لەکاتێکدا من ئەمشەو لە نیوە شەودا لەباخەکەمدا قورئانم دەخوێند ئەسپەکەم کەوتە سمکۆڵان، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بخوێنە کوڕی (حفير)". دەڵێ: دەستم کردەوە بە خوێندنەوە هەمدیسان کەوتەوە سمکۆلا،، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بخوێنە کوڕی (حفير)" دەڵێ: خویندمەوە هەمدیسان کەوتەوە سمکۆلا،، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "بخوێنە کوڕی (حفير)" دەڵێ: منیش دەستم هەلگرت، (يحيى) لێیەوە نزیك بوو ترسام بیشێلێت، شتێکم بینی وەك پەڵە هەور شتێکی وەك چراخانی تێدابوو، بە ئاسمانا هەڵکشابو هەتا لەبەرچاوم ونبوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ)

فەرمووی: "ئەوە فریشتە بوون گوێیان لێگرتبویت، ئەگەر بەردەوام بوویتایە، بۆ بەیانی خەڵکی ئەو فریشتانەیان دەبینی و لێیان نەدەشارایەوە".

**( ٦ ) حەسوودی دروست نیە لە دووشتا نەبێ**

١١١٥ـ عَنْ سَالِمٍ عَنْ أَبِيهِ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) قَالَ: "لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَهُوَ يَقُومُ بِهِ اناء اللَّيْلِ واناء النَّهَارِ. ورَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ اناء اللَّيْلِ واناء النَّهَارِ". (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٧)

لە(سالم)ەوە ئەویش لە باوکیەوە (ﷺ) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: "حەسوودی دروست نییە لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێك خوا قورئانی پێ خەڵات کردبێت، بەردەوام هەستێ بە دەورکردنەوەی بە ڕۆژ و شەو، پیاوێکیش خوا سامانی پێببەخشێت بەردەوام خەریکی بەخشینی بێت بەشەو ڕۆژ".

**( ٧ ) زۆر خوێندنەوەی قورئان**

١١١٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (ﷺ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ الْإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ، إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا، وإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ". (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٤٣)

(عبدالله)ی کوڕی (عمر) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "خاوەن قورئان وەك خاوەنی وشتری بەستراوە وەهایە، ئەگەر چاودێری بکات رایدەگرێت، ئەگەر بەریشی بدات دەڕوات".

١١١٧ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "بِئْسَمَا لِأَحَدِهِمْ يَقُولُ: نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وكَيْتَ، بَلْ هُوَ نُسِّيَ. اسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ، فَلَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ بِعُقُلِهَا". (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٤٤)

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "چەند خراپە کەسێك لە ئێوە بڵێت، ئایەتی ئەوەو ئەوەم لەبیرچووە، بەڵکو لەبیری براوەتەوە، قورئان دەوربکەنەوە بێگومان قورئان لە دڵی پیاودا زووتر لەدەست دەردەچێ وەك لە حوشتر لەپەتی خۆی".

**( ٨ ) دەنگخۆش کردن بە خوێندنەوەی قورئان**

١١١٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ): أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ: "مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ" يَجْهَرُ بِهِ. (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٣٦)

(أبو هريرة)(ﷺ) گوێی له پێغەمبەر بووه (ﷺ) كه فەرموویەتی: "خـوا مۆڵـەتی بەهیچ شتێك نەداوه وەك ئەوەی مۆڵەتی به پێغەمبەرێكی دەنگ خۆش داوه قورئان بەدەنگەوه بخوێنێت" بەئاشكرا بیخوێنێ،

١١١٩ـ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِي مُوسَى (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) لِأَبِي مُوسَى: "لَوْ رَأَيْتَنِي وأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَا وتِكَ الْبَارِحَةَ، لَقَدْ أُ وتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٦١)**

(أبـو بـردة)لـه (ابـو موسـى)ەوه (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) بـه (أبـو موسی)ی فەرموو: "كاشكی ئەمشەو بت بینایەم كه چۆن گـوێم بـۆ خوێندنەوەكـەت شل كردبوو، بەڕاستی سازێك له سازەكانی بنەماڵەی (داود)ت پێدراوه".

### ( ٩ ) قورئـان خوێندن به ئـاوازەوه

١١٢٠ـ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيَّ (ﷺ) يَقُولُ: قَرَأَ النَّبِيُّ (ﷺ) عَامَ الْفَتْحِ فِي مَسِيرٍ لَهُ سُورَةَ الْفَتْحِ عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَرَجَّعَ فِي قِرَا وتِهِ. قَالَ مُعَاوِيَةُ: لَوْلَا أَنِّي أَخَافُ أَنْ يَجْتَمِعَ عَلَيَّ النَّاسُ لَحَكَيْتُ لَكُمْ قِرَا وتَهُ. **(بخاري/ المغازي/ ٤٠٣١)**

(معاوية)ی كوڕی (قرة) دەڵێ: له (عبـدالله)ی كـوڕی (مغفـل)ی (المزنـي)م بیسـت (ﷺ) دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) لەساڵی ئازادكردنی مەككەدا، بەسـواری وڵاخەكەیـەوه بەڕێگەوه سورەتی (الفتح)ی دەخوێند، بـه ئـاوازەوه دەیخوێنـد. (معاویـه) دەڵـێ: ترسی ئەوەم نەبوایه كه خەڵكیم لێ كۆدەبێتەوه، وەك ئەو بۆم دەخوێندن.

### ( ١٠ ) بەئـاشكرا خوێندنەوەی قورئـان لەشەوداو گوێ لێگرتنی

١١٢١ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) سَمِعَ رَجُلًا يَقْرَأُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ: "يَرْحَمُهُ اللَّهُ، لَقَدْ أَذْكَرَنِي كَذَا وكَذَا آيَةً، كُنْتُ أَسْقَطْتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وكَذَا". **(بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٥٥)**

(عائشـه)(ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەر (ﷺ) گـوێی لـه پیاوێـك بـوو لەشـەودا قورئـانی دەخوێندەوه، فەرمووی: "خوا ڕەحمی پێبكات ئایەتی ئەوەو ئـەوەی بیرخسـتمەوه كەلەبیرم چووبوون له فلان سورەت و فلان سورەت".

### ( ١١ ) قورئـان لەسەر حەوت پیت دابەزیوه

١١٢٢ـ عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (ﷺ) قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (ﷺ) يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا، وكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَقْرَأَنِيهَا، فَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ

عَلَيْه، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِه فَجِئْتُ بِه رَسُولَ اللَّه (ﷺ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "أَرْسِلْهُ، اقْرَأْ". فَقَرَأَ الْقِرَاءة الَّتِي سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "هَكَذَا أُنْزِلَتْ". ثُمَّ قَالَ لِي: "اقْرَأْ". فَقَرَأْتُ، فَقَالَ: "هَكَذَا أُنْزِلَتْ، إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ، فَاقْرَؤوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ". **(بخاري/ الخصومات/ ٢٢٨٧)**

(عمر)ی كوڕی (الخطاب)(ﷺ) دەڵێ: گوێم لە (هشام)ی كوڕی (حكيم)ی كوڕی (حزام)(ﷺ) بوو سورەتی (الفرقان)ی دەخوێند جیاواز لە خوێندنی من، كە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بۆی خوێندبووم، خەریك بوو پەلە بكەم (خوێندنەوەكەی پێببڕم) بەڵام مۆڵەتمدا تاڵیبووەوە، پاشان بەرۆكیم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێموت: ئەی پێغەمبەری خوا، من گوێم لەمەبوو سورەتی (الفرقان)ی خوێندەوە جیاواز لەوەی كە تۆ بەمنت خوێندەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "وازی لێبێنە، بخوێنە" ئەویش هەر بەو شێوە خوێندی كە من لێم بیستبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "هەروا دابەزیووە" پاشان بەمنیشی فەرموو: "بخوێنە" منیش خوێندمەوە، فەرمووی: "هەروا دابەزیوە، ئەم قورئانە لەسەر حەوت پیت دابەزیووە، ئێوەیش ئەوەندەی بۆتان دەكرێ بیخوێننەوە".

## (١٢) قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەر خەڵكی تردا

١١٢٣ـ عَنْ أَنَسٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (ﷺ): "إِنَّ اللَّهَ (ﷻ) أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ: (لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا)". قَالَ: وسَمَّانِي (لَكَ)؟ قَالَ: "نَعَمْ". قَالَ: فَبَكَى. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٥٩٨)**

(أنس) كوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە (أبی)ی كوڕی (كعب)(ﷺ) ی فەرموو: "خوای گەورە فەرمانی پێكردووم كە (لم يكن الذين كفروا) بەسەر تۆدا بخوێنم. وتی: ناوی بردم (تۆ)؟ فەرمووی: "بەڵێ" دەڵێت: ئەویش گریا.

**١١٢٤ـ** عَنْ مَعْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي قَالَ: سَأَلْتُ مَسْرُوقًا: مَنْ آذَنَ النَّبِيَّ (ﷺ) بِالْجِنِّ لَيْلَةَ اسْتَمَعُوا الْقُرْآنَ؟ فَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُوكَ -يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ (ﷺ)- أَنَّهُ آذَنَتْهُ بِهِمْ شَجَرَةٌ. **(بخاري/ فضائل الصحابة/ ٣٦٤٦)**

(معن) دەڵێ: كەلەباوكم بیستووە دەیوت: پرسیارم لە(مسروق) كرد: كێ پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار كردەوە بە جنۆكەكان، ئەو شەوەی گوێیان لە قورئان

گرتبوو، وتی:باوکت قسەی بۆ کردم –مەبەستی (أبن مسعود)ە (ﷺ)– درەختێك ئاگاداری کرد.

## (١٣) گوێگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە قورئان خوێندنی خەڵك

١١٢٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اقْرَأْ عَلَيَّ الْقُرْآنَ". قَالَ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقْرَأُ عَلَيْكَ وعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: "إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي". فَقَرَأْتُ (النساء) حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ: (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وجِئْنَا بِكَ عَلَى هؤُلاءِ شَهِيدًا) (٤١) رَفَعْتُ رَأْسِي، أَوْ غَمَزَنِي رَجُلٌ إِلَى جَنْبِي، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ دُمُوعَهُ تَسِيلُ. (بخاري/ فضائل القرآن/٤٧٦٨)

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم: "قورئانم بۆ بخوێنە" دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئان بۆتۆ بخوێنم کە بۆ تۆ دابەزیووە؟ فەرمووی: "من حەز دەکەم لە غەیری خۆمەوە بیبیستم" منیش (النساء)م خوێند، هەتا گەیشتمە: (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وجِئْنَا بِكَ عَلَى هؤُلاءِ شَهِيدًا) (٤١) واتە: ئەی چۆنە ئەگەر بۆ هەر میللەتێك شایەتێکمان هێنابێ و تۆشمان هێنابێ شایەت بیت بەسەر هەموویانەوە. سەرم هەڵبڕی یا پیاوێك لەلامەوە ئاگاداری کردم کە سەرم هەڵبڕی دەبینم چاوەکانی پێغەمبەر (ﷺ)پڕبووە لە فرمێسك..

١١٢٦ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: كُنْتُ بِحِمْصَ، فَقَالَ لِي بَعْضُ الْقَوْمِ: اقْرَأْ عَلَيْنَا، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمْ سُورَةَ يُوسُفَ (عليه السلام) قَالَ: فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: واللَّهِ مَا هَكَذَا أُنْزِلَتْ. قَالَ: قُلْتُ: ويْحَكَ، واللَّهِ لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالَ لِي: "أَحْسَنْتَ". فَبَيْنَمَا أَنَا أُكَلِّمُهُ إِذْ وجَدْتُ مِنْهُ رِيحَ الْخَمْرِ، قَالَ: فَقُلْتُ: أَتَشْرَبُ الْخَمْرَ وتُكَذِّبُ بِالْكِتَابِ؟ لَا تَبْرَحُ حَتَّى أَجْلِدَكَ. قَالَ: فَجَلَدْتُهُ الْحَدَّ. (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧١٥)

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: من لە (حمص)بووم هەندێ خەڵك پێیان وتم: قورئانمان بۆ بخوێنەرەوە، منیش سورەتی (یوسف)م (عليه السلام) بۆ خوێندنەوە، دەڵێ: پیاوێك لە خەڵکەکە وتی: بەخوا وادانەبەزیوە، دەڵێ: وتم: کوڕە ماڵ وێران بەخوا بۆ پێغەمبەرم (ﷺ) خوێندۆتەوە، فەرموویەتی: "چاکت خوێندەوە" لەکاتێکدا کە من لەگەڵی قسەم دەکرد، هەستم بە بۆنی عارەق کرد لێیەوە، دەڵێ: وتم: ئایا شەراب دەخۆیتەوە و بەربەرەکانێ لەگەڵ قورئانیشدا دەکەیت، نابێت لە جێی خۆت بجوڵێیت تا دارکاریت دەکەم، دەڵێ: داری حەددم لێدا.

## ( ١٤ ) هەڕەشە لە جیاوازی لە خوێندنی قورئاندا

١١٢٧ـ عَنْ جُنْدَبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَا ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُمْ، فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ فَقُومُوا". (بخاري/ فضائل القرآن/ ٤٧٧٣)

(جندب)ی کوڕی (عبدالله)ی (البجلی) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: "قورئان بخوێنن تا ئەوەندەی دڵتان لەسەری ڕێك بێت، کاتێك ناکۆکیتان تێکەوت هەستن".

# بەشی شەستو حەوتەم: تەفسیر

**( ١ ) سورەتی ( البقره ) ئایەتی ( وادخلوا الباب سجدا و قولوا حطّةً ) ٥٨**

١١٢٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "قيلَ لِبَنِي إِسْرَائيلَ: (ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وقُولُوا حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ) فَبَدَّلُوا، فَدَخَلُوا الْبَابَ يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ، وقَالُوا: حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٣٦٥)**

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: "بە نەوەی (اسرئیل) وترا (ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وقُولُوا حِطَّةٌ يُغْفَرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ) واتا: (لە دەرگاکەوە بە کڕنوشەوە بچنە ژوورەوە و بڵێن گوناهەکانمان لێهەڵوەرێنە تالەهەڵەکانتان چاو پۆشی بکرێت. کەچی ئەوان گۆڕییان بە قنەخشکێ چوونە ژوورەوەو، دەیانوت: دانەوێڵەیەك لە موویەکدا)

**( ٢ ) ئایەتی ( وليس البرُّ... ) ١٨٩**

١١٢٩ـ عَنْ أَبِي إِسْحَقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبراء يَقُولَ: كَانَتِ الْأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَرَجَعُوا لَمْ يَدْخُلُوا الْبُيُوتَ إِلَّا مِنْ ظُهُورِهَا، قَالَ: فَجاء رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ بَابِه، فَقيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةَ: (وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا). **(بخاري/ العمرة/ ١٧٠٩)**

أبو اسحاق دەڵێ: گوێم لە (البراء)بوو دەیوت:یاریدەدەران (الانصار) کاتێك حەجیان دەکرد و دەگەڕانەوە، لە پشت ماڵەوە نەبێ نەدەچوونە ژوورێ، دەڵێت پیاوێك لە یاریدەدەران وای نەکرد لە دەرگاکەوە چووەوە بۆ ماڵەوە، لەوبارەیەوە قسەی لەگەڵ کرا ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: (وليس البرّ بأن تأتوا البيوت من ظهورها) واتا: (خێر ئەوە نیە لەپشتەوە بێنەوە بۆ ماڵەوە).

**( ٣ ) سورەتی ( أل عمران ) ئایەتی ( هو الذي أنزل عليك الكتاب منه آيات محكمات ) ( ٧ )**

١١٣٠ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: تَلَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ): (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَا و الْفِتْنَة وابْتِغَا و تَأْوِيلِه ومَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ والرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا ومَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ). قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ

**اللَّهِ (ﷺ): "إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ (ﷻ)، فَاحْذَرُوهُمْ". (بخاري/ التفسير/ ٤٢٧٣)**

(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ..تا دوای ئایەتەکە(٧) واتا: (ئەو خوایە خوایەکی ئەو تۆیە کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر تۆ بەشێك لە ئایەتەکانی ڕوونو ئاشکران، ئەوانە بناغەی قورئانەکەن، هەندێکی تریش جیاوازی هەڵدەگرن و بە ئاسانی مانایان نازانرێت، ئەوانەی کە دڵیان خوار وخێچی تێدایە، دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، بۆ ئەوەی ئاشوب و ناکۆکی دروست بکەن، یان بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ بکەن، لە کاتێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە مەگەر هەر خوا خۆی بیانزانێت ، بۆیە ئەو کەسانەی کە ڕۆچون لە زانستداو دامەزراون، دەڵێن: ئێمە باوەڕی دامەزراومان بەهەموو ئەو ئایەتانە هەیە کە هەمووی لە لایەن پەروەردگارمانەوەیە، لەڕاستیدا تەنها ژیر و خاوەن بیرەکان بیردەکەنەوە". عائشە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "ئەگەر ئەوانەتان بینی کە دوای ئەو ئایەتانە دەکەوتن کە مانای جۆراوجۆر هەڵدەگرن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوای گەورە ناوی بردوون. خۆتانیان لێبپارێزن".

**١١٣١-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (ﷺ): أَنَّ رِجَالًا مِنَ الْمُنَافِقِينَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) كَانُوا إِذَا خَرَجَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ، وفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَإِذَا قَدِمَ النَّبِيُّ (ﷺ) اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ، وحَلَفُوا. وأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا، فَنَزَلَتْ: (لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلَا تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِنَ الْعَذَابِ). (بخاري/ التفسير/ ٤٢٩١)**

(أبو سعيد الخدري) (ﷺ) دەڵێ:لە کاتێکا پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆ غەزایەك چەند پیاوێك لە دووڕووەکان لێی دوادەکەوتن و، خۆش حاڵیش دەبوون بەوەی کە دواکەتبوون لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتەوە بڕوبیانوویان بۆ دەهێنایەوە و، سوێندیان دەخوارد حەزیشیان دەکرد سەناوستایشیش بکرێن بە شتێ کە نەیان کردووە، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (ولا تحسبن الذین..) واتە: (گومان وانەبەیت بەوانەی کە دڵخۆشن بەوەی کە کردوویانە، حەزیان لەوەیە ستایشی بکرێت بە شتێك کە نەیانکردووە، گومان وانەبەیت پێیان کە لەدەست سزا ڕزگاریان بووبێت، بەڵکو سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە).

١١٣٢ـ عَنْ حُمَيْدَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ: أَخْبَرَهُ أَنَّ مَرْوَانَ قَالَ: اذْهَبْ يَا رَافِعُ -لِبَوَّابِهِ- إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ: لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِئٍ مِنَّا فَرِحَ بِمَا أَتَى، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ مُعَذَّبًا، لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (ﷺ): مَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ الْآيَةِ؟ إِنَّمَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ. ثُمَّ تَلَا ابْنُ عَبَّاسٍ: (وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ). هَذِهِ الْآيَةَ، وَتَلَا ابْنُ عَبَّاسٍ: (لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا). وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: سَأَلَهُمُ النَّبِيُّ (ﷺ) عَنْ شَيْءٍ فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ، فَخَرَجُوا قَدْ أَرَوْهُ: أَنْ قَدْ أَخْبَرُوهُ بِمَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ، وَاسْتَحْمَدُوا بِذَلِكَ إِلَيْهِ، وَفَرِحُوا بِمَا أَتَوْا مِنْ كِتْمَانِهِمْ إِيَّاهُ مَا سَأَلَهُمْ عَنْهُ. **(بخاري/ التفسير/ ٤٢٩٢)**

له(حميد)ی کوڕی (عبدالرحمن) کوڕی (عوف)ەوە: کە (مروان) بە (رافع)ی دەرگاوانی وت: بڕۆ لای (أبن عباس) پێی بڵێ: ئەگەر هەر یەك لە ئێمە سزا بدرێت لەسەر ئەوەی کە دڵخۆشە بەوەی کە کردوویەتی حەز دەکات سوپاس بکرێت بە شتێ کە نەیکردووە، ئەوا هەر هەمووومان سزا دەدرێین، (أبن عباس) (ﷺ) وتی: چیتانە بەسەر ئەم ئایەتەوە، ئەم ئایەتە لەبارەی ئەهلی کتابەوە هاتووە. پاشان (أبن عباس) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وإذا اخذ الله میثاق الذین..) **(١٨٧)** واتە: (کاتێ خوا پەیمانی لە خاوەن کتێبەکان وەرگرت کە دەبێ ڕوونی بکەنەوە بۆ خەڵکی و نەیشارنەوە، کەچی پشتگوێیان خست و بە نرخێکی هەرزان فرۆشتیان ئای کە شتێکی بێنرخیان کڕیووە کە ژیانی دنیایە) ئینجا (أبن عباس) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ولا تحسبن الذین..)ئینجاوتی: پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری شتێکی لێکردن ئەوانیش لێیان شاردەوە و شتێکی تریان پێوت، کاتێ دەرچوونە دەرەوە، وایان پێنیشاندا کە وەڵامی پرسیارەکەی ئەویان داوەتەوەو، داوایان لێکرد لەسەر ئەوە سوپاس و ستایشیان بکات، لەناو خۆیشیاندا خۆش حاڵ بوون بەوەی کردیان و، وەڵامی پرسیارەکەی ئەویان شاردۆتەوە.

## (٤) سورەتی (النساء) ئایەتی (وأن خفتم الا تقسطوا في الیتامی) (٣) لەگەڵ (ویستفتونك في النساء)(١٢٧)

١١٣٣ـ عَنْ عُرْوَةَ بْنُ الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (ﷺ) عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تعالى: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النساء مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ). قَالَتْ: يَا

ابْنَ أُخْتِي هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ ولِيِّهَا تُشَارِكُهُ فِي مَالِه، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ ولِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ. فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ، ويَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، وأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النساء سِوَاهُنَّ. قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ (﵂): ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّه (ﷺ) بَعْدَ هَذِه الْآيَةِ فِيهِنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (يَسْتَفْتُونَكَ فِي النساء قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ومَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النساء اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ) قَالَتْ: والَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ تَعَالَى أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ الْآيَةُ الْأُولَى الَّتِي قَالَ (اللَّهُ) فِيهَا: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النساء). قَالَتْ عَائِشَةُ: وقَوْلُ اللَّه (تعالى) فِي (الْآيَةِ) الْأُخْرَى: (وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ) رَغْبَةَ أَحَدِكُمْ عَنِ الْيَتِيمَةِ الَّتِي تَكُونُ فِي حَجْرِه، حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ والْجَمَالِ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا وجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النساء إِلَّا بِالْقِسْطِ، مِنْ أَجْلِ رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ. (بخاري/ الشركة/ ٢٣٦٢)

له(عروه)ی کوڕی (الزبیر)ەوە: کە پرسیاری لە (عائشة) (﵂) کردووە دەربارەی ئایەتی (وأن خفتم الا تقسطوا في اليتامى..)واتە: (ئەگەر ترسیان لە ئەنجامدانی دادپەروەری لەگەڵ کچە بێباوکەکاندا هەبوو ئەوە لەئافرەتانی تر کە حەڵاڵە بۆتان ژن مارەبکەن دوو دوو، یا سێ سێ یان چوار چوار، عائشة وتی: ئەی خوشکەزام مەبەست ئەو کچە بێباوکەیە کە لە داڵدەی سەرپەرشتیارەکەیدایە و، بەشدارە لە سامانەکەیدا ئەویش شەیدای سامان و جوانیەکەی دەبێت. دەیەوێت مارەی بکات بەڵام بێ ئەوەی دادگەریی بنوێنن لەمارەییەکەیانداو، وەك خەڵكی تر مارەیی بداتێ. بۆیە ئەو جۆرە کەسانە ڕێگریکران لەوەی کە مارەیان بکەن، مەگەر کاتێك نەبێت دادگەربن لە گەڵیاندا و لەوەی کە مارەیان بکەن، مەگەر کاتێك نەبێت کە مارەیی تەواویان بۆ دابنێن و، وەك هاووێنەی خۆیان فەرمانیان پێکراکە (لەکاتی ئاوادا) ژنانی دیکە مارە بکەن لەوانەی کە بۆیان دەشێت جگەلەوان. (عروه) دەڵێ: (عائشة)(﵂) وتی: لەدوایدا هەمدیسان خەڵکی کەوتنەوە پرسیار کردن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش ئەم ئایەتە لەبارەیانەوە. خوای باڵادەستیش ئەم ئایەتەی تری نارد (ويستفتونك في النساء..)(١٢٧) واتە: (ئەی موحەممەد پرسیارت لێدەکەن لەبارەی ژنانەوە، پێیان بڵێ خوای گەورە دەربارەیان وەڵامتان دەداتەوە،

جا ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە لەبارەی ئەو کچە بێباوکانەی، ئەو مافەیان نادەنێ کە خوا بۆی داناون و، ناشتانەوێ مارەیان بکەن ڕێگە لەشووکردنیان دەگرن لەبەر سامانەکەیان. خوا فەرمانتان پێدەدات کە وانەکەن). عائشة دەڵێ: ئەوەی کە خوا باسی کردووە کەلە قورئاندا بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە ئایەتی یەکەمە کە خوا فەرمووی (وأن خفتم..). عائشە دەڵێ: ئەم ئایەتەیش (وترغبون أن تنكحوهن..) مەبەست پێی ئەو کچە بێ باوکەیە کە لەدالْدەی کەسێکدا دەبێت بەڵام کەم سامان و کەم جوانییە بۆیە نایخوازێت. هەر بۆیە ڕێگرییان لێکرا کە ئافرەتانی بێباوکی خاوەن سامان و جوانی مارە بکەن، مەگەر دادگەر بن لەگەڵیاندا، لەبەر ئەگەری حەز لێنەبوونیان.

**( ٥ ) ئایەتی ( ومن كان فقيرا فليأكل بالمعروف ) ٦**

**١١٣٤ـ عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها)، فِي قَوْلِه (عز وجل) (وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ) قَالَتْ أُنْزِلَتْ فِي والِي (مَالِ) الْيَتِيمِ الَّذِي يَقُومُ عَلَيْهِ ويُصْلِحُهُ، إِذَا كَانَ مُحْتَاجًا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهُ. (بخاري/ البيوع/ ٢٠٩٨)**

لە(عائشة)وە (رضي الله عنها) دەڵێ: ئایەتی (فمن كان فقيرا فليأكل بالمعروف) لەبارەی سەرپەرشتیاری سامانی هەتیوەوە دابەزیووە، کە سامانەکەی بۆ دەپارێزێت (چاکسازی تێدا دەکات، بۆیشی دروستە لەکاتی پێویستیدا لێی بخوات).

**( ٦ ) ئایەتی ( فما لكم في المنافقين فئتين ) ٨٨**

**١١٣٥ـ عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رضي الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ إِلَى أُحُدٍ، فَرَجَعَ نَاسٌ مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ، فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (ﷺ) فِيهِمْ فِرْقَتَيْنِ: قَالَ بَعْضُهُمْ، نَقْتُلُهُمْ وقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا، فَنَزَلَتْ: (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ). (بخاري/ فضائل المدينة/ ١٧٨٥)**

(زید)ی کوڕی (پابت)(رضي الله عنه) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بەرەو (أُحد)، کەسانێك لەوانەی کەلە خزمەتیدا بوون گەڕانەوە یا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەیان بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان دەیان وت: دەبێت بیان کوژین. هەندێکی تریش دەیان وت: نابێت، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (فما لكم المنافقين فئتين) واتە چیتانە وابەرامبەر بە دووڕووەکان بوون بە دووبەش.

**( ٧ ) ئایەتی ( ومن يقتل مؤمنا متعمدا ) ٩٣**

**١١٣٦ـ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): أَلِمَنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: لَا. قَالَ: فَتَلَوْتُ عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ**

اللَّه إِلَهًا آخَرَ ولَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. قَالَ: هَذِه آيَةٌ مَكِّيَّةٌ، نَسَخَتْهَا آيَةٌ مَدَنِيَّةٌ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا). **(بخاري/ التفسير/ ٤٣١٤)**

(سعيد)ی كوڕی (جبیر) دەڵێ: بە (أبن عباس)م وت: ئایا كەسێك كە ئیمانداریێكی بە دەستی ئەنقەست كوشت بێت تەوبەی بۆ هەیە؟ وتی: نەخێر. دەڵێ: منیش ئەم ئایەتەم بۆ خوێندەوە كە لە سورەتی (الفرقان)داهەیە: (والذين لا يدعون مع الله الهاً آخر و لايقتلون النفس التي حرَّم اللهُ الاّ بالحق) تاكۆتایی ئایەتەكە (كەباسی تەوبە دەكات) وتی: ئەم ئایەتە ئایەتێكی مەككەییە ئایەتێكی مەدینەیی حوكمەكەی (نەسخ)كردۆتەوە. كە ئەمەیە: (ومن يقتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها)واتە: هەر كەس ئیماندارێك بەدەستی ئەنقەست بكوژێت دۆزەخیەو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە.

## ( ٨ ) ئایەتی ( ولا تقولوا لمن القى اليكم السلم.. ) ٩٤

١١٣٧ـ عَن ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: لَقِيَ نَاسٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلًا فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَأَخَذُوهُ فَقَتَلُوهُ، وأَخَذُوا تِلْكَ الْغُنَيْمَةَ، فَنَزَلَتْ: (وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا) وقَرَأَهَا ابْنُ عَبَّاسٍ (السَّلَامَ). **(بخاري/ التفسير/ ٤٣١٥)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: خەڵكانێك لە موسڵمانان گەیشتن بەپیاوێك كە چەند سەر مەڕێكی كەمی پێبوو، پیاوەكە وتی: السلام عليكم. بەڵام ئەوان گرتیان و كوشتیان و مەڕەكانیشیان برد. لەم ڕووەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (ولا تقولوا لمن القى اليكم السلم لست مؤمنا).

## ( ٩ ) ئایەتی ( وان امرأة خافت من بعلها.. ) ١٨٢

١١٣٨ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) فِي قَوْلِه عَزَّ وجَلَّ: (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا) قَالَتْ: نَزَلَتْ فِي الْمَرْأَةِ تَكُونُ عِنْدَ الرَّجُلِ، فَلَعَلَّهُ أَنْ لَا يَسْتَكْثِرَ مِنْهَا، وتَكُونُ لَهَا صُحْبَةٌ ووَلَدٌ، فَتَكْرَهُ أَنْ يُفَارِقَهَا، فَتَقُولُ لَهُ: أَنْتَ فِي حِلٍّ مِنْ شَأْنِي. **(بخاري/ المظالم/ ٢١٣٤)**

(عائشة)(ﷺ) دەربارەی ئەم ئایەتە (وان امراة خافت من بعلها نشوزا أو اعراضا..) دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو ژنەهاتووە كەلای مێردەكەی دەبێت، و مێردەكەیشی ڕەنگە زۆر بەلایدا نەچێت و حەزی لێی نەبێت و، ژنەكەیش تەمەنێكی لەگەڵ بردووە سەر و منداڵی لێی هەیە، حەز ناكات كە مێردەكەی وازی لێبێنێت و بە مێردەكەی دەڵێت: تۆ (تەلاقم مەدە) و ئیتر ئازادبە لەبارەمەوە.

## ( ١٠ ) سورەتی ( المائدة ) ئایەتی ( اليوم اكملت لكم دينكم ) ١٣

١١٣٩ـ عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: جاء رَجُلٌ مِنَ الْيَهُود إِلَى عُمَرر فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَ وونَهَا، لَوْ عَلَيْنَا نَزَلَتْ مَعْشَرَ الْيَهُود لَاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا. قَالَ: وأَيُّ آيَةٍ؟ قَالَ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ورَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا). فَقَالَ عُمَرُ: إِنِّي لَأَعْلَمُ الْيَوْمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ، والْمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ، نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) بِعَرَفَاتٍ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ. **(بخاري/ الإيمان/ ٤٥)**

(طارق)ی کوڕی (شهاب) دەڵێ: پیاوێکی جوولەکە هات بۆلای (عمر) (ﷺ) وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئایەتێك لە کتێبەکەتاندایە، ئەگەر لەسەر ئێمەی کۆمەڵی جوولەکە دابەزییایە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بە جەژن. وتی: کام ئایەت؟ وتی: (اليوم أكملت لكم دينكم و..) واتا: (ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ بە پایان گەیاندن و، ناز و نیعمەتی خۆم بۆ تەواو کردن و ڕازی بووم بەوەی کە ئیسلام ئاینتان بێت) عومەر وتی: من باش دەزانم ئەم ئایەتە لەچ ڕۆژێکدا و لەچ شوێنێکدا دابەزیە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە (عەرەفات) لە ڕۆژی هەینیدا **(واتا دووجار جەژنە)**.

**١١٤٠**–عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجْنَ: (لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا): طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، والدَّجَّالُ، ودَابَّةُ الْأَرْضِ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٣٥٩)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: سێ (نیشانەی قیامەت) هەن هەرکاتێ پەیدابوون (لاينفع نفسا..) واتا: (هەرکەس لەو ڕۆژەدا ئیمان بهێنێت سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەبووبێت، یان کردەوەی چاکی هاوڕێ لەگەڵ ئیمانی نەبووبێت). هەڵاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە و، هاتنی دەجال و، جانەوەرەکەی زەوی".

## ( ١١ ) ئایەتی ( وما كان الله ليعذبهم وأنت فيهم )

١١٤١ـ عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: (اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السماء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) **(٣٢)** فَنَزَلَتْ: (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وأَنْتَ فِيهِمْ ومَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ. ومَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) إِلَى آخِرِ الْآيَةِ. **(بخاري/ التفسير/ ٤٣٧١)**

(أنس)ی کوڕی (مالك)(ﷺ) دەڵێ: (أبو جهل) وتی: (اللهم ان كان هذا..)واتە: ئەی خوایە ئەگەر ئەم دینە ڕاستە و لەلایەن تۆوە ڕەوانەکراوە لە ئاسمانەوە بەرد

بارانمان بکە، یان سزایەکی سەختمان بۆ بهێنە. ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی: (وما کان الله لیعذبهم..) واتە: (بێگومان خوای گەورەو بالاّ سزانادا بەسەریاندا هەتا تۆ لەناویاندا بیت، هەروەها خوایش سزا دەریان نییە هەتا ئەوان داوای لێخۆشبوون بکەن، ئەی بۆچی خوا سزایان نەدات لە کاتێکدا ئەوان ڕێگری دەکەن لە کەعبە..)

**( ١٢ ) سورەتی ( براءة ) و ( الانفال ) و( الحشر )**

١١٤٢ــ عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه): (سُورَةُ التَّوْبَةِ) قَالَ: آلتَّوْبَةِ؟ قَالَ: بَلْ هِيَ الْفَاضِحَةُ، مَا زَالَتْ تَنْزِلُ (وَمِنْهُمْ... وَمِنْهُمْ) حَتَّى ظَنُّوا **(أَنْ)** لَا يَبْقَى مِنَّا أَحَدٌ إِلَّا ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ: قُلْتُ: (سُورَةُ الْأَنْفَالِ)؟ قَالَ: تِلْكَ سُورَةُ بَدْرٍ. قَالَ: قُلْتُ: فَالْحَشْرُ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ. **(بخاري/ التفسير/ ٤٦٠٠)**

(سعيد)ی کوڕی (جبیر)دەڵێ: بە(أبن عباس)م (رضي الله عنه) وت: سورەتی (التوبة) وتی: ئایا تەوبە؟ وتی: بەڵکو سورەتی ئابروو بەرەیە، هەر بەردەوام دادەبەزی (تیایاندایە، تیایاندایە) تاوا گومانمان برد کە هیچ کەسێکمان نامێنێ ناوی تێیدا نەبێت. دەڵێ: وتم: ئەدی (الحشر)؟ وتی: ئەوە لەسەر (بنو النضیر)هاتە خوارێ.

**( ١٣ )سورەتی ( هود ) ئایەتی ( أن الحسنات یذهبن السیئات )**

١١٤٣ــ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: جاء رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ، وَإِنِّي أَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا، فَأَنَا هَذَا، فَاقْضِ فِيَّ مَا شِئْتَ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ (رضي الله عنه): لَقَدْ سَتَرَكَ اللَّهُ لَوْ سَتَرْتَ نَفْسَكَ. قَالَ: فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) شَيْئًا، فَقَامَ الرَّجُلُ فَانْطَلَقَ، فَأَتْبَعَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) رَجُلًا دَعَاهُ وتَلَا عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ: (أَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ). فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ :يَا نَبِيَّ اللَّهِ، هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: "بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً". **(بخاري/ مواقيت الصلاة/ ٥٠٣)**

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (رضي الله عنه) دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەلا خوارووی مەدینەوە ژنێکم بەگیر هێنا، تووشی گوناه بووم بێ ئەوەی زینای لەگەڵ بکەم، ئیستایش ئەمە منم، چ بڕیارێکم لەبارەوە دەدەیت بفەرموو ئامادەم. (عمر)(رضي الله عنه) پێی وت: خوا بۆی پۆشیوویت ئەگەر خۆیشت بتپۆشیایا. دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، پیاوەکە هەستا و ڕۆیشت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی بە شوێنیدا نارد بانگی کرد و ئەم ئایەتەی

بەسەردا خوێندەوە (وأقم الصلاة..)واتە: (نوێژ بەچاکی ئەنجام بدە لەهەردوو سەری ڕۆژەوە (کە بەیانی و عەسرە) لە چەند ساتێکی شەویشدا کە نزیکە لە ڕۆژەوە و مەبەست شێوان و خەوتنانە، لە ڕاستیدا کردەوە چاکەکان گوناهەکان ڕادەماڵن ئەوەش ئامۆژگاریە بۆ ئەوانەی یادی خوادەکەن) پیاوێك لەناو خەڵکەکەدا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بەس تایبەتە بەو؟ فەرمووی: "بەڵکو بەهەموو خەڵکی بە گشتی".

## ( ١٤ ) سورەتی سبحان (الاسراء) ئایەتی ( ويسئلونك عن الروح ) ٥٨

**١١٤٤ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (ﷺ) فِي حَرْثٍ وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى عَسِيبٍ، إِذْ مَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ، فَقَالُوا: مَا رَابَكُمْ إِلَيْهِ لَا يَسْتَقْبِلُكُمْ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ؟ فَقَالُوا: سَلُوهُ، فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُهُمْ فَسَأَلَهُ عَنِ الرُّوحِ، قَالَ: فَأَسْكَتَ النَّبِيُّ (ﷺ) فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ شَيْئًا، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، قَالَ: فَقُمْتُ مَكَانِي، فَلَمَّا نَزَلَ الْوَحْيُ قَالَ: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُ وتيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا). (بخاري/ التفسير/ ٤٤٤٤)**

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: لەکاتێکدا من لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) لەناو کێڵگەیەکدا دەڕۆیشتم، خۆیدابوو بەسەر داردەستێکی دارخورمادا، بەلای چەند جولەکەیەکدا تێپەڕی لەناو خۆیاندا بەیەکتریان دەوت: پرسیاری لێبکەن دەربارەی ڕۆح، وتیان: چی بەدگومانی کردوون لە بێتوانایی ئەو پیاوە، کێ دەڵێ وەلامێکی واتان ناداتەوە کە پێتان ناخۆش بێ؟ وتیان: پرسیاری لێبکەن، هەندێکیان لەلایدا وەستان و پرسیاریان لێکرد دەربارەی ڕۆح. دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) مات بوو، هیچ وەلامێکی نەدایەوە، منیش زانیم کە وەحی بۆدێت لە شوێنی خۆم ڕاوەستام، کاتێ وەحی دابەزی فەرمووی: "(ويسئلونك عن الروح..) واتە: (پرسیارت لێدەکەن لەبارەی ڕۆحەوە بڵێ ڕۆح تایبەتە بە زانستی پەروەردگارمەوە، ئێوە تەنها کەمێك زانیاریتان پێدراوە)".

## ( ١٥ ) ئایەتی ( أولئك الذين يدعون يبتغون الى ربهم الوسيلة ) ٥٧

**١١٤٥ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ): (أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ) قَالَ: كَانَ نَفَرٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ، فَأَسْلَمَ النَّفَرُ مِنَ الْجِنِّ، وَاسْتَمْسَكَ الْإِنْسُ بِعِبَادَتِهِمْ، فَنَزَلَتْ: (أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ). (بخاري/ التفسير/ ٤٤٣٧)**

(عبدالله) کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: ئایەتی: (أولئك الذین..) واتە: (ئەوانەی ئەوان هاواریان بۆ دەکەن، ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن، داوای نزیك بوونەوە لەخوا دەخوازن) ئەم ئایەتە دەربارەی چەند کەسێك لە مرۆڤ هاتە خوارەوە کە چەند کەسێکیان لە جنۆکە دەپەرست. ئەو چەند کەسەی کەلە جنۆکە بوون موسڵمان بوون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چەند کەسە لە مرۆڤ هەر لەسەر پەرستنی خۆیان مانەوە. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (أولئل الذین یدعون..)

## ( ١٦ ) ئایەتی ( ولا تجهر بصلاتك و لا تخافت بها )

**١١٤٦ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وجَلَّ: (وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ولَا تُخَافِتْ بِهَا) قَالَ: نَزَلَتْ ورَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مُتَوَارٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ، فَإِذَا سَمِعَ ذَلِكَ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ ومَنْ أَنْزَلَهُ ومَنْ جاء بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (ﷺ): (وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ) فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ قرَا وتَكَ (وَلَا تُخَافِتْ بِهَا) عَنْ أَصْحَابِكَ، أَسْمِعْهُمُ الْقُرْآنَ ولَا تَجْهَرْ ذَلِكَ الْجَهْرَ (وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا) يَقُولُ: بَيْنَ الْجَهْرِ والْمُخَافَتَةِ. (بخاري/ التفسير/ ٤٤٤٥)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەربارەی فەرموودەی خوا (ولا تجهر بصلاتك..)واتە: (لەکاتی خوێندنی قورئان لە نوێژەکانتدا دەنگ بەرز مەکە و زۆریش نزمی مەکە، لەو نێوانەدا حاڵەتی مامناوەندی بگرە، دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی حەشار ئەدا لە مەککەدا، کاتێ نوێژی بە هاوەڵەکانی بکردایە، دەنگی بەرز دەکردەوە بە قورئان خوێندن. کاتێ بێ باوەڕەکان ئەمەیان دەبیست جنێویان دەدا بە قورئان و، ئەوەی کەناردوێتی و ئەوەش کە بۆی نێردراوە، هەر بۆیە خوا بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: (ولا تجهر بصلاتك..)واتە: (نوێژەکەت بە ئاشکرا مەخوێنە نەبادا بێ باوەڕەکان گوێیان لێبێت) (ولا تخافت بها) (بەنهێنیش مەیخوێنە بەڕادەیەك هاوەڵەکانت گوێیان لێنەبێت قورئان، بدە بە گوێیاندا و ئەوەندەش دەنگ بەرز مەکەرەوە) (وابتغ بین ذلك سبیلا) واتە: (شێوازێك بگرە نە بەرز و نە نزم)".

**١١٤٧ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وجَلَّ: (وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ ولَا تُخَافِتْ بِهَا) قَالَتْ: أُنْزِلَ هَذَا فِي الدعاء. (بخاري/ التفسير/ ٤٤٤٦)**

(عائشە) (ﷺ) دەربارەی ئایەتی (ولا تجهر بصلاتك ولا تخافت بها) دەڵێ: ئەم ئایەتە لەبارەی دوعا و نزاوە دابەزی.

**( ١٧ ) سورەتی ( الكهف ) ئایەتی ( فلا نقيم لهم يوم القيامة وزنا ) ١٠٥**

**١١٤٨ـ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: "إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، اقْرَءوا: (فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا)". (بخاري/ التفسير/ ٤٤٥٢)**

(ابو هريره)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: "لـەرۆژی قیامەتـدا پیاوی زەبەلاحی قەڵەوی ئەو تۆ دێت کـەلای خـوا نرخـی باڵـە مێشـولەیەکی نیـە". ئایەتی (فلا نقيم لهم..) بخوێننەوە.

**( ١٨ ) سورەتی مريم  ئایەتی ( وأنذرهم يوم الحسرة ) ٣٩**

**١١٤٩ـ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (الخدري) (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "يُجاء بِالْمَوْتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ كَبْشٌ أَمْلَحُ –زَادَ أَبُو كُرَيْبٍ– فَيُوقَفُ بَيْنَ الْجَنَّةِ والنَّارِ –وَاتَّفَقَا فِي بَاقِي الْحَدِيثِ– فَيُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ وَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، قَالَ: وَيُقَالُ: يَا أَهْلَ النَّارِ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ قَالَ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ وَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُذْبَحُ، قَالَ: ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ فَلَا مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ خُلُودٌ فَلَا مَوْتَ". (قَالَ): ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ) وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى الدُّنْيَا. (بخاري/ التفسير/ ٤٤٥٣)**

(أبو سعيد الخدری) (ﷺ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرموویـەتی: "مـردن دەهێنرێـت لـە ڕۆژی قیامەتـدا لـە سـەر شـێوەی بـەرانێکی بـازگ دەوترێـت: ئـەی بەهەشتییەکان ئەمە دەناسن؟ ئەمانیش مـل درێژدەکـەن و تەماشـا دەکـەن دەڵـێن: بەڵێ ئەوە مردنە، هەروەها دەوترێت: ئەی دۆزەخیەکان ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش مل درێژ دەکەن و تەماشا دەکەن و دەڵێن: بەڵێ ئەوە مردنە ئـەمجا فـەرمان دەکرێـت و سـەری دەبـڕن، پاشـان دەوترێـت: ئـەی بەهەشـتیەکان: مانـەوەی بـێ مـردن، ئـەی دۆزەخیەکان مانەوەی بێ مردن". پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: (وانذرهم يوم الحسرة..) واتە: (ئەی پێغەمبەر سـتەمکاران ئاگـادار کـەرەوە لـەڕۆژی پەشیمانی کاتێ کـار لـەکار تـرازاوە. وە ئـەوانیش غەفڵـەت گرتـوونی و تـازە بـاوەڕ ناهێنن، بەدەستی ئاماژەی بۆ دنیا کرد، (أبو كريب) ئەوەی بۆ زیاد کردووە: کە ئەو بەرانە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەوەستێنرێت.

## ( ١٩ ) ئایەتی ( أفرأيت الذي كفر بأياتنا ) ٧٧

١١٥٠ـ عَنْ خَبَّابٍ (ﷺ) قَالَ: كَانَ لِي عَلَى الْعَاصِ بْنِ وائِلٍ دَيْنٌ فَأَتَيْتُهُ أَتَقَاضَاهُ، فَقَالَ لِي: لَنْ أَقْضِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: **(إِنِّي)** لَنْ أَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ (ﷺ) حَتَّى تَمُوتَ ثُمَّ تُبْعَثَ، قَالَ: وإِنِّي لَمَبْعُوثٌ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ؟ فَسَوْفَ أَقْضِيكَ إِذَا رَجَعْتُ إِلَى مَالٍ ووَلَدٍ. قَالَ وكيعٌ: كَذَا قَالَ الْأَعْمَشُ. قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذه الْآيَةُ: (أَفَرَأَيْتَ الَّذي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وقَالَ لَأُوتيَنَّ مَالًا ووَلَدًا) إِلَى قَوْله: (وَيَأْتِينَا فَرْدًا). **(بخاري/ البيوع/ ١٩٨٥)**

(خبّاب)(ﷺ) دەڵێ: قەرزێکم لای (عاص)ی کوڕی (وائل) بوو، چوو بۆلای داوام کردووه، پێی وتم: نات دەمەوە تابێ باوەڕ نەبیت بە (محمد)، دەڵێ: منیش پێم وت: هەگیز بێ باوەڕ نابم بە (محمد) تادەمریت و پاشان زیندوو دەبیتەوە. وتی: جا من زیندوو دەبمەوە پاش مردن؟ کەوابوو لەوێ دەت دەمەوە کاتێ گەڕامەوە لای ماڵو منداڵ. (وکیع) دەڵێ: (الاعمش)یش هەروای وتووە. دەڵێ: ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (أفرأيت الذي كفر.. بايأتينا) واتە: (ئایا ئەو جۆرە کەسانەت دیوە کە باوەڕی بە ئایەتەکانی ئێمە نییە و دەڵێت: سوێند بەخوا من سامان و نەوەم پێدەدرێت ئایا ئەو ئاگاداربووە بەسەر نهێنیەکاندا یان بەڵێنی لە خواوە وەرگرتووە. نەخێر وانییە ئەوەی کە دەیڵێت دەینووسین و لەسەری سزای دوور ودرێژی دەدەین، ئەوەی کە دەڵێت بە میراتیی لێی دەستێنێتەوە و خۆی بەتەنها دێتەوە بەردەستمان).

## ( ٢٠ ) سورەتی ( الانبياء ) ئایەتی ( كما بدأنا أول خلق نعيده ) ١٠٤

١١٥١ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) بِمَوْعظَةٍ فَقَالَ: "يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ إِلَى اللَّه حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا: (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ) **(١٠٤)** أَلَا وإِنَّ أَوَّلَ الْخَلَائِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَة إِبْرَاهِيمُ عَلَيْه السَّلَام. أَلَا وإِنَّهُ سَيُجَاء بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي، فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي، فَيُقَالُ: إِنَّكَ لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا **(بَعْدَكَ)** فَأَقُولُ كَمَا قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: (وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وأَنْتَ عَلَى كُلِّ شيء شَهِيدٌ. إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) **(المائدة: ١١٧-١١٨)**. قَالَ: فَيُقَالُ لِي: إِنَّهُمْ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٤٦٣)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەناوماندا ڕاوەستاو ئامۆژگاریی کردین فەرمووی: "ئەی خەڵکینە ئێوە بەپێی پەتی و ڕووتو قوتی و خەتەنە نەکراوی، لەبارەگای خوادا کۆدەکرێنەوە لە (کما بدأنا..)واتە: هەروەك چۆن لەسەرتاوە دروستمان کرد وەکو ئەوەی خۆی لێدەکەینەوە، ئەوە پەیمان و بەڵێنی ئێمەیە بێگومان ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین. ئاگاداربن یەکەم کەس کە پۆشتە دەکرێتەوە لەڕۆژی قیامەتدا (أبراهیم)ە (ﷺ) هەروەها ئاگاداربن کە پیاوانێك لە ئومەتەکەم دەهێنرێن. بەلای چەپدا دەبرێن. منیش دەڵێم ئەی پەروەردگار هاوەڵەکانم، دەوترێت: تۆ چوزانی چیان داهێناوە پاش خۆت دەڵێم وەك چۆن بەندەی باش (حەزرەتی عیسا) وتی: (وکنت علیهم شهیدا..) واتە: هەتا لەناویاندا بووم من شایەت بووم لەسەریان، بەڵام لەکاتێکدا منت بردەوە لای خۆت، ئیتر هەر خۆت چاودێر و ئاگادار بوویت لەسەریان. تۆ ئاگاداری بە هەموو شتێك. ئەگەر سزایان بدەیت بەندەی خۆتن ئەگەر لێشیان خۆش بیت بەڕاستی تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت. دەڵێ: پێم دەوترێت: ئەوانە لەو کاتەوە کە جیابوویتەوە لێیان پاشگەزبوونەتەوە لە دینەکەیان".

**( ٢١ ) سورەتی ( الحج ) ئایەتی ( هذا خصمان أختصموا في ربهم ) ١٩**

**١١٥٢ـ عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ (ﷺ) يُقْسِمُ قَسَمًا: إِنَّ (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) إِنَّهَا نَزَلَتْ فِي الَّذِينَ بَرَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ، حَمْزَةُ وعَلِيٌّ وعُبَيْدَةُ بْنُ الْحَارِثِ، وعُتْبَةُ وشَيْبَةُ ابْنَا رَبِيعَةَ والْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. (بخاري/ التفسير/ ٤٤٦٦)**

(قیس)ی کوڕی (عباد) دەڵێ: گوێم لە (أبو ذر)بوو بەوپەڕی دڵنیاییەوە سوێندی دەخوارد: کە (هذان خصمان..) واتە: (ئەمانە دوو دەستەی دژ بەیەکن کردیانە کێشە لەبارەی پاروەردگاریانەوە)، دەربارەی ئەو کەسانەی هاتونە خوارەوە کەلە ڕۆژی بەدرا زۆرانبازیان کرد. (حمز)ەو (علی) و (عبیدە)ی کوڕی (الحارث)، لەگەڵ (عتبە)ەو (شیبە)ی کوڕانی ربیعە و (الولید) ی کوڕی (عتبة).

**( ٢٢ ) سورەتی ( نور ) ئایەتی ( أن الذین جاؤوا بالأفك عصبة منكم )**

**١١٥٣ـ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ وعُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ وعَلْقَمَةُ بْنُ وقَّاصٍ وعُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ حَدِيثِ عَائِشَةَ (ﷺ) زَوْجِ النَّبِيِّ**

(ﷺ) حينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الْإِفك مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ ممَّا قَالُوا، وكُلُّهُمْ حَدَّثَني طَائفَةً منْ حَديثها، وبَعْضُهُمْ كَانَ أَوْعَى لحَديثهَا منْ بَعْضٍ وأَثْبَتَ اقْتصَاصًا، وقَدْ وعَيْتُ عَنْ كُلِّ واحدٍ منْهُمُ الْحَديثَ الَّذي حَدَّثَني، وبَعْضُ حَديثهِمْ يُصدِّقُ بَعْضًا، ذَكَرُوا: أَنَّ عَائشَةَ زَوْجَ النَّبيِّ (ﷺ) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نسَائه، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بهَا رَسُولُ اللَّه (ﷺ) مَعَهُ، قَالَتْ عَائشَةُ: فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا في غَزْوَةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ فيهَا سَهْمي، فَخَرَجْتُ مَعَ رَسُول اللَّه (ﷺ) وذَلكَ بَعْدَ مَا أُنْزلَ الْحجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ في هَوْدَجي وأُنْزَلُ فيه مَسيرَنَا، حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) منْ غَزْوه وقَفَلَ ودَنَوْنَا منَ الْمَدينَة آذَنَ لَيْلَةً بالرَّحيل، فَقُمْتُ حينَ آذَنُوا بالرَّحيل فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ منْ شَأْني أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْل فَلَمَسْتُ صَدْري، فَإِذَا عقْدي منْ جَزْعِ ظَفَارِ قَد انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عقْدي، فَحَبَسَني ابْتغَاؤُهُ، وأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذينَ كَانُوا يَرْحَلُونَ لي، فَحَمَلُوا هَوْدَجي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعيريَ الَّذي كُنْتُ أَرْكَبُ، وهُمْ يَحْسبُونَ أَنِّي فيه، قَالَتْ: وكَانَت النساء إِذْ ذَاكَ خفَافًا لَمْ يُهَبَّلْنَ ولَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، إِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ منَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكر الْقَوْمُ ثقَلَ الْهَوْدَج حينَ رَحَلُوهُ ورَفَعُوهُ، وكُنْتُ جَاريَةً حَديثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وسَارُوا، ووَجَدْتُ عقْدي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنَازلَهُمْ ولَيْسَ بهَا دَاعٍ ولَا مُجيبٌ، فَتَيَمَّمْتُ مَنْزلي الَّذي كُنْتُ فيه، وظَنَنْتُ أَنَّ الْقَوْمَ سَيَفْقدُوني فَيَرْجعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالسَةٌ في مَنْزلي غَلَبَتْني عَيْني فَنمْتُ، وكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّل السُّلَميُّ ثُمَّ الذَّكْوَانيُّ قَدْ عَرَّسَ منْ وراء الْجَيْش، فَادَّلَجَ فَأَصْبَحَ عنْدَ مَنْزلي، فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائمٍ، فَأَتَاني فَعَرَفَني حينَ رَآني، وقَدْ كَانَ يَرَاني قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ الْحجَابُ عَلَيَّ، فَاسْتَيْقَظْتُ باسْترْجَاعه حينَ عَرَفَني، فَخَمَّرْتُ وجْهي بجلْبَابي، و واللَّه مَا يُكَلِّمُني كَلمَةً، ولَا سَمعْتُ منْهُ كَلمَةً غَيْرَ اسْترْجَاعه، حَتَّى أَنَاخَ رَاحلَتَهُ فَوَطئَ عَلَى يَدهَا فَرَكبْتُهَا، فَانْطَلَقَ يَقُودُ بيَ الرَّاحلَةَ حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُوغرينَ في نَحْر الظَّهيرَة، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ في شَأْني، وكَانَ الَّذي تَوَلَّى كبْرَهُ عَبْدُ اللَّه بْنُ أُبَيّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَدمْنَا الْمَدينَةَ، فَاشْتَكَيْتُ حينَ قَدمْنَا الْمَدينَةَ شَهْرًا، والنَّاسُ يُفيضُونَ في قَوْل أَهْل الْإِفْك، ولَا أَشْعُرُ بشَيْءٍ منْ ذَلكَ. وهُوَ يَريبُني في وجَعي أَنِّي لَا أَعْرفُ منْ رَسُول اللَّه (ﷺ) اللُّطفَ الَّذي كُنْتُ أَرَى منْهُ حينَ أَشْتَكي، إِنَّمَا يَدْخُلُ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) فَيُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُولُ: "كَيْفَ تيكُمْ"؟ فَذَاكَ يَريبُني ولَا أَشْعُرُ بالشَّرِّ، حَتَّى خَرَجْتُ بَعْدَ مَا نَقَهْتُ وخَرَجَتْ مَعي أُمُّ مسْطَحٍ قبلَ الْمَنَاصعِ وهُوَ مُتَبَرَّزُنَا، ولَا نَخْرُجُ إِلَّا لَيْلًا إِلَى لَيْلٍ، وذَلكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخذَ الْكُنُفَ قَريبًا منْ بُيُوتنَا، وأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَب الْأُوَل في التَّنَزُّه، وكُنَّا

نَتَأَذَّى بِالْكُنُف أَنْ نَتَّخذَهَا عنْدَ بُيُوتنَا، فَانْطَلَقْتُ انا وأُمُّ مسْطَحٍ وهِيَ بِنْتُ أَبِي رُهْمِ بْنِ الْمُطَّلب بْن عَبْد مَنَاف، وأُمُّهَا ابْنَةُ صَخْر بْن عَامرٍ خَالَةُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيق (رضي الله عنه)، وابْنُهَا مسْطَحُ بْنُ أُثَاثَةَ بْن عَبَّاد بْن الْمُطَّلب، فَأَقْبَلْتُ انا وابْنَتُ أَبِي رُهْمٍ قبلَ بَيْتي حينَ فَرغْنَا منْ شَأْننَا، فَعَثَرَتْ أُمُّ مسْطَحٍ في مرْطهَا، فقَالَتْ: تَعس مسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْت، أَتَسُبِّينَ رَجُلًا قَدْ شَهدَ بَدْرًا؟ قَالَتْ: أَيْ هَنْتَاهْ، أَوَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَالَ؟ قُلْتُ: ومَاذَا قَالَ؟ قَالَتْ: فَأَخْبَرَتْني بِقَوْلِ أَهْلِ الْإِفْك، فَازْدَدْتُ مَرَضًا إِلَى مَرَضي، فَلَمَّا رجَعْتُ إِلَى بَيْتي فَدخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) فَسلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: "كَيْفَ تيكُمْ". قُلْتُ: أَتَأْذَنُ لي أَنْ آتيَ أَبوَيَّ؟ قَالَتْ: وأَنَا حينَئذٍ أُرِيدُ أَنْ أَتَيَقَّنَ الْخَبَرَ منْ قبلهمَا، فَأَذنَ لي رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم)، فَجِئْتُ أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لأُمِّي: يَا أُمَّتَاهْ مَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ؟ فقَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ هَوِّني عَلَيْك، فوَاللَّه لَقَلَّمَا كَانَت امْرَأَةٌ قَطُّ وضيئَةٌ عنْدَ رَجُلٍ يُحبُّهَا، ولَهَا ضَرَائرُ، إِلَّا كَثَّرْنَ عَلَيْهَا. قَالَتْ: قُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّه، وقَدْ تَحَدَّثَ النَّاسُ بِهَذَا؟ قَالَتْ: فَبَكَيْتُ تلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لَا يَرْقَأُ لي دَمْعٌ، ولَا أَكْتَحلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ أَصْبَحْتُ أَبْكي، ودعَا رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) عليَّ ابْنَ أَبِي طَالبٍ وأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رضي الله عنه) حينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ، يَسْتَشيرُهُمَا في فرَاق أَهْله، قَالَتْ: فَأَمَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ فَأَشَارَ عَلَى رَسُول اللَّه (صلى الله عليه وسلم) بِالَّذي يَعْلَمُ منْ براءة أَهْله، وبِالَّذي يَعْلَمُ في نَفْسه لَهُمْ منَ الْوُدِّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه هُمْ أَهْلُكَ ولَا نَعْلَمُ إِلَّا خَيْرًا. وأَمَّا عَليُّ بْنُ أَبِي طَالبٍ (رضي الله عنه) فَقَالَ: لَمْ يُضَيِّق اللَّهُ عَلَيْكَ، والنساء سوَاهَا كَثيرٌ، وإِنْ تَسْأَل الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ. قَالَتْ: فَدعَا رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) بَرِيرَةَ، فَقَالَ: "أَيْ بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْت منْ شيْء يَرِيبُك منْ عَائشَةَ". قَالَتْ لَهُ بَرِيرَةُ: والَّذي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إِنْ رَأَيْتُ عَلَيْهَا أَمْرًا قَطُّ أَغْمصُهُ عَلَيْهَا أَكْثَرَ منْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَديثَةُ السِّنِّ، تَنَامُ عَنْ عَجين أَهْلهَا، فَتَأْتي الدَّاجنُ فَتَأْكُلُهُ، قَالَتْ: فَقَامَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) عَلَى الْمنْبَر فَاسْتَعْذَرَ منْ عَبْد اللَّه بْن أُبَيّ ابْنِ سَلُولَ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) وهُوَ عَلَى الْمنْبَر: "يَا مَعْشَرَ الْمُسْلمينَ، مَنْ يَعْذرُني منْ رَجُلٍ قَدْ بَلَغَ أَذَاهُ في أَهْل بَيْتي، فَوَاللَّه مَا عَلمْتُ عَلَى أَهْلي إِلَّا خَيْرًا، ولَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا مَا عَلمْتُ عَلَيْه إِلَّا خَيْرًا، ومَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلي إِلَّا مَعي". فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ الْأَنْصَارِيُّ (رضي الله عنه) فَقَالَ: أَنَا أَعْذرُكَ منْهُ يَا رَسُولَ اللَّه، إِنْ كَانَ منَ الْأَوْس ضَرَبْنَا عُنُقَهُ، وإِنْ كَانَ منْ إِخْوَاننَا الْخَزْرَج أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ. قَالَتْ: فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ (رضي الله عنه)، وهُوَ سَيِّدُ الْخَزْرَج وكَانَ رَجُلًا صَالحًا، ولَكن احْتَمَلَتْهُ الْحَميَّةُ، فَقَالَ لسَعْد بْن مُعَاذٍ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّه لَا تَقْتُلُهُ ولَا تَقْدرُ عَلَى قَتْله. فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وهُوَ ابْنُ عَمِّ سَعْد بْن مُعَاذٍ، فَقَالَ لسَعْد بْن عُبَادَةَ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللَّه لَنَقْتُلَنَّهُ،

فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ الْمُنَافِقِينَ. فَثَارَ الْحَيَّانِ الْأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَقْتَتِلُوا، وَرَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَائِمٌ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ، قَالَتْ: وَبَكَيْتُ يَوْمِي ذَلِكَ لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ، وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، ثُمَّ بَكَيْتُ لَيْلَتِي الْمُقْبِلَةَ، لَا يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلَا أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، وَأَبَوَايَ يَظُنَّانِ أَنَّ الْبُكَا وَ فَالِقٌ كَبِدِي، فَبَيْنَمَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي اسْتَأْذَنَتْ عَلَيَّ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَذِنْتُ لَهَا فَجَلَسَتْ تَبْكِي، قَالَتْ: فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَلِكَ دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَسَلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ، قَالَتْ: وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مُنْذُ قِيلَ لِي مَا قِيلَ، وَقَدْ لَبِثَ شَهْرًا لَا يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي بِشَيءٍ، قَالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ جَلَسَ ثُمَّ قَالَ: "أَمَّا بَعْدُ يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللَّهُ (ﷻ)، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبٍ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ". قَالَتْ: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي، حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً، فَقُلْتُ لِأَبِي: أَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فِيمَا قَالَ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ لِأُمِّي: أَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، فَقُلْتُ –وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لَا أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ–: إِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَرَفْتُ أَنَّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ بِهَذَا حَتَّى اسْتَقَرَّ فِي نُفُوسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَإِنْ قُلْتُ لَكُمْ: إِنِّي بَرِيئَةٌ –وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ– لَا تُصَدِّقُونِي بِذَلِكَ، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِأَمْرٍ –وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ– لَتُصَدِّقُونَنِي، وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلًا إِلَّا كَمَا قَالَ أَبُو يُوسُفَ: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ). قَالَتْ :ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَاضْطَجَعْتُ عَلَى فِرَاشِي. قَالَتْ: واناءاللَّه حِينَئِذٍ أَعْلَمُ أَنِّي بَرِيئَةٌ، وَأَنَّ اللَّهَ مُبَرِّئِي بِبَراءتِي، وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنْ يُنْزَلَ فِي شَأْنِي وَحْيٌ يُتْلَى، وَلَشَأْنِي كَانَ أَحْقَرَ فِي نَفْسِي مِنْ أَنْ يَتَكَلَّمَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ بِأَمْرٍ يُتْلَى، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) **(فِي النَّوْمِ)** رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بِهَا. قَالَتْ: فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مَجْلِسَهُ، وَلَا خَرَجَ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ أَحَدٌ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى نَبِيِّهِ (ﷺ) فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَا وَ عِنْدَ الْوَحْيِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ فِي الْيَوْمِ الشَّاتِ، مِنْ ثِقَلِ الْقَوْلِ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَهُوَ يَضْحَكُ، فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا أَنْ قَالَ: "أَبْشِرِي يَا عَائِشَةُ، أَمَّا اللَّهُ فَقَدْ بَرَّأَكِ". فَقَالَتْ لِي أُمِّي: قُومِي إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَا أَقُومُ إِلَيْهِ وَلَا أَحْمَدُ إِلَّا اللَّهَ، هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ بَراءتِي، قَالَتْ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ) عَشْرَ آيَاتٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلَاءِ

الْآيَاتِ براءتي. قَالَتْ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ (ﷺ) -وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وفَقْرِه-: واللَّه لَا أُنْفِقُ عَلَيْهِ شَيْئًا أَبَدًا بَعْدَ الَّذي قَالَ لعَائشَةَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ منْكُمْ والسَّعَة أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى) إِلَى قَوْله: (أَلَا تُحبُّونَ أَنْ يَغْفرَ اللَّهُ لَكُمْ) -قَالَ حبَّانُ بْنُ مُوسَى: قَالَ عَبْدُ الله بْنُ الْمُبَارَك: هَذه أَرْجَى آيَةٍ في كتَاب اللَّه (ﷻ)- فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: واللَّه إِنِّي لَأُحبُّ أَنْ يَغْفرَ اللَّهُ لي، فَرَجَعَ إِلَى مسْطَحٍ النَّفَقَةَ الَّتي كَانَ يُنْفقُ عَلَيْه وقَالَ: لَا أَنْزِعُهَا منْهُ أَبَدًا، قَالَتْ عَائشَةُ: وكَانَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) سَأَلَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ زَوْجَ النَّبِيِّ (ﷺ) عَنْ أَمْري: "مَا عَلمْت" أَوْ "مَا رَأَيْت". فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه أَحْمِي سَمْعِي وبَصَرِي، واللَّه مَا عَلمْتُ إِلَّا خَيْرًا. قَالَتْ عَائشَةُ: وهِيَ الَّتي كَانَتْ تُسَامِينِي مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ، وطَفِقَتْ أُخْتُهَا حَمْنَةُ بِنْتُ جَحْشٍ تُحَارِبُ لَهَا، فَهَلَكَتْ فِيمَنْ هَلَكَ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَهَذَا مَا انْتَهَى إِلَيْنَا مِنْ أَمْرِ هؤلاء الرَّهْطِ. **(بخاري/ المغازي/ ٣٩١٠)**

(الزهره) دەڵێ: (سعيد)ی کوڕی (المسيب) و(عتبه)ی کوڕی (الزبير)و (علقمه)ی کوڕی (وعاص) و (عبيدالله)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی (عتبه)ی کوڕی (مسعود) بۆیان گێڕاومەتەوە دەربارەی ڕووداوەکەی (عائشة)(ﷺ) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ بوختانچییەکان ئەوەیان دەربارە وت کە وتیان. هەریەك لەوانە، چمکێك لە ڕیوایەتەکەی عائشەیان بۆ گێڕاوەتەوە، بەڵام هەندێکیان لە هەندێکی تریان باشتر لەبەریان کرد بوو، چیرۆکەکەیان باشتر دەزانی، منیش لە هەریەکەیانەوە ئەوەم لەبەرکردووە کە بۆی گێڕاومەتەوە، قسەی هەندێکیشیان لەناویەکدا ڕاستی قسەی ئەوانی تریان دەسەلمێنێ. دەڵێن: (عائشة)(ﷺ) خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بچوایە بۆ سەفەر، لەنێوان ژنەکانیدا. کامیان پشکی بەربکەوتایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ خۆی دەیبرد، عائشە (ﷺ) دەڵێ: لەیەکێك لە غەزاکاندا تیروپشکی کردوو من دەرچووم، منیش لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) ڕۆیشتم ئەمەیش پاش دابەزینی (ئایەتی) حیجاب. من لەوسەفەرەدا کەلەناو کەژاوەکەمدا هەڵدەگیرام و دادەنرام. کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگەکەی بوویەوە و بڕیاری گەڕانەوەی داو لە مەدینە نزیك بووینەوە، شەوێکیان بڕیاری ڕۆیشتنیدا، منیش لەوکاتەدا ڕۆیشتم لەسوپاکە دوور کەوتمەوە تا کاتێ پێویستی سەر ئاوم ئەنجامدا گەڕامەوە بۆلای کۆچ و بارەکە دەستمدا لە سینگ وبەرۆکم، سەیردەکەم ئەو ملوانکەیەم کە لە مورووی (ظفار)بوو بچڕابوویەوە، بۆیە گەڕامەوە بەدوای

ملوانکەکەمدا دەگەڕام، ئەو گەڕانە دوای خستم، ئەو چەند کەسەی کە کەژاوەکەی منیان باردەکرد. کەژاوەکەیان هەڵگرتبوو خستبوویانە سەر ئەو وشترەی کە من سواری دەبووم، وایان زانی بووکە منی تێدام، ئەو کاتەیش ژنان سووکەڵەبوون ئەوەندە قەڵەوو گۆشتن نەبوون ، کەمخۆر بوون، هەر ئەمەندەیان دەخوارد کە پێی بژین، ئەو خەڵکەیش کاتێ کەژاوەکەیان هەڵ گرتبوو بەرزیان کرد بۆوە هەستیان بەسووکی کەژاوەکە نەکردبوو، منیش ئافرەتێکی تازە ساڵ و تازە پێگەیشتووبووم، وشترەکەیان هەستاندبوو ڕۆیشتبوون. منیش ملوانکەکەم دۆزیەوە دوای ئەوەی سوپاکە کەوتبووە ڕێ. کە هاتمەوە هەوارگەکەیان سەیر دەکەم کەسی تێدا نەماوە، منیش گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تیایدا بووم، وامزانی خەڵکەکە بۆم دەگەڕێن و، دێنەوە بە دوامدا لە کاتێکدا کە من دانیشتبووم، لە شوێنی خۆما خەو زۆری بۆ هێنام و خەوم پیاکەوت، (صفوان)ی کوڕی (المعطل السلمي) لەدوای سوپاکەوە سەرخەوی شکاندبوو، لە کۆتایی شەودا کەوتبووەڕێ. دەمەو بەیان گەیشتبووە شوێنەکەی من، تارمایی زەلامێکی خەوتووی بینی بوو هات بۆ لام و ناسیبوومی،چونکە پێش فەرزکردنی حیجاب منی بینی بوو، منیش بە دەم (انا لله و انا اليه راجعون)ی ئەوەوە خەبەرم بوویەوە، کاتێ ناسیمیەوە، کت وپڕ بە چمکی چارشێوەکەم ڕووخسارم داپۆشی، بەخوا نەهیچ قسەیەکی لەگەڵ کردم و نەهیچ وشەیەکم لێبیست جگە لە (انا لله وانا اليه راجعون)ەکەی. یەکسەر حوشترەکەی ئیخ داو پێم لەسەر دەستی داناو، منیش سواری بووم، جڵەوی حوشترەکەی گرت و هێنامی تاگەیشتینەوە بە سوپاکە ، پاش ئەوەی لەناو جەرگەی نیوەڕۆدا لەبەرگەرما لایان دابوو، ئەوەی دەمی وەردا لەو باسەی من تیاچوو، ئەوەی پشکی هەرەگەورەی بەرکەوت (عبدالله)ی کوڕی (أبي) کوڕی (سلول)بوو، کاتێ هاتینەوە بۆ مەدینە، بۆماوەی مانگێك نەخۆش کەوتم، توومەس خەڵکی هەر قسەی بوختان چییەکان ئەم بەرو ئەوبەر پێدەکەن و، منیش ئاگام لە هیچ نییە و هەستی پێناکەم. بەڵام لەوەدا کەوتبوومە گومانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سۆز و بەپەرۆشەوە بوونەی جارانی بۆم نەمابوو کەلەکاتی نەخۆشیما لێمدەدی، بەڵکو هەر ئەمەندە نەبێت کە کاتێ دەهاتە ژوورەوە سەلامی دەکردو، دەیفەرموو: "نەخۆشەکەتان چۆنە" منیش ئەوە دەیخستمە گومانەوە و، هەستیشم بە هیچ خراپەیەك نەدەکرد، تاوەکوو شەوێکیان پاش ئەوەی کەمێك باش بوو بووم، لەگەڵ دایکی (مسطع)دا

چووین بۆ سەراوکردن، ئەوە شوێن دانیشتمان بوو، شەواوشەو دەردەچووین بۆ سەرئاو، ئەمەیش پێش ئەوەی سەرئاو دروست بکەین لە نزیك ماڵەکانماندا، کاروپیشەکان وەك پیشەی عەرەبە پێشووەکان بوو لە چوونەسەرئاودا حەزمان نەدەکرد لە ئاودەست لەپاڵ ماڵەکانماندا دروست بکەین، من و دایکی (مسطع)کە کچی (ابی رهم)ی کوڕی (عبدالمطلب)ی کوڕی (عبدالمناف) بوو، دایکیشی کچی (صخر)ی کوڕی (عامر)ی پووری (أبو بکر الصدیق) بوو (ﷺ) کوڕەکەیشی (مسطع)ی کوڕی (أثاثة)ی کوڕی (عبد)ی کوڕی (عبدالمطلب)بوو، من و دایکی (مسطع) کاتێ سەراومان کرد هاتین بەرەو ڕووی ماڵەکەی من، دایکی (مسطع)پێی لە دامێنی کراسەکەی هەڵکەوت و وتی: "دەك بەدبەخت بی (مسطح) منیش پێموت چەند خراپت وت. نزا لەکەسێك دەکەیت کە ئامادەی جەنگی بەدر بووە، وتی: ئەی داماوی باوان شێواو. ئەی نەت بیستووە چی دەڵێت؟ وتم: چی وتوە؟ دەڵێ: ئیتر دەنگ و باسی بوختان چیەکانی بۆ گێڕامەوە، منیش ئەمەندەی تر نەخۆشکەوتم، کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆلام سەلامی کردو فەرمووی: "نەخۆشەکەتان چۆنە" منیش وتم: ڕێگەم دەدەیت بچمەوە بۆلای دایك و باوکم، دەمویست لە ڕێگەی ئەوانەوە دڵنیابم لەو هەواڵە، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێگەیدام، منیش هاتمەوە بۆلای دایك و باوکم. بەدایکم وت: دایە خەڵکی چی دەڵێن؟ وتی: ئەی کچۆڵەی خۆم گوێ مەدەرێ، بەخوا کەم ڕێکەوتووە ژنێکی جوان لای پیاوێك بێت و خۆشی بوێت و سەربەهەوێ بێت، قسەی زۆری لەسەر نەکرێ، وتم: سبحان الله، خەڵك ئەم قسەیەیان کرد؟ دەڵێ: ئەو شەوە تا بەیانی گریام فرمێسکم نەدەنیشتەوە، خەو لە چاوم نەدەکەوت، بۆ بەیانیش هەر دەگریام، لەو ماوەیەدا وەحی دواکەوت پێغەمبەر (ﷺ) عەلی کوڕی (أبو طالب) و (أسامە)ی کوڕی (زید)ی (ﷺ) بانگ کردبوو ڕاوێژی پێکردبون سەبارەت بە وازهێنان لە خێزانی. (أسامە) ئاماژەی بۆ کردبوو بەوەی کە دەیزانی لە پاکیی خێزانی، بەو خۆشەویستیەش کە دەیزانی لە دڵیدا هەیە، بەرامبەرە بە خێزانی. وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانی خۆتە ئێمەش لە چاکە بەولاوە هیچمان لێنەدیوە، (عەلی)کوڕی (أبو طالب)یش وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆ خوا تەنگی زەوی لێنەهێناویتەوە یەك. خۆ ژنانی تر جگە لەو زۆرن. ئەگەر بیشچیتە لای کارەکەرەکەی ڕاستیت پێدەڵێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بريرة)بانگ دەکات دەفەرمووێت: "ئەی بەریرە هیچ

شتێکت له (عائشة) بینیوه که بتخاته گومانەوه" بریرەش دەڵێت: سوێند بەو کەسەی تۆی بەڕاستی ڕەوانه کردووه هەرگیز هیچ شتێکم لێنەبینیووه کەلێی بە عەیب بگرم. ئەوەندە نەبێت که ئەو کچێکی منداڵکاری تازه پێگەیشتووه، لەماڵەوه بەسەر هەویرەکەیدا خەوی لێدەکەوێت ، مەڕ و ماڵات دێت هەویرەکەی دەخوات. پێغەمبەر (ﷺ) چووه سەر مینبەر و هەندێ گلەیی و گازندەی لە عبدالله ی کوڕی سلول کرد فەرمووی: "ئەی کۆمەڵگەی موسڵمانان، کێ هەیه پشتم بگرێت لە دژی پیاوێك که ئەزیەت و ئازاری بۆم گەشتۆته خاو خێزانیشم، بەخوا من له خاو خێزانی خۆم چاکه نەبێت هیچ شتێکی دیکەیان لەبارەوه نازانم، باسی پیاوێکیش دەکەن خێر نەبێت هیچ شتێکی لەبارەوه نازانم، لەگەڵ خۆما نەبێت نەهاتۆته ماڵەوه" (سعد)ی کوڕی (معاذ)ی (الأنصاری)(ﷺ) هەستاو وتی: من پشتت دەگرم له دژی، ئەگەر له (أوس)ه دەدەین له گەردنی، ئەگەر له برا (خەزرەجی)یەکانیشمانه چۆن ئەمرمان پێدەفەرموویت ئێمەش ئەمرەکەت بەجێ دێنین. دەڵێ: سعدی کوڕی (عبادە) هەستا که سەرۆکی خەزرەج بوو پیاوێکی باش بوو، بەڵام دەمار گرتی و وتی بەخوا درۆت کرد نایکوژین و نایشتوانیت بیکوژی، (أسید)ی کوڕی (حضير)یش که ئامۆزای (سعد)ی کوڕی (معاذ)بوو به (معد)ی کوڕی (عبادە)ی وت: بەخوا درۆت کرد هەر دەبێت بیکوژین، چونکه تۆ دووڕوویت پاساو بۆ دوڕوەکان دێنیتەوه، هەروەها هەردوو هۆزەکه له (اوس) و (خزرج) تێهەڵچوون تا خەریك بوو دەست بدەنه یەکتری و بجەنگن. پێغەمبەریش (ﷺ) هەر لەسەر مینبەرەکەوه خەریك بوو بێدەنگی دەکردن، تا بێدەنگ بوون. ئەویش بێدەنگ بوو. دەڵێ: منیش ئەو ڕۆژه هەر دەگریام فرمێسکم نەدەنیشتەوه و خەو نەچووه چاوم، پاشان بۆ شەوی داهاتوویش هەر بەبەردەوامی دەگریام. فرمێسکم نەدەنیشتەوه و چاوم نەئەچووه خەو. باوك و دایکیشم وا گومانیان دەبرد که گریان جەرگم دەبڕێت، له کاتێکدا ئەوان هەردووکیان لەلام دانیشتبوون، منیش دەگریام ژنێکی (أنصاری) داوای مۆڵەتی هاتنه ژوورەوەی کرد بێت بۆلای من، منیش مۆڵەتمدا. دانیشت دەستی کرد به گریان دەڵێ: له کاتێکدا بەو حاڵەوه دانیشتبووین، پێغەمبەر (ﷺ) هاته ژوورەوه و سەلامی کرد و پاشان دانیشت دەڵێ: لەوکاتەوه که ئەوه دەربارەم وترابوو پێغەمبەر (ﷺ) لەلام دانەنیشتبوو، ماوەی مانگێك تێپەڕی کردبوو هیچ وەحیەکی دەربارەی من بۆ نەهاتبوو، دەڵێ: ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دوای شایەتمان هێنان

فەرمووی: "ئەی (عائشة) من لەبارەی تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەیشتووە، جا ئەگەر تۆ پاکیت ئەوا خوای باڵادەستیش پاکیت دەردەخات، خۆ ئەگەر لە گوناهێکیش نێزیك كەوتویتەوە، داوای لێخۆش بوون لە خوا بکە و تۆبە بکە، چونکە بەندە ئەگەر کاتێ دانی نا بە گوناهێکدا پاشان تۆبەی کرد خوا تۆبەکەی لێوەردەگرێت، دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) قسەکانی تەواو کرد، فرمێسکم وشکی کرد، تاوەکو هەستم بە دڵۆپێك نەئەکرد لێی بە باوکمم وت: لە بریتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە، ئەویش وتی: بەخوا نازانم چ وەڵامێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەمەوە، ئینجا بە دایکمم وت: لە بریتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە. ئەویش وتی: بەخوا نازانم چ وەڵامێکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەمەوە. منیش وتم — لەکاتێکدا کە من ئافرەتێکی منالْ کاریش بووم، قورئانیشم زۆر نەدەزانی—: بەخوا من چاك دەزانم ئەمەی کە بیستووتانە بە تەواوەتی لە دڵتانا جێگیر بووە و باوەڕتان پێی کردووە. جا ئەگەر من پێتان بڵێم: من پاکم —خوایش دەزانێ کە من پاکم— بەوە باوەڕم پێناکەن، خۆ ئەگەر دانیش بە شتێکدا بنێم بۆتان، کە خوایش چاك دەزانێت کە من پاکم باوەڕم پێدەکەن ، بە خوا من هیچ نموونەیەکم دەست ناکەوێت بۆ خۆم و خۆشتان، مەگەر هەر ئەوە نەبێت کە باوکی (یوسف) فەرمووی: (فصبر جمیل و الله المستعان علی ما تصفون) دەڵێ: پاشان: ڕووم وەرگێڕاو لەسەر جێگاکەی خۆم پاڵکەوتم، دەڵێ: بەخوا من ئەوکاتە چاك دەمزانی کە من پاکم، و خوایش بە پاکی خۆم پاکیم دەردەخات، بەڵام باوەڕم نەدەکرد، کە خوا لەبارەمەوە وەحی بنێرێت و بخوێنرێتەوە. خۆمم لا بچوکتر بو لەوەی کە خوای باڵادەست لەبارەمەوە بێتە گوفتار. بەڵام من ئومێدم وابوو کە پێغەمبەر (ﷺ) خەوێك ببینێت خوا بەهۆیەوە پاکیم دەربخات، بەخوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجێی خۆی نەجوڵا و کەسیش لە دانیشتوانی ماڵەکە دەرنەچووبوون، تاوەکو خوا وەحی ناردە سەر پێغەمبەر (ﷺ)، ئەو ترس و لەرزەی کەلەکاتی دابەزینی (وەحی) دا دایدەگرت لەوێشدا دایگرت، تاوەکو بەڕادەیەك، وەك وردە مرواری ئارەقی لێدەچۆڕا، لە ڕۆژی سەرماو سۆڵەی زستاندا، لە قورسایی و سەختی ئەو وشەیەی دادەبەزییە سەری، دەڵێ: کاتێ (وەحی) کۆتایی هات پێغەمبەر (ﷺ) پێدەکەنی، یەکەم وشە کە پێی هاتە گۆ ئەوە بوو کە فەرمووی: "مژدەت لێبێت ئەی عائشە خوا پاکی دەرخستیت". دایکم پێی وتم: هەستە بەلایەوە، منیش وتم: بەخوا هەڵناسم بەلایەوە

تەنها سوپاسی ئەو خوایە دەکەم، ئەو خوایەی کە پاکی منی دەرخست، دەڵێ: خوای باڵادەست دەئایەتی ناردە خوارەوە (أن الذين جاؤوا..) واتە: (بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان وائەزانن کە ئەو بوختانە خراپ بوو بۆتان بەڵکو خێر بوو بۆتان) خوای گەورە و باڵا دەست بەم ئایەتانە پاکی منی دەرخست. (أبو بكر) (ﷺ) —کەلەوەپێش خەرجی (مسطح)ی دەکێشا لەبەر خزمایەتی و هەژاری و نەداریەکەی— وتی: بەخوا لەمەولا هەرگیز هیچ شتێکی نادەمێ پاش ئەوەی کە بە عائشەی وت خوای باڵادەستیش ئەم ئایەتەی نارد: (ولا يأتل اولو الفضل..) واتە: (ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچەران لە پێناوی خوادا نەدەن ، با لێبوردە بن وچاو پۆشی بکەن، ئەی حەز ناکەن خوا لێتان خۆش بێت، خواش لێبوردە و میهرەبانە). (حیان)ی کوڕی (موسی) دەڵێ: (عبدالله)ی کوڕی (مبارك) دەڵێ: ئەم ئایەتە هیوا بەخشترین ئایەتە لە قورئاندا— ئەمجا ئەبوبەکر (ﷺ) وتی: بەڕێ بەخوا من حەز دەکەم خوا لێم خۆش بێت، بۆیە گەڕایەوە بۆ خەرجی کێشانی (مسطح)کەلەوەو پێش دەیکێشاو وتی: هەرگیز لێی ناگرمەوە ، (عائشة) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاریشی لە (زینب)ی کچی (جحش)ی (خێزانیشی کردبوو لەبارەمەوە: "داخۆ هیچی لێوە دەزانیێ" یا "بینیووتە" ئەویش وتبووی: ئەی پێغەمبەری خوا چاو گوێم دەپارێزم خێر نەبێت هیچ شتێکی تر نازانم(عائشة)(ﷺ) دەڵێ: لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا تەنها ئەو لەجوانیدا هاوشانی دەکردم، بەڵام بە خۆ پارێزی وخواناسی خۆیەوە خوا پاراستی، بەڵام (حمنة)ی خوشکی هەر لەسەری دەکردەوە تا تیاچوو لەگەڵ ئەوانەی کە تیاچوون، (الزهری) دەڵێ: ئەمە بوو پوختەی سەرگوزشتەی ئەو چەند کەسەی کە پێیان گەیشتووە.

**( ٢٣ ) سورەتی ( الفرقان ) ئایەتی ( والذين لا يدعون مع الله الها آخر ) ٦٨**

١١٥٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ): أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ قَتَلُوا فَأَكْثَرُوا، وزَنَوْا فَأَكْثَرُوا، ثُمَّ أَتَوْا مُحَمَّدًا (ﷺ) فَقَالُوا: إِنَّ الَّذِي تَقُولُ وتَدْعُو لَحَسَنٌ، ولَوْ تُخْبِرُنَا أَنَّ لِمَا عَمِلْنَا كَفَّارَةً. فَنَزَلَ: (وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ ولَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ولَا يَزْنُونَ. ومَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا) ونَزَلَ: (يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ) الآية. **(بخاري/ التفسير/ ٤٥٣٢)**

(أبن عباس) (ﷺ) دەڵێ: خەڵكانێك لە موشریكەكان كوشتاری زۆر و، زینای زۆریان كردبوو ، پاشان هاتنە خزمەت (محمد) (ﷺ) وتیان: ئەوەی تۆ دەیڵێیت و بانگی بۆ دەكەی شتێكی جوانە ئەگەر خەبەرت پێمان بدایە ئەوەی كردوومانە كەفارەتی بۆهەیە. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (والذین لا یدعون..) واتە: (هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە پەرستراوێكی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن كەسیش ناكوژن كە خوا كوشتنی حەرام كردبێت بەهەقی خۆی نەبێت ، هەروەها زینا ناكەن جا ئەوەی ئەو جۆرە خراپانە بكات توشی سزا و ئازار دەبێت) هەروەها ئایەتی (قل یا عبادي..) هاتە خوارەوە واتە: (پێیان بڵێ خوا دەفەرموێت ئەی بەندەكانم ئەوانەی كە خۆتان گوناهباركردووە و تاوانتان زۆرە نا ئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا).

**( ٢٤ ) سورەتی ( السجده ) ئایەتی ( فلا تعلم نفس.. ) ١٧**

**١١٥٥ــ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ): "يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: أَعْدَدْتُ لعبَادِيَ الصَّالحِينَ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، ولَا أُذُنٌ سَمعَتْ، ولَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْرًا، بَلْهَ مَا أَطْلَعَكُمُ (اللَّهُ) عَلَيْهِ". ثُمَّ قَرَأَ: (فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ) (١٧). (بخاري/ التفسير/ ٤٥٠٢)**

(أبو هريرة)(ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "خوای گەورە و باڵادەست فەرموویەتی: خەڵات و بەراتێكی وام ئامادە كردووە بۆ بەندە چاكەكانی خۆم ، كە نەچاو دیبێتی و نەگوێچكە بیستبێتی و ، نە بەدڵی كەسیشدا هاتبێ ، جگە لەوەی كە خوا ئاگاداری كردوون و بۆی باس كردوون" پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (فلا تعلم نفس..) واتە: هیچ كەس لەو بەختەوەرانە نازانێ چی بۆ هەڵگیراوە لە ناز و نیعمەتی جۆراوجۆر كە چاو پێی گەش دەبێتەوە.

**( ٢٥ ) سورەتی ( الاحزاب ) ئایەتی ( أذا جاؤوكم من فوقكم وفي أسفل منكم )**

**١١٥٦ــ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ): فِي قَوْلِه عَزَّ وجَلَّ: (إِذْ جاءوكُمْ مِنْ فَوْقكُمْ ومنْ أَسْفَلَ منْكُمْ وإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ) (١٠) قَالَتْ كَانَ ذَلِكَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ. (بخاري/ المغازي/ ٣٨٧٧)**

دەربارەی ئەم ئایەتە (إذا جاؤوكم..) واتە: كاتێك دوژمنان لەسەر و خوارتانەوە هاتنە سەرتان لەو كاتەدا چاوەكان ئەبڵەق بوون گیان گەشتبووە گەروو) عائشە (ﷺ) دەڵێ: مەبەست ڕۆژی (خندق)ە.

## ( ٢٦ ) سورەتی ( یس )ئایەتی ( و الشمس تجري لمستقر لها ) ٣٨

١١٥٧ـ عَنْ أَبِي ذَرّ (ﷺ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه (ﷺ) عَنْ قَوْلِ اللَّه تَعَالَى: (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرّ لَهَا) (٣٨). قَالَ: "مُسْتَقَرُّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ". (بخاري/ التفسير/ ٤٥٢٥)

(أبو ذر)(ﷺ) پرسارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد دەربارەی ئایەتی (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرّ لَهَا) فەرمووی: "قەرارگاکەی لە ژێر عەرشدایە".

## ( ٢٧ ) سورەتی ( الزمر ) ئایەتی ( وما قدروا الله حق قدره ) ٦٧

١١٥٨ـ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: جاء حَبْرٌ إِلَى النَّبِيِّ (ﷺ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ –أَوْ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ– إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى إِصْبَعٍ، والْأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، والْجِبَالَ والشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، والماء والثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى إِصْبَعٍ، ثُمَّ يَهُزُّهُنَّ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ. فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّه (ﷺ) تَعَجُّبًا مِمَّا قَالَ الْحَبْرُ تَصْدِيقًا لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ: (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ والْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ والسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) (٦٧). (بخاري/ التفسير/ ٤٥٣٣)

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: زانایەکی جوولەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی (محمد) یا ئەی باوکی (قاسم) –خوا لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەك و، زەمینەکان لەسەر پەنجەیەك و، کێو و درەختەکان لەسەر پەنجەیەك ڕادەگرێت، پاشان ڕایان دەوەشێنێ و دەفەرموێت: منم پادشا منم پادشا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری سوڕما لە ڕاستی قەسەکەیی و پێکەنی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (وما قدروا الله حق قدره..) واتە: (خوانەناسان قەدری خوایان وەك پێویست نەگرت لەکاتێکدا هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی قودرەتی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئاسمانەکانیش بەدەستی قودرەتی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی شایستەی ئەوە نییە کە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار ئەدەن".

## ( ٢٨ ) سورەتی ( حم السجدة ) ( فصلت ) ئایەتی (وما کنتم تستترون ان یشهد علیکم سمعکم )

١١٥٩ـ عَن ابْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ ثَلَاثَةُ نَفَرٍ: قُرَشِيَّانِ وثَقَفِيٌّ، أَوْ ثَقَفِيَّانِ وقُرَشِيٌّ، قَلِيلٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ، كَثِيرٌ شَحْمُ بُطُونِهِمْ، فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتُرَوْنَ اللَّهَ يَسْمَعُ

مَا نَقُولُ؟ وقَالَ الْآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جهَرْنَا، ولَا يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا. وقَالَ الْآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جهَرْنَا فَهُوَ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ :(وَمَا كُنْتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ ولَا أَبْصَارُكُمْ (وَلَا جُلُودُكُمْ) الآية. (بخاري/ التفسير/ ٤٥٣٨)

(أبن مسعود) (ﷺ) دەڵێ: سێ كەس لای كەعبەدا كۆبوونەوە: دووان لە هۆزی (قورەیش) و یەكێكیش لە (ثقیف)، كەم فام و بێ عەقڵ بوون، ئەگەر چی ورگن و قەڵەو بوون، یەكێكیان وتی: باشە ئێوە لاتان وایە كە خوا گوێی لێمان بێت چی دەڵێین؟ یەكێكی دیكەیان وتی: دەنگ هەڵبڕین گوێی لێمانە، ئەگەر سووك قسە بكەین گوێی لێمان نییە، ئەوی تریان وتی: ئەگەر ئاشكراكەمانی گوێ لێبێت، ئەوا گوێی لە سووكەكەیشمانە، خوایش ئەم ئایەتەی نارد (وما كنتم تستترون..) واتە:(ئێوە كاتی خۆی ئەوەندە گومڕابوون گوناهو تاوانەكانتان نەدەشاردەوە چونكە مەترسیتان نەبوو كە گوێ و چاوو پێستتان شایەتیتان لەسەر بدەن).

**( ٢٩ ) سورەتی ( الدخان ) ئایەتی ( فارتقب يوم تأتي السماء بدخان مبين )**

١١٦٠ـ عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ جُلُوسًا، وهُوَ مُضْطَجِعٌ بَيْنَنَا، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ قَاصًّا عِنْدَ أَبْوَابِ كِنْدَةَ يَقُصُّ ويَزْعُمُ: أَنَّ آيَةَ الدُّخَانِ تَجِي و فَتَأْخُذُ بِأَنْفَاسِ الْكُفَّارِ، ويَأْخُذُ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ. فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ – وَجَلَسَ وهُوَ غَضْبَانُ–: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ، مَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ شَيْئًا فَلْيَقُلْ بِمَا يَعْلَمُ، ومَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ: اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّهُ أَعْلَمُ لِأَحَدِكُمْ أَنْ يَقُولَ لِمَا لَا يَعْلَمُ اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وجَلَّ قَالَ لِنَبِيِّهِ (ﷺ): (قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ومَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ) (ص: ٧٦). إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) لَمَّا رَأَى مِنَ النَّاسِ إِدْبَارًا فَقَالَ: "اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ". قَالَ: فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شيءٍ، حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ والْمَيْتَةَ مِنَ الْجُوعِ، ويَنْظُرُ إِلَى السماء أَحَدُهُمْ فَيَرَى كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ، فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّكَ جِئْتَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ وبِصِلَةِ الرَّحِمِ، وإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا، فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ. قَالَ اللَّهُ عَزَّ وجَلَّ: (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السماء بِدُخَانٍ مُبِينٍ. يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ) إِلَى قَوْلِهِ: (إِنَّكُمْ عَائِدُونَ) (الدخان: ١٠–١٦). قَالَ: أَفَيُكْشَفُ عَذَابُ الْآخِرَةِ؟: (يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ) فَالْبَطْشَةُ يَوْمَ بَدْرٍ ،وَقَدْ مَضَتْ آيَةُ الدُّخَانِ والْبَطْشَةُ، واللِّزَامُ، وآيَةُ الرُّومِ. (بخاري/ الاستسقاء/ ٩٦٢)

(مسروق) دەڵێ: ئێمە لای (عبدالله) دانیشتبووین، ئەو لە نێوانماندا ڕاكشابوو، پیاوێك هات بۆلای وتی: ئەی (أبو عبدالرحمن)، حیكایەت خوانێك لای دەروازەكانی

شاری (کنده) مەبەست دەروازەی کوفەیە (چیرۆك دەخوێنێتەوە و، وا دەزانێت: کە ئایەتی ڕووداوی دوکەڵەکە ڕوودەدات و، هەناسە لە بێباوەڕان دەچنێ، بەڵام بڕواداران وەك هەڵامەت دەگرێتەوە، عبدالله دانیشت –بە تووڕەییەوە– وتی: ئەی خەڵکینە لە خوابترسن، هەرکەس لە ئێوە شتێکی زانی با بەپێی زانینەکەی خۆی قسەبکات، هەرکەسیش نەیزانی بابڵێت خوا زاناترە، چونکە ئەوەیش زانستیەکی زیاترە گەر کەسێك نەزانێت و بڵێت: خوا زاناترە، ئەوەتا خوای باڵادەست بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: (قل ما أسألكم..) واتە: (ئەی پێغەمبەر بەو خەڵکە بڵێ: من هیچ پاداشت و خەڵاتێکم لە ئێوە ناوێت، من لەو کاسانەیش نیم زۆر لە خۆبکەم) چونکە پێغەمبەری خوا کاتێك بینی وا پشتی تێدەکەن فەرمووی: "خوایە گرانیەکی حەوت ساڵە وەك حەوتەکەی یوسف" دەڵێ: ئەوانیش تووشی وشکە ساڵیو قاتو قڕیەك بوون، کە هەموو شتێکی ڕیشەکێش کرد، تاوایان لێهات لە برسانا پێستەی مردارەوبوویان دەخوارد، تاوای لێهات کەیەکێ لەوان سەیری ئاسمانی دەکرد شێوەی وەکو دووکەڵ وابوو، (أبو سفيان) هات بۆ خزمەتی وتی: ئەی (محمد)، تۆ هاتووی فەرمان بە گوێڕایەڵی خواو، بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی دەکەیت، وا خزمو هۆزەکەت هەمووی تیاچوون، دە لەخوا بپاڕێرەوە بۆیان، خوای گەورەش فەرمووی: (فارتقب يوم تأتي السماء..) واتە: "چاوەڕێی ڕۆژێك بە کە دوکەڵێکی ئاشکرا بەری ئاسمان دەگرێت هەموو خەڵکی دادەگرێتەوە بۆیە بە ترسەوە دەڵێن ئەمە سزا و ئازارێکی بە ئێشە.. تا دەگاتە انكم عائدون.. دخان ١٦) دەڵێ: جا ئایا سزای دوارۆژ لائەچێت )واتە ئەوەی حیکایەت خوانەکە دەیڵێت وانییە چونکە سزای ڕۆژی قیامەت سووك نابێت (يوم نبطش البطشة الكبرى انا منتقمون) مەبەست لە (البطشة) ڕۆژی (بدر)ە، بەڵام سزای دووکەڵ و دەست وەشاندنی (ڕۆژی بەدر)و کوشتاری ڕۆژی بەدرو ئایەتی ڕۆم تێپەڕی کرد.

**١١٦١ـ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ: خَمْسٌ قَدْ مَضَيْنَ: الدُّخَانُ، واللِّزَامُ، والرُّومُ، والْبَطْشَةُ، والْقَمَرُ. (بخاري/ التفسير/ ٤٥٤٨)**

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) (ﷺ) دەڵێ: پێنج شت تێپەڕیوون: دوکەڵەکە و، ڕۆژی بەدر و، ڕۆم و، کوشتاری بەدرو، لەت بوونی مانگ.

**( ٣٠ ) سورەتی ( ق ) ئایەتی ( يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيد )**

١١٦٢ـ عَنْ عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ عطاء فِي قَوْلِهِ عَزَّ وجَلَّ: (يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ) **(٣٠).** فَأَخْبَرَنَا عَنْ سَعِيدٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ) أَنَّهُ قَالَ: "لَا تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا وتَقُولُ: (هَلْ مِنْ مَزِيدٍ) حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ، فَيَنْزَوِي بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وتَقُولُ: قَطْ قَطْ، بِعِزَّتِكَ وكَرَمِكَ. ولَا يَزَالُ فِي الْجَنَّةِ فَضْلٌ حَتَّى يُنْشِئَ اللَّهُ لَهَا خَلْقًا، فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الْجَنَّةِ". **(بخاري/ التوحيد/ ٦٩٤٩)**

(عبد الوهاب) کوڕی (عطا) لەبارەی ئەم ئایەتەوە (یوم تقول ....) واتە: (ڕۆژێك کە بە دۆزەخ دەڵێین ئایا پڕبوویت، ئەویش دەڵێت: ئایا هیتر ماوە). لە سەعید و قەتادەو لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "بەردەوام خەڵك دەخرێتە دۆزەخەوەو ئەویش دەڵێت : ئایا زیاتر ماوە، هەتا خوای باڵادەست پێیەکی پیادەنێ بەو شێوەیە دۆزەخ دێتەوە یەك و، ئینجا دەڵێ: سوێند بە بەزەیی و بەخشندەیت بەسمە، بەسمە. بەردەوام بەهەشتیش زیادەی هەیە هەتا خوا دروستکراوێکیان بۆ دروست دەکات و زیادەکەی بەهەشتی تیا نیشتەجێ دەکات".

**( ٣١ ) سورەتی ( الرحمن ) ئایەتی ( وخلق الجان من مارج من نار )**

١١٦٣ـ عَنْ عَائِشَةَ (ﷺ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): "خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وخُلِقَ آدَمُ (ﷺ) مِماعصِفَ لَكُمْ". **(بخاري/ التفسير/ ٤٥٩٠)**

(عائشە) (ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "فریشتە لە ڕوناکی دروستکراوە، جنۆکەش لە بڵێسەی ئاگر، ئادەمیش چۆن بۆتان باس کراوە" (واتە لە قوڕ).

**( ٣٢ ) سورەتی ( الجن ) ئایەتی ( قل اوحي الى أنه استمع نفر من الجن )**

١١٦٤ـ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (ﷺ) قَالَ: مَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) عَلَى الْجِنِّ ومَا رَآهُمْ، انْطَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وبَيْنَ خَبَرِ السماء وأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ إِلَى قَوْمِهِمْ، فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وبَيْنَ خَبَرِ السماء، وأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَالُوا: مَا

